# ئینسکلۆپیدیا
# پارێزگەها دهۆکێ


سەرنڤیسەر و سەرپەرشتێ گشتێ

**موسەدەق تۆڤی**

هاریکارێ سەرنڤیسەری

خالد سالح


## بەرگێ نەهێ

## قەزا و ناحیا، پێکهاتێن ئایینی و نەتەوەیی، ئیندێکسێ ئینسکلۆپیدیایێ، پانووراما ئینسکلۆپیدیایێ


٢٠١٧ ز        ٢٧١٧ ک        ١٤٣٩ مش

# ناڤەرۆك

# سەنتەرێ قەزا بەردەرەش(*)

سەعید بارانی

قەزا بەردەرەش جهەکێ ستراتیجی هەیە دکەڤیتە دناڤبەرا هەردو رووبارێن زێیێ مەزن (بەهدینان) و خازری دا د ناڤبەرا هەرسێ پاریزگەهێن هەولێر و دهۆك و مووسل دا ل سەر رێکا هەردو باژێرێن مووسل و ئاکرێ، (٣٤کم) ژ باژێرێ مووسل و (٤٥کم) ژ باژێرێ ئاکرێ دوورە.

## سنوورێن قەزایێ:

**باکووری،** قەزا ئاکرێ یە.

**باشووری،** ناحیا بەرتلە، یا پاریزگەها مووسل.

**رۆژهەلاتی،** زێیێ مەزن.

**رۆژئاڤایی، رووبارێ خازری.**

بەردەرەش ئێك بوو ژ ناحیێن سەر ب ناڤەندا قەزا مووسل بوو و دهێتە هەژمارتن ئێك ژ کەڤنترین ناحیێن پاریزگەها مووسلێ کو ب (العشائر السبعة) دهاتە نیاسین چونکی حەفت عەشیرەت ب ناڤێن (رەشکەری، گێژ، بۆت، شێخ بزێنی، خدری، زەنگەنە، شاك و ...هندەکێن دی ژی تێدابوون). ژ مالێن کەڤنار ل بەردەرەش ( میکایل مەحمود، سەید محەمەد، محەمەد قەچۆ، سمایل مەعروف، گەرز، عەزیزە درێژ، بەرەمالی خدرە و .... هتد ).

باژێرێ بەردەرەش ژ تاخێن: بەردەرەش بچووك، خێلەکی، سەرهلدان، ئازادی، کوردستان، شۆرش، رۆناکی، خەبات، برایەتی، تاخێ ٧٣٠ و شەهیدان پێکهاتییە.

دەربارەی ناڤێ بەردەرەش دو بۆچوون هەنە:

**یائێکێ** ئەوە کو ئاخا دەڤەرێ یا رەشە و یا ب زاخ و بەرەکەتە بۆ چاندنێ.

**یا دووێ** ئەوە کو خەلکێ دەڤەرێ یێ ژ چیایێ رەش ژبرباکوورێ رۆژهەلاتی هاتین و ئەڤ ناڤە یێن دگەل خۆ هینایین.

بەردەرەش ل دەستپێکێ گوندەکێ بچویك بوو و ژبەر هاتنا گەلەك خەلکی ژ تیرە و عەشیرەتێن جودا ئێدی پتر پێدڤی ب خزمەتکاری و دەزگایێن میری بوو و دەڤەر ل سالا (١٨٩٠)ێ بوویە ناحیە و ناڤەندا وێ ل دەستپێکێ ل گوندێ (جۆجەر) بوو پاشی هاتییە ڤەگوهاستن بۆ (بەردەرەش). دەمێ دەولەتا عیراقی ل سالا (١٩٢١)ێ هاتییە دامەزراندن یەکەم رێڤەبەرێ ناحیێ (نەشئەت ئەفەندی) بوو، سالا (١٩٢٦)ێ ناحیا (العشائر السبعة) ب قەزا ئاکرێ ڤە هاتە گرێدان کو د وی دەمی دا هەژمارا خەلکێ وێ (١٠) هزار کەس بوون.

ل دەستپێکێن سەدساڵیا بیست و ئێکێ و ب دروستی ل ٢٠٠٧/٤/٨ێ بەردەرەش بوو قەزا ل سەر رووبەرێ (٨٩٣)ێ کیلومەترێن چوارگۆشە و (١٠٨)

گوند و ناحیە پێڤە هاتنە گرێدان ب ڤی رەنگی:

سەنتەرێ قەزایێ: (٨) گوند کو نها کەتینە دناڤ سنوورێ بازێرڤانیا بەردەرەش دا بناڤێن ئانیان، ئانیانۆك، خێلەکی، زەمزەمۆك، زەوبەرەش، شبوەرا، بەردەرەشی بچووك و کانیلان.

ناحیا رۆڤیا: (٤١) گوند.

ناحیا دارەتوو: (٣٥) گوند.

ناحیا کەلەکێ: (٢٥) گوند.

ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٩٧)ێ یا ناحیێن قەزا ئاکرێ و ل دووڤ وان پسوولەیێن ئازۆقەی کو ژ لایێ رێکخراوا (W.F.P)ڤە هاتینەدان ژمارا خێزانێن ناحیێ (٧٣١٧) سەرخێزان بوون کو دبوونە (٥١٧١٣) کەس و رێژەیا ٣٦٪ ژ ژمارا قەزا ئاکرێ پێکدهینا، نها ژمارا ئاکنجیێن ناڤەندا بەردەرەش پترە ژ (٦٠) هزار کەسان و ل دووڤ ئامارا سالا (٢٠١٠)ێ ژمارا ئاکنجیێن قەزایێ ب (١٣٦) هزار کەسان هاتینە تەخمینکرن. ل دووڤ سەرژمێریا تەخمینکریا رێڤەبەریا ئامارا پارێزگەها دهۆکێ بۆ سالا ٢٠١٦ هژمارا خەلکێ قەزا بەردەرەش ب هەر سێ ناحیێن وێ ڤە ١٤٤٠٦٠کەس بوو، ژ وانا ٥٠٥٤١کەس بازێری و ٩٣٥١٤ کەس گوندنشینن[1].

یەکەم خواندنگەها سەرەتایی ل سالا (١٩٣٦)ێ ل بەردەرەش هاتییە ڤەکرن و ل سالا (١٩٦٩)ێ کارەب گەهشتییێ، دیسان چەندین فەرمانگەهێن دی ب ڤی شێوەی لێ هاتینە ڤەکرن:

١- ڤەکرنا بنکەهێ پۆلیسێن بەردەرەش ل ١٨٦١ز.

٢- بەردەرەش بوو ناحیە ل ١٨٩٠ز.

٣- ڤەکرنا فەرمانگەها داراییا بەردەرەش ل١٩٣٠ز.

٤- ڤەکرنا بنکەهێ تەندروستی ل ١٩٤٤ز.

بەردەرەش



٥- ڤەکرنا فەرمانگەها بارێ شارستانییا بەردەرەش ل ١٩٤٧ز

٦- ڤەکرنا فەرمانگەها پۆستەوگەهاندنێ ل ١٩٥٦ز

٧- دامەزراندنا ئێکەتییا قوتابیانیێن کوردستانێ ل بەردەرەش ل١٩٧١ز.

٨- ڤەکرنا فەرمانگەها کارەبا بەردەرەش ل ١٩٧٥ز.

٩- ڤەکرنا فەرمانگەها سامانێ ئاژەلی ل ١٩٧٧ز.

١٠- ڤەکرنا فەرمانگەها چاندنێ ل ١٩٧٨ز.

١١- ڤەکرنا فەرمانگەها ئاڤا بەردەرەش ل ١٩٧٩ز.

١٢- ڤەکرنا ئێکەتییا زانایانیێن ئایینێ ئیسلامی کوردستان ل ١٩٩٢/٢/١٩.

١٣- ڤەکرنا بنکەهێ ئاسایشا بەردەرەش ل ١٩٩٥/١١/١.

١٤- دامەزراندنا سەنتەرێ رەوشنبیری ل ١٩٩٥/٥/٤.

١٥- ڤەکرنا دادگەها بەراییا بەردەرەش ل ٢٠٠٠/٨/١٩.

١٦- دامەزراندنا کەرتێ ئێکەتییا ماموستایایێن کوردستان ل ٢٠٠٤/١٠/٤.

١٧- ڤەکرنا بانکا بەردەرەش ل ٢٠٠٥/٥/٢٥.

١٨- ڤەکرنا بنکەهێ ئاگر ڤەمراندنا بەردەرەش ل ٢٠٠٥/٩/٤.

١٩- بەردەرەش بوو قەزا ل ٢٠٠٧/٤/٨.

٢٠- ڤەکرنا کەرتێ تەندروستیێ بەردەرەش ل ٢٠٠٧/٤/١٥.

٢١- ڤەکرنا رێڤەبەریا پۆلیسێن بەردەرەش ل ٢٠٠٧/٥/٣.

٢٢- ڤەکرنا رێڤەبەریا پەروەردا بەردەرەش ل ٢٠٠٧/٨/٢.

٢٣- ڤەکرنا تێبینەرایەتییا تۆمارا خانووبەرەیا بەردەرەش ل ٢٠٠٧/١١/٩.

٢٤- ڤەکرنا بنکەهێ تەندروستیێ خازر ل ٢٠٠٨/٨/١.

٢٥- ڤەکرنا رێڤەبەریا ئاسایشا بەردەرەش ل ٢٠٠٨/٨/٣١.

٢٦- ڤەکرنا پەیمانگەها تەکنیکیا بەردەرەش ل ٢٠٠٩/٧/١.

٢٧- ڤەکرنا رێڤەبەریا رەوشنبیری و هونەریا بەردەرەش ل ٢٠٠٩/٨/٤.

٢٨- ڤەکرنا هۆبا دارستانێ ل ٢٠٠٩/١٠/٢٦.

٢٩- ڤەکرنا بنکەهێ پۆلیسێن هەوارهاتنێ ل ٢٠٠٩/١٢/٢٤.

٣٠- ڤەکرنا بنکەهێ نەهێلانا تاوانان ل ٢٠١٠/٧/٣.

٣١- ڤەکرنا نڤیسینگەها زانیاریان ل ٢٠١١/٤/١٧.

٣٢- ڤەکرنا نڤیسینگەها دیڤچوونا توندوتیژیێ دژی ئافرەتان ل ٢٠١١/٨/٣.

٣٣- ڤەکرنا بنکەهێ وەرزش و لاوان ل ٢٠١١/٨/١٦.

٣٤- ڤەکرنا نڤیسینگەها ڤەگوهاستنێ ل ٢٠١١/١١/٢١.

٣٥- ڤەکرنا بنکەهێ چاڤدێری و بازرگانیێ ل بەردەرەش ل ٢٠١١/٢١/١.

نها (٦) باخچەیێن ساڤایان و (١٦) بنگەهێن ساخلەمیێ ل بەردەرەش هەنە کو سێ ژ وان ل ناڤەندا قەزایێ نە و یێن دی ل گوند و ناحییێن سەر ب وێڤەنە.

هەلبەت ژبلی جهێ قەزایێ یێ ستراتیجی گەلەك پیرێن نەفتێ ژی لێ هەنە و ئەڤە ژی داهاتەکە بۆ دەڤەرێ و کوردستانێ ب گشتی[٢].

ل دووڤ دوا سەرژمێریا رێڤەبەریا گشتییا پەروەردا پارێزگەها دهۆکێ بۆ سالا خواندنێ ٢٠١٦ - ٢٠١٧ ل سەرانسەری سنوورێ قەزا بەردەرەش ٦ باخچەیێن ساڤایان ١٢٠ خواندنگەهێن بنەرەتی ٢٥ ئامادەیی ٢ خواندنگەهێن خواندنا بلەز هەنە[٣].

## گوندێن سەر ب سەنتەرێ قەزا بەردەرەش

### گوندێ زمزۆك:

گوند د کەڤیتە رۆژهەلاتا قەزا بەردەرەش، د ڤی گوندی دا کانییەکا خۆش و زەلال ب ناڤێ کانییا زمزم هەبوو و ناڤ هاتییە کورتکرن بوویە (زمزۆك) کو ناڤێ گوندییە، مێژوویا گوندی ل دووڤ گۆتنا خەلکێ وی ڤەدگەرێتەڤە بەری ١٥٠ سالان.

## سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ كریدەو.

**باشووری،** گوندێ شێخالكە.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ كەونەباك.

**رۆژئاڤایی،** بازێرڤانییا قەزا بەردەرەشە.

ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ١٣٤ كەس بوون.[٤]

گوند نێزیكی (١٦٤) سەرخێزانن كو د بنە (٨٦١) كەس، پێكهاتینە ژ دو بنەمالان (شاسواری، بەستۆرەیی).

دو شوینوار ل گوندی هەنە، كانی زمزم و بەردەكەر.

ژیانا خەلكێ گوندی ل سەر جۆتیارێ و پالەتیێ و مۆچەیان ڤەیە.

## گوندێ كانیلان:

گوند د كەڤیتە دووراتییا ٤كم ژ بەردەرەش ل بنارێ چیایێ مەقلووبی و د ناڤبەرا چوار رووباراندا كو ل قەلەمۆك د گەهنە ئێك، ئەو رووبار ژی (خازر ل لایێ باشوورێ رۆژهەلاتێ گوندی دەریاز دبیت و گۆمر و گەرما و سارداو)، ناڤێ گوند پێكهاتییە ژ دو برگان (كانی + لان)، چونكە د كەڤندا و هەتا نها ژی گەلەك كانی لێ هەنە، و (لان) ب واتایا جهی د هێت، واتە (جهێ كانیێ) و ل دووڤ گۆتنا دانعەمران دبیت ل سالا ١٨٨٤ێ هاتبیتە ئاڤاكرن، ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ٣٥٢ كەس بوون.[٥]

## سنوورێن جوگرافی:

گوند دكەڤیتە رۆژئاڤا قەزا بەردەرەش و باشوورێ

گوندێ زمزمۆك



گوندێ ئیسماوا و باکوورێ گوندێ قاتیسی گەورە و رۆژهەلاتی چیایێ مەقلووب ل رەخ رووباری خازری.

## ژ جهێن شوینواری و کەفنار:

١- پێ پرد: ئەڤ پرە د کەڤیتە رۆژئاڤایێ گوندی و ل سالا ١٤٠٠ئ ز ژ لایێ ئوسماییان ڤە هاتییە دروستکرن.

٢- پردی مەندان: پرەکا ب ناڤ و دەنگە ل دەڤەرا گۆرانەتی ل سەر رووبارێ خازری، دکەڤیتە باشووری گوندی و رێکەکا سەرەکی بوویە د ناڤبەرا بەردەرەش و مووسل دا، سالا ١٩٢٠ئ هاتییە ئاڤاکرن و ل سالا ١٩٣٤ئ ژ لایێ ئنکلیزی ڤە ب رەنگەکێ دی نویژەنکری یە و ل سالا ١٩٨٠ئ ل نێزیك هەمان پر ب رەنگەکێ دی هاتە دروستکرن و هاتن و چوون نها ل سەر یا بەردەوامە. پر ب ناڤێ کچەکا گوندی (مەندێ) هاتییە ب ناڤکرن.

٣- گردی خەزنە: دکەڤیتە ژێریێ گوندی، جهەکێ کەڤنە و هەتا نها چ دەستکاری تێدا نەهاتینەکرن.

٤- کەمپە: ل ژێریا گوندی، دەمێ ئنکلیز هاتینە عیراقێ کەمپەك ل وێرێ دروستکربوون و ب کەمپ ب ناڤکربوون.

٥- مام بۆتان: جهێ گوندەکێ کەڤنە.

٦- کەندالەسۆر.

٧- بریسکەداری.

بۆ جارا ئێکێ سالا ١٩٥٦ئ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن.

جهێ گوندی جهەکێ گوزارییە و خەلك گەلەك ژ دەڤەرێن دی قەست د کەنێ، و ژبەر هەبوونا چوار رووباران، بەرهەمێ چاندنێ ژی لێ هەیە کو ژیانا وان یا سەرەکی ل سەر چاندنێ یە ژ بلی راڤ و نێچیرا ماسییان ژی.

گەلەك کەسایەتی و هونەرمەندان سەرەدانا ڤی گوندی کرینە وەکی: مەلك غازی ل سالا ١٩٣٤ئ ل دەمێ نویژەنکرنا پرا مەندان، هونەرمەندان حەسەن زیرەك ل سالا ١٩٤٠ئ، محەمەد عارفێ جزیری ل سالا ١٩٧٣ئ، حەسەن سیساوا ل سالا ١٩٧٥ئ.

## گوندێ مەموزین:

گوند د کەڤیتە سەر رێکا سەرەکییا ئاکرێ بەردەرەش، د بەرێ دا ملکێ ژنەکێ بوو ب ناڤێ (مەکرێ) ناڤێ گوندی ژ (مەم و زین) هاتییە کو دو ئەڤینداربوون و جهێ سەرنجراکێشانا خەلکی بوو، گوند ژ دو پشکان هاتییە (مەم و زین) و (شۆرك).

## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ قەرەناز.

**باشووری:** ناڤەندا قەزا بەردەرەش.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ خرابە یاسین.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ نەزراوا.

خەلکێ گوندی ژ لایێ جڤاکی ڤە ژ عەشیرەتا گۆران تیرەبێن رەژگەری، زەنگەنە، شێخ بزێنی، بۆتانی نە، ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ئ هژمارا خەلکێ گوندی ٢٠١ کەس بوون.(١)، نها دبنە نێزیکی ٧٠ مالان و پتر ژ ٥٠٠ کەسان.

ژ شوینوارێن گوندی کەلا مەم و زین کو دیرۆکەکا گەلەك کەڤن هەیە و بلنداهییا وێ ١٨٠م، و گۆرستانا گوندی یا ل سەر کەلایێ و چەندین شوینوارێن کەڤن لێ د هێنە دیتن.

دیسان ل گوندی (کانی با) و (کانی مرازان) لێ هەنە، خەلکەك ل رۆژێن چوارشەمبی دهێن سەرەدانا وان دکەن و تەڤنا وان د لەشێن خۆ ددەن دا ژ نەخۆشیێن پیستی ساخ ببن.

ژ لایێ ئابووری ڤە ژیانا وان پتر ل سەر چاندنێ یە، ب تایبەتی گەنم و جەهـ و نیسك و نۆك و باقلك و گژنیژ و دارێن سپینداری، ژ بلی فێقی و مفای ژ بیرێن ئیرتیوازی بۆ چاندنا برنجی و چێکرنا حەوزێن ماسییان وەردگرن، دیسان تەرش و کەوالی و مێشێن هنگڤینی ژی ب خودانکەن.

# ناحیا رۆڤیا

سەعید بارانی

رۆڤیا ئێکە ژ ناحییێن سەر ب قەزا بەردەرەش ڤە و جهەکێ جیۆپۆلیتکی هەیە، دکەڤیتە لایێ باکووری سەنتەرێ قەزا بەردەرەش ب دووراتییا (١٦کم) و باشووری دەڤەردارییا ئاکرێ. ناڤێ رۆڤیا یێ ژ رێڤینگ هاتی، ب واتایا جهێ بێهنڤەدانا رێبوارێن کاروانێن بازرگانی ل سەر رێکا حەریر، چونکی دکەتە سەر رێکا بازرگانییا حەریری کو ئەو ژی قۆناغ قۆناغ بوویە، ل سەر زارێ خەلکی دبێژن دەنگێ رێڤین هاتییە گوهارتن و بوویە رۆڤی و پاشی بۆ رۆڤیا.

رۆڤیا گوندەکێ ناڤدارە ب هەبوونا تەکیا شێخ عەبدولعەزیز، دیسان سێریانەکا گرنگە بۆ پێکڤە گرێدانا هەرسێ پارێزگەهێن (دهـۆک، هەولێر، مووسل)، یان ژی بێژین پێکڤە گرێدانا هەرسێ قەزایێن (بەردەرەش، ئاکرێ، شێخان).

ل دووڤ بریارا جڤاتا وەزیران یا ژمارە (١٠) ل رۆژا ٢٠٠٦/١٠/١٢ێ یا ب قەزاکرنا بەردەرەش، رۆڤیا ژی وەکی ناحیە سەر ب قەزایێ ڤە هاتە دامەزراندن. ل ٢٠٠٧/٤/٨ێ بوویە ناحیە و ئێکەم رێڤەبەرێ وێ (قادر عەزیز قادر) بوو کو ل رۆژا ٢٠٠٧/٥/٢٧ێ دەست ب کارێ خۆ کری. نها ناحیە پێکهاتییە ژ ٤٣ گوندان و ٤١ ژ وان د ئاڤانە. رووبەرێ عەردێ وێ (٢٩٠کم) چوارگۆشەیە کو دبیتە (١١١٣٦٣) دۆنەمێن عەردی، ژ وان ژی (٩٤٦٦٤)دۆنـەم ب کێر چاندنێ دهێت و (١٦٦٩٩)دۆنەم ب کێرناهێن.

ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ هژمارا خەلکێ گوندێ رووڤیا ١٥٧ کەس بۆ.[٧]

ل دووڤ سەرژمێرییا تەخمینکرییا رێڤەبەرییا ئامارا پارێزگەها دهۆکێ بۆ سالا ٢٠١٦ێ هژمارا خەلکێ سەرانسەری ناحیێ ٣٧٠٥٠ کەسن ژ وانا ٢٨٢٤ کەس باژێری و ٣٤٢٢٦ گوندنشینن[٨].

## سنوورێن ناحیێ:

**باکووری:** ناحیا گردەسینە کو سەر ب قەزا ئاکرێ ڤەیە.

**باشووری:** ناحیا دارەتوویە کو دبێژنێ دەشتا ناڤکورێ.

ب رەنگەکێ گشتی خەلکێ ناحیا رۆڤیا ژ چوار عەشیرەتان پێکهاتییە ئەو ژی (گۆران، زێباری، سۆرچی، هەرکی). ژمارا خێزانێن ناحیێ (٥٩٣٠) سەرخێزانن کو دبنە (٣١,٢٥٣) کەس، ل سنوورێ باژێرڤانییا رۆڤیا ژمارا خێزانان د دەمێ بەرهەڤکرنا ڤێ نڤیسینێ دا (٦١٤) سەرخێزانن کو دبنە (٣٢٢٩) کەس و تێکدا کوردن.

هندەك کەس هەنە بۆ هندێ دچن کو جوهییان ئەڤ گوندە یێ ئاڤاکری و کارێ چاندنێ دکرن، پشتی هینگێ یاسین ئاغا ژ تیرەیا گێژ یێ هاتی و ل گوندی ئاکنجی بووی و پاشی (خدری) دگەل جویان تێکهەل بووینە و گوند فرەهتر لێ کرینە و جوی هەر یێن بەرەڤ ئسرائیلێ چووین و یێن کێم بووین.

## شوینوارێن رۆڤیا:

ڤی جهی شوینوارێن گرنگ تێدا دهێنە دیتن، ژ وانان (گرێ رۆڤیا) کو گرەکێ ناڤدارە، دیسان چەند شوینوارێن دی ژی هەنە وەکی:

١- کەلایا رۆڤیا: مێژوویەکا کەڤنا نەدیار هەیە و دبیت ل سەر ملێ ئێخسیرا هاتبیتە دروستکرن.

٢- بیرەکا ئاڤێ لێ هەیە و ب کەرپیچا هاتبوو نژنین، گەلەکا کەڤنە و مێژوویا دروستکرنا وێ نەدیارە و بەری چەند سالەکا هاتییە تێکدان.

٣- سێ ئاشێن ئاڤێ د سالێن بیستان و سیهان ژ سەدسالیا بیستێ ل سەر جۆکا جووجەر هەبوون، ئەو ژی: ئاشێ کامەلا کو یاسین ئاغای دانا بوو، ئاشێ جمك یا مالا شێخا بوو، خەندەك ئاش ئەو ژی یا ئیسماعیل ئاغای بوو و هێشتا شوینوارێ هندەك ژ وان دیارن.

## تەکیا رۆڤیا:

بابێ هەشتێ یێ شێخێن نها یێن رۆڤیا شێخ ئیسماعیل ولیانی کو ژ دایکبوویێ سالا (١٠٨٦مش) یە بەری (٣٠٠)سالان هاتییە ڤی گوندی کو ل وی سەردەمی عەشیرەتا خدری لێ د ئاکنجیبوون، ئەڤ شێخە ل ناڤ وان گەریا و پتریا وان کرنە مریدێن خۆ، پاشی دچیتە مووسل و ل وێرێ ژی گەلەك عەرەب و کورد دبنە دەروێش و خەلیفەیێن شێخی و هەر ل وێرێ ل مالا حەسەن پاشای کو والیێ مووسلێ بوو ئەو ژی دبیتە خەلیفەیێ وی، ل سالا (١١٦٣مش) وەغەرا داویێ دکەت و خەلکێ رۆڤیا وی ڤەدگەرینەڤە رۆڤیا و ل وێرێ ڤەدشێرن، کورێن وی شێخ یەحیایێ دێوانە و مروەت خان ژ سلێمانیێ دهێن و هەر ل جهێ گۆرێ وی تەکیایەکێ د دامەزرینن، پشتی چەند سالەکان ئاڤاهییەکێ رێك

سەنتەرێ ناحیا رۆڤیا



و پێك بۆ تەكیایێ دروست دكەن و هەتا نها چەندین جاران هاتییە نویژەنكرن. ئەڤ شێخە بەرزنجینە ل سەر تەریقەتا قادری و موریدێن خۆ ل پتریا جهێن كوردستانێ و ل سنە و سۆریا و ئوردن و گەلەك پارێزگەهێن عیراقێ هەنە.

ڤەكرنا خواندنگەهان ل ڤی جهی گیروو بوویە، ئەو ژی ژبەر رێگریا هندەك كەسێن دەستەلاتدار ل دەڤەرێ، هەروەك دهێتەڤەگێران د دەمێ خۆدا قایمقامێ ئاكرێ یەحیا جاف سەرەدانا گوندی دكەت و پێشنیازا ڤەكرنا خواندنگەهەكێ ل وێرێ دكەت، لێ ئەحمەد ئاغا سمایل ئاغا ناڤدار ب (ئەحمێ) ب بەهانەیا كو دێ زارۆكێن وان فێری كارێن خراب بن قەبیل نەكر، پاشتر ل سالا (١٩٧١) ێ خواندنگەهەكا سەرەتایی ل گوندی هاتە ڤەكرن و عادل ئیسماعیل (ژ مووسلێ) یەكەم رێڤەبەر و ئیلهام ئاكرەیی یەكەم مامۆستا بوویە ل گوندی و ل سالا ئێكێ بیست خواندكاران تێدا دخواند كو سێ ژ وان پەیمانگەهـ تەمامكرن. سالا (١٩٧٦)ێ ناڤنجیەك ژی لێ هاتە ڤەكرن و نها خویندكارێن (٢٥) گوندێن دەور و بەر دەوامێ لێ دكەن.

سالا (٢٠١٢)ێ سەنتەرەكێ رەوشەنبیری ژی لێ هاتییە ڤەكرن.

ژ لایێ وەرزشی ڤە یاریزانەك ب ناڤێ (خالد مشیر) ل سەر ئاستێ هەلبژارتییێن عیراقێ یاریا فوتبۆلێ دكەت خەلكێ ڤی جهی یە.

ژ لایێ سیاسی ڤە خەلكێ ڤێ دەڤەرێ ژی پشكداری د شۆرشێ دا كرینە و شەهید و بریندار داینە و كەتینە زیندانان و چوار جاران گوندێ وان هاتییە سۆتن و تالانكرن.

ژ لایێ ژیارا خەلكی ڤە ژیانا وان پتر ل سەر چاندنێ یە، ب تایبەت چاندنا گەنم و جەهـ و برنج و كرتۆپ و ... گەلەك دەرامەتێن دی، نەمازە ئاڤەكا زۆرا ژێر عەرد هەیە و گەلەكا نێزیكی عەردی یە، دیسان خەلكێ وێ تەرش و كەوالی ژی ب خودان دكەن(**).

## گوندێن ناحیا رۆڤیا:

### گوندێ زێلكەی عەبدولعەزیز:

گوند دكەڤیتە ناحیا رۆڤیا ل باكوورێ رۆژهەلاتێ قەزا بەردەرەش، رووبەرێ عەردێ وی (٢٧٥٠) دۆنمە، ناڤێ گوندی ژ دو برگان پێكهاتییە، زێلكە (زێ + لق)، واتە تایێ زێ، یان لقێ زێ چونكی وەكی جۆكەكا ئاڤێ مینا زێ تێرا دەرباز دبیت، ژێدەرێ وێ ژ گوندێ (زیلكا فاخر) بەرەڤ گوندێ جوجەری بچووك و پاشی زیلكا عەبدولعەزیزی دهێت، برگا دووێ ژی (عەبدولعەزیزە)، سەر ناڤێ شێخ عەبدولعەزیز گەیلانی هاتییە وەرگرتن كو مەزارێ وی ل گەلیێ ئاكرێ یە. ئەڤ گوندە ژ مێژە یێن كرینە وەقف بۆ شێخ عەبدولعەزیز گەیلانی، ژبەر هندێ ب ڤی ناڤی هاتییە ب ناڤكرن.

#### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ شێخانۆكە.

**باشووری:** گوندێ دەرێستان.

**رۆهەلاتی:** بانی بەردەسۆر.

**رۆژئاڤایی:** ناحیا رۆڤیا و گوندێ جۆجەری بچووك.

#### دیرۆكا گوندی:

چ ژێدەرێن باوەرپێكری نینن كو مێژوویا ڤی گوندی دیار بكەن، لێ ل دووڤ گۆتنا پیرەمێر و دانعەمران و ئەو گۆرستان و شوینوارێن هەین، دیرۆكا وی بۆ بەری پتر ژ (٤٥٠) سالان ڤەدگەریت و ژیان هەر تێدا یا بەردەوام بوویە و نەهاتییە چۆلكرن.

#### پێكهاتا گوندی:

خەلكێ گوندی هەمی ژ عەشیرەتا گۆران تیرەیا (شێخ بزێنی)نە، ژبەر كو ئەڤ گوندە دكەڤیتە دناڤبەرا هەردو عەشیرەتێن گۆران و سۆرچییان، زمانێ وان ژی شێوەزارەكێ تایبەت یێ هەی، دبیت ژ

هەمی عەشیرەتا گۆرانان جوداتر بیت.

ژمارا خەلكێ گوندی پتر ژ حەفتێ مالان و نێزیكی (٤٠٠) سەرخێزانانە.

ژیانا خەلكێ وی ب رەنگەكێ گشتی ل سەر چاندنێ یە، ب تایبەت چاندنا دێمی ژ گەنم و جەهـ و نیسك و نۆك و گوندۆران، ژ بلی ب خودانكرنا تەرش و كەوالی ژ پەز و بزن و چێلا و خودانكرنا مریشك و قازان، هەروەسان گەلەك ژێ مۆچەیان كو دناڤ دام و دەزگەهێن حوكمەتێ دا كاردكەن وەردگرن، لەوما نها كارێ چاندنێ ژ بەرێ كێمتر لێ هاتیە.

بۆ جارا ئێكێ خواندنگەهـ ل سالا (١٩٧٨-١٩٧٩)ێ لێ هاتیە ڤەكرن و هێلا كارەبێ ل سالێن هەشتیان گەهشتیە گوندی.

د بەرێ دا چوار ئاش ل ڤی گوندی هەبوون، شوینوارێن دو ژ وان ب ناڤێن (ئاشێ سمایل ئاغا و ئاشێ رەشید كۆر)ماینە و شوینوارێ هەردو ئاشێن دی نەماینە.

## گوندێ جوجەری گەورە:

ناڤێ گوندی پێكهاتییە ژ دو برگان (جوو) ب واتایا (جوی) و (جەر) ب واتایا (جەرك).

### پێكهاتا گوندی:

گوند ژ چەند بابكالان پێكهاتییە، ئەو ژی: (حاجی عەولا، عەمەرە شەل، عەبدلقادر تەها، حاجی مستەفا و عەبدول، هاب حەمۆ و عەلی رەمەزان، حاجی فەقێ خدر، عەلی شەرۆ، حاجی وەسمان، حاجی فەتاح، ئیبراهیم خدر) و هەر ئێك ژ وان نوینەرێ تیرەیەكا عەشیرەتێ یە، وەكی تیرەیێن: ( شێخ بزێنی و گێژ و خێل و موسەیی و عەبزێدی و شێخانی و بالەكی و قەمبەری)، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ٢٠٩ كەس بوون.[٩]

### شوینوار و جهێن كەڤنار:

ل ژووریا گوندی گرەك ب ناڤێ (ئاسنگران) هەیە، دبیت مێژوویا وی بۆ پێشی زایینێ ڤەدگەرێت و گەلەك جاران هەستیك لێ دهێنە دیتن، ئەڤە وێ چەندێ دگەهینت كو د كەڤندا گۆرستان بوویە.

عەردێ گوندی گەلەكێ نەرمە و كێم زویرك لێ هەنە و بەر گەلەك لێ د كێمن و عەردێ وان پتر ئاڤی یە و گەلەك گەنم و جەهـ و نیسك و نۆك و باقلكان لێ دچینن و هەر د كەڤندا گوندەكێ ب ناڤ و دەنگ بوویە ل نافكورێ ب چاندنا برنجی و كونجییان، دیسان دو سكر ژی ب ناڤێن (سكرێ میری و سكرێ دووبەستان) ل ڤی گوندی هەنە و چوار ئاشێن هێرانێ ل بەر كاردكرن. هەردو گوندێن جوجەر ژ گوندێن هەرە كەڤنن د دیرۆكێدا، دیرۆكنڤیس و گەروكێ ناڤدار یاقوت ئەلحەمەوی (١١٧٨-١٢٢٩)ز ئاماژە ب هەردوو گوندێن جوجەر كریە و گوتیە: ئەڤ گوندە دكەڤنە دەڤەرا ئاكرێ یا حەمیدی (العقر الحمیدیة)[١٠].

## گوندێ جوجەری بچووك:

گوند دكەڤیتە باكوورێ قەزا بەردەرەش و سەر ب ناحیا رۆڤیا ڤەیە، ئەڤ گوندە ل سالا (١٨٩٠)ێ بۆ ماوەیێ ١٢ سالان ناحیە بوو، پشتی سالا ١٩٠٢ێ و ل سەردەمێ حوكمێ ئوسمانییان ئێشەك ل گوندی بەلاڤ بووی و گەلەك مرۆڤێن وێ مرین ناحیە بۆ بەردەرەش هاتە ڤەگوهاستن. ناڤێ گوندی پێكهاتییە ژ دو برگان (جوو) ب واتایا (جوی) و (جەر) ب واتایا (جەرك).

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** ناحیا رۆڤیایە.

**باشووری،** گوندێ دۆستەكە.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ زێلكەی عبدالعزیزە.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ جوجەری گەورەیە.

## پێكهاتا گوندی:

خەلكێ گوندی ژ چەند بەرەبابەكان پێكدهێت ئەو ژی: ئەو ژی ژ تیرەیێن: (گێژ، رەشكەری، بۆت، شێخ ب زێنی، كاوانی).

ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ٣٢٧ كەس بوون.[11]

ژیارا خەلكێ وی ل سەر چاندنێ یە، ب تایبەتی گەنم و جەهـ و نیسك و نۆك و گوندۆر و برنج و ...هتد، هەژیە بێتەگۆتن ئەڤ گوندە یەك ژ گوندێن ناڤدارێن دەڤەرا گورانانە ب چاندنا برنجی، رووبەرێ عەردێ وی (٥١٠٠) دۆنەمن، یێ دابەشكری یە ل سەر چوار جۆرە زەڤیان (جوجر، مكاوە، گولوكەتەر، جەنگە).

سالا (١٩٧٠)ێ خواندنگەهـ لێ هاتیە ڤەكرن و كارەب ژی ل سالا (١٩٧٧)ێ گەهشتییە گوندی.

## گوندێ بەردەزیو:

دیرۆكا ئاڤابوونا گوندی ڤەدگەریتەڤە سالا (١٩٧٢)ێ، ناڤێ گوندی ژ هەبوونا بەرێ زیڤی ل سنوورێ ڤی گوندی هاتییە، ئەڤ جۆرە بەرە وەكی هسان بۆ سەقاكرنا داس و بڤر و شالۆكان دهاتە ب كارهینان، رووبەرێ عەردێ وی ٩٠٠ دۆنەمن.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** بانی بەردەسۆرە.

**باشووری،** گوندێ باروانە.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ چەمە.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ بەردەسۆرە.

### پێكهاتا گوندی:

گوند ژ ئێك بنەمال ژ عەشیرەتا سۆرچییان تیرەیا (تومەحالە) پێكهاتییە. گوند نها ١٣ مالن و ١٦ سەرخێزان و ژمارا ئاكنجیێن وی ٨٥ كەسن.

خواندنگەهـ بۆ جارا ئێكێ ل سالا ٢٠٠٢ێ هاتییە ڤەكرن و هێلا كارەبێ ژی سالا ١٩٨٩ێ گەهشتییە گوندی.

ژیانا خەلكێ وی ل سەر چاندنێ و ب خودانكرنا تەرش و كەوالی یە.

## گوندێ بەردەسۆر:

گوند دكەڤیتە رۆژهەلاتا بەردەرەش، دیرۆكا ئاڤابوونا وی ڤەدگەریتەڤە سالا ١٩١٨ێ، ناڤێ گوندی یێ هاتی كو كەلەك بەر لێ هەنە و ل وەرزێ هاڤینێ (سۆر دبن ژ گەرما)، رووبەرێ عەردێ وی ٨٤٥ دۆنەمن.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ پەلاسانە.

**باشووری،** گوندێ خارۆكە.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ بەردەزیو.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ باروانە.

### پێكهاتا گوندی:

ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ٢٨ كەس بوون.[12]، نها گوند پێكهاتییە ژ هەشت بنەمالان ژ تیرەیا (پیریال) عەشیرەتا سۆرچییان، و د بنە ١٩٠ مال .

سالا ١٩٧٩ێ خواندنگەهـ لێ هەبوو، هێلا كارەبێ ژی ل سالا ١٩٨٣ێ گەهشتییە گوندی.

ژیانا خەلكێ وی ل سەر چاندنێ و ب خودانكرنا تەرش و كەوالی یە.

## گوندێ نەزراوە:

گوند د كەڤیتە باكوورێ بەردەرەش، سەر ب ناحیا رۆڤیایە، ل دووڤ گۆتنا شارەزایێن گوندی پترە ژ سەد سالانە ژیان ل ڤی گوندی هەیە، ناڤێ وێ هاتییە كو بیرەكا ئاڤێ لێ هەبوو (نزە ئاڤ، نیزنیزك) ژێ د هات و پاشی بوویە نەزراوا.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێ پیرچاوش.

**باشووری:** ناڤەندا بەردەرەش.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ مەم و زین.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ كانی ئەسپانی گەورە.

**پێكهاتا گوندی:**

ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ٩٣ كەس بوون.[١٣]، نها خەلكێ گوندی پێكهاتییە ژ عەشیرەتا گوران تیرەیێن گێژ، میسەیی، كۆپی، كو د بنە ٩٢ خێزان و ٥٠٨ كەس.

ژیانا وان یا ئابووری ژی ل سەر چاندنێ یە، ب تایبەتی گەنم و جەهـ و نۆك و برنج و زەرزەواتی.

## گوندێ تۆبزاوە ژووری:

گوند دكەڤیتە باكوورێ قەزا بەردەرەش، سەر ب ناحیا رۆڤیا ڤەیە، سالا ١٩٦٠ێ یێ هاتییە ئاڤاكرن.

ناڤێ گوندی یێ ژ وێ چەندێ هاتی كو گوند ب خورتی و هێزا تۆپزی یا ژ مولكدارێن مۆسلی وەرگرتی.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێ دەربێستانی مەزن.

**باشووری:** گوندێ پەلاسانە.

**رۆژهەلاتی:** بانی بەردەسۆرە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ دەربێستانی بچووك.

**پێكهاتا گوندی:**

ل ئامارا ١٩٥٧ێ ئاماژە ب گوندێ طوبزاوە هاتیە كرن كو ١٢٨ كەسن، و ئاماژە ب گوندێ سەروكانی طوبزاوە هاتیە كو ٥٢ كەس بوون.[١٤]

ئەڤ گوندە ١٢٠ مالە كو دبنە ٦٠٣ كەس ژ دو بەرەبابێن عەشیرەتا سۆرچییان.

خەلكێ گوندی كارێ چاندنێ و ب خوادنكرنا تەرش و كەوالی دكەن و رووبەرێ عەردێ وێ (١٠٠) تغارن.

سالا ٢٠٠٠ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەكرن و كارەب ژی ل سالا ١٩٨٢ێ گەهشتییە گوندی.

## گوندێ تۆبزاوە نوێ:

دكەڤیتە باكوورێ قەزا بەردەرەش و سەر ب ناحیا رۆڤیا ڤەیە، سالا ١٩٩٢ێ هاتییە ئاڤاكرن، ناڤێ گوندی هەر هەمان واتایا تۆبزاوە ژووری یە.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێ دەربێستانی بچووكە.

**باشووری:** گوندێ بارەوانە كو سەر بە ناحیا دارەتووەیە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ پەلاسانە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ كربدەوە.

**پێكهاتا گوندی:**

ڤی گوندی دو تیرەیێن عەشیرەتا گوران لێ هەنە، ئەو ژی (شێخ بزێنی و چۆپانی). ژمارا خێزانێن گوندی (٣٥) سەرخێزانن كو دبنە (٤٥٠)كەس.

**زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:**

ژیارا خەلكی ل سەر چاندنێ یە، ب تایبەت گەنم و جەهـ و برنج و نیسك و نۆك و باقلك و شینكاتی، دیسان تەرش و كەوالی ژی ب خودان دكەن، و رووبەرێ عەردێ وان یێ چاندنێ (٤٠٠) تغارەیە.

سالا ١٩٩٤ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەكرن و هێلا كارەبێ ژی ل سالا ٢٠٠٧ێ بۆ گوندی هاتییە راكێشان.

## گوندێ پیربوب:

گوند دكەڤیتە باكوورێ قەزا بەردەرەش و سەر ب ناحیا رۆڤیا ڤەیە، سالا (١٩٤٥)ێ هاتییە ئاڤاكرن.

ناڤێ گوندی پێكهاتییە ژ دو برگان، (پیر) واتە زەلامێ ئایینی یێ ئێزدییان و (بوب) ب واتایا هەبوونا شوینوارێن ئێزدییان.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ كربەویل مەزنە.

**باشووری،** گوندێ كانی هەسپانی بچووكە.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ پیرچاوشە.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ كەندالەسۆرە.

### پێكهاتا گوندی:

خەلكێ گوندی هەمی عەشیرەتا گۆرانن ژ تیرەیا (گێژ) ژ بەرەبابێ (رەزا مشیر ئاغا)، پێكهاتییە ژ (١٠) مالان كو دبنە (١٥) سەرخێزان و (٦٠) كەس.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

خەلكێ گوندی هەمی مژوولی چاندنێ نە، ب تایبەت گەنم و جەهـ و نیسك و نۆك و باقلك و برنج و كونجی و زەرزەواتێن هاڤینێ و ماش و ...هتد.

سالا ١٩٧٩ێ كارەب بۆ گوندی هاتییە راكێشان.

## گوندێ حەسەنی:

گوند دكەڤیتە باكوورێ قەزا بەردەرەش، ل سەر ناڤێ گوندی دو بۆچوون هەنە، یا ئێكێ ئەوە كو مەزارێ شێخەكی ب ناڤێ (شێخ حەسەن) یێ لێ هەی و هەتا نها مەزارێ وی مایە و یا دووێ ژی ئەوە كو ئەڤ گوندە یێ (یونس پێغەمبەری) بوو و ئەڤ گوندە ب خێر و بەرەكەت و (حەسەنات) بوو. مێژوویا گوندی ژی یا دیار نینە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ هەزار جۆتە.

**باشووری،** گوندێ بامەرزێیە.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ كربەویلی بچووكە.

**رۆژئاڤایی،** رووبارێ خازرە.

### پێكهاتا گوندی:

گوند ژ گەلەك تیر و عەشیرەتان، وەكی (شكاك، زەنكەنە، بۆت، رەژگەری، سۆرچی، خدری، رۆژبەیانی) پێكهاتییە، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ١٢٧ كەس بوون.[١٥]، و نەها دبنە (١٣٠) مال و ژمارا خێزانان (١٦٨) سەرخێزانە كو دبنە (٩٥٧) كەس.

### شوینوار و جهێن كەڤنار:

ژ شوینوارێن گوندی كەڤنە خرابەكێ مەزن هەیە كو ل سەر دەستێ جوهیا هاتبوو دروستكرن، هەروەسان پرەكا كەڤن ژی ب ناڤێ پرا حەسەنی لێ هەیە.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ڤی گوندی ژبەر رووبارێ خازری ئاڤەكا زۆر لێ هەیە و ئەڤە ژی پالدەر بوویە كو خەلكێ گوندی پتر چاندنێ بكەن وەكی چاندنا گەنم و جەهـ و برنج و گێزەر تڤر و كونجی و وەكی گۆتنەكێ ل وێ دەڤەرێ هەیە دبێژیت «دەچینە حەسەنی، دا تڤر و گێزەر بچینین».

سالا (١٩٨١)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هەبوو و نها هەرسێ قۆناغێن خواندنێ ل گوندی هەنە. سالا (١٩٨٠)ێ كارەب ژی گەهشتییە گوندی.

## گوندێ خەمیس كوچك:

گوند دكەڤیتە باكوورێ قەزا بەردەرەش سەر ب ناحیا رۆڤیا ڤەیە، دیرۆكا گوندی ڤەدگەریتەڤە سالا (١٩٠٠)ێ.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ كربەویل.

**باشووری،** گوندێ دولێجان.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ كەندالە سۆرە.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ بامەرزێیە.

### پێكهاتا گوندی:

گوند پێكهاتییە ژ ئێك بەرەباب، ئەو ژی (گێژ)ن، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ

گوندی ١٢٧ کەس بوون.[١٦]، نها ژمارا مالێن وان (١٢) مالە و دبنە (١٥) سەرخێزان.

ڤی گوندی (١٠٠٠)دۆنەمێن عەردێ هەنە و ژبانا خەلکێ وی ل سەر چاندنێ یە.

سالا (٢٠٠١)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەکرن و هێلا کارەبێ ژی ل سالا (١٩٨٢)ێ بۆ گوندی هاتییە راکێشان.

## گوندی دولیجانی گەورە:

ژ گوندێن کەڤنێن قەزا بەردەرەشە سەر ب ناحیا رۆڤیایە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێن دولێجان تارق و دولیجان ئەحمەد ئاغا

**باشووری:** گوندێ ئیسماوە

**رۆژهەلاتی:** گوندێ کانی هەسپان

### پێکهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە ل سالا ١٩٤٨ێ ژ ئالیێ محەمەد فارس ئاغایێ زێباری ژ مولکدارێن مووسلی هاتییەکرین، نها زێباری پێن شەهی لێ ئاکنجینە، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ گوندی ١٣٨ کەس بوو ، نها خەلکێ گوندی پترن ژ ٣٧٠ێ کەسان.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

گوندەکێ ئاڤییە، بیرێن سەرعەردی هەنە، لەوما ژی خەلکێ گوندی چاندنا دێم و ئاڤی دکەن و رەنگێن جوداێن زەرزەواتی دچینن هندەك ژی تەرش و کەوالی خودانکەن.

### شوینوارێن گوندی:

د ئەتلەسا شوینوارێن عیراقێ دا ئاماژە ب گرەکێ شوینواری ب ناڤێ گردێ دولیجانی گەورە (خرابە دولیجان کبیر) هاتییەکرن.

سالا ١٩٦٨ێ خواندنگەهـ ل گوندی

گوندێ دولێجان کەتۆ



هاتییەڤەکرن، سالا ١٩٩٤ێ قوناغا ئامادەیی ژی ل گوندی هاتییەڤەکرن.

## گوندێ دولێجان کەتۆ:

گوند دکەڤیتە باکوورێ قەزا بەردەرەش و سەر ب ناحیا رۆڤیا ڤەیە، ئەڤ گوندە ل سالا (١٩٩٢)ێ ژ گوندێ دۆلیجان جودابوویە و هاتییە ئاڤاکرن.

### پێکهاتا گوندی:

پێکهاتییە ژ بنەمالەکا مەزن کو ب بنەمالا (کەتۆ) ژ عەشیرەتا گۆران و ژ تیرەیا (عەلی شارك) د بەرنیاسن.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ دولێجان مەزنە.

**باشووری:** گوندێ ئیسماوایە.

**رۆژهەلاتی:** کانی هەسپانی مەزنە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ گرێگایە.

گوند پێکهاتییە ژ (٣١) سەرخێزانان کو دبنە (٢٥٠) کەس.

ژیانا خەلکێ وی ل سەر چاندنێ و ب خودانکرنا چێلایە.

خواندنگەهـ ل سالا (١٩٩٩)ێ ل گوندی هاتییە ڤەکرن.

## گوندێ شێخانۆك سۆرچی:

گوند دکەڤیتە باکوورێ قەزا بەردەرەش و سەر ب ناحیا رۆڤیا ڤەیە، ناڤێ گوندی یێ ژ دو بڕگان هاتی، (شێخ) ژ شێخێن بزێنیا و (نۆك) کو ئاخا ڤی گوندی یا گونجایە بۆ چاندنا نۆکان، ژبەر کەڤناتیا گوندی مێژوویا وی ژی دیار نینە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ زێلکەی فەخری.

کوندێ شێخانۆك سۆرچی



**باشووری**: زێلکەی عبدالعزیزە.

**رۆژهەلاتی**: گوندێ بانی بەردەسۆرە.

**رۆژئاڤایی**: گوندێ کێلە سپیە.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا سۆرچی تیرە و بنەمالێن (چاپۆتی، تومحل، مام سال، شێخ بزنی، سەرمردی)نە، ژمارا مالێن وان (١٠٠) مالن و دبنە (١٤٠) سەرخێزان.

ل ڤی گوندی دو شوینوار هەنە، ئەو ژی (سنگەسار و هەوار کەلۆك).

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ڤی گوندی (٣٠٠) تغارێن عەردی هەنە و ژیانا خەلکێ گوندی ل سەر وی عەردی و چاندنێ یە، ژ بلی خودانکرنا تەرش و کەوالی ژی.

خواندنگەهـ ل سالا (١٩٧١)ێ لێ هاتییە ڤەکرن و هێلا کارەبێ ژی ل سالا (١٩٨٠)ێ بۆ هاتییە راکێشان.

## گوندێ عەلی شانە:

گوند دکەڤیتە باکوورێ قەزا بەردەرەش و سەر ب ناحیا رۆڤیا ڤەیە، سالا (١٩٧٥)ێ هاتییە ئاڤاکرن و ناڤێ وێ ژ وێ چەندێ هاتییە کو کەسەك ب ناڤێ (عەلی) ل گوندی هەبوو و (شانە) ژ جۆتیاران بۆ مولکداران وەردگرت و ناڤێ گوندی بۆ (عەلی شانە).

### سنوورێن گوندی:

**باکووری**: گوندێ ئۆمەرسێنانە.

**باشووری**: بازێرڤانیا ناحیا روڤیایە.

**رۆژهەلاتی**: گوندێ یەکمالەیە.

**رۆژئاڤایی**: گوندێ سیگردکە.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا زێباری و تیرەیا چاربۆتی نە، گوند نێزیکی (٤٠)مالانە و ژمارا خەلکێ وی (٣٣٠)کەسە.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیارا خەلکێ گوندی ژی ل سەر چاندنێ یە، وەکی گەنم و جەهـ و برنج و فێقی و ...هتد.

سالا(١٩٩٤)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەکرن و هێلا کارەبێ ژی ل سالا (١٩٧٩)ێ بۆ گوندی هاتییە راکێشان.

## گوندێ یەکمالە:

گوند دکەڤیتە باکوورێ قەزا بەردەرەش و سەر ب ناحیا رۆڤیا ڤەیە، ناڤێ گوندی یێ هاتی کو ل بەراهیێ تنێ ئێك مال بوو، دیرۆکا گوندی ژی ڤەدگەرێتەڤە بۆ سەردەمێ ئوسمانییان.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری**: گوندێ خرابە نوێ.

**باشووری**: ناحیا روڤیایە.

**رۆژهەلاتی**: گوندێ کێلە سپیە.

**رۆژئاڤایی**: گوندێ ئۆمەرسێنانە.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا گۆران تیرەیا (گێژ)ن، ل دووف سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلکێ گوندی ٤٦ کەس بوون.[17]، نها ژمارا خانیێن گوندی (٤٥)مالن و (٥٣)ێ سەرخێزان لێ دژین.

ژیارا خەلکێ گوندی ل سەر چاندنێ و ب خودانکرنا تەرش و کەوالی یە و رووبەرێ عەردێ گوندی (٢١٠٠) دۆنەمن، دیسان هندەك ژ خەلکێ گوندی مۆچەخۆرن.

## گوندێ پەلاسان:

گوند دکەڤیتە باکوورێ رۆژهەلاتێ قەزا بەردەرەش و سەر ب ناحیا رۆڤیا ڤەیە، سالا (١٩٥٧)ێ هاتییە ئاڤاکرن. ناڤێ گوندی یێ ژ پەیڤا (پەلا)، ب واتایا بارینا بارانەکا بۆش و (سان) ب واتایا ئاسانی، یان ساناهی هاتی، واتە ب ئاسانی پەلا لێ دکەڤیت و بوویە (پەلائاسان) و بوویە پەلاسان.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ دەربێستانی بچووکە.

**باشووری،** بارەوانە .

**رۆژهەلاتی،** گوندێ بەردەسۆرە

**رۆژئاڤایی،** گوندێ تۆبزاوا نوێیە.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا سۆرچییانە، ژ دو بەرەبابان (تۆومحال و مام سال) پێکهاتینە، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلکێ گوندی ١٦١ کەس بوون.[١٨]، نها بوینە نێزیکی (٢٧٠) مالان و (٢٨٠) سەرخێزانان ل گوندی هەنە کو دبنە (١٣٠٤) کەس.

ژیارا خەلکێ گوندی ل سەر چاندنێ و خودانکرنا تەرش و کەوالی یە و (٤٩٤٨) دۆنەمێن عەردێ چاندنێ لێ هەنە.

سالا (١٩٩٧)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەکرن و کارەب ژی ل سالا (١٩٨٠) گەهشتییە گوندی.

## گوندێ خرابە سەعدون:

گوند دکەڤیتە باکوورێ رۆژهەلاتێ قەزا بەردەرەش و سەر ب ناحیا رۆڤیا ڤەیە، دیرۆکا ئاڤاکرنا گوندی ڤەدگەرینتەڤە سالا (١٩٧٥)ێ، ناڤێ گوندی یێ هاتی کو گرەك ل ڤی جهی هەبوویە و ئەو کەسێ ل سەر وی گری ئاکنجیبووی ناڤێ وی (سەعدون) بوو و پاشی گوند بەرفرەهـ بوویە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ خەلیلکانە.

**باشووری،** گوندێ هەزار جۆتە.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ گلێنەیە کو سەر بە ناحیا گردەسینە.

**رۆژئاڤایی،** رووبارێ خازری یە.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا زێباریانە ژ تیرەیا (بانی)، ژمارا ئاکنجیێن گوندی (١٣٠) سەرخێزانن کو دبنە (٦٠٠) کەس.

ژیارا خەلکێ گوندی ل سەر چاندنێ یە، ب تایبەتی رەز و گەنم و جەهـ و برنج و ...هتد.

سالا (١٩٨٥)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەکرن و هێلا کارەبێ ژی ل سالا (١٩٧٩)ێ گەهشتییە گوندی.

## گوندێ ئۆمەرسێنان:

گوندەکێ کەڤنە دکەڤیتە باکوورێ قەزا بەردەرەش، ل دووڤ گۆتنا دانعەمران دیرۆکا گوندی ڤەدگەرینتەڤە بۆ بەری (١٥٥) سالان، ناڤێ وی یێ ژ (ئۆمەر) هاتی کو سێ برا بووینە و هندەك ژی دبێژن ئۆمەر شڤان بوو و سێ نان ڤێ بوون.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ خرابە نوێ.

**باشووری،** گوندێ عەلی شانەیە.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ یەکمالەیە.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ گلێنەیە کەسەر بە ناحیەی گردەسێنە.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی ژ هەردو عەشیرەتێن (گۆران و زێبار)یانە، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلکێ گوندی ٤٥٤ کەس بوون.[١٩]، نها گوند نێزیکی (٢٠٠)مالانە و (٣٠٠) سەرخێزان تێدا دژین کو ژمارا خەلکێ وی دبنە (٢٧٥٤)کەس.

ل ڤی گوندی دو شوینوار ب ناڤێن (خرابە کەنکر و شکەفتیان) لێ هەنە.

ژیارا خەلکێ وی ل سەر چاندنێ و خودانکرنا تەرش و کەوالی یە و رووبەرێ عەردێ وی یێ چاندنێ (٩٠٠) تغارن.

سالا (١٩٧١)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەكرن و كارەب ژی ل سالا (١٩٧٣)ێ گەهشتییێ و بنكەهێ ساخلەمیێ ل سالا (١٩٧٥)ێ بۆ هاتییە دروستكرن.

## گوندێ بامەرزێ:

ئەڤ گوندە دكەڤیتە باكوورێ رۆژئاڤایێ قەزا بەردەرەش، سالا (١٩٤٥)ێ هاتییە ئاڤاكرن، ناڤێ گوندی پێكهاتییە ژ دو برگان، (با) كو دەشتەكا بەر بایە و (مەرەزێ)، یان مەرەزە كو ب واتایا (برنج) دهێت و ئەڤ دەشتە یا ب ناڤ و دەنگە بۆ چاندنا برنجی.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ حەسەنی یە.

**باشووری،** گوندێ گركەجووە

**رۆژهەلاتی،** گوندێ خەمیس كچكە

**رۆژئاڤایی،** رووباری خازری.

### پێكهاتا گوندی:

خەلكێ گوندی ژ عەشیرەتا گۆرانن ژ تیرەیا (گێژ)، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ٥١ كەس بوون.[٢٠]، نها پێكهاتییە ژ نێزیكی (٤٣) سەرخێزانان كو دبنە (٢٢٢) كەس.

ژ شوینوارێن گوندی (گردی گەورەی بامەرزێ).

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا خەلكی ل سەر چاندنێ و ب خوادنكرنا تەرش و كەوالی یە مینا چێل و گامێشان و رووبەرێ عەردێ چاندنێ (١٢٢٣) دۆنەمن، ژ وانان (٦٠٠) دۆنەمێن ئاڤی و (٦٢٣) دۆنەمێن دێمی نە.

سالا (١٩٨٠)ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەكرن و كارەب ژی هەر د ڤێ سالێ دا گەهشتییە گوندی.

## گوندێ دەربێستان بچووك:

ئەڤ گوندە دكەڤیتە باكوورێ قەزا بەردەرەش، سالا (١٩٥٠)ێ هاتییە ئاڤاكرن، ناڤێ وی ژ هندێ هاتییە كو گوند دكەڤیتە سەر رێكا باخچە و بیستانان و وەكی دەرگەهەكی بوو بۆ وان باغ و بیستانان، واتە گوند (دەرگەهێ بیستانان) بوو لەوما ئەو ناڤ ل سەر هاتییە دانان.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ جەنكەیە.

**باشووری،** گوندێ تۆبزاوەی نوێ یە.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ پەلاسانە.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ گریدەوە.

### پێكهاتا گوندی:

سێ عەشیرەتێن (سۆرچی و گۆران و زێباری) ل گوندی دژین، تێكدا (٩٢) سەرخێزانن دبنە (٤٠٨) كەس.

### ژ شوینوارێن ڤی گوندی:

(خرابە عەیشێ، چیاماشان، گوركان).

ژیانا خەلكێ وی ل سەر چاندنێ یە، ب تایبەتی گەنم و جەهـ و برنج و .... هەروەسان تەرش و كەوالی ژی ب خودان دكەن و رووبەرێ عەردێ وان (٢٥٠) دۆنەمن.

سالا (١٩٨١)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەكرن و هێلا كارەبێ ژی ل سالا (١٩٨٧)ێ گەهشتییێ.

## گوندێ خرابە واژ:

گوند دكەڤیتە باكوورێ قەزا بەردەرەش و سەر ب ناحیا رۆڤیا ڤەیە، سالا (١٩٧٥)ێ هاتییە ئاڤاكرن، ناڤێ گوندی یێ هاتی كو گوند دكەڤیتە سەر گرەكێ و گیایەكێ رەنگ (واژە) سپی ل سەر شین دبت لەوما ئەو ناڤ ل سەر هاتییە دانان.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ جوجەری مەزنە.

**باشووری،** گوندێ قەرەنازە.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ دۆستەكە.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ پیرچاوشە.

### پێكهاتا گوندی:

خەلكێ گوندی ژ عەشیرەتا گۆران تیرەیا (خدرین) ە، نێزیكی (٧٢) مالانە كو دبنە (٤٠٥) كەس.

سالا (١٩٩١)ێ گوند یێ هاتییەڤالاكرن و خەلكێ وێ راگوهاستبوونە كۆمەلگەهەكا زۆرە ملێ ل دەڤەرا هەولێرێ و ل سالا (١٩٩٢)ێ ڤەگەریانە سەر جهێن خۆڤە.

ژیارا خەلكێ گوندی ل سەر چاندنێ یە، ب تایبەتی برنج و گەنم و جەهـ و نیسك و نۆك و باقلك و كونجی و شینكاتیێن هاڤینی.

خواندنگەهـ ل سالا (٢٠٠٥)ێ ل گوندی هاتییە ڤەكرن و كارەب ژی ل سالا (١٩٧٩)ێ گەهشتییە گوندی.

## گوندێ خرابە یاسین:

گوند دكەڤیتە باكوورێ رۆژهەلاتێ قەزا بەردەرەش و سەر ب ناحیا رۆڤیا ڤەیە، خرابەگوند بوویە و سالا (١٩٧٥)ێ هاتییەڤە ئاڤاكرن، كەسێ ئەڤ خرابەیە ئاڤاكری ناڤێ وی (یاسین) بوویە و ب ناڤێ وی هاتییەناڤكرن.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ دۆستەكە.

**باشووری،** گوندێ مەموزینە.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ گریدەوە.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ قەرەنازە.

### پێكهاتا گوندی:

خەلكێ گوندی هەمی گۆرانن ژ عەشیرەتا رەشكەری و ژ تیرەیێن (شاسوار و باجلانن).

گوند ل سەرهلدانێ هاتییە چۆلكرن و ل سالا (١٩٩٢)ێ خەلكێ وی ڤەگەریایە ڤە.

ژیارا خەلكێ وی ل سەر چاندنێ یە، ب تایبەتی گەنم و جەهـ و برنج و نیسك و نۆك و باقلك و شینكاتی و ...هتد، هەروەسان تەرش و كەوالی ژی ب خودان دكەن.

سالا (٢٠٠٥)ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەكرن و كارەب ژی ل سالا (١٩٧٩)ێ گەهشتییێ.

## گوندێ گربەویل بچوك:

گوند د كەڤیتە باكوورێ قەزا بەردەرەش، د بنەرەتدا ناڤێ گوندی ل سەردەمێ ئوسمانییان و نەخشەیێ دابەشكرنا عەردی ل یاسایا چاكسازیا چاندنێ ددەمێ حوكمەتا عەبدولكەریم قاسمی ژی دا ب ناڤێ (گربەگۆل) هاتبوو كو ل كەرتێ ٧٥ێ بەردەرەش بوو. رووبەرێ عەردێ چاندنێ ل دووڤ وێ دابەشكرنا ل سالا ١٩٦٣ێ هاتییە ئەنجامدان ١٢٩٠ دۆنەمە كو ب سەر ١٣ جۆتیاران دا هاتبوو دابەشكرن.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێن گلینە و جەریرە.

**باشووری،** گوندێ خەمیس كچكە.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ گربەویل مەزن.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ حەسەنیێ.

### پێكهاتا گوندی:

نها گوند ٢٤ مالن ژ عەشیرەتێن (زەنگەنە، شێروانی، خاڤۆبین، شكاك، گێژ، خێل).

د مێژوویا ڤی گوندی دا دهێتەڤەگێران كو سێ گوند ب ڤی ناڤی هاتینە ئاڤەدانكرن، هەروەسان شوینوارێن سێ خرابە گوندان ژی لێ هەنە.

ژیانا خەلكێ وی ل سەر جۆتیاریێ و ب خودانكرنا تەرش وكەوالی یە.

## گوندێ گربەویل گەورە:

دیرۆكا ئاڤابوونا ڤی گوندی ڤەدگەریێتەڤە سالا ١٩٦٦ێ. ناڤێ گوندی یێ ژ ها . ۆنا گرەكی هاتی كو جۆرێن گولا ل سەربوون. رووبەرێ عەردی وی یێ چاندنێ ٣٠ تغارێن عەردی نە.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ کلێنە.

**باشووری:** گوندێ پیرچاوشە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ دیناران.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ گریەوێل بچوك.

**پێکهاتا گوندی:**

ئەڤ گوندە ٢٥ مالن کو دبنە ٤٠ خێزان سەر ب عەشیرەتا سۆرچییانە.

سالا ١٩٩٩ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەکرن و هێلا کارەبێ ژی ل سالا ١٩٨٩ێ گەهشتییە گوندی.

ژیانا خەلکێ وی ل سەر چاندنێ بە مینا گەنم و جەهـ و نۆك و برنج و باجانسۆرك و خیار و شتی و ...هتد.

## گوندێ سێ گردك:

گوند دکەڤیتە باکوورێ رۆژئاڤایێ قەزا بەردەرەش، ناڤێ گوندی ژ هەبوونا سێ گردان، ب واتایا سێ گران هاتییە کو ل گوندی ێێن هەین، یێ ئێکێ ب ناڤێ (گردی گۆرستانە) و چەند مالەك ل سەر دروستکرینە و یێ دووێ ب ناڤێ (گردی شێخ ئەحمەد)ە کو گۆڕێ وی شێخی لێ هەیە، گوندێ سێێ ژی ب (خرابە) هاتییەناڤکرن.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندی ئومەرسینایە.

**باشووری:** جۆجەری مەزن.

**رۆژهەلاتی:** ناحیا رۆڤیا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ دینارانە.

**پێکهاتا گوندی:**

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا گۆران تیرەیا (گێژ)ن، پێکهاتا وان یا سەرەکی ژ چوار بەرەبابان پێکدهێت ئەو ژی: ئەیوب و تەیب کو هەردو براێن ئێکن و یاسین عەبدولقادر و خدر خودێدا، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلکێ گوندی ١٣٥ کەس بوون.[٢١]

گوند سێ جاران ژ لایێ حکومەتێن عیراقێ ڤە هاتییە سۆتن.

سالا (١٩٩٧)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن، نها دو کارخانەیێن بلۆکان و دو پرۆژەیێن پەلەوەران لێ هەنە و ئەڤ گوندە دهێتە هەژمارتن یەکەمین گوندێن دەڤەرا گۆرانان کو پرۆژەیێ پەلەوەران ل سالا ١٩٩٩ێ لێ هاتییە ڤەکرن.

ژیانا خەلکێ وان ژی ل سەر چاندنێ یە، ب تایبەتی چاندنا گەنم و جەهـ و برنج و نیسك و نۆك و فستەقێن عەردی و کونجی و باجانسۆرك و خیار و تەماتە و فلفل و ...هتد، ڤی گوندی سێ بیرێن ئیرتیوازی ب کووراتییا نێزیکی (٢٠٠م) هەنە و ئاڤا وان بخۆ بێ ماتۆر دەردکەڤیت.

## گوندێ چەمە:

ژ گوندێن قەزا بەردەرەشە، دکەڤیتە دووراتییا (٢٤کم) ژ زێ مەزن، د کەڤندا ئەڤ گوندە دارستانەکا سرۆشتی هەبوویە، واتە (چەم) بوویە و گەلەك جۆرێن گیاندارێن کیڤی لێ هەبووینە لەوما گۆتینێ (چەمە)، ژمارا ئاکنجییێن وی (٢٦٣٠) کەسن کو د بنە (٥٠٣) سەرخێزان.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** کێلە و بێلە رەشە.

**باشووری:** خارۆکە.

**رۆژهەلاتی:** زێبێ مەزن.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ بەردەزیوە.

**پێکهاتا گوندی:**

د کەڤندا گۆران ل ڤی گوندی هەبوون، لێ پشتی سالێن پێنجیان و پشتی سۆرچییان هندە زەڤی کڕین ئەو ژی لێ ئاکنجیبووینە، ژ بنەمالێن ڤی گوندی: (شێخ عەزیز، سەید ئەدهەم، فەقێ عەولا، یاسین ئەحمەد، یاسین حسین، مام هەیاس، شێخ ئوسعەد، نەبی چاوشین، باکە سۆر، مەلا

زەردێی، برایم مەرجان، پووتە، برایم عوسمان، مام کەچەل، سێودین، رەمەزان عەرەب، حەسەن زارێ، مام حەمەدان، عەزێ، سمایل بەسێ).

سالا (١٩٧٤)ێ ئەڤ گوندە کەتییە بەر هێرشێن رژێما عیراقێ و بۆ دەمێ دو رۆژان ب فرۆکەیان هاتییە بومبابارانکرن و دان و دکاکێ وان هەمی سۆتن و گوند ژ لایێ زەلامێن رژێمێ ڤە هاتە تالانکرن.

## شوینوار و جهێن دیارێن گوندی:

گرەك ل ژێریێ گوندی ب ناڤێ (گردی حاجی) هەیە، دیرۆکا وی ڤەدگەریێتەڤە سەردەمێ ئاشووریان و گەلەك جاران تشتێن کەڤن لێ دهێنە دیتن، دیسان گەلەك جهێن دیار ل گوندی ب ڤان ناڤان هەنە: (هاش هاش کەرە، سورك، قەلەموك، سۆرەبان، بن سەنگەرە، ناوئاڤار، تەیرۆك، دۆل حەبیب، بنەوان، بنگرد، گۆمێ، سەرقەلات، کەرکەزی، جۆخین، قورەبەگ، باریکایی، سێ کوچکە، چەولك، بانیێ قولارەیێ).

بۆ یەکەم جار سالا (١٩٧١)ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەکرن کو هینگێ (٢٥) خویندکار لێ هەبوون و تا نها ژی هەر یا بەردەوامە، تنێ ل سالا (١٩٧٤)ێ ژ ئەگەرێ شەری دەوام لێ نەهاتییەکرن، سالا (١٩٨٢)ێ هێلا کارەبێ گەهشتییە گوندی و سالا (١٩٨٥)ێ بیرەکا ئیرتیوازی لێ هاتییە کۆلان.

ژین و ژیارا خەلکێ گوندی ل سەر چاندنا دەرامەتێن دێم و ئاڤی یە، مینا: گەنم و جەهـ و نیسك و نۆك و باقلك و ...هتد، هەروەسان ل هاڤینان ژی یا ب ناڤ و دەنگە ب خیار و باجانسۆرك و فلفل و گوندۆر و شتیان، و هندەك ژ خەلکێ گوندی تەرش و کەوالی ژ پەز و بزن و چێلا ب خودانکەن.

## گوندێ دەربێستان:

گوند دکەڤیتە باکوورێ قەزا بەردەرەش، ناڤێ وی ژ وێ چەندێ هاتییە کو د کەڤندا گەلەك بیستانێن چاندنێ لێ شیندکرن و ب ڤی ناڤی هاتییە ناڤکرن، رووبەرێ عەردێ وی (١١٠) تغارن، گوند (١٢٠) مالە

گوندێ چەپە



کو دبنە (١٣٢) سەرخێزان و ژ دەهـ بابكالان پێكدهێت.
گوند ژ گوندێن هەرە كەڤنە، ل دووڤ گۆتنا دانعەمرێن گوندی ئەڤە (١٦٥) سالن ژیان تێدا یا بەردەوامە.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری،** گوندی زێلكەیە.
**باشووری،** گوندی پەلاسانە.
**رۆژهەلاتی،** گوندێ بانی بەردەسۆرە.
**رۆژئاڤایی،** گوندی جوجەری بچووكە.

**پێكهاتا گوندی:**

ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ دوو گوند ب ڤی ناڤی هەبوون، دەرێستان بچووك ٩٤ كەس بوون، دەربستان گەورە ٩٨ كەس بوون[٢٢].

دو شوینوارێن كەڤن ل گوندی هەنە، گردی دەرێستان كو د كەڤیتە نیڤا گوندی و یێ دووێ (مەرقەدێ شێخ بایەزید)ە، چەند كەلوپەلێن كەڤن ل گوندی هاتینە دیتن و ل نك هندەك ژ خەلكێ گوندی د پاراستینە.

سالا (١٩٧٥)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە دروستكرن و هێلا كارەبێ ژی ل سالا (١٩٨١)ێ بۆ هاتییە راكێشان.

ژیانا خەلكێ گوندی ل سەر چاندنێ و كرێكاری و مۆچەیانە.

## گوندێ دۆستەك:

گوند دكەڤیتە باكوورێ قەزا بەردەرەش ل دەشتا نافكورێ، ناڤێ گوندی ژ وێ چەندێ هاتییە كو ل سەر رێكێ بوویە و رێكا گەلەك خەلكی تێ كەتییە و وەسان گەلەك مێهڤان بۆ دچوون و زوو دبوونە دۆست دگەل خەلكی و مێهڤان دۆست بووینە و ژبەر هندێ بوویە دۆستەك. گوند پێكهاتییە ژ (٨٢) مالان و (١٠٦) سەرخێزانان كو د بنە (٥١٧) كەس.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری،** گوندی جۆجەری مەزن.
**باشووری،** گوندی قەرەنازە.
**رۆژهەلاتی،** گوندی گریدەو.
**رۆژئاڤایی،**گوندی خرابەواژە.

سالا (١٩٩٥)ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەكرن و نها قۆناغێن سەرەتایی و ناڤنجی (بنەرەت) لێ هەنە.

عەردێ گوندی گەلەكێ ب زاخە بۆ چاندنێ و ژیانا خەلكێ وی ل سەر چاندنێ یی، ب تایبەت گەنم و جەهـ و نۆكان، ژ بلی خودانكرنا تەرش و كەوالی.

## گوندێ كانی ئەسپانی بچووك:

ئەڤ گوندە ل سالا ١٩٧٠ێ هاتییە ئاڤاكرن، ناڤێ وی یێ ژ كانی هاتی كو گەلەك كانی لێ هەنە، رووبەرێ عەردێ وی دگەهیتە ١٣٢٠ دۆنەمان.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری،** گوندێن پیرچاوش و پیربۆیە.
**باشووری،** گوندێ ئیسماوا.
**رۆژهەلاتی،** گوندێ كانی ئەسپانی گەورەیە.
**رۆژئاڤایی،** گوندێ دۆلیجان مەزن.

**پێكهاتا گوندی:**

ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ١١٨ كەس بوون[٢٣]، هەژیە بێژین د سەرژمێریێدا تنێ ئاماژا ب گوندەكی ب ناڤێ كانی ئەسپان هاتیە كرن، نها ژمارا مالێن گوندی دگەهنە ١٥ مالان و نێزیكی ٢٥ خێزانن، گوند ژ دو بنەمالان پێكدهێت، هەردو ژ تیرا خدرینە ژ عەشیرەتا گۆران.

ژ جهێن شوینواری ل ڤی گوندی (گردی قولە رەش) و گەلەك جاران كەلوپەل ل ڤی گوندی

دهێنه دیتن، نها كەسەكی ژ خەلكێ گوندی ب ناڤێ (حاجی محەمەد سەلیم حەسەن) گەلەك ژ كەرەستەیێن كەڤن و كەلەپۆری یێن دەڤەرێ ل جەم خۆ پاراستینە.

سالا ٢٠٠٠ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەكرن و هێلا كارەبێ ژی ل سالا ١٩٨٩ێ گەهشتییە گوندی.

ژیانا خەلكێ گوندی ل سەر چاندنێ و ب خودانكرنا تەرش و كەوالی یە.

## گوندێ كانی ئەسپانی گەورە:

گوند دكەڤیتە باكوورێ قەزا بەردەرەش، ناڤێ گوندی یێ هاتی وەكی دانعەمرێن گوندی د بێژن د كەڤندا هەسپ ل ڤی گوندی هەبووینە و خەلكێ وی خودان هەسپان بووینە و ناڤ ژ هەبوونا هەسپان هاتییە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ پیرچاوشە.

**باشووری:** گوندێ ئامیانە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێن نەزراوا و خرابە واشە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ ئیسماوا.

### پێكهاتا گوندی:

گوند پێكهاتییە ژ پێنج عەشیرەتان، ئەو ژی (گۆران، زێباری، مزووری، زراری، وەستای ئاسن كوت) و ١٥ بنەمالن و نێزیكی ١٣٦٥ خێزانن.

ل ڤی گوندی شوینوارێن پێنج ئاشان هەنە.

ژیانا خەلكێ گوندی ل سەر جۆتیارێ یە وەكی گەنم و جەهـ و نیسك و نۆك و برنج و باجانسۆرك و كونجی و ... هتد.

## گوندێ كەنداله سۆر:

مێژوویا ئاڤاكرنا ڤی گوندی ڤەدگەرێتەڤە سالا ١٩٦٨ێ، ناڤێ وی یێ هاتی ژبەر ئاخا وێ یان عەردێ وی یێ سۆرە. رووبەرێ عەردێ وی دگەهیتە نێزیكی ٤٠٠ دۆنەمان.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ گربەویل گچكە.

**باشووری:** گوندێ دۆلیجان.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ پیربۆب.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ خەمیس كچكە.

ئەڤ گوندە ژ ئێك بنەمالا عەشیرەتا گۆرانە، ژمارا خانیێن وان ٤ مالن و ٤ خێزان.

ژیانا خەلكێ وی ل سەر چاندنێ یە، ب تایبەتی گەنم و جەهـ و نۆك وبرنج و ... هتد.

## گوندێ ئیسماوا:

گوند د كەڤیتە باكوورێ قەزا بەردەرەش، ناڤێ وی هەتا نها نەهاتییە زانین كا ژ چ هاتییە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ دۆلیجانێ.

**باشووری:** ناڤەندا قەزا بەردەرەش.

**رۆژهەلاتی:** كانی ئەسپانی گەورە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ گرێكایە.

ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ٢١٣ كەس بوون.[٢٤]، ل ڤی گوندی شوینوارەك هەیە كو پێكهاتییە ژ سێ گرا خەلك د بێژنێ (سێ چیا) و شوینوارێن دیوار و مالان لێ د هێنە دیتن، دیسان هندەك شوینوارێن دی ژی هەنە وەكی (خرابە وەلی) و (باسكی فاتمە) و (حەسەن).

سالا (١٩٧٨-١٩٧٩)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەكرن، ژێدەرێ ئاڤا وان یا ڤەخوارنێ ژی سێ بیرێن ئیرتیوازی نە ژ بلی بیرێن دی بۆ چاندنێ كو ژ لایێ خەلكی ڤە هاتینە كۆلان و د كەڤندا بنگەهێ كشتوكالی لێ هەبوویە.

ژێدەرێ ژیانا خەلكێ وی ل سەر چاندنێ یە، ب تایبەت چاندنا گەنمی و جەهی و نیسك و نۆك

و دەرامەتێن هاڤینی، و هندەك ژێ فەرمانبەر و مامۆستا و پێشمەرگەنە.

## گوندێ پیرچاوش:

ناڤێ گوندی پێکهاتییە ژ دو برگان (پیر + چاوش)، (پیر) کەسایەتیەکێ ئایینی یە و (چاوش) ل نك ئێزدییان ب واتایا چاڤدێر دهێت، پیرچاوش ب واتایا چاڤدێرەکێ یان پۆلیسەکێ وی سەردەمی دهێت، و ناڤێ چەند گوندێن دەڤەرێ ب پیر دەست پێ دکەت، وەکی (پیر چاوش و پیر بۆب و پیر بەنك) کو هەتا هێرشێن میرێ رەواندزێ سالا ١٩٣٢ێ ئێزیدی ل دەڤەرێ دژیان.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێن دیناران و سیکردکە.

**باشووری:** گوندێن کانی ئەسپان و نەزراوا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێن جۆجەری مەزن و خرابە واژە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ پیربۆب.

### پێکهاتا گوندی:

ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلکێ گوندی ٣٢٧ کەس بوون.[٢٥]، نها ژمارا مالێن گوندی ٢٠٢ مالن و ئاکنجیێن وی ١٠٧٠ کەسن.

### شوینوارێن گوندی:

- ئاسنگەران: شوینوارەکێ کەڤنێ گوندی یە و دبیت د دەمێ خۆدا ژ وێرێ هاتبن گوند دروستکرین.
- چیایێ مەند: قەبرستانەکا کەڤنە ل گوندی.
- خرابە: جهەکێ بلندە ل گوندی و دبیت مێژوویا ڤان خرابەیان گەلەکا کەڤن بیت.
- کانی قولەرەش:

بۆ جارا ئێکێ سالا ١٩٧٠ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەکرن، سالا ١٩٨٠ێ هێلا کارەبێ گەهشتییە گوندی. ل سالا ١٩٧٠ێ یەکەمین ترومبێل گەهشتییە ڤی گوندی و سالا ١٩٧٥ێ کەسەکی ب ناڤێ حسێن خەلیل محەمەد یەکەمین تەلەفزیۆن ئینایە ڤی گوندی.

عەردێ ڤی گوندی بۆ چاندنێ یێ ب زاخە لەوما

گوندێ پیرچاوش



ژیانا خەلكێ وی ژی پتر ل سەر جۆتیاریێ یە و نێزیكی ٢٠ بیرێن ئاڤێ لێ هەنە، ژ بلی گەلەك كانییا و رووبارەكی و بەرهەمێن گرنگێن چاندنێ ل ڤی گوندی گەنمە و برنجێ وی ژی یێ ب ناڤ و دەنگە، پرۆژەیێ پەلەوەران ژی لێ هەیە.

## گوندێ گركەجوو:

ب گردەجۆ ژی دهێتەناڤكرن، د كەڤیتە سەر رووبارێ خازری، دیرۆكا ئاڤابوونا وی ل دووڤ گۆتنا دانعەمران ڤەدگەریێتەڤە بەری پتر ژ ١٥٠ سالان.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ بامەرزێ.

**باشووری،** گوندێ گرێگایە.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ دۆلیجان.

**رۆژئاڤایی،** كۆمەلگەها كەلەكچی یە.

### پێكهاتا گوندی:

گوند ژ چەند بنەمالان وەكی بنەمالێن (سۆفی ئەحمەد، سەعید بۆتی، رەشید بۆتی سلێمان محەمەد و قەرەنییان) پێكهاتییە، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ١٢٥ كەس بوون.[٢٦]، نها دبنە نێزیكی ٨٠ مالان ژ عەشیرەتا گۆرانن.

ژ شوینوارێن كەڤنێن گوندی خرابە سوار و خرابە قەبرستان.

خواندنگەهـ ل سالا ١٩٧٨ێ لێ هاتییە ڤەكرن.

ژیانا خەلكێ وی مینا پتریا دەڤەرێ ل سەر چاندنێ و ب خودانكرنا تەرش و كەوالی یە.

## گوندێ گرێگا:

گوند د كەڤیتە بەر رەخێ ئاڤا خازری، دیرۆكا ڤی گوندی گەلەكا كەڤنە و ل دووڤ گۆتنان ڤەدگەریێتەڤە بەری زایینێ، ناڤێ وی د بەرێ دا (خاوسان) بوو، هەروەك دهێتەڤەگێران كو ل ڤی جهی ل سەر رووبارێ خازری شەرەك د ناڤبەرا ئەسكەندەرێ مەقدونی و شاهێ ئیرانێ دارۆشی روودا و خوین هاتەرشتن. ناڤێ وی یێ نها پێكهاتییە ژ دو برگان (گرد + گا)، چونكی خەلكێ گوندی ل سەر وی گری گا ب خودانكرن.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ بامەرزێ.

**باشووری،** گركەجوو.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ دۆلیجانی مەزن.

**رۆژئاڤایی،** چەمێ خازری و ناحیا كەلەكچی.

### پێكهاتا گوندی:

خەلكێ گوندی ژ دو تیرەیێن عەشیرەتا گۆرانانن، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ٩٢ كەس بوون.[٢٧]، ددەمێ بەرهەڤكرنا ڤێ نڤیسینێدا ژمارا مالێن گوندی ٧٠ مالن كو دبنە ١١٢ خێزان و ٦٥٦ كەس.

سالا ٢٠٠٠ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەكرن.

ژیانا خەلكێ وی ل سەر چاندنێ یە، ب تایبەتی گەنم و جەهـ و نیسك و نۆك و باقلكان و مفای ژ خازری بۆ چاندنێ د بینن، و مێشێن هنگڤینی ژی ب خودانكەن.

## گوندێ هەزار جۆت:

گوندەكێ كەڤنارە دكەڤیتە سەر رووبارێ خازری بەرامبەر ناحیا قەسرۆكێ، ناڤێ گوندی یێ هاتی ژبەر زۆر چاندنا رەز و باغ و شینكاتی لێ د هاتەكرن و نە هەر هزار جۆت، بەلكی چەند هزار جۆت لێ د هاتنە كرن، دیرۆكا گوندی ڤەدگەریێتەڤە سەردەمێ ئوسمانییان.

### پێكهاتا گوندی:

موسلمان و جوی و فەلە یێن ل ڤی گوندی ژیاین، لێ جوی ل سالێن پێنجیان چووینە ئسرائیلێ. ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ١٧٨ كەس بوون.[٢٨]، سالێن شێستاندا ژ

سەدساليا چوويى زێبارى ێێن هاتينە ڤى گوندى و ێێن لێ ئاكنجيبووين، نها گوند نێزيكى (١٣٠) مالانە و (٢٨٧) سەرخێزان لێ دژين و ژمارا خەلكێ وى (١٤٩٥)كەسە.

ل ڤى گوندى شوينوارێن كەڤن هەنە، وەكى بەرێ ئاشێ ئاڤێ كو هەتا نها يێ ماى و ديسان گۆڕێ (عەلى عەبدولا زەينەب) كو ل سالا (١٣٢٣مش) هاتيە شەهيدكرن و گرەكێ كەڤن ژى ل ڤى گوندى هەيە.

سالا (١٩٦٩)ێ بۆ ئێكەم جار خواندنگەهـ ل ڤى گوندى هاتيە ڤەكرن و مامۆستايێن وى ژ مووسل دهاتن و ل سالا (١٩٨٠)ێ ئاڤاهييەك بۆخواندنگەهێ ب بەر و چيمەنتوى هاتيەئاڤاكرن و هەر د ڤێ سالێ دا بيرەكا ئيرتيوازى ژى بۆ گوندى هاتە كۆلان.

سالا (١٩٦٥)ێ مزگەفتەك و سالا (٢٠٠٣)ێ دێرەك ژى ل گوندى هاتنە چێكرن.

وەكى دانعەمر دبێژن و د پەرتووكێن فلكلۆرێ كوردى (پێنج داستانى كوردەوارى- ياسين حەسەن) دا هاتين خانێ لەپ زێرين د داستانا (كەلا دمدم) دا خەلكێ ڤى گوندى بوويە:

**خانەك رابوو ژ هەزار جۆتى**
**مال و حالێ (كرت و مالێ) خۆ فرۆتى و ...هتد.**

ڤى گوندى دو جۆكێن ئاڤێ هەنە، ئێك يا ل سەر رووبارێ خازرى كو دبێژنێ رووبارێ فەلا و يا دووێ ژێدەرێ وێ ژ گوندێ گلگۆرانە كو دبێژنێ جۆكا ميرى.

ژيارا خەلكێ گوندى ل سەر چاندنێ يە، وەكى گەنم و جەهـ و نيسك و نۆك و برنج و كونجى و شينكاتى و ...هتد، رووبەرێ عەردێ ڤى گوندى ژى (٢٠٠٠)دۆنەمن[٢٩].

## گوندێ ديناران:

گوندە سەر ب ناحيا روڤيا يە، دكەڤيتە سەر ريكا سەرەكى، دهێتەگۆتن ئەڤ گوندە ژ تاپۆيا حكومەتا عيراقى ل سالا ١٩٣١ێ هەر دۆنمەك ب دو دينارێن وى سەردەمى هاتيەكرين لەوما ب ديناران هاتيەناڤكرن.

### سنوورێن گوندى:

**باكوورى،** گوندێ گلينە

**باشوورى،** گوندێ پيرچاوش

**رۆژهەلاتى،** گوندێ سێ گردك

**رۆژئاڤاى،** گوندێ گريەوێل

### پێكهاتا گوندى:

ئەڤ گوندە د بنياتدا يێ عەشيرەتا گۆرانان بوويە، پشتى ل سالا ١٩٧٤ێ كەتيە بەر هێرشا حكومەتا عيراقێ و خەلكێ وى دەربەدەر بووينە ل سالا ١٩٧٥ێ حكومەتا عيراقێ دايە عەشيرەتا زێبارييان و نها زێبارييێن بانى ل گوندى ئاكنجينە. ل دووڤ سەرژمێرييا سالا ١٩٧٥ێ هژمارا خەلكێ گوندى ١٦٢ كەس بوو ، نها ١٢٠ خێزان ل گوندى دژين دبنە دەوروبەرێن ٦١٣ كەسان.

### ژێدەرێن ژيارا خەلكێ گوندى:

- خەلكێ گوندى مژوولى چاندنا دەخل و دانێ دێم و ئاڤينە وەك گەنم و جەهـ و برنج و نوك و كونجى، هەروەسان زەرزەواتى دچينن و رەز ژى هەنە، هندەك ژ وان مژوولى خودانكرنا تەرش و كەوالى نە.

### شوينوارێن گوندى:

گوندەكێ خرابەيێ كەڤنار ل نێزيكى گوندى هەيە، هەروەسان د ئەتلەسا شوينوارێن عيراقێ دا ئاماژە ب دو شوينوارێن ڤى گوندى ب ناڤێ گرێ ديناران (گرد ديناران) و گۆرستانا ديناران قبرستان ديناران هاتيەكرن .

سالا ١٩٩٤ێ خواندنگەهـ ل گوندى هاتيەڤەكرن.

## گوندێ قەرەناز:

گوند دكەڤيتە باكوورێ قەزا بەردەرەش، ناڤێ گوندى ژ دو پەيڤان (قەرە + ناز)، د هێتەڤەگێران

سەردەمێ ئوسمانییان چەند مالەك ل ڤی گوندی بوون ژنەکا رەنگ ئەسمەر ب ناڤێ ناز مەزناتی ل وان دکر، پشتی شکەستنا دەولەتا ئوسمانی ئەڤ گوندە ژی هاتیەبەردان و مایە ڤالا، جارەکا دی دناڤبەرا سالێن (١٩٤٦-١٩٥٠)ێ گوند هاتیەڤە ئاڤاکرن و ب هەمان ناڤ هاتیەناڤکرن.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ دۆستەك.

**باشووری:** گوندێ مەم و زینە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ خرابە یاسین.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ نەزراوایە.

ئەڤ گوندە ژ چەند تیرە و بەرەبابان پێکهاتییە، وەك تیرەیێن (گێژ، بۆت، شاسواری، موسەیی، بەرزنجی و...هتد) و بەرەبابێن وەك: موشیر یونس، قادر تاهر عەبدولعەزیز، عەبدوللا فەقی، مەولود تەها عەبدولعەزیز، رەشید قادر قادر، محەمەد ئەحمەد حسێن وسەعید خدر ئەحمەد...هتد، گوند ژ (١٦١) سەرخێزانان پێکهاتییە کو دبنە (٨٠٦) کەس.

ئابوورێ گوندی مینا پتریا دەڤەرێ ل سەر چاندنێ یە، ب تایبەت گەنم و جەهـ و باقلك و نۆك و برنج و کونجی و ...هتد.

سالا (١٩٧٥)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەکرن و کارەب ژی ل سالا (١٩٦٩)ێ گەهشتییێ.

**گوندێ قەرەناز**



# ناحیا دارەتوو

مووتەلیب جەزنی

## دارەتوو

دارەتوو ئێك ژ ناحیێن قەزا بەردەرەشە، بەری ببیتە ناحیە گوندەك بوو سەر ب ناحیا بەردەرەش، ب دووراتییا (١٠کم) دکەڤیتە رۆژهەلاتی سەنتەرێ قەزا بەردەرەش. ب بریارا حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ (سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران) ژمارە ٨٤٤ ل ٢٠٠٧/٤/٢٩ بوویە ناحیە[1]. یەکەم رێڤەبەرێ ناحیێ هەڤال محەمەد سەلیم بۆ. ژ بلی ناڤەندا ناحیێ چەند فەرمانگەهـ ژی وەك: بازێرڤانی و پۆلیس و پشکەکا کارەبێ و ئاسایش و ئاگرڤەمراندن ل دارەتوو هەنە. ل دووڤ سەرژمێریا تەخمینکریا رێڤەبەریا ئامارا پارێزگەها دهۆکێ بۆ سالا ٢٠١٦ هژمارا خەلکێ سەرانسەری ناحیێ ٣٣٥٧٠ کەس، ژ وانا ٤٦٩٢ کەس بازێری و ٢٨٨٧٨ کەس گوندنشینن.

## سەنتەرێ ناحیا دارەتوو

دهێتەڤەگێران بەری نێزیکی ٢٥٠ سالان باپیرێن خەلکێ گوندی ژ دەڤەرا ئاکویان یا سۆران هاتینە ڤی جهی و لێ ئاکنجیبوونە و ئەو ژ عەشیرەتا رەژوکەری نە.

## سنوورێن دارەتوو:

**باکووری:** گوندێ گریدەو.

**باشووری:** گومزەرد

**رۆژهەلاتی:** گوندێ مۆریلان.

**رۆژئاڤای:** گوندێ دوگوندان.

ل سەر ناڤێ وێ ژی دبیت بۆ هندێ ڤەدگەرێت کو د بەرێدا گەلەك (دار توی) لێ هەبووینە و ژبەر هندێ ب وی ناڤی هاتیەناڤکرن. ئەڤ گوندە (ناحیە) چ جاران نەهاتییە چۆلکرن و هەردەم ئاڤەدانبوویە. ل سالا ١٩٩٧ێ ل دەمێ جۆتکرنێ ل نێزیکی گرێ (حاجی سلێمان) ل نێزیکی قورەبەگی دارەتوو کێلیەك هاتییە دیتن ل سەر نڤیسی بوو (قبر الامیر بهاء الدین سلیمان بن داوود مرحف الحمدی، توفی فی نصف شعبان اثنتی عشر ق )، ئەو کێلی دەست بۆ دەستی یا هاتییە فرۆتن، تا گەهشتییە وەلاتێ عەرەبستانا سعودیێ.

## پێکهاتا دارەتوو:

موسلمانن، ژ چەندین بنەمالان سەر ب چەند تیرەبێن عەشیرەتا گۆران ژ وانا: (قەمبەری،

کاسەرەشی، دزەیی، چۆپانی، شاسواری) پێکهاتییە. ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلکێ گوندی ٨٤٩ کەس بوون.[٢]

## شوینوارێن دارەتوو:

کەڤنە گوندەك ب ناڤێ (قەلاتۆك) لێ هەیە، لێ مێژوویا وی یا دیار نینە و بەری گوندێ دارەتوو هەبوو. هەروەسان چەند خرابە گوند ژی لێ هەنە، وەکی (حەجی مستەفا، خرابەی ئاشی، خرابەی مەوك)، کو گەلەك جاران گلینە لێ دهێنە دیتن.

د بەرێ دا دارەتوو ٢١ هزار دۆنەمێن عەردێ چاندنێ هەبوون، لێ پشتی هەردو گوندێن بارەوان ل سەر وی عەردی هاتینە ئاڤاکرن، عەردێ وان ژی دابەش بوو.

بۆ جارا ئێکێ ل سالا (١٩٤٤)ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەکرن، نها ژی سێ خواندنگەهـ لێ هەنە، ئێك ژ وان خواندنگەهان ل سالێن شێستان هاتییە دروست کرن و هەردووێن دی ل سالێن (٢٠٠٦-٢٠١١) هاتینە دروست کرن و نها تا قۆناغا شەشێ ئامادەیی لێ هەیە.

کارەب بۆ جارا ئێکێ ل سالا (١٩٨١)ێ گەهشتییە گوندی، هەروەسان بنگەهێ ساخلەمیێ ژی ل سالێن هەشتیان گەهشتییێ.

## ژێدەرێن ئاڤێ:

د بەرێ دا خەلکێ گوندی مفا ژ کانییەکێ ب ناڤێ (کانیە سۆرکە) وەکی ژێدەرێ ئاڤێ وەردگرتن، ناڤێ کانییێ ژ هەبوونا بەرەکێ سۆر دناڤ کانیێ دا، کو خەلکێ دەڤەرێ دبێژنێ (تات)یێ هاتی، وی بەری وەکرییە کو رەنگێ ئاڤێ سۆر بیت و ناڤێ کانییا ئاڤا سۆر ل سەر بێتە دانان، تا نها ژی ئەو کانی مایە و چەند مال مفای ژێ وەردگرن، لێ نها خەلکێ گوندی ب رەنگەکێ گشتی مفای ژ شەش بیرێن ئیرتیوازی وەردگرن، یا ئێکێ ل سالا (١٩٥٧)ێ هاتییە لێدان و یا دووێ د سالێن

سەنتەرێ ناحیا دارەتوو



شێستاندا و هەر چوارێن دی ل سالا (١٩٩١)ێ.

رووبەرێ عەردێ چاندێ ل ڤی گوندی د گەهیتە (١٣٥٨٥) دۆنەمان، ژ وانان (٣١٠٦) دۆنەم ب کێر چاندنێ ناهێن، ژ بەروبوومێن چاندنێ ژی باراپتر گەنم و جەهن، هەروەسان پەزی و بزنا و چێلان ژی ب خودان دکەن، زێدەباری پەلەوەرێن مالی مینا مریشک و عەلۆک و قاز و وەردەکان[٣].

گیاندارێن کێڤی وەک: ریڤی و تیری و کێرویشک و گورگن ل دەڤەرێ دهێنە دیتن.

## گوندێن ناحیا دارەتوو:

وەکی دیار سرۆشتێ دەڤەرا دارەتوو ب رەنگەکێ گشتی وەکی ئێکە و پتریا وێ دەشتە، لەوما ژیارا خەلکێ وێ ژی گەلەک یا ژێک جودا نینە، خەلکێ وێ ب رەنگەکێ بەرفرەهـ دان و دکاکا دچینن، ب تایبەت گەنمی و جەهی، هەروەسان نۆک ژی دهێنە چاندن و چاندنا وان باراپتر چاندنەکا دێمی یە و یا گرێدای بارانانە، و تا نها مفا ژ هەردو رووبارێن (خازر و زێ مەزن) بۆ چاندنێ گەلەک نەهاتییە وەرگرتن.

دناڤ سرۆشتێ وێ دەڤەرێ دا ب رەنگەکێ گشتی گیاندارێن کێڤی ژی دهێنە دیتن، مینا کێرویشک و تیری و گورگ و حەفتیار، هەروەسان سیخور ژی ل دەڤەرێ دهێنە دیتن....

### گوندی بارەوان گچکە:

بارەوان گچکە: ب دووراتییا (١٠)کم دکەڤیتە باکوورێ ناحیێ.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ وێ ژ تیرا (بەراوی) عەشیرەتا (گۆران)ن. گوند ژ (١٥) خێزانان پێکدهێت، کو ژمارا خەلکێ وێ

کێلیا قەبرەکێ کەڤن ل ناحیا دارەتوو



دبنە (٧٠) کەس.

ڤی گوندی مێژوویەکا کەڤنا هەی، وەکی دبێژن ڤەدگەرێتەڤە پتر ژ (٢٠٠) سالان. و ژبەر کەڤناتییا گوندی نەهاتییە زانین کا ناڤێ گوندی ژ چ هاتییە. گوند ل سالا (١٩٦١) ێ بێ هاتییە چۆلکرن و جارەکادی ل سالا (١٩٩١)ێ بێ ئاڤا بوویەڤە. ڤی گوندی خرابە گوندەکێ ب ناڤێ (خرابەی بارەوان) بێ هەی و پارچێن گلینەیی و تشتێن دی لێ د هێنە دیتن.

بۆ جارا ئێکێ ل سالا (١٩٩١)ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەکرن، ئەو ژی خانییەکێ ئاخێ بوو، پاشی ئاڤاهییەکێ نوی ل گوندێ ڤاتیسی بۆ هاتە ئاڤاکرن، نها تا پۆلا پێنجێ بنەرەتی لێ دخوینن و پشتی هینگێ خویندکارێن وان دچنە گوندێن دەور و بەران بۆ تەمامکرنا خواندنا خۆ. سەبارەت کارەبێ ژی ئەو ژی ل سالا (١٩٩٣)ێ یا گەهشتییێ.

ژێدەرێ ئاڤا گوندی ژی بیرەکا ئیرتوازی یە. ئەردێ گوندی پترە ژ (١٠٠٠) دۆنەمان، ژبەر نەبوونا چ ژێدەرێن سەرەکی بۆ ئاڤدانێ دێ بینین چاندنا گوندی هەمی دێمی یە[٤].

## گوندێ بارەوان گەورە:

ئەڤ گوندە ب دووراتییا (٦,٥)کم د کەڤیتە باکوورێ ناحیا دارەتوو ب رێکەکا نە ڤێرکری.

### پێکهاتا گوندی:

پترییا خەلکێ وێ ژ تیرا (رەشکەری) یێن عەشیرەتا (گۆران)ن، سێ خێزان ژ (سۆرچیان) و دو خێزان ژ (هەرکییان) ژی لێ د ئاکنجی نە.

گوند ل سالا ١٩٥٦ێ ب ناڤێ سێ گردکان هاتییە ئاڤاکرن، پشتی هینگێ ناڤێ گوندی هاتییە گوهارتن، بێ بزانن هۆیێ وێ چیە. ژمارا خەلکێ گوندی نێزیکی (٦٥٠) کەسانە.

### شوینوارێن گوندی:

دو خرابە گوند ب ناڤێن (خرابەی بارەوان) و (خرابەی هاشمی) یێن هەین، لێ مێژوویا وان یا دیار نینە و نەهاتییە زانین کا ل چ دەم و ژ لایێ کێڤە هاتینە دروستکرن.

جارا ئێکێ ل سالێن هەشتیان ژ سەدسالییا بیستێ خواندنگەهـ لێ هاتییەڤەکرن، ئاڤاهییەکێ ئاخێ بوو، پاشی ل سالا (١٩٩٤) ێ ئاڤاهییەکێ نوی ل گوندی هاتەئاڤاکرن. سالا (١٩٨٢)ێ کارەبا گەهشتییە گوندی.

ژێدەرێ ئاڤا ڤەخوارنا گوندی ژی، دو بیرێن ئیرتیوازی نە.

چاندنا گوندی ژی ل سەر دێمی و ئاڤی یە. ژ بلی گەنم و جەهـ و نۆکان، بیستانێن ئاڤی ژی ژ ترۆزی و خیار و گوندۆر و شوتی و ... هتد هەنە[٥].

## گوندێ بەرگێل (هەنجیرۆك نوێ):

بەرگێل (هەنجیرۆك نوێ)؛ ب دووراتییا (١٥)کم ب رێکەکا نیڤ ڤێرکری دکەڤیتە باشوورێ ناحیێ و زێ مەزن دکەڤیتە باکوورێ گوندی.

ناڤێ گوندێ بەرگێل یێ ژ پەیڤا (بەر + گێر) هاتی، ژبەر چەند (گیراوەیەك - ب دەڤۆکا دەڤەرێ) کو جهێ گوندی یێ وەسانە هەمی زویرکن و گوند بخۆ یێ ل ئەردەکێ دەشت، ژبەر هندێ یێ گۆتینێ (بەرگێر) و پاشی ناڤ یێ هاتییە گوهارتن و بوویە (بەرگێل). سەبارەت ناڤێ دووێ ژی یێ هاتی کو د بەرێ دا گەلەك دارێن هژیرا (هەنجیر) لێ هەبوون.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ ڤی گوندی ژ عەشیرەتا (بۆت)ن، ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلکێ گوندی ١٠٢ کەس بوون[٦]، د دەمێ بەرهەڤکرنا ڤێ نڤیسینێدا گوند (٩٠) خێزانان بخۆڤە دگریت کو دبنە (٥٢٥) کەس.

### شوینوارێن گوندی:

گرەك ب ناڤێ (جومعە) یێ ل نێزیکی گوندی هەی و نها ئەو گر بوویە گۆڕستان. دیسان جهەك

ب ناڤێ (بابلبێز) لێ هەیە، گەلەك جاران گلینە و تشتێن كەڤن وەكی شوینوار لێ دهێنە دیتن.

ڤی گوندی دیرۆكەكا كەڤنا هەی و دبێژن ڤەدگەریتەڤە بۆ بەری پتر ژ (١٢٠) سالان، چونكی چەند خانیێن كێم لێ ماینە.

ل سالا (١٩٨٢)ێ بۆ جارا ئێكێ خواندنگەهـ لێ هاتیە ڤەكرن، ئەو ژی ئاڤاهیەكێ ئاخێ بوو، سالا (٢٠١٢)ێ ئاڤاهیەكێ مۆدێرن بۆ هاتیەئاڤاكرن و تا پۆلا هەشتێ بنەرەتی لێ دخوینن، پشتی ڤێ قۆناغێ تەمام دكەن خویندكارێن وان بەرێ خۆ ددەنە كۆمەلگەها (بشیریان) كو نێزیكترین گوندە ژ بەرگێل بۆ تەمامكرنا خواندنا خۆ.

سەبارەت كارەبێ ژی، ئەو ژی بۆ جارا ئێكێ ل سالا (١٩٨٤) ێ گەهشتیە گوندی.

## ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

دو بیرێن ئیرتیوازی نە، یا ئێكێ ل سالا (١٩٨٩)ێ یا هاتیەكۆلان، بەری ئەڤ بیرە بێنە كۆلان، خەلكێ گوندی مفا ژ زێیێ مەزن وەردگرت، كو تنێ (٢) كم ژ باشوورێ گوندی دوورە.

گوندی (٢٧٠٠) دۆنەمێن ئەردێ چاندنێ هەنە و چاندنا وان یا سەرەكی دێمی یە[٧].

# گوندێ بەنێنان:

ب دووراتییا (١٦) كم ب رێكەكا نیف ڤێركری دكەڤیتە باكوورێ سەنتەرێ ناحیا دارەتوو، ژ گوندێن مەزنە ل دەڤەرێ.

دیرۆكا ڤی گوندی یا كەڤنە و ل دووڤ چەند ژێدەرێن تۆماركرنا زەڤیان، ئەو تۆمار ڤەدگەرێنەڤە سالا (١٨٩٢)ێ، گوند لە وی سەردەمی هەبوو، كو بنەمالا (عەلی ئاغا)ی ئەو گوند یێ ئاڤاكری، گوند ل سالا (١٩٦٤)ێ یێ هاتیە چۆلكرن و جارەكادی ل سالا (١٩٧١)ێ یێ هاتیە ئاڤاكرن ڤە.

## پێكهاتا گوندی:

پتریا خەلكێ وێ ژ تیرەیا (رەشــكــەری) یا عەشیرەتا (گــۆران)ن، ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ١١٨ كەس بوون.[٨]، نها ژمارا خێزانێن گوندی د گەهنە (٦٠٠) خێزانن، كو دبنە (٣٨٠٠) كەس[٩].

## شوینوارێن گوندی:

ل نێزیكی ڤی گوندی ب دووراتییا (٤) كم كافلەگوندەك ب ناڤێ (حاجی بەگ) یێ هەی، كو دبیت دەمەكی دا یێ ئاڤا بوویە و شوینوارێن وی گوندی دیارن، لێ نەهاتیە ئاڤاكرن.

گوند ژ چوار بنەمالێن سمایل ئاغا، كوێخا عەزو، عەلی زارەی، عەلی سۆفی پێكدهێت.

بۆ جارا ئێكێ خواندنگەهـ ل سالێن پێنجیان لێ هاتیە ڤەكرن و نها سێ خواندنگەهـ لێ هەنە و ئاڤاهیێن وان ل سالێن (١٩٨١، ٢٠١٠، ٢٠١٢) هاتینە ئاڤاكرن و خویندكار تا تەمامكرنا قۆناغا ئامادەیی ل گوندی د خوینن.

سالا (١٩٨١)ێ كارەب گەهشتیە گوندی و بنكەهێ تەندروستی ل سالا (٢٠٠٩)ێ و بازێرڤانی ل سالا (٢٠١٢)ێ لێ هاتینە دامەزراندن.

## ژێدەرێ ئاڤا ڤەخوارنێ:

ژ زێیێ مەزنە كو دكەڤیتە نێزیكی گوندی ب (١٠٠)م. دیسان بۆ دابینكرنا ئاڤا ڤەخوارنێ پێنج بیرێن ئیرتیوازی ژی لێ هاتینە كۆلان.

دەرامەتێ سەرەكیێ چاندنێ گەنم و جەهـ و نۆكن و ئەڤ گوندە یێ ب ناڤ و دەنگە ب چاندنا شوتییان[١٠]، خەلكێ ڤی گوندی كارێ ب خودانكرنا پەز و بزن و چێلان ژی دكەن[١١].

# گوندێ بیۆك:

بیۆك ب دووراتییا (١٢)كم ب رێكەكا نیف ڤێركری دكەڤیتە باشوورێ ناحیا دارەتوو، هەردو گوندێن مۆرێلان و بەنێنان دكەڤنە باشوورێ رۆژهەلاتێ گوندی.

## پێكهاتا گوندی:

خەلكێ وێ ژ تیرا (رەشكەری)یا عەشیرەتا (گوران)ن، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ٧٣ كەس بوون.[١٢]، نها گوند پێك دهێت ژ (٨٦) خێزانان كو ژمارا خەلكێ گوندی دبنە (٤٨٠) كەس و نها لێ د ئاكنجی نە.

ناڤێ گوندی یێ ژ هەبوونا دارێن (بی) هاتی، كو ددەمەكی دا زۆر لێ هەبووینە. ل دووڤ گۆتنان دیرۆكا گوندی ڤەدگەریێتەڤە بۆ بەری (١٢٠) سالان، ئانكو سەدساليیا نۆزدی، خەلكێ گوندی گەلەك جاران گوندێ خۆ یێ هێلای و جارەكا دی یێن زڤرینەڤە گوندی و چ جاران گوند ب تەمامی چۆل نەبوویە.

ڤی گوندی كەڤنە ئاشەك لێ هەیە، بەری سەدساڵەكان كار دكر، ل دووڤ گۆتنان هەتا سالێن بیستان ژ سەدساليیا چوویی خەلكی مفا ژێ وەردگرت.

خواندنگەهـ بۆ جارا ئێكێ ل سالا (١٩٧٩) ێ لێ هاتییەڤەكرن د ئاڤاهییەكێ ئاخێ ڤەبوو، پاشی ئاڤاهییەكێ نوی بۆ هاتییە ئاڤاكرن و نها تا پۆلا حەفتێ بنەرەتی لێ دخوینن و پشتی وێ قۆناغێ دچنە گوندێن دەور و بەران بۆ تەمام كرنا خواندنا خۆ.

سالا (١٩٧٨)ێ هێلا كارەبێ گەهشتییێ و ژێدەرێ ئاڤا وان ژی بیرەكا ئیرتیوازی یە[١٣].

## گوندێ تربە سپی:

تربە سپی ب دووراتییا (٢٤)كم دكەڤیتە باكوورێ ناڤەندا ناحیا دارەتوو سەر لێڤا رووبارێ خازری، رووبار دكەڤیتە رۆژئاڤایێ گوندی. خەلكێ وێ ژ تیرەیا (بۆت)ا عەشیرەتا (گۆران)ن. ناڤێ گوندی یێ هاتی ژ (تربە= ئاخ) + (سپی)، واتە ئاخا سپی یان ژی ژ توربا سپی ئانكو گۆڕێ سپی هاتبیت. ژمارا خەلكێ گوندی (٥٥) خێزانن كو دبنە (٧٥٠) كەس. دبێژن بەری پتر ژ (٩٠) سالان گوند هاتییەئاڤاكرن.

## پێكهاتا گوندی:

پێكهاتا گوندی ئێك بنەمالەیە، ئەو ژی بنەمالا (حەجی سمایل)ە، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ١٢٠ كەس بوون.[١٤].

گوندێ بێوك



سالا (١٩٩٣) ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەکرن و تا پۆلا شەشێ بنەرەتی لێ هەیە، بەری هینگێ بۆ خواندنێ دچوونە گوندێن دەوروبەران وەك گوندێ (دووسەرە).

ل سالێن هەشتیان ژ سەدسالیا بۆری کارەب گەهشتییە گوندی، ژێدەرێ سەرەکی یێ ئاڤا گوندی بەرێ کانیك بوون، کو نها نەماینە و هشك بووینە و بیرەکا ئیرتیوازی یا بۆ گوندی هاتییە کۆلان و بۆ کاروبارێن رۆژانە و ڤەخوارنێ مفای ژێ دبینن[١٥].

## گوندێ خرابە یاسین:

ئەڤ گوندە ب دووراتییا (٨) کم دکەڤیتە باکوورێ مەلبەندێ ناحیا دارەتوو، ڤی گوندی دو خرابە ب ناڤێن (موسا کازم و خرابە دێم) یێن هەین و گەلەك جاران پارچێن گلینەی ل ڤان هەردو خرابان دهێنە دیتن.

دیرۆکا ڤی گوندی ڤەدگەریێتەڤە دووماهییا سالێن حەفتییان ژ سەدسالیا بووری، ل بەری هینگێ جهێ گوندی د هاتە بکارهینان بۆ چاندنێ. ناڤێ گوندی یێ ژ (یاسین) هاتی کو کەسەك بۆ چاندن لێ دکر، ژبەر هندێ ناڤێ خرابەی و ناڤێ یاسین یێ ل سەر هاتییە دانان.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ وێ ژ تیرەیا (رەشکەری) یا عەشیرەتا (گـــۆران)ن. ئەڤ گوندە (٢٣) خێزانن کو ژمارا ئاکنجیێن گوندی دبنە (١٨٠) کەس.

ل ســالا (١٩٩١)ێ گـونـد ب تەمامی یێ هاتییەچۆلکرن و سالا (١٩٩٢)ێ جارەکادی یێ هاتییە ئاڤاکرن ڤە و ژیان لێ یا بەردەوامە.

بۆ جارا ئێکێ خواندنگەهـ ل سالێن هەشتیان ژ سەدسالیا بووری لێ هاتییە ڤەکرن و تا پۆلا شەشێ بنەرەتی لێ هەیە و پشتی تەمامکرنا ڤێ قۆناغێ، خویندکارێن گوندی بەرێ خۆ ددەنە گوندێن دەور و بەران. کارەب ژی ل سالێن هەشتییان گەهشتییە گوندی.

ژێدەرێ ئاڤا گوندی ژی هەر بیرەکا ئیرتیوازی یە و ئەو ژی ل سالێن هەشتیان هاتییە کۆلان.

سەبارەت دەرامەتێ چاندنێ ژێ، رووبەرێ ئەردێ ڤی گوندی دبیتە (٦٠٠٠) دۆنەمێن دێمی، لەوما چاندنا گەنم و جەهان یا لێ هەی[١٦].

## گوندێ خارۆك:

ئەڤ گوندە ب دووراتییا (٢٠) کم دکەڤیتە رۆژهەلاتی ناحیا دارەتوو ل سەر لێڤا رووبارێ خازری و رووبار دکەڤیتە رۆژهەلاتێ گوندی.

ناڤێ گوندی یێ ژ وێ چەندێ هاتی کو یێ (خوارە) و دوورەدەستە، ب واتایا (خوار) یان (خوارۆك) و ب بوورینا دەمی یێ بوویە (خارۆك).

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ وێ تیرەیا (شێخ بزێنی)یا عەشیرەتا (گۆران)ن، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلکێ گوندی ١٠٦ کەس بـوون[١٧]، نها ژمارا خەلکێ گوندی (١٢٠) خێزانن کو دبنە (٦٥٠) کەس.

ل نێزیکی گوندی کاڤلە گوندەك ب ناڤێ (گوندێ عەبدولعەزیز) یێ هەی، هەتا سالا (١٩٧٤)ێ ئەڤ گوندە یێ ئاڤا بوو، لێ پشتی شکەستنا شۆرشا ئەیلوولێ گوند هاتییەچۆلکرن و هێژ نەهاتییە ئاڤاکرن. ژ جهێن کەڤنار ل ڤی گوندی جهەکێ چیایی هەیە ب ناڤێ (قەور قەلان)، گەلەك جاران تشتێن کەڤن لێ دهێنە دیتن.

ل سەر دیرۆکا گوندی ژی دبێژن کو ل بەری (١٢٠) سالان گوند یێ ئاڤابوو، واتە دیرۆکا وی ڤەدگەریێتەڤە سەدسالیا نۆزدێ.

خواندگەهـ بۆ جـارا ئێکێ ل سالا (١٩٨٠)ێ لێ هاتییە ڤەکرن، ئاڤاهیێ وێ ئاخ بوو، پشتی سەرهلدانێ ئاڤاهییەکێ نوو بۆ هاتە ئاڤاکرن و تا پۆلا شەشێ بنەرەتی یا لێ هەی، پشتی هینگێ خویندکارێن گوندی دچنە گوندێن دەور و بەران بۆ تەمامکرنا قۆناغێن دووڤدا ژ خواندنێ. کارەب ل سالا (١٩٨٥)ێ گەهشتییە گوندی.

ژێدەرێ ئاڤا سەرەكییا گوندی رووبارێ زێ یێ مەزنە، كو دكەڤیتە دووراتییا (١٠٠) م، ئەڤە ژ بلی هەبوونا بیرەكا ئیرتیوازی كو ئەو ژی ئاڤێ بۆ گوندی دابین دكەت.

سەبارەت چاندنێ ژی، دەرامەتێن دێم و ئاڤی لێ دهێنە چاندن، مینا گەنمی و جەهی و نۆك و شوتی و خیار و باجانسۆرك و كولند و ...هتد.

ژ بەر كو گوندێ (خارۆك) یێ نێزیكی رووباری یە، لەوما ب ماسیگرتنێ ژی ناڤدار بوویە و خەلكەك بۆ ژین و ژیارا خۆ ڤی كاری ژی دكەن و ماسیان دبەنە بەردەرەش بۆ فرۆتنێ[١٨].

## گوندێ خەندەك:

خەندەك ب دووراتییا (١٨)كم دكەڤیتە باكوورێ رۆژهەلاتێ ناحیا دارەتوو، پشكەكە ژ گوندێ بەنێنان، كو ل سەر عەردێ وان هاتییە ئاڤاكرن. گوندێ بەنێن دكەڤیتە باشوورێ رۆژهەلاتێ گوندی و گوندێ بیۆك دكەڤیتە باكوورێ گوندی. ناڤێ گوندی یێ ژ وێ چەندێ هاتی كو گوند یێ ل جهەكێ كوور مینا خەندەكان هاتییە ئاڤاكرن.

### پێكهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە ژ هەردو عەشیرەتێن (گۆران و هەركی) پێكدهێت كو دبنە (٢٢) خێزان و ژمارا خەلكێ وێ دبنە (١٨٠) كەس. گوند ژ دو بنەمالێن سەرەكی پێكدهێت: (زری)، كو ژ عەشیرەتا (هەركی) یانە و ل دووڤ گۆتنان یێ ژ باكوورێ كوردستانێ هاتین و ل ڤی گوندی ئاكنجی بووین و بنەمالا (مام شین).

نێزیكی گوندی نیڤ خرابەك ب ناڤێ (باسكێ قادر ئاغای) یێ هەی. دیرۆكا ئاڤاكرنا ڤی گوندی ڤەدگەریتەڤە سالا (١٩٧٥)ێ.

ل سالێن هەشتییان خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییەڤەكرن، ئاڤاهییەكێ ئاخێ بوو و پشتی سەرهلدانێ ئاڤاهییەكێ نوی بۆ هاتە دروستكرن و تا پۆلا شەشێ بنەرەتی لێ دخوینن، هێلا كارەبێ ژی ل سالا (١٩٨٥)ێ یا گەهشتییە ڤی گوندی.

بەری سالا (٢٠٠٤)ێ ژێدەرێ ئاڤا گوندی زێ یێ مەزن بوو، پشتی هینگێ بیرەكا ئیرتیوازی بۆ هاتییە كۆلان و مفای ژێ وەردگرن.

رووبەرێ ئەردێ چاندنێ ل ڤی گوندی د گەهیتە نێزیكی (٢٠٠) دۆنەمان و دەرامەتێ چاندنێ یێ گوندی پێكدهێت ژ بەرهەمێن چاندنێ یێن دێمی و ئاڤی، مینا گەنم و جەهـ و نۆك و شوتی و خیار و باجانسۆرك و كولند و ... هتد[١٩].

## گوندێ دالەرێ:

دالەرێ ب دووراتییا (١٥) كم ب رێكەكا نیڤ ئاخ و نیڤ ڤێركری ژ رۆژهەلاتێ ناحیا دارەتوو دوورە، ناڤێ گوندی یێ ژ كورتكرنا ناڤێ (دەحلەرێ) هاتی كو ددەمەكی دا دەحلەكێ مشە ل نێزیكی گوندی هەبوو، ژبەر هندێ گوند یێ پێ هاتییە ب ناڤكرن.

### پێكهاتا گوندی:

خەلكێ وێ ژ تیرەیێن (سۆرداشی و رۆژبەیانی و چۆپانی) یێن عەشیرەتا (گۆران)ن، ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ١٥٩ كەس بوون[٢٠]، نها ژمارا ئاكنجییێن ڤی گوندی دگەهنە (١٤٠) خێزانان كو دبنە نێزیكی (٩٠٠) كەسان.

سەبارەت دیرۆكا گوندی ژی دبێژن مێژوویا وی ڤەدگەریتەڤە بۆ پتری (٢٥٠)سالان، واتە ل سەدێ هەڤدێ ئەڤ گوندە هەبوو. گەلەك جاران هندە بنەمالان گوند یێ چۆلكری و ژ گوندی باركرین، لێ جارەكادی یێن ڤەگەریاینەڤە گوندی و گوند چ جاران چۆل نەبوویە و ژیان هەر تێدا یا بەردەوام بوویە.

### شوینوارێن گوندی:

جهێن كەڤنارێن گوندی، جهەكێ هەی ب ناڤێ (كەور قەلان) و گەلەك جاران گلینە و كەل و پەلێن كەڤن ل ڤی جهی هاتینە دیتن، ل دووڤ هندە ژێدەران دبێژن كو د دەمێ ئوسمانییاندا ئەڤ جهە یێ ئاڤابوو و بۆریەكا لۆلەیی یا ل وی جهی هەی كو بۆ لایێ رووبارێ زێ ڤە یا هاتییە درێژكرن و هزر

دهێتەکرن کو ئەو دەمێ خۆ دا بۆ راکێشانا ئاڤێ هاتبیتە بکارهینان. دیسان گەلەك جهێن خانییان ژی ل ناڤ زەڤیێن چاندنێ دا دهێنە دیتن.

سالا (١٩٧٨)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتیەڤەکرن، ئاڤاهییەکێ ئاخێ بوو، پاشی سالا (١٩٩٤)ێ خواندنگەهەکا نوی ل گوندێ بیۆك هاتیە ئاڤاکرن و تا پۆلا نەهێ بنەرەتی خواندن ل ڤێ خواندنگەهێ دهێتە کرن. سەبارەت هێلا کارەبێ ژی، ستوینێن وێ بۆ جارا ئێکێ ل سالا (١٩٨١)ێ هاتینە چوکلاندن، لێ هێزا کارەبێ بخۆ ل (٢٠٠٢/٣/١٣) گەهشتییە گوندی.

هەر چەند ئەڤ گوندە چەند مەترەکێن کێم ژ زێ یێ مەزن دوورە و د بەرێ دا مفا ژ ڤێ ئاڤێ ددیتن بۆ کاروبارێن رۆژانە، لێ ژێدەرێ ئاڤا وان بیرەکا ئیرتیوازی یە کو ل سالا (١٩٩٧)ێ یا هاتییە کۆلان.

ژ بەر کو گوند یێ نێزیکی زێ یێ مەزنە، خەلکێ گوندی ژ بلی چاندنا گەنمی و جەهی، چاندنا بیستانان ژی دکەن و رووبەرێ ئەردێ چاندنێ ل ڤی گوندی دگەهیتە (٢٣٠٠) دۆنەمان[٢١].

## گوندێ درین بۆت:

درین بۆت ب رێکەکا هندەك ئاخ و هندەك ڤیر ب دووراتییا (١٥)کم دکەڤیتە باشوورێ ناحیا دارەتوو ل بەر لێڤا رووبارێ خازری، ناڤێ گوندی یێ ژ هەبوونا (درك)، واتە ستری کو خەلکێ دەڤەرێ وێ پەیڤێ بکاردهینن یا هاتی. دیسان دبێژنە ڤێ دەڤەرێ بۆتان ژی، واتە (دری + بۆت) و یا بوویە (درین بۆت).

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ وێ ژ تیرەیێن (هەمەوەند و بۆت)ێن عەشیرەتا (گۆران)ن. ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلکێ گوندی ٦٥ کەس بوون[٢٢]. نها گوند ٦٥ بنەمالن کو دبنە نێزیکی ٣٥٠ کەسان.

دبێژن دیرۆکا گوندی ڤەدگەریتەڤە بۆ بەری نێزیکی (٣٥٠) سالان، وی سەردەمی واتە سەدسالییا شازدێ گوند هەبوویە و گەلەگ جاران خەلکێ گوندی گوند یێ هێلای و چووین، لێ جارەکادی یێن ڤەگەریاینەڤە و چ دەمان گوند ب تەمامی نەهاتییە چۆلکرن و ژیان هەر تێدا یا بەردەوام بوویە.

ل سالا (١٩٨١)ێ خواندنگەهـ لێ هاتییەڤەکرن، ئاڤاهییەکێ ئاخێ بوو و ژبەر نەبوونا مامۆستایان، چەندین جاران ئەڤ خواندنگەهە یا هاتییە دائێخستن و ڤەکرن، تا سالا (١٩٩٢)ێ ئاڤاهییەکێ نوو بۆ هاتییە ئاڤاکرن و خواندن تا پۆلا نەهێ بنەرەت یا لێ هەی. هەروەسا کارەب ل سالا (١٩٨٥)ێ گەهشتییە گوندی.

هەرچەند ئەڤ گوندە چەند مەترەکان یێ ژ رووبارێ (خازر)ی دوورە و بەری سالا (١٩٧٦)ێ بۆ کارێن رۆژانە مفا ژ وی رووباری وەردگرتن، نها پشتی کۆلانا بیرەکا ئیرتیوازی مفای ژ بیری وەردگرن.

رووبەرێ ئەردێ چاندنێ ل ڤی گوندی دگەهیتە (١٧٥٠) دۆنەمان، گەلەك ژێ دێمە، گەنمی و جەهی لێ دچینن، سەرەرای وێ چەندێ بیستانێن ئاڤی ژی هەنە[٢٣].

## گوندێ دووسەرە:

گوند ب دووراتییا (١٥)کم دکەڤیتە باشوورێ مەلبەندێ ناحیا دارەتوو.

دبێژن دیرۆکا گوندی ڤەدگەریتەڤە بۆ سەردەمێ ئوسمانییان. ناڤێ گوندی یێ ژ (دو سەرا) هاتی، (دو سەرا) ل دووڤ گۆتنا خەلکێ گوندی دو لیوایێن سەربازێن ئوسمانی بوون کو ل ڤی گوندی هەبوون، نها ژی شوینوارێن وان د دیارن، و گوند ژ (دو سەرا) یێ بوویە (دوو سەرە).

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ وێ ژ هەردو عەشیرەتێن (گۆران و زێباری) یانە. عەشیرەتا گۆران پێك دهێن ژ تیرەیێن (پالانی، چۆپانی، بۆت)، ژ سالا ١٩٦١ێ ئەڤە خێزانێن زێباری لێ ئاکنجی بووینە. ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧) ێ هژمارا خەلکێ گوندی ٢٦٩ کەس بوون[٢٤]. نها ژمارا خەلکێ گوندی دگەهنە (٢٠٠) خێزانان، دبنە

نێزیکی (١٣٧٠) ێ کەسان.

دو خرابە ل ڤی گوندی هەنە، کو دیرۆکا وان ڤەدگەریێتەڤە سەردەمەکێ کەڤن، کو ئەو ژی هەردو خرابەیێن (حاجی برایم و خرابەی فەللە)ی نە، دیسان چەندین دیوارێن بەری ل گوندی هاتینە دیتن، کو مێژوویا وان ڤەدگەریێتەڤە سەردەمێن ئوسمانییان.

ل سالا (١٩٧٣)ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەکرن، بۆ جارا ئێکێ سالا (١٩٨٢)ێ کارەب گەهشتییە گوندی.

ژێدەرێ سەرەکیێ ئاڤا گوندی ژ رووبارێ (خازر) ی یە، کو دکەڤیتە دووراتییا (١٠٠)م، ژ بلی دو بیرێن ئیرتیوازی کو ئەو ژی ئاڤێ بۆ گوندی دابین دکەن.

رووبەرێ ئەردێ ڤی گوندی پترە ژ (٤٠٠٠) دۆنەمانە و ژبەر کو ئەڤ گوندە یێ نێزیکی رووبارێ (خازر)ی یە، یێ شیای مفای ژ وێ ئاڤێ وەرگریت و ئەردێ ئاڤی و چێکرنا بیستانان پترە ژ ئەردێ دێم و چاندنا گەنم و جەهان. هەروەسان مفای ژ رووبارێ (خازر)ی بۆ راڤ و نێچیرا ماسییان ژی وەردگرن[٢٥].

## گوندێ دووگوندان کچکە:

دووگوندانی گچکە ب دووراتییا (٣)کم دکەڤیتە رۆژئاڤایێ ناحیا دارەتوو، ناڤێ گوندی یێ ژ هەبوونا دو گوندێن نێزیکی ئێک و ب ئێک ناڤ یێ هاتی، کو دو گوند ب ڤی ناڤی یێن هەین، ئەو ژی هەردو گوندێن (دو گوندانی بچووك و گەورە) و گەلەك نێزیکی ئێکن، دووراتییا دناڤبەرا هەردوان دا کێمترە ژ ئێك کیلومەتر و ناڤێ (گەورە و بچووك) ژی هەر یێ ژ قەبارێ هەردو گوندان هاتی، کو ئێك ژ ئێکی مەزنترە.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ وێ ژ هەردو تیرەیێن (کاوانی و خەمزەیی) یێن عەشیرەتا (گۆران)ن. ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلکێ گوندی ٢٥٥ کەس بوون[٢٦]،

گوندێ دووسەرە



نها ژ (٨٠) خێزانان پێكدهێت، ژمارا خەلكێ وێ دبنە نێزیكی (٦٧٠)كەس ل گوندی ئاكنجینە.

دهێتە گۆتن كو ڤی گوندی مێژوویەكا كەڤنا هەی و ڤەدگەریێتەڤە بۆ بەری (٢٠٠) سالان، واتە گوند ل سەدسالییا هەژدێ هەبوو و ئەڤ گوندە دو جاران یێ چۆل بووی و هاتییەڤە ئاڤەدانكرن، ئەڤ گوندە ل سالا ١٩٧٤ێ یێ هاتییە چۆلكرن و جارەكادی ل سالا ١٩٩١ێ یێ ئاڤەدانبوویەڤە.

### شوینوار و جهێن كەڤنارێن گوندی:

ڤی گوندی خرابەیەك ب ناڤێ (خرابە یونس) یێ هەی، هەروەسان كانییەك ب ناڤێ (كانی قەبران) و (كانی قوللەتین) یێن هەین، گۆرەكێ كەڤن ژی دناڤبەرا هەردو گوندێن (دوو گوندان بچووك و گەورە) دا ب ناڤێ (قولله رەش)یێ هەی، گەلەك جاران گۆسك ل ڤان جهان دهێنە دیتن. دیسان ژ جهێن دیارێن ڤی گوندی (كۆرەك) یا هەی، دبیت ددەمەكی یا هاتییە ب كارهینان بۆ چێكرنا ئامان و كەل و پەلێن دی.

خواندنگەهـ بۆ جارا ئێكێ ل سالا (١٩٨٦)ێ یا ل ڤی گوندی هاتییە ڤەكرن، پاشی خواندنگەهەكا نوی ل گوندێ (دوو گوندان گەورە) هاتییەئاڤاكرن، تا پۆلا نەهێ بنەرەتی لێ دخوینن و بۆ درێژەپێدانا خواندنا خۆ خەلكێ ڤان هەردو گوندان دچنە جهێن دی دخوینن. هێلا كارەبێ بۆ جارا ئێكێ ل سالا (١٩٨٦)ێ یا گەهشتییە گوندی.

ژێدەرێ ئاڤا گوندی ژی بیرەكا ئیرتیوازی یە.

رووبەرێ ئەردێ چاندنێ ل ڤی گوندی (٣١٠٢) دۆنەمن و چاندنا سەرەكی یا خەلكێ گوندی گەنم و جەهـ و نۆك و دەرامەتێ ئاڤی یە[27].

## گوندێ دووگوندان گەورە:

ژ وان گوندانە كو دكەڤنە دووراتییا (٤)كم ژ رۆژئاڤایێ ناحیا دارەتوو، ناڤێ گوندی وەكی ئاماژە یێ هاتییە دان یێ ژ هەبوونا دوو گوندان هاتی و ئەڤە (دووگوندان گەورەیە).

### پێكهاتا گوندی:

خەلكێ وێ ژ عەشیرەتا (گۆران)ن و ژ تیرەیێن (كەوخەو هەمزەیی، چۆپانی، رەشكەری، كاوانی)نە. ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ٢٤٤ كەس بوون[28]، نها (١٩٤) خێزانن، و ژمارا روینشتیێن وی دگەهن (١٠٦٠) كەسان.

ئەڤ گوندە ڤەدگەریێتەڤە بۆ بەری (٢٠٠) سالەكان، واتە ل سەدسالییا هەژدێ هەبوو و خەلكێ ڤی گوندی گەلەك جاران یێن ژێ باركرین، لێ جارەكادی هەر یێن زڤرینەڤە گوندی و چ دەم نەهاتینە كو ئەڤ گوندە ب تەمامی هاتبیتە چۆلكرن.

خواندنگەهـ بۆ جارا ئێكێ ل سالا (١٩٨٤)ێ یا هاتییەڤەكرن، ئاڤاهییەكێ ئاخێ بوو، سالا (١٩٩٤)ێ ئاڤاهییەكێ نوو بۆ هاتە ئاڤاكرن و تا پۆلا نەهێ بنەرەتی خواندن لێ دهێتەكرن. هێلا كارەبێ ژی ل سالا (١٩٨١)ێ یا گەهشتییە گوندی.

ژێدەرێ ئاڤا ڤەخوارنێ ژی دو بیرێن ئیرتیوازی بۆ گوندی هاتینە كۆلان.

چاندنا سەرەكییا گوندی ژی دەرامەتێ دێمە ژ گەنم و جەهان و رووبەرێ ئەردێ چاندنێ ل ڤی گوندی دگەهیتە (١٢٠٠) دۆنەمان[29].

## گوندێ زەنگەنان:

زەنگەنان ب دووراتییا (٦)كم رۆژئاڤایێ مەلبەندێ ناحیا دارەتوو.

### پێكهاتا گوندی:

خەلكێ وێ ژ تیرەیێن (رەشكەری، شاسواری، زەنگەنە، بۆت) ژ عەشیرەتا (گۆران)ن، ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ٧٢٠ كەس بوون[30]، گوند (٣٥٠) خێزانان بخۆڤە دگریت، كو ژمارا روونشتیێن گوندی دگەهنە (٢٠٠٠) كەسان.

ڤی گوندی دیرۆكەكا كەڤنا هەی و دبێژن ڤەدگەریێتەڤە چاخێ (مادەكان) و ژ وی سەردەمی و تا نها گەلەك گوهۆرین ب سەردا هاتینە. ئەڤ

گوندە دو جاران ب تەمامی یێ هاتییە چۆلکرن، جارا ئێکێ ل سەردەمێ ئوسمانییان و جارا دووێ ل سالا (١٩٧٣)ێ، لێ جارەکادی پشتی سالا (١٩٧٥)ێ یێ ئاڤابوویەڤە.

## شوینوارێن گوندی:

ژ شوینوارێن کەڤنێن ڤی گوندی پێنج خرابە ب ڤان ناڤان لێ هەنە: (خرابەی دێم، ورکە، شەبەك، موسای کازم، خرابەی جوجەر) کو وەکی دبێژن ڤەدگەریێنەڤە سەردەمێن ساسانیان و گەلەك تشت دناف ڤان خراباندا دهێنە دیتن، لێ پویتە پێ ناهێنەدان و ژ ناڤدچن. هەروەسان گەلەك جۆکێن ئاڤێ بۆ وان خرابان چووینە و تا نهو ئەو شوینوار دیارن. دیسان دو کەڤنە گوند ژی ل ئاقارێ ڤی گوندی یێن هەین، ئەو ژی هەردو گوندێن (موسای کازم) کو ل سەدەمێ ئوسمانییان هەبوو و گوندێ (کانی با) کو ئەو ژی پشتی هاتنا ئینگلیزی بۆ عیراقێ یێ هاتییە چۆلکرن.

بۆ جارا ئێکێ ل سالا (١٩٤٥)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن، ڤان سالێن داویێ ئاڤاهییەکێ نوو بۆ هاتییە دروستکرن و تا قۆناغا دووازدێ ئامادەیی ل گوندی هەیە. هێلا کارەبێ بۆ جارا ئێکێ ل سالا (١٩٨٥)ێ گەهشتییە گوندی.

## ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

بەرێ کانی ژێدەرێ ئاڤا ڤەخوارنا گوندی بوون، دو کانی (کانی پیاوان و کانی ژنان) هەبوون، نها ژێدەرێ ئاڤا وان سێ بیرێن ئیرتیوازی نە، یا بەراهیێ ل سالێن پێنجییان هاتییە کۆلان.

چاندنا گوندی باراپتر گەنم و جەهە و رووبەرێ ئەردێ ڤی گوندی دگەهیتە (٨٠٠٠) دۆنەمان[٣١].

گوندێ زەنگەنان



## گوندێ شەمسەخر:

شەمسەخر ب دووراتییا (١٨)كم دكەڤیتە رۆژئاڤایێ مەلبەندێ ناحیێ.

## پێكهاتا گوندی:

خەلكێ وێ ژ تیرەیێن (ئۆمەریل، رەشكەری) یێن گورانن، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ٨٩ كەس بوون.[٣٢]، نها ژ (٨٠) خێزانان پێكدهێت و ژمارا خەلكێ گوندی دگەهیتە (٥١٠) روینشتییان. سالا (١٩٤٨)ێ چەند مالەكان ژ بنەمالا (بلباس) ان ژ گوندی باركرینە و چووینە جهەكێ دی.

ناڤێ گوندی یێ ژ هەبوونا ژنكەكا بچویك و نیڤ قەلەو ب ناڤێ (شەمسە) هاتی، ڤێ ژنكێ ئاشەك هەبوو و تا نها ژی شوینوارێن ئاشی ل گوندی دیارن، لەوما ئەڤ گوندە بوویە (شەمسەخرەكە) و پاشی یێ بوویە (شەمسەخر).

ئەڤ گوندە یێ بێ بەهر نینە ژ شوینوار و خرابەك ب ناڤێ (خرابەی گوند) لێ هەیە و گەلەك جاران گلینە و بەرێن كەڤن لێ دهێنە دیتن، دیسان شوینوارێ ئاشەكی ژی لێ هەیە، كو پیرەمێرێن گوندی ژ پیرێن بەری خۆ بهیستینە ئەڤ ئاشە تا سالێن سیهان ژی كاردكر و خەلكێ گەلەك گوندان مفا ژێ وەرگرتینە.

ل سالا (١٩٧٥)ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەكرن، نها تا پۆلا نەهێ بنەرەتی لێ دخوینن. هێلا كارەبێ بۆ جارا ئێكێ ل (١٩٨٩/١/١) ێ گەهشتییە گوندی.

## ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

ڤەخوارنێ دو بیرێن ئیرتیوازی نە، كو یا ئێكێ ل سالا (١٩٧٧) ێ یا هاتییە كۆلان و یا دووێ ل سالا (١٩٩٩) ێ.

چاندنا گوندی ژی ب پلا ئێكێ گەنم و جەهـ و نۆكن و رووبەرێ ئەردێ گوندی دگەهیتە (٢٧٠٠) دۆنەمان[٣٣].

گوندێ شەمسەخر





## گوندێ شێخالك:

شێخالك ب دووراتیا (١٥)كم دكەڤیتە باشوورێ رۆژئاڤایێ ناحیا دارەتوو، ناڤێ گوندی یێ ژ پەیڤێن (شێخ خالد) هاتییە وەرگرتن و پاشی یێ بوویە (شێخالك).

## پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی ژ تیرەیێن (رەشکەری، شاسواری، زەنگەنە، بۆت)یێن عەشیرەتا (گـۆران)ن، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلکێ گوندی ١٤٤ کەس بوون.[٣٤]، نها ژ (٣٢) خێزانان کو دبنە (٤٠٠) کەس.

گوندەکێ کەڤنە ڤەدگەرینتەڤە بۆ بەری پتر ژ (٣٠٠) سالان. ئەڤ گوندە ل سالا (١٩٧٤)ێ هاتبوو چۆلکرن و ب تنێ دو مال لێ مابوون و پاشتر جارەکادی گوند ئاڤابوو ڤە.

ڤی گوندی گۆرستانەکا کەڤن یا هەی و گەلەك جاران بەرێن جۆنیان و جەرك و کەل و پەل لێ دهێنەدیتن و گۆرەك ژ وان نڤیسینا لاتینی ل سەر هەیە کو مێژوویا وی ڤەدگەرینتەڤە بۆ بەری (٧٠٠) سالان.

ل دووڤ ژێدەران دبێژن خەلکێ گوندی کوردێن داسنی بوون و دبیت وان ئەڤ ناڤە ل گوندی نابیت.

گشتیا خەلکێ گوندی موسلمانن و ژ بنەمالێن ناڤدار ل ڤی گوندی (عەنتەر و سەفەر) ن.

بۆ جارا ئێکێ خواندنگەهـ ل سالێن هەشتیان ل ڤی گوندی هاتییە ئاڤاکرن و ئەو ژی ئاڤاهییەکێ ئاخێ بوو، پاشی ئاڤاهییەکێ نوی ل سالا (٢٠٠١)ێ لێ هاتە دروستکرن و تا پۆلا شەشێ بنەرەتی لێ هەیە. دیسان هێلا کارەبێ ژی ل هەشتیان گەهشتییە گوندی.

## ژێدەرێ ئاڤا گوندی:

ل بەرێ کانییەك ل نێزیکی گوندی هەبوو، لێ نها ژێدەرێ سەرەکی بیرەکا ئیرتیوازی یە، کو ئەو ژی ل سالێن هەشتیان ژ سەدێ بووری یا هاتییە کۆلان.

رووبەرێ ئەردی ل ڤی گوندی دگەهیتە (٢٢٠٠) دۆنەمان و ئەردێ وان یێ دێمە[٣٥].

## گوندێ گەلووك:

گوندێ گەلوك ب دووراتیا (١٧)کم ب جادەکا ڤێرکری دکەڤیتە باشوورێ رۆژئاڤایێ دارەتوو، ناڤێ گوندی یێ ژ (گەلەك) ب واتایا (زۆر) یێ هاتی و پاشی یێ بوویە (گەلووك).

ئەڤ گوندە ژ گوندێن کەڤنە و مێژوویا وی یا دیار نینە، دبێژن ڤەدگەرینتەڤە بۆ پتری (١٥٠) سالان و چ دەمان ئەڤ گوندە چۆل نەبوویە و هەر یێ ئاڤەدانە.

## پێکهاتا گوندی:

خەلکێ وی ژ تیرەیا (بۆت)ا (گۆران)ن، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلکێ گوندی ١٩٥ کەس بوون.[٣٦]، نها دگەهنە (١٣٠) خێزانان و دبنە (١١٦٥) کەس.

ل دووراتیا (١٥) کم ژ ڤی گوندی کاڤلە گوندەك ب ناڤێ (کانی وورچ) یێ هەی. ئەڤ گوندە ل سالێن حەفتیان ژ سەدێ بووری یێ کاڤل بووی.

ژ شوینوارێن ڤی گوندی خرابەیەك ب ناڤێ (خەرابەی قەلای ئاغا) یێ هەی.

ل سالا (١٩٧٥)ێ خواندنگەهـ لێ هاتییەڤەکرن، نها تا پۆلا نەهێ بنەرەتی لێ دخوینن. هێلا کارەبێ ل سالا (١٩٨١) ێ یا گەهشتییە گوندی.

## ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

ژێدەرێ ئاڤا گوندی ل بەرێ ل سەر ئاڤا رووبارەکێ بچویك بوو کو ژ ئاڤارێ هەردو گوندێن (کەونەباك و زەنگەنان) دهات لێ پشتی بیرەکا ئیرتیوازی ل سالا (١٩٧٦)ێ هاتییە کۆلان، ئەو بیر بۆ ژێدەرێ سەرەکیێ ئاڤا گوندی.

چاندنا گوندی ژی مینا وێ دەڤەرێ ل سەر دەرامەتێ دێمی یە ژ گەنم و جەهـ و نۆکان و رووبەرێ ئەردێ گوندی دگەهیتە (١٦٥٠) دۆنەمان[٣٧].

## گوندێ گربدەو كۆن:

گربدەو كۆن ب دووراتییا (٥)كم دكەڤیتە باكوورێ دارەتوو ب جادەكا نیڤ ڤێركری ل باشوورێ رۆژهەلاتێ گوندێ گربدەو نوێ و ژ تیرەیا (رەشكەری)یا عەشیرەتا (گۆران)ن، د سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ دا تنێ ئاماژە ب گوندەكی ب ناڤێ گربدەو هاتییە كرن سەرژمێرییا وی ٤٣٩ كەس بون[٣٨].

گوند پێكدهێت ژ (٣٠٠) خێزانان، كو ژمارا ئاكنجیێن وێ دبنە (١٢٣٠) كەس.

نێزیكی ڤی گوندی چەند خرابەیەك وەكی شوینوار ب ناڤێن (حەسەن مەولوود، توولە زەری، جبۆ، خرابە پان، خرابە شەبەك) پێن هەین.

ئەڤ گوندە یێ كەڤنە و دیرۆكا وی ڤەدگەریت بۆ پتر ژ (٢٠٠) سالان كو ژیان دڤی دەمی دا هەر تێدا یا بەردەوام بوویە و نە هاتییە چۆلكرن، لێ ب دروستی نەهاتییە زانین كا كەنگی هاتییە ئاڤاكرن.

شینوارێ خرابەیەكی یێ ل گوندی هەی ب ناڤێ (قەلای ئاغا)، كو گەلەك جاران تشتێن كەڤن لێ دهێنە دیتن.

خواندنگەهـ بۆ جارا ئێكێ ل سالێن شێستان ژ سەدسالیا بووری یا ل ڤی گوندی هاتییە ڤەكرن، پاشی خواندنگەهەكا نوی هاتە ئاڤاكرن و نها خواندن تا دوا رێزا قۆناغا ئامادەیی لێ هەیە. ل سالا (١٩٨١)ێ هێلا كارەبێ گەهشتییە گوندی. ژێدەرێ ئاڤا ڤەخوارنا گوندی دو بیرێن ئیرتیوازی نە، یا ئێكێ ل سالا (١٩٦٣)ێ یا هاتییە كۆلان.

رووبەرێ ئەردێ چاندنێ ل ڤی گوندی دگەهیتە (٩٠٠٠) دۆنەمان و دەرامەتێن دێمی و ئاڤی ل ڤی گوندی دهێنە چاندن، ژ گەنم و جەهـ و نیسك و نۆك و برنج و خیار و باجانسۆرك و شوتی و...هتد[٣٩].

## گوندێ گربدەو نوێ:

گربدەو نوێ ب دووراتییا (٥)كم ب جادەكا نیڤ ڤێركری دكەڤیتە باكوورێ ناڤەندا ناحیا دارەتوو.

### پێكهاتا گوندی:

خەلكێ وێ ژ تیرەیێن (بەرازی، چۆپانی، قەمبەری، شاسواری)یێن عەشیرەتا (گۆران)ن. گوند ژ (٦٥) خێزانان كو دبنە (٣٠٠) كەس پێكدهێت.

ژ شوینوارێن ڤی گوندی هەر هەمان شوینوارن كو ل گوندێ گربدەو كۆن هەین كو دهەڤپشكن دناڤبەرا هەردو گونداندا، ژ بلی كەڤنە گوندەكی ژێ ب ناڤێ (سالی بەگ)، كو گوندەكێ كەڤن بوو و ل سالا (١٩٠٠) ێ یێ ئاڤابوو، هەروەسان گوندەكێ دی ژێ ل نێزیك گوندی ب ناڤێ (گولە كەتەریش) تا سالێن پێنجیان ژ سەدسالیا بووری هەبوو، لێ نەمایە.

سالا (١٩٩٣)ێ پشتی ئاوارەیێن ژ ئیرانێ ڤەگەریاینە ڤە ب بریارا حكومەتا هەرێمێ ئەڤ گوندە هاتییەئاڤاكرن.

بۆ جارا ئێكێ خواندنگەهـ ل سالا (١٩٩٤)ێ لێ هاتییە ڤەكرن، كو ئەو ژی خانیەك بوو، پاشی ئاڤاهییەكێ نو بۆ هاتەدروستكرن و نها تا پۆلا حەفتێ خواندن لێ دهێتە كرن. هێلا كارەبێ ژی ل سالا (١٩٩٣)ێ یا گەهشتییە گوندی.

رووبەرێ ئەردی ل ڤی گوندی دگەهیتە (١١٠٠) دۆنەمان و گەنم و جەهـ ژ دەرامەتێن سەرەكی یێن چاندنا ڤی گوندی نە[٤٠].

## گوندێ گردەپان:

گردەپان ب دووراتییا (١٣)كم ب جادەكا ڤێركری دكەڤیتە باشوورێ رۆژئاڤایێ ناڤەندا دارەتوو. ناڤێ گوندی یێ ژ وێ چەندێ هاتی كو گوند یێ ل سەر گرەكێ (گردەكێ) نیڤ پان هاتییە ئاڤاكرن و ناڤێ وی یێ ژ وێ چەندێ هاتی.

### پێكهاتا گوندی:

خەلكێ وێ ژ تیرەیا (بۆت)ا عەشیرەتا (گۆران)ن، ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ

گوندی ٣٧١ كەس بـوون.[٤١]، ئەڤ گوندە ژ (٥٠٠) خێزانان كو دگەهنە (٣٠٠٠) كەسان پێكدهێت.

ل نێزیكی ڤی گوندی چەند كەڤنە گوند هەنە كو ئاڤەدانی لێ نەمایە، مینا (كانی وورچ) كو بەری (٨٠) سالان بێ ئاڤەدان بوو، نها خەلكێ وی گوندی یێ ل گوندێ (گردەپان) ئاكنجی بووین، هەر وەسان كاڤلە گوندێن (پێنجوینە و گردەپان گەورە و بچووك)، كو بەری (٨٠) سالان سێ گوندێن ژێك جودا بوون، لێ نها بووینە ئێك گوند كو ئەو ژی گوندێ (گردەپانە) و هەردووێن دی ژی یێن هاتینە دگەل ڤی گوندی و بووینە ئێك گوند. دیسان دبێژن ل بەری (٣٠٠) سالان چەند گوندێن دی تر ژی ب ناڤێن (گەلی مار، ركاوە، كەلكان) هەبوون، لێ نها نەمانە و نەهاتییە زانین كا كیش بنەمالا گوندێ (گردەپان) ژ بنیاتدا خەلكێ وان چەند گوندان بووینە و ئەڤرۆ بووینە پشكەك ژ گوندێ (گردەپان).

دیرۆكا ڤی گوندی گەلەكا كەڤنە و دبێژن ڤەدگەرێتەڤە بۆ بەری پتر ژ (٤٠٠) سالان و چ سەردەمان ئەڤ گوندە نە هاتییە چۆلكرن و هەردەم یێ ئاڤەدان بوو.

سەبارەت جهێن كەڤن ژی چەند شوینوار لێ هەنە، مینا (شێخ مووس، كو دیوارەكێ كەڤنە و دیرۆكا وی ڤەدگەرێتەڤە سەردەمێ ئاشووریان، پێنجوونە، خرابەی سەرەوە، جۆنە بەگ).

خواندنگەهـ ل سالا (١٩٥٨)ێ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەكرن، ئەو ژی ئاڤاهییەكێ ئاخێ بوو، پاشی ئاڤاهییەكێ نوی بۆ هاتییە ئاڤاكرن. هێلا كارەبێ ژی ل سالا (١٩٨١)ێ یا گەهشتییە گوندی و بنكەهەكێ تەندروستی ل سالا (٢٠٠٥)ێ یێ لێ هاتییە ڤەكرن.

ژێدەرێن ئاڤا ڤەخوارنێ ل ڤی گوندی پێنج بیرێن ئیرتیوازی نە كو ئاڤێ بۆ گوندی دابین دكەن.

رووبەرێ ئەردێ ڤی گوندی دگەهیتە (١٩٠٠٠) دۆنەمان و چاندنا وان یا سەرەكی دەرامەتێ دێمە ژ گەنم و جەهـ و نۆكان[٤٢].

گوندێ گردەپان



## گوندێ گۆمەزەرد:

گوند ب دووراتییا (٥)كم ب جادەكا نیڤ ڤیركری دكەڤیتە باشوورێ مەلبەندێ ناحیا دارەتوو، و ل رۆژهەلاتی گوندێ گردەپان، ناڤێ گوندی ل دووڤ زێدەرێن گوندی بخۆ دبێژن یێ ژ گۆمەكا ئاڤێ هاتییە وەرگرتن.

### پێكهاتا گوندی:

خەلكێ گوندی ژ تیرەیێن (رەشكەری، چۆپانی، قەمبەری، خدری، هەمەوەند)یێن عەشیرەتا (گۆران) ن، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ٢٤١ كەس بوون.[٤٣]، نها ژ (١٩٠) خێزانان كو ژمارا خەلكێ وێ دبنە (١٤٠٠) كەس پێكدهێت.

## شوینوارێن گوندی:

دوو خرابە وەك شوینوار ل نێزیكی ڤی گوندی هەنە، یێ ئێكێ ب ناڤێ (خەزنە) كو گەلەك جاران كەل و پەل مینا گلینە لێ دهێنە دیتن و یێ دووێ ب ناڤێ (خرابەی حەسەن)، هەروەسان شوینوارێن كەڤنە گوندەكێ كاڤل ژی لێ هەیە ب ناڤێ (قەرەقاز).

دیرۆكا ڤی گوندی دبێژن ڤەدگەریێتەڤە بۆ بەری پتر ژ (١٠٠) سالان كو ژیان لێ هەبوویە و چ دەمان ئەڤ گوندە نەهاتییە چۆلكرن.. ئەڤ گوندە بەری ئاڤا ببیت جهێ چەراندنا گیاندارێن خۆمالی بوویە و ژبەر راوەستاندنا زێدەرێ ئاڤا ڤێ گۆمێ رەنگێ ئاڤێ هاتییە گوهارتن و یێ سەر ب زەری ڤە لێ هاتی، ژبەر هندێ دەمێ گوند هاتییە دروستكرن ئەڤ ناڤە ل سەر هاتییە دانان.

ل سالا (١٩٧٩)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییەڤەكرن، نها هەتا پۆلا نەهێ بنەرەتی خواندن لێ هەیە و پشتی ڤێ قۆناغێ خویندكارێن وێ دچنە گوندێ (گردەپان) بۆ تەمامكرنا خواندنا خۆ. سەبارەت هێلا كارەبێ ژی ئەو د سالێن هەشتیان گەهشتییە گوندی.

گوندێ گۆمەزەرد



### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

ژێدەرێ سەرەکی یێ ئاڤا ڤەخوارنا گوندی ل بەرێ کانییەك بوو ب ناڤێ (کانی خۆخێ)، لێ ئەو کانی نەمایە و یا هشك بووی و نها ژێدەرێ ئاڤا وان چوار بیرێن ئیرتیوازی نە، کو یا ئێکێ ل سالا (١٩٦٥)ێ یا هاتییە کۆلان.

رووبەرێ ئەردی ڤی گوندی دگەهیتە (٦٠٠٠) دۆنەمان و دەرامەتێ وان یێ سەرەکی گەنم و جەهن[٤٤].

## گوندێ قاتسی کچکە:

قاتسی کچکە ب دووراتییا (١٤)کم باشوورێ رۆژئاڤایێ ناحیا دارەتوو و خەلکێ وێ ژ عەشیرەتا (زێباری) نە، گوند مولکێ مولکدارەکێ عەرەب بوو، جۆتیارێن عەرەب بۆ کارێ چاندنێ ئینابوونە وێرێ، لەوما ب قاتسی عەرەبان هاتبووناڤکرن دا ژ قاتسی کوردان بێتە جوداکرن، پاشتر عەرەب ژ وێرێ چوون و زێباریان عەردێ وی گوندی کڕی و نها ب قاتسی زێباریان دهێتەنیاسین..

گوند (٧٠) خێزانان بخوڤە دگریت کو ژمارا ئاکجیێن وێ دبنە (٣٥٠) کەس.

## شوینوارێن گوندی:

خرابە وەکی شوینوار ب ناڤێن (خرابە و خرابەی عەرەبان) یێ ل ڤی گوندی هەین، گەلەک جاران گۆسك و جەڕك لێ دهێنە دیتن، لێ ب دروستاهی نەهاتییە زانین کا ئەڤ هەردو گوندە کەنگی کاڤل بووینە و گۆڕستانێن وان تا نها ژی دیارن.

ژ بەر جهێ پێشامەتێ گوندی و ل دووڤ گوتنا خەلکێ گوندی دبێژن گوندەکێ گرتی بوو، خۆ دەمێ خۆدا رێکا ترومبێلێ ژی نە دگەهشتێ، پاشی ناڤێ وێ بۆ (قاتێ سێ) ب واتایا (قادی سێهەم).

خواندنگەهـ بۆ جارا ئێکێ ل سالا (١٩٨٧)ێ یا ل ڤی گوندی هاتییەڤەکرن و تا پۆلا نەهێ بنەرەتی یا ل ڤێ خواندنگەهێ هەی. هێلا کارەبێ ژی ل سالا (١٩٨٨)ێ یا گەهشتییە گوندی.

خەلکێ گوندی ل بەرێ مفا ژ چەند کانییان وەردگرتن و نها یێن هشکبووین، ژێدەرێ ئاڤا گوندی بیرەکا ئیرتیوازی یە کو ئەو ژی ل سالا (١٩٩٩)ێ یا هاتییە کۆلان.

رووبەرێ ئەردێ گوندی دگەهیتە (٦٠٠) دۆنەمان و چاندنا وان یا سەرەکی گەنم و جەهن[٤٥].

## گوندێ قاتسی گەورە:

قاتسی گەورە ب دووراتییا (١٥)کم دکەڤیتە باشوورێ رۆژئاڤایێ دارەتوو ل سەر روویێ چەپێ یێ رووبارێ خازری، کو رووبار دکەڤیتە رۆژئاڤایێ گوندی و گوندێ قاتسی بچووك دکەڤیتە رۆژهەلاتێ گوندی.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ وێ ژ تیرەیا (بۆت)ا عەشیرەتا (گۆران)نن، ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلکێ گوندی ١٠٩ کەس بوون[٤٦]، نها دگەهنە (١١٠) خێزانان، کو دبنە نێزیکی (٥٠٠) کەسان.

دیرۆکا ڤی گوندی دبێژن ڤەدگەریێت بۆ بەری (٢٠٠) سالان. ئەڤ گوندە چ جاران چۆل نەبوویە و ئەگەر هندە مال چووبن ژی هەر جارەکادی یێن ڤەگەریاینەڤە.

## شوینوارێن گوندی:

ئێك خرابە گوند یێ ل ڤی گوندی هەی ب ناڤێ (خرابەی سولتان)، کو گەلەك جاران پارچە گلینە و تشتێن دی لێ دهێنە دیتن، دیسان شوینوارێن کەڤنە گوندەکی ژی لێ هەیە، دیرۆکا وی دبێژن ڤەدگەریێتەڤە بۆ بەری (١٥٠) سالان. ناڤێ گوندی هەر هەمان ناڤێ پێشترە، وەکی ل (گوندێ قاتسی بچووك) هاتییە دیارکرن.

ل سالا (١٩٧٩)ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەکرن، ئەو ژی ئاڤاهییەکێ ئاخێ بوو، پاشی ئاڤاهییەکێ نوی بۆ هاتە ئاڤاکرن، نها تا پۆلا نەهێ بنەرەتی لێ دخوینن. هێلا کارەبێ ژی ل سالا (١٩٨٧)ێ یا گەهشتییە گوندی.

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

ژێدەرێ ئاڤا گوندی ل بەرێ رووبارێ (خازر) ی بوو، کو ب تنێ (١٠٠)م یا ژ گوندی دووره، لێ نها مفای ژ بیرەکا ئیرتیوازی وەردگرن کو ل سالا (١٩٩٨) ێ یا هاتییە کۆلان.

رووبەرێ ئەردێ ڤی گوندی دگەهیتە (١٠٠٠) دۆنەمان و چاندنا وان یا سەرەکی گەنم و جەهـ و نۆك و باقلك و گوندۆر و ترۆزی نە[٤٧].

## گوندێ کەلکان (هەنجیرۆك کۆن):

هەنجیرۆکی کۆند ب دووراتییا (٢٥)کم دکەڤیتە باشوورێ مەلبەندێ ناحیا دارەتوو ژێرێ گوندێ شەمسەخر. د بەرێدا ژبەر هەبوونا گەلەك باغێن هژیران ب (هەنجیرۆك) ناڤدکرن، لێ ناڤێ دووێ (کەلکی) یێ ژ وێ چەندێ هاتی کو خەلکێ گوندی گوندێ خۆ یێ بەردایی و یێ بوویە (کەلکی)، ب واتایا (کاڤل و وێرانی) ل دووڤ دەڤۆکا گۆرانان.

### پێکهاتا گوندی:

ژ هەردو تیرەیێن (بۆت و رەشکەری) یێن عەشیرەتا (گۆران)ن. ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلکێ گوندی ١٢٢ کەس بوون[٤٨]، نها ژ (٥٠) خێزانان کو دبنە (٣٤٠) کەس پێکدهێت.

دیرۆکا گوندی ڤەدگەرێتەڤە بۆ بەری پتر ژ (٢٥٠) سالان کو ئەڤ گوندە هەبوویە، د سالێن پێنجیاندا ژ سەدسالییا بووری ئەڤ گوندە چەند سالەکان هاتبوو چۆلکرن، لێ جارەکادی هاتەڤە ئاڤەدانکرن.

ژ شوینوارێن ل دەور و بەرێن گوندی دهێنە دیتن گەلەك جاران تاسولقە و تەنویرێن گەلەك کەڤن هاتینە دیتن.

بۆ جارا ئێکێ ل سالا (١٩٩٩)ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەکرن و نها تا پۆلا شەشێ بنەرتی لێ دخوین. هێلا کارەبێ ژی ل سالێن هەشتیان یا گەهشتییە گوندی.

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

ژێدەرێ ئاڤا گوندی ل بەرێ کانییەکا ئاڤێ بوو، لێ بیرەکا ئیرتیوازی یا هەی، کو ئەو ژی ل سالا (٢٠٠٦) ێ یا هاتییە کۆلان.

رووبەرێ ئەردی ل ڤی گوندی دگەهیتە (٣٠٠٠) دۆنەمان و ژ دەرامەتێن سەرەکی کو ل ڤی گوندی دهێە چاندن گەنم و جەهە، هەروەسان بیستانێن ئاڤی یێن لێ هەین و باجانسۆرك و خیار و شوتی لێ دهێنە چاندن[٤٩].

## گوندێ کۆراو:

کۆراو ب دووراتییا (٢٥)کم ب جادەکا نیڤ ڤێرکری دکەڤیتە باشوورێ مەلبەندێ ناحیا دارەتوو و گوندێ شەمسەخر دکەڤیتە باکوورێ گوندی، ناڤێ گوندی ل دووڤ ژێدەرێن دەڤەرێ دبێژن یێ ژ پەیڤا (کۆر) هاتییە وەرگرتن، کو ل دووڤ زاراڤێ دەڤەرێ کۆر ب واتایا (نەمان، تێکچوون، خراب) دهێت، واتە نەمانا گوندی و جارەکادی ئاڤابوویەڤە. دیسان ئەڤ گوندە ل سالێن چلان ژی ژ سەدێ بووری یێ هاتییە چۆلکرن و یێ ئاڤەدان بوویەڤە، ژبەر هندێ ئەڤ ناڤە یێ ل گوندی دانایین.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ وێ ژ دوو عەشیرەتێن (گۆران و بلباس) پێکدهێت، یێن (گۆران) ژ تیرەیا (بۆت)ن، (بلباس) ژی ژ مێژووەرە ژ دەڤەرا رانیە هاتینە و ل ڤێ دەڤەرێ ئاکنجی بووینە، لێ مێژوویا هاتنا وان نە هاتییە زانین، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلکێ گوندی ٢١٤ کەس بوون[٥٠]، نها گوند (٣٥) خێزانان بخۆڤە دگریت کو دبنە (٢١٨) کەس.

ل نێزیکی ڤی گوندی گرەك ب ناڤێ (ملە کەچەلە) یێ هەی، و چ گژ و گیا ل سەر شین نابن و چ شوینوار ل ڤی گوندی بەرچاڤ ناکەڤن و نەهاتینە دیتن.

دیرۆکا ڤی گوندی دبێژن ڤەدگەرێتەڤە بۆ بەری پتر ژ (٢٠٠) سالان کو ل وی سەردەمی هەبوو. ئەڤ

گوندە ل سالا (١٩٨٦)ێ یێ هاتییە چۆلکرن، لێ نە چۆلکرنەکا تەمام، چونکی چەند مالەك لێ مابوون و گوند جارەکا دی پشتی سەرهلدانێ یێ ئاڤەدان بوویەڤە .

بۆ جارا ئێکێ ل سالا (١٩٩٤)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن، تا پۆلا شەشێ بنەرتی لێ دخوینن و پشتی هینگێ خویندکارێن وان بۆ تەمامکرنا خواندنا خۆ دچنە گوندێ (شەمسەخر) کو نێزیکترین گوندە ل (کۆراو). هێلا کارەبێ ژی ل سالێن هەشتیان گەهشتییە گوندی.

## ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

ژێدەرێ ئاڤا گوندی ژی ل بەرێ کانییەکا ئاڤێ بوو، لێ نها ژێدەرێ ئاڤا وان دوو بیرێن ئیرتیوازی نە، کو یا ئێکێ ل سالا (١٩٨٣)ێ یا هاتییە کۆلان.

رووبەرێ ئەردێ گوندی دگەهیتە (٢٨٠٠) دۆنەمان، چاندنا وان یا سەرەکی ژی دەرامەتێ زڤستانی یە ژ گەنمی و جەهی[٥١].

## گوندێ مۆرێلان:

مۆرێلان ب دووراتییا (٤)کم دکەڤیتە باشوورێ رۆژهەلاتێ ناحیا دارەتوو، رووبارێ خازری دکەڤیتە رۆژهەلاتێ گوندی و گوندێ بیۆك دکەڤیتە باشوورێ رۆژئاڤایێ وی. وەك پیرەمێرێن گوندی ژێ دبێژن ئەو ل بەری (٢٥٠) سالان هەبوویە و جهێ گوندی ل دەمێ ئاڤاکرنێ (مێرۆلە) ب واتایا مێری گەلەك لێ هەبووینە، لەوما وان ژی ب باش دیتینە ڤی ناڤی داننە سەر گوندی.

## پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی ژ تیرەیا (رەشکەری)یا عەشیرەتا (گۆران)ن، ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلکێ گوندی ٢٨٢ کەس بوون[٥٢]، نها (٢١١) خێزانن و ژمارا خەلکێ وێ دبنە (١٧٣٢) کەس.

ل نێزیکی گوندی خرابەك ب ناڤێ (خال ئەحمەد) یێ هەی، کو دەمێ خۆدا گۆڕستان بوویە، دیسان شوینوارەك ژی ب ناڤێ (کەور قەلان) یێ لێ هەی و

گوندێ مۆرێلان



شوونوارێن كەڤنە گوندەكی لێ دیارن. ژ شوونوارێن دی یێن گوندی، شكەفتا مەلا عومەر كو ١٠٠٠ پەز دێ چنە تێڤە، ملی سەنگەر، ئادگار كو جهەكێ پیرۆزە و مەرقەدەكە، خەلك بۆ نەخۆشییان سەرەدانا وی دكەن.

خواندنگەهـ بۆ جارا ئێكێ ل سالا (١٩٧٥)ێ یا ل گوندی هاتییە ڤەكرن، نها تا پۆلا نەهێ بنەرەتی یا ل گوندی هەی. هێلا كارەبێ بۆ جارا ئێكێ ل سالا (١٩٨٣)ێ یا گەهشتییە گوندی.

ژێدەرێ ئاڤا گوندی بەرێ كانییەك بوو ب ناڤێ (كانی سۆر)، ناڤێ كانییێ یێ ژ وێ چەندێ هاتی ژبەر كو حەلانەكێ سۆر دبنێ كانیێ دا هەبوو، نها ژێدەرێ ئاڤا گوندی دوو بیرێن ئیرتیوازی نە[٥٣].

ل سەر چاندنێ ژی ئەردێ گوندی دگەهیتە (٨٠٠٠) دۆنەمان و چاندنا وان یا سەرەكی دەرامەتێ دێمە ژ گەنم و جەهـ و گوندۆران[٥٤].

## گوندێ كۆنەباك:

كۆنەباك ب دووراتییا (٧)كم دكەڤیتە رۆژئاڤایێ ناحیا دارەتوو ب جادەكا نە ڤێركری، رۆژهەلاتێ گوندێ زمزمۆك و رۆژئاڤایێ گوندێ زەنگەنان .

ناڤێ گوندی یێ ژ (كۆن + باك) هاتییە وەرگرتن، چونكی ئەڤ گوندە یێ (كۆن ب واتایا كەڤن و دیرۆكی) یە و گوندەك ب ناڤێ (باك) ل نێزیكی ڤی گوندی تا سالێن چلان ژ سەدێ بووری هەبوویە و پاشی هەردو گوند بووینە ئێك و ناڤێ گوندی بوویە (كۆنەباك).

## پێكهاتا گوندی:

خەلكێ گوندی ژ تیرەیێن (شاسواری و گەردی) یێن (گۆران)ن. ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ٢٨٨ كەس بوون[٥٥]. نها ژ (٣٧٠) خێزانان كو دبنە دەوروبەرێن (٢٠٠٠) كەس پێكدهێت.

## شوینوار و جهێن كەڤنارێن گوندێ

خرابەیەكێ كەڤن ب ناڤێ (خرابەی سلێمان ئاغا) یێ ل گوندی هەی، گەلەك جاران تشتێن كەڤن ژ تاسولقە و گلینە لێ دهێنە دیتن، ب تایبەت ل دەمێ جۆتی و كێلانا ئەردی، لێ دیرۆكا ڤی خرابەی دیار نینە، نەهاتییە زانین كا كەنگی و ژ لایێ كێڤە هاتییە ئاڤاكرن.

دیسان جهەكێ دی یێ شوینواری ل نێزیكی گوندی ب ناڤێ (قەلا رەش)یێ ل گوندی هەی و گەلەك تشتێن كەڤن ل ناڤ ڤی شوینواری دهێنە دیتن، ژ وانان پارەیە كو مێژوویا وان ڤەدگەرێتەڤە سەردەمێ (عەبدولمەلك كورێ مەروانی) و ئەو پارە ژ كەرەستێ زیڤی یێ هاتییە دروستكرن.

دیرۆكا ڤی گوندی یا كەڤنە، لێ ب دروستی نەهاتییە زانین كا كەنگی هاتییە دروستكرن، لێ ل دووڤ گۆتنان دبیت مێژوویا وی ڤەدگەرێتەڤە بۆ بەری (٣٠٠-٤٠٠) سالان.

خواندنگەهـ بۆ جارا ئێكێ ل سالا (١٩٧٧)ێ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەكرن، نها تا پۆلا نەهێ بنەرەتی لێ دهێتە خواندن. هێلا كارەبێ ژی ل سالا (١٩٧١)ێ یا گەهشتییە ڤی گوندی.

د كەڤندا ژێدەرێ ئاڤا گوندی كانی بوون، لێ نها سێ بیرێن ئیرتیوازی ل گوندی هەنە، یا ئێكێ سالا (١٩٦٤) ێ یا هاتییە كۆلان.

رووبەرێ ئەردێ چاندنێ ل ڤی گوندی دگەهیتە (٥٠٠٠) دۆنەمان و چاندنا وان یا سەرەكی دەرامەتێ دێمە ژ گەنم و جەهـ و نۆك و باقلك و گوندۆر و ترۆزی و ...هتد[٥٦].

د ئامارا رێڤەبەریا ئامارا پارێزگەها دهۆكێ دا ناڤێ هندەك جهێن دی وەك گوند هاتیینە بەلێ دراستیدا ئەو نها نە گوندن بەلكی خرابەگوند یان كەڤنەوار یان جهێن خودانكرنا تەرش و كەوالی بوون وەك: بەنگینە، گورگاڤا، چیازەرك، كانی هرچ، گردەپان بچووك، گولەتەتەر، باك و بەهراوقەرەنی.

# ناحیا کەلەك[1]

بەرهەڤکرن: موسەدەق تۆڤی

دەڤەرا کەلەکێ یا ناڤدارە ب (کەلەکا یاسین ئاغای)، یان (ئەسکی کەلەك) و بەری هێرشێن میر محەمەد پاشایێ رەواندزی ل سالا (١٨٣٢)ێ یا ناڤدار بوو ب (کەلەکا داسنییان) کو ئێزدی لێ دژیان.

ناحیا کەلەك دکەڤیتە رۆژهەلاتێ قەزا حەمدانیێ (قەرەقۆش) و باشوورێ قەزا بەردەرەش ب دووراتییا (٤٢کم) ژ ناڤەندا قەزایێ، هەمی رووبەرێ عەردێ وێ دەڤەرا د ناڤبەرا هەردو رووبارێن زێ مەزن و خازری ڤەدگریت، رووبەری سەرناسەری ناحیێ ١٧,٧٦٥ کم ٥.

## سنوورێن ناحیا کەلەك:

**باکوور و باکوورێ رۆژهەلاتی:** ناحیا دارەتوو و سەنتەرێ قەزا بەردەرەش

**باشوور و باشوورێ رۆژهەلاتی:** رووبارێ زێ یێ مەزن - ناحیا گوێرا قەزا مەخموور

**رۆژهەلاتی:** رووبارێ زێ یێ مەزن- قەزا خەبات

**رۆژئاڤای:** قەزا حەمدانیی و قەزا بەرتللە یا پارێزگەها مووسلێ

ئەڤ ناحیە هەر د کەڤندا ب ڤی ناڤی (کەلەك) یا ناڤدارە چونکی گەلەك (کەلەك)، ب واتایا (بەلەم، یان ئەو تشتێن پێ ژ ئاڤێ دەرباز دبن) لێ هەبوون، کاروانی و سەربازان مفا ژێ دیتن و ب ناڤێ کەلەکان هاتییەناڤکرن، ل دەڤەرێ ئەڤ جهە ب (کەلەکا یاسین ئاغای) یا ناڤدارە، و پشتی ئێزدییان عەشیرەتێن (بۆت و شێخ بزێنی و ...) جهێ وان گرتن. و (یاسین ئاغا) بخۆ یێ ژ گوندێ (پەلکانە) ژ ناڤ عەشیرەتا شێخ بزێنی یا سەر ب چەمچەمال ڤە دگەل کۆمەکا زەلامان هاتینە (گەور گۆسك) و پاشتر ( دبیت پشتی سالا ١٨٣٢ێ بیت) دگەل ٣٠ سوارێن ژ کەس و کارێن خۆ ژ ئاڤا زێی دەرباز بوون و هاتنە گوندێ کەلەکێ و بوونە سەردار و مەزنێن ڤی گوندی لەوما ناڤێ گوند ژی بوویە کەلەکا یاسین ئاغای.

٢٢ گوند سەر ب سنوورێ ڤێ ناحیێ ڤەنە.

سالا (١٨٨٠)ێ کەلەك سەر ب دەڤەرا (قەرەقۆش) ڤەبوو، پشتی (قەرەقۆش- حەمدانیە) ل سالا (١٩٦٨)ێ بوویە قەزا، کەلەك ژی ب وێ قەزایێ ڤە گرێدان، ب بریارەکا کۆماری (مرسوم جمهوری) ل ٢٢ کانوونا دووێ ١٩٧٠ێ بریارا دامەزراندنا ناحیا کەلەك هاتییەدان و دگەل قەزا حەمدانیێ هاتییەگرێدان[2]. ل ١١ حزیرانا ١٩٨٧ ب بریارەکا دی یا کۆماری ئەڤ ناحیەیە هاتییەهەلوەشاندن[3]. پشتی سەرهلدانێ ب بریارەکا وەزارەتا ناڤخۆیی یا حکومەتا هەرێما کوردستانێ ناحیا کەلەك دگەل ناحیا خەبات یا پارێزگەها هەولێرێ کرینە یەك ناحیە و داینە دگەل پارێزگەها هەولێرێ[4]، ل ٢٩ مەها نیسانا سالا ٢٠٠٧ێ ب بریارەکا ئەنجومەنێ وەزیران یا هەرێما کوردستانێ بریارا دامەزراندنا قەزا بەردەرەش یا سەر ب پارێزگەها




نەخشەیێ کارگێری بۆ ناحیا کەلەك

دهۆکێ هاتیبەدان و ل دووڤ ڤێ بریارێ ناحیا کەلەك ب گوندێن وێ ڤە کەتینە سەر پارێزگەها دهۆکێ[٥].

ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ژمارا وان کەسێن ل دەڤەرا کەلەکێ سەر ب ناحیا (قەرەقوش) ڤە ل پارێزگەها مووسلێ دژیان ب ڤێ رەنگی بوون: کەلەك (کەلەك یاسین ئاغا) ٣٠٧ کەس، بشیریان ٥١٧ کەس، گەویلان ٤٥٦ کەس، زەهرە خاتون ٢٠٦ کەس، قەسرۆك ١٠٩ کەس و کەورەسۆر ٢٠٣ کەس بوون.

ل سەرژمێریا سالا (١٩٩٧)ێ یا ناحیێن قەزا ئاکرێ و ل دووڤ وان پسۆلەیێن ئازۆقەی کو ژ لایێ رێکخراوا (W.F.P)ڤە هاتینەدان ژمارا خێزانێن ناحیێ (١٠٣٦) سەرخێزان بوون کو دبوونە (٦٣٩٦) کەس، و ل ئامارا سالا (٢٠١٠)ێ هاتییە ئەنجامدان ژمارا ئاکنجییێن وێ ب (١٤١٢٤) دهاتنە تەخمینکرن و ژمارا ناڤەندا ناحیێ ب (٧٧٢٠) هاتینە تەخمینکرن. ل دووڤ ئامارا تەخمینکریا رێڤەبەریا ئامارا پارێزگەها دهۆکێ بۆ سالا ٢٠١٦ێ هژمارا سەرجەمێ خەلکێ ناحیا کەلەکێ ٣٨٨١١ کەسن، ژ وانا ١٤٣٥٥ کەس باژێری و ٢٤٥١٩کەس گوندنشینن[٦].

## پێکهاتا خەلکێ ناحیێ:

ژ لایێ جڤاکی ڤە خەلکێ ناحیێ و شەش گوندێن ب سەرڤە ژ عەشیرەتا گۆران تیرەیێن (بۆت و شێخ بزێنی و پالانی) نە، کوردێن شەبەك ژی یێن ل حەفت گوندان و زەنگەنە ل سێ گوندان و کاکەیی ژی ل چوار گوندان کو ئەو ژی ئایینزایەکێ تایبەتن و ب نەتەوە کوردن، ئانکو پێکهاتا ئایینی یا ناحیێ موسلمانێن سونە و شیعە و کاکەیی نە.

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ ناحیێ:

دەڤەرا کەلەکێ دەڤەرکا ب ناڤ و دەنگە بۆ چاندنێ، هندەك ژ خەلکێ وێ مژوولی خودانکرنا تەرش و کەوالی نە، د هەمان دەمدا دەڤەرێن دکەڤنە

سەنتەرێ ناحیا کەلەك



د سنوورێ ناحیێ دا پتریا وان کو دکەڤنە سەر رووبارێ زێی دەڤەرێن گەشت و گۆزارینە و زێدەباری وێ چەندێ کو خەلکێ وێ مفایەکێ باش ژ راڤە ماسیا وەردگرن، بوونا دەڤەرێ سەر زێیێ مەزن و رێکا ستراتیژیا هەرسێ پارێزگەهێن (هەولێر و دهۆك و مووسل) دەلیڤەکا دی یا کاری و رێنجبەریێ بۆ خەلکێ ناحیێ دابین دکەت، دیسان چەند جهـ و مەزارگەهـ ژی مینا (مەزارێ شێخ عەبدولقادر گەیلانی) لێ هەنە.

## سەروبەری کارگێریێ ناحیێ:

زێدەباری کارگێریا ناحیێ ١٢ فەرمانگەهـ: سەرۆکاتیا بازێرڤانیا کەلەك، سەرۆکاتیا بازێرڤانیا بەشیریان، فەرمانگەها کارەبێ، فەرمانگەها ئاڤێ، بنگەهێ پولیسێن کەلەك، بنگەهێ ئاسایشێ، بنگەهێ ساخلەمیێ ل کەلەکێ و بنگەهێ ساخلەمیێ ل بەشیریان، بنگەهێ هاتن و چوونێ، بنگەهێ بەرگریا شارستانی، هۆبا چاندنێ و هۆبا دارایبا کەلەکێ دگەل ١٢ خواندنگەهان کو دو ژ وان ئامادەیی نە لێ هەنە.

## کۆمەلگەها بشیریان:

د بنیاتدا گوندەکێ کەڤنارە و ل دووڤ گۆتنێن دانعەمران مێژوویا وی ڤەدگەریێتەڤە بۆ بەری پتر ژ (١٥٠)سالان، دکەڤیتە لایێ باشوورێ رۆژهەلاتێ قەزا بەردەرەش و ٥ کم ژ سەنتەری ناحیی دوورە، ناڤێ ڤێ کۆمەلگەهێ یێ ژ ناڤێ قەزا (بشێری) ل دەڤەرا جزیرا بۆتا ل باکوورێ کوردستانێ هاتی.

### سنوورێن کۆمەلگەهێ:

**باکووری،** گوندێن گەویلانی بۆتان، بەرگێل، کەلکان، کۆراو و شەمسەخر.

کۆمەلگەها بشیریان



**باشووری،** گوندێن كەورەسۆر و سەنترێ ناحیێ.
**رۆژهەلاتی،** رووبارێ زێ یێ مەزن.
**رۆژئاڤیی،** ئاڤارێ گوندێ كەورەسۆر.

### پێكهاتا كۆمەلگەهێ:

پتریا هەرە مەزنا خەلكێ كۆمەلگەهێ ژ عەشیرەتا گۆرانن، ل دووڤ ئامارێن كارگێریا ناحیێ ١١٥٠ خێزان ل ناحیێ دژین دبنە پتر ژ ٦٢٠٠ كەسان.
ژیانا خەلكێ وێ ل سەر چاندنێ یە و پتر ژ (١٠) تغارێن عەردی هەنە، هندەك ژی مژوولی خودانكرنا تەرش و كەوالی نە و هندەكێن دیتر مژوولی خودانكرن و راڤە ماسییانە، گەلەك ژ خەلكێ وێ مووچەخۆرن، كارگەهەكا خیز و حەسویێ ل ڤێ كۆمەلگەهێ هەیە.
سەر و بەرێ خزمەتگوزاریان ل ڤێ كۆمەلگەهێ یێ باشە، نها باخچێ زارۆكان و خواندنگەهـ و بنگەهێ تەندروستی و مزگەفت و بازێرڤانی لێ هەنە.
بۆ جارا ئێكێ خواندنگەهـا سەرتایی ل سالا (١٩٥٩-١٩٦٠)ێ و خواندنگەها ئامادەییا تێكەل ل سالا ٢٠١٢ێ لێ هاتینە ڤەكرن. ل سالا (١٩٧٦)ێ بنگەهێ تەندروستی ل بەشیریان هاتییەڤەكرن و هێلا كارەبێ ژی ل سالا (١٩٨١)ێ گەهشتییێ و سالا ١٩٨٥ێ پرۆژێ ئاڤێ لێ هاتییە دانان.

## گوندێ گەویلان:

ب گەویلانی بۆتان ژی دهێتەناڤكرن، گوند دكەڤیتە باشوورێ قەزا بەردەرەش ٨ كم ژ سەنتەرێ ناحیێ دوورە، ناڤێ گوندی ڤەدگەرێتەڤە بۆ بەرێ (١٧٠)ێ سالان.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ گردەپانە.
**باشووری،** گوندێ كەورەسۆرە.

گوندێ گەویلانێ بۆتان



**رۆژهەلاتی:** گوندێن كۆراو و شەمسەخرە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ گەویلانی نوێ (كەمپی گەویلان)، ئاچ قەلای گەورە و بچووك.

خەلكێ گوندی ژ عەشیرەتا بۆتانن ژ تیرەیا (رەش بۆت) و پێكهاتینە ژ چوار بەرەبابان، نها گوند ١٠٨ خێزانە دبنە ٥٣٧كەس.

سێ جاران گوند ژ ئالیێ حكومەتا عیراقێ ڤە هاتییەخرابكرنن دواجار ل سالا (١٩٧٤)ێ گوند كاڤلكرینە و ل رۆژئاڤایێ گوندی گوندەك ب ناڤێ (قەحتانیە) ئاڤاكرینە و عەرەب لێ ئاكنجیكرن. سالا (١٩٩١)ێ خەلكێ گوندی ڤەگەریانەڤە سەر وارێ بابكالان و ل سالا (٢٠٠٣)ێ وان عەرەبان ژێ ئەو دەڤەر هێلان.

## زێدەرێن ئاڤا گوندی:

نها دو بیرێن ئیرتیوازی ژێدەرێن ئاڤا گوندینە و ب رێكا كۆمكرنی ل دو تانكییان دهێتەدابەشكرن ل سەر مالان.

ژیانا خەلكێ گوندی ل سەر چاندنێ و ب خودانكرنا تەرش و كەوالی یە، رووبەرێ عەردێ چاندنێ (٨٠٠٠) دۆنەمە و پاوانێ گوندی (٤٥٠٠) دۆنەمە.

سالا (١٩٩٧)ێ خواندنگەهەك هاتییەڤەكرن و ل سالا ٢٠٠٤ێ ئەڤ خواندنگەهە بوویە خواندنگەها گەویلانا بنەرەتی یا تێكەل، هێلا كارەبێ ژێ ل سالا (٢٠٠٥) گەهشتییە گوندی هەر د وی سالێدا تۆرا ئاڤێ ل گوندی هاتییەدانان.

## گوندێ نازمیە:

گوند دكەڤیتە باشووری قەزا بەردەرەش ٨كم ژ سەنتەرێ كەلەكێ دوورە، سالا (١٩٤١)ێ هاتییە ئاڤاكرن و پێشتر ناڤێ وی (پیر حەلان) بوو.

## سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێن ئاش قەلا و بەحرە.

**باشووری:** سەنتەری ناحیا كەلەك.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ كەورە سۆر.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ مەنكوبە.

## پێكهاتا خەلكێ گوندی:

خەلكێ گوندی ژ عەشیرەتا گۆرانن و مالەك شەبەك ژێ دگەل خەلكێ گوندی دژیتن، د دەمێ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ ئەڤ گوندە سەر ب ناحیا حەمدانیێ بوو و هژمارا خەلكێ گوندی ٧٨ كەس بوون[٧] ، د دەمێ بەرهەڤكرنا ڤێ نڤیسینێدا هژمارا خەلكێ گوندی ٤٢ خێزانن دبنە ١٤٥ كەس.

گوند ل سالا (١٩٧٤)ێ ل سەر دەستێ حكومەتا عیراقی هاتییە تەعریبكرن، سالا ٢٠٠٣ سەرژنوو هاتییەڤە ئاگاكرن.

ژیارا خەلكێ گوندی ل سەر چاندنێ و خودانكرنا تەرش و كەوالی یە.

بۆ جارا ئێكێ ل (١١) چریا دووێ سالا (٢٠٠٣)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەكرن و ل سالا ١٩٦٨ێ تۆرا دابەشكرنا ئاڤێ ل گوندی هاتییەدانان و سالا ٢٠٠٠ێ كارەب گەهشتییە گوند.

## گوندێ ئاچ قەلا:

گوند دكەڤیتە سەر گرەكێ پان و بەرفرەهـ ل باشوورێ قەزا بەردەرەش، سالا (١٩٦٠)ێ هاتییە ئاڤاكرن، ناڤێ گوندی یێ هاتی كو ئاشەك ل بەر گوندی بوویە لەوما ناڤێ وی ژێ بوویە (ئاش قەلا)، یان دبیت ناڤێ گوندی یێ ژ (ئاچ قەلا) هاتی كو دكەڤیتە باكوورێ كوردستانێ و كۆچەران ئەو ناڤ یێ دگەل خۆ هینای، ئەڤ گوندە نها بوویە دو گوند ب ناڤێ ئاچ قەلای گەورە و ئاچ قەلای بچووك.

## سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ توركوماس و سنووری ناحیا دارەتوو.

**باشووری:** گوندێ گوندێن نازمیە و بەحرە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ گوندێن گەویلان و گەورەسۆر.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ گوندێن تورکوماس و سێودینان.

## پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتێن (شەبەك، زراری، بۆت)ن، نها نێزیکی (٣٠) مالان یێن ل گوندی.

ژیارا خەلکێ گوندی ل سەر چاندنێ و خودانکرنا تەرش و کەوالی یە، رووبەرێ عەردێ ڤی گوندی (١٥٠٠) دۆنەمن.

سالا (٢٠٠٤)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەکرن و کارەب ژی ل سالا (٢٠٠٣) گەهشتییێ.

## گوندێ گەورەسۆر:

گوند دکەڤیتە باشوورێ رۆژهەلاتێ بەردەرەش و ٢کم ژ سەنتەری ناحیێ دوورە، دیرۆکا ئاڤاکرنا وی وەکی ژ دانعەمران هاتییە بهیستن ڤەدگەریێتەڤە سالا (١٩٤٠)ێ، ناڤێ وی ژی یێ هاتی کو ئاخا گوندی یا سۆرە (خۆلە سۆر).

## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ گەویلان.

**باشووری:** ناڤەندا ناحیێ.

**رۆژهەلاتی:** کۆمەلگەها بشیریان و رووبارێ زێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ نازمیەیە.

## پێکهاتا خەلکێ گوندی:

خەلکێ گوندی عەشیرەتا گۆران ژ تیرەیا (بۆت)ن، د دەمێ ئەنجامدانا سەرژمێریا ١٩٥٧ێ سەر ب ناحیا قەرەقوش (حەمدانیێ) بوو و هژمارا خەلکێ گوندی ١٠٩ کەس بوو[٨]، د دەمێ بەرهەڤکرنا ڤێ نڤیسینێدا ژ ٨٦ سەرۆکخێزانان پێکهاتییە دبنە پتر ژ ٤٨٠ کەسان.

گوندێ گەورەسۆر



**زێدەرێن زیارا خەلكێ گوندی:**

ژیارا خەلكێ وی ل سەر چاندنێ یە و گوندی نێزیكی (٦٠٠٠) دۆنەمێن عەردی هەنە، گەنم و جەهی دچینن و هندەك بیستانان چێدكەن و هندەك ژی دەبارا ژیانا خۆ ب ماسیگری و خودانكرنا ماسییان ب رێڤەدبەن، دیسان چەند كارگەهێن حەسو و خیزی ژی لێ هەنە كو خەلكەك ل سەر كار دكەن.

شوینوار و جهێن كەڤنار: ل سنوری گوندی شوینوار و جهێن كەڤنار ب ناڤێن: شێخ عەبدولقادر، شێخ محەمەد، كانی هەنارە و گۆرستانا گوندی هەنە.

سالا (٢٠٠٠)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەكرن، كارەب ژی سالا (١٩٩٤)ێ گەهشتییە گوندی و سالا ٢٠٠١ی تۆڕا دابەشكرنا ئاڤێ ل گوندی هاتییەدانان.

## گوندێ تۆلەبەن:

گوند دكەڤیتە باشوورێ قەزا بەردەرەش سەر ب ناحیا كەلەكێ یە و ١٠كم ژ كەلەكێ دوورە. ناڤێ گوندی یێ هاتی كو خەلكێ گوندی سەلك دروستدكرن و كارێ نێچیرێ پێ دكرن و ناڤ ژ تۆلبەند بۆ تۆلبەن. سالا ١٩١٠ێ ل سەر دەستێ مەزنێ ڤێ گوندی ب ناڤێ (گرامی) هاتییە دروستكرن.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێ گەویلانە.

**باشووری:** گوندێ ئاش قەلایە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ نازمیەیە.

**رۆژئاڤایی:** رووبارێ خازرە.

**پێكهاتا گوندی:**

خەلكێ گوندی هەمی كاكەیینە، د سەرژمێریا ١٩٥٧یدا ناڤێ گوندی ب (تل لبن) هاتییەتوومارکرن و دەمی هژمارا خەلكێ گوندی ٢٨٣ كەس بوو[٩]، نها ژمارا مالێن وان نێزیكی ٥٥٠ مالانە كو دبنە (٦٠٠) سەرۆكخێزان.

**شوینوار و جهێن كەڤنار:**

ژ شوینوارێن گوندی (تەپەی خراب) كو هەتا نها كەرەستێن كەڤن لێ دهێنە دیتن، دیسان گۆڕەك ب ناڤێ مۆسالكازم لێ هەیە پیروزییا خۆ ل نك خەلكێ دەڤەرێ هەیە.

گوند ل سالا ١٩٨٨ێ ل سەر دەستێ حكومەتا عیراقێ هاتییە كاڤلكرن و خەلكێ وێ راگوهاستینە كۆمەلگەها (پیرەمەگرۆن) ل رۆژئاڤایی سلێمانیێ و پشتی سالا ١٩٩١ێ خەلكێ وێ ڤەگەریاینە سەر جهێ خۆڤە.

**زێدەرێن زیارا خەلكێ گوندی:**

ژیانا خەلكێ گوندی ل سەر چاندنێ یە و نێزیكی ٨٠٠٠ دۆنەمێن عەردی یێن هەین، ٥٠٠٠ دۆنەمان بۆ چاندنێ ب كار دهینن و یێن دی وەكی چەروانە بۆ خودانكرنا تەرش و كەوالی یە، ئەڤ گوندە یێ ب ناڤ و دەنگە بۆ ڤێ چەندێ و ل سالا ١٩٩٢ێ نێزیكی ٢٠٠٠٠سەرێن پەزی لێ هەبوون.

ل سالا ١٩٦٥ێ بۆ جارا ئێكێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەكرن و نها سێ خواندنگەهـ لێ هەنە زارۆكێن هندەك گوندێن دەوروبەر و ئەوێن ژ سەرگوندێن خۆ مشەختبووین ژی ل ڤان خواندنگەهان دخوینن، ل سالا ١٩٨١ێ كارەب گەهشتییە گوندی.

## گوندێ زەنگەل:

ب دووراتییا ٥كم ژ سەنتەرێ ناحیێ دوورە و دهێتەگۆتن ئەڤ پەیڤە ژ پەیڤا زەنگین هاتییە.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** سەنتەرێ ناحیێ

**باشوور:** گوندێ كۆلەبۆر.

**رۆژهەلاتی:** رووبارێ زێ یێ مەزن، ئالیێ دیی رووباری

قەزا خەبات یا هەولێری.

**رۆژئاڤای:** گوندێن چەمە کۆر و تەل ئەسوەد

**پێکهاتا خەلکێ گوندی:**

ژ هەردو نەتەوەیێن کورد و عەرەب پێکدهێت ب ئایین موسلمان و ب عەشیرەت کاکەیی نە، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ گوندی ٢٩١ کەس بوو[١٠]، نها ١٦٩ خێزان ل گوندی هەنە دبنە٨٤٢ کەس.

**شوینوار و جهێن کەڤنارێن گوندی:**

گۆرستانا کەڤنا گوندی و مەزارێ کاکەییان.

بیرەکا ئیرتیوازی ژێدەرێ سەرکیێ ئاڤا گوندی یە و ئاڤا بیرێ ل تانکییە کی کۆمدبیت و ب رێکا تۆرا ئاڤێ ل سەر مالێن گوندی دهێتەدابەشکرن.

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

پتریا خەلکێ گوندی مژوولی چاندنێ نە و گەنم و جەهی دچینن و بیستانان دکەن هندەك ژی کارێ خودانکرنا تەرش و کەوالی و ئاژەلداریێ دکەن و هندەك ژی دەبارا ژیارا خۆ ب خودانکرنا ماسییان دکەن.

تنێ جارەکێ گوند ژ ئالیێ حکومەتا عیراقی ڤە هاتیبەخرابکرن و ڤالا کرن ژ خەلکێ وی، پشتی تەنابوونا سەروبەری خەلکی زڤرینەڤە و گوند سەر ژ نوو ئاڤاکرییەڤە.

ل سالا ١٩٧٥ێ بۆ یەکەمین جار خواندنگەهـ ل گوندێ هاتییەڤەکرن. ل سالا ١٩٨٠ کارەب گەهشتییە گوندی و سالا ١٩٨٥ێ تۆڕا ئاڤێ ل گوندی هاتییەدانان.

پرا کەلەکێ یا کەڤن



# قەزا ئاكرێ

ئیبراهیم یونس زێباری

## لایێ دیرۆكی و كارگێری:

ئاكرێ باژێرەكێ كەڤنارێ كوردستانێ یە، ژ سەدسالیا حەفتێ بەری زایینێ ڤە سەنكەكا شارستانی بازرگانی و سیاسی هەبوو، دەولەتا میدی (٦١٢پ. ز- ٥٥٠ پ.ز) ئەڤ دەڤەرە ژ دەستەلاتێ دەولەتا ئاشووری ئینایە دەر و میرەكێ كوردا ب ناڤێ میر زەند دەستەلاتی لێ كریە و ژمارەكا زۆرا ئاڤاهییان ل رەخێن كەلا ئاكرێ ئاڤاكرینە و ژێدەر دبێژن ل سالا (٥٣٣پ. ز) زەرەدشت سەرا ئاكرێ دایە. سالا (١١٥پ. ز) ئیمبراتۆرێ رۆمانی تراگان دەست ب سەر ئاكرێ دا گرتییە و د ڤۆناغێن ل دووڤدا ئاكرێ وەكی هەمی دەڤەرا بەهدینان د هەمان كاودان دا بووریە[1].

ئاكرێ ب درێژاهیا میرگەها بەهدینان چەندین جاران تووشی هێرشێن جودا جودا بوویە، وەكی هێرشا والیێ مووسلێ حسێن پاشایێ جەلیلی ل سالا (١٧٤٠)ێ بەری وێ هێرشا نادر شاهی و هێرشا محەمەد پاشایێ رەواندزی ل سالا (١٨٣٢)ێ و هێرشا داویێ یا محەمەد پاشا ئینجە بەیرەقدار بوویە كو فەرمانا لێدان و خرابكرنا كەلا ئاكرێ دای و ژ ڤێ سالێ ئاكرێ دگەل سنجەڤا مووسل یا ئوسمانی هاتە گرێدان[2]. سالا (١٨٧٧)ێ ئاكرێ بوویە قەزایەك سەر ب مووسل ڤە و یەكەم قایمقامێ وێ (عەلی یاوەر ئەفەندی) بوو و ل هەمان سال باژێرڤانی ژی ب سەرۆكاتیا قایمقامی لێ هاتە دامەزراندن[3].

پشتی شەرێ جیهانیێ ئێكێ لەشكەرێ ئنگلیزی هاتە عیراقێ و گەهشتە دەڤەرا مووسل ژی و ل ٤ چریا دووێ سالا (١٩١٩)ێ كۆلۆنێل بیل، فەرماندەیێ سیاسی یێ بریتانی ل مووسل و هاریكارێ وی كاپتن سكوت و دو پاسەوانێن وان ل بیرا كەپرا ل دەڤەرا ئاكرێ د روی ب روبوونەكێ دا دگەل خەلكێ دەڤەرێ هاتنە كوشتن. لێ ل ٢٧ هەمان هەیڤ لەشكەرێ ئنگلیزی دەستەلات ل ئاكرێ گرتەدەست ڤە[4].

ل دەستپێكا دەهێ ئێكێ ژ سەدسالیا بیستێ (ویگرام) سالۆخەتا ئاكرێ دكەت كو باژێركەكێ چیایی یە و پەسنا جوانیا وێ دكەت[5]. هەر وەسان (فیلد) ژی ل سالا (١٩٢٦)ێ سالۆخەتا باژێركی دكەت كو دكەڤیتە دووراتیا (٦٥) میلان باكوورێ رۆژهەلاتێ باژێرێ مووسل و رێژەیەكا مەزن یا ئاڤێ و ژێدەرێن كانییان لێ هەنە و ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٢٢)ێ ئاكرێ پێكهاتیبوو ژ (٨٠٠) خانییان و ژمارا خەلكێ وێ ٤٠٠٠ كەسن و دەڤەرێ ٢٧٠٠٠ پەز لێ هەنە، پتریا خەلكێ وێ كوردن، ژبلی ٤٠ خێزانێن

جوییان و ٢٠ خێزانێن كلدانییان و جوییان گەلەك دوكان هەبوون و ئەو د شەهرەزابوون د چێكرنا زیڤی دا، ب تایبەت خەنجەرێن كوردی[٦].

**ل سەر ناڤێ ئاكرێ چەند بۆچوون هەنە:**

هندەك دبێژن ناڤێ ئاكرێ ژ پەیڤا كوردی (ئاگر) هاتییە، كو خەلكێ دەڤەرێ بەری هاتنا مەسیحی ئاگرپەرێس بوون و ئاگر نیشانا خێر و بەرەكەتێ یە و كلدان و ئارامییان وەرار ئێخستنە ڤێ پەیڤێ و كرنە (عەقر).

جەمال بابان دبێژیت ئەڤ ناڤە ب واتایا خرابە دهێت.

هندەك ژێدەرێن دی یێن سریانی ب (مەرگا) كو پەیڤەكا كلدانیبا كەڤنە ب ناڤكرینە و ئەڤ ناڤە بەلكی دەڤەرەكا بەرفرەهتر بخۆڤە دگریت كو ئاكرێ و دەور و بەران ژی ڤەدگریت.

گەرۆك و جوگرافیناسێن عەرەب ب (عەقرە) ناڤكرینە، یاقوت ئەلحەمەوی كو سالا (٦٠٤مـش/١٢٠٧ز)ی سەرەدانا ڤی جهی كرییە و چاڤپێكەتن دگەل زانایێن وێ كرییە و ژ وانان (محەمەد ئیبن فەزلون) و گۆتییە كو (عەقرە) (كل فرجە بین جبلین- ب واتایا هەر عەردەكێ ڤەكری یێ دناڤبەرا دو چیایاندا)، دیسان ژێدەرێن ئیسلامی ژی بەحسی ڤی جهی كرینە و ب (المرج) ناڤكرینە، ب واتایا (عەردێ نزمێ دناڤبەرا چیایانرا).

ئیبن حەوقەل دبێژیت رستەڤەكە (هەر جهەكێ گوند و باغ لێ هەبن) سەر ب نەینەواڤەیە.

دەمێ دبێژن (عەقر الحمیدیە) ژی ئارمانج ژێ ئەو عەشیرەتا حەمیدیانە كو ل وێ دەڤەرێ یا ئاكنجی.

دیسان ئەڤ ناڤە د چەند پەرتووك و نڤیسینێن دی ژی دا هاتییە، وەكی (غایە المرام) یا دیروكنڤیسێ مووسلی یاسین خەیرەللا ئەلخەتیب كو دگۆتە ئاكرێ (كچك استنبول)، ب واتایا ستەنبۆلا بچویك كو ئەو ژی مینا ستەنبۆلێ یا ب خێر و بێر و بەرەكەتە و ئاڤەكا زۆر و جوانیبا سرۆشتی لێ هەیە.

ئەنوەر مایی دبێژیت ئاكرێ بازێرێ (ادیابینیە)، هەر وەسان گۆتینە ئاكرێ (الحبال)، ب واتایا عەردێ ب زاخ كو گەلەك فێقی و دەرامەت ژێ دهێت، لێ پتریا بۆچوونان بۆ هندێ دچن كو ناڤ ژ (ئاگر) هاتییە ژ بەر خەلكێ دەڤەرێ یان ئاگرپەرێس بوون، یان بەری هاتنا مەسیحییەتێ ل سەر ئایینێ زەرەدەشتی بوون و ئاگر ژ تشتێن گرنگ بوو د ناڤبیر و باوەرێن وان و تا نها چەند جهـ و پەرستگەهێن ئاگری ل ڤی جهی هاتینە دیتن و تا نها ژی كورد ب رەنگەكێ گشتی ڤێ پەیڤێ بۆ (ئاگر) ب كاردهینن، لێ ئەو پەیڤ هاتییە گوهارتن و د ژێدەرێن میژوویی یێن ئیسلامی دا ب (عقرە) هاتییە، لێ كورد تا نها ژی هەمان پەیڤا كەڤن بكاردهینن و دبێژنێ (ئاكرێ)[٧].

پشتی ل ٢٣ تەباخا سالا (١٩٢١)ێ حكۆمەتا شاهی ل عیراقێ هاتییە دامەزراندن، یەكەمین قایمقامێ دەولەتا عیراقی ب ناڤێ (ئەمین ئەفەندی) هاتە دامەزراندن و ئاكرێ هەر ژ دامەزراندنا دەولەتا عیراقی و هەتا سالا (١٩٦٩)ێ هەر چەندە پرانیبا خەلكێ وێ كوردن، لێ وەكی قەزایەكا سەر ب مووسل ڤە و پشت گوهـ هاڤێتی سەرەدەری دگەل دهاتەكرن، ئەڤ رەوشە هەتا سالا (١٩٩١)ێ وەكی خۆ ما، تا ل ١٢ای ئادارا خەلكێ ئاكرێ دژی داگیركەرا سەرهلدای و ب بریارا حكۆمەتا هەرێما كوردستانێ ل ١٥ تیرمەها سالا (١٩٩٢)ێ ئاكرێ ب پارێزگەها دهۆكێ ڤە هاتە گرێدان و یەكەم قایمقام پشتی سەرهلدانێ (تێلی ئەمین) بوو، هەتا نها نێزیكی ٥٠ قایمقام لێ هاتینە دامەزراندن[٨]. ئاكرێ ژبلی سەنتەرێ ئاكرێ بخۆ هەرسێ ناحیێن دینارتە و بجیل و گردەسێن بخۆڤە دگریت.

**لیستا ناڤێ سەرۆكێن یەكەیێن كارگێری یێن قەزا ئاكرێ دناڤبەرا سالێن (١٨٧٧- ٢٠١٦)**

| | |
|---|---|
| ١- عەلی یاوەر ئەفەندی | ١٨٧٧ -١٨٨١ |
| ٢- عەبدولوارث | ١٨٨١ -١٨٨٨ |
| ٣- دەرویش ئەفەندی | ١٨٨٨ -١٨٩٣ |
| ٤- ئەلحاج یەعقوب ئەفەندی | ١٨٩٣ -١٨٩٤ |
| ٥- عەبدولقادر ئەفەندی | ١٨٩٤ -١٨٩٩ |
| ٦- صالح ئەفەندی | ١٨٩٩ -١٩٠٣ |

٧- رەفعەت ئەفەندی ١٩٠٣- ١٩٠٧
٨- صالح بەگ ١٩٠٧- ١٩١٢
٩- حەجی حەسەن ئەفەندی ١٩١٢- ١٩٢١
١٠- ئەمین ئەفەندی ١٩٢١- ١٩٢٧
١١- شاكر ئەلقەساب ١٩٢٧- ١٩٣٠
١٢- مەردان محەمەد ١٩٣٠- ١٩٣٥
١٣- سەعید عەبدۆلقادر ١٩٣٥- ١٩٣٧
١٤- جەلال سائیب ١٩٣٧- ١٩٣٨
١٥- نازم وەنداوی ١٩٣٨- ١٩٤٠
١٦- عزەت نەجیب ١٩٤٠- ١٩٤٣
١٧- جەمال رەفعەت ١٩٤٣- ١٩٤٤
١٨- فازل نوری ١٩٤٤- ١٩٤٦
١٩- بورهانولدین ئەسعەد ١٩٤٦- ١٩٤٧
٢٠- مەهدی ساقی ١٩٤٧- ١٩٥٠
٢١- شاكر فەتاح ١٩٥٠- ١٩٥١
٢٢- عارف تالەبانی ١٩٥١- ١٩٥٢
٢٣- عەبدولمەجید بەرواری ١٩٥٢- ١٩٥٣
٢٤- ئیسماعیل حەقی رەسول ١٩٥٣- ١٩٥٤
٢٥- شاكر فەتاح ١٩٥٤- ١٩٥٥
٢٦- عەبدولمەجید بەرواری ١٩٥٥- ١٩٥٦
٢٧- سوبحی عەلی ١٩٥٦- ١٩٥٨
٢٨- ئەكرەم عەبدولمەجید ١٩٥٩- ١٩٦٠
٢٩- عەبدولجەبار ئەلئالۆسی ١٩٦٠- ١٩٦٢
٣٠- صادق ئەلتەبەتەبائی ١٩٦٢- ١٩٦٥
٣١- محەمەد عەلی بریفكانی ١٩٦٥- ١٩٧٠
٣٢- یەحیا جاف ١٩٧٠- ١٩٧١
٣٣- جەلال خۆشناو ١٩٧١- ١٩٧٤
٣٤- تەلعەت هادی ١٩٧٤- ١٩٧٤
٣٥- كازم عەبدولرزا ١٩٧٤- ١٩٧٤
٣٦- حسێن فەتحوللا ١٩٧٤- ١٩٧٥
٣٧- سەعید سلێمان ١٩٧٥- ١٩٧٨
٣٨- ناجی خەزعەل زێدان ١٩٧٨- ١٩٧٩
٣٩- ئیبراهیم كەریم عەزیز ١٩٧٩- ١٩٨٢
٤٠- موعتەسم عەبدولكەریم بەرزنجی١٩٨٢- ١٩٨٤
٤١- رەسول ئەسعەد شێتنە ١٩٨٤- ١٩٨٧
٤٢- عەتاللاعەلوان عەبدۆللا ١٩٨٧- ١٩٨٩
٤٣- جەلال عەبدۆللا صالح ١٩٨٩- ١٩٩١
٤٤- مومتاز هاشم ١٩٩١- ١٩٩١
٤٥- تێلی ئەمین عەلی ١٩٩٣- ١٩٩٦
٤٦- یەحیا عەبدولعەزیز بەرزنجی ١٩٩٦- ١٩٩٨
٤٧- رەشید حسێن ئەحمەد ١٩٩٨- ٢٠٠٢
٤٨- جەعفەر مستەفا مەعروف بەرزنجی٢٠٠٢-٢٠٠٥
٤٩- جەهوەر عەلی عەزیز ٢٠٠٥- ٢٠١٦
٥٠- مازن محەمەد سەعید ٢٠١٦- بەردەوامە

## لایەنێ جوگرافی:

قەزا ئاكرێ پێكهاتییە ژ چیا و گر و دەشتان، دكەڤیتە دناڤبەرا هەردو دەڤەرێن سۆران و بەهدینان و سێ پارێزگەهان پێكڤە گرێدەت، ئەو ژی هەولێر ب دووراتییا (١١٠كم) باشوورێ رۆژهەلات، مووسل ب دووراتییا (٩٠كم) باشوورێ رۆژئاڤای، دهۆك (١١٨كم) رۆژهەلاتی كو نها قەزایەكە سەر ب وێڤە و رێژەیا (١٣٪)ێ ژ رووبەرێ وێ پارێزگەهێ پێكدهینت و بەرێ هینگێ سەر ب پارێزگەها نەینەواڤە بوو كو دكەتە باكوورێ رۆژهەلاتێ وێ پارێزگەهێ. ل سەر هەردو هێلێن درێژیێ (٤٤,٩ و ٤٢.٥) رۆژهەلاتی و هەردو بازنەیێن پانیێ (٣٧,٠٢ و ٣٦,٣٦) باكووری. رووبەرێ وێ (١٩٤١ كیلومەترێن چوارگۆشەنە)، كو دبیتە (٦٨١٣٨٢) دۆنەم، ژ وانان (٥٤٩٨٢) دۆنەم سەنتەرێ قەزایێ یە. رووبەرێ باژێرێ ئاكرێ هەتا سالا (١٩٩٠)ێ تنێ ١٢ كیلومەترێن چوارگۆشە بوون، لێ ل سالا (١٩٩٨)ێ بوو ٥٦ كیلومەترێن چوارگۆشە و نها دگەهیتە ١١٣ كیلومەترێن چوراگۆشە و بازێرڤانییا ئاكرێ ب هەڤكاری دگەل كومپانییەكا ئەلمانی

دیمەنەك ژ ئاکرێ



رابووینە ب دانانا دیزاینێ بنەرەتی یێ باژێری کو کار ل سەر ڤی رووبەری هەتا سالا (٢٠٣٥)ێ بکەن. ئاکرێ دکەڤیتە بلنداهیا (٦٦٥م) ل سەر ئاستێ دەریایێ و (٢٤٢٨٤) خێزان کو دبنە (١٤١٩١٥) کەس لێ دژین، ژ وانان (١١٤٦٥) خێزان کو دبنە (٦٦٢٥٠) کەس ل ئاکرێ و گوندێن دەور و بەر کو دبنە ١٣ گوند دژین[٩].

سنوورێن وی بەردەوامی هاتینە گوهارتن و داوی جار ناحیا بەردەرەش ژێڤەبوویە و بوویە قەزایەکا سەربخۆ، سنوورێن قەزا ئاکرێ یێن سرۆشتی ب ڤی رەنگی نە:

**باکووری:** دەشتا زێ و چیایێ شرین.

**باشووری:** چیایێ مەقلووبی.

**رۆژهەلاتی:** رووبارێ زێ مەزن (زێ بادینان).

**رۆژئاڤایی:** رووبارێ خازری.

لێ ژ لایێ جوگرافیا سیاسی ڤە سنوور ب ڤی شێوەی نە:

**باکووری:** هەردو قەزایێن ئامێدیێ و مێرگەسۆر.

**باشووری:** قەزا حەمدانیە کو نها ژی سەر ب پارێزگەها نەینەواڤەیە.

**رۆژهەلاتی:** پارێزگەها هەولێرێ.

**رۆژئاڤایی:** قەزا شێخان.

ژمارا خێزان و ئاکنجیێن قەزایێ ل شواتا (١٩٩٧)ێ ب ڤی شێوەی بوون:

| ژ | دەڤەر | ژ. خێزانان | ژ. کەسان |
|---|---|---|---|
| ١ | ناڤەندا ئاکرێ | ٣٢٣٤ | ١٩١٥٥ |
| ٢ | گوندێن ناڤەندێ | ١١٦١ | ٧٦٦٦ |
| ٣ | ناحیا دینارتە | ٢٩٥٤ | ١٨٥٦٢ |
| ٤ | ناحیا بجیل | ١٧١٠ | ١١٨١٤ |
| ٥ | ناحیا گردەسین | ٤٠٥٧ | ٢٨٣٤٣ |

ئاکرێ چەندین جهێن شوینواری لێ هەنە، ژ وانان کەلا ئاکرێ و کونە کۆتر و گوندك و گەلیێ رەش کو سەر ب ناڤەندا ئاکرێ ڤەنە، هەر وەسان گر ئاشوور و

سەرکەڤرۆك و خرابە ژووری و ژێری و کەلەدێر و زێراڤ ل ناحیا گردەسین و کەلاتێ و گەلی نێروە خانەکی و گەلی زەنتە ل ناحیا بجیل و گوندێ سۆس ل ناحیا دینارتە و... چەندین شوینوارێن دی[١٠].

## کانیێن ئاکرێ:

ئاکرێ جهەکێ دەولەمەندە ب سامانێ ئاڤی و چەندین کانی لێ هەنە، ژ وانان:

کانی زەرك کو (٧٠٠م) ژ ناڤەندا قەزایێ دوورە و وەکی جهێ چارەسەریا نەخۆشییان دهێتە بکارهینان، کانی تلویتان، کانیا قازی ل باکوورێ رۆژهەلاتا بازێری.

کانیێن خەچکێ ، خەندانێ، ل رۆژئاڤای بازێری.

زێدەباری چەندین کانیێن دی کو ب هەڤرا دو شیڤێن بچویك ژ هەردو ئالیێن بازێری دروست دکەت و چەند کانیێن دی درێژنە سەر و ب گەهشتنا وان هەردو شیڤان ل باشوورێ رەزان رووبارەکێ بچویك دروست دکەن[١١].

ب کورتی پتر ژ (٨٠) کانییان ل هەرسێ تاخێن کۆرەڤا و چوستەیی و قاپەکی هەنە، مینا کانیێن (پاشای، ڤۆناغا، نێچیرڤانا، قەشەی، تەوکێ، ئاقدێ، زیادی، مزگەفتا تلویتان، بیێ، مام عەبدالکی، ئستێنکێ، مەمیێ، بیك و زاڤا، مزگەفتا حەجیا، ستێ، سیپەی کو جهەکێ گوزاری یە، گیرەی، سیارا، عەزیز عەلی، مشکا، پێغەمبەری، فەلەی، سیمێ، حلانی، قازی، سەیدای، حاجوی، دوشیڤانێ، عەرێ، کانیلۆك، شێخ تاهری) ئەڤە هەمی ل تاخێ کۆرەڤا.

یێن تاخێ قاپەکی ژی پێکهاتینە ژ کانیێن مام گەرۆك، سارمیێ، سارمیا خارێ، سینێ، شێخ ماڤی، شینی، کوکا، ملا سالمی، عەنجافری، بندۆلی، میرا، نیڤەکێ، خاجا، عەبوی، خدر غازی، شابی.

یێن تاخێ چوستەیی پێکهاتینە ژ کانیێن حسوی، کاشی، بن زەیتینا، محسنی، پیرێ، ڤێرکی، قمبرا، حەمە عەلی، ناروك، جبی، بەیاری، خەندانێ، پشولی، مەرۆك، خەجۆك، فەیزوی، تەمیلێ، عەمبیشلا، کەریمی، تینێ، زواینێ، نافکی، شێخ عەبدۆلعەزیزی، ساڤار، مەسێ، حەجی عوبەیدی، ئیسڤی، رەزۆکی، قاسۆیا، عەلەمۆکا[١٢].

هاڤینگەها سیپە



## جۆیێن ئاڤێ:

ئاکرێ گەلەك جۆکێن ئاڤێ ژی لێ هەنە کو پتر بۆ ئاڤدانێ و کار و بارێن رۆژانە ب کاردهینان، ژ وان:

جۆکا سەرەرەکی کو ژ کانی زەرکێ دەردکەڤیت، جۆکا عەلی مەحمیدیان کو دیسان ژ کانی زەرکێ دەردکەڤیت، جۆکا سەرێ سیپەی یا رۆژهەلات کو بەرەڤ دۆلا بەرۆکا سەیدای شۆردبیت، جۆکا سەرێ سیپەی یا رۆژئاڤا بەرەڤ باشووری، جۆکا جەوسەقێ، کو درێژترین جۆکە و ئاڤێ ژ کانیا تلویتان وەردگریت، جۆکا رەزێن گۆرەڤا ل ئالیێ باکوور بەرەڤ رۆژهەلات دچیت، جۆکێن تاخێ جۆستەیان و ئەو ژی ژ چەند جۆکان پێکهاتینە، وەکی جۆکا سەری، جۆکا ژووری، جۆکا بنێ جامعێ، جۆیا رەزێن گەلی، هەر وەسان چەند لقێن بچویك ژی دەردکەڤن، ژبلی چەند جۆکێن دی وەکی، جۆیا سپی، جۆکا رەش، جۆکا مەیدانێ، جۆکا بنیێ نهارێ، جۆکا تاقێ و... هتد[١٣].

## جهێن گوزاری:

ژبەر هەبوونا ئاڤەکا زۆر ژ کانی و رووبـاران و سرۆشتەکێ جوان، هەمی بووینە هۆکار کو جهێن خۆش و گوزاری لێ مشە ببن، وەکی کانی زەرکێ، رەزێ میری کو دبنیاتدا یێ میر ئیسماعیل پاشایێ دووێ بوو، سەرێ گری ل ناڤەراستا ئاکرێ، گەلیێ شێخ عەبدولعەزیزی کو مەرقەدێ شێخ عەبدولعەزیز کورێ شێخ عەبدولقادر گەیلانی لێ یە، پشتا گەلی، مەمیێ ل رۆژهەلاتا ئاکرێ، هاڤینگەها گەلیێ زەنتە ب دووراتییا (١٢کم) ژ باژێرێ ئاکرێ، سەرێ سادا ل هنداڤی بجیل، ئامادا سەر ب ناحیا دینارتە ڤە، گربیش ب دووراتییا (٢١کم) ژ ئاکرێ، هاڤینگەهـ و سیلاڤا سیلێ ل نێزیك گوندێ دڤری، کورتکا ل ناحیا دینارتە و... چەندین جهێن هێژ نەهاتینە دیار و راگەهاندن[١٤].

سەیرانگەهێن ئاکرێ



باژێركێ ئاكرێ



## سەرێن ئاكرێ (ئەو جهێن ب سەر ناڤدار):

سەرێ ئاكرێ، سەرێ كەلێ، سەرێ كانیێ، سەرێ تاتكا، سەرێ هەسیێ، سەرێ گری، سەرێ سیپەی، سەرێ تانكێ، سەرێ بێوكێ، سەرێ كەنداڵا، سەرێ بێ سۆسی، سەرێ تیشی، سەرێ بێوكا مهەتێ، سەرێ عەمبشالا، سەرێ كواركێ، سەرێ دەرەجۆكا، پیكە سەری.

## لایەنێ جڤاكی:

خەلكێ ئاكرێ پێكهاتینە ژ هەردو ئایینێن ئیسلام و مەسیحی ب رێژەیەكا كێم، ل بەری سالا (١٩٤٨)ێ جوی ژی لێ هەبوون، هەر وەسان ئاكرێ یا دەولەمەندە ب هەبوونا عەشیرەتێن جوداجودا ژ زێباری و هەركی و گۆران و سۆرچی و مزووری و...هتد. هەر وەسان چەندین بنەماڵ لێ هەنە كو ل ڤێرە ئاماژە ب چەندین بنەماڵان و دبیت هندەك نە بنەماڵ بن، لێ ناڤەكێ خۆ وەكی ناڤ ل باژێری هەیە و ب

ڤی شێوەی:

بنەماڵێن: (خشتانا، كۆسا، یونس حەجیا، سیتالی، عەیش رەڤەند، شەملە پیڤازێ، كنتە خوری، مێوە لینكی، جغسی، مامیلۆكی، گدۆی، پەتكی، مەلاكی، حەلیمكی، قەلپیسا، سەیدایێ مەزوی، حاجی عەبوی، پێ رەشا، قەپوی، صادقێ شەریفێ، زموی، خەبازا، خەیاتا، شەڤیلكا، شندوی، چیچكێ مەزێ، عەلی مەحمیدیا، محەمەد عەلی پێلاڤ فرۆش، پێخاسا، زۆرنا بێژا، ژارەی، چۆك رەشا، حسكێ، لولێ، مهاجرا، عەزیز ئاغای، كەشیشا، پیچانا، دێوانا، كلۆخا، باسكێ خەتمی، مستەفا عەبدال، چاڤ رەشا، بچنێ، ئەمەدی، كوتیلۆكی، قوتی، چیت كەوا، مەسێ، صۆفی عەبێ، عەلیكا، كۆچەرا، ڤیتكا، عەسكوی، تەفوكەركی، شكاكا، شەكر، سەفارا، شەنكە ریتی، دۆل قوتا، جەبێ، باشای، مارگرا، مالا مێرا، تەمەر خانی، بزنۆكێ، تەمیمی، گەیسۆكا، گورگە شینی، عەبدولوەهاب ئاغای، حەمە شا، خێسویا، خەندانی، خاجا، شەنگوی، زەموی،

چیچکە مەلای، رەژی کەرا، سەیدێ مایێ، مێکوی، سیحوی، کورتان کەرا، عەمبەرخانا، نالبەندا، حەجی لەڤەنی، سوپاسی، کیتانی، گولێ، مەجێ، پسکێتا، فلیتی، مەنێ، چرۆی، زیێدایێ، عەسکەری، تەیروی، چاوشی، قەلۆی، قەرمۆی، قازی، کاسك کەرا، بندۆلا، حەلێ، چاڤۆی، لەڤەنی، مفتی، ماخۆسا، تاتانی، گێلەخی، گلەخینکی، مشکێ، بیسپاری، حەجی شەکری، شەمێ، یوسف نەباتێ، خیبالێ، حەسەن پاشای، نەقارا، هەدێ، دندلی، باپیرۆکی، محەمەد سالح گێرەی، مالا تێلی «حەسەن تێلی»،رەشو ساحب، شینۆی، سندسی، رەشۆی، حەسەن چری، ربێ، ملخەی، بیبێ، کەریم میرۆی، ڤیچکەی، مام عوسمانی، ڤێرەی، قوریتانی، حەلا بسکسۆر، ئۆتەچیا، سلێمان ئاشەڤانی، دەحلۆی، مرۆکێ، حەجی شەنەی، قورەیش، کلیزی، کوچوی، قوریتانی، عزێر ئای زوکی، حەجی عیسای، حاجی عەلی، مەلا عارفی، فازلی، حاجی حەموی کورکاڤەی، حەجی بادینی، شەرمنیا، حەسەن نەجاری، دەروێش سالەی.

## تاخێن بازێرێ ئاكرێ:

ئاكرێ پێكهاتییە ژ چەندین تاخان، ل بەراهیێ هەردو تاخێن جوستەیی و کوراوا هاتینە دروستکرن و پاشی تاخێ سێ قابەکی هاتییە دروستکرن و هەتا سالا (١٩٦٠)ێ ئاكرێ پێكهاتیبوو ژ ڤان هەرسێ تاخان کو سێ کەڤنترین تاخن ل ئاكرێ و پتریا بێن دی نوی هاتینە ئاڤاکرن، ئەو تاخێن کەڤن ژێ پێكهاتینە ژ:

**تاخێ چوستەیی،** کەڤنترین و ناڤدارترین تاخە ل ئاكرێ، دکەڤیتە سنوورێن رۆژئاڤا و و باکوورێ رۆژئاڤایێ بازێری. ل سەر ناڤێ وی ژی دو بۆچوون هەنە:

ئێك: جهێ ئاکنجیبوونا جوییان (جویلەکستان).

دو: جۆستەیی دهێت ب رامانا هەستیاری و زیرەکی، دێ بێژن (فلان کەس یێ چوستە)، ب واتایا زیرەکیێ دهێت.

ژ جهێن بەرنیاس ل ڤی تاخی:

بازێرکێ ئاكرێ



مقێم: كەڤنترین بازارێ ئاكرێ یە، جامعا مەزن، بەنا دێرێ، گەلیێ شێخ عەبدۆلعەزیزی، كو مەرقەدێ شێخ عەبدۆلعەزیز گەیلانی لێ یە، كەڤرێ قەسابی، كو ناڤێ وی ژ كوشتنا مرۆڤان هاتییە، كنیشتێ، كو جهێ پەرستگەها جوییان بوو، جسرێ كوكا، كاڤلێ حەمامۆكێ، زێوكێ، مهەتێ، قەشوری، كانیا بەیاری، سەرشێلا، سەرێ دەرەجۆكا (بەربەخۆكێ)، تاقێ (گاڤێ)، تاخێ زەعێمی، هجرێ، پیربانێ، بەریدێ، ئاشی.

**تاخێ گۆراوە:**

ناڤێ تاخی ژ گۆڕ (گۆڕستانێ) هاتییە.

ل دووڤ گۆتنان كو میرێ كەلێ داخواز ژ گوندێ (گورگاوا) ژ عەشیرەتا زێباریان كریوو كو ل وێرێ ئاكنجی ببن دا كو رێیا ئاڤا كەلێ دروست بكەن وەكی ئەندازیارێن ئاڤ و سۆلینان.

**ژ جهێن بەرنیاس ل ڤی تاخی:**

كانی زەرك، سیپەلا سیبە، كو جهەكێ گوزارییە ل ئاكرێ، كانیا تلیتا، بەرۆكا سەیدای، خركا، بەردەركێ قشلێ، رەزێ میری، كەلا كەڤن، تاس مەنجەلا، عەلی مەحمیدا، مەمیێ.

**تاخێ قابەكێ:**

ل سەر ناڤێ تاخی دو بۆچوون هەنە:

ئێك: ژ ناڤێ وان كەسان هاتییە كو ژ گوندێ قابكا هاتینە ڤی جهی و لێ ئاكنجیبووینە.

دو: ناڤ ژ قابەك (سێنیك) هاتییە، كو وان كەسان ئەو پەیڤ بكاردهینان كو ژ دەڤەرا سۆران هاتینە ڤی جهی.

**ژ جهێن بەرنیاس ل ڤی تاخی:**

كانی مام كروك، زەڤیێ، شەڤیلكا، خەستە (نها هاوار هاتێ)، سارمیێ، مەلا ئەحمەد.

ب بەرفەرهبوونا بازێری تاخێن نوی ژی هاتنە دروستكرن، ژ وانان:

- **سارمیێ:** ئەو ژی سێ سارمی نە: (یا عەلوی، یا ئەنوی، یا خارێ)، شكەفتا، زەڤیا حەجی نەنوی.
- **زێویكێ (زێوكێ):** كانیا بەیاری، شێخ ئیسف.
- **تاقێ (گاڤێ):** شێخ ماڤێ، كانیا سێنی، سەبۆسیێ، بندۆلی.
- **مهەتێ:** كانیا دەرمان نافكێ، جۆخینا، مەستەلێ، غاباتی.
- **قەشۆری:** سالا (١٩٨٠)ێ هاتییە دامەزراندن، ژ جهێن دیار ل ڤی تاخی: كانی ڤیركێ، كەر گەڤسكێ، رەڤیاجی، بن زەیتوینكا.
- **خرگا:** د بەرێ دا جهێ وان رەزبوون، پاشی د دەمێ حكۆمەتا ناڤەندی دا ل سەر فەرمانبەران هاتە دابەشكرن و بۆ تاخەكێ بازێری. ژ جهێن دیار ل ڤی تاخی: بورجا خرگا، رێكا گشتی، غاباتێ (دارستانا) خرگا.
- **رفاهی:** ل بەرێ گرەكێ بلند بوو و بۆ جۆخینا دهاتە بكارهینان، مینا تاخێ پێشتر ل سەر فەرمانبەران هاتە دابەشكرن و بۆ تاخەك.
- **میسكا:** پێشان جهێ چەروانان بوو، خودانێ وی عەزیز ئاغا و شێخ عەزیز ئاكرەیی فرۆتنە خەلكی و وان ژی ئاڤاكر و بۆ تاخەك.

ئەڤ گەرەكێن نافبری هەتا سالا (١٩٨٠)ێ د ناڤاسنوورێ بازێرڤانییا ئاكرێ دابوون. و پشتی هینگێ ژ ئەگەرێ كاودانێن سیاسی و شەران سال بۆ سالێ تاخێن بازێری پتر لێ هاتن و چەندین تاخێن دی هاتنە ئاڤاكرن، وەكی:

- **تاخێ ئازادی:** ئەڤ تاخە پشتی ئەنفالان ب ناڤێ (مجمع المسیحیین- كۆمەاگەها مەسیحینشین) هاتییە ئاڤاكرن، خەلكێ وێ پێكهاتیبوون ژ مەسیحیێن گوندێن (هیزانكێ، بیریژكێ، كەشكاف، دوپرێ). ژ جهێن دیارل ڤی تاخی: دێرەك لێ هەیە.
- **تاخێ شۆرش (خوارێ و سەری):** د بەرێ دا جهێ هاڤێتنا پاشماوەیێن بازێری و جهێ سەرژێكرنا ئاژەلی بوو، پاشی رێكخراوەكێ هندە خانی بۆ كێم دەرامەتان لێ ئاڤاكرن، پشتی هینگێ و ژبەر كاودانێن جڤاكی و ب هاریكاریا حكۆمەتا

هەرێما کوردستانێ هندە خانی هاتنە ئاڤاکرن و بۆ تاخەکێ بازێری. ژ جهێن دیار ل گوندی: رێکا سمێلا، سەرکرش، گومرکێن ڤیڤی.

- **تاخێ ١١ ئەیلوول،** د بەرێ دا دگۆتنێ شیڤەکور، ئەو ژی ب رێکا دابەشکرنێ د رێکا کۆمەلا ئاکنجیبوونا فەرمانبەران هاتییە دابەشکرن و چەند خزمەتگوزاری مینا مەیدانا حەسەن بەگ و سەیرانگەها ئاکرێ و زیندانا نوی لێ هەنە.

- **تاخێ حەجی غەنی،** ناڤێ تاخی ژ ناڤێ کەسەکی ب ناڤێ (حەجی غەنی)، کو ژ عەشیرەتا سۆرچییانە، پشتی ژ ئاوارەیێ ڤەگەریاین ئەڤ عەردە ل سەر بنەمالا وی هاتە دابەشکرن و ب ناڤێ وی هاتەنیاسین.

- **تاخێ شەهیدانا قەلعێ،** ب ناڤێ شەهیدان هاتییە ب ناڤکرن، چونکی عەردێ وی ل سەر خێزانێن شەهیدان هاتبوو دابەشکرن و بۆ هاتبوونە ئاڤاکرن. ژ جهێن دیار ل ڤی تاخی: قەلا ئاکرێ و نیچرگز حۆل و بازارێ ئەرزانێ پەرۆکان.

- **تاخێ فەوجێ،** ب ناڤێ فەوجا سەربازی هاتییە ب ناڤکرن کو بەرێ ل ڤی جهی بوو، پشتی سەرهلدانێ (٩١) خێزانێن پێشمەرگەیان لێ ئاکنجیبوون.

- **تاخێ شەهیدانا نوی،** هەر ب ناڤێ شەهیدان هاتییە ب ناڤکرن.

- **تاخێ بیۆك،** گوندەکێ رەخ و دۆرێن ئاکرێ بوو و نها بوویە تاخەکێ بازێری و ئاکنجیێن وێ ژ عەشیرەتا زێبارییانە.

- **تاخێ گولان،** ل دەستپێکێ تاخ ب رێکا رێکخراوەکێ هاتە ئاڤاکرن و پاش عەردێن وی دابەشکرن و بۆ تاخەك.

- **ئالەرەش،** دکەڤیتە باشوورێ بازێرێ ئاکرێ ل نێزیك تاخێ گولان، ل بەراهیێ گوندەك بوو و نها تاخەکێ بازێری یە.

- **ئالەیێ،** د بەرێ دا گوندەکێ بۆشێ زێبارییان بوو ل باشوورێ رۆژئاڤایێ بازێری و نها بوویە تاخەکێ بازێری.

- **باشقال ئاغا،** گوندەکە نها سەر ب ناڤەندا ئاکرێ ڤەیە، خەلکێ وی ژ عەشیرەتا زێبارییانە. ژ جهێن دیار ل گوندی کێلا باشقال.

- **باشقال رەڤەند،** گوندەکە ل رۆژهەلاتی سەنتەرێ

بازێرکێ ئاکرێ



ئاكرێ، خەلكێ وی ژ عەشیرەتا زێبارییانە.

- **كوچینە فەلا فەرزد،** خەلكێ ڤی گوندی ژ عەشیرەتا هەركییانە و سالا (٢٠٠٠)ێ ئەڤ گوندە كەتییە د ناڤاسنوورێ ناڤەندا ئاكرێ دا.
- **كوچینە حەسەن بدو،** ئەڤ تاخە نوی هاتییە دروستكرن، پشتی حەسەن بدو رابووی ب دابەشكرنا زەڤیێن عەردی و نها بویە تاخەكێ مەزن.
- **كوچینی فەلا،** ئەڤ تاخە پشتی روودانێن سەرهلدانا تیرۆرێ ل عیراقێ دروست بوویە، دەمێ خەلكێن مەسیحی ژ باژێرێن عیراقێ ژبەر تیرۆرێ رەڤین و قەستا كوردستانێ كرین.
- **سۆسنا،** ئەڤ گوندە دكەڤیتە رۆژئاڤایێ سەنتەرێ ئاكرێ، خەلكێ وی زێبارینە و پشتی سالا (٢٠٠٣) ێ ئەڤ گوندە كەتییە د ناڤاسنوورێ باژێرڤانییا ئاكرێ دا.
- **رەزۆك،** گوندەكە دكەڤیتە دناڤبەرا هەردو گوندێن سۆسنا و كوچینە فەلا، ئاكنجیێن وێ زێبارینە.
- **سماقۆك،** ئەڤ گوندە دكەڤیتە باشوورێ رۆژئاڤایێ ئاكرێ، ئاكنجیێن وی ژ عەشیرەتێن زێباری و هەركی و خێلین.
- **خربە ژێری،** گوندەكە ل باكوورێ رۆژئاڤایێ ئاكرێ، ئاكنجیێن وی ژ عەشیرەتا هەركیيا نە.
- **خربە ژووری،** گوندەكە دكەڤیتە رۆژئاڤایا باژێرێ ئاكرێ، خەلكێ وی ژ عەشیرەتا زێبارییانە.
- **خربا كەڤن،** گوندەكە دكەڤیتە رۆژئاڤایا باژێرێ ئاكرێ، خەلكێ وی ژ عەشیرەتا زێبارییانە.
- **راسلعەین،** گوندەكێ زێبارییانە، گەلەكێ ب ئاڤ و دەرامەتە.
- **جونا،** دكەڤیتە رۆژهەلاتێ ئاكرێ، ئاكنجیێن وی زێبارینە.
- **قاچاغ ئاڤا،** ئەڤ گوندە ل بەرێ یێ ئەمەر خۆشا بوو، تاخ ب رێكێن زێدەگاڤی هاتییە ئاڤاكرن.
- دیسان چەند تاخێن دی تر ژی هەنە، وەكی تاخێ دەواجن كو پرۆژەیەكێ پەلەوەران (دواجن) لێ هاتبوو دروستكرن، ناڤ ب وی ناڤی هاتە ب ناڤكرن و هەتا نها ژی هەر ب وی ناڤی مایە، هەر وەسان تاخێن نێرگز لاند و كەلێ ستی كو ژ تاخێن نوی نە و ل ژێر ئاڤاكرنێ نە.

## ژێدەر


١. مصدق توڤی و ئیسماعیل بادی، رێبەرێ پارێزگەها دهۆكێ، (دهۆك: ٢٠١٠)، بپ١٢١.
٢. هەمان ژێدەر، بپ١٢٣.
٣. هەمان ژێدەر، بپ١٢٤.
٤. هەمان ژێدەر، بپ١٢٧.
٥. د. بدرخان السندي، المجتمع الكردي في المنظور الاستشراقي، (اربيل، ٢٠٠٢)، ص٤٨٩.
٦. هەمان ژێدەر، بپ٤٩٠.
٧. جميد شكري، ئاكرێ (عقره) في العهد الملكي، دار سپيريز للطباعة والنشر، (دهوك، ٢٠٠٨)، م: حاجي هاشم- اربيل، ص ١٩- ٢٢.
٨. مصدق و ئیسماعیل، رێبەر.... بپ١٢٨.
٩. مصدق و ئیسماعیل، رێبەر.... بپ١٢٩.
١٠. فائق ابو زيد سليم ئاكرەيی، دليل ئاكرێ السياحي، چاپخانەی زانكۆی سەلاحەددین- هەولێر، ١٩٩٩، بپ٢٦- ٢٧.
١١. حیكمەت مەلا یاسین، رەزێن ئاكرێ و رێك و بنەمایێن ئاڤدانێ، كوڤارا ئاكرێ، ژمارە ٥، ئادارا ٢٠١٤، بپ١٦.
١٢. دليل ئاكرێ السياحي.... بپ٦٥- ٦٧.
١٣. هەمان ژێدەر، بپ١٩- ٢٠.
١٤. هەمان ژێدەر، بپ٥٦- ٦٤.

# ناحیا بجێل

کاروان زاهیر

ناحیا بجیل: پێشتر ب ناحیا سۆرچی دهاتەناڤکرن، ژ بەرکو دەمێ بریارا دامەزراندنا ڤێ ناحیێ هاتییە دان سەردەمێ دەستەلاتداریا ئوسمانی و پاشتر یا شاهینی (مەلکی بوو) ل عیراقێ، وی دەمی پێکهاتا جوگرافییا سنوورێن ناحیان ل سەر بنیاتەك عەشیرەتی دهاتەدانان، ئەڤ ناحیەیە ژی ژبەرکو پرانییا خەلکێ وێ ژ عەشیرەتا سۆرچی بوون ب ناحیا سۆرچی هاتییەناڤکرن، ئەڤ ناحیەیە یەك ژ ناحیێن هەرەکەڤنێن دەڤەرا بەهدینانە، ل دووڤ سالناما ویلایەتا مووسل یا ئوسمانی یا سالا ١٣٣٠مش/١٩١١-١٩١٢ز یەك ژ دو ناحیێن سەر ب قەزا ئاکرێ ڤە بوویە و هەر ب ناحیا سۆرچی هاتییەنیاسین[١]. ئانکو ناحیا سۆرچی ل سالا ١٩١١- ١٩١٢ز هەبوو و دبیت دامەزراندنا وێ هێژ کەڤنتر بیت. پشتی دامەزراندنا حکۆمەتا شاهینی یا عیراقێ ل دووڤ پاشبەندێ بەیانا وەزارەتا ناڤخۆیا عیراقێ هژمار ١١٢ ل رۆژا ١٥ چریا ئێکێ ١٩٢٢ێ وەك یەك ژ دو ناحیێن سەر ب قەزا ئاکرێ ئاماژە پێ هاتییەکرن ئەو دو ناحیە ژی (سۆرچی و زێبار) بوون[٢]. هەتا سالا سالا ١٩٣٨ێ مەلبەندێ ناحیێ ل گوندێ کەلاتێ بوو، ل سالا ١٩٣٨ێ هاتییەڤەگوهاستن بۆ گوندێ بجیلێ[٣].

ناحیە ب ڤی رەنگی مایە هەتا ل رۆژا ١١ حزیرانا ١٩٨٧ێ ب بریارەکا سەرکۆماری (مرسوم جمهوری) هاتییەهەلوەشاندن، د وێ بریارێدا ژی هەر ب ناحیا سۆرچی ناڤێ وێ هاتییە[٤].

سالا ١٩٩٧ێ سەرژنوو حکۆمەتا هەرێمێ ناحیە ب ناڤێ ناحیا بجیل دامەزراندەڤە ئەڤە ژی ژبەر وێ چەندێ بوو کە دەڤەر یا مەزنا و عەشیرەتا سۆرچی ب خۆڤە دگریت کو مەزنترین عەشیرەتە ل وێ دەڤەرێ[٥].

## سنوورێن ناحیا دینارتە:

**باکووری**: ناحیا دینارتە

**باشووری**: سنوورێ پارێزگەها هەولێرێ و ناحیا کەلەك

**رۆژهەلاتی**: رووبارێ زێ یێ مەزن و ئالیێ دی یێ رووباری ناحیا حەریر

**رۆژئاڤا**: ناحیا گردەسین و باژێرێ ئاکرێ.

رووبەرێ گشتیێ ناحیێ (١٢٦٦١٦) دۆنەمێن عەردی، ئانکو (٣٥٠) کیلومەترێن چوارگۆشە بخۆڤە دگریت، عەردێ وی یێ چاندنێ یێ دێم (٥٣٧٣٥) دۆنەمن و یێ ئاڤی (٢٣٥٥) دۆنەمن[٦]، هەموو سنوورێ

ناحیێ (٦١) گوندان ب خۆ ڤە دگریت.

ل دووڤ سەرژمێریا تەخمینیا رێڤەبەریا ئامارا پارێزگەهێ بۆ سالا ٢٠١٦ێ هژمارا خەلكێ سەرانسەری ناحیێ ٢١٨٢٨ كەسە، ٣٦٩١ كەس ب باژێرنشین دهێنە هژمارتن و یێن دیتر ١٨١٣٧ كەس ب گوند نشین دهێنە هژمارتن[٧]. د وارێ ئابووریدا دەڤەرەك دەولەمەندە، عەردێ وێ هاریكارە بۆ هەموو رەنگێن چاندنێ دێم و ئاڤی، زێدەباری نێزیكیا دەڤەرێ ژ رووبارێ زێی ژێدەرێن دی یێن ئاڤێ هەنە كو بۆ چاندنێ مفای ژێ وەردگــرن، زێدەباری ڤێ چەندێ وەك د سەروبەرێ گوندێن واندا دیاردبیت؛ ئێك ژ دەولەمەندترین دەڤەرێن كوردستانێ یە د وارێ خودانكرنا مەر و مالاتیدا، ل دووڤ داتایێن رێڤەبەریا ڤێتەرنەری ل سنوورێ ناحیا بجیلێ ١١٥ هزار سەرێن پەزی هەنە، رۆژانە تنێ شەش تەنێن شیری ژ بجیلێ بۆ هەولێرێ دچیت زێدەباری ئەوێ ل ئاكرێ و جهێن دیتر دهێتەفرۆشتن و ئەوێ خەلكێ دەڤەرێ ب خۆ دكەنە رێچال بۆ خوارنا خۆ و بۆ فرۆشتنێ[٨].

## بجیل:

مەلبەند یان سەنتەرێ ناحیا بجیلە، (١٣كم) ژ باژێرێ ئاكرێ دوورە، ل سەر رێكا سەرەكیا ئاكرێ دەشت حەریرە، بنارا چیایێ (سادە) كو ناڤدارترین چیایە ل وێ دەڤەرێ پشتی چیایێ (پێرس)ی.

## پێكهاتا جڤاكیا بجیل:

باژێركێ بجیلێ پێنج تاخێن (سەرهلدان، سەروكانی، رزگاری، ئەیلوول و بانی) ب خۆڤە دگریت، (٦٧٦) خێزان ل باژێركی دژین كو دبنە نێزیكی (٣٢٣٧) كەس، خەلكێ ناحیێ دو بەشە، پشكا مەزن ژ عەشیرەتا سۆرچیا نە، نها چەند عەشیرەتن دی تێدا دئاكنجی نە، وەكی: (بارزانی، زێباری، زراری، شاكی،

ناحیا بجێل



مزووری) و دبنە تیرەیێن: (مامساکی، مامگرد، ماله شێخ، چاربۆتی، ڕێزایی، نەقەبی، رەڤەندۆکی، ئالکەیی، هەربۆیی، سینا). ب رەنگەکێ گشتی بجێل ژ ڤان مالباتێن سەرەکی پێکدهێت: (مالباتا کەریم خان، مالباتا الیاس، مالباتا حامد زبنێ، مالباتا محەمەد شەریف، مالباتا مەلاحەسەن، مالباتا بریندار، مالباتا وەیسی، مالباتا مستەفایێ نەبی، مالباتا بلولوك، مالباتا توخمە شڤان، مالباتا مارەسێن، مالباتا رەسورێ حەفسەتێ، مالباتا تەقی لدین، مالباتا چاربۆتیا، مالباتا رێزاییا، مالباتا بلنگی، مالباتا عەبدۆلای، مالباتا زبیر، مالباتا بابۆی، مالباتا فەقێ یوسفی، مالباتا حەسەن دینۆی، مالباتا حەسۆی، مالباتا سەلیم، مالباتا ئەحمەد ئالکەیی، مالباتا غەزالی، مالباتا شێخزادا، مالباتا صوفی خدری، مالباتا مستۆ باسا، مالباتا تووەیی یا و مالباتا محەمەد رەمەزان.

## سەروبەرێ کارگێری:

زێدەباری ڕێڤەبەریا ناحیا بجیل فەرمانگەهێن ژێری ل باژێرکێ هەنە ل دووڤ سالا دامەزراندنا وان: بنکەهێ پۆلیسێن بجێل سالا (١٩٣٨)ێ، بنکەهێ ئاسایشێ سالا(٢٠٠٩)ێ، باژێرڤانیا بجیل سالا (١٩٧٠)ێ، فەرمانگەها دادنوسی سالا (٢٠١٣)ێ، بنکەهێ ساخلەمیێ سالا(١٩٣٨)ێ، بنکەهێ پۆلیسێن دارستانێ سالا (٢٠٠٨)، بنکەهێ ئاگر ڤەمراندنێ سالا (٢٠٠٦)ێ، بنکەهێ پۆستە و گەهاندن سالا (٢٠٠٥)ێ، فەرمانگەها بارێ شارستانی سالا(١٩٣٨)ێ، هۆبا چاندنێ (٢٠٠٦)ێ فەرمانگەها کارتازانیاری سالا (٢٠١٤)ێ، بنکەهێ کارەبێ سالا (٢٠٠٨)ێ، بنکەهێ ڤیتێرنەری (٢٠٠٧)ێ. هەژیە بێژین سالا ١٩٧٥ کەهرب گەهشتییە بجیل.

**هژیرێن ناحیا بجێل**



## پەروەردە:

ل ناڤەندا بجیل ئەڤ خواندنگەهە هەنە:

- خواندنگەها سەرەتایی (نها بنەرەتی) سالا (١٩٣٨)ێ.
- خواندنگەها سەرێ سادا بنەرەت، سالا (١٩٧٠)ێ.
- خواندنگەها بجیل ئامادەیی، سالا (١٩٧٠)ێ.
- خواندنگەها بجیل ئامادەیی ئێڤاران، سالا (٢٠١٤)ێ.
- خواندنگەها بجیل ئێڤاران بنەرەت، سالا (٢٠١٢)ێ.
- باخچێ بجیل یێ زارۆکان، سالا (٢٠١٠)ێ.

## ژێدەرێ ئاڤێ:

- بجیل جهەکێ دەولەمەندە ب ئاڤێ، حەفت کانییێن سەرەکی ب ناڤێن: (کانییا ئاقدێ کەژۆی، کانییا ئاقدێ سەرووکانی، کانییا تەهای، کانییا شەمێ، کانییا شێخی، کانی میتکو، کانی کەولێ هەبوون)، ئەڤ کانییە ژێدەرێ ئاڤا ڤەخوارنێ و پێدڤییێن مالێ و چاندنێ بوون و دەرگەهەك بوون بۆ گەشتوگوزاری ل دەڤەرێ.
- سالا (١٩٩٧)ێ پرۆژەیێ ئاڤێ ل بجیل هاتییە دروستکرن، ل دووڤ بەرنامەکێ رێکخستنی ئاڤێ دابەشدکەت، سەرجاڤێ ڤی پرۆژەی سەروکانییا ئاڤا ناحیێ یە.

## ژێدەرێن ژیارا خەلکی:

جهێ بجیل جهەکێ گونجایە بۆ چاندنا دەرامەتێن دێم و ئاڤی، مینا گەنم و جەهـ و نیسك و نۆك و ماش و کونجی و رەز و بیستان و جۆرێن فێقی، لەوما خەلکێ وی ژی پتر گرێدای چاندنێ نە، هەروەسان تەرش و کەوالی و چێلان ژی ب خودان دکەن و پتر ژ (٢٠٠٠) سەر لێ هەنە، ل وەرزێن گەرمێ دبەنە زۆمێن سەرێ سادا، دیسان مریشك و مێشێن هنگڤینی ژی خوداندکەن کو داهاتەکێ دی یێ خەلکێ دەڤەرێ یە، گەشت و گوزار ژی ئێکە ژ داهاتێن خەلکێ وی و دشیاندایە گەلەك جهێن دی ژی بۆ ڤێ مەبەستێ بکاربینن، وەکی سەرێ سادا و گەلیێ نێروا، سەرەرای کو نەفت ژی ل چەند جهێن وێ هاتینە دیتن، وەکی ل گۆجار، جۆنەلە، دازین، شەرەڤۆنا و مێرگە مۆش. ژبلی کو گەلەك ژ خەلکێ وی مووچەخۆرن[٩].

## جهێن شوینواری و کەڤنار ل بجیل:

- **گۆرستانا سەر مەزاران:** ئێکە ژ گۆرستانێن مەزن ل دەڤەرێ و ژبەر کو گۆرێن مالباتا شێخان لێ هەنە نها مەزنترین گۆرستانە کو سۆرچییێن سۆران و بەهدینان مریێن خۆ لێ ڤەدشێرن.
- **گۆرستانا گر کەمەك:** ل رۆژئاڤا ناحیێ.
- **گۆرستانا گر کەچوو:** دکەڤیتە ناڤەندا باژێرکی.
- **گۆرستانا شاکوی:** ل رۆژئاڤا باژێرکێ بجیل.
- **گۆرستانا شێخ عوزیر:** ل باکووری باژێرکی.
- **بەردێ کافرا:** بەرەکە ل باکووری باژێرکی، دووڤ کەڤنە باوەرێن خەلکێ گوندی ئەو رەشاتییا سەر بەری خوینا کافرایە.
- **شکەفتەتینك:** جهەکێ کەڤنارە ل باکووری باژێرکێ بجیلێ.
- **شکەفتەخرا:** دکەڤیتە باکووری باژێرکێ بجیلێ.
- گۆرەپانا کۆرە خەمرەڤین: ل باکووری باژێرکێ بجیلێ.
- **شکەفتە عاشقا:** ل باکووری باژێرکێ بجیلێ دو پەیکەر لێ هەبوون، ئێك یێ خرابکری و ئێکێ مای.
- **شکەفتا لەندەهۆی:** وەك خەلکەك باوەر دکەن جهێ ڤەحەویانا ئێك ژ کافرا بوویە، ب ناڤێ وی هاتییە ناڤکرن و دکەڤیتە باکووری باژێرکێ بجیلێ.
- **شکەفتا حەیشۆجێ:** ل ناڤەندا ناحیێ.
- **گۆرانا بەرازا:** ل باکووری گوندی و جهێ راڤکرنا

بەرازا بوویە.

- **داربەنۆكا دایكە شەشی،** جهەكێ ناڤدارە ل ناحیێ ل باكووری باژێركێ بجیلێ.
- **كەڤنەگوند،** ل باكووری باژێركێ بجیلێ گوندەكێ كەڤنار هەیە، تنێ شوینوار ماینە.
- **گۆما شەهیدان،** جهەكێ ناڤدارە ل جەم خەلكی، دهێتە گۆتن ل بەرێ شەهید ل وێرێ شووشتینە و دكەڤتە باشووری بجیلێ.
- **ئاشێ ئاڤێ،** ژ هەردو ئاشێن (ئاشێ كەژۆی - ئاشێ شكەفتێ) پێكدهێن كو دكەڤتە ناڤەندا باژێركێ بجیلێ، بۆهێرانا دەخلو دانی هاتینە ب كارئینان.

# گوندێن سەر ب ناحیا بجیلێ

## گوندێ سۆسناوا:

گوندەكێ سەرنجراكێشە ل بنارێ چیایێ (بێرات)، ب دووراتییا (۱۳كم) دكەڤیتە رۆژهەلاتی مەلبەندێ ناحیا بجیل و (٥كم) رۆژئاڤا رووبارێ زێ مەزن، ناڤێ گوندی ژ دو برگەیان پێكدهێت: (سۆسن) كو ناڤێ گولەكێ یە ئێكە ژ گولێن بەربەلاڤێن چیایی، یا دی (ئاڤ) كو رێژا ئاڤێ ل گوندی گەلەكا زۆرە، ببوورینا دەمی ڤان دو برگەیان ئێككرتییە و بوویە (سوسناوا).

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** زنجیرا چیایێ بێرات ل سەر سنوورێ ناڤبەرا دەڤەرا سۆرچیایەتی و دەڤەرا زێبار.

**باشووری:** گوندێ بێسمەكەران.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ خەلان مامكرد.

**رۆژئاڤا:** گوندێ كەلاتی.

### پێكهاتا گوندی:

سۆسناوا گوندەكێ ناڤدارە ل دەڤەرێ، خەلكێ

گوندێ سۆسناوا



گوندی ژ عەشیرەتا سۆرچی نە و رهسپیێن قەبیلا مامكرد ل ڤی گوندی ئاكنجینە، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلكێ گوندی ١٣٤ كەس بوو[١٠]، نها خەلكێ گوندی (٩٤) خێزانن كو دبنە نێزیكی (٥٦٠٠) كەس تێدا دژین*، ژ چەندین بنەمالا پێكدهێن، دبنە دو جۆر بنەمالا سەرەكی (توخمە شڤان)ە و یێن دی تر ژی كو پێكهاتینە ژ (مۆكاڤەیی، سمۆرە، سۆرانی و رەڤەندۆكی) زۆر ژمێژە هاتینە گوندی و ل وێرێ د ئاكنجینە.

## كانی و ژێدەرێن ئاڤێ:

ل سۆسناوا گەلەك كانی هەنە، بووینە ژێدەرێ سەرەكیێ ژیانا گوندی و ئاڤا ڤان كانیا بەلاڤدبیتە سەر هەمی مال و رەز و باغێن گوندی و جوانیەك دایە سۆسناوا، وەك: (كانیا قەسرێ، كانیا شكەفتێ، كانیا قولەتینێ، كانیا ئەرمەنیا، كانیا برقوژی، كانیا شیخۆری و كانیا مۆكاڤا)، ئەڤ كانییە هەمی ل ژێریا گوندی د گەهنە ئێك و رووبارەكی مەزن دروست دكەن ب درێژیا (٥كم) درژێتە رووبارێ زێی مەزن.

## ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژبەر هەبوونا ئاڤەكا زۆر چاندنا خەلكێ گوندی پتر ل سەر دەرامەتێ ئاڤێ یە، ب تایبەت برنج و كونجی و تویتن و گویز و چێكرنا بیستانان و جۆرێن فێقی، هەروەسان دەرامەتێ دێم ژی ژ گەنم و نیسك و نۆكان دهێنە چاندن، ژئلی خودانكرنا تەرش و كەوالی، دیسان هندەك خەلكێ گوندی بازرگانیێ دكەن و هندەك ژی مووچەخۆرن.

## شوینوار و جهێن كەڤنارێن گوندی:

ژمارەكا شوینواران ل گوندی هەنە، ژ وان ژی:

**كەلا سوسناوا:** ئەڤ كەلایە دكەڤیتە رۆژهەلاتی باكووری گوندی، ل سەر چیایێ ئاسێ هاتییە بنیاتنان، ژبەر كو پشكنین بۆ نەهاتییە كرن كەسەك ب دروستاهی مێژوویا وێ نزانیت.

**مزگەفتا مۆكاڤا:** ل باكووری رۆژئاڤا گوندی، ل دووڤ ڤەگێرانێن خەلكێ دەڤەرێ ڤەدگەریتەڤە بۆ سەردەمێ هاتنا ئاینێ ئیسلامێ بۆ كوردستانێ.

**شكەفتا پیریل:** ل باكووری رۆژهەلاتی گوندی.

**ئاشێن ئاڤێ:** ژ چەند ئاشا پێكهاتینە ل رۆژهەلاتی گوندی، مێژوویا وان ڤەدگەرێنە ڤە سەردەمێ میرگەها بەهدینان.

**ملێ پیر ئاڤدەل:** ل رۆژهەلاتی گوندی و ئەڤ ناڤە ل میر ئاڤدەلی هاتییە كو سەردەمەكی حوكمرانی ل كەلا گوندی كرییە.

**قەبرستانێن گوندی:** ژمارەكا گۆرستانێن زۆر كەڤنن و وێ چەندێ د سەلمینن كو گوندەكێ كەڤنارە، ئەوژی ئەڤەنە: سۆفی هەمزە، مام رۆستەم، شڤانكار، شێخۆ پەز، گۆرەبیر، چاروێ، سەرخر، خەروە، قەبرێ فەلەی، برایم تانچوگردە پەشنك.

-سالا (١٩٧٩)ێ بۆ جارا ئێكێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەكرن، ل سالا (١٩٨٢)ێ ژ لایێ حكۆمەتا عیراقیڤە هاتییە داخستن، سالا (١٩٩٢)ێ جارەكادی خواندنگەهـ هاتیەڤە ڤەكرن.

- سالا (١٩٩٩)ێ بنگەهێ ساخلەمیێ ل گوندی هاتییە ڤەكرن وخزمەتەكا بەرچاڤا خەلكێ دەڤەرێ كرییە، د هەمان سالدا پرۆژەیێ ئاڤا ڤەخوارنێ ل گوندی هاتییە چێكرن[١١].

## گوندێ خانەگە:

گوند دكەڤیتە دووراتییا (٣كم) رۆژئاڤا بجیلێ و ل دەڤەرا چیایی هەلكەفتیە. ناڤێ گوندی ژ خانەڤا هاتییە، دبێژن ئەو شكەڤتا ل باكووری گوندی خەلوەتگەهـ و خانەقایا دەروێشان بوویە و ناڤێ گوندی ژ وێ چەندێ هاتییە.

## سنوورێن گوندی:

**باكووری:** زنچیرا چیایێ بێرات.

**باشووری:** گوندێ دزۆك.

**رۆژهەلاتی:** ناحیا بجیل.

**رۆژئاڤا:** گوندێ زنتا.

**پێکهاتا گوندی:**

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا سۆرچی نە سەر ب تیرەیا (مامەسام)ن، ژ مێژە ل گوندی ئاکنجینە، مێژوویا وان ڤەدگەریتەڤە چەندین پشتا بەری نها، د بنیاتدا ژ ئێك مالبات (مالباتا حەجی رسول) پێکهاتییە، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ گوندی تنێ ٢٠ کەس بوو[١٢]، نها دبنە (٣) خێزان و (١٥) کەس.

**شوینوار و جهێن کەڤنارێن گوندی:**

**شکەفتاخروە**، ل باکووری گوندی.

**دەلاقە**، ژ ناڤی دیارە کو جهێ هەلگرتنا تشتی بوویە، دکەڤیتە باکووری گوندی.

**گۆرستانا ئەسحابەی**، ل باشووری گوندی، کەڤنارە و مێژوویا وێ دیار نینە، گورێن مەزن لێ هەنە.

گۆرستانا گر کەپەدار، گورێن زۆر کەڤن لێ هەنە، دکەڤیتە باشووری گوندی.

**کەڤنەگوند**، ل باکووری گوندی و شوینوارێن خانیێن کەڤن لێ دیارن، مێژوویا وان دیار نینە.

**ژێدەرێن ئاڤا گوندی:**

چەند کانی ل گوندی هەنە، وەکی، (کانیی هنارۆك، کانی داسین، کانی رۆلك، کانییا خانەگە) هەبوون، دەمێ خۆ دا مفایەکێ باش دگەهاندە گوندیان تایبەت د وارێ چاندنێدا، بەلێ نها ئاڤا وان بەرەڤ کێم ئاڤیێ و هشکبوونێ دچن و چ پرۆژەیێن ئاڤێ ل گوندی نینن.

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

پەز و مالات تایبەت بزن و چێل، هەر د کەڤندا ل گوندی دهێنە خودانکرن، پتر ژ (٥٠٠) سەران هەنە.

بۆ خواندنێ زارۆکێن وان ل ناحیا بجیل دخوینن .

**گوندێ شەرمفونا:**



## گوندێ شەرەفونا:

گوند دكەڤیتە دووراتییا (٢٨كم) رۆژهەلاتێ بجیل، سەر رێكا سەرەكییا د ناڤبەرا (ئاكرێ-قەندیل)، ناڤێ گوندی ژ عەشیرەتا شەرەفا هاتییە كو ددەمەكێ نەدیار دا ژ مرێبا هاتینە ڤی گوندی و لێ ئاكنجی بووینە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری**: گوندێ گەلووك ژێری.

**باشووری**: گوندێ ستریان.

**رۆژهەلاتی**: گوندێ بێخمە.

**رۆژئاڤا**: گوندێ دازین بنزویر.

### پێكهاتا گوندی:

خەلكێ گوندی ژ عەشیرەتا سۆرچییانە سەر ب تیرەیا (مامساكی) نە، ژمێژە لێ دئاكنجی، مێژوویا ئاكنجیبوونا وان ڤەدگەرێتەڤە چەندین پشتا بەری نها، دبنیاتدا دو مالباتن: (مالباتا ئەحمەدی و مالباتا محەمەد عوسمان)، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلكێ گوندی ١١٩ كەس بوو[١٤]، ژمارا وان د دەمێ ئامادەكرنا ڤێ نڤیسینێدا (١٥٠) خێزانن كو دبنە (١٨٠٠) كەس.

### شوینوار و جهێن كەڤنارێن گوندی:

گۆرستانا كەڤن: دكەڤیتە ناڤ گوندی.

گۆرستانا چێلە سپیلك: گەلەكا كەڤنە دكەڤیتە رۆژئاڤا گوندی.

ئاش: زۆرێ كەڤنە دكەڤیتە باكووری گوندی.

### ژێدەرێ ئاڤا گوندی:

تنێ كانییەك ب ناڤێ (كانیا جۆنەری) وەكی ژێدەرێ ئاڤا ڤەخوارنێ و پێدڤییا ناڤمالێ و چاندنێ ل گوندی هەبوو، نها ل كێمیێ دایە، سالا(٢٠٠٥)ێ پرۆژەیێ ئاڤا ڤەخوارنێ بۆ گوندی هاتییە دروستكرن.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ئەڤ گوندە جهەكێ گونجایە بۆ خودانكرنا تەرش و كەوالی، لەوما ژێدەرێ سەرەكی یێ ژیانا وان ل سەر تەرش و كەوالی بوو، پتر ژ (٣٠٠٠) سەرێن ئاژەلان كو پێكهاتینە ژ پەز و چێلان ل گوندی دهێنە خودانكرن، ل وەرزێ هاڤینێ دبەنە كویستانێن حاجی ئۆمەران و ل سەرێ زڤستانێ ڤەدگەرێنەڤە و داهاتەكێ باشێ ئابووری بۆ وان دابین دكەتن. دیسان خەلكێ گوندی چاندنا گەنم و جەهان ژی دكەن، ژبلی بیستانان و چاندنا كەسكاتی بۆ پێدڤیێن رۆژانە. هەروەسان گەلەك ژ خەلكێ وی مووچەخۆر و پێشمەرگە و كاسبكارن .

سالا (١٩٧٨)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەكرن[١٥].

## گوندێ قەسرۆك:

گوند دكەڤیتە دووراتییا (٣٠كم) رۆژهەلاتێ بجیل ل سەر رووبارێ (زێی مەزن). ناڤێ گوندی ژ وێ چەندێ هاتییە كو ڤی گوندی د كەڤندا خانیێن خۆش هەبووینە و جهەكێ خۆشە ژی لەوا ب قەسرا هاتییە ناڤكرن و نها بوویە (قەسرۆك).

### سنوورێن گوندی:

**باكووری**: گوندێ شەرەفونا.

**باشووری**: گوندێ ئەستریان.

**رۆژهەلاتی**: رووبارێ زێی مەزن.

**رۆژئاڤای**: گوندێ دازین بنزویر.

### پێكهاتا گوندی:

خەلكێ وی ژ عەشیرەتا سۆرچی نە ژ تیرەیا (مامساكی)، مێژوویا ئاكنجیبوونا وان ڤەدگەرێتەڤە چەندین پشتا بەری نها، هەمی ژ مالباتا (رەشید ئاغا) نە، پێكدهێن ژ (٤٥) خێزانان كو دبنە (٢٠٧) كەس.

### شوینوار و جهێن كەڤنارێن گوندی:

**ئاشێ كەڤن**، گەلەكێ كەڤنارە دكەڤیتە باكووری گوندی، بۆهێرانا گەنمی و برنجی هاتییە بكارهینان.

**گۆرستانا كركە جوو**، دكەڤیتە باكووری گوندی، وەكی ژ ناڤی دیار جوهییان مرێن خۆ لێ ڤەدشارتن.

**گۆڕستانا ملێ بنجی**، کەلەکا کەڤناره دکەڤیته باکووری گوندی.

## ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

ژێدەرێ ئاڤا گوندی ل بەرێ پێکهاتبوو ژ سێ کانییان ب ناڤێن (کانییا کەڤنه گوند، کانییاخدۆی، کانییا کانی زەرك) و مفایەکێ باش دگەهانده گوندیان ب تایبەت بۆ چاندنێ، لێ نها ئاڤا وان بەرەڤ هشکبوونێ ڤه دچن و مفای ژ رووباری وەردگرن.

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ئەڤ گونده جهەکێ گونجایه بۆ خودانکرنا تەرش و کەوالی، ب تایبەت چێلان و هەتا نها ژی یێ بەردەوامه، پتر ژ (٣٠٠) سەرێن چێلان ل گوندی دهێنه خودانکرن، پەزی ژی خودان دکەن و چاندنا گەنم و جەهان ژی دکەن، ژبلی بیستانان و چاندنا کەسکاتی بۆ پێدڤیێن رۆژانه و دار و بارێ فێقی وەکی هنار و هژیر و تری. دیسان راڤە ماسییان ژی دکەن و مفای ژ رووباری ب دانانا کارگەهێن (خیزی) دکەن و مفایەکێ ئابووریێ باش هەیه، ژبلی کو گەلەك ژ خەلکێ گوندی مووچەخۆر و پێشمەرگە و کاسبکارن.

سالا (١٩٩٨)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییه ڤەکرن[١٦].

## گوندێ ئەستریان:

گوند دکەڤیته دووراتییا (٣٥کم) رۆژهەلاتێ بجیل سەر رووبارێ زێی مەزن. ناڤێ گوندی ژ وێ چەندێ هاتییه کو گیایەك لێ شین دبیتن زۆرێ ب ستری یه و ب ستری زەرك بەرنیاسه ب بوورینا دەمی بوویه (ستریان).

## سنوورێن گوندی:

**باکووری**: گوندێ قەسرۆك.

**باشووری**: گوندێ کەندەگول.

**رۆژهەلاتی**: رووبارێ زێی مەزن.

**رۆژئاڤای**: گوندێ دازین.

گوندێ قەسرۆك.



### پێكهاتا گوندی:

خەلكێ گوندی ژ عەشیرەتا سۆرچییانە سەر ب تیرەیێن (مامگرد، مامساكی، شێخزادە، مارەباس )ن، ژ مێژە ل گوندی د ئاكنجی، مێژوویا وان ڤەدگەرێتەڤە چەندین پشتا بەری نها، پێكهاتینە ژ چەندین مالباتان، وەكی (مالباتا ئەحمەد، چلبی، جەلۆ، صالحی گبێ، حەولا، توخمە غەلیفە، مامتەها)، ژمارا وان (٨٠) خێزانن كو دبنە (٤٢٠) كەسان.

### شوینوارێن گوندی:

گۆڕستانا كەڤن: ژ ناڤی دیارە یا كەڤنارە، دكەڤیتە باشووری گوندی.

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل بەرێ سێ كانی ب ناڤێن (كانیی بارین، كانییا ژنا، كانییا زەلاما) ل گوندی هەبوون و مفایەكێ باش بۆ چاندنێ ژێ دیتن، لێ نها ئەڤ ئاڤە بەرەڤ نەمانێ و هشكبوونێ ڤە دچن.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ئەڤ گوندە جهەكێ گونجایە بۆ ئاژەلدارییێ، لەوما هەر دكەڤندا پەز و بزن و چێل لێ ب خودانكرینە و ئێك بوویە ژ ژێدەرێن ژیانا وان و هەتا نها ژی ل سەر وی كاری دبەردەوامن، نها پتر ژ (٥٠٠) سەرئاژەلان ل گوندی دهێنە ب خودانكرن، ژبلی كو خەلكێ وی چاندنا گەنم و جەهان و چێكرنا بیستان و جنیكان و راڤكرنا ماسییان ژی دكەن، هەروەسان هندەك ژی مووچەخۆرن.

سالا (١٩٩٢)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەكرن.

سالا (١٩٩٤)ێ پرۆژەیێ ئاڤێ بۆ گوندی هاتییە دروستكرن.

سالا (٢٠٠٥)ێ بنكەهێ ساخلەمیێ لێ هاتییە ڤەكرن[١٧].

## گوندێ زرگێنە:

گوندەكێ كەڤنارە دكەڤیتە دووراتییا (٢,٥كم) باشووری بجیل.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** ناحیا بجیل.

**باشووری:** گوندێ كەشانە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ شانەصۆر سەری.

**رۆژئاڤای:** گوندێ دزۆك.

### پێكهاتا گوندی:

خەلكێ وی ژ عەشیرەتا سۆرچی تیرەیێن (مامگرد، مامساكی، سینا) ومێژوویا وان ل گوندی ڤەدگەرێتەڤە چەندین پشتا بەری نها و ژ چەندین مالباتان پێكهاتینە كو ئەڤەنە: (حەجی خلیل، بایز، محەمەد ملا)،ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلكێ گوندی ٥٩ كەس بوو[١٨]، ژمارا وان دبنە (٩٨) خێزان كو دبنە (٤٠٥) كەس.

### شوینوارێن گوندی:

گۆڕستانا مام خەلیفە: یا كەڤنارە و دكەڤیتە باشووری گوندی.

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

ئێك كانی ب ناڤێ كانییا گوندی هەبوو و چاندن ژێ ل بەر دهاتەكرن، نها بەرەڤ هشكبوونێ ڤە دچیت.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ئەڤ گوندە جهەكێ گونجا و بوویە بۆ خودانكرنا تەرش و كەوالی ژ پەز و بزن و چێلان، لەوما ئەو ئێك بوویە ژ ژێدەرێن ژیانا خەلكێ گوندی و هەتا نها یا بەردەوامە، پتر ژ (٣٥٠٠) سەران لێ هەنە و ل هاڤینان دچنە كویستانێن (حاجی ئومەران)، دیسان خەلكێ

گوندی چاندنا گەنم و جەهـ و چێكرنا بیستانان ژی دكەن، ژبلی كو گەلەك ژێ كاسبكار و پێشمەرگە و مووچەخۆرن.

سالا (١٩٩٤)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەكرن.

سالا (٢٠٠٢)ێ پرۆژەیێ ئاڤێ بۆ وان هاتییە چێكرن (١٩)

## .گوندێ شارانێ:

گوندەكێ كەڤنارە دكەڤیتە دووراتییا (٨كم) رۆژهەلاتێ مەلبەندێ ناحیا بجیل، ناڤێ گوندی یێ دیار نینە، ملەك لێ هەیە دبێژن زۆرێ كەڤنارە و ب ملێ شارانێ هاتییە نیاسین.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ كەلات.

**باشووری:** گوندێ جۆنەلە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ رولكا ژێری.

**رۆژئاڤا:** گوندێ شانەصۆر.

### پێكهاتا گوندی:

خەلكێ گوندی ژ عەشیرەتا سۆرچی نە سەر ب تیرەیا (مامكرد)ن، ژ مێژە ل گوندی د ئاكنجینە، مێژوویا وان ڤەدگەرێتەڤە چەندین پشتا بەری نها، ژ مالباتەكێ ب ناڤێ مالباتا سەعیدی پێكهاتییە پێكهاتییە، نها (٨) خێزانن و دبنە (٤١) كەس.

ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی ئێك كانی بوو ب ناڤێ (كانییا گوندی)، چاندن ژی ل بەر دهاتەكرن و نها بەرەڤ هشكبوونێ ڤەدچیت.

### ژێدەرێن زیارا خەلكێ گوندی:

جهێ گوندی جهەكێ گونجایی یە بۆ خودانكرنا

گوندێ شارانێ:



پەز و مالاتی، ب تایبەت پەز و بزن و چێلان، هەر ژ كەڤندا ئەڤە ئێكبوویە ژ وان كارێن خەلكێ گوندی، نها ئەو ژی بەرەڤ كێمبوونێ دچیت و تنێ (٢٠٠) سەرێن پەزی ل گوندی دهێنە ب خودانكرن. دیسان خەلكێ گوندی چاندنا گەنم و جەهان ژی دكەن و بیستانان ژی ژ (باجانسۆرك و خیاران) دچینن.

سالا (٢٠١٢)ێ پرۆژەیێ ئاڤێ بۆ گوندی هاتییە چێكرن، بەلێ نها تێكچوویە[٢٠].

## گوندێ روولكا كەریم خان:

گوندەكێ كێم ئاڤە، دكەڤیتە دووراتییا (٨كم) رۆژهەلاتێ بجیل، ناڤێ گوندی ژ ناڤێ دارا (روولك) هاتییە كو ل ڤی گوندی د زۆرن.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری**: زنجیرا چیایێ بێرات.

**باشووری**: گوندێ دەشتیل.

**رۆژهەلاتی**: گوندێ سوسناوا.

**رۆژئاڤا**: گوندێ كەلات.

### پێكهاتا گوندی:

خەلكێ وی ژ عەشیرەتا سۆرچییانە سەر ب تیرەیا (مامگرد)ن، ژ مێژە ل گوندی دئاكنجینە، مێژوویا وان ڤەدگەرێتەڤە چەندین پشتا بەری نها، ل بەرێ كۆتان بوویە و جهێ خودانكرنا پەز و مالاتی بوو، ژ مالباتا (توخمە شڤان) پێكدهێت كو نها (٨) خێزانن و دبنە (٤٨) كەس.

گوندێ روولكا كەریم خان



### شوینوارێن گوندی:

**ئاشێ رولجێ:** ئاشەكێ كەڤنارە دكەڤیتە رۆژهەلاتی گوندی، بۆ هێرانا گەنمی و برنجی هاتییە بكارئینان.

### زێدەرێن زیارا خەلكێ گوندی:

هەر دكەڤندا خودانكرنا پەز و بزن و چێلان ژێدەرێ سەرەكیێ ژیانا خەلكێ ڤی گوندی بوویە، هەتا نها ژی بەردەوامن و پتر ژ (١٥٠٠) سەرێن مالاتی ل گوندی دهێنە ب خودانكرن، هاڤینان دچنە كویستانێن حاجی ئۆمەران، هەروەسان خەلكێ گوندی گەنم و جەهان ژی دچینن و بیستانان ژی دكەن.

زارۆكێن وان بۆ خواندنێ دچنە گوندێ دەشتیل و ئاڤ ژی بۆ وان ب تانكەران دهێت[21].

## گوندێ شانەسۆر ژێری:

گوندەكێ كەڤنارە و دەڤەرەكا زویرە، گەلەكێ كێم ئاڤە، دكەڤیتە دووراتییا (٣كم) باشووری رۆژهەلاتێ بجیل.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ كانی در.

**باشووی:** گوندێ گەرمكا سەری.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ شارانێ.

**رۆژئاڤا:** گوندێ شانەسۆر سەری.

### پێكهاتا گوندی:

خەلكێ وی ژ عەشیرەتا سۆرچی تیرەیا (مامكرد)ن، ژ مێژە ل گوندی د ئاكنجی، مێژوویا وان ڤەدگەرێتەڤە چەندین پشتا بەری نها، گوند د بنەرەتدا كۆتان و جهێ خودانكرنا پەزی بوویە و ژ ئێك بنەمال ب ناڤێ (مالباتا حماغە)پێكدهێت، ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ خەلكێ گوندی تنێ ٤٢ كەس بوون[22]، نها (١٩) خێزانن كو دبنە (١١٠) كەس.

### زێدەرێن زیارا خەلكێ گوندی:

جهەكێ گونجایە بۆ خودانكرنا پەز و مالاتی ب تایبەت پەز و بزن و چێلان، لەوما هەر د كەڤندا ئەڤە ئێكبوویە ژ كارێن گوندیان، هەتا نها ژی بەردەوامە، پتر ژ (٥٠٠٠) سەرئاژەل ل گوندی دهێنە خودانكرن، هاڤینان دچنە كویستانێن حاجی ئۆمەران. دەرامەتێ گەنم و جەهان كێم لێ دهێتە چاندن، دیسان هندەك ژ خەلكێ وی كاسبكار و پێشمەرگە و مووچەخۆرن.

سالا (١٩٩٨)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییەڤەكرن.

سالا (٢٠١٠)ێ پرۆژەیێ ئاڤێ بۆ وان هاتییە چێكرن و كێشەیا بێ ئاڤیێ چارەسەركرییە[23].

## گوندێ چەمەسێل:

گوند دكەڤیتە دووراتییا (٦كم) رۆژئاڤایێ بجیل، ناڤێ گوندی ب دروستی نەهاتییە زانین كا ژ چ هاتییە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندی دزۆك.

**باشووری:** گوندێ چێلان.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ مێرگە مۆشك.

**رۆژئاڤا:** رووبارێ گبێلو گوندێ نواڤا.

### پێكهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە یەك ژ وان ٥٤ گوندێن قەزا ئاكرێ بوو یێن ژ ئەنجامێ سەروبەرێ نە تەنا یێ دەڤەرێ و زێدەگاڤیێن عەشیرەتان ل سەر خەلكێ گوندان ل داویا سەدسالیا نوزدێ و دەسپێكا سەدسالیا بیستێ هاتینەبەردان و ڤالا بووین ژ خەلكێ و پاشتر ل دووڤ پێشنیازا ویلایەتا مووسل یا ئوسمانی ل سالا ١٩٠٧ێ داینە دگەل گوندێن سولتان عەبدولحەمیدێ دووێ و وەك مولكێن وی سەرەدەری دگەلدا هاتییەكرن ب مولكێن هەمایونی (الاملاك الهمایونیە) دهاتنە ناڤكرن و هەتا لادانا سولتان عەبدولحەمیدی ژ دەستەلاتی ماینە دگەل مولكێن وی و پاشتر كەتینە سەر مولكێن گەنجینەیا گشتییا دەولەتێ.

وی دەمی رووبەرێ گوندی ١٨٠٠ دۆنەمێن عەردی بوو [٢٤]. خەلکێ نهاییێ گوندی ژ عەشیرەتا سۆرچی ب تیرەیێن (مامکرد، مامانوپەز)ن، مێژوویا ئاکنجیبوونا وان ڤەدگەرێتەڤە چەندین پشتا بەری نها، ژ چەندین مالباتان پێکهاتینە، وەکی: (حەولا، محەمەد، قادر)، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ خەلکێ گوندی ٣٢ کەس بوون[٢٥]، نها ژمارا وان (١٧) سەرخێزانن کو دبنە دەوروبەرێن (٢٠٠) کەسان.

### شوینوار و جهێن کەڤنارێن گوندی:

شکەفتا نوارکا، دکەڤیتە باکووری گوندی.

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

ئێك کانییە ب ناڤێ (کانییا گوندی)، چاندن ل بەر دهاتەکرن و نها بەرەڤ هشکبوونێ دچیت.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

هەر د کەڤندا ئەڤ گوندە ئێکبوویە ژ وان گوندان یێن تەرش و کەوالی لێ دهاتە خودانکرن و هەتا نها ژی بەردەوامە، پتر ژ (٦٠٠) سەرێن پەز و بزن و چێلان لێ دهێنە خودانکرن، ژبلی کو دەخل و دان ژی باش بەرهەمدهینن و چێکرنا بیستانان و چاندنا باجانسۆرك و خیار و شتییان، بۆ ڤێ چەندێ مفای ژ ئاڤا رووبارێ گبێری دبینن. هەروەسان گەلەك ژ خەلکێ گوندی کاسبکار و مووچەخۆرن.

سالا (١٩٩٥)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەکرن.

سالا (٢٠٠٥)ێ پرۆژەیێ ئاڤێ بۆ وان هاتییە چێکرن[٢٦].

## گوندێ کەندەگول:

گوند دکەڤیتە سەر رووبارێ زێ مەزن ب دووراتییا (٤٠کم) رۆژهەلاتی مەلبەندێ ناحیا بجیل، ناڤێ گوندی ژ وێ چەندێ هاتییە کو گوند دکەڤیتە جهەکێ کویر و زۆر گول و گولزار لێ شین دبن و ب کەندە گول بەرنیاس بوویە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری**، گوندێ ئەستریان.

**باشووری**، رووبارێ زێی مەزن.

**رۆژهەلاتی**، هەر رووبارێ زێی مەزن.

**رۆژئاڤا**، گوندێ خولێ.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ وی عەشیرەتا سۆرچی سەر ب تیرەیێن (کرو، مامساکی)نە، مێژوویا ئاکنجیبوونا وان ڤەدگەرێتەڤە چەندین پشتا بەری نها و ژ چەندین مالباتان پێکهاتینە، وەکی: (مالباتا خدۆیێ مەستانێ، مالباتاحمۆی، مالباتا حاجی هەمزە، مالباتا ئەحمەدێ هەسپەزێ، خندۆیێ مینۆی)، ژمارا وان (١٢٠) سەرخێزانن کو دبنە (٣٠٠) کەس.

ڤی گوندی گۆرستانەکا کەڤن ل رۆژهەلاتێ گوندی یا هەی.

### ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

ژێدەرێن ئاڤێ ل ڤی گوندی پێکهاتییە ژ سێ کانییان ب ناڤێن (کانیی کوراڤۆك، کانیی کەچەرۆك، کانی رەزەگور)، نها ئاڤێن وان بەرەڤ هشکبوونێ ڤە دچن.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ئەڤ گوندە جهەکێ گونجایە بۆ خودانکرنا پەز و مالاتی، ب تایبەت پەز و چێلان و هەر د کەڤندا ئەڤە ئێکبوویە ژ ژێدەرێن ژیانا وان و هەتا نها ژی بەردەوامە، پتر ژ (٨٠٠) سەرئاژەل ل گوندی دهێنە خودانکرن و داهاتەکێ باشێ ئابووری بۆ وان دابین دکەتن، ژبلی کو بەرهەمەکێ باشێ دەخل و دانی ژ گەنم و جەهان و چێکرنا بیستانان و دارێن فێقی ژ هنار و هژیر و تری لێ دهێنە چاندن، هەر وەسا کو گوند دکەڤیتە سەر رووبارێ زێ مەزن راڤکرنا ماسیان ژی ئێکە ژ ژێدەرێن ژیانا وان، دیسان هندەك خەلکێ وی کاسبکار و پێشمەرگەنە.

سالا (١٩٧٨)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەکرن.

سالا (٢٠١٢)ێ پرۆژەیێ ئاڤێ بۆ وان هاتییە چێکرن[٢٧].

## گوندێ بیێ:

گوند دكەڤیتە دەڤەرەكا ئاسێ و چیایی، ب دووراتییا (٣٢كم) رۆژهەلاتی مەلبەندێ ناحیا بجیل، ناڤێ گوندی ژ دارا بیێ (بیهۆكێ) هاتییە كو د كەڤندا ئێكبوویە ژ دارێن بەربەلاڤێن گوندی.

**باكووری:** زنجیرا چیایێ بێرات.

**باشووری:** گوندێ بیا ژێری.

**رۆژهەلاتی:** رووبارێ زێی مەزن.

**رۆژئاڤای:** گوندێ نێروا.

## پێكهاتا گوندی:

خەلكێ گوندی ژ عەشیرەتا سۆرچییانە سەر ب تیرەیێن (مارەمەند، مامساكی)، مێژوویا ئاكنجیبوونا وان ل ڤی گوندی ڤەدگەرێتەڤە چەندین پشتا بەری نها، پێكدهێن ژ هەردو مالباتێن (خدۆی و ئاڤدەل)، سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلكێ گوندی ٦٧ كەس بوو[٢٨]، نها وان (٨٣) سەرخێزانن كو دبنە (١٩٠) كەس.

## شوینوار و جهێن گوندی:

ڤی گوندی سێ گۆڕستانێن كەڤن لێ هەنە:

گۆڕستانا مەلا عەلی: دكەڤیتە باكوورێ گوندی.

گۆڕستانا شێرەسوار: دكەڤیتە باشوورێ گوندی.

گۆڕستانا مام خدۆی: دكەڤیتە رۆژئاڤایێ گوندی.

ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

ڤی گوندی دو كانی ب ناڤێن (كانیی موسا، كانیی مزگەفتێ) هەنە، بەرێ چاندن ل بەر دهاتەكرن لێ نها ئاڤا وان كێمبوویە و بەرەڤ هشكبوونێ دچن و تنێ بۆ ڤەخوارنێ مفا ژێ دهێتە وەرگرتن.

## ژێدەرێن زیارا خەلكێ گوندی:

جهەكێ گونجایە بۆ خودانكرنا پەز و مالاتی ب تایبەت بزنێ، هەر د كەڤندا ئەڤە كارێ سەرەكیێ گوندیان بوو و هەتا نها ژی بەردەوامە، پتر ژ (١٠٠٠٠) سەران ل گوندی دهێنە خودانكرن و ل هاڤینان دچنە كویستانێن حاجی ئۆمەران، هەروەسان خەلكێ گوندی دەخل و دانی ژی ژ گەنم و جەهان دچینن ژ بلی چێكرنا بیستانان و چاندنا باجانسۆرك و خیار و كەسكاتییێن دی و چاندنا دار و بارێ فێقی ژ هنار و هژیر و تری، ژبلی كو هندەك ژ خەلكێ گوندی كاسبكار و مووچەخۆرن.

سالا (٢٠٠٠)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەكرن.

سالا (٢٠١٢)ێ پرۆژەیێ ئاڤێ بۆ وان هاتییە چێكرن[٢٩].

## گوندێ بانەسۆر:

گوند دكەڤیتە دووراتییا (٤كم) باشووری مەلبەندێ ناحیا بجیل، ناڤێ گوندی یێ ژ وێ چەندێ هاتی كو ئەو جهێ گوند ل سەر هاتییە ئاڤاكرن جهەكێ راستە و ئاخەكا سۆر لێ هەیە، لەوما بوویە بانەسۆر.

## سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ شانەسۆر سەری.

**باشووری:** گوندێ گەرمكا ژوور.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ گۆجار.

**رۆژئاڤای:** گوندێ میرگەمۆشك.

## پێكهاتا گوندی:

خەلكێ گوندی ژ عەشیرەتا سۆرچییانە سەر ب تیرەیا (مامسال)ن، مێژوویا ئاكنجیبوونا وان ل ڤی گوندی ڤەدگەرێتەڤە چەندین پشتا بەری نها، ژ ئێك مالبات ب ناڤێ (مالباتا كابایزحەیران) پێكهاتییە، ژمارا وان (١٢) سەرخێزانن كو دبنە (٨٠) كەس.

## شوینوار و جهێن كەڤنارێن گوندی:

گۆڕستانا جەمكە حوزر گۆڕستانەكا كەڤنارە، دكەڤیتە باشووری گوندی.

سەبارەت ژێدەرێن ئاڤێ ژی ل ڤی گوندی تنێ كانیییەك ب ناڤێ (كانیيا گوندی) لێ هەیە و ل بەرێ چاندن ل بەر دهاتەكرن، نها بەرەڤ هشكبوونێ ڤەدچیت.

## ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ئەڤ گوندە یێ گونجایە بۆ خودانكرنا تەرش و كەوالی ژ پەز و بزن و چێلان و هەر دكەڤندا ئەڤ كارە كرینە و هەتا نها ژی بەردەوامە، نها پتر ژ (٢٠٠٠) سەران ل گوندی دهێنە ب خودانكرن هاڤینان دچنە كویستانێن حاجی ئۆمەران. دیسان خەلكێ گوندێ دەرامەتێ چاندنێ ژی دكەت ژ دەخل و دانی و چێكرنا بیستانان، ژبلی كو هندەك خەلكێ گوندی كاسبكار و مووچەخۆر و پێشمەرگەنە.

ژبەر كو زارۆكێن وان دكێمن خواندنگەهـ بۆ نەهاتییە ڤەكرن و پرۆژەیێ ئاڤێ ژی لێ نینە[٣٠].

## گوندێ گۆجار:

گوند دكەڤیتە دەڤەرا زوێرگ، ب دووراتییا (١٥كم) رۆژهەلاتێ بجیلێ، نها بوویە ئێك ژ وان جهێن گرنك چونكی نەفت لێ دەركەفتیە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ سەرسول.

**باشووری،** گوندێ مەمەندۆك.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ زراڤك.

**رۆژئاڤای،** گوندێ گەرمكاژوری.

### پێكهاتا گوندی:

خەلكێ وی ژ عەشیرەتا سۆرچییانە سەر ب تیرەیا (مامكرد)ن، ژ مێژە ل گوندی د ئاكنجینە، مێژوویا وان ڤەدگەرێتەڤە چەندین پشتا بەری نها، ژ چەندین مالباتا پێكهاتییە كو ئەڤەنە: (مالباتا صالح، مالباتا باس، مالباتا محمود، مالباتا عسمان، مالباتا مینۆ، مالباتا رەشید، مالباتا مستۆ)، ژمارا وان (٧٦) خێزانن كو دبنە (٤٠٠) كەس.

### شوینوارێن گوندی:

**شكەفتا خەمانێ،** شكەفتەكا كەڤنارە ل رۆژهەلاتی گوندی، مێژوویا وی دیار نینە.

**گۆرستانا كەڤن،** گۆرستانەكا كەڤنە دكەڤیتە د ناڤاگوندیدا.

### ژێدەرێ ئاڤا گوندی:

ژێدەرێن ئاڤێ ل ڤی گوندی پێكهاتینە ژ (٢) كانییان ئەوژی (كانیيامێرانێ، كانیياكەڤن)ن.

ل بەرێ ڤان كانییان مفایەكێ باش دگەهاندە گوندیان ب تایبەت چاندن ل بەر دهاتەكرن، لێ نها بەرەڤ هشكبوونێ دچن و تنێ ئاڤا وان بۆ ڤەخوارنێ مفا ژێ دهێتە وەرگرتن، سالا (١٩٩٤)ێ پرۆژەیێ ئاڤا ڤەخوارنێ بۆ گوندی هاتییە دروستكرن.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

جهەكێ گونجایە بۆ خودانكرنا تەرش و كەوالی، د كەڤندا ئەڤە ئێكبوویە ژ وان كارێن گوندیان ئەنجامددان و هەتا نها ژی بەردەوامە، پتر ژ (٥٠٠٠) سەرێن ئاژەلان ژ پەز و بزن و چێلان ل گوندی هەنە، وەرزێ هاڤینێ دبەنە كویستانێن حاجی ئۆمەران و سەرێ زڤستانێ ڤەدگەرێنەڤە و داهاتەكێ باش بۆ وان دابین دكەتن. دیسان خەلكێ گوندی دەخل و دانی تایبەت گەنم و جەهان دچینن و بیستانان دكەن، باجانسۆرك و خیار و باجان و بامیان دچینن، ژبلی دار و بارێ فێقی، ب تایبەت هنار و هژیر و تری، هەروەسان گەلەك ژ خەلكێ گوندی كاسبكار و مووچەخۆرن ژی.

سالا (١٩٨٠)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەكرن و هەتا نها یا بەردەوامە[٣١].

## گوندێ سۆریا ژێری:

ئەڤ گوندە دكەڤیتە جهەكێ زوێرگ، ب دووراتییا (١٦كم) رۆژهەلاتێ بجیلێ، گوندەكێ نوییە و سالا (٢٠١٢)ێ بوویە گوند، ناڤێ گوندی هەر ژ گوندی سۆریا ژووری هاتییە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ سۆریا ژووری.

**باشووری،** گوندێ دارووك ژێری.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ نیروا.

**رۆژئاڤا،** گوندێ خەلان مامگرد.

**پێكهاتا گوندی:**

خەلكێ وی ژ عەشیرەتا سۆرچییانە، سەر ب تیرەیا (مامگرد)ن، بەرێ كۆتان بوو، ئانكو جهێ خودانكرنا تەرش و كەوالی بوویە، ژ مالباتا (توخمە ئەحمەد) پێكهاتییە، نها (٥) خێزانن كو دبنە (٣٤) كەس.

ژێدەرێ ئاڤا گوندی تنێ كانییەكە ب ناڤێ (كانییا دەشتێ) و بیرەك ژی ب دەست كۆلاینە.

**ژێدەرێن زیارا خەلكێ گوندی:**

ژبەر كو د بنەرەتدا ئەڤ گوندە جهێ خودانكرنا پەز و مالاتی بوویە، لەوما ژمارەكا زۆرا پەز و ومالاتی لێ دهێنە ب خودانكرن، ب تایبەتی پەز و بزنان كو ژمارا وان ژ (٨٠٠) سەران پترە، ل هاڤینان دچنە كویستانێن حاجی ئومەران و بەرهەمەكێ باش ژ شیر و ماست و پەنیر و ژاژی و هری و... هتد بەرهەم دهینن، كو بوویە ئێك ژ گرنگترین ژێدەر بۆ داهاتێ گوندی. هەروەسان دەخل و دان ژی ل گوندی بەرهەم دهینن، ب تایبەت گەنم و جەهان و دەرامەتێ دی یێ دێم ژی ژ گوندۆر و ترۆزیان.

بۆ خواندنێ ژی زارۆكێن وان دچنە گوندێ خەلان.[٣٢]

## گوندێ خولێ:

گوندەكێ كەڤنارە، دكەڤیتە دەڤەرا زویرگە ل سەر رووبارێ (زێی مەزن)، ب دووراتییا (٣٠كم) رۆژهەلاتێ ناحیا بجیل، ناڤێ گوندی ژ وێ خولا رووبارێ هاتییە ئەوا ل نێزیك گوندی را دبووریتن كو دكەڤیتە باشووری گوندی.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری،** گوندێ كیلی سینان.

**باشووری،** رووبارێ زێی مەزن.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ كەندەگول.

**رۆژئاڤای،** گوندێ میربالیان.

**پێكهاتا گوندی:**

خەلكێ وی ژ عەشیرەتا سۆرچییانە سەر ب تیرەیا (سینا)نە، ژ مێژە ل گوندی د ئاكنجینە و ژ چەند مالباتان پێكدهێن كو ئەڤەنە: (مالباتا رەشكێ شلە، مالباتا حەسەن، مالباتا توخمە حمر)، ل سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلكێ گوندی ١٥٣ كەس بوو[٣٣]، ژمارا وان (٥٣) خێزانن كو دبنە (٥٠٦) كەس.

**شوینوارێن گوندی:**

گورستانا بچویكا دكەڤیتە ناڤ گوندی، زۆرا كەڤنە و مێژوویا وێ دیار نینە.

**ژێدەرێ ئاڤا گوندی:**

ژێدەرێن ئاڤێ ل ڤی گوندی ژ (٣) كانییان ب ناڤێن (كانییا مەلا، كانییا گوندی، كانییا چەم) پێكهاتینە، وان كانییان ل بەرێ مفایەكێ باش دگەهاندە گوندی و ب تایبەت بۆ چاندنێ، لێ نها ئاڤا وان بەرەڤ كێمیێ ڤە دچیت، سالا (٢٠١٠)ێ حكومەتا هەرێمێ پرۆژەیێ ئاڤا ڤەخوارنێ بۆ گوندییان دروستكر و ئاریشەیا كێم ئاڤیێ چارەسەركرییە.

**ژێدەرێن زیارا خەلكێ گوندی:**

ئەڤ گوندە جهەكێ گونجایە بۆ خودانكرنا چێلان و پتر ژ (٨٠٠) سەران ل گوندی دهێنە خودانكرن، بەرهەمەكێ باش ژ شیر و ماست و پەنیر و ژاژی و...هتد بەرهەم دهینن و ئێكە ژ گرنگترین داهاتێن وان و ل هاڤینان دچنە كویستانێن حاجی ئومەران، هەروەسان خەلكێ گوندی دەخل و دانی ژی دكەن، ب تایبەت گەنم و جەهان و زەڤیێن گوندۆر و ترۆزیان ژی شین دكەن، ژبلی چاندنا خیار و تەماتە و باجانرەشك و بامی و لۆبیك و شتی و... هتد، ب تایبەت كو گوند دكەڤیتە سەر رووبارێ زێ مەزن و مفایەكێ باش ژێ دبینن، دیسان گەلەك ژ خەلكێ

گوندی مووچەخۆرن ژی.

سالا (٢٠٠٥)ێ بۆ ئێکەم جار خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەکرن[٣٤].

## گوندێ دازین ژێری:

گوند دکەڤیتە دەڤەرا زویرکە ب دووراتییا (١٨کم) رۆژهەلاتێ بجیلێ، سالا (١٩٥٧)ێ بوویە گوند، ناڤێ گوندی ژ داسنیا هاتییە کو دبێژن ل بەرێ ل ڤی جهی دنیشتەجێ بووینە، و ب بوورینا دەمی بوویە دازین.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ دازین ژووری.

**باشووری،** گوندێ کەندەگول.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ شەرەفونا.

**رۆژئاڤای،** گوندێ میربالیان.

### پێکهاتا گوندی:

گوندێ دازین ئەڤ گوندە یەك ژ وان ٥٤ گوندێن قەزا ئاکرێ بوو یێن ژ ئەنجامێ سەروبەرێ نە تەنا یێ دەڤەرێ و زێدەگاڤیێن عەشیرەتان ل سەر خەلکێ گوندان ل داوییا سەدساليا نوزدێ و دەسپێکا سەدسالییا بیستێ هاتینەبەردان و ڤالا بووین ژ خەلکێ و پاشتر ل دووڤ پێشنیازا ویلایەتا مووسل یا ئوسمانی ل سالا ١٩٠٧ێ داینە دگەل گوندێن سولتان عەبدۆلحەمیدێ دووێ و وەك مولکێن وی سەرەدەری دگەلدا هاتییەکرن ب مولکێن هەمایونی (الاملاك الهمایونیە) دهاتنە ناڤکرن و هەتا لادانا سولتان عەبدۆلحەمیدی ژ دەستەلاتی ماینە دگەل مولکێن وی و پاشتر کەتینە سەر مولکێن گەنجینەیا گشتییا دەولەتێ، وی دەمی رووبەرێ گوندی ٥٠٠٠ دۆنەمێن عەردی بوو[٣٥]، دبیت پشتی دوبارە ئاڤاکرنا گوندی ب دازین ژێری هاتبیتەناڤکرن، خەلکێ نهایێ گوندی سۆرچی نە سەر ب تیرەیا (مامگرد)ن، بەری ئەڤ تیرەیە ل گوندی ئاکنجی ببن، ئەڤ گوندە جهێ خودانکرنا تەرش و کەوالی بوویە، ئانکو کۆتان بوو، ژ هەردو بنەمالێن (مالباتا مستەفای، مالباتا قادری) پێکهاتییە، ژمارا (١٤) خێزانن کو دبنە (١٠٦) کەس. د سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێدا ئاماژە ب گوندەکی ب ناڤێ دازینەهاتییەکرن وی دەمی هژمارا خەلکێ وی تنێ ٢٤ کەس بوو[٣٦].

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

د بنەرەتدا گوند جهێ خودانکرنا پەز و مالاتی بوویە، لەوما ژمارەکا زۆرا پەز و مالاتی لێ دهێنە ب خودانکرن و ل هاڤینان دچنە کویستانێن حاجی ئومەران، ب تایبەت پەز و بزن، کو ژمارا وان ژ (٣٠٠٠) سەران پترە و بەرهەمەکێ باش ژ (شیر و ماست و پەنیر و ژاژی و هری... هتد) بەرهەم دهینن. هەروەسان گوندی دەخل و دان ژی دچینن، کو ئەو ژی داهاتەکێ دی یێ خەلکێ گوندی یە، ژبلی کو هندەك مووچەخۆرن ژی.

پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا (٢٠١٤)ێ بۆ گوندی هاتییە چێکرن.

خواندنگەهـ ل سالا (٢٠٠٢)ێ ل گوندی هاتییە ڤەکرن[٣٧] .

## گوندێ دازین بنزویر:

گوند دکەڤیتە دەڤەرا زویرکە، ب دووراتییا (١٨کم) رۆژهەلاتێ بجیلێ، جهێ گوندی ل بەرێ کۆتانبوو، سالا (١٩٥٧)ێ بوویە گوند، ناڤێ وی ژ داسنیا هاتییە کو دبێژن ل بەرێ ل ڤی جهی د ئاکنجیبوون، ب بوورینا دەمی بوویە دازین.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ دازین ژووری.

**باشووری،** گوندێ دازین ژێر.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ شەرەفونا.

**رۆژئاڤای،** گوندێ زراڤك.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ وی ژ عەشیرەتا سۆرچی نە سەر ب تیرەیا

(مامگرد)ن، گوند وان پێکهاتییە ژ مالباتا سمایل بتنێ، کو دبنە (٦) خێزان و (٤٥) کەس.

جهێن شوینواری ل گوندی گۆرستانا بنگەری یە، کو گۆرستانەکا کەڤنە دکەڤیتە رۆژهەلاتێ گوندی و مێژوویا وی دیار نینە.

## ژێدەرێ ئاڤا گوندی:

تنێ ئێك ژێدەرێ ئاڤێ ل گوندی هەیە ئەوژی (کانی سارداڤ) ە، چ پرۆژەیێن ئاڤێ بۆ نەهاتینە چێکرن.

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

د بنەرەتدا گوند جهێ خودانکرنا پەز و مالاتی بوویە، لەوما ژمارەکا زۆرا پەز و مالاتی ل گوندی دهێنە ب خودانکرن، ب تایبەت پەز و بزنان، کو ژمارا وان ژ (١٢٠٠) سەران پترە و ل هاڤینان دبەنە کویستانێن حاجی ئومەران، خەلکێ گوندی مفایەکێ باش ژ شیر و ماست و پەنیر و ژاژی و هریبا وان دبینن، ئەو چەند ئێکە ژ گرنگترین ژێدەرێن ژیانا وان، ژبلی چاندنا گەنم و جەهان و هندەك ژی پێشمەرگە و مووچەخۆرن.

بۆ خواندنێ ژی زارۆکێن وان دچنە گوندێ دازین ژێری[٣٨].

## گوندێ دازین ژووری:

گوندەکێ جوان و بلندە ل دەڤەرا زویرگان، سالا (١٩٥٧)ێ هاتییە ئاڤاکرن، کو بەری هینگێ کۆتانا حاجی وەسمان لێ بوویە، دکەڤیتە دووراتیا (١٣کم) رۆژهەلاتێ بجیلێ.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ کەندەسوور.

**باشووری،** گوندێ دازین ژێری.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ شەرەفوونا.

**رۆژئاڤای،** گوندێ میربالیان.

گوندێ دەشتیل



**پێکهاتا گوندی:**

دازین ژوور ژ عەشیرەتا سۆرچی تیرەیا (مامگرد) ن، ب شکەفتو دهێتە نیاسین، تنێ ئێك بنەماله ب ناڤێ (حاجی وەسمان)، د کەڤندا ل ڤی گوندی دژین، نها بووینه (١٦) خێزان و (٩٥) کەس.

بەری سەرهلدانا سالا (١٩٩١)ێ گوند ژ لایێ رژێما عیراقێ ڤە هاتییە خرابکرن، لێ جارەکا دی خەلکێ گوندی ئاڤاکرنەڤە و بەردەوامی ب ژیانا خۆ دانەڤە.

ڤی گوندی چ کانی و پرۆژەیێن ئاڤێ لێ نینن، ئاڤ بۆ ب تانکەران دهێت.

**زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

ژیانا خەلکێ وی پتر ل سەر خودانکرنا تەرش و کەوالی یە و بۆ وێ چەندێ ژی هەر ئاڤ ب تانکەران دهێت، دیسان دەخل و دان ژی ب دێمی لێ دهێنەکرن.

سالا (٢٠٠٢)ێ بۆ ئێکەم جار خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەکرن[٣٩].

**گوندێ دەشتیل:**

گوند دکەڤیتە دەشتەکا راست ل بنارێ چیای، ب دووراتییا (١٠کم) رۆژهەلاتی ناحیا بجیلێ، جهێ گوندی ل بەرێ کۆتان بوو، سالا (١٩٩٥)ێ بوویه گوند، ناڤێ گوندی ژ وی جهی هاتییە یێ گوند ل سەر هاتییەئاڤاکرن.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ کەلاتی.

**باشووری:** گوندێ سەرسول.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ روولکا ژووری.

**رۆژئاڤا:** گوندێ جۆنەله.

**پێکهاتا گوندی:**

خەلکێ وی سۆرچی نە سەر ب تیرەیا (مامگرد) ن، پێکهاتییە ژ ئێك بنەمال ب ناڤێ (مالەسێن)، دبنە (٢١) خێزان و (١١٢) کەس.

گوندێ خەلان مامگرد



## شوینوارێن گوندی:

**گۆڕستانا گرکە جو،** دکەڤیتە باکووری گوندی، زۆرا کەڤنارە و مێژوویا وی دیار نینە، دبێژن جوهی لێ هاتینە ڤەشارتن.

**گۆڕستانا بچووکا،** دکەڤیتە باکووری گوندی، گەلەکا کەڤنە.

## ژێدەرێ ئاڤا گوندی:

تنێ ئێك ژێدەرێ ئاڤێ ل گوندی هەیە ئەوژی (کانی حەلانۆك)ە، ل رۆژهەلاتی گوندی و ژێدەرێ ئاڤا ڤەخوارنێ یە، سالا (٢٠٠٠)ێ پرۆژەیێ ئاڤێ بۆ هاتییەچێکرن، ل هەمان سال خواندنگەهـ ژی بۆ هاتییە ڤەکرن.

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

د بنەرەتدا گوند جهێ خودانکرنا پەز و مالاتی بوویە، لەوما ژمارەکا زۆرا پەز و بزن و چێلان دهێنە خودانکرن، ژمارا وان ژ (٦٠٠) سەران پترە، هاڤینان دچنە کویستانێن حاجی ئومەران، مفایەکێ باش ژ شیر و ماست و پەنیر و ژاژی و هریێ دبینن، ژێدەرێ سەرەکیێ ژیانا گوندییانە ، ژبەر کێمیا ئاڤێ چاندن ل گوندی ناهێتەکرن. هەروەسان هندەك ژ خەلکێ گوندی مووچەخۆرن ژی، ب تایبەت ل ناڤ هێزێن لەشکەرێ کوردستانێ[٤٠].

## گوندێ خەلان مامگرد:

گوندەکێ کەڤنارە، ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان مێژوویا وی ڤەدگەرێتەڤە بۆ بەری (٣٠٠) سالان، دکەڤیتە بناری چیایێ بێرات، ب دووراتییا (١٣کم) ژ ناڤەندا بجێلێ، سەر رێیا سەرەکییا قەندیل- ئاکرێ، ناڤێ گوندی ژ پەیڤا (خلوە) هاتییە ژبەر کو ل بەرێ خەلوەتگا ل گوندی هەبوویە کو جهێ خودێ پەرستیێ بوویە و زیکر و عیبادەت تێدا دکرن.

ئەو قورئانا دەستنڤیس یا سالا ١١٧٣ مش هاتییە نڤیسین



## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** زنجیرا چیایێ بێرات.

**باشووری:** گوندێ داررووك.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ سۆریا.

**رۆژئاڤای:** گوندێ سوسناوا و بێسمەکەران.

## پێکهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە ژ عەشیرەتا سۆرچییانە سەر ب تیرەیا (مامگرد)ن، گوندێ شێخ زادەیایە و ب شێخ زادێ مامگردا بەرنیاسن، ژ چەند بنەمالێن کەڤن پێکدهێن وەکی (حوسێنی، ئەحمەدی، حەسەنی، شاکری، شۆری) و هەمی د کەڤندا ل ڤێرێ ئاکنجینە. ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ ڤی گوندی ١٥٠ کەس بوو[٤١]، ژمارا وان (٥٤) خێزانن کو دبنە (٣٢٢) کەس.

## شوینوار و جهێن کەڤنارێن گوندی:

مزگەفتا کەڤن: دکەڤیتە د ناڤاگوندی دا، مێژوویا وێ ل دووڤ گۆتنان ڤەدگەرێتە سەردەمێ هاتنا ئایینێ ئیسلامێ بۆ کوردستانێ و تنێ شوینوارێن وێ ماینە.

**تانەبەرد:** ژ چەند بەردان پێکهاتینە، دهێتە گۆتن ل سەر دەمێ کەڤن جهێ عیبادەتی بوویە، درێژیا وێ (٣م)ن و پانی (٣م)، دکەڤیتە د ناڤاگوندیدا.

**دارا ملە مزگەفتی:** دار بەرویەکا زۆرا کەڤنە، وەك گوندی دبێژن مێژوویا وێ ڤەدگەرێتەڤە بەری ٢٠٠ سالان و وەکی خۆیە، ل دەڤ گوندیا گەلەکا خۆشتڤیە و باش سەخبێریێ لێ دکەن.

**گۆڕستان:** چەندین گۆڕستانێن زۆر کەڤن ل گوندی هەنە، ئەڤە ژی دیار دکەت کو ژ مێژە گوند یێ ئاڤا بوو، ژ وانژی گۆرستانا (خەریبۆك، گرك، چاخا بن کەڤری، جویشك).

گوندێ سۆریا



**قورئان:** پەرتووکا پیرۆز ئێکە ژ بەلگەیێن مەزن یێ کەڤناتییا ڤێ گوندی، ئەڤ پەرتووکا پیرۆز وەقفا مالباتا (ئەحمەدی) یە، ب دەستخەت هاتییە نڤیسین و مێژوویا وێ وەکی ل سەر هاتییە دیارکرن ڤەدگەڕێتەڤە سالا (١١٧٣مش)، نها ل دەڤ مامۆستا (نوری ئەحمد کەریم) یا پاراستییە.

## ژێدەرێن ئاڤێ:

دو کانییێن سەرەکی ب ناڤێن (کانییا بیرێ، کانییا ژێری)ل گوندی هەنە، ئاڤا گوندی دابین دکەن، ل بەرێ رەز و باغەکێ باش ل بەر ئاڤا وان دهاتەکرن، هنار و هژیر و توی دهاتنە چاندن، نها ژبەر کێمیا ئاڤێ رەز و باغ بەرەڤ نەمانێ چووینە.

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژبەر هەبوونا پاوانێن باش و ئەردەکێ بەرفرەهێ مەزن خودانکرنا تەرش و کەوالی ژ پەز و بزن و چێلان ل گوندی یا بەربەلاڤبوو، خودانێن وان بەرێ دچوونە کویستانان و ل زڤستانان ڤەدگەریانەڤە سەر کۆزان، نها ئەڤ کارە بەرەڤ کێمیێ دچیت و خەلك ب کارێن دیڤە مژوولە، تایبەت چاندنا دەخل و دانی، وەکی: گەنم و جەهـ و نیسك و نۆك و کزن (خوارنا گایا)، رەزێن دێم ل چیایی ژ تری و سماق و... هتد دهاتنەکرن و مفا دگەهاندە خەلکێ گوندی. هەر چەندە ئەڤ کارە ژی بەرەڤ کێمیێ دچن و پتر کاسبکاریێ و پالەتیێ دکەن، دیسان خەلکێ گوندی مفای ژ سرۆشتێ دەڤەرێ ژ کەزان و رێڤازان دبینن و کارێن دەستی وەکی چێکرنا گۆپالان و... هتد دکەن. هەروەسان گەلەك ژ خەلکێ گوندی مووچەخۆرن، ب تایبەت پێشمەرگەنە.

سالا (١٩٧٩)ێ بۆجارا ئێکێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەکرن و هەتا سالا (١٩٨٢)ێ بەردەوامبوویە، پاشان دهێتەگرتن، سالا (٢٠٠٠)ێ جارەکادی خواندنگەهـ ل گوندی هاتییەڤەکرن[٤٢].

## گوندێ سۆریا:

گوندەکێ جوان و ڤەشەنگە، گەلەکێ کەڤنارە، دکەڤیتە بنارێ زنجیرا چیایێ بێرات، ب دووراتییا (١٥کم) ژ ناڤەندا ناحیا بجیلێ، ناڤێ گوندی ژ رەنگێ ئاخا وی هاتییە کو یا رەنگ سۆرە و چ گژ و گیا لێ شین نابیت.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** زنجیرا چیایێ بێرات.

**باشووری:** گوندێ داروولک.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ نیروا.

**رۆژئاڤا:** گوندی خەلان مامکرد.

## پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی سۆرچی نە ژ تیرەیا (مامساکی) نە، د بنیاتدا ژ ئێك مالبات ئەوژی بنەمالا (مەحمود سۆریەیی)یە پێکدهێن، ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ گوندی ١٤ کەس بوو[٤٣]، نها ژمارا وان (٦٣) خێزانن کو دبنە (٣٤٩ ) کەس، دیرۆکا دروستبوونا گوندی ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان بۆ سەردەمێ دەولەتا ئوسمانی ڤەدگەرێت.

## جهێن شینواری و بەرچاڤێن گوندی:

**رێزەبەرا مزگەفتێ:** ژ گەلەك بەرا پێکدهێت، ل دەرێ مزگەفتا کەڤن هەتا بنارێ چیای دچن ب درێژیا (١٦٠م) و مەزنیا وان نێزیکی ئێك مێترن.

**کیلێ حەدۆ و یوسفا:** دکەڤیتە هنداڤا گوندی ل سەر تیشی و دو کەس بووینە دهێتەگۆتن ل وێرێ شەهید بووینە، مێژوویا وێ نەهاتییە زانین.

**مزگەفتا کەڤن:** دیوارێن وێ ماینە، دکەڤیتە گوندێ کەڤن، مێژوویا وێ ل دووڤ گۆتنان ڤەدگەرێتەڤە سەردەمێ هاتنا ئایینێ ئیسلامێ بۆ دەڤەرێ.

**گۆرستانا پیر مکایل:** دیرۆکا وێ ل دووڤ گۆتنان بۆ سەردەمێ هاتنا ئیسلامێ بۆ دەڤەرێ ڤەدگەرێتەڤە.

## زێدەرێن ئاڤا گوندی:

چەندین کانی وەکی ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی هەنە، مینا (کانییا پیرمکایل، کانی سۆرك، کانی شڤان، کانی کەپرۆك، کانی بەردین، کانی سویسکە، کانی گرو)، پرۆژەیێ ئاڤێ سالا (٢٠٠٥)ێ ل گوندی هاتییە دروستکرن.

## زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ب هەبوونا ئاڤەکا زۆر ل گوندی، رەز و باغەکێ ئێکجار زۆر ل گوندی پەیداکرن، بەلێ نها ئەو کانی بەرەڤ هشکبوونێ دچن، لەوما رەز و باغ ژی بەرەڤ نەمانێ دچن، ژ بەرهەمێن ل گوندی دهاتنە چاندن هنار و هژیر و توو و سێڤ و خۆخ و حلویك و...هتد، هەروەسان ئەڤ گوندە ل دەڤەرێ ب چاندنا برنج و کونجی و نیسك و نۆك و گەنم و جەهان یێ بەرنیاس بوو، دیسان ژبەر هەبوونا پاوانەکێ باش و زۆمان، تایبەت زۆما (گۆرە بیرا سۆریا)، کو ئێکە ژ گرنگترین جهێن خودانکرنا تەرش و کەوالی، پەز و بزن و چێل ل گوندی خودانکرن و هەتا نها ژی یا بەردەوامە، هژمارا وان دگەهیتە پتر ژ (٢٣٠٠) سەرئاژەلان. دیسان گەلەك ژ خەلکێ گوندی مووچەخۆرن ژی.

سالا (١٩٧٩)ێ بۆ جارا ئێکێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەکرن، سالا (١٩٨٢)ێ هاتییە گرتن ڤە و سالا (١٩٩٨)ێ جارەکادی هاتییە ڤەکرنڤە[٤٤].

## گوندێ نێروا:

ئەڤ گوندە دکەڤیتە دەربەندێ گەلیەکێ تەنگ ل سەر رێکا سەرەکییا ناڤبەرا ڤەندیل- ئاکرێ، ب دووراتییا (١٦کم) ژ ناڤەندا ناحیا بجیلێ دوورە، ناڤێ گوندی ژ عەشیرەتا نێروەییا هاتییە کو د بنەرەتدا گوندی خەلکێ وێرێ بووینە، ب ئەگەرێ گوندی هاتینە و دیرۆکا هاتنا وان دیار نینە، لێ خویایە کو بەری (پێنج) پشتا ل ڤی گوندی دئاکنجی نە.

گوندێ نێروا



## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** زنجیرا جیایێ بێرات.

**باشووری:** گوندێ داررووك ژێری.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ زیوە.

**رۆژئاڤا:** گوندێ سۆریا:

## پێکهاتا گوندی:

د بنەرەتدا خەلکێ وی ب گشتی سەر ب عەشیرەتا نێرەوەیاڤە بوون، ژبەرکو ژ مێژە ل ڤی گوندی نها سەر ب سۆرچییاڤەنە ژ تیرەیا (مامساکی)نە، ژ چەند بنەمالەیان پێکدهین ئەوژی: (حاکم، شێخەمیر، رەشکە، شێحەسەن، حەسەن)، ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧یێ هژمارا خەلکێ گوندی کەس بوو(٤٥) ، نها دگەهنە (٥١) سەرخێزانان کو دبنە (٣٠٩) کەسان.

## شوینوار و جهێن کەڤنارێن گوندی:

**مەدرەسا کەڤن:** دکەڤیتە پێش دەرگەهێ گەلی ل باکووری گوندی و شوینوارێن وێ دیارن.

**شکەفتا بوك و زاڤایا:** ژوورەکە درێژیا وێ (٢م) و پانیا وێ (٢م) بلندییا وی (١,٨م)، دەرگەهەکێ بچویك یێ هەی، دکەڤیتە پشتا گەلیێ نیروا و تەختەك ل بەری تێدا هاتییەدروستکرن لەوا دبێژنێ شکەفتا بیك و زاڤا.

**شکەفتا هەسپێ رەش:** شکەفتەکە ب بلنداهییا (٥٠م)، پشتا گەلی و زۆرا سەرنجراکێشە، کەس نەشێت بچیتە دژوورڤە، ئەو پەیژەیێن بۆ هاتن و چوونێ بۆ چێکرین نەماینە و تنێ شوینا وان ماینە.

ئاشێن کەڤن: ئەو ژی (١٦) ئاشن ل سەر رووبارێ نیروا ب درێژیا (٥کم) هاتینە دروستکرن.

**چۆگا فەلا:** مێژوویەکا کەڤن یا هەی، دبێژن فەلا یا دروستکری، درێژاهییا وێ (٢٠٠م).

**گوندێ سەروکانی:**



**ژێدەرێن ئاڤا گوندی:**

ژێدەرێ ئاڤا گوندی ل بەرێ ل سەر دو کانییان بوو، ئەو ژی (کانییا رەبەنا، کانییا گوندی)، ڤان کانییان ئاڤ بۆ هەمی گوندی دابیندکر، نها ئەو ژی بەرەڤ کێمیێ ڤە دچن، سالا (٢٠٠٢)ێ پرۆژەیێ ئاڤێ بۆ گوندی هاتییە دروستکرن.

**ژێدەرێن زیارا خەلکێ گوندی:**

ب ئەگەرێ هەبوونا ئاڤەکا زۆر باغەکێ ئێکجار زۆر ل گوندی دهاتەکرن و هەتا نها ژی بەردەوامە، لێ نها ژ ئەگەرێ کێمبوونا ئاڤێ ئەو ژی کێمتر لێ هاتینە، ژ فێقیێ لێ دهاتە چاندن: هنار و سێڤ و خوخ و مژمژە و حلویك و تری و هژیر و...هتد، دیسان چاندنا برنجی و کونجی و نیسك و نۆك و گەنم و جەهـ و چەندین بەرهەمێن دی. هەروەسا ژبەر هەبوونا پاوانا و جهێ گونجای بۆ خودانکرنا پەز و مالاتی، ئەڤ پیشەیە ئێکە ژ کارێن سەرەکیێن خەلکێ گوندی و هەتا نهو ژی بەردەوامە، نێزیکی (٣٠٠٠) سەرێن ئاژەلان ژ پەز و بزن و چێلان ل گوندی دهێنە خودانکرن و گەلەك ژ ڤان مەر و مالاتێ خۆ دبەنە (حاجی ئۆمەران و سیدەکان). دیسان هندەك ژ خەلکێ گوندی مووچەخۆرن. ل ڤی گوندی سیپەلا گەلیێ نێروەیا ژی هەیە کو جهەکێ گوزارییە، لێ وەکی پێدڤی مفا ژێ نەهاتییە دیتن.

سالا (١٩٧٩)ێ بۆ جارا ئێکێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەکرن، سالا (١٩٨٢)ێ هاتییە گرتن و سالا (١٩٩٩)ێ جارەکادی هاتییەڤەکرن[٤٦].

## گوندێ سەروکانی:

گوند دکەڤیتە دووراتییا (٥کم) رۆژهەلاتێ بجیلێ، سەر رێیا کشتییا قندیل- ئاکرێ، ناڤێ گوندی ژ ناڤێ کانییەکێ هاتییە دکەڤیتە باکووری گوندی کو بەرنیاسە ب کانییا (سەروکانی).

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** زنجیرا چیایێ بێرات.

**باشووری:** گوندێ شانەسۆر.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ کەلات.

**رۆژئاڤا:** گوندێ بوسێل.

**پێکهاتا گوندی:**

ئەڤ گوندە ژ وان گوندانە یێن دەسپێکا سەدساڵیا بیستێ بەردای و ڤالا ژ خەلکی و پاشتر ل سالا ١٩٠٧ێ داینە دگەل مولکێن سولتانێ ئوسمانی عەبدۆلحەمیدی دووێ[٤٧]، خەلکێ نهایێ گوندی ژ عەشیرەتا سۆرچی تیرەیا (مامساکی)نە، ژ سێ بەرەبابان: مەسیح، قادری، ریزانی پێکهاتییە، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ گوندی ٢٢ کەس بوون[٤٨]، نها (٢٧) خێزانن کو دبنە (١٢٠) کەس.

**شوینوار و جهێن کەڤنارێن گوندی:**

**قەسرێ کەڤن:** ژمارەکا شوینوارێن قەسرا پێکدهێن، دکەڤنە رۆژهەلاتی گوندی و ل دووڤ گۆتنان مێژوویا وان ڤەدگەریت بۆ دو سەدساڵیان.

**گۆڕستان:** ژ چەند گۆڕستانان ل دەور و وبەرێ گوندی ب ناڤێن (قادریا، شەهیدۆکا) پێکدهێن، دووڤ گۆتنان دیرۆکا وان ڤەدگەریتەڤە سەردەمێ هاتنا ئایینێ ئیسلامێ بۆ کوردستانێ.

**ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:**

گوند ژ کۆمەکا کانییان پێکهاتییە و هەتا نها ژی ژێدەرێن ئاڤا گوندی نە و خەلکی شینکاتی ل بەر دکرن، کانی ژی ئەڤەنە: کانی بواری، کانی دۆرەنیشاڤ، کانی بستی، کانی سەرۆکانی، کانی قادری، کانی سلێمان، کانی چەما، ئاڤا ڤان کانییان بەرەڤ و هشکبوونێ دچیت. پرۆژەیێ ئاڤا ڤەخوارنێ سالا (١٩٩٨)ێ بۆ گوندی هاتییەدرستکرن.

**ژێدەرێن زیارا خەلکێ گوندی:**

بەری نها خەلکێ گوندی برنج و ماش و نیسك و نۆك و کونجی و گەنم و جەهـ دچاندن، لێ نها ژبەر هشکەسالیان ئەڤ بەرهەمە ناهێنە چاندن

و تنێ گەنم دهێنەکرن. هەروەسان پەز و مالاتەکێ زۆر ژی لێ دهاتە ب خودانکرن، ب تایبەت بزن و پەز و چێل و ل هاڤینان دچوونە چیای، بەلێ نها تنێ چێل دهێنە ب خودانکرن ئەو ژی ب رێژەیەکا کێمتر ژ جاران، نها خەلکێ گوندی ب شێوەیەکێ گشتی دو کارێن سەرەکی دکەن ئەو ژی پێشمەرگایەتی و کاسبکاری کو رەز و باغان دچینن و بەرهەمێ هنار و هژیر و خۆخ وتری و مژمژە.

سالا (١٩٧٨)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتیە ڤەکرن و پاشان هاتیەگرتن، سالا (٢٠٠٩)ێ جارەکادی هاتیە ڤەکرن و سالەکێ بەردەوامبوویە و دووبارە هاتیەڤ گرتن، بۆ خواندنێ زارۆکێن گوندی دچنە گوندێ (بوسیل) کو زۆر نێزیکی ڤی گوندی یە[٤٩].

## گوندێ بوسێل:

گوندەکێ کەڤنارە ل بنارێ زنجیرا چیایێ بێرات ل سەر رێکا سەرەکییا (قەندیل- ئاکرێ)، ب دووراتییا (٤کم) ژ ناڤەندا ناحیا بجیل، مێژوویا ئاڤاکرنا گوندی نەهاتیە زانین، تنێ ل باب و باپیرانڤە هاتیە گۆتن کو بەری (٥) پشتا ل ڤی گوندی د ئاکنجی.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری،** زنجیرا چیایێ بێرات.

**باشووری،** گوندێ شانەسۆر.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ سەروکانی.

**رۆژئاڤا،** گوندی کانی در.

## پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی عەشیرەتا سۆرچی نە سەر ب تیرەیا (مامساکی)ن، ژ دو بەرەبابان پێکهاتییە (مەلا عیسا و حەبیب)، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ گوندی ٨٨ کەس بوو[٥٠]، بەلێ نها گوند ژ (٨٥) خێزانان پێکدهێت کو دبنە (٤٥٠) کەس.

گوندێ بوسێل،



## شوینوار و جهێن کەڤنارێن گوندی:

**مزگەفتا گومبەتێ:** دکەڤیتە لایێ باشووری رۆژئاڤا گوندی ل سەر رێکا گشتی، مێژوویا وێ گەلەکا کەڤنە، هەتا نها ئاڤاهیێ وێ ب تمامی مایە و نەهاتییە هەرفاندن.

**دارێن قادریا:** کو (٨) دارێن زۆر کەڤنارن، مێژوویا وان دیار نینە و ل نك خەلکێ گوندی خۆشتڤی نە.

ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

ڤی گوندی هندەك کانی هەنە، ژوان: کانییا بەسولکێ، کانییا ژنا، کانییا زەلاما، کانی خاتون، کانییا کاڤلا، کانییا زێوەی.

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ل بەرێ بەرهەمەکێ باشێ چاندنێ ل بەر ڤان کانییان دهاتەچاندن، وەکی هنار و هژیر و تری و سێڤ و ژبلی باجانسۆرك و خیار و باجانرەشك و لۆبیك و کولند و....هتد، بەلێ نها ژبەر کێمبوونا ئاڤێ ئەو ژی بەرەڤ کێمبوونێ دچن. هەروەسان پەز و مالاتەکێ زۆر ل گوندی دهاتە خودانکرن و تا نها ژی پتر ژ (٣٠٠٠) سەرێن پەز و بزن و چێلان ل گوندی دهێنە خودانکرن و ل هاڤینان دچنە زۆزانێن سەرێ سادا. دیسان هندەك ژ خەلکێ گوندی مووچەخۆرن.

سالا (١٩٧٨)ێ خواندنگەهـ بۆ جارا ئێکێ ل گوندی هاتییە ڤەکرن، پاشان هاتییە گرتن و سالا (٢٠٠٠)ێ دوبارە هاتییە ڤەکرن و هەتا نها بەردەوامە [٥١].

## گوندێ گەلۆك مامگرد (کانی دری):

دکەڤیتە بنارێ زنجیرا چیایێ بێرات دەرێ گەلیەکی ل سەر رێکا گشتییا (ئاکرێ- قەندیل)، ب دووراتییا (٦٠٠م) رۆژهەلاتێ بجیلێ، ناڤێ گوندی ژ گەلی بوویە گەلۆك و ژبەر هەبوونا (دڕیا) ل سەر کانییا گوندی، نها ناڤێ گوندی بوویە کانی دری.

**گوندێ گەلۆك مامگرد (کانی دری)،**



**سنوورێن گوندی :**

**باکووری،** زنجیرا جیایێ بێرات.

**باشووری،** گوندێ شانەسۆر.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ بوسێل.

**رۆژئاڤا،** ناڤەندا ناحیا بجیل.

**پێکهاتا گوندی :**

ئەڤ گوندی ژی ژ وان ٥٤ گوندێن قەزا ئاکرێ یە یێن ل سالا ١٩٠٧ێ داینە دگەل مولکێن سولتان عەبدولحەمیدێ دووێ، وی دەمی رووبەرێ عەردێ گوندی ٢٥٠٠ دونومێن عەردی بوون[٥٢]، گوندی ژ عەشیرەتا سۆرچی تیرەیا (مارەباس)ن، سالا (١٩٤٠)ێ هاتینە ڤی گوندی، بەری هینگێ ل گوندێ (شکەفتێ) یێ ناحیا (حەریر) بوون، د بنیاتدا ژ بنەمالا (ڕێزایی سۆرانی) پێکدهێت، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ خەلکێ گوندی ٢٦ کەس بوو[٥٣]، نها (٢٠) خێزانن کو دبنە (٨١) کەس.

سالا (١٩٧٤)ێ ب ئەگەرێ هەبوونا پەیوەندییان دگەل شۆرشێ ئەڤ گوندە ژلایێ حکومەتا عیراقێڤە هاتییە سۆتن.

**شوینوار و جهێن کەڤنارێن گوندی:**

ڤی گوندی چەند شوینوار لێ هەنە، وەکی:

**کەڤنە گوند،** دکەڤیتە باکووری گوندی، گەلەکێ کەڤنە ب گەلووك مامکرد بەرنیاسبووە.

**زەرگە زەڤی،** دکەڤیتە باشووری گوندی، شوینوارێن گوندەکێ گەلەکێ کەڤنە تنێ شوینوار ماینە.

**گۆرستانا (شێخستی)،** ل رۆژهەلاتێ گوندی و مێژوویا وێ دیار نینە، گۆرێن زۆر درێژ لێ هەنە.

**ژێدەرێن ئاڤێ:**

زۆر کانی و ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی هەنە، بەلێ بەرەڤ هشکبوونێ دچن، ژوان: کانی سپیندار، کانی زەیتون، کانی ئاڤدەلان، کانیا گوندی، کانی کۆرەمار و چ پرۆژەیێن ئاڤێ ل گوندی نینن، ل دەمێن پێدڤی ژی ئاڤێ ب تانکەران بۆ دهینن.

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

ل بەرێ رەز و بیستانێن باش ل بەر ڤان کانییان دهاتنەکرن، فێقیبیەکێ زۆر ژ هنار و هژیر و تری و سێڤ و مژمژە و... هتد بەرهەمدهینان، لێ نها ژ کێم ئاڤیێ ئەڤ کارە بەرەڤ نەمانێ دچیت. دیسان خەلکێ گوندی دەخل و دانەکێ زۆر باش ژی ل گوندی دچاندن بەلێ ئەو ژی بەرەڤ نەمانێ دچیت و تنێ رێژەیەکا کێما گەنمی دهێنەچاندن.

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

ژین و ژیارا خەلکێ ڤی گوندی هەتا نها ژی پتر ل سەر خودانکرنا پەز و مالاتییە، خەلکێ گوندی پتر ژ (٢٤٠٠) سەرێن پەز و بزن و چێلان خودانکەن و هاڤینان دچنە زۆزانێن (سەرێ سادا)، دیسا گەلەك ژ خەلکێ گوندی کاسبکار و مووچەخۆرن[٥٤].

**گوندێ سامەدین:**

گوند دکەڤیتە دەڤەرەکا زویرگ ب دووراتییا (١٢کم) ژ ناڤەندا ناحیێ، ئەڤ گوندە ل بەرێ کۆتانا پەز و مالاتی بوویە، خەلکێ وی رەڤەند بووینە، هاڤینان دچوونە زۆزانێن حاجی ئۆمەزان ل دووڤ چەروانەکێ باش و ل ئاڤەکا سازگار دگەریان، زڤستانان دهاتنە سەر کۆتانا خۆ ل ڤی جهی کو پشتی هینگێ ل سالا (١٩٩٨)ێ بوویە گوند و لێ ئاکنجی بووینە.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری،** گوندێ بێسمەکەران.

**باشووری،** گوندێ دازین.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ داروولك ژوور.

**رۆژئاڤا،** گوندێ کەندە سۆر ژێری.

**پێکهاتا گوندی:**

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا سۆرچی تیرەیا (مامکرد و ماملەس)ن، ژ ئێك مالبات ئەوژی مالباتا (حەجی رەزاق)ی پێکهاتییە. ژمارا وان نها (١١) خێزانن کو دبنە (٥٢) کەس.

## ژێدەرێن ئاڤێ:

تنێ دو بیر کو ب دەستی هاتینە کۆلان بۆ ئاڤا ڤەخوارنێ ل ڤی گوندی هەنە و چ پرۆژەیێن ئاڤێ بۆ گوندی نەهاتینە چێکرن، بۆ پێدڤییێن دیتر ئاڤێ ب تانکەران دهینن.

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ئەڤ گوندە جهێ ب خودانکرنا پەز و مالاتی بوویە، نها ژی ئەڤ کارە بەردەوامە و ژمارەکا زۆرا پەزی لێ دهێتە خودانکرن، هاڤینان ل دووڤ چەروانی دچنە زۆزانان. دیسان ل بەرێ هندەکان دەخل و دان دچاندن، لێ نها تنێ بۆ ئالفی جەهی و کێم گەنمی دچینن.

سالا (٢٠٠٧)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەکرن، پاشان ژبەر چەند ئەگەران سالا (٢٠١٠)ێ هاتییەگرتن[٥٥].

## گوندێ داروك زووری:

دکەڤیتە دەڤەرا زویرگا، ب دووراتییا (١٥کم) ژ بجیلێ، ل سەر رەخێن رووبارەکێ تژی ئاڤ ل زڤستانێ و گەرم و هشك ل هاڤینێ، ناڤێ گوندی ژ ئێك بنێ دارێ هاتییە کو دکەڤندا ل ڤی جهی هەبوویە، ب بوورینا دەمی ژ (دارەك) بوویە (داروك).

## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ خەلان مامکرد.

**باشووری:** گوندێ دازین.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ داررووك ژێری.

**رۆژئاڤا:** گوندێ سامەدین.

## پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا سۆرچی و شێخ زادەنە. بەری ببیتە گوند (کۆتان) جهێ خودانکرنا پەز و مالاتی بوو، سالا (١٩٨٠)ێ بوویە گوند، تنێ مالباتا (شێخزادە) ب خۆڤە دگریت، ئەوژی (١٠)خێزانن دبنە (٧٥)کەس.

## ژێدەرێن ئاڤێ:

گوندەکێ دێمە، ژێدەرێن ئاڤێ تنێ بیرێن دەستکردن بۆ ڤەخوارنێ ب دەست هاتینە کۆلان، لەوما خەلکێ وی ل هاڤینان مالێن خۆ دبرنە کویستانان.

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

خەلکێ گوندی بۆژیارا خۆ پشتەگەرمێن خودانکرنا پەز و مالاتییە، ل وەرزێ هاڤینێ دچنە زۆزانێن حاجی ئۆمەران. بۆ خوارنێ و ئالفێ ئاژەلی ژی گەنم و جەهەکێ زۆر ل گوندی دهێتە چاندن، هەروەسان هندەك ژ خەلکێ وی کاسبکارن و وهژمارەك ژی پێشمەرگەنە.

سالا (٢٠٠٠)ێ بۆ جارا ئێکێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن[٥٦].

## گوندێ جۆنەلە:

ئەڤ گوندە سالا (١٩٢٥)ێ بوویە گوند، بەرێ تنێ ئێك مالبوو و پەز و مالات خودانکر، دکەڤیتە دەڤەرەکا زویرگ، ب دووراتییا (١٠) کم رۆژهەلاتی بجیلێ، ناڤێ گوندی ژ وێ چەندێ هاتییە کو گوند دکەڤیتە جهەکێ نزم، ئانکو جۆم (شیڤ) و ب بوورینا دەمی بوویە جۆنەلە.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ کەلات.

**باشووری:** گوندێ کۆجار.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ سەرسول.

**رۆژئاڤا:** گوندێ مێرگە موشك.

## پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا سۆرچی تیرەیا (مامکرد)ن، ژ بنەمالا (مارەسێن) پێکدهێت، نها (٦٢) خێزانن کو دبنە (٣٢٥) کەس.

**شوینوار و جهێن کەڤنارێن گوندی:**

چەند جهێن شوینواری ل گوندی هەنە کو کەڤناتییا جهێ گوندی د سەلمینت، ژ وان ژی:

**ئاشێ کەڤرێ قەسابا**، ئاشەکێ کەڤنە ل باشووری گوندی، مێژوویا وی دیار نینە.

**ئاشێ بەرازا**، ئاشەکێ کەڤنە ل باکووری گوندی.

**گۆڕستانا (نکردار)**، ل رۆژئاڤا گوندی و گەلەکا کەڤنارە.

**گۆڕستانا (گاوجێ)**، ل باشووری گوندی، ئەو ژی گەلەکا کەڤنارە.

**زێدەرێن ئاڤێ:**

چەندین کانی ل گوندی هەنە، ل بەرێ رەز و باغەکێ زۆر ل بەر دکرن، ژوانژی: (کانی چنار، کانی هنارۆك، کانی بنجیرە، کانی هەرەشێ، کانی سۆر و کانیا ملێ هەیدەری)، ڤان کانییان جۆرێن فێقی ژ هژیر و هنار و سێڤ و خۆخ و مژمژە و و تری ل بەر دهاتنە چاندن، سالا (٢٠٠٣)ێ پرۆژەیێ ئاڤێ ل گوندی هاتیەچێکرن کێشەیا ئاڤا گوندی چارەسەرکر.

**زێدەرێن زیارا خەلکێ گوندی:**

د کەڤندا هەتا نها خودانکرنا تەرش و کەوالی کارێ سەرەکیێ خەلکێ گوندی بوو، نها پتر ژ (١٠٠٠) سەرێن پەز و بزن و چێلان ل گوندی هەنە، بەرێ خودانێن پەز و مالاتی دچوونە کویستانێن حاجی ئۆمەران. هەروەسان چاندنا گەنم و جەهی ئێك بوو ژ پیشەیێن گوندی و هەتا نها بەردەوامە، هەبوونا ئاڤەکا زۆر بوویە ئەگەر برنجەکێ باش و ب ناڤ و دەنگ ل ڤێرێ بهێتە چاندن و هەتا نها ژی بەردەوامە، دیسان بیستانێن باش ژی دهێنەکرن، باجانسۆرك و خیار و بامی و باجانرەشك و لۆبیك ب رێژەیەکا زۆر دهێنە چاندن و فرۆتن. دیسان هندەك ژ خەلکێ گوندی مووچەخۆرن.

سالا (٢٠٠٠)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن[٥٧].

**گوندێ زنتا:**

گوندەکێ گەشت و گوزارێ خۆشە و داوی خالا سنووری یە د ناڤبەرا بجیل- دینارتێ، بجیل- ئاکرێ دا، ل سەر رێکا سەرەکییا (ئاکرێ- دینارتە)، دکەڤیتە دەرگەهێ گەلیێ زنتا، ب دووراتییا (٥کم) ژ رۆژئاڤا بجیلێ، ناڤێ گوندی ژ زەنگەلان هاتییە.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری**، گەلیێ زنتا.

**باشووری**، گوندێ دزۆك.

**رۆژهەلاتی**، گوندێ خانەگە.

**رۆژئاڤا**، گوندێ چۆنا و رووبارێ گبێل.

**پێکهاتاگوندی:**

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا سۆرچی سەر ب تیرەیا (مالەمەند)ن، زۆر ژ مێژە ل گوندی ئاکنجینە، ژ دو مالباتێن سەرەکی ( حەجی یوسف و حەجی ئەحمەد) پێکدهێت، خزمایەتی د ناڤ واندا ب هێز بوویە، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ خەلکێ گوندی تنێ ٨٠ کەس بوون[٥٨]، نها خەلکێ گوندی (٣٩) خێزانن کو دبنە (٢٢٠) کەس. سالا (١٩٧٤)ێ گوند ژ لایێ هێزێن حکۆمەتا عیراقێڤە هاتییەسۆتن و کاڤلکرن، پاشان ژلایێ خەلکی ڤە هاتییە ئاڤاکرنەڤە.

**زێدەرێن ئاڤێ:**

تنێ ئێك کانی ب ناڤێ (کانییا زنتا) لێ هەیە، هەر دکەڤندا هەتا نها ژی ژێدەرێ ئاڤا گوندی بوویە، سالا (٢٠٠٣)ێ پرۆژەیێ ئاڤی ل گوندی هاتییەدانان.

**زێدەرێن زیارا خەلکێ گوندی:**

چاندن کارێ سەرەکیێ خەلکێ گوندی بوو و پتر ژی دەخل و دان دچاندن، بەلێ نها ئەڤ کارە هێدی هێدی بەرەڤ کێمبوونێ دچیت، پتر رەز و باغ و بیستان ب شێوەکێ بەرچاڤ دهێنەکرن. دیسان

خەلکێ گوندی ب شێوەیەکێ بەرچاڤ پەز و مالاتی خوداندکەن، پتر ژ (١٥٠٠) سەرێن پەزی هەنە، ل بەرێ کویستان و گەرمیان دکرن. ژبلی جۆتیاریێ و خودانکرنا پەز و مالاتی گەلەك ژ خەلکێ گوندی مووچەخۆر و کاسبکارن، چیاێن ڤی گوندی پەز کیڤی لێ هەیە.

سالا (١٩٧٨)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتیە ڤەکرن[٥٩].

گوندێ زەنتە ژ گوندێن هەرە کەڤنە ل دەڤەرێ، ل دووڤ ژێدەران دەستنڤیسەکا پەرتووکا (رفع الخفا فی السیره النبویه) یا ئیبنولحاجی سالا ١١٨٩مش/١٧٧٥ز ل ڤی گوندی هاتییەڤە نڤیسین[٦٠]، ئەڤە ب خۆ نیشانا کەڤناتیا ڤی گوندییە.

## گوندێ شانەسۆر ژووری:

ئەڤ گوندە دکەڤیتە دەڤەرا زویرگ، دبێژن نێزیکی سەدسالانە بوویە گوند، ل بەری هینگی کۆتان بوو، ئانکو جهێ خودانکرنا مەر و مالاتی بوو، ب دووراتییا (٢کم) ژ بجیلێ، ل سەر ناڤێ گوندی ژی خەلکێ گوندی دبێژن ل بەرێ مێشێن هنگڤینی ل ڤێرە دهاتنە خودانکرن و شانەیێن وان دسۆر بوون لەورا ناڤێ گوندی بوویە شانەسۆر.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ کانی در.

**باشووری،** گوندێ بانەسۆر.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ شانەسۆر ژێری.

**رۆژئاڤا،** گوندێ زەرگێنا.

### پێکهاتا گوندی:

گوند ژ عەشیرەتا سۆرچی تیرەیا (مامگرد)ن، ژ (بنەمالا خدری) نە، هژمارا وان سالا ١٩٥٧ێ ٤٢ کەس بوو[٦١]، نها (٩) خێزانن کو دبنە (٤٢) کەس. خەلکێ

گوندێ مێرگەمۆشك،



وی نها پتر بەرەڤ باژێران دچن.

بەری سالا (١٩٩١)ێ گوند ژ لایێ حکومەتا عیراقێڤە هاتیە سۆتن، پشتی سەرهلدانێ هاتیە ئاڤاکرن ڤە.

### ژێدەرێن ئاڤێ:

ڤی گوندی تنێ کانییەك ب ناڤێ (کانی دۆرەبی) لێ هەیە، ئەو ژی بەرەڤ هشکبوونێ ڤە دچیت

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

چاندن، ب تایبەت چاندنا گەنم و جەهـ و نیسك و نۆکان ژێدەرەکێ گرنگێ ژیارا گوندییانە، هەروەسان مژوولی خودانکرنا پەز و چێلانە، نێزیکی (٧٠٠) سەران ل گوندی هەنە و ل هاڤینان دبەنە کویستانێن حاجی ئۆمەران[١٢].

## گوندێ مێرگەمۆشك:

گوندەکێ کەڤنارە دکەڤیتە دەڤەرا زویرگ، ب دووراتییا (٥کم) ژ ناڤەندا بجیلێ، ئێکە ژ وان گوندێن ددەمێ خۆدا جوهی لێ دئاکنجی، ناڤێ گوندی ژی دبێژن ژ وێ چەندێ هاتیە کو ئێکێ جوی ب ناڤێ (مۆشێ) بوویە و ناڤێ گوندی ژ ناڤێ وی کەسی هاتییە، ب بوورینا دەمی بوویە (مێرگەمۆشك).

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ زەرگێنە.

**باشووری،** گوندێ کێلان.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ گەرمکا سەری.

**رۆژئاڤا،** گوندێ چەمەسێل.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا سۆرچی نە سەر ب تیرەبێن (مامکرد، مالەشێخ، مامانوپەز، مامسال)ن، ژ بنەمالەیین (بنەمالاحەولای، بنەمالا سامی کەژۆ، بنەمالا عەبدی، بنەمالا قادری، بنەمالا شەمزین) پێکدهێن، سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ گوندی ٤٢ کەس بوو[١٣]، نها (٦٠) خێزانن کو دبنە (٣٥٠) کەس[١٤].

### شوینوار و جهێن کەڤنارێن گوندی:

ئاشەکێ ئاڤێ ل رۆژئاڤا گوندی هەیە، بۆ هێرانا دەخل و دانی هاتییە ب کارهینان، نەهاتییە زانین کا کەنگی هاتییە دروستکرن.

### ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

سێ کانی ل گوندی هەنە، ئەو ژی (کانی بێرەرەشك، کانییا دارا و کانییا قورتێ شەمەدۆك)، نها بەرەڤ هشکبوونێ دچن. سالا (٢٠٠٦)ێ پرۆژەیێ ئاڤێ ل گوندی هاتییە چێکرن.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیانا خەلکی ل بەرێ ل سەر خودانکرنا پەز و مالاتی بوو، نها ژی ئەڤ کارە یێ بەردەوامە و پتر ژ (٢٠٠٠)ێ سەرێن پەز و مالاتی ل گوندی هەنە، هاڤینان دبەنە کویستانێن دەڤەرا حاجی ئۆمەران. خەلکێ گوندی دەخل و دانی ژی دچینن، چ بۆ خوارنێ بیت یان بۆ ئالفێ تەرش و کەوالی ب تایبەت جەهی، دیسان گەلەك بەرهەمێن دی ژی ل گوندی دهاتنەچاندن، مینا باجانسۆرك و خیار و باجانرەشك و بامی و لۆبیك و کەرەفس و... هتد، لێ نها بەرەڤ کێمیێ ڤە دچن، هندەك ژ خەلکێ گوندی مووچەخۆرن.

بۆ ئێکەم جار سالا (١٩٩٩)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییەڤەکرن[١٥].

## گوندی بێخمە:

گوندەکێ زۆرێ کەڤنارە و داوی خالا سنوورییە ل رۆژهەلاتێ بجیلێ، دکەڤیتە دەرگەهێ گەلیێ بیخمێ ل سەر لێڤێن رووبارێ زێی مەزن، ب دووراتییا (٣٠کم) ژ ناحیا بجیلێ، ناڤێ گوندی ل دووڤ گۆتنا خەلکێ گوندی ژ بێ خەمیێ هاتییە.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** زنجیرا چیایێ بێرات.

**باشووری:** گوندێ قەسرۆك.

**رۆژهەلاتی:** زێی مەزن.

**رۆژئاڤا:** گوندێ گەلووك.

**پێكهاتا گوندی:**

مێژوویا ڤی گوندی یا دیار نینە، چەندین پشتە ژیان ل ڤی گوندی هەی، خەلكێ وی ژی ژ عەشیرەتا سۆرچی نە سەر ب تیرەیا (مامساكی)، ژ چوار بنەمالەیێن سەرەكی: (مالباتا نافخۆش، مالباتا حدی، مالباتا عەبدۆللا، مالباتا ئەحمەد) پێكدهێن، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ۱۹۵۷ێ خەلكێ گوندی ۵۸ كس بوون[٦٦]، ژمارا وان (۱۲۸) خێزانن كو دبنە پتر ژ (٦٧٢) كەس.

ژبەر كو خەلكێ گوندی هەر ژ كەڤندا پەیوەندی ب شۆرشێن كوردی ڤە هەبوویە لەوما حكومەتێن عیراقی سێ جاران گوند كاڤلكرینە و ل دووڤدا ژ لایێ خەلكێ وی ڤە هاتییە ئاڤاكرن:

١- سالا (١٩٦٣)ێ گوند هاتییەسۆتن و خەلكێ وی ئاوارەی گوندێن رەخێ دی یێ ئاڤێ بووینە.

٢- سالا (١٩٧٤)ێ دوبارە هاتییە سۆتن و خەلكێ وی چووینە گوندێ مالەمووسێ.

٣- سالا (١٩٨٧)ێ دیسان هاتییەڤەسۆتن و كاڤلكرن و خەلكێ گوندی ئاوارەی گوندێ كەلات بووینە، سالا (١٩٩٥)ێ زڤرینەڤە جهێ خۆ.

**شوینوار و جهێن كەڤنارێن گوندی:**

ل بێخمێ چەندین جهێن شوینواری هەنە، لێ مێژوویێن وان دیار نینن وەك:

**كەڤرێ قەلاتێ:** تشتەك كەڤنارە ل باكوورێ گوندی.

**ئاش:** زۆرێ كەڤنە دكەڤیتە رەخێ سەری یێ گوندی.

**دێر:** دكەڤیتە گەلیێ بێخمێ ل باكووری گوندی و چ زانیاری ل سەر نینن.

**دیوارێ جسری:** دكەڤیتە رۆژهەلاتێ گوندی، ژ بەرێ پر بوویە بۆ رەخێ دی یێ ئاڤێ.

**ژێدەرێن ئاڤا گوندی:**

چەند كانی ل گوندی هەبوون ژوانا: (كانییا سەروكانی، كانییا ناڤگوندی، كانییا پێشپەزگا)، هەر هەموو ژی كانییێن كەڤنن و رێخوشكەر بووینە خەلك ل ڤی گوندی ڤەجەمیێن و لێ بژین. سالا (٢٠١٠)ێ پرۆژەیێ ئاڤێ بۆ گوندی هاتییە چێكرن.

**ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:**

گوند دكەڤیتە رەخێن رووبارێ زێی مەزن، لەوما بوویە جهەكێ باش بۆ خودانكرنا تەرش و كەوالی تایبەت پەز و بزنان، ژمارا وان دگەهیتە (٤٠٠٠) سەران. هەروەسان ماسییەكێ باش ل ڤێرە دهێتە راڤكرن، چەندین خوارنگەهێن تایبەت ب ماسییان هەنە و رێژەیەكا زۆر ژی بۆ بازێرێن دی یێن كوردستانێ دهێنە هنارتن. هەروەسان ل ڤی گوندی گەنم و جەه و برنج و گندۆرێ دێمی دهێنە چاندن و بیستانێن مەزنێن شتی و گوندۆر و خیار و باجانسۆرك و باجانرەشك و بامی و لۆبیك و....هتد لێ دهێنە چاندن. ژبلی كو هندەك ژ خەلكێ گوندی كاسبكار و مووچەخۆرن ژی.

سالا (١٩٧٨)ێ بۆ جارا ئێكێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەكرن، سالا (١٩٨٠)ێ هاتییە گرتن ڤە، سالا (١٩٩٥)ێ جارەكادی ژ لایێ حكومەتا هەرێمێ ڤە هاتییەڤەكرن و ل هەمان سال بنكەهێ ساخلەمیێ ژی لێ هاتییەڤەكرن و مفایەكێ بەرچاڤ دگەهینتە گوندێن دەور و بەرژی[٦٧].

## گوندێ بنهەڤراز:

گوندەكێ نوویە سالا (٢٠٠٠)ێ هاتییە ئاڤاكرن، دكەڤیتە دەڤەرەكا زویرگ، ب دووراتییا (١٥كم) رۆژهەلاتێ بجیلێ، ناڤێ گوندی ژ وێ چەندێ هاتییە كو دكەڤیتە بن هەڤرازەكێ.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری،** گوندێ كەندە سۆر ژێری.

**باشووری،** گوندێ زراڤك.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ سامەدین.

**رۆژئاڤا،** گوندێ بانیە قولێر.

**پێكهاتا گوندی:**

خەلكێ گوندی عەشیرەتا سۆرچی نە ژ تیرەیا (مامگرد)ن، د كەڤندا ل ڤێرە ئاكنجینە، دەسپێكێ تنێ ئێك مالبات بوو، ئەو ژی مالباتا (مالباتانورەدین) ی، جهێ گوندی كۆتانا خودانكرنا پەز و مالاتی بوو، نها ژمارا خەلكێ گوندی بووینە (١٣) خێزان، كو دبنە (٩٤) كەس.

كارێ خەلكێ گوندی ب رەنگەكێ گشتی ل سەر خودانكرنا تەرش و كەوالییە.

سالا (٢٠٠٥)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییەڤەكر[٦٨].

## گوندێ ماندیان ژێری*:

گوندەكێ كەڤنارە، دكەڤیتە دەڤەرەكا زویرگە ل سەر زێی مەزن، ب دووراتییا (٣٠كم) باشوورێ رۆژهەلاتێ بجێل، دیرۆكا وی دیار نینە. ناڤێ گوندی ژ وێ چەندێ هاتییە كو دبێژن ل كەڤن ژبەر كاركرنا زۆر د ماندی بووینە و بوورینا دەمی بوویە ماندییان.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری،** گوندێ ماندیان ژووری.

**باشووری،** رووبارێ زێی مەزن.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ هیزا.

**رۆژئاڤا،** گوندێ كەویلان.

**پێكهاتا گوندی:**

خەلكێ گوندی سۆرچی نە، سەر ب تیرەیا (عەلی خدر)ن، ژ هەرسێ مالباتێن: (مالباتا توخمە حسۆ، مالباتا توخمە ئەحمەد، مالباتا توخمە قەبران) پێكهاتییە، دبنە (٦٠) خێزان و (٤٢٠) كەس.

چەندین گۆڕستانێن كەڤن ل گوندی هەنە ژوان ژی (گۆڕستانا گوندی، گۆڕستانا كەڤنە گوندی، گۆڕستانا پیرناز، گۆڕستانا پیر بلێر، گۆڕستانا پیرهەمزە).

پرۆژەیێ ئاڤێ سالا (١٩٩٦)ێ بۆ گوندی هاتییە چێكرن.

**زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:**

ل ڤی گوندی گەنم و جەه باش بەرهەم دهێنن و خەلكێ وی مفایەكی وەكی داهات ژێ دبینن، هەروەسان گوندۆر و ترۆزی و شتی و جۆرێن فێقی ژ هنار و هژیران ژی وەكی داهاتەك دچینن ، ژبلی خودانكرنا تەرش و كەوالی و هندەك ژی پێشمەرگە و مووچەخۆرن.

سالا (١٩٩٢)ێ خواندنگەهـ بۆ گوندی هاتییە ڤەكرن و هەتا نها ژی یا بەردەوامە[١٩].

## گوندێ ماندیان ژووری:

گوندەكێ كەڤنارە و مێژوویا وی دیار نینە، دكەڤیتە دووراتییا (١٦كم) باشووری ناڤەندا ناحیا بجیلێ، ناڤێ گوندی ژ وێ چەندێ هاتییە كو د كەڤندا خەلكێ گوندی بەردەوام ب كاریڤە د مژویلبون و زۆر ماندی دبوون لەورا ناڤێ ماندییان هاتییە سەر ناڤێ گوندی.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری،** گوندێ گەرمكا.

**باشووری،** گوندێ كەویلان.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ هیزا.

**رۆژئاڤا،** گوندێ قەسرۆك.

**پێكهاتا گوندی:**

خەلكێ گوندی ژ عەشیرەتا سۆرچی تیرەیا (عەلی خدر)ن، ژ زاردەڤێ خەلكێ گوندی دبێژن مێژوویا ئاكنجیبوونا وان ل ڤی گوندی بۆ چەند پشتان

گوندێ زیوە



بەری نها ڤەدگەریێت، د بنیاتدا سێ مالباتن، ئەو ژی (مالباتا فەتاح، مالباتا عومەر و مالباتا زوبەیر)، د سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێدا ئاماژە ب گوندێ ماندیان فەتاح) هاتییەکرن کو ئەم د وێ باوەرێدانە هەمان ئەڤ (ماندیان ژووری)یە هژمارا خەلکێ وی وێ سالێ ٤١ کەس بوو[٧٠]، نها (٣٢) خێزانن دبنە (١٩٦) کەس.

ڤی گوندی تنێ گۆرستانەکا گەلەک کەڤن وەك شوینوار ل ژووریا گوندی هەیە.

### ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

چەندین کانی ل گوندی هەنە، مینا (کانی حەلانۆك، کانیا گوندی، کانی خەرەپلنگ). سالا (٢٠٠٠)ێ پرۆژەیێ ئاڤێ ل سەر کانییان هاتییەچێکرن.

ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

بەرهەمێ ئاژەلی ل گوندی کێمە، پەز و چێل تنێ بۆ پێویستییێن رۆژانە ژ شیر و ماستی دهێنە ب خودانکرن، گەنم ب رێژەیەکا باش ل گوندی دهێتە چاندن و سالانە بەرهەمەکێ باشێ هەی، دیسان هندەك ژ خەلکێ گوندی کاسبکار و مووچەخۆر و پێشمەرگەنە.

سالا (٢٠٠٠)ێ بۆ ئێکەم جار خواندنگەهـ ل گوندی هاتییەڤەکرن[٧١].

## گوندێ زیوە:

گوندەکێ کەڤنارە دکەڤیتە بنارێ چیایێ بێرات ب دووراتییا (٢٠کم) رۆژهەلاتی بجیلێ. ل دووڤ ژ گۆتنا پیرەمێرێن گوندی خویایە کو بەری هەفت پشتا ل ڤێرە ئاکنجینە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** زنجیرا چیایێ بێرات.

**باشووری:** گوندێ شەرەفونا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ گەلوك.

**رۆژئاڤا:** گوندێ نیروا.

### پێكهاتا گوندی:

خەلكێ گوندی ژ عەشیرەتا سۆرچییانە سەر ب تیرەیا (مامساكی)ن، د كەڤندا ل گوندی د ئاكنجینە، ژ ئێك بنەمال ئەو ژی بنەمالا (سەعید)ی پێكدهێن، ل سالا ١٩٥٧ێ هژمارا وان تنێ ١٥ كەس بوو[٧٢]، نها (٧) خێزانن كو دبنە (٥٧) كەس.

### جهێن شوینواری:

ڤی گوندی مزگەفتەكا كەڤن وەكی جهەكێ شوینواری ل ژووربیا گوندی هەیە، ل دیڤ ئاخفتنا گوندیان مێژوویا وێ ڤەدگەرێتەڤە سەردەمێ هاتنا ئیسلامێ بۆ كوردستانێ.

### ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

ڤی گوندی چەند كانی هەنە، وەكی: (كانی كەندار، كانی هنچیروك، كانی جویستان)، ئەڤ كانییە بووینە ژێدەرەكێ باش بۆ ئاڤا گوندی، ل بەرێ رەز و بیستانەكێ باش ل بەر دهاتەكرن، نها بەرەڤ كێمبوونێ و ژ ناڤچوونێ دچن، سالا (٢٠١٥)ێ پرۆژەیێ ئاڤێ بۆ گوندی هاتییە چێكرن. ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

پشكەك ژ خەلكێ گوندی مژوولی خودانكرنا تەرش و كەوالینە و نێزیكی (١٠٠٠) سەران هەنە، ل هاڤینان دچنە چیایێ سەری و ل وێرێ هەر ئێكی پاوانێ خۆ هەیە. دیسان هندەك ژ خەلكێ گوندی دەخل و دانی و دەرامەتێن دی ژێ دچینن، ژبلی كو هندەك ژ خەلكێ گوندی مووچەخۆرن. بۆ خواندنێ ژی زارۆكێن وان دچنە گوندێن دەور و بەر[٧٣] .

### گوندێ كێلان:

گوندەكێ كەڤنارە، ل دووڤ گۆتنان پترە ژ سەد سالان بوویە گوند، دكەڤیتە دەڤەرەكا زویرگ ناڤ كەندەكا كویر، ب دووراتییا (٧كم)كم ژێربیا بجیلێ.

گوندێ گەلۆك مامساك ژێری



**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ کەشانە.

**باشووری:** گوندێ گەرمکا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ گەرمکا سەری.

**رۆژئاڤا:** رووبارێ گبیر.

**پێکهاتا گوندی:**

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا سۆرچی نە و سەر ب تیرەیێن: (مالەشێخ، مامگرد، مامەنوپەز، سینا، مامساکی و مامسال)، ژ بنەمالێن: (شقیق، جاخۆپەز، گرم، بلولۆك، کانەبی، میرزا، توخمەخێزان، توخمەشار و حەجی حەسەن)، ل سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ ناڤێ گوندی ب کیلانە هاتییەتوومارکرن، هژمارا خەلکێ گوندی ١١٨ کەس بوو[٧٤]، ژمارا وان (٩٧)خێزانن کو دبنە (٤٦٣) کەس.

**ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:**

چەند کانی ل گوندی هەنە، ژوانا: کانی چێلەسۆر، کانی کەرکەپیر، کانی کەندە سماکینو، کانی کۆرە جوو، بەرێ رەز و باغەکێ باش ل بەر ئاڤا ڤان کانییان دهاتەکرن، لێ نها بەرەڤ هشکبوونێ دچن. پرۆژەیێ ئاڤێ بۆ گوندی نەهاتییە چێکرن.

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

ڤی گوندی عەردەکێ باش بۆ خودانکرنا پەز و مالاتی هەیە و پتر ژ (٢٥٠٠) سەران خوداندکەن و بەرهەمەکێ باش دابیندکەتن و بوویە ئێك ژ گرنگترین داهاتێ گوندیان، دیسان هندەك خەلکێ گوندی مژویلی چاندنێ نە و هندەك ژی مووچەخۆرن.

سالا (١٩٨٧)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەکرن، پاشان ل سالا (١٩٨٢) هاتییەگرتن، پشتی سەرهلدانا سالا (١٩٩١)ی جارەکادی خواندنگەهـ بۆ گوندیان هاتییەڤەکرن[٧٥].

## گوندێ گەلۆك مامساك ژێری:

ئەڤ گوندە ب دووراتییا (٢٢کم) دکەڤیتە رۆژهەلاتی بجیلێ، د کەڤندا ل دەرگەهێ گەلیەکی بوویە، ب بوورینا دەمی ناڤ ژ گەلی بوویە گەلۆك، سالا (١٩٥٥)ێ بوویە گوند، بەری هینگێ تنێ مالەك لێ ئاکنجیبوویە و ژ گوندی گەلۆکێ سەری هاتینە وێرێ.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ گەلوك مامساك ژووری.

**باشووری:** گوندێ شەرەڤۆنا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ بێخمە.

**رۆژئاڤا:** گوندێ زێوە.

**پێکهاتا گوندی:**

خەلکێ وی ژ عەشیرەتا سۆرچی تیرەیا (مامساکی)نە، ژ سێ بنەمالێن: (بنەمالا حسێنێ هەمینێ، بنەمالا شێخیلا، بنەمالا نازێ) پێکدهێن، ل سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا تنێ ئاماژە ب گوندەکی ب ناڤێ گەلەك مام ساك هاتییەکرن و هژمارا خەلکێ گوندی تنێ ١١٢ کەس بوو، نها (٤٨) خێزانن کو دبنە (٤٦٠)کەس. د هەمان سەرژمێریێدا ئاماژە ب گوندەکی دی ب ناڤێ گەلوك مام کرد هاتییەکرن هژمارا خەلکێ وی تنێ ٢٦ کەس بوو[٧٦].

ڤی گوندی چ ژێدەرێن ئاڤێ مینا کانییان نینن، ئاڤا وان ب تانکەران دهێت.

**زێن و ژیارا خەلکێ گوندی:**

مینا گوندێن دی یێن دەڤەرێ خودانکرنا تەرش و کەوالی ژێدەرێ سەرەکیێ ژیانا وانە، ڤی گوندی پتر ژ (٤٠٠٠) سەران هەنە، ل هاڤینان قەستا کویستانێن حاجی ئۆمەران دکەن. هەروەسان ل گوندی بەرهەمەکێ باش یێ دەخل و دانی ژی دهێتە چاندن. ژبلی کو هندەك ژ خەلکێ گوندی مووچەخۆرن.

سالا (١٩٩٨)ێ بۆ ئێکەم جار خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن[٧٧].

## گوندێ دزۆك:

گوند دەڤەرەکا زویرگە، دکەڤیتە سەر روبارێ

(گبێر)ی، ب دووراتییا (٥کم) باشووریٚ رۆژئاڤا بجیل، سالا (١٩٥٥)یٚ بوویە گوند.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندیٚ زنتا.

**باشووری:** گوندیٚ چەمەسیٚل.

**رۆژهەلاتی:** گوندیٚ زەرگێنا.

**رۆژئاڤا:** رووباریٚ گبێر.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکیٚ گوندی ژ عەشیرەتا سۆرچی تیرەیا (مامگرد)ن، د کەڤندا ل ڤی گوندی د ئاکنجینە، ژ سیٚ مالباتێن: مالباتا صادق، مالباتا عسمان، مالباتا حیەز پێکدهێن، هژمارا وان دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧یٚ ٣٧ کەس بوو[٧٨]، نها (٢٤) خێزانن دبنە (١٢٣) کەس.

### جهێن شوینواری و ناڤدار ل گوندی:

ئاش: دکەڤیتە رۆژئاڤا گوندی، مێژوویا وی دیار نینە.

گورستانێن کەڤن: دو گۆرستانێن کەڤن ب ناڤێن گۆرستانا (خوارانیٚ) ل باکووری و گۆرستانا (کانی جدۆ) ل باشووری گوندی هەنە.

### ژێدەرێن ئاڤیٚ ل گوندی:

چەند کانی ل گوندی هەنە ئەوژی: کانییا چەمیٚ داری، کانییا دارەتوو، کانی سۆرك، ئەڤ کانییە ئەگەریٚ ویٚ چەندیٚ بوون کو چاندنەکا باش ل بەر بهێتەکرن، نها ئەوژی بەرەڤ کێمیٚ و هشکبوونیٚ دچن. سالا (٢٠١١)یٚ پرۆژەییٚ ئاڤیٚ بۆ گوندی هاتییە چێکرن.

### ژین و ژیارا خەلکیٚ گوندی:

پەز و بزن ل گوندی گەلەکیٚ زۆرە و پترە ژ (٢٠٠٠) سەران، دیسان گوندی دەخل و دانی (گەنم و جەهـ و نیسك و نۆك و برنجی) دچینن، گوندەکیٚ ناڤدارە ب چاندنا برنجی، رەز و باغ و بیستانان ژی دکەن. ژبلی ڤان کاران هندەك ژ خەلکیٚ گوندی مووچەخۆرن ژی.

سالا (٢٠٠٢)یٚ بۆ ئێکەم جار خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەکرن[٧٩].

## گوندی میربالیان:

ئەڤ گوندە دکەڤیتە دەڤەرەکا زویرگە، ب دووراتییا (٢٥کم) باشووریٚ رۆژهەلاتیٚ بجیلیٚ، ل سەر ناڤیٚ گوندی دبێژن د کەڤندا میرەك ل وەرزیٚ بهاریٚ هاتییە ڤی گوندی، بالیٚ خۆ ییٚ ب سەر گوندی کێشایی و ئاڤەدانکرییە، ب بوورینا دەمی بوویە میربالیان، لیٚ ئەو گوند نەمایە و دووڤ گۆتنێن گوندیان سالا (١٨٩٥)یٚ دوبارە هاتییەئاڤاکرن ڤە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندیٚ گوجار.

**باشووری:** گوندیٚ کەندەگول.

**رۆژهەلاتی:** گوندیٚ دازین.

**رۆژئاڤا:** گوندیٚ مەمەندۆك.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکیٚ گوندی ژ عەشیرەتا سۆرچی تیرەیا (سینا)نن، ژ مێژە ل گوندی د ئاکنجینە، ژ مالباتێن: (مالباتا ئەحمەدی، مالباتا بەرخندا، مالباتا عەزیز شێخۆیەز، مالباتا عەزیز محەمەد، مالباتا حەیدری، مالباتا صۆفی، مالباتا ئەحمەد فەقیٚ) پێکدهێن، ل سالا ١٩٥٧یٚ هژمارا خەلکیٚ گوندی ١٢٧ کەس بوو[٨٠]، نها (٨٥) خێزانن کو دبنە (٦٩٤) کەس.

### شوینوارێن گوندی:

ڤی گوندی گۆرستانێن کەڤن ل باشووری گوندی هەنە، هەروەسان قەبرەك دبێژنیٚ (نوح پێغەمبەر).

ژێدەرێن ئاڤیٚ ل گوندی:

گوندی سیٚ کانی ب ناڤێن: (کانییا سەردۆرا، کانییاگوندی، کانییا ساردافیٚ) هەنە، نها بەرەڤ

هشكبوونێ دچن، سالا (٢٠٠٣)ێ بڕۆژەیێ ئاڤا ڤەخوارنێ بۆ گوندی هاتیيە دروستكرن.

**ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:**

ژمارەكا زۆرا پەز و مالاتی ل گوندی دهێتەخودانكرن، ژ (٣٠٠٠) سەران پترە، هاڤینان دبەنە كویستانێن حاجی ئومەران. دیسان دەخل و دان ژی ل ڤی گوندی دهێتە چاندن و بیستان دهێنە كرن، ترۆزی و گندۆرێن دێم دچینن، ژبلی خیار و باجانسۆرك و باجانرەشك و شتی و بامی و لۆبیك و... هتد. هەروەسان هندەك ژ خەلكێ گوندی مووچەخۆر و پێشمەرگەنە.

سالا (١٩٧٨)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەكرن، سالا (١٩٨٢)ێ هاتییەگرتن، سالا (١٩٩١)ێ جارەكادی خواندنگەهـ هاتییە ڤەكرن. سالا (٢٠١٥)ێ بنكەهێ ساخلەمیێ ل گوندی هاتییە ڤەكرن[٨١].

## گوندێ كەندەسۆر ژێری:

ئەڤ گوندە ل بەراهیێ كۆتان بوو، دكەڤیتە دەڤەرا زویرگ، ب دووراتییا (١٥كم) رۆژهەلاتی ناڤەندا ناحیا بجیلێ، سالا (١٩٤٠)ێ ژ لایێ (محەمەدێ بابێ فەق عەلی) هاتییە ئاڤاكرن، ناڤێ گوندی ژ وێ شیڤا دوێرێ رادبووریت هاتییە ، كو ئاخا وێ یا سۆرە، لەورا ب كەندە سۆر هاتییە ناڤكرن.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێ بێسمەكەران.

**باشووری:** گوندێ زراڤك.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ سامەدین.

**رۆژئاڤا:** گوندێ كەندە سۆر ژووری.

**گوندێ روولكا ژووری:**



**پێكهاتا گوندی:**

خەلكێ گوندی ژ عەشیرەتا سۆرچی تیرەیا (مامكرد)ن، ژ ئێك مالبات ئـەوژی (مامله‌س) پێكهاتییە، ژ سالێن چلانڤە ل ڤێرە ئاكنجینە، ژمارا وان (٩) خێزانن كو دبنە (٤٥) كەس.

**ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:**

ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی دكێمن و ئەوێن هەین ژی وەرزی نە، زڤستانێ ب ئاڤن و هاڤینێ هشك دبن، ئاڤ ب تانكەران بۆ ڤەخوارنێ و پەز و مالاتی دهێت، چ پرۆژەیێن ئاڤێ بۆ گوندی نەهاتینە چێكرن.

**ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:**

دكەڤندا ئەڤ گوندە كۆتان و جهێ خودانكرنا پەز و مالاتی بوویە، هەتا نها ژی ئەڤ كارە بەردەوامە، ژمارەكا زۆرا پەزێ سپی هەیە، هاڤینان قەستا زۆزانێن حاجی ئۆمەران دكەن. دەخل و دان ژی ب تایبەت گەنم و جەهـ كێم ل گوندی دهێتە چاندن، كو تنێ بۆ ئالفی و خوارنێ دهێتە چاندن.

سالا (٢٠٠٣)ێ خواندنگەهـ هاتییە گوندی[٨٢].

## گوندێ كەشانە:

ئەڤ گوندە دكەڤیتە دەڤەرا زویرگ، ب دووراتییا (٨كم) ژ باشووری بجیلێ، سالا (١٩٩٢)ێ پشتی سەرهلدانێ بوویە گوند و بنیاتێ ناڤێ وی نەهاتییە زانین.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری،** گوندێ مێركەمۆشك.

**باشووری،** گوندێ كیلان.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ كەرمكا ژوور.

**رۆژئاڤا،** گوندێ باراڤا.

**پێكهاتا گوندی:**

خەلكێ گوندی ژ عەشیرەتا سۆرچی تیرەیا (مامسال)ن، ژ دو بنەمالێن سەرەكی ب ناڤێن (بنەمالا ئاڤدەل شێر و بنەمالا ئەحمەد) پێكدهێت، ژمارا وان (٣٤) خێزانن كو دبنە (١٦٠) كەس.

**ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:**

تنێ یەك كانی ب ناڤێ كانییا (نوارەچیخ) ل گوندی هەیە، ئەو ژی بەرەڤ كێمبوونێ و هشكبوونێ دچیت، پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا (١٩٩٥)ێ ل گوندی هاتییە چێكرن و كێشەیا بێ ئاڤیێ ل گوندی هاتییە چارەسەركرن.

**ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:**

پەز و مالات ژێدەرێ سەرەكیێ ژیانا خەلكێ گوندییە، پتر ژ (٢٥٠٠) سەران هەنە، وەرزێ هاڤینێ دچنە زۆزانێن حاجی ئۆمەران و چەروانێ باش بۆ پەز و مالاتێ خۆیەیدا دكەن، هندەك ژ خەلكێ گوندی ژی مووچەخۆرن.

سالا (٢٠٠٢)ێ خواندنگەهـ بۆ ئێكەم جار ل گوندی هاتییە ڤەكرن[٨٣].

## گوندێ روولكا ژووری:

گوند دكەڤیتە دەڤەرا زویرگ ب دووراتییا (١٠كم) رۆژهەلاتی ناڤەندا ناحیا بجیل، ل بەرێ ئەڤ جهە كۆتان بوو، سالا (١٩٩٢)ێ بوویە گوند، ناڤێ گوندی ژ ناڤێ گیایەكی ب ناڤێ (روولك) هاتییە.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری،** زنجیرا چیایێ بێرات.

**باشووری،** گوندێ روولكا ژێری.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ روولكا كەریمخان.

**رۆژئاڤا،** گوندێ كەلات.

**پێكهاتا گوندی:**

خەلكێ گوندی ژعەشیرەتا سۆرچی تیرەیا (مامكرد)ن، ژ ئێك بنەمال ب ناڤێ (مالەسێن) پێكهاتییە، ژمارا وان (١٧) خێزانن كو دبنە (١٠٢) كەس.

**جهێن کەڤنار ل گوندی:**

ڤی گوندی تنێ جهەکێ کەڤنار وەکی شوینوار هەیە، ئەوژی (گۆڕستانا گەردیا)نە.

**ژێدەرێ ئاڤێ ل گوندی:**

گوندی هەر تنێ (کانی بەردەچێل) وەکی ژێدەرێ ئاڤێ هەیە، ئاڤا وی ژی بەرەڤ کێمیێ ڤە دچیت، لەوما ئاڤ بۆ گوندی ب تانکەران دهێت.

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

ب شێوەیەکێ گشتی خەلکێ گوندی ب خودانکرنا مەر و مالاتی ڤە دمژوولن، نێزیکی (٥٠٠) سەران ل گوندی هەنە. د وارێ چاندنێ ژی دا ژبەر نەبوونا ئاڤێ تنێ دەخلی دچینن، هندەك ژ خەلکێ گوندی ژی مووچەخۆر و پێشمەرگەنە.

سالا (٢٠٠٤)ێ بۆ ئێکەم جار خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەکرن[٨٤].

## گوندێ روولکا ژێری:

روولکا ژێری ل بەرێ کۆتان بوو، دکەڤیتە دووراتیا (١٠کم) رۆژهەلاتێ بجیلێ ل دەڤەرا زویرگە، سالا (١٩٩٢)ێ بوویە گوند. ناڤێ گوندی هەر مینا ناڤێ گوندێ پێشترە کو ژ گیایێ (روولك) هاتییە.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری،** گوندێ روولکا سەری.

**باشووری،** گوندێ بانیەقولێر.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ کەندەسۆر سەری.

**رۆژئاڤا،** گوندێ دەشتیل.

**پێکهاتا گوندی:**

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا سۆرچی تیرەیا (مامکرد)ن، ژ بنەمالا (حاجی رەسول) پێکهاتییە، (١٠) خێزانن کو دبنە (٥٠) کەس.

**جهێن شوینواری:**

ڤی گوندی تنێ گۆڕستانەکا کەڤنار ب ناڤێ (گۆڕستانا سەید)لێ هەیە.

**ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:**

تنێ ئێك کانی یە ب ناڤێ کانیبیا گوندی، ئەو ژی بەرەڤ هشکبوونێ دچیت، پرۆژەیێ ئاڤێ ل گوندی نینە و ئاڤ بۆ وان ب تانکەرات دهێت.

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

د بنیاتدا گوند جهێ خودانکرنا پەزی بوو، نها ژی پتریا گوندیان مژوولی ڤی کارینە، دەور و بەرێ (٤٠٠٠) سەرێن پەز و بزنان ل گوندی هەنە، ل هاڤینان دچنە زۆزانێن دەڤەرا حاجی ئۆمەران. دیسان هندەك ژ خەلکێ گوندی مووچەخۆرن.

سالا (٢٠٠٢)ێ بۆ ئێکەم جار خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەکرن و تا نها یا بەردەوامە[٨٥].

## گوندێ بیبیا ژێری:

گوند دەڤەرەکا چیایی و ئاسێ یە، گوندەکێ نوییە و پێشتر کۆتانا پەزی بوو، دکەڤیتە دووراتیا (٣١کم) رۆژهەلاتێ بجیل، سالا (٢٠١٢)ێ بوویە گوند. ناڤێ وی ژ دارا (بیووك- بیهۆك) هاتییە کو ل بەرێ ل ڤی گوندی د زۆر بوون.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری،** گوندێ بیبیا سەری.

**باشووری،** گوندێ بێخمە.

**رۆژهەلاتی،** زێی مەزن.

**رۆژئاڤا،** گوندێ گەلووك.

**پێکهاتا گوندی:**

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا سۆرچییانە سەر ب تیرەیا (مامساکی)یا، ژبنەمالا (حسێن) پێکهاتییە، ژمارا

وان نها (١١) خێزانن كو دبنە (٦٣) كەس. د سەرژمێریا سالا ١٩٥٧یدا ئاماژە ب یەك گوندێ بێ هاتییەكرن وی دەمی هژمارا خەلكێ وی ٦٨ كەس بوو[٨٦].

**ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:**

ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی كانی نە، مینا كانیێن (كانییا روولكێ، كانییا مالا، كانییا مەحمود).

ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

خودانكرنا پەز و مالاتی كارێ سەرەكیێ گوندییانە، پتر ژ (١٠٠٠) سەرێن ئاژەلی ل گوندی هەنە، پەزدار ل هاڤینان دچنە چەروانێن حاجی ئۆمەران. هەروەسان و ژبەر هەبوونا ژێدەرێن ئاڤێ رەز و باغ و بیستان دهێنەكرن، ب تایبەت هژیر و هنار و زەرزەوات و چاندنا دێم ژ گەنم و جەهـ و نیسك و نۆك و .....هتد). دیسان هندەك ژ خەلكێ گوندی مووچەخۆرن ژی[٨٧].

## گوندێ زراڤكێ:

گوند دكەڤیتە دەڤەرا زویركە، ب دووراتییا (٢٠كم) رۆژهەلاتێ بجیلێ. سالا (٢٠٠٥)ێ ل جهەكێ بەرتەنگ و زراڤ هاتییە ئاڤاكرن لەوما ب وی جهی هاتییە ب ناڤكرن، بەری ببیتە گوند كۆتان بوویە.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێ بنهەڤراز.

**باشووری:** گوندێ كەندەگول.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ دازین ژووری.

**رۆژئاڤا:** گوندێ گۆچار.

**پێكهاتا گوندی:**

خەلكێ گوندی ژ عەشیرەتا سۆرچی تیرەیا (مامكرد)ن، شێخزادەنە و دبنیاتدا ئێك بنەمالن ب ناڤێ (بنەمالا عیصام)ی، نها ژ (٩)خێزانان پێكدهێت كو دبنە (٧٠) كەس.

**ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:**

چەند كانی ل گوندی هەنە وەكی: (كانی كەپەن، كانییا زەلاما و كانی پونگ)، سالا (٢٠١٥)ێ پرۆژەیێ ئاڤی بۆ گوندی هاتییە چێكرن و كێشەیا بێ ئاڤیێ چارەسەربوویە.

**ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:**

خەلكێ گوندی بەری هەر كاری مژوولی خودانكرنا پەز و مالاتی نە، پتر ژ (٦٠٠) سەرێن پەز و بزنان هەنە، ل هاڤینان دچنە كویستانێن حاجی ئۆمەران. دیسان خەلكێ گوندی كارێ چاندنا دەخل و دانی دگەل بیستانێن زەرزەواتی ژی دچینن. ژبلی كو پشكەكا خەلكی مووچەخۆرن.

سالا (٢٠١٠)ێ بۆ ئێكەم جار خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەكرن و هەتا سالا (٢٠١٤)ێ یا بەردەوامبوو، پاشان ژبەر كو گوند نێزیكی گوندی دازین ژێری یە خواندنگەها وان هاتە گرتن[٨٨].

## گوندێ كەندە سۆر ژووری:

گوندەكێ كەڤنارە دكەڤیتە دەڤەرا زویرگ، ب دووراتییا (١٣كم) رۆژهەلاتێ بجیلێ. ناڤێ گوندی ژ وێ شیڤێ هاتییە ئەوا دوێرێ را دبووریت كو ئاخا وێ یاسۆرە، لەورا ب كەندە سۆر هاتییەناڤكرن.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێ روولكا كەریمخان.

**باشووری:** گوندێ دازین ژووری.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ كەندە سۆر ژێری.

**رۆژئاڤا:** گوندێ گۆچار.

**پێكهاتا گوندی:**

خەلكێ گوندی ژ عەشیرەتا سۆرچی تیرەیا (مامكرد)ن، ژ بنەمالا (مالەسێن)، ژمارا وان (٢٤) خێزانن كو دبنە (١٦٠) كەس و پێنج پشتە ل ڤی گوندی د ئاكنجی.

**جهێن شوینواری كەڤنار:**

باسكێ بۆكبەرا: جهەكێ كەڤنار و ب ناڤ و

دەنگە ل هەمی دەڤەرێ، ل بەرێ ل ڤی جهی بووك پێك دگهۆرین.

گۆڕستانا گوندی: دكەڤیتە باكوورێ گوندی، زۆرا كەڤنە و مێژوویا وێ دیار نینە.

**ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:**

ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی كێمن، ئەو كانیێن هەین وەرزینە، پرۆژەیێ ئاڤێ ل گوندی سالا (٢٠٠٩)ێ هاتییە دروستكرن و ب تانكەران ئاڤێ بۆ گوندی دهینن.

**زین و ژیارا خەلكێ گوندی:**

دكەڤندا ئەڤ گوندە جهێ خودانكرنا پەز و مالاتی بوویە، نهاژی ئەڤ كارە بەردەوامە و پتر ژ (١٨٠٠) سەرێن پەز و بزن و چێلان ل گوندی ب خودان دكەن. ژبۆ دابینكرنا ئاڤێ و ئەردەكێ باش وەرزێ گەرمایێ قەستا زۆزانێن حاجی ئۆمەران دكەن. دیسان خەلكێ گوندی دەخل و دانی ژی بۆ خوارنێ و ئالفی ب رێژەیەكا كێمتر دچینن، ب تایبەت گەنم و جەهان. ژبلی كو هندەك خەلكێ گوندی مووچەخۆرن ژی.

سالا (٢٠٠١)ێ بۆ ئێكەم جار خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەكرن و هەتا نها ژی یا بەردەوامە[٨٩] .

## گوندێ داررووك ژێری:

ئەڤ گوندە دكەڤیتە دەڤەرا زویرگە، سەر رەخێن بەستەكا تژی ئاڤ ل زڤستانێ و هشك و گەرم ل هاڤینێ، ب دووراتییا (١٦كم) ژ ناڤەندا ناحیێ، ناڤێ گوندی ژ بنەكێ دارێ هاتییە كو دكەڤندا ل ڤی جهی هەبوویە، ب بوورینا دەمی ژ (دارەك) بوویە (داررووك). گوند ل بەرێ كۆتان بوو، پاشان ل سالا (١٩٧٧)ێ بوویە گوند.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری،** گوندێ داررووك ژووری.

**باشووری،** گوندێ شەرەفۆنا.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ نیروە.

**رۆژئاڤا،** گوندێ دازین.

**پێكهاتا گوندی:**

خەلكێ گوندی ژ عەشیرەتا سۆرچی تیرەیا (مامكرد)ن، شێخزادەنە ژ بنەمالا (شێخزاد)، ژمارا وان (٢٤) خێزانن كو دبنە (١٣٠)كەس.

ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

گوندەكێ كێم ئاڤە و تنێ هندەك كانی ل زڤستانێ هەنە كو ل هاڤینان هشك دبن، ل هاڤینان ئاڤ بۆ وان ب تانكەران دهێت.

**ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:**

د كەڤندا و هەتا نها هەر جهێ خودانكرنا تەرش و كەوالی بوویە، نها ژی ئەڤ كارە یێ بەردەوامە، گوندی پتر ژ (٢٠٠٠) سەرێن ئاژەلی خودانكەن، هاڤینان ژی دچنە كویستانێن حاجی ئۆمەران. ژبەر نەبوونا ئاڤێ تنێ جهێ وان بۆ دەخل و دانی گونجایە و ئەو لێ دهێتە چاندن.

سالا (١٩٩٨)ێ بۆ ئێكەم جار خواندنگەهـ هاتییە ڤەكرن[٩٠].

## گوندێ بانیە قولێر:

دكەڤیتە دەڤـەرا زویرگە، ب دووراتییا (٨كم) رۆژهەلاتێ مەلبەندێ ناحیێ، ناڤێ گوندی ژ وی جهێ بلند (بانی) هاتییە كو دكەڤیتە سەر، ئانكو بانییەكا بلندە، ب بوورینا دەمی بوویە بانیە قولێر. ئەڤ جهە سالا (٢٠٠٣)ێ بوویە گوند و بەری هینگێ كۆتان بوویە.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری،** گوندێ روولكا ژێری.

**باشووری،** گوندێ كۆچار.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ كەندەسۆر.

**رۆژئاڤا،** گوندێ سەرسوول.

**پێكهاتا گوندی:**

خەلكێ گوندی ژ عەشیرەتا سۆرچی تیرەیا (ماگرد)ن، دبنیاتدا ئێك بنەماله ئەوژی بنەمالا (مارەسێن)ە، پێكدهێت ژ (١١)خێزانان كو دبنە (٧٥) كەس.

**ژێدەرێن ئاڤا گوندی:**

پـرۆژەیـێ ئاڤێ سـالا (٢٠٠٧)ێ ل گوندی هاتیه دروستكرن و كێشەیا كێم ئاڤیێ هاتیه چارەسەركرن.

**ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:**

ئەڤ گوندە هەر د كەڤندا و هەتا نها هەر جهێ خودانكرنا تەرش و كەوالی بوویە، نها ژی ئەڤ كارە یێ بەردەوامە و پتر ژ (١٥٠٠) سەرێن پەز و بزن و چێلان دهێنە خودانكرن، ژبەر نەبوونا ئالفەكێ باش ل هاڤینان، پەزدار ل وی وەرزی دچنە كویستانێن حاجی ئۆمەران. ڤی گوندی دەخل و دانەكێ باش ژی لێ دهێتە چاندن، مینا گەنم و جەهـ و نیسك و نۆكان كو ئەو ژی ئێكە ژ ژێدەرێن ژیانا هندەك ژ خەلكێ گوندی، ژبلی كو هندەك ژێ مووچەخۆرن.

سالا (٢٠٠٣)ێ بۆ ئێكەم جار خواندنگەهـ ل گوندی هاتیە ڤەكرن، ژبەر نێزیكبوونا ڤی گوندی ژ گوندێ كەلات، سالا (٢٠٠٨)ێ جارەكادی هاتیەگرتن ڤە و زارۆكێن وان بۆ خواندنێ دچنە وی گوندی[٩١].

## گوندێ كێلی سینان:

دكەڤیتە دەڤەرا زویرگە سەر رووبارێ زێ مەزن، ب دووراتییا (٢٨كم) باشووری ناڤەندا بجیل، ل بەرێ كۆتان بوو، د سالێن پێنجییاندا بوویە گوند. ناڤێ وی ژ (جێرێ) هاتییە، ب رامانا كو ل بەرێ گێرا دەخل و دانی ب دەوارا ل ڤی گوندی یا بەلاڤبوو، ب بوورینا دەمی ل (جێری) بوویە كێلی سینان ژی ناڤێ تیرەیا خەلكێ گوندییە، لەوما گوند ب (كێلی سینان) بەرنیاسبوو.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێ میربالیان.

**باشووری:** رووبارێ زێی مەزن.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ خولێ.

**رۆژئاڤا:** گوندێ هیزان.

**پێكهاتا گوندی:**

خەلكێ گوندی ژ عەشیرەتا سۆرچی تیرەیا (سینان)ن، تنێ ئێك مالباتە ب ناڤێ (مالباتا محەمەدی مەستانێ)، نها (٢١) خێزانن كو دبنە (١٠٧) كەس.

**جهێن شوینواری كەڤنار:**

قەلاتۆك: قەلاتەكا كەڤنارە ل باشووری گوندی، مێژوویا وی دیار نینە.

**ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:**

ڤی گوندی چەند كانی وەكی ژێدەرێ ئاڤێ هەنە، مینا: كانییا كەری، كانی كاڤانۆك، كانییا كەرۆ.

ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

وەكـی دیار جهەكێ گونجایە بۆ خودانكرنا تەرش و كەوالی، لەوما هەر د كەڤندا و هەتا نها هەر لێ دهێنە خودانكرن، نها پتر ژ (١٥٠٠) سەران هەنە. دیسان كو گوند دكەڤیتە سەر رووبارێ (زێی مەزن)، بەرهەمێ ماسی ژی ل گوندی یێ زۆرە وەكی داهاتەكێ دی یێ ئابووری، هەروەسان دەخل و دان و گەلەك جۆرێن فێقی ژی ل گوندی دهێنەكرن، ژبلی بیستانان و چاندنا دەرامەتێن هاڤینی ل بەر ئاڤا رووباری، وەكی: شتی و خیار و گندۆر و...هتد. هندەك ژ خەلكێ گوندی ژی مووچەخۆرن.

سالا (٢٠٠٠)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەكرن[٩٢].

## گوندێ مەمەندۆك:

گوندەكێ كەڤنە ل دەڤەرا زیركە، ب دووراتییا (٢٠كم) باشووری ناحیا بجیل، خەلكێ گوندی چەندین پشتە ل ڤیرێ د ئاكنجینە.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری،** گوندێ کیلێ.

**باشووری،** گوندێ گۆجار.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ میربالیان.

**رۆژئاڤا،** گوندێ گەرمکا ژێری.

**پێکهاتا گوندی:**

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا سۆرچی نە سەر ب تیرەبێن (سینان و مامسال)ن، د بنیاتدا دو مالباتن ب ناڤێن (مالباتا محەمەد خارۆ و مالباتا برایم)، ل سالا ١٩٥٧ێ خەلکێ گوندی ٦١ کەس بوون[٩٣]، نها (٣٢) خێزانن کو دبنە (١٨٤) کەس.

**جهێن شوینواری:**

تنێ گورستانەکا کەڤنار ب ناڤێ (گۆڕستانا ملی) ل گوندی هەیە.

**ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:**

ڤی گوندی کانییەك ب ناڤێ (کانییا فەقێ عومەر) هەیە و ژێدەرێ ئاڤا گوندی بوو، سالا (٢٠٠٦)ێ پرۆژەیێ ئاڤێ ل گوندی هاتییە چێکرن.

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

خودانکرنا تەرش و کەوالی ئێکە ژ گرنگترین ژێدەرێن داهاتێ خەلکێ گوندی و پتر ژ (٤٠٠٠) سەران هەنە، ل هاڤینان ژی دبەنە کویستانێن حاجی ئومەران. دیسان دەخل و دانەکێ باش ژی ژ گەنم و جەهان دهێنە چاندن، هەروەسان بیستان ژی ب رێژەیەکا کێم و بۆ خوارنا رۆژانە هەنە.

سالا (٢٠٠٦)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییەڤەکرن[٩٤].

## گوندێ هیزان:

گوندەکێ کەڤنە دکەڤیتە دەڤەرا زویرگ ل سەر زێی مەزن، ب دووراتییا (٣٠کم) باشوورێ ناڤەندا ناحیا بجیل، خەلکێ گوندی چەندین پشتە ئاکنجیێن ڤی گوندی نە.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری،** گوندێ گەرمکا ژێری.

**باشووری،** رووبارێ زێی مەزن.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ کیلێ.

**رۆژئاڤا،** گوندێ ماندیان.

**پێکهاتا گوندی:**

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا سۆرچی تیرەیا (سینان)ن، چەندین پشتە ل ڤی گوندی د ئاکنجی، پێکهاتینە ژ هەردو بنەمالێن (توخمەخێزان و توخمە مامگوری)، د دەمێ ئەنجامدانا سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ گوندی ١٠٦ کەس بوو[٩٥]، نها (٣٠) خێزانن کو دبنە (١٢٧) کەس.

**شوینوار و جهێن کەڤنارێن گوندی:**

گورستانەکا کەڤنار ب ناڤێ (**گۆڕستانا جوهیا**) ل رۆژهەلاتی گوندی هەیە، مێژوویا وێ دیار نینە و قەبرێن جوهیا لێ هەنە.

**کۆچکا محۆی،** گەلەکا کەڤنە دکەڤیتە سەر گرەکی ل باکوورێ گوندی.

**ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:**

دو کانیێن سەرەکی ل گوندی هەنە، ئەو ژی: (کانییا ژنا و کانییا زەلاما)، سالا (٢٠٠٨)ێ پرۆژەیێ ئاڤێ بۆ گوندی هاتییە چێکرن.

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

خەلکێ گوندی بەری هەر کاری مژوولی خودانکرنا پەز و مالاتینە، ژ (٣٠٠٠)هزار سەران پتر هەنە، وەرزێ هاڤینێ دبەنە کویستانێن حاجی ئۆمەران. دیسان گوند دکەڤیتە سەر رووبارێ (زێی مەزن) بەرهەمێ ماسییان ژی داهاتەکێ دی یێ ئابووری یە بۆ خەلکێ

گوندی. هەروەسان خەلكێ گوندی دەخل و دانی و گەلەك جۆرێن فێقی ژی دچینن و بیستانان دكەن و بەرهەمەكێ باشێ شتی و خیار و گوندۆران بەرهەم دهینن. ژبلی كو هندەك خەلكێ گوندی مووچەخۆر و پێشمەرگەنە.

سالا (٢٠٠٨)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتیەڤەكرن[٩٦].

## گوندێ گەرمكا ژووری:

گوندەكێ كەڤنارە دكەڤیتە دەڤەرا زویرگە، ب دووراتیا (٥كم) باشووری رۆژهەلاتی ناڤەندا بجیلێ، ناڤێ گوندی ژ وێ گەرمایێ هاتیە ئەوا هاڤینێ ڤێ دەڤەرێ ڤەدگریت.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ مێكەموشك.

**باشووری:** گوندێ گەرمكا ژێری.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ گۆجار.

**رۆژئاڤا:** گوندێ چێلان.

### پێكهاتا گوندی:

خەلكێ گوندی ژ عەشیرەتا سۆرچی تیرەیا (مامكرد)ن، چەندین پشتە ل ڤی گوندی د ئاكنجی و ژ (مالباتا مەحمود گۆجاری)نە، كو دبنە (٢٥) خێزان و (١٥٠) كەس.

### شوینوار و جهێن كەڤنارێن گوندی:

**گورستانا كەڤنە گوند،** دكەڤیتە باشووری و زۆرا كەڤنە.

قەلاتۆك: وەكی گوندەكێ كەڤنارە و مێژوویا وی دیارنینە.

### ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

سێ كانی وەكی ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی هەنە، ئەو ژی (كانیا بنتوو، كانیا تەبەقێ، كانیا قەلاتۆك)، بەلێ نها بەرەڤ نەمانێ و كێم ئاڤێ دچن. سالا (١٩٩٨)ێ پرۆژەیێ ئاڤێ بۆ گوندی هاتیە دروستكرن.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

خودانكرنا تەرش و كەوالی هەتا نها ژ پیشەیێن سەرەكیێن خەلكێ گوندیە، نها پتر ژ (٣٠٠٠) سەران خودانكەن، هاڤینان دچنە كویستانێن حاجی ئومەران. چاندن لایەكێ دیێ داهاتێ گوندییە، تایبەت دەخل و دان، تێرا پێدڤیین رۆژانە بیستانان دكەن، دیسان هندەك خەلكێ گوندی مووچەخۆرن.

سالا (١٩٩٨)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتیەڤەكرن[٩٧].

## گوندێ گەرمكا ژێری:

گوند دكەڤیتە دەڤەرا زویرگە، ب دووراتیا (١٥كم) رۆژهەلاتی بجیل. ناڤێ گوندی ژ وێ گەرمایێ هاتیە ئەوا ل وەرزێ هاڤینی روو دكەتە ڤێ دەڤەرێ. نها بوویە جهەكێ گرنك نەفت لێ دەركەتییە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ گەرمكاسەری.

**باشووری:** گوندێ ماندیا سەری.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ مەمەندۆك.

**رۆژئاڤا:** گوندێ كێلان.

### پێكهاتا گوندی:

خەلكێ وی ژ عەشیرەتا سۆرچی تیرەیێن (مامكرد و مالە شێخ و سینا)نە، مێژوویا ئاكنجیبوونا وان ڤەدگەرێتەڤە چەندین پشتا بەری نها، ژ چەند مالباتێن (مالباتا هەفتۆی، مالباتا شێخەسەن، مالباتا حاجی، مالباتا خەلیل) پێكدهێن، نها دبنە (٣٨) خێزان و (٣٤٠) كەس. د سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێدا ناڤێ گوندەكی ب ناڤێ گوندێ گەرمكا هاتیە، وی دەمی هژمارا خەلكێ وی ٧٤ كەس بوون، دبیت پاشتر بوویە دو گوند ب ناڤێ گەرمكا ژووری و ژێری[٩٨].

گوندێ سەرسول،



### شوینوارێن گوندی:

گۆڕستانا كەڤن: گەلەكا كەڤنە دكەڤیتە باكووری گوندی.

### ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

ڤی گوندی پێنج كانی: (كانییا شێخمەند، كانییا سكر، كانییا رەزا، كانییا كەنداتیخو، كانییا سەرۆكانی) هەنە.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژبەر كو جهەكێ گونجاییە بۆ خودانكرنا پەز و مالاتی، لەوما هەر د كەڤندا ئێك بوویە ژ وان كارێن گوندیان دكرن و هەتا نها ژی بەردەوامە، پتر ژ (٢٠٠٠) سەرێن ئاژەلان ل گوندی دهێنە خودانكرن. دیسان خەلكێ گوندی دەخل و دانی ژی وەكی ژێدەرەكێ دی یێ داهاتی مشە بەرهەم دهینن، ب تایبەت گەنم و جەهی، هەروەسان بیستان ژی بۆ خوارنا رۆژانە و بۆ فرۆتنێ دچینن، ژبلی جۆرێن فێقی و زەرزەواتی ژ هنار و هژیر و تری و شتی و خیار و... هتد، هندەك ژ خەلكێ گوندی ژی مووچەخۆرن.

سالا (٢٠٠٠)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییەڤەكرن[٩٩]

## گوندێ دۆبێ:

گوندەكێ كەڤنە و دیرۆكا وی دیار نینە، دكەڤیتە سەر رووبارێ (زێی مەزن)، ب دووراتییا (٢٥كم) باشووری بجیل، ناڤێ گوندی ژ وێ چەندێ هاتییە كو دهێتە گۆتن ئاخەكا زۆر ب پیت و بەرەكەت بۆ ئاژەلان هەیە و (دۆ، دەو)ەكێ باش بەرهەم دهات، ب بوورینا دەمی بوویە دۆبێ. خەلكێ گوندی چەندین پشتە ئاكنجییێن ڤی گوندی و ل دووڤ گۆتنان ڤەدگەرینتەڤە سەدسالیا هەژدێ.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ گەویلان.

**باشووری:** رووبارێ زێی مەزن.

**رۆژهەلاتی:** رووبارێ زێی مەزن.

**رۆژئاڤا:** گوندێ زێراڤ.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا سۆرچی تیرەیا (مالە شیخ)ن، ژ مێژە ل گوندی دئاکنجینە و ژ ئێك مالبات ب ناڤێ (مالباتا قوتبەلدین)ی پێکدهێت، نها (١٣) خێزانن کو دبنە (٨٠) کەس.

### شوینوار و جهێن کەڤنارێن گوندی:

**قەلاتا شێخ بەدیع:** دکەڤیتە د ناڤاگوندی دا، مێژوویا وی بۆ سەدسالەکێ بەری نها ڤەدگەرێت.

**شوینوارێن کانییا ئاڤدی:** شوینوارێن کەڤن وەکی دیوار لێ هەنە، مێژوویا وی ل دووڤ گۆتنان ڤەدگەرێتەڤە بۆ بەری دو سەدسالەکان.

### ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

ڤی گوندی سێ کانی: (کانییا ئاڤدی، کانییا پیرا، کانی سۆرك) هەنە، مفا بۆ ڤەخوارنێ و چاندنێ ژێ دهاتنە دیتن، لێ نها بەرەڤ هشکبوونێ دچن. سالا (٢٠١٠)ێ پرۆژەیێ ئاڤێ بۆ گوندی هاتییە دروستکرن.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

خەلکێ گوندی مژوولی کارێ جۆتیاریێ نە، گەنم و جەهی دچینن، پتر ژ سەد تغارێن عەردی ل گوندی هەنە، هەروەسان تێرا خۆ بیستانان دچینن. ژبەر نێزیك بوونا گوندی ژ رووبارێ زێی، ماسی ژێ پشکەکێ ژ پێویستییا گوندییان دابیندکەن. پشکەکا دیتر ژ گوندییان مووچەخۆرن.

بۆ خواندنێ زارۆکێن گوندی دچنە گوندێ گەویلانێ[١٠٠].

## گوندێ سەرسول:

گوند دکەڤیتە دەڤەرا زویرگە ل سەر تاڤگەیەکێ (سولاڤەکێ)، ب دووراتییا (٨کم) رۆژهەلاتی ناحیا بجیل، ناڤێ گوندی ژ وێ سویلاڤێ یە کو گوند ل سەر هاتییە ئاڤاکرن، ل وەرزێ زڤستانێ ئاڤ لێ دچیتە خار و ل هاڤینێ یا هشکە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ دەشتیل.

**باشووری:** گوندێ گۆجار.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ روولکا ژێری .

**رۆژئاڤا:** گوندێ جۆنەرە.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا سۆرچی تیرەیا (مامکرد)ن، ژ مێژە ل گوندی ئاکنجینە، مێژوویا وان ڤەدگەریتەڤە چەندین پشتا بەری نها، ژ ئێك مالبات ب ناڤێ (مارەسێن) پێکهاتییە، نها دبنە (٢٠) خێزان و (١٠٢) کەس.

سالا (٢٠٠٥)ێ پرۆژەیێ ئاڤێ بۆ گوندی هاتییە دروستکرن.

ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی: کارێ سەرەکی یێ خەلکێ وی خودانکرنا پەز و مالاتی یە و پتر ژ (٢٠٠٠) سەرێن ئاژەلان هەنە، بۆ ڤێ مەرەمێ ژێ دبرنە کویستانان. پشکەکا دی ژ گوندییان دەخل ودانی دچینن و تێرا پێویستییا خۆ بیستانان ژێ دکەن. ژبلی کو هندەك ژ خەلکێ گوندی مووچەخۆرن.

سالا (٢٠٠٤)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییەڤەکرن[١٠١] .

## گوندێ گەویلان:

گوند دکەڤیتە دەڤەرا زویرگە، ب دووراتییا (٢٠کم) باشووری ناڤەندا ناحیا بجیل، سالا (١٩٤٥)ێ بوویە گوند، ناڤێ گوندی ژێ ژ ناڤێ کانییا گوندی (گەویلان) هاتییە.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ ملندیان .

**باشووری،** گوندێ دۆبێ.

**رۆژهەلاتی،** زێی مەزن.

**رۆژئاڤا،** گوندێ گۆمکێ.

## پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا سۆرچی تیرەیێن (مالە شێخ، مامساکی، سۆرانی، نقەبی، گەردی، مامکرد، سوکاسجی، مامان و مەر)ن، مێژوویا ئاکنجیببوونا وان ل ڤی گوندی ڤەدگەرێتەڤە چەند پشتا و ژ چەندین مالباتا پێکهاتینە، ئەو ژی: شێخ ئەحمەد، عومەر، حەمید، جبرائیل، مەلا خالید و عەبدۆللا، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ د وێ سالێدا هژمارا خەلکێ گوندی ٢٣٨کەس بوو[١٠٢]، نها دبنە (١٢٠) خێزان و (٥٩٥) کەس.

## شوینوار و جهێن کەڤنارێن گوندی:

تەکیا: تەکیا شێخێن سۆرچییایە، ناڤەراستا سەدساليیا (١٨)ێ زایینی سەردەستی (شێخ عەبدۆللا)ێ شەهید ل کۆلەکا هاتییە دامەزراندن، پاشان هاتییە ڤەگوهاستن بۆ بجیلێ، ل دووڤدا بۆ گوندێ دۆبێ، داوی جار ژی بۆ گوندێ گەویلان ژ لایێ شێخ ئەحمەدی ڤە.

## ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

دو کانییێن سەرەکی ب ناڤێن کانییا زەلاما و کانییا ژنا ل گوندی هەنە و ل بەرێ مفایەکێ باش دگەهاندە گوندیان، ب تایبەت بۆ چاندنێ. سالا (١٩٨٢)ێ پرۆژەیێ ئاڤێ بۆ گوندی هاتییە دروستکرن.

گوندێ کەلات (کەلاتی):



### زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

خودانكرنا پەز و مالاتی مینا پتربیا گوندێن دەڤەرێ پیشەییا سەرەكییا خەلكێ گوندی یە، دیسان چاندنا دەخل و دانی (گەنم و جەهـ و برنج و نیسك و نۆكان) ل گوندی دهێتەكرن، هەروەسا بیستانێن باجانسۆرك و خیار و باجانرەشك و بامی و... هتد، بۆ خوارنا رۆژانە بەرهەم دهینن. گوندی رەز و باغەكێ باشێ فێقی هەیە و چەندین جۆرێن فێقی بەرهەمدهینن. پشكەكا دیترا گوندییان دەبارا خۆ ب مووچەیان دبەنە سەر.

سالا (١٩٥٧)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییەڤەكرن و هەتا نها بەردەوامە[١٠٣].

### گوندێ كەلات (كەلاتێ):

گوندەكێ كەڤنارە و وەكی دهێتە گۆتن مێژوویا وی بۆ پێنج سەدسالەكان بەری نها ڤەدگەریت، دكەڤیتە بنارێ چیایێ بیرات، سەر رێكا سەرەكییا ناڤبەرا (ئاكرێ- هەولێر)، ب دووراتییا (٥,٥كم) رۆژهەلاتی بجیلێ. ناڤێ گوندی ژ (قەلات- كەلا) هاتییە كو دكەڤیتە رۆژهەلاتی گوندی.

د پەرتووكا (المعجم التاریخی لاماره بهدینان) دەربارەی ڤی گوندی هاتییە: گوندەكە دكەڤیتە ناڤبەرا ئاكرێ و رووبارێ زێی ل رۆژهەلاتێ ئاكرێ، یاسین ئەلعومەری (١٧٤٤- ١٨١٦) ئاماژە پێكرییە و گۆتییە: (گوندەكێ مەزنە دكەڤیتە نێزیكی ئاكری، نێزیكی كندیر گوندەكێ ئاڤایە و سەر ب ئامێدیێ یە)، سولتان حسێن وەلی میرێ بەهدینان گۆژمێ دەهـ قرش و پێنج بەغدادی ل سەر سەپاندبوون وەك خویك بۆ خواندنگەها قوبەهان یا ئامێدیێ[١٠٤]

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** زنجیرا چیایێ بێرات.

**باشووری:** گوندێ شارانێ.

**رۆژهەلاتی:** زێی روولكا كەریمخان.

**رۆژئاڤا:** گوندێ سەروكانی.

### پێكهاتا گوندی:

خەلكێ وی یێ رەسەن سۆرچی نە سەر ب تیرەیێن (مامكرد، ماله شێخ، سۆرانی، نقەبی، سینا، مۆكاڤەیی و عەلی خدر)ن، ژ مێژە ل گوندی ئاكنجینە، مێژوویا وان ڤەدگەریتەڤە چەندین پشتا بەری نها، ژ مالباتێن رەسەن ل گوندی مالباتا (توخمە شڤان و توخمە حاجی و ماله سێن و بلولۆك)، مالاتێن دی تر ل ڤان سالێن داویێ هاتینە كەلاتێ، مینا (گۆجاری، مۆكاڤەیی، ئەحمو، حەمەد گجكە، عەلی خدر، قەیم، سوار، میرزا و مەلا مەحمود)، ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ د وێ سالێدا هژمارا خەلكێ گوندی ٤٩٤ كەس بوو[١٠٥]، ب ڤێ چەندێ دبیتە مەزنترین گوندێ ناحیا بجیلێ د وێ سالێدا، نها ژمارا وان (٤٥٨) خێزانن كو دبنە (٢٤٤٣) كەس.

### جهێن شوینواری و كەڤنار ل گوندی:

**گركێ قشلێ:** دكەڤیتە رۆژئاڤا گوندی، جهێ بارەگایێ ناحیێ بوو (ناحیا سۆرچی)، پاشتر هاتە ڤەگوهاستن بۆ بجیلێ، مێژوویا ئاڤاكرنا قشلێ نەهاتییە زانین.

**قەلات:** دكەڤیتە رۆژهەلاتی گوندی، مێژوویا وێ دیار نینە، بەلێ خویایە كو سەردەمەكی (عومەر ئاغا) پاشایێ وێ قەلاتێ بوویە و سەر ب میرگەها بەهدینان ڤە بوویە، ئەڤ ئاغایە سەر ب تیرەیا مامكرد بوویە، نها ژی كەس و كارێن وێ تیرەیێ ل ژیانێ ماینە و وەكی زانیاری ژ مەزنێن ڤێ تیرەیێ هاتینە وەرگرتن و ئێكی بۆ یێ دی ڤەگوهاستینە هەمی ژ بنەمالا وی نە.

**دێروونە:** دكەڤیتە باكووری گوندی، مێژوویا ئاڤاكرنا وێ نەهاتییە زانین دبێژن یا مەسیحیایە و كەسەكی ب ناڤێ (ئۆنە).

**قەبرێ مەترە تیز:** ناڤ ژ مەتران پۆلیس هاتییە و قەبرەكێ تنێ یە، دكەڤیتە باشووری گوندی.

ملێ مەیدانێ: ل سەردەمێ كەڤن جهێ فرۆتن و

کرینا ئاژەلان بوویە، دکەڤیتە باشووری گوندی.

**گەروا دەرگەی:** ئاکە دەرگەهێ هاتنا ناڤکەلاتی بوویە، دکەڤیتە رۆژهەلاتی گوندی.

چەندین گۆڕستانێن کەڤن ژی لێ هەنە، وەکی: گۆڕستانا دێروونە ل باکووری گوندی، گۆڕستانا شەهیدۆك ل رۆژهەلاتێ گوندی، گۆڕستانا ملێ مەیدانێ ل باشوورێ گوندی، گۆڕستانا ملێ ماشا ل باشووری گوندی، گۆڕستانا گەروا دەرگەی ل رۆژهەلاتێ گوندی. گۆڕستانا گرکی ل رۆژهەلاتێ گوندی. گۆڕستانا مللە جوی ل رۆژهەلاتێ گوندی و قەبرێن جوییا لێ هەنە. گۆڕستانا مللە چورگن ل باشوورێ گوندی، گۆڕستانا حەلانان ل رۆژهەلاتێ گوندی، گۆڕستانا ناڤرەزێ شەفیع ل ناڤ گوندی.

**ئاش:** کۆمەکا ئاشان دکەڤنە ناڤ سنوورێن کەلاتێ دا، مێژوویا دروستکرنا وان نە هاتییەزانین، بەلێ خویایە کو زۆر دکەڤنن، ژماراوان (١٢) ئاشن، تنێ ناڤێ سێ ژ وان ب ناڤێن (ئاشێ شەفیعی، ئاشێ نەبۆی و ئاشێ میری)هەنە.

### ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

چەندین کانیێن سەرەکی چ بۆ ڤەخوارنێ و چ بۆ چاندنێ هەنە، وەك: کانییا مەسیلان، کانی کەژیل، دلۆپین، کانی، گەروا جوانەگای، کانی دۆلەنیشاڤ، گاوە، کانی خالمەلا، کانی کسیل، کانی کارەسول، کانی هنار، کانی رەش، کانی مۆرەپەز، کانی گراڤی، کانییا شەکا، کانی ئەسعەد، کانی حەزی خان، کانییا بنێ ساکا، کانییا دێروونە، کانییا ئاشێ شەفیع، کانی کێرووشك، کانی سعیدۆك، کانی زێلو، سالا (١٩٩٨)ێ پرۆژەیێ ئاڤا ڤەخوارنێ بۆ گوندی هاتییە دروستکرن.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

دکەڤندا خودانکرنا پەز و مالاتی ئێك بوویە ژ کارێن خەلکێ گوندی و هەتا نها بەردەوامە، پتر ژ (١٠٠٠) سەرێن ئاژەلی ل گوندی هەنە، هاڤینان دبەنە زۆزانین حاجی ئۆمەران و زڤستانان دزڤرینەڤە. هەروەسا ب شێوەکی زۆر (پەلەوەر) ل گوندی دهێنەخودانکرن و مفایێ ئابووریی باش ژێ دبینن. دەخل و دان ژی ب باشی بەرهەمدهینن، تایبەت گەنم و جەهـ و نیسك و نۆك و ماش و برنجی، برنجێ وان یێ ناڤدارە و گوندی مفایەکێ باش ژێ دبینن، هەروەسان بیستان ژی بۆ خوارنا رۆژانە و فرۆتنێ ژی دچینن، چەندین جۆرێن فێقی ل گوندی دهێنەچاندن. پشکەك ژ گوندییان فەرمانبەر و مووچەخۆرن. ژبەر جهێ وی یێ گونجای بزاڤا کرین و فرۆتنێ ژی لێ هەیە، چەند دوکان ل گوندی هاتینە ڤەکرن.

سالا (١٩٥٥) خواندنگەهـ ل گوندی ب ناڤێ (خواندنگەها کەلات یا سەرەتایی) هاتییە ڤەکرن و هەتا نها یا بەردەوامە، دو خواندنگەهێن دی ژی ل گوندی هەنە، ئەو ژی (ئامادەییا کـەلات)، کو سالا (٢٠٠٨)ێ هاتییە ڤەکرن و خواندنگەها بیرات بنەرەتی، کو سالا (٢٠٠٩)ێ هاتییە ڤەکرن.

سالا (٢٠٠٥) بنگەهێ تەندروستی ل کەلاتی هاتییە ڤـەکـرن، خزمەتەکا بـاش دگەهینتە دەڤەرێ[١٠٦].

## گوندێ گەلووك ماماك زووری:

گوند دکەڤیتە دەرێ گەلییەکی ل دەڤەرا چیایی، ب دووراتییا (٢٠کم) رۆژهەلاتی ناحیا بجیل. ناڤێ گوندی ژ وی جهی هاتییە ئەوێ گوند لێ هاتییە ئاڤاکرن.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** زنجیرا چیایێ بێرات.

**باشووری:** گوندێ گەلوك ژێری.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ زێوە.

**رۆژئاڤا:** گوندێ نێروا.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا سۆرچی سەر ب تیرەیا (مامساکی)نە، ژ مێژە ل گوندی دئاکنجینە، مێژوویا وان ڤەدگەرێتەڤە چەندین پشتا بەری نها، ئێك مالباتە ئەو ژی مالباتا (حاجی تەها)، سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ گوندی ١١٢ کەس بوو[١٠٧]، نها (٣٦) خێزانن و دبنە (١٨٨) کەس.

### ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

ل ڤی گوندی سێ کانی ب ناڤێن (کانییازەلاما،

كانییا ژنا، كانیی خەزار)، هەبوون، لێ نها ئاڤا وان بەرەڤ كێمیێ و هشكبوونێ ڤە دچن و بوویە ئاریشە بۆ گوندیان و ئاڤ ب تانكەران بۆ وان دهێت.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ل ڤی گوندی پتر ژ (٥٠٠٠) سەرێن ئاژەلان ژ پەز و بزن و چێلان دهێنە ب خودانكرن و ل هاڤینێ دچنە زۆزانێن حاجی ئۆمەران و زڤستانان ڤەدگەرێننەڤە. دیسان خەلكێ گوندی دەخل و دانی ژی دچینن و بەرهەمەكێ باش بەرهەم دهینن، ژبلی كو بیستانان ژی دكەن و باجانسۆرك و خیار و باجانرەشك و بامیان بۆخوارنا رۆژانە دچینن. پشكەكا خەلكێ گوندی ژی مووچەخۆرن.

سالا (٢٠٠٠)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەكرن[108].

## گوندێ بێسمەكەران:

گوند دكەڤیتە ناڤبەرا دەڤەرا زوورگ و چیایی دا، ب دووراتییا (١٣كم) رۆژهەلاتێ بجیلێ.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ سوسناوا

**باشووری،** گوندێ سامەدین

**رۆژهەلاتی،** گوندێ خەلان مامكرد

**رۆژئاڤا،** گوندێ روولكا كەریمخان

### پێكهاتا گوندی:

خەلكێ وی ژ عەشیرەتا سۆرچی تیرەیا (مامكرد)ن، چەندین پشتا بەری نها ل ڤی گوندی دئاكنجینە، پێكهاتینە ژمالباتێن: (توخمە شڤان، ماملەس، شكەفتو و بیەیی)، ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا گوندییان ١٠٨ كەسبوو [109]، نها خەلكێ گوندی (٣٧) خێزان و (١٨٣) كەس.

### جهێن شوینواری:

**گۆڕستانا دارێ،** گۆڕستانەكا زۆر كەڤنارە، دكەڤیتە رۆژهەلاتێ گوندی.

**ئاش،** شوینوارێ ئاشەكێ كەڤنە دكەڤیتە باشوورێ گوندی.

**كەڤنە گوند،** شوینوارێن گوندەكێ كەڤنارە ل رۆژهەلاتێ گوندی.

**چار(چال)،** دكەڤنە باشووری گوندی جهێ هەلگرتنا گەنمی و جەهی بووینە.

### ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

ل گوندی چوار كانی وەكی ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی هەبوون، ئەوژی: (كانییا زەلاما، كانییا ژنان، كانی بیرا مزگەفتێ، كانییا كەندا خەربۆجی)، ل بەرێ مفایەكێ مەزن دگەهاندنە گوندی، لێ نها ئەڤ كانییە بەرەڤ كێمیێ و هشكبوونێ دچن، پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا (١٩٩٧)ێ بۆ گوندی هاتییە دروستكرن.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ل ڤی گوندی پتر ژ (٨٠٠) سەرێن پەز و بزن و چێلان دهێنە خودانكرن و داهاتەكێ ئابووریێ باش بۆ وان دابین دكەتن، دیسان دەخل ودان ژی ل گوندی دهێتە كرن، ژبلی كو بیستانان ژی دكەن و تێرا خوارنا رۆژانە بەرهەم دهینن. هندەك ژ خەلكێ گوندی ژی مووچەخۆرن.

سالا (١٩٧٩)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییەڤەكرن و هەتا نها ژی بەردەوامە .


## ژێدەر

١. أ.د خلیل علی مراد أ.د عبدالفتاح علی البوتانی، بادینان فی سالنامات ولایه الموصل العپمانیه، (اربیل- ٢٠١٣)، ص ١٦.

٢. عبدالله غفور، التشكیلات الاداریه فی جنوب كردستان، (اربیل- ٢٠١٤)، ص ١٨٨.

٣. موسەدەق تۆڤی و ئیسماعیل بادی، رێبەرێ پارێزگەها دهۆكێ، (دهۆك، ٢٠١٠)، بپ١٣٢.

٤. عبدالله غفور، التشكیلات الاداریه فی جنوب كردستان، (اربیل- ٢٠١٤)، ص ١٢٦.

# ناحیا دینارتە

موسەدەق تۆڤی

ناحیا دینارتێ یەك ژ سێ ناحیەیێن سەر ب قەزا ئاكرێ ڤەیە، سەنتەرێ ناحیێ باژێركێ دینارتە یە ب دووراتییا (٢٠كم) دكەڤیتە باكوورێ رۆژئاڤایێ ئاكرێ.

## سنوورێن ناحیێ:

**باكوور و رۆژهەلاتی،** رووبارێ زێی، ئەڤ رووبارە سنوورێ سرۆشتییە د ناڤبەرا وێ و ناحیا بارزان یا سەر ب قەزا مێرگەسۆری ڤە.

**رۆژهەلاتی،** ناحیا بجیلێ و ناحیا خلێفان یا سەر ب قەزا سۆران ڤە.

**باشوور،** سەنتەرێ قەزا ئاكرێ و ناحیيا گردەسین

**رۆژئاڤای،** ناحیا چەمانكێ یا سەر ب قەزا ئامێدیێ ڤە.

## مێژوویا ناحیا دینارتێ:

چ گومان تێدا نینە كو دەڤەرا نهایا ناحیا دینارتە ژ ئالیێ مرۆڤایەتیڤە یەك ژ كەڤنترین دەڤەرانە كو مرۆڤ لێ ئاكنجی بووین، شوینوار و جهێن كەڤنار و شكەفتێن دەڤەرێ شاهدێ ڤێ راستیێ نە و د چەند ژێدەراندا ئاماژە ب ڤێ چەندێ هاتییەكرن و چەندین بۆیەرێن دیرۆكی ل ڤێ دەڤەرێ روودایەنە، بەلێ یا مە ل ڤێرێ دڤێت ئاماژە پێ بكەین، مێژووا كارگێری یا ڤێ دەڤەرێ یە.

ژ ئالیێ كارگێریڤە ئەڤ ناحیەیە كو پێشتر ب ناحیا زێبار دهاتەناڤكرن، ل نیڤا دووێ ژ سەدسالیا نوزدێ ناحیەكا سەر ب سنجەقا (لیوا- پارێزگەها) مووسلێ یا ویلایەتا مووسلێ یا دەولەتا ئوسمانی بوو، ل دووڤ بریارەكا سولتانێ ئوسمانی ل ٢٦ كانوونا ئێكێ ١٨٧٨ی هەردو ناحیێن زێبار و شیروان گەهاندینە ئێك و قەزایەك ب ناڤێ قەزا زێبار ژێ پێكئینانە، ژێ قەزا زێبار پتر ژ چارێكا سەدسالییەكێ ڤەكێشایە و پاشتر بوویەڤە ناحیە[1]. ل دووڤ سالنامێن ئوسمانی بێن سالا ١٨٩٠ و ١٨٩٢ێ سنوورێن قەزا زێبار ب ڤی رەنگی بوون: رەواندز ل رۆژهەلاتی، ئامێدیێ ل رۆژئاڤای، ئاكرێ ل باشووری و هەكاری ل باكووری. بەلێ د سالناما ١٨٩٤یدا سنوورێن قەزا زێبار ب ڤی رەنگی هاتینەدەسنیشانكرن: رۆژهەلاتی ناحیا برادوست یا سەر ب قەزا رەواندزێ، ل رۆژئاڤای ناحیا بەرواری ژێری یا سەر ب قەزا ئامێدیێ ڤە، ل باشووری ئاكری و باكووری ناحیا شەمدینان یا سەر ب ویلایەتا وانێ ڤە.

د ڤێ قواناغێدا سەنتەرێ قەزایێ گوندێ

بیرەکەپرا بوو، و وەك ژێدەر ئاماژە پێدکەت قەزا ژ دو ناحیان شیروان ل ئالیێ رۆژهەلاتی و مزووری بالا (مزووری ژووری) ل ئالیێ باکووری پێکدهات، ل دووڤ سالناما ١٨٩٠ێ و سالناما ١٨٩٢ێ ٢٥٠ گوند و ل دووڤ ساناما ١٨٩٤ێ ١٨٠ گوند سەر ب ڤێ قەزایێ ڤە بوون. هەروەسان سالنامێن ئوسمانی ئاماژە ب ناڤێن قائیمەقامێن قەزا زێبار کریە: ل سالا ١٨٩٠ێ مستەفا ئەفەندی و سالا ١٨٩٢ێ حاجی سەعید ئەفەندی و سالا ١٨٩٤ێ مستەفا توفیق ئەفەندی ب وەکالەت قائیمەقامیا قەزا زێبار کرینە[٢]. پشتی هەلوەشاندنا قەزا زێبار هەردو ناحیەیێن شێروان و مزووری ژووری داینە دگەل قەزا رەواندزێ یا دراوسێ و ناحیا زێبار کو مەلبەندێ وێ گوندێ بیرەکەپرا بوو داینە دگەل قەزا ئاکرێ هەروەك د سالنامێن ویلایەتا مووسلێ یێن ١٩٠٧ێ و ١٩١٢ێدا هاتی[٣].

پشتی هەلوەشیانا دەولەتا ئوسمانی و دامەزراندنا دەولەتا شاهینیا عیراقێ ل سالا ١٩٢١ێ ب بریارا شاهی (اراده ملكیه) هژمار ٤٣٢ ل رۆژا ٢٨ کانوونا ئێکێ ١٩٢٤ێ سەرژنوو بریارا دامەزراندنا قەزا زێبار یا پێکهاتی ژ هەردو ناحیەیێن نەهلێ و زێبار هاتییەدان و د هەمان بریاردا هەردو ناحیەیێن زێبار و بارزان ژ قەزا ئاکرێ هاتینەڤەقەتاندن[٤]، پشتی سێ سالان ل ١٠ ئیلوانا ١٩٢٧ێ ب بریارەکا دی یا شاهینی بریارا دامەزراندنا دو ناحیەیان شێروان و بیرەکەپرا ل قەزا زێبار هاتییەدان[٥].

داوی جار هەر ب بریارەکا شاهینی ب هژمار ٦٦٥ ل ٢٠ کانوونا ئێکێ ١٩٤٤ کو د رۆژناما (الوقائع العراقیة) هژمار ٢٢٥٢ ل رۆژا ١٩٤٥/١/٨ێدا هاتییەبەلاڤکرن، بریارا ڤەقەتاندنا ناحیا بیرەکەپرا ژ قەزا زێبار و گرێدانا وێ دگەل قەزا ئاکرێ و ڤەقەتاندنا (فك ارتباط) قەزا زێبار ب هەردو ناحیەیێن وێ بارزان و مزووری ژووری ژ لیوا مووسلێ و گرێدانا وان دگەل لیوا ئەربیلێ (هەولێری) هاتییەدان و ل دووڤ ڤێ بریارێ رووبارێ زێ یێ مەزن ب درێژیا هەتا دگەهیتە سنوورێ ترکیا بوویە سنوورێ سرۆشتیێ ناڤبەرا هەردو لیوا (پارێزگەهـ)ێن مووسلێ و هەولێرێ و ب ڤێ بریاری ژ سالا ١٩٤٥ێڤە ب یەکجاری دووەم تەمەنێ قەزا زێبار ب داویهاتییە و دەڤەرا زێبار د سنوورێ کارگێریێ ناحیا بیرەکەپرادا کەتیە دگەل قەزا ئاکرێ یا سەر ب لیوا مووسلێ ڤە[٦]. یەکەم رێڤەبەرێ ناحیێ د ڤێ قۆناغێدا محەمەد سەبری موسا بوو[٧].

ل سالا ١٩٥٥ێ ل دووڤ بریارەکا وەزیرێ ناڤخۆیێ عیراقێ کو د هژمارا ٣٧١٥/ رۆژا ١٩٥٥/١٠/٢٢ێ رۆژناما (الوقائع العراقیه)دا هاتییەبەلاڤکرن مەلبەندێ ناحیێ ژ گوندێ بیرەکەپرا هاتییەڤەگوهاستن بۆ گوندێ دینارتە و ژ وێ دیرۆکێڤە ئەڤ دەڤەرە ب ناحیا دینارتە هاتییەناسکر[٨].

سەروبەرێ ناحیا دینارتە ب ڤی رەنگی مایە هەتا روودانا شۆرشا ١٤ تیرمەها ١٩٥٨ێ و دەسپێکرنا شۆرشا کوردستانێ ل ئەیلوولا ١٩٦١ێ، د قۆناغا شۆرشێدا و هەتا سەرهلدانا ١٩٩١ێ مەلبەندێ ناحیێ و دەڤەرێن سەر ب وێ ڤە مەیدانەکا شەرێ ناڤبەرا حکۆمەتێ و هێزێن پێشمەرگەی بوویە و هەردەم کارگێریا ناحیێ و فەرمانبەرێن وی ل بەر مەترسیێ بوونە و ئەڤ کارگێریە ل بەر هەلوەشاندن و ڤەگوهاستنا جهێ وێ بوویە هەتا داوی جار ل ١١ حزیرانا سالا ١٩٨٧ێ بریارا هەلوەشاندنا وێ هاتەدان و سازێن کارگێری نەمانە ل دەڤەرێ . هەژیە ل ڤێرێ بێژین د ڤێ قۆناغێدا ئانکو قۆناغا ڤەگوهاستنا مەلبەندێ ناحیێ ژ بیرەکەپرا بۆ دینارتێ هەتا هەلوەشاندنێ ئەڤ ناحیەیە ب ناحیا نەهلێ هاتییەنیاسین و دبریارا هەلوەشاندنا وێ ب ناحیا نەهلە ناڤێ وێ هاتییە[٩] ژبەرکو باژێرکێ دینارتە دکەڤیتە ناڤەندا نهالا نەهلێ، پەیڤا نەهلێ ژی ژ نهال هاتییە ژبەرکو ئەڤ جهە دکەڤیتە د نهالەکا نزمدا ناڤبەرا هەردو زنجیرە چیایێن پێرس و سەرێ ئاکرێ[١٠].

سەروبەر ب ڤی رەنگە ما هەتا ل سالا ١٩٩٦ێ ب بریارەکا حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ سەرژنوو ناحیا دینارتە ل هەمان جهێ خۆ هاتییەڤە دامەزراندن[١١].

**پێکهاتا ناحیێ:**

ناحیا دینارتە ژ (٨٦) گوندان پێکدهێت، (٦٧) د ئاڤەدان و (١٩) د ڤالانە.

رووبەرێ نهایێ سنوورێ ناحیا دینارتە (٢٨٣٩٣٠)دۆنمە، ل دووڤ ئامارێن ناحیێ ل سالا ٢٠١٦ێ ٢٥٧٤٣کەس ل سنوورێ ناحیێ دژین و هژمارا خەلکێ مەلبەندێ ناحیێ (١١٠٠٠) کەسە، پێکهاتا نەتەوەیی یا خەلکێ کورد و ئاشووری و کلدانن، ژ ئالیێ ئایینیڤە ٩٦٪ موسلمان و ٤٪ مەسیحینە، ژ مەسیحییان ٣٪ ئاشووری و ١٪ کلدانن. پرانیا خەلکێ موسلمان ب عەشیرەت زێباری نە و هندەك ژ سۆرچییان ژی ل سەنتەرێ ناحیێ دژین[١٢].

**سەرژمێرییا رەسمی:**

ل دەسپێکا دامەزراندنەڤا ناحیێ ل سالا ١٩٩٦ێ تنێ ٤ فەرمانگەهـ ل ناحیێ هەبوون، لێ نها ١٩ فەرمانگەهێن حکۆمەتی لێ هەنە، ل پرانیا گوندێن ئاڤاکری خواندنگەهێن بنەرەتی و ل سەرانسەری ناحیێ ٥٩ خواندنگەهـ هەنە، ژ وانا ٨ ئامادەیی، ١ دواناڤنجی، ٤٩ بنەرەتی و یەك باخچەیێ ساڤایان، و نێزیکی ٣٠٠ مامۆستایێن هەردو قۆناغان ل ڤی سنووری ئەرکێ فێرکرنی ب ڕێڤەدبەن، هەروەسان پێنج بنکەهێن ساخلەمیێ ل سنوورێ ناحیێ ل (دینارتە، سەرگەلی، سەرکەندال، بامشمش و هەرنێ) هەنە[١٣].

**کارەبا سنوورێ ناحیێ:**

پشتی سالا ٢٠٠٥ێ ویستگەهەکا کارەبێ یا (K.V٣٣)ل سەنتەرێ ناحیێ هاتیبەدانان و هەتا نها کارەبا گشتی گەهشتییە ٤٣ گوندێن سەر ب ناحێ ڤە

**جهێن گەشت و گوزاری و شوینواری:**

ل سنوورێ ناحیا دینارتە چەندین جهێن گەشت و گوزار هەنە، وەك هاڤینگەهێن: گریش، گویسکێ، سویلێ، گەلی زەنتە، گەلی سپیندار، گەلیێ زێوە، کورتکا، گویسکێ، کانی توزێ، مێرگەرەش، شەهێ، دوبیرێ، ئەرتون و ... جهێن دی، هەروەسان چەندین جهێن کەڤنار و شوینواری وەك: شکەفتا چاربۆت، شکەفتا سوسێ، مزگەفتا مێردڤیان، گرێ عەمەری و کەڤنە دێرێن گوندێن: گریش ژووری، دڤری، سیان، شکەفتێ و دوودی ژووری لێ هەنە.

دینارتە



# گوندێن ناحیا دینارتە

بێوار حسێن زێباری

## بازێرکێ دینارتە:

دینارتێ دکەڤیتە ناڤبەرا زنجیرا چیایێن سەرێ ئاکرێ و سەرێ سادا ژ ئالیێ باشوور و چیایێ پیرس ژ ئالیێ باکوور و گرێ (عمر) ژ ئالیێ رۆژهەلات و گرێ (جەواد)ی ژ ئالیێ رۆژئاڤای ب دووراتییا (١٩کم) ژ بازێرێ ئاکرێ..

## سنوورێن دینارتە :

**باکوور:** چیای پیرس و گوندێ بیراکەپرا

**باشوور:** سەرگەلی

**رۆژهەلات:** گوندێ ئامادا ژووری و ئامادا ژێری و بەرۆژا زاوا

**رۆژئاڤا :** مەرزینگان

بازێرکێ دینارتە مەلبەندێ ناحیێ یە و هەروەك هاتییەدیارکرن ل سالا ١٩٥٥ کارگێریا ناحیێ ژ گوندێ بیرەکەپرا هاتییە ڤەگوهاستن بۆ گوندێ دینارتە، و ژ هنگی وەرە سەرەرای کاودانێن سەختێن ب سەر دەڤەرێدا هاتین دینارتە هێدی هێدی ژ گوندەکیڤە بەرەڤ بازێرکەکێ بچووك کەتییە رێ و ل سالا ١٩٧١ێ بازێرڤانی ل دینارتە هاتییەڤەکرن و ل سالا ١٩٨٦ێ هاتبوو هەلوەشاندن هەتا ل سالا ١٩٩٨ێ سەر ژ نوو بازێرڤانی ل دینارتە هاتییەڤەکرن و نها سنوورێ بازێرڤانییا دینارتە ٥٤٨ دۆنمە و پێنج تاخ: ئاشتی، ئازادی، خەبات، برایەتی و سەرهلدان ل بازێرکی هەنە، زێدەباری بازارەکی کو ب سەدان دوکانێن جۆراوجۆر ب خۆڤەدگریت کو تێرا دینارتە و دەڤەرێن سەر ب وێ ڤە پێدڤیاتییان دابیندکەن، هەروەسان شەش مزگەفت و پێنج کارگەهێن ئەلەمنیۆمی و شەش کارگەهێن پلاستیکی (PVC) بۆ دروستکرنا دەرگەهـ و پەنجەران لێ هەنە.

## پێکهاتا بازێرکێ دینارتە:

خەلکێ دینارتە ژ هەردو عەشیرەتێن زێباری و سۆرچی پێکهاتینە

## ژێدەرێن ئاڤا دینارتە:

١- **کانییا فەلا:** ژێدەرێ سەرکیێ پرۆژەیێ دابەشکرنا ئاڤێ یە ل دینارتێ .

٢- **کانییا میرا:** بو ڤەخوارنێ و ئاڤدانا هندەك بیستانا بکارتێت .

٣- **کانییا ژنا:** بو شوشتنا کەل و پەلێ ناڤمالێ و نڤێژکرنا ژنا بکارتات .

٤- **کانییا خانێ:** بو ئاڤدانا ئاژەلان .

٥- **کانییا فەقیا:** بەرێ بو ڤەخوارنێ بکارتات و نها ئاڤدانێ لبەر دکەن .

٦- جوکەکا ئاڤێ ژ سەروکانییا گرییش دهێتە دینارتێ بو ئاڤدانا رەز و باغا و کرنا برنجی.

یەکەمین خواندنگەها سەرەتایی ل سالا ١٩٥٦ێ ل دینارتە هاتیبەڤەکرن، نها ٢ خواندنگەهێن بنەرەتی و سێ ئامادەیی (کوران، کچان و ئێڤاران) و باخچەکێ ساڤایان و ئامادەییەکا ئیسلامی (ژ یەکێ ناڤنجی هەتا شەشێ ئامادەیی) ل دینارتە هەنە.

## گوندێن دینارتێ:

دۆلا نەهلێ کو دکەڤیتە باشوور و رۆژئاڤایا دینارتێ چل و هەشت گوندان بخۆڤە دگریت، گەلەك ژ ڤان گوندان دکەڤندا مەسیحی بووینە و نها ژی شوینوارێن دێرێن وان ل ژمارەکا ڤان گوندان ماینە، مینا (گرییش، دڤری، سیان، شکەفتێ و هەشتکا) و نها ژی مەسیحی ل هژمارەکا وان گوندان مینا (کەشکاوا، دووپرێ) ماینە، خەلکێ نها یێ ل سەر ڤان گوندان ژ دۆلا زێبارێ هاتینە، پتریا ڤان گوندان ئاڤی نە، و ژیانا زۆربەیا خەلکێ وی ل سەر چاندنا رەز و باغانە، تایبەت ل گوندێن گرییش ژێری و ژووری و دڤری و هەردو سیانان و هەردو ئەرتونا و بامشمش، هەر وەسا خودانکرنا مەر و مالاتی پشکەکا زۆرا ژیانا خەلکی دابین دکەت، گوندێن (گویسکێ و هەردو گرییش و شەهێ و بامشمش) د بەرنیاسن ب گویزا، گوندێن (دۆستەك و کاڤلکا) کو ل بلنداهییا چیای نە د بەرنیاسن ب چاندنا سماقا سپی و باشترین سماقا کوردستانێ لڤان گوندانە، پرانییا خەلکێ ڤان گوندان ژ عەشیرەتا زێبارییانە، دگەل هژمارەکا کێما سۆرچییان ل ناڤەندا دینارتێ، بەری هەوێن وێرانکرنا گوندان ل سالێن هەشتییان پتریا گوندان ل سەری و دووری رێ یێن سەرەکی بوون، لێ نها هاتینە سەر رێیا گشتی یا دۆلا نەهلێ و چ گوند نینن بێ کارەب و پتریا گوندان پشتی ئاڤاکرنێ ب چەند سالەکێن کێم، ئەو نەبن یێن دو سێ مال، مزگەفت و خواندنگەهـ لێ هاتینە دروستکرن.

## گوندێ بیرەکەپرا:

ئەڤ گوندە دکەڤیتە پشت چیای پیرس ب دووریا نێزیکی (٢٠کم) باکوورێ ناحیا دینارتە، ناڤێ گوندی ژ دوبرگان (بیر+ کەپر) پێکهاتییە و دبێژن ب ڤی ناڤی هاتییەناڤکرن چونکی جهێ گوندی واریوو و بەری ببیتە گوند خەلك دچوونە وێرێ و بیر و کەپر بۆ مەبەستا ئاڤدان و خودانکرنا مالاتی لێ چێدکرن و ب جهـ دبوون، پرانییا خۆجهێن وی هەر بیراکەپری نە، نها نێزیکی (٥٠) مالا لێ هەنە و ئاکنجیێن وێ نێزیکی (٣٠٠) کەسانە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ سەرکێ .

**باشووری:** سەنتەرێ ناحیا دینارتە.

**رۆژهەلاتی:** ناحیا بلێ و گوندێ سەفتێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ هەرنێ.

### پێکهاتا گوندی:

هەمی خەلکێ گوندی بیرەکەپرینە و ڤان مالباتان بخۆڤەدگریت: مالا تاها و مالا عەموی و مالا هادی و مالا ئاغا و مستەفا ربانی.

ل دووڤ سالنامێن ئوسمانی و گۆتنێن خەلکێ گوندی ئەڤ گوندە دکەڤندا مەلبەندێ قەزا زێبار بوویەو ل دووڤ سالنامێن ویلایەتا مووسل یا ئوسمانی یێن سالا ١٨٩٢ و ١٨٩٤ێ بیرەکەپرا مەلبەندێ قەزا زێبار بوو، هەردو ناحیێن شێروان و مزووری ژووری سەر ب ڤێ قەزایێ ڤە بووینە، گوند ب خۆ ٧٠- ٨٠خانی بوو، هەروەسان د پەسنا گوندێ بیرەکەپرادا دبێژیت: کانیێن ئاڤا تەزی و خوش لێ هەنە، سەقایێ وێ د هاڤینێدا ژ گوندێن دیتر فێنکترە[1]، ئەڤ سەروبەرێ کارگێری بەردەوام بوویە هەتا سالێن چلان ل دووڤ ئیرادا مەلکی هژمار ٦٦٥ ل ٢٠ کانوونا ئێکێ ١٩٤٤ێ ناحیا بیرەکەپرا ژ قەزا زێبار هاتینەڤەقەتاندن و داینە دگەل قەزا ئاکرێ و قەزا زێبار ب هەردو ناحیێن بارزان و مزووری ژووریڤە داینە دگەل لیوا هەولێرێ[2] ل

دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ گوندێ بیرەکەپرا ٤٠٥ کەس بوون[٣].

ژ روودانێن مێژوویی یێن ڤی گوندی کوشتنا هەردو ئەفسەرێن بریتانی بوون (کاپتن بیل و سکوت) ژ لایێ زێباری و بارزانییان ڤە ل ١٢ چریا ئێکێ سالا (١٩١٩)ێ.

ئەڤ گوندە چەندین جاران ژلایێ حکۆمەتێن عیراقێ ڤە هاتییە وێرانکرن. و پشتی ئەنفالێن سالا (١٩٨٧)ێ هاتەڤە وێرانکرن، و چۆل بوو هەتا سەرهلدانا سالا (١٩٩١)ێ ب سەرداهاتی. سالا (١٩٩٢)ێ هاتەڤە ئاڤاکرن تانوکە ئاڤایە ئەڤ گوندە ب هاریکارا حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ و رێکخراوێن خێرخواز بتایبەت (K.R.O) هاتەڤە ئاڤاکرن، نها مزگەفت لێ هەیە کو ل سالا (١٩٩٨)ێ هاتییە دانان و خواندنگەکا بنەرەت ژی ل سالا (١٩٩٢)ێ هاتییە دامەزراندن و سالا ٢٠٠٠ێ دا کارەب ژی گەهشتیە گوندی .

## ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

کانیا بیرکا سینا، کانی کفر، بیرکاشەکا، ئافیلوکا، کانی سارکێ، کانیا شانیکێ.

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیانا پرانیا خەلکێ گوندی ژبلی پێشمەرگاتیێ ل سەر خودانکرنا مەر و مالاتی و چاندنێ و چنینا سماقێ یە، چونکی عەردێ ڤی گوندی تا رادەیەکی دەشت و چیایە. ژ بەرهەمێن وان (سماق و تری و دەخل و جەهـ و نیسك)، پشتی سالا (١٩٩٢)ێ و دووریێچا ئابووری هەتا رادەیەکێ باش خەلکی (برنج) ل بەر کانیا شانیکێ کو دکەڤیتە ژێریا رۆژهەلاتێ گوندی ب دووریا نێزیکی (٣کم) و نێزیکی رووبارێ زێ مەزن دکرن، کو کانیەکا بۆش و سار و ناڤدارە، لێ ژبەر هشکەسالیا داوییا سالێن نۆتان ئەڤ کانیە کێم بوویە و ژ سالا (٢٠٠٠)ێڤە بوویە جهەکێ گەشتیاری.

## گوندێ پرێسە:

دکەڤیتە سەر لێڤێن رووبارێ زێی، ل سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ گوندی ١٨٨ کەس بوو، نها ئاکنجیێن وی دۆرێن (٤٥٠) کەسانە و پتریا (٨٠)

گوندێ پرێسە:



مالا (خانی) نە و نێزیکی (٦٠) سەرۆك خێزانن. رامانا ناڤێ گوندی ژی (سێ برا و پرێ) هاتییە.

**باکووری:** گوندێ بارزانە.

**باشووری:** گوندێ جۆنێ

**رۆژهەلاتی:** باژێرکێ بلێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ هنارێ.

## پێکهاتا گوندی:

گوندەکێ بەرنیاسە ب ئۆلدارێ، مەزنترین کەسایەتیێ دەڤەرێ (شێخ جبرائیل کورێ شێخ حەسەن کورێ شێخ تاهر کورێ شێخ جبرائیل کورێ شێخ جەلال کورێ شێخ جبرائیل، کو ب (پیر جب) دهاتە نیاسین، ل سالا (١١٦٥مش/١٧٥٢ز) خەلکێ گوندێ پرێسە ل دەڤەرا زێبار هاتییە ئاکرێ و سەرپەرشتیا ب سەدان چەکدارێن دەڤەرێ چوویە وەلاتێ مسرێ بۆ شەرێ دژی فەرەنسیا و سەرکەڤتن بدەستڤە هینانە، ژبەر کو ئەڤ گوندە دکەڤیتە نێزیکی رووبارێ زێ مەزن خەلکێ ڤی گوندی ب مەلەڤانیان دهێنە نیاسین و خەلکی ڤی گوندی ب شێخ دهێنە نیاسین و د بێژنێ شێخێن پریسە .

پشتی گوند ل سالا (١٩٨٥)ێ هاتییە وێرانکرن، ڤان سالان دەمێ سەرژنوو هاتییە ئاڤاکرن گوند هاتە ڤەگوهاستن بۆ جهەکێ نێزیکتر ژ رووبارێ زێی، ژ ئاڤاهیێن بەرچاڤێن گوندی: مزگەفتا ل سالا (١٩٩٩)ێ و خواندنگەهـ ل سالا (٢٠٠٠)ێ لێ هاتینە ڤەکرن. سالا ٢٠٠٠ێ کارەب گەهشتییەگوندی و ئاڤا گوندی ژی ژ رووبارێ زێی دهێت[٤].

گوندێ هەرنێ:



## گوندێ هەرنێ:

ئێکە ژ گوندێن مەزن ل دەڤەرێ، دکەڤیتە د ناڤبەرا گوندێن پیراکەپرا و بازێ و بازا قرنەی، ب دووراتییا (١٨کم) ژ مەلبەندێ ناحیا دینارتە، ژ کەڤن وەرە ئەڤ گوندە ژ گوندێن مەزنێن دەڤەرا زێبار بوویە، ل سالا ١٩٥٧ێ ٥٥٣ کەس ل ڤی گوندی دژیان[٥]، نها زێدەتر ل (٢٢٥) سەر خێزانان لێ هەنە، ژمارا ئاکنجییێن وێ دوورێن (٩٠٠) کەسانە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ پرێسە.

**باشووری،** گوندێ کریش ژووری و ژێری و مەرزینگانێ

**رۆژهەلاتی،** گوندێ بیراکەپرا.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ بازێ.

### پێکهاتا گوندی:

دکەڤندا جوی و مەسیحی دگەل موسلمانان ل ڤی گوندی دژیان، نها ژی شوینوارێن دێرێ لێ ماینە، هەرنێ نها ل سەر سێ ئویچاخێن سەرەکی دابەش بووینە، ئەو ژی (کورە شەر، ناڤگوندی، مالە ژێری) و بنەمالێن گوندی ژی ژ (مەلا موسی، زەر، شێر، سعو ، ئانی) پێکهاتینە، هەورەسا هندەك مالێن دیتر لێ هەنە ژ گوندێن وەکــ (هناری و بازی و ساکی .... هتد) قەستا گوندی کرییە.

ئەڤ گوندە مینا هەمی گوندێن دەڤەرێ چەندین جاران هاتییە وێرانکرن، داوی جار ل سالا (١٩٨٥)ێ بوو کو هاتییە وێرانکرن و خەلکێ وێ هندەك بەرەڤ ئیرانێ چوون و هندەك هاتنە دەڤەرا نەهلێ. سالا (١٩٩٢)ێ هاتییەڤە ئاڤاکرن، د کەڤندا ژمارەکا زۆرا بیرێن ئاڤێ لێ هەنە..

### شوینوارێن گوندی:

ل گۆڕستانا گوندی ترێن کەڤن و کێلیێن نەخشاندی هەنە کو دیرۆکا وان دزڤریتە بەری زێدەتر ل (٣٠٠) سالان. (مستەفا زیبر) کو ب (مستەفای زیوی) د هاتە نیاسین کەسەکێ دیرۆکنیاس و حسابدارەکێ بەرنیاس بوو ڤەگێرایە ئەڤ کێلیبە ژلایێ کەسەکێ خەلکێ ڤی گوندی ب ناڤێ (ئــەولاد) هاتینە نەخشاندن، ئێك ژ شارەزایێن ڤی کەسی ل حسابێ (بیرکاریێ) ڤەگێرایە: (ل فلان رۆژێ بەری نیڤرۆ هەرنە ناڤ رەزێن تری هیچ تلییەکا بالەتە نابینن و پشتی نیڤرۆ هەتا ئێڤاری دێ بالەتە بیت)، ئانکو دزانی ل کیژ رۆژێ تری دێ گەهیت، ئەڤ چەندە پراکتیك کرییە و وەسا دەرکەفتییە ل حسابا سالێ ژی زۆرێ شارەزا بوو.

### زێدەرێن ئاڤا گوندی:

بۆ ئاڤدانا مەر و مالاتی مفا ل بێرمێن ئاڤێ وەرگرتینە کو دو بێرم هەنە، و بۆ ڤەخوارنێ ژی بیر ب کارئینایەنە کو ب سەدان بیرێن ئاڤێ لێ هەنە، خەلکێ گوندی دیرۆکا درۆستکرنا وان نزانن.

### زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیانا زۆربەیا خەلکی ل سەر خودانکرنا مەر و مالاتی و چاندنا سماق و تری و دەخل و جەهی یە، تایبەت سماقێ کو ب رێژەکا زۆر ژێ دهێت. سالا (١٩٥٥)ێ ئێکەم جار خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن و مزگەفت ژی ل سالا (١٩٩٠)ێ هاتییە دانان. نها چوار مزگەفت و بنگەهێ ساخلەمیێ لێ هەنە[٦].

## گوندێ بازێ:

ئەڤ گوندە دکەڤیتە رۆژئاڤایا گوندێ هەرن ب دووریا نێزیکی (٣کم)، عەردێ وی پتر چیایی یە و هەتا نها نەهاتییە ئاڤاکرن، دبیت گوندەکێ بچوك بوویە، دو گوندێن نێزیکی ئێك ب ناڤێن (بازا گەلی و بازا قرنە) هەنە، رەنگە هەردو دکەڤندا هەر ئێك بن و ژبەر هەبوونا کانیێ ل گوندێ بازا قرنەی وەکی وار ل هاڤینان هاتبیتە بکارهینان[٧].

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ هناری.

**باشووری،** گوندێ شکەفتی

**رۆژهەلاتی،** گوندێ هەرنێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ هۆکێ.

خەلکێ ڤی گوندی د سالێن هەشتێیان دا هاتینە ڤەگوهاستن بۆ گوندێ سەرگەلی نێزیکی دینارتێ و پاشان بۆ باژارێ مووسل، نها زۆربەی وان ل دەوروبەرێن ئاکرێ ئاکنجینە.

ژیانا زۆربەیا خەلکی وی ل سەر خودانکرنا مەر و مالاتی و چاندنا سماق و تری....بوون.

د سەرژمێریا سالا ١٩٥٧یدا دو گوند ب ناڤێ بازێ گەلی هژمارا خەلکێ وی ٤٩ کەس بوو و بازێ قورنە هژمارا خەلکێ وی ١٢٦ کەس بوو هاتینە تۆمارکرن[٨].

## گوندێ هنارێ:

گوندەکێ چیایی یە، دکەڤیتە باکوورێ رۆژئاڤایێ بازێ ل بەرۆژێ چیایێ سەرێ سۆرێ، ژ گوندێن مەزنێن دەڤەرا زێبار بوو، ل سالا ١٩٥٧ێ ٢٠٧ کەس ل گوندی دژیان[٩]، پشتی کو د سالێن شێستاندا گوند هاتیەبەردان هەتا نها نەهاتیە ئاڤاکرن و گوندەکێ چۆلە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** رووبارێ زێی- دەڤەرا بارزان.

**باشووری:** گوندێ بازا قرنێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ پرێسە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن شنی و خۆشنا و هۆکی.

### پێکهاتا گوندی:

پشکەکا ئاغایێن زێباریان لێ بووینە، ب تایبەت مالا (حەجی ئاغا)، پشتی گوند هاتیە وێرانکرن هێژ نەهاتیە ئاڤاکرن، خەلکێ گوندی ل ئاکرێ و دینارتێ و گوندێن (گریش و ئەرتون و سوسنا و سەرگەلی) بەلاڤبووینە.

### ژێدەرێن ژیارا گوندی:

گوندەکێ کێم ئاڤ و بچویکە و عەردێ چاندنێ یێ کێمە، ژیانا خەلکێ پتر سەر خودانکرنا مەر و مالاتی و بەرهەمێن چیایی تایبەت تری و سماق و هرمیا بوویە و شکەفتێن زۆر و جوان ل گوندی هەنە[١٠].

گوندێ هویکێ:



## گوندێ خۆشانا:

گوندەكێ چیایی و كێم ئاڤە ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ ١٤٥ كەس ل گوندی دژیان[11]، ل سالێن شێستان گوند هاتییەبەردان هەتا نها نەهاتییە ئاڤاكرن، دكەڤیتە نێزیكی گوندێ هناری و جوگرافیا ڤان هەردو گوندان یا نێزیكی ئێكە، خەلكێ وی نها ل دینارتێ، دریێسا، گردەسێن، گریش دبەلاڤن و خەلكێ وی ب كارێ چاندنا تری و سماق و هرمیا رادبن.

### سنوورێن گوندی :

**باكووری،** گوندێ هنارێ.

**باشووری،** گوندێ هۆكی.

**رۆژهەلاتی،** گوندی هناری.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ شنی یێ.

### زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

چونكی دەڤەرەكا چیایی بوویە، ژیارا وان یا ب زەحمەت بوو، پتر ل سەر خودانكرنا مەرو مالاتی بوویە[12].

## گوندێ هویكێ:

گوندەكە دكەڤیتە سەنتەرێ دۆلا زێبارێ دناڤبەرا بازا قرنەی و چاربووت، بەرۆڤاژی زۆربەی گوندێن ڤێ دۆلێ تا رادەیەكێ گوندەكێ ب ئاڤە و پشكەكا زۆرا ئاغایێن زێباریان ل ڤی گوندی بووینە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێن چالیێ و خۆشانا .

**باشووری،** گوندێ كاڤلكا.

**رۆژهەلاتی،** گوندێن بازێ و هنارێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ چاربووتێ.

### پێكهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە دكەڤندا گوندەكێ مەزن بوویە ل سالا ١٩٥٧ێ ٤٣٣كەس ل گوندی دژیان[13]،و جهێ ئاغا و پساغا و كرمانجا بوویە، زۆربەیا ئاغایێن زێبارییا ل ڤی گوندی بووینە، ب تایبەت مالا (ئەحمەد ئاغا)، ل دەسپێكا سالێن شێستان هاتییە وێرانكرن، ل ناڤەراستا سالێن حەفتییان دوبارە هاتییەڤە ئاڤاكرن، ل ئەنفالێن سالا (١٩٨٨)ێ ب ئێكجاری هاتییە وێرانكرن، نها چوار پێنج مالەكێن خودان مالات و بۆ چاندنێ لسەر گوندی نە، ژمارا ئاكنجییێن وی نێزیكی (٣٠) كەسانە. ل سالا (٢٠١٣)ێ كارەبا گەهشتیێ و مزگەفت ژی ل سالا (٢٠١٣)ێ هاتییە ئاڤاكرن، خەلكێ دی یێ ڤی گوندی ل دینارتێ، گیرە، مووسل و ئاكرێ و سەرگەلی و مەزرینگان و بەردەرەش و دهۆك و زۆر جهێن دن دژین. ل سالێن (١٩٥١ – ١٩٥٢) ێ خواندنگەهـ لێ هەبوویە بەلێ نها لێ نینە.

ژ شوینوارێن گوندی ژی گرێ مەزن و كاڤلێن گوندی و گومبەتەك وەك گۆرستان هەیە.

### شكەفتێن گوندی:

ژمارەكا زۆرا شكەفتان لێ هەنە، ناڤدارترینێن وان: شێل، نەهانكا، لاڤا، سالیا، بەرێ سور، ماسی... هتد.

### زێدەرێن ئاڤا گوندی:

ژ زێدەرێن ئاڤێ ژی ل گوندی چەند بیر و بێرم بۆ ئاڤدانا مەر و مالاتی لێ هەنە، هەر وەسان كانی ژی لێ هەنە، ژ وان كانیێن هەتا نها ئاڤ تێ دژێت: سالیا، شیڤا قەلا، كانەبی، گراڤێ، رەزا، بیكی، كانییا گوندی، بوتێ... هتد.

### زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

گوندەكێ خودان چەندین زەڤیێن چاندنێ یە ب تایبەت دەخل و جەهـ و نیسك و نۆك و تری و سماقێ، زێدەباری خودانكرنا مەر و مالاتی خەلكێ گوندی د كەڤندا تری د برە دەشتێ و هەتا مووسلێ دچوون و تریێ خۆ ب دەخل و دان و برنج و هندە پێدڤیێن دیتر دگۆهارت[14].

گوندێ چاربووت،



## گوندێ چاربووت:

ئێكە ژ گوندێن مەزنێن دەڤەرا زێبار، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلكێ گوندی ٢١٣ كەس بوون[١٥]، گوندەكێ كێم ئاڤە و دكەڤندا مفا ژ ئاڤا زڤستانێ د ناڤاسێریجاندا وەرگرتییە و شوینوارێن دێرین لێ هەنە، ل دووڤ گۆتنێن دیرۆكنڤیس و شوینوارناس (عەبدۆلرەقیب یوسف) شوینوارێن پەرستگەهێن ئایینێ میترایی ل ڤی گوندی هەنە و دامەزرێنەرێ دەولەتا دۆستەكی یا كوردی (باد كورێ دۆستەك) خەلكێ ڤی گوندی بوو، د چەند ژێدەرەكاندا ئاماژە ب كەڤناتییا ڤی گوندی هاتیە كرن، ل سالا (١٦٢٠)ێ یوسف بەگ باپیرێ مەزنێ مالباتا ئاغایێن زێبار ل ڤی گوندە وەغەرا داوی كرییە[١٦]. ئەڤ گوندە ل سەردەمێ شۆرشا گولانێ ل سالێن هەشتییان هاتیەئاڤاكرن و خەلكێ گوندی لێ نیشتەجێبووینە، بەلێ د هەوا ئەنفالاندا د ناڤبەرا ٨/٢٥- ١٩٨٨/٩/١٥ێ گوند هاتییەوێرانكرن و خەلكێ گوندی مشەختبووینە، پشتی سەرهلدانێ و هەتا سالا (٢٠١٣)ێ تنێ چەند مالەك زڤرینەڤە سەر گوندی، لێ پشتی جادە و كارەب گەهشتینێ و پرۆژەیێ ئاڤێ ژی بۆ هاتییەچێكرن، دەمێ بەرهەڤكرنا ڤێ نڤیسینێ ل داوییا ٢٠١٦ێ پتر ژ (١١) خێزانان زڤرینەڤە گوندی كو ژمارا ئاكنجییان (٧٥) كەسن و ژمارەكا زۆرا خەلكێ ڤی گوندی ل دەڤەرا سۆرچییان و مەخمۆر و دەشتا هەولێرێ و ئیران و توركیا و دینارتێ و گوندێ گرییش و ئاكرێ دئاكنجینە، گوند ژ چەند بنەمالان پێكدهێت ژ وانا: بنەمالێن تیلە و علی و حسو محمد و دكەڤندا مزگەفت هەبوویە و مالا شێخێن چاربووتیان برێڤە برییە.

## سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێن چالی و بانیێ.

**باشووری،** گوندێن كاڤلكا و دۆستەك.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ هۆكی.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ گورگاڤێ.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ڤی گوندی عەردەكێ بەرفرەهـ یێ چاندنێ و مالداریێ هەیە و هندەك بیرێن ئاڤێ لێ هەنە، ژیارا خەلكێ وی ژی ل سەر مەرو مالاتی یە، هەروەسا رەزێن تری و سماق و باغ ژی هەنە.

- سالا (٢٠١١)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەكرن.

## گوندێ چالێ:

گوندەكێ كەڤناره و شوینوارێن كەڤن لێ هەنە، دكەڤیتە باكوورێ رۆژهەلاتێ چاربووت ب چیایێ سەرێ سۆرێ ڤە، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ ١٨٠ كەس ل ڤی گوندی دژیان[17]، پشتی گوند ل سالێن شێستان هاتییەبەردان هەتا نها نەهاتییە ئاڤاكرن و خەلكی وی ل بلێ و گریش و دینارتێ و ئاكرێ و سۆران ئاكنجیبووینە. زارەكی دهێتە ڤەگێران كو دكەڤندا گوندێ چالیێ میر هەبووینە و دەسەلاتداری دەڤەرێ كرییە، لێ دیرۆكا وان نەهاتییە زانین.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** خلانا و گوندێ شنیا ژێری.

**باشووری،** گوندێن هۆكی و چاربووت.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ شنیێ ژووری.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ بانیێ.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

چونكی پرانییا عەردێ ڤی گوندی چیایی یە و بۆ چاندنێ یا بزەحمەتە، لەوما ژیارا خەلكێ وی پتر ل سەر چاندنا تری و سماق و مەرو مالاتی بوویە و بیرێن ئاڤێ ژی بۆ وێ چەندێ لێ هەنە[18].

## گوندێ شنی ژووری:

دكەڤیتە د ناڤاد گەلیەكی دا هەر ب ناڤێ گوندی ل چیایێ سەرێ سۆرێ، دكەڤندا گوندەكێ بەرنیاس بوویە ب درۆستكرنا (شەل و شەپكێن كوردی). شوینوارێن مزگەفت و خواندنگەها ئایینی لێ هەنە و زۆر زانایێن ئایینی و رەوشەنبیری لێ رابووینە، مینا زانا و هەلبەستڤان (خالد ئاغایێ زێباری) خودانێ بەیتا سیسەبانێ و (الزواخر) كو دیوانەكا هەلبەستێ بوو ب زمانێ عەرەبی و پێكدهات ژ (٤٧٦) مالكا و تەجویدا كوردی و دیوانا هەلبەستێ ب زمانێ كوردی، باپیرێ وی خالدێ ئێكێ چوویە باكوورێ كوردستانێ ل میرگەها بۆتان و كەسایەتیەكێ نێزیكێ میر بەدرخان بوویە و ل سەر هەلویستێن وی و نێزیك بوونا وی ل مالباتا بەدرخانیان ژلایێ (رەشید پاشایێ ئوسمانی) هاتییەگرتن و ل گرتیگەها ئامەدێ چوویە بەر دلوڤانیا خودێ، نەڤیێن وی نها ل رۆژهەلاتێ كوردستانێ نە، ئەڤ گوندە مینا گوندێن دیتر یێن دەڤەرێ گوندەكێ كێم ئاڤە و خودان چەند بیرێن ئاڤێ یە. ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلكێ گوندی ٤١٨ بوون[19]، پتریا ١٠٠ خانیان لێ هەبوون، ژ دو ئوچاخان پێكدهات، دو مزگەفت هەبوون، یا مەزن ل (١٩٣٠)ێ یا بچووكتر سالا (١٩٤٥)ێ هاتینە ئاڤاكرن، د مزگەفتێدا خواندنگەها ئایینی هەبوو وی دەمی ٩٥ فەقی هەبوون، ژ هەمی گوندا هەتا ئاكرێ ژی بۆ خواندنێ قەستا ڤی گوندی كرییە، ل ڤی گوندی كارێ چێكرنا دۆشاڤێ دهاتەكرن، هندەكان ژی پیشەسازیا پێلاڤ و جلكێن كوردی دكرن، نێزكی ٢٠ بیرێن ئاڤێ هەنە و ئێك كانی، ئەو ژی دگوتێ كانییا مری و سێ ئاش ب ناڤێن: بیرا كەپرێ و خالانە و بیاڤێ ل گوندی هەبوون، گوند ل سالا (١٩٦١)ێ هاتییە بەردان و هەتا نها نەهاتییەئاڤاكرن.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ شنی ژێری.

**باشووری،** گوندێ هۆكێ.

**رۆژهەلاتی،** گوندێن خۆشنا و هنارێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ چالی یێ.

### زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ئەڤ گوندە ژی یێ كێم ئاڤە و ب تنێ كانییەك و چەند بیرێن ئاڤێ لێ هەنە، ژیانا وان ب رەنگەكێ گشتی و هەر دكەڤندا ل سەر مەرومەلات و بەرهەمێن چیایی بوویە، مینا گوهیشك و كەزان و كورۆسكا، هەتا نها نەهاتییە ئاڤاكرن[٢٠].

## گوندێ شنی ژێری:

گوندەكە دكەڤیتە نزارێ سەرێ سۆرێ ل بەرامبەر دەڤەرا بارزان ل سەر رووبارێ زێ مەزن، خەلكێ ڤی گوندی هەر ل گوندێ شنیا ژووری هاتینە، ل بەراهیێ وار بوویە پاشان بوویە گوند و گوندەكێ بچووكە، ئەو ژی ل سالا (١٩٦١)ێ هاتییەبەردان و هەتا نها نەهاتییە ئاڤاكرن.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ سەورە.

**باشووری،** شنی ژووری.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ هنارێ.

**رۆژئاڤایی،** خالانا.

ژیارا خەلكێ گوندی د دەمێ خۆدا ل سەر مەرو مالات و سماق و بەرهەمێن چیایی بوو[٢١].

## گوندێ گورگاڤێ:

گوندەكێ بچویك و كێم ئاڤە، دكەڤیتە د ناڤاگەلیەكێ دا ل باشوورێ رۆژئاڤایێ گوندێ چاربووت، پشتی ل سالێن شێستان هاتییەخرابكرن و بەردان هەتا نها نەهاتییە ئاڤاكرن، خەلكی وی نها ل چەند جهان مینا: دینارتێ، ئاكرێ، بەردەرەش... و زۆر جهێن دی د بەربەلاڤن. تنێ بۆ بۆ شینكرنا عەردی و بەرهەمێن سرۆشتی قەستا گوندی دكەن.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ بانیێ.

**باشووری،** گوندێ دۆستەك.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ چاربووت.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ گادانا.

### ژیارا گوندی:

ژبەر كو گوند بۆ ئاڤێ پشت بەستنێ ل سەر بیرێن ئاڤێ دكەت، لەوما ژیانا خەلكێ وی پتر ل سەر مەر و مالاتی وچاندنا دێم مینا تری و سماقێ بوو، ژیار ل گوندی یا زەحمەت بوویە ئانكو بەرفرەهـ نەبوویە، ئاڤ ژی وەك بیر بێن هەی .

## گوندێ گادانا:

گوندەكێ مەزن بوویە، د سالێن شێستاندا ژ سەدسالییا بووری هاتییە خرابكرن و هەتا نها چۆلە، دكەڤیتە رۆژئاڤایێ گوندێ گورگاڤێ و دكەڤندا مال مەلا لێ بووینە وەكی مەلا پیر، پرانییا خەلكێ گوندی نها ل گریش ژێری، كۆمەلگەها گریش، هەشتكا، ئەرتون ژووری، گومانا، گوهانا، بامشمش، دوودی ژێری ل سنوورێ دینارتێ دبەربەلاڤن و پشكەك ژی ل ئاكرێ و بەردەرەش و ئالەیی د ئاكنجینە.

د دەمێ خۆدا یەك ژ مەزنترین گوندێن دەڤەرێ بوو نێزیكی (٥٠٠) خانی لێ هەبوون، و ژ چەندین بنەمالان پێكدهات ژ وانا بنەمالێن: حەدوو، لاسو، مال مەلا، جلال، حجم، بەكرك، حەجی سمایل، شل...هتد.

سماقا ڤی گوندی یا ناڤدارە و رەنگ سپی رەنگ كیڤە زەرە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێن بانیێ و نپاخی.

**باشووری،** گوندێ مێرداڤیا.

**رۆژهلاتی،** گوندێ گورگاڤێ.

**رۆژئاڤایی،** دەڤەرا شاری.

### زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

چونكی جهێ گوندی یێ تەنگ و كێم ئاڤ بوویە، لەوما ژیارا خەلكێ وی هەر دكەڤندا و هەتا نها ژی

ل سەر خودانکرنا مەرو مالات و سماق و تری یە. و پێنج کون بەفر، ئانکو جهێن بەفر هەلگرتنێ بۆ هاڤینێ هەبوون[22].

## گوندێ نپاخی:

ناڤێ گوندی ژ (بێ بیستان ئانکو هشکــ و بێ باخ ) هاتییە، ئەڤ گوندە گوندەکێ دوورە دەست و ڤەدەرە لەوما د هەموو دەماندا خەلکەکی بۆ پاراستنا خۆ قەستا ڤی گوندی کرییە.

گوند ژ سێ بنەمالان پێکدهات، بنەمالێن: حجی و ژێری و ئاغا، نێزیکی ٦٠ مال بوون دبوونە نێزیکی ٤٠٠ کەسان، سالا (١٩٥٣)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییەڤەکرن، ئەڤ گوندە ل سالا (١٩١٩) ێ هاتییەبەردان، پشتی هاتییەڤەئاڤاکرن جارەکا دی ل سالا (١٩٦١)ێ هاتییەبەردان و هەتا نها نەهاتییەئاڤاکرن.

### سنوورێن گوندی :

**باکوور،** گوندێ هلۆرا

**باشوور،** گوندێ کادانا

**رۆژهەلات،** گوندێ بانی

**رۆژئاڤا،** گوندێ لاتکا

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

گوندەکێ کێم ئاڤبوویە و ژێدەرێ ئاڤا گوندی بیربوون و ژیارا گوندی سەر خودانکرنا مەرو مالات و متای هشك بوویە[23].

## گوندی بانیێ:

ژ گوندێن مەزنێن دەڤــەرا زێبار بوو، ل دووڤ سەرژمێریا عیراقێ یا سالا ١٩٥٧ هژمارا خەلکێ گوندی ٤٧٦ کەس بــوون[24]، ژ پتر ژ ١٢ بنەمالان پێکدهات، نێزیکی (٩٠) مال و بەری ل سالا ١٩٦١ێ بێتەبەردان دورێن (٥٠٠) کەسان لێ دژیان، سالا (١٩٢٠)ێ مزگەفت ل گوندی هاتییەئاڤاکرن، سالا (١٩٦١) ێڤە هاتییەبەردان و نەهاتبووئاڤاکرن هەتا سەردەمێ شۆرشا گولانێ، ل سالێن هەشتییان ژ سەدسالییا چوویی هندەك ژ گوندییان زڤرینەڤە سەر گوندی و لێ ئاکنجی بوون، سالا (١٩٨٨)ێ بەری دەسپێکرنا ئەنفالان (٢٥) خێزان لێ دژیان، د ناڤبەرا ٨/٢٥- ١٩٨٨/٩/١٥ێ گوند ب خێزانێن تێدا کەتنە بەر هەوا ئەنفالان و خەلکێ وی مشەخت و ئاوارە بووڤە[25] و هەتا نها نەهاتییەڤەئاڤاکرن.

### سنوورێن گوندی :

**باکووری،** گوندی هلۆرا و شنی ژێری

**باشووری،** گوندێ کادانا

**رۆژهەلاتی،** گوندێ چالی

**رۆژئاڤایی،** نپاخی

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ئـەڤ گوندە ژی بۆ پێدڤیاتیێن خۆ ژ ئاڤێ پشتکەرمێ بیرا بوو و ژیارا گوندی ل سەر مەرو مالات و رەز و متای چیایی بوون.

## گوندی سەرانی:

ئەڤ گوندە ژی کۆ دکەڤیتە دەڤــەرا زێبار و دووماهیا دەڤەرێ ئانکو رۆژئاڤایێ زێبارە، ژ دو بنەمالان پێکدهات، بنەمالا خیچەی و عەمێ، بەری بێتە بەردان ١٥ خانی لێ بوون و نێزیکی ١٥٠ کەسان لێ دژیان، ئەڤ گوندە ژی ل سالێن شێستان هاتییەبەردان و هێز یێ بەردایە. دو گوند ب ناڤێ سەرانی ژووری و سەرانی ژێری هەنە.

## گوندێ کافیا:

ئەڤ گوندە ژی دکەڤیتە زێبارا ژووری و دشێین بێژین دووماهیك گوند بوو، رۆژئاڤایێ گوندی سریانێ بوو، ژ ئێك بنەمال ئەو ژی بنەمالا (شعبان)ی پێکدهات، بەری گوند ل سالێن شێستان بێتەبەردان و خرابکرن ١٥ خانی لێ بوون، سەردەمێ شۆرشا گولانێ گوند هاتییەڤەئاڤاکرن، بەری ئەنفالا ١٩٨٨ێ (٤٠) خێزان

ل گوندی دژیان، د ناڤبەرا ٨/٢٥- ١٩٨٨/٩/١٥ێ ئەڤ گوندە ژی کەتیە بەر هەوا ئەنفالان و هاتیەخرابکرن و خەلکێ وی ئاوارە و مشەخت بووینە و هەتا نها نەهاتیەئاڤاکرن. بنکەهەکێ پێشمەرگەیێن شۆرشا گولانێ لێ بوو. هاتیە چوولکرن تانوکە نەهاتیە ئاڤاکرن[٢٦].

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژ بەرکو ڤی گوندی ئاڤاکا زۆر هەبوو، لەوما گوندیان گەلەك چاندنا ئاڤی دکر، ب تایبەت چاندنا برنجی، هەروەسان بیستان دکرن و مەرۆمالات خودان‌دکرن.

## - گوندێ چەم بێکێ:

ئێکەم گوندێ ناحیا دینارتێ یە ل بەرامبەر بێخمێ، دکەڤیتە سەر رووبارێ زێ مەزن، ب دووراتیا نێزیکی (٢٠کم) رۆژهەلاتێ ناحیا دینارتە، دارێن بیهۆکێ (بی) ل رەخێ زێی ل نێزیکی گوندی دزۆرن، لەوما ب وی ناڤی هاتیەناڤکرن.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ چەم شیڤی.

**باشووری،** گوندێ مالە موسێ.

**رۆژهەلات،** زێی بێخمە.

**رۆژئاڤا،** گوندێ هەربو.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ ڤی گوندی ژ عەشیرەتا سۆرچیانە، ل سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ گوندی تنێ ٣١ کەس بوو[٢٧]، نها نێزیکی (٣٥) سەر خێزان لێ هەنە، گوندەکێ ب ئاڤە و ژیانا خەلکی وی ل سەر چاندنێ و مەرو مالاتی یە، خواندنگەهـ ژی ل سالا (٢٠٠١) ێ لێ هاتیە ئاڤاکرن. هەمی مرۆڤێن ئێکن ئانکو ئێك بنەمالن و سۆرچی نە. سالا (٢٠٠٠)ێ دا کارەب گەهشتی یێ[٢٨].

گوندێ سۆسێ:



## گوندێ ماله موسێ:

گوند دكەڤیتە نێزیكی گوندێ چەم بێكێ ژلایێ باشوورێ رۆژئاڤایی و نێزیكی رووبارێ زێ مەزنە بەرامبەر بێخمێ. ناڤێ گوندێ ژ ناڤێ بنەمالا ماله موسێ هاتییە، ل سالا (٢٠٠٠)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەكرن و هەر وێ سالێ كارەب گەهشتییە گوندی.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ سوسێ.

**باشووری،** گوندێ بیێ.

**رۆژهەلاتی،** زێیێ بێخمە.

**رۆژئاڤایی،** مێرەكێ.

### پێكهاتا گوندی:

پرانییا خەلكێ وێ ژ عەشیرەتا سۆرچی نە، نێزیكی (٥٠) سەر خێزانان لێ هەنە، هەمی كەس و كارێن ئێكن، و ژیارا وان ل سەر مەر و مالاتی بوو و نها پتر ل سەر مووچانە[٢٩].

## گوندێ باروودخانە:

گوندەكێ كێم ئاڤە دكەڤیتە هنداڤی گوندێ ماله موسێ، پشتی سەرهەلدانا سالا (١٩٩١)ێ وەكی گوند هاتییە ئاڤاكرن و پێشتر وەك عومبارا كەل و پەلێن بەنداڤا بێخمە بوو، خۆجهێن ڤی گوندی كەسوكارێن خەلكێ گوندێ ماله موسێ نە، ژیانا خەلكێ وێ ل سەر مەرو مالاتی یە و نها پتر ل سەر مووچانە. نها ژی ئاڤایە، سالا (٢٠٠٠)ێ كارەب گەهشتییە ڤی گوندی.

## گوندێ سۆسێ:

گوندەكێ ب ئاڤە دكەڤیتە باكوورێ رۆژئاڤایێ بارودخانێ و د نهالەكێ دایە، سنوورێن وێ ژی ئەڤەنە:

**باكووری،** گوندێ هەربو.

**باشووری،** گوندێ سەركەندال.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ مالەموسێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ مێرەكا.

### پێكهاتا گوندی:

زۆربەی خەلكێ گوندی سۆرچی نە و هندەك ژی نقەبی نە، نێزیكی (٦٠) سەر خێزانان لێ هەنە، عەردێ چاندنێ ل ڤی گوندی یێ كێمە و ژیانا وان ل سەر مەرو مالاتی و چاندنێ و مێشێن هنگڤینییە. ل زنجیرا چیایێ پیرس ل هنداڤ ڤی گوندی شكەفتەكا دێرین و ئاسێ هەیە دبێژنێ شكەفتا سوسێ. سالا (٢٠٠٠)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەكرن، پشتی سالا (٢٠١٠)ێ كارەب گەهشتییە گوندی.

## گوندێ مێرەكێ:

ئەڤ گوندە پشتی سالا (١٩٩١)ێ هاتییە ئاڤاكرن، ژ نێزیكی (٢٥) سەر خێزانان پێكدهێت و پرانییا خەلكێ گوندی ب (نقەبی) دهێنە نیاسین و هەمی كەس و كارێن ئێكن.

سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ بێكرێ.

**باشووری،** گوندێ خەلانە.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ سوسێ

**رۆژئاڤا،** گوندێ سەركەندال.

ژیارا خەلكێ گوندی ل سەر چاندنا برنجی و بەرهەمێن چیایی و مەرو مالاتی یە، كانییێن ئاڤێ لێ هەنە.

سالا (٢٠٠٠)ێ خواندنگەهـ بۆ گوندی هاتییە ئاڤاكرن و كارەب ژی كۆ پشتی (٢٠٠٣)ێ هاتییە گوندی[٣٠].

## گوندێ سەركەندال:

ئێكە ژ گوندێن مەزنێن دۆلا نقەبی یە ل رۆژهەلاتێ دینارتێ و گوندەكێ ب ئاڤە و عەردەكێ بەرین هەیە،

نێزیكی (١٠٠) سەرخێزانان لێ د ئاكنجی نە، ناڤێ گوندی دیارە یێ هاتی كو گوند یێ ل سەر گرەكی و كەندالەك لێ هەیە.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** ساكا كولەكا.

**باشووری:** گوندێ بوسێل.

**رۆژهەلات:** گوندێ مێرەگێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ مێركێ.

گوند سالا (١٩٨٨)ێ د ئەنفالاندا هاتییەوێرانكرن، ل سالا (١٩٩١)ێ هاتییەڤەئاڤاكرن.

**ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:**

ژیانا خەلكێ وی ل سەر مەرو مالاتی و چاندنا برنجی و دەخل و دانی و تری یە.

سالا (٢٠٠٠)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەكرن، مزگەفت و بنكەهەكێ ساخلەمیێ ژی لێ هەنە، سالا (٢٠٠٠)ێ كارەب گەهشتییە گوندی.

## گوندێ مێوگێ:

گوندەكێ بچویكە دكەڤیتە نێزیكی كانییا (توزێ)، تنێ شەش حەفت سەر خێزانن و هەمی نقەبی نە و كەس و كارێن ئێكن، خودان مەرۆمالاتن و عەردێ چاندنێ هەیە و ژیارا وان ل سەر و رەز و باغانە. وەك خودانكرنا مەر و مالاتی، ژێدەرێ ئاڤا گوندی كانینە.

## گوندێ تویژگێ:

گوند دكەڤیتە سەر جادا دینارتێ- بێخمە، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلكێ گوندی تنێ ٤٥ كەس بوون[٣١].

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێ نقەب.

**باشووری:** گوندێ بوسێل.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ مێركێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ شیڤا گویسكێ.

**گوندێ نەڤەبێ:**



## پێكهاتا گوندی:

گوند نقەبی نە و كەس و كارێن ئێكن و ژ شەش سەر خێزانان پێكدهێت، ل سالا (١٩٨٨)ێ هاتییە وێرانكرن و پشتی سالا (٢٠٠٠)ێ هاتییەڤەئاڤاكرن، ژیانا خەلكێ وی ل سەر مەرو مالاتی و بەرهەمێن چیایی یە، دو كانی ب ناڤێ سەروكانی و كانیا بچویك ل گوندی هەنە و ئەو ژێدەرێ ئاڤا گوندینە.

## گوندێ نەقەبێ:

گوندەكێ خرابەیە، نهالەك هەر ب ناڤێ ڤی گوندی هەیە كو گوند دكەڤیتە تێدا، دكەڤندا ژمارەكا زۆرا جوییان ل ڤی گوندی دژیان، ل سالێن نۆتان وەكی سەرەدان ژمارەكا جوییان هاتبوونە دەڤەرێ. ناڤێ گوندی ژی ژ ناڤێ عەشیرەتێ هاتییە و ئیجاخا نقەبا هندەك دبێژن ئەم زێباری نە و هندەكێن دی دبێژن ئەم سۆرچی نە، هندەك ژی خۆ ب نقەبی دهژمێرن.

## سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ ئیسومەرا.

**باشووری،** گوندێ توژكێ.

**رۆهەلاتی،** گوندێ مێركێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ ژیركا.

ژیارا وان ل سەر خوداناكرنا مەرۆمالات و دەخل و دانی و متایێ هشك بوو، ئەڤ گوندەژی ل سالێن شێستان هاتییەبەردان و خەلكێ وی ل جهێن جودا بەلاڤبوونە.

## شیڤا گویسكێ:

گوندەكێ بچویكە پشتی سالا (٢٠٠٠) هاتییە

شیڤا گویسكێ،



ئاڤاكرن و تنێ (٤) سەرخێزانن ژ ئێك مالبات و هەمی نقەبی نە، دكەڤیتە ناڤبەرا گوندێن توژگێ و ژیركا، ناڤێ گوندی ژ ناڤێ شیڤێ یە كو ب ناڤێ گویسكی دهێتە ناڤكرن و بوویە شیڤا گویسكێ، وان چوار خێزانان تنێ بۆ خودانكرنا مەرۆمالات قەستا گوندی كرییە بوویە گوند .

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری،** گوندێ نەقەب.

**باشووری،** سەنتەری بجێل.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ توژگێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ ژیركا.

ژیانا خەلكێ وی ل سەر مەر و مالاتی و متایێ هشكە[٣٢].

## گوندێ مەرانێ:

گوندەكە ئاڤییە لێ نها چۆلە، دكەڤیتە بنێ چیایێ سەرێ سادا، دكەڤندا چەند سەر خێزانێن مالباتەكێ لێ ژیاینە، نها خەلكێ ڤی گوندی ل ئامادا ژێری ئاكنجی بووینە و هژمارا وان كێمن تنی بۆ خودانكرنا مەرو مالاتی دچنە گوندی. نەكو زێدەتر .

## گوندێ ژیركا:

گوندەكە دكەڤیتە نێزیكی گوندێ ئامادا ژووری و ژ (٣٠) سەر خێزانان پێكدهێت، هەمی نقەبی نە و كەس و كارێن ئێكن.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری،** گوندێ ئیسومەرا.

**باشووری،** ناحیا بجیل.

**رۆژهەلاتی،** شیڤا گویسكی و نەقەب.

**رۆژئاڤایی،** ئامادا ژووری و ژێری.

ژیارا خەلكێ وی ل سەر مەر و مالاتی و بەرهەمێن چیایی یە، پرۆژەیێ ئاڤێ و خواندنگەهـ و مزگەفت

**گوندێ ئامادا ژووری،**



لێ هەنە، سالا ٢٠٠٠ێ خواندنگەها گوندی هاتییەدامەزراندن. ژيارا خەلکێ گوندێ ل سەر دەخل و دان و مەر و مالات و رەزێن تری یە.

## گوندێ نێك مالێ:

ئەڤ گوندە دکەڤیتە سەر ئەردێ شیڤا گویسکێ، هەتا سالا (١٩٩١)ێ خرابە بوو و ئێك مالبات لێ هەیە و نەقەبی نە و ژيانا وان ل سەر خودانکرنا مەر ۆ مالاتی یە. ئەو ژی بۆ خودانکرنا مەرو مالات چووینە گوندی .

## گوندێ ئامادا ژووری:

مەزنترین گوندێ دۆلا نقەبی یە ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ ١٣٤ کەس ل ڤی گوندی دژیان[٣٣]،و پرانییا وان نقەبی نە و ژ نێزیکی (١٥٠) سەر خێزانانە، گوندەکێ ب ئاڤە و هەتا سالا (٢٠٠٠)ێ گوندەکێ بەرنیاس بوو ب چاندنا برنجی. خواندنگەهەك ل سالا (١٩٧٨)ێ و ئێکا دی ل سالا (٢٠٠٣)ێ لێ هاتینە ئاڤاکرن و مزگەفت و پرۆژەیێ ئاڤێ و یاریگەها تەپا پێ یا دەست کرد لێ هەیە.

ژيارا پشکەکا خەلکێ گوندی سەر خودانکرنا مەر و مالاتی یە و هندەك ژی کۆ کار و بارێن ئاقاری دکەن رەزو سماق و دەخل و دان و بیستان ژی لێ هەنە .

## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ زێوە.

**باشووری:** گوندێ ئامادا ژێری.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ ژیرکا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ کانی حەلانێ.

**گوندێ ئامادا ژێری:**



## ئامادا ژێری:

ئەڤ گوندە پشتی ویرانکرنا هژمارەکا گوندێن دۆلا نقەب و ڤەگوهاستنا خەلکێ وان بۆ سەر جادا دینارتێ و بێخمە هاتییە ئاڤاکرن و ژ نێزیکی (٧٠) سەرخێزان پێکدهێت.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ ئامادا ژووری.

**باشووری،** گوندێن دەڤەرا بجێل.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ ژێرکا.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ بەرۆژا زاوا.

پرانییا خەلکێ ڤی گوندی کەس و کارێن ئێکن، ئەڤ گوندە سێ جاران هاتییە چۆلکرن سالا ١٩٦١ و ١٩٨٤ و ١٩٨٨ێ پشتی سەرهلدانێ هاتییەڤەئاڤاکرن و نها ئاڤایە و دو کانی ب ناڤێن (کانییا ماری، کوشک) لێ هەنە.

ژیارا خەلکێ گوندی ل سەر چاندنێ و مەرو مالاتی یە، ژبلی کو نها پتریا گوندییان فەرمانبەر و پێشمەرگە و مامۆستانە.

کارەب و جادە هەر دگەل ئاڤابوونەڤا گوندی و ل سالا (١٩٩٥)ێ خواندنگەهـ ژی ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن و ل سالا (٢٠٠٠)ێ ئاڤاهیێ مزگەفتێ ژی لێ هاتییە ئاڤاکرن.

## گوندێ بەرۆژ زاوە:

ئەڤ گوندە ل سالا (١٩٨٦)ێ ل سەر جادا دینارتێ بێخمە هاتییەڤە ئاڤاکرن پشتی هژمارەکا گوندێن دۆلا نقەب ڤەگوهاستینە ڤی جهی و نها ژی ئاڤایە و نێزیکی (٣٠) خانی کو دبنە (٤٠) سەرخێزان و پتریا وان کەس و کارێن ئێکن. ناڤێ گوندی یێ هاتی کو کانیەکا ئاڤێ ب ناڤێ زاوا ل ڤی گوندی هەیە و گوند بخۆ ژی دکەڤیتە بەرۆژی، خەلکێ گوندی ژ بنەمالەکێ ب ناڤێ مالا سەعدوی پێکهاتینە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ سەفتێ.

**باشووری،** سەرێ سادا.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ ئامادا.

**رۆژئاڤایی،** بازارێ دینارتە.

### زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیانا خەلکێ وی هەر دکەڤندا ل سەر مەر و مالاتی و دەخل و دان و برنج و رەز و باغ و سماقێ بوو. لێ نها پتر ل سەر مووچانە. ڤی گوندی دو مزگەفت لێ هەنە، ئێک ژوان سالا (١٩٩٥)ێ هاتبوو ئاڤاکرن و یا دووێ ل سالا (٢٠١٥)ێ. سالا (٢٠٠٠)ێ کارەب گەهشتییە گوندی[٣٤].

ئەڤی گوندی بتنێ کانییەک ب ناڤێ کانییا زاوا هەیە.

## گوندێ کانی حەلان:

دکەڤیتە ناڤبەرا دینارتێ و ئامادا ژووری ژلایێ رۆژهەلاتی، نێزیکی (٤٠) مالانە کو دبنە نێزیکی (٥٠) سەر خێزانان و پتریا وان کەس و کارێن ئێکن. ناڤێ گوندی هاتییە کو کانییەک ب ناڤێ کانییا حەلان هەبوویە لەوما ناڤێ گوندی ژی بوویە کانییا حەلان، خەلکێ گوندی ژ یەک بنەمالن ب ناڤێ بنەمالا ئیبراهیمێ عومەری.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ زێوە .

**باشووری،** گوندێ بەرۆژا زاوا.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ ئامادا.

**رۆژئاڤایی،** بازێرێ دینارتە.

ئەڤ گوندە سێ جاران ل دەمێ حکۆمەتێن عیراقێ هاتییە بەردان سالا ١٩٦١ و ١٩٧٤ و ١٩٨٤ ێ و پشتی سەرهلدانێ گوند هاتییەڤەئاڤاکرن.

## زێدەرێ ئاڤا گوندی:

ژێدەرێن ئاڤێ ل ڤی گوندی کانینە وەك کانیێن: سنجێ، پیر قاسم، کانیا حەلانی، نها پرۆژەیێ ئاڤێ ژی بۆ گوندی هاتیە چێکرن.

ژ جهێن ناڤدارێن ژی: (گرێ سپورێ و گرێ سپیلکی بەراشا، گرێ نوی).

گوندی دو مزگەفت هەنە، ئێك سالا (١٩٩٥)ێ و یادیتر سالا (٢٠٠٠)ێ هاتینەئاڤاکرن، کارەب ژی سالا (٢٠٠٠)ێ دا گەهشتی یێ .

## گوندێ سەرگەلی:

گوندەکێ بچویکە و هەتا نها تاخەکە سەر ب دینارتێ ڤە، پشتی سالا (٢٠٠٣)ێ بەرفرەهـ بوویە و نێزیکە دگەل دینارتێ ئێك بگریت، دکەڤیتە دووراتیا (١کم) ژێریێ دینارتێ و ل دەرێ گەلیێ گەلی زنتا ژلایێ باکووری ڤە، ناڤێ وی ژ وێ چەندێ هاتیە کو دکەڤیتە سەرگەلیێ زنتا.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** ناحیا دینارتە.

**باشووری:** گەلی زنتا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ مفرق دینارتە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ گویسکێ.

### پێکهاتا گوندی:

پێکهاتا گوندی تێکەلە ژ عەشیرەتێن زێباری و سۆرچی و هندەك ژ دەڤەرا سۆران، نێزیکی (٩٠) سەرخێزانن.

تنێ کانییەکا ئاڤێ ئەو ژی (کانییا سەرکانیێ) ل گوندی هەیە.

سالا (٢٠٠٠)ێ بنکەهەکێ ساخلەمیێ ب هیمەتا بەهمەنێ قوبادی دەرهێنەرێ فلمێ (کویسەلەکان دەفرن) ل ڤی گوندی هاتییەڤەکرن، زۆربەی دیمەنێن وی فلمی ل ڤی گوندی هاتبوونە وێنەگرتن. دیسان دو مزگەفت لێ هەنە، ئێکا کەڤنە و یا دی سالا (٢٠٠١)ێ هاتیە ئاڤاکرن، سالا (١٩٧٨)ێ خواندنگەهـ لێ هاتیە ئاڤاکرن[٣٥].

## دوریانا دینارتە:

پشتی سالا (١٩٨٧)ێ حکۆمەتا بەرێ یا عیراقێ خەلکێ گوندێ کەلاتی و دەوروبەرێن وێ ل سنوورێ ناحیا بجیل دەرئێخستین، ل ڤی جهی کو دبیتە عەرد و زەڤیێن دینارتێ ئاکنجیکرن، دکەڤیتە باشوورێ رۆژهەلاتێ دینارتێ ب دووریا (٧٠٠م)، ناڤێ وی ژی یێ ژ پەیڤا (مفرق)ا عەرەبی هاتی کو دەروازا دوریانایە و پتریا (٢٠) خانی لێ هەنە کو دبنە نێزیکی (٤٠) سەرخێزانان، پرانییا خەلکێ وی ژ عەشیرەتا سۆرچی نە. ژیارا وان ژی ل سەر چاندنێ یە، هەروەسا چەندین مامۆستا و فەرمانبەر و پێشمەرگە ژێ هەنە. سالا (١٩٩٩)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییەئاڤاکرن، سالا (٢٠٠٠)ێ مزگەفتا گوندی هاتیە ئاڤاکرن. خەلکێ گوندی ژ بنەمالا مامندێ سۆرچی نە و سالا ١٩٩٩کارەب گەهشتییە گوندی[٣٦].

## گوندێ گویسکێ:

ب دووریا (٤کم) گوند دکەڤیتە باشوورێ دینارتێ، ناڤێ گوندی گویسکێ یان گویزکێ یە و خەلکێ گوندی دبێژن ناڤێ وی یێ ژ گویزا هاتی کو گەلەك گویز لێ هەنە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێن مەزرینکانی و گریش ژووری.

**باشووری:** گوندێ چونا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێن سەرگەلی و دینارتە

**رۆژئاڤایی:** گوندێ هەشتکا.

### پێکهاتا گوندی:

پرانییا خەلکێ ڤی گوندی خزم و کەس و کارێن ئێکن ژ عەشیرەتا زێباری نە، ژمارا ئاکنجیێن وی (١٧٠) کەسن کو دبنە (٣٥)خانی .

**ژێدەرێ ئاڤا گوندی:**

گوندەكێ ب ئاڤە و جهەكێ گەشتیاری یە و چەند كانی لێ هەنە، مینا كانیا گوندی یاسەرەكی و كانیا بناڤێ و هتد... ژیانا پتریا خەلكی وی ل سەر چاندنێ یە ب تایبەت چاندنا ئاڤی مینا (گویز و سێڤ و خۆخ و هناران)، دیسان عەردێ چیایی ژی هەبە كو سماق و تری لێ دهێتە چاندن.

ل ناڤەراستا سالا (١٩٩٣)ێ خواندنگەهـ لێ هاتیە ئاڤاكرن و مزگەفت ژی هەیە، سالا (١٩٩٩)ێ كارەب گەهشتیە گوندی، هاڤینێن ڤی گوندی د فێنكن و زڤستان ژی زۆر د سارن و بەفرەكا زۆر لێ دهێت چونكە نزارە و دكەڤیتە ب چیای ڤە ل رۆژئاڤایێ گەلیێ زنتا.

## گوندێ هەشتكا:

ئەڤ گوندە دكەڤیتە ژێریا زنجیرا چیایێ سەرێ ئاكرێ و (٥كم) ژ سەنتەرێ ناحیا دینارتێ دوورە، ناڤێ گوندی پێكهاتیە ژدو برگان (هەشت+ ئیكێ) ودبێژن جاران مەزنەك ل گوندی هەبوویە، كو عەرد داڤ خەلكی، ژ هەشت پشكان حەفت بۆ خۆ دبرن و تنێ پشكەك د دا وی خەلكێ عەرد شیندكر، ئەو دو پەیڤ سڤك بووینە و بوویە هەشتكا. پشتی سالا (٢٠٠٠)ێ گوند بەرفرەهبوو و ژمارەكا مالێن گوندێ ناڤبری ل ژێریا گوندی گوندەكێ دی ب ناڤێ هەشتكا ژێری ئاڤاكرن، كو پێكدهێت ژ (٨) سەرخێزانان و پتریا وان كەس و كارێن ئێكن كو دكەڤندا ژ گوندێ گادانا هاتینە.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری،** گوندێن گریش و ئیشكەفتی.

**باشووری،** گوندێن جونا و باشقال.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ گویسكێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ شرتا.

گوندێ هەشتكا



### پێكهاتا گوندی:

خەلكێ گوندی ل دەسپێكێ ژ گوندێن (باشقال و جۆنا) نێزیك ئاكرێ هاتینە ڤی گوندی و هەتا نها لێ دژین و پترییا وان خزم و كەس و كارێن ئێكن، بەری وان ژی هندەك ژ گوندێ كادانا هاتینە ڤی گوندی و لێ ئاكنجیبوونە، نها پتر ل (٥٠) سەر خێزانان لێ هەنە.

شوینوارێن دێرەكێ ل گوندی هەنە، هەر وەسان شكەفت ژی هەنە.

ئەڤ گوندە گوندەكێ ب ئاڤە و چەندین كانی لێ هەنە، مینا شوركامیركا، شیفكامیركا، كانییا مەلا عیسای، سەرۆكانییا گوندی. ژیانا خەلكێ وی ل سەر چاندنا ئاڤی یە، مینا سێڤ و خۆخ و تری و هنار...هتد.

سالا (١٩٧٨)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییەڤەكرن و سالا (١٩٨٧)ێ كارەب گەهشتییە گوندی.

## گوندێ مەزرینگانێ:

گوند دكەڤیتە رۆژئاڤایێ دینارتێ ب دووریا (١كم)، ل دەسپێكێ ناڤێ ڤی گوندی (بازنجا) بوو، لێ ب بوورینا دەمی ناڤێ وی هاتە گوهرین و بۆ مەزرینگان.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ هەرنێ.

**باشووری:** گوندێ گویسكێ.

**رۆژهەلاتی:** ناحیا دینارتە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ كرییش.

### پێكهاتا گوندی:

خەلكێ گوندی هەمی زێبارینە ژ گوندێن: هۆكێ، كادانی، چالی، چاربووتی نە، زۆرێن دن ژی لێ دژین، گوند ژ (١٦٥) مالان پێكدهێت، ژمارا ئاكنجیێن وی نێزیكی (٨٥٠)كەسانە، هندەك ژ خەلكێ ڤی گوندی نها بەربەلاڤ بووینە ل سەر دەڤەران ڤە.

### شكەفتێن گوندی:

ڤی گوندی چەند شكەفت لێ هەنە، ژوانان

كرییش ژێری



شکەفتا عەباس، شکەفتا رازا، شکەفتا کەلێ.

### زێدەرێن ئاڤا گوندی:

ژێدەرێن ئاڤێ ژی ل گوندی کانینە، مینا کانیا گوندی، کانیا ژنا، سەرۆکانی، کانیا ئێشا، ژبلی بیرەکا ئاڤا ڤەخوارنێ ژی لێ هەیە، لەوما پتریا عەردێ گوندی بیستان و رەزێن دێمی نە، لێ نها زۆربەیا خەلکێ ڤی گوندی بووینە خودان مووچە و کار ل گوندی کێم بوویە. گوند ب بەرهەمێن خۆ یێن ئاڤی و فێقیێ هاڤینی یێ ب ناڤ و دەنگە، مینا هژیر، تری، هنار، هتد... تایبەتی هنارێن مالا نیروی کو ل دەڤەرێ ب ناڤ ودەنگن.

سالا (١٩٩٩)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن، ئاڤاهیێ مزگەفتێ ژی د سالێن شێستاندا هاتییە ئاڤاکرن و رێیا وان ژی رێیا گشتی یە کو د ناڤاگوندی را دچیتە دەڤەرێ، سالا ١٩٨٠ێ کارەب گەهشتییە گوندی.

## گربیش ژێری:

گوندەکێ ب دار و بارە، دکەڤیتە دووراتییا نێزیکی (٢کم) رۆژئاڤایێ دینارتێ، ناڤێ گوندی ژ دو برگەیان (گر+ پیش) پێکهاتییە، ب واتایا (گرێ پیشی) کو جهەك لێ هەیە و هەتا نها ژی دبێژنێ (گر) (بیش) ژی ئەوە دەمێ گیا هشکدبیت.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ هەرن.

**باشووری:** گوندێ هەشتکا

**رۆژهەلاتی:** گوندێ گربیش ژووری.

**رۆژئاڤایی:** کۆمەلگەها گربیش.

### پێکهاتا گوندی:

پرانیا خەلکێ گوندی د بنیاتدا خەلکێ گوندێ گادانا نە ل دەڤەرا زێبار، ژمارا وان (١١٥) سەرخێزانن کو د دەمێ بەرهەمڤکرنا ڤێ نڤیسینێدا دبوونە (٦٧٠) کەس.

### ژیارا خەلکێ گوندی:

گوندەکێ ئاڤییە، کانیێن ئاڤێ لێ هەنە مینا: کانیا مۆسای، کانیا پەلتا، هتد... لەوما ژیانا خەلکی وی ژی پتر ل سەر چاندنا فێقی یە، وەکی سێڤ و خۆخ و هنارۆك و هژیر و گویز و دیسان مەر و مالاتی خودان دکەن. جهێن ناڤدار ژی وەکی هاڤینگەه لێ هەنە، وەکی هاڤینگەها بن گویزا.

سالا ١٩٨٠ێ کارەب گەهشتییە گوندی سالا ٢٠٠٠ێ ئاڤاهیێ مزگەفتێ و خواندنگەها گوندی هاتینەئاڤاکرن.

## گوندێ گربیش ژووری:

ناڤێ گوندی هەمان ناڤێ گربیش ژێری یە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ هەرن.

**باشووری:** گوندێ هەشتکا و گویسکی.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ مەزرینگان.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ گربیش ژێری.

### پێکهاتا گوندی:

پرانیا خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا زێبارییانە و خەلکی ڤی گوندی ل مفرق دینارتە، شکەفتێ، بەنی ماوەت، دفری، کاڤلکا، دۆستەك دژین. دەمێ نڤیسینا ڤی بابەتی هژمارا وان (١٤٦٨) کەسن کو دبنە (٢٠٠) مال.

چەند کانی ل گوندی هەنە، وەکی کانیا محمد قادوی، کانیا رەشکوی، کانیێن بن گیزا.

خواندنگەهـ ل سالا (١٩٧٥)ێ ل ڤی گوندی هاتییە ئاڤاکرن. سالا (١٩٨٠)ێ کارەب گەهشتییە گوندی.

## گوندێ کۆمەلگەها گربیش:

ئێکەم کۆمەلگەهە ل سەردەمێ حکۆمەتا عیراقێ سالا (١٩٨٧)ێ ل دەڤەرا نەهلێ ل سەر عەردێ گربیش ل نێزیکی گوندێ گربیش ژێری هاتییە ئاڤاکرن و وەکی گوند دهێتە هژمارتن.

### سنوورێن كۆمەلگەهێ:

**باكووری:** گوندێ هەرن.

**باشووری:** گوندێ هەشتكا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ گریش ژێری.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ ئشكەفتێ.

### پێكهاتا كۆمەلگەهێ:

گەلەك زێباری ل ڤێ كۆمەلگەهێ ئاكنجیكرینە، مینا خەلكێ گوندێن پریسە و كافی، لێ نها خەلكێ گوندێن وەك: كافی و هلۆری و گادنی و پریسەی .... هاتینێ، ژمارا مالێن گوندی دبنە (١٤٥) خانی و یا خەلكێ وی نێزیكی (٨٠٠) كەسانە.

### زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ل سەر خودانكرنا مەر و مالاتی و چێكرنا بیستانانە، هژبرێن گریشێ ناڤودەنگن، ئاڤا وان ژ گریش دهێت.

ل سالا (١٩٩٧)ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەكرن. و مزگەفت (١٩٩٩)ێ و پشتی سەرهلدانا (١٩٩١)ێ كارەب گەهشتییە كۆمەلگەهێ.

### گوندێ شرتا:

گوند دكەڤیتە رۆژئاڤایا گوندێ هەشتكا و نێزیكی (١٦كم) ژ سەنتەرێ ناحیێ دوورە، ناڤێ گوندی وەك هندەك ژ گوندییان دبێژن: یێ ژ (شیرەتا) هاتی، چونكی خەلكێ گوندی هەر دكەڤندا مرۆڤێن دیندار بوون و مامۆستایێن زیرەك و شەهرەزایێن دەڤەرێ بووینە، هەروەسا حەكیم بووینە كو نەخۆشیێن خەلكی چارەكرینە و شیرەت ل خەلكی كرینە. لەوما دبێژن ناڤێ شرتا یێ ژ شیرەتا هاتی.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ ئشكەفتی.

**باشووری:** گوندێ باشقالا ئاغا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ هەشتكا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ ئاڤدەلكا.

گوندێ شرتا



**پێكهاتا گوندی:**

خەلكێ گوندی زێباری نە و هەمی مرۆڤێن ئێكن، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلكێ گوندی ١٢٢كەس بوو[٣٧]. كارێ وان یێ سەرەكی ژی جۆتیاری و خودانكرنا مەر و مالاتییە، گوند ب بەرهەمێن خۆ یێن ئاڤی و دێمی ناڤدارە. هەروەسا گوند ب شێخا ژی یێ ناڤدارە كودبێژنێ (شێخێن شرتا). ژمارا ئاكنجییێن وی (١٨٥) كەسن د (٣٩) خانییاندا .

هندەك شوینوار و جهێن كەڤنار ل گوندی هەنە وەك: ناوسكەك وەكی شكەفتا نە یا ل چیایێ گوندی. هەروەسا شوینوارێ ئاشێ ئاڤێ ژی لێ هەیە، ژبلی چەند چالێن بەفرێ (كونبەفر) ل چیای.

چەند كانی ل گوندی هەنە وەك كانییا گلەخینكی، سەرۆكانییا گوندی.

سالا (١٩٩٨)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییەڤەكرن و سالا (٢٠٠٠)ێ كارەب گەهشتییە گوندی.

## گوندی شكەفتێ:

گوندەكێ ئاڤایە و دوورە ژ رێیا سەرەكی، ناڤێ گوندی ژ شكەفتی هاتییە كو زۆر شكەفت لێ هەنە.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری،** گوندێ بازێ.

**باشووری،** گوندێ شرتا.

**رۆژهەلاتی،** كۆمەلكەها گرییش.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ بەنی ماوەت.

**پێكهاتا گوندی:**

خەلكێ گوندی زێباری نە، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلكێ گوندی ٦٨ كەس بوو[٣٨]، د بنیاتدا ژ بەنی ماوەت و شەهی و شكەفتێ بخۆنە. ئەڤ گوندە ژی وەك پرانییا گوندێن دەڤەرێ هەتا سەرهلدانا (١٩٩١)ێ یێ بەردای بوو، پشتی سەرهلدانێ گوند ل ژێرێ گوندێ كەڤن هاتییەئاڤاكرن.

جهێن شینواران ژی لێ هەنە، وەكی دێرەكێ كو هەتا نها شوینوارێن وێ مایـنە، هەروەسا شكەفت ژی لێ هەنە، وەكی شكەفتا كەلێ، ژبلی كون بەفرەك ژی ل گوندی هەیە.

**ژێدەرێن ئاڤێ:**

چەند كانی ل گوندی هەنە، وەك: كانییا بەرانك، كانییا عەور، كانییا میرزا محەمەد، كانییا گوندێ سەری، كانییا سارك. و بیرەك ژی لێ هەیە. و ئاڤەك هەیە كو بكێر ڤەخوارنێ ناهێت.

ژیارا خەلكێ گوندی ل سەر خودانكرنا مەر ۆ مالات و چێلانە.

خواندنگەهـ ژی ل گوندی هاتییەڤەكرن.

## گوندی بەنی ماوەتا:

ئەڤ گوندە دكەڤیتە نێزیكی گوندێن شكەفتێ و دڤرێ، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلكێ گوندی ١٢٨ كەس بوون[٣٩]، و سالا (١٩٨٤)ێ ژ ئەنجامێ سەروبەرێ دەڤەرێ هاتییەبەردان و پتریا خەلكێ وی ل گوندێ شكەفتێ ئاكنجیبوون، نها تنێ چەند مالەك ل ڤی گوندی دژین.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری،** گوندێ كاڤلكا.

**باشووری،** گوندێ شرتا.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ ئشكەفتی.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ دڤری.

**پێكهاتا گوندی:**

خەلكێ گوندی هەمی زێباری نە.

خواندنگەهـ و مزگەفت لێ نینن چونكی كێم خەلك لێ دژین .

## گوندێ دڤرییێ:

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێ كاڤلكا.

**باشووری:** گوندێ ئاڤدەلكا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ بەنی ماوەت.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن سیانێ و خانەكێ.

**پێكهاتا جڤاكی:**

د بەرێدا گوندەكێ مەسیحی نشین بوو، نها پێكهاتێن ڤی گوندی زێبارینە و دبنیاتدا هەمی ل سالێن شێستان ژ گوندێن دۆستەكی و كاڤلكی هاتینە، گوند نها (١٥٠) مالن و پترن ژ (٢٠٠) سەرۆكخێزانان، سالا (١٩٧٩)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە، دو مزگەفت ل گوندی هەنە، ئێك سالێن شێستان و یا دی سالا (٢٠١١)ێ هاتییە ئاڤاكرن، سالا (١٩٨٧)ێ كارەب گەهشتییە گوندی. دیسان چەند كانی ژی هەنە، وەكی كانییا دێرێ، كانییا بسماقی، كانییا شێخ، كانییا سیلێ. ڤی گوندی جهێن شینوار و دێر و هاڤینگەهـ ژی هەنە.

## گوندێ كاڤلكا:

ژ وان گوندێن زێبارییانە یێن ل سالا ١٩٨٥ێ هاتینەوێرانكرن و هەتا نها نەهاتییەڤە ئاڤاكرن و نەزڤرینەڤە سەر گوندی، خەلكێ وی ل گوندێ دڤرێ و ئاكرێ و بەردەرەش دژین.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێن چاربووت و هۆكی.

**باشووری:** گوندێ دڤریێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ بازێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ دۆستەك.

ژیارا خەلكێ گوندی: د دەمێ خۆدا ب هیڤیا خودانكرنا مەر و مالاتی و متایێ هشك و چنینا سماقێ بوویە، بەلێ نها گوندێ بەردایە و هەرئێك ل جهەكی ب رەنگەكی دژین.

## گوندێ دۆستەكا:

گوندەكێ عەشیرەتا زێبارییانە ژ سالا (١٩٨٠) ێڤە ب یەكجاری هاتییەبەردان، هەتا نها نە هاتییە ئاڤاكرن ، تنێ هندە كاڤلە خانی لێ هەنە، خەلكی وی ژی نها ل گوندێ دڤریی و دینارتە و ئاكرێ و هەولێر و زۆر جهێن دی دژین.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێن چاربووتێ و كورگاڤێ.

**باشووری:** گوندێن خانەكێ و گیرە و ئەرتوون.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ كاڤلكا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن مێراڤیا و ئەرتوون.

**زێدەرێن ئاڤا گوندی:**

ل سەر كانی و بیر و بێرم و سێریجان بوو، ژ كانییێن گوندی، كانییا بانی پیرا، كانییاماملا. ئەڤ گوندە ب سماق و هەبوونا رەزێن تری یێ ناڤداربوو. ژیارا وان ژی ل سەر مەر و مالات و سماق تری و متای هشك یێ چیایی بوویە[٤٠].

## گوندێ سیان تەتۆ:

گوندەكێ كەڤنارە و دكەڤندا جوی و مەسیحی لێ هەبووینە، ب دووراتییا نێزیكی (١٢كم) دكەڤیتە رۆژئاڤایێ دینارتێ، گوند دبیتە دو گوند ب ناڤێن سیان تەتو و سیانا حەجی حسێن، نها ب هەڤرا دبێژنە هەردووان سیان تەتو . ژ چەند بنەمالەكا وەك بنەمالێن: حەجی زاهێر و جی رشید و قرتاسی و سعو و دیی و ملا عبدالله پێكهاتییە.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێ خانەكێ.

**باشووری:** گوندێ موسلیان.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ دڤری.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ گیرە.

## پێکهاتا گوندی:

پێکهاتا وان هەمی زێباری نە ، نها نێزیکی (٤٠) سەرخێزانانە.

گوندکێ ئاڤیە و یێ بەرنیاسە ب چاندنا فێقی، وەکی سێڤ و خۆخان، ل ڤی گوندی دو مزگەفت هەنە، ئێك ل سالێن هەشتیيان هاتیە ئاڤاکرن و یا دی ل سالا (٢٠٠٠)ێ، سالا (١٩٩٤)ێ خواندنگەهـ لێ هاتییەڤەکرن و سالا (١٩٨٧)ێ کارەب گەهشتییەگوندی.

ژیارا خەلکێ گوندی ل سەر کرنا بیستانان بوو وەك بیستانێن: خۆخ و سێڤ و هژیران، هندەکان دەخل و دانی دکرن، بەلێ نها ئەڤ رێنجبەرییە کێم بووینە پتریا وان مووچەخورن[٤١].

## گوندێ خانەگێ:

گوند دکەڤیتە دووراتییا (١٤کم) ژ ناحیا دینارتە، گوند دو گوندە، لێ ب گوندەکی دهێتە نیاسین، ژ سالا (١٩٨٧) یڤە دۆستەکی و خانەگێ لێ دژین. سالا (٢٠٠٠)ێ خواندنگەهـ لێ هاتییەڤەکرن و ئاڤاهیێ مزگەفتێ سالا (٢٠٠٥)ێ هاتییەئاڤاکرن.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ دۆستەك.

**باشووری:** گوندێ سیان.

**رۆژهەلاتی:** گوندێن سیان و دڤریێ.

**رۆژئاڤای:** گوندێ گیرەی.

ئاڤەکا باش هەیە و بیستان تایبەت یێن هناران زۆر لێ هەنە و ژیارا وان سەر بیستان و مەر و مالاتی تری و متای هشك بوو.

## گوندێ گیرە:

ئەڤ گوندە دکەڤیتە دووریا (١٥کم) ژ سەنتەرێ ناحیا دینارتێ، گوند ل دەسپێکێ ل سەری ئانکو دوور بوویە ژ رێیا گشتیا نەهلێ، لێ ژبەر نەبوونا خزمەتگوزیان هاتیە نێزیکی رێیا گشتیا نەهلێ و تا نها ئاکنجییێن وی جهینە، ناڤێ گوندی ژ وێ چەندێ هاتییە کو ئاڤا وان گیرە گرتی دبیت لەوما

گوندێ گیرە



بوویە گیرەی.

## سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ دۆستەك.

**باشووری،** گوندێ كورتكا.

**رۆهەلاتی،** گوندێن سیان و خانەكێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ ئەرتوون.

## پێكهاتا گوندی:

خەلكێ گوندی هەمی زێبارینە ژ گوندیێن (هۆكی و گادانی) و بێن بەری وان هەمی گیرەی نە.

گوند ل دەسپێكا سالێن هەشتییان هاتییەبەردان و چۆلكرن، لێ ل سالا ١٩٨٦ێ سەر ژ نوو هاتییەڤەئاڤاكرن و هەتا نها یێ ئاڤایە

## كانیێن گوندی:

زۆر كانی لێ هەنە وەكی: كانیا گوندی، كانیا دوولەسور، كانیا مێرگا دودا، كانیا سەری گوندی، كانیا حسین، كانیا نەزیری، كانیا حجی میرزا...و هتد.

## ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

د دەمێ خۆدا ژیارا وان ل سەر مەر و مالات و دەخل و دان و سماق بوویە، نها ئاڤ ل ڤی گوندی كێم بوویە و بیستان ژی كێم بووینە و خەلكی پتر بەرێ خۆ داینە مووچەیان و بارا پترا گوندیان پێشمەرگە و فەرمانبەر و مامۆستانە و گوند بەرەڤ كێمبوونێ ڤە دچیت.

هەروەسا چەند جهێن ناڤدار ژی هەنە، وەكی گركێ دێرێ و گرێ مەزن و بەرێ سوور، ژێلی سێ چوار گر و شكەفت و زۆر جهێن دی ژی لێ هەنە.

سالا (١٩٩٦)ێ بۆ ئێكەم جار خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەكرن و مزگەفت ژی ل سالا (١٩٩٨)ێ هاتییە ئاڤاكرن، كارەب سالا (١٩٨٧)ێ گەهشتییە گوندی.

## گوندێ ئەرتۆن ژووری:

ئەڤ گوندە دكەڤیتە سنوورێ ناحیا دینارتێ ب دووریا (١٦كم) ژ ناحیا دینارتە دوورە، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلكێ گوندی تنێ ٩٢ كەس بوو، دیارە ئێك گوند بوویە[٤٢]، و بووینە دو گوند، ئێك ژێری و ئێك ژووری، یێ ژووری ژمارا ئاكنجیێن وی نێزیكی (١٠٠) سەرۆكخێزانانن.

## سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ دۆستەك.

**باشووری،** گوندێ كورتكا.

**رۆژهەلاتی،** گوندی گیرەی.

**رۆژئاڤایی،** گوندێن بامشمش و كومانا.

سالا (٢٠٠٣)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییەڤەكرن، مزگەفتا نهایا گوندی سالا (٢٠٠١)ێ هاتییەئاڤاكرن.

د ژێدەراندا هاتییە ئەڤ گوندە كەڤنە گوندەكێ مەسیحییان بوو و شوینوارێن دێرەكێ ب ناڤێ ماركوركیس لێ هەنە، لێ ئەڤ گوندە نها یێ ڤالایە ژ مەسیحییان، ل سالا (١٨٥٠)ێ بادجەری سەرا ڤی گوندی دایە وەك ئەو دبێژیت ١٥ خێزانێن مەسیحی لێ هەبوون و پەرستڤان (كاهن)ەك هەبوو، دەستڤیسەكێ ئینجیلێ یێ سالا (١٧٥٥)ێ ب دەستێ كەسەكێ خەلكێ ڤی گوندی ب ناڤێ (ایشوع بن ابراهیم) هاتییەنڤیسین هێژ ل مەترانخانا كلدانییا ئاكرێ یە[٤٣].

## گوندێ ئەرتۆن ژێری:

ئەڤ گوندە دكەڤیتە دووریا (١٦كم) ژ ناحیا دینارتە، ل دەسپێكێ ئەڤ گوندە ل سەری بوو، لێ ژبەر نەبوونا خزمەتگوزیان پشتی سەرهلدانێ هاتییە نێزیكی رێیا گشتیا نەهلێ و تا نها لێ دئاكنجی نە خزمەتگوزاری ژی وەك ئاڤ و قوتابخانە و رێ و بەر ڤان هاتییە سەر رێیا گشتی ئاكنجی

بوونە. ژمارا ئاكنجییێن ڤی گوندی نێزیكی (٢٥٠) سەرۆكخێزانانن.

## سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ ئەرتوون ژووری.

**باشووری،** گوندێ كورتكا.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ گیرەی.

**رۆژئاڤایی،** گوندێن بامشمش و كومانا.

## پێكهاتا گوندی:

خەلكێ گوندی زێبارینە ژ گوندێ هنارێ هالتینە.

## ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

ڤی گوندی چەند كانی هەنە، مینا: كانییا باسكێ كوچێ، كانییا سیمی و گنشتێ ... هتد، ئاڤا كانییا باسكێ كوچێ ئاڤاكا بۆشە و وەك دبێژن مفادارە بۆ گولچیسكا.

## ژێدەرێ ژیارا خەلكێ گوندی:

ل بەرێ خەلكێ گوندی جۆتیار بوون، رەزێن دێمی و ئاڤی و بیستان هەبوون و جۆرێن فێقی مینا هنار و تری و هژیر و خۆخ و دەخل و دان سماق....و هتد دچاندن، لێ نها پتر بووینە خودان دەوام و كار ل گوندی كێم بوویەیەكەمین جار سالا (٢٠٠٠)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییەڤەكرن و سالا (١٩٨٦) ێ كارەب گەهشتییە گوندی و سالا (١٩٩٩)ێ مزگەفتا نهایا گوندی هاتییەئاڤاكرن.

خواندنگەهەك لێ هەیە كو ل سالا (٢٠٠٠)ێ بۆ ئێكەم جار هاتییە دامەزراندن و مزگەفت ژی ل سالا (١٩٩٩)ێ دا هاتییە ئاڤاكرن[٤٤].

## گوندێ گۆمانا:

ئەڤ جهە نە گوند بوو، بەلكی ئەردێ گوندێ بامشمشە، خەلكێ وی هەمی ل سالا (١٩٨٥)ێ ژ بامشمش و كادانا هاتینە و بوویە ئێك ژ گوندێن دەڤەرا نەهلێ و هەتا نها لێ دئاكنجی نە، ناڤێ

گوندێ بامشمش



گوندی ژی ل گۆمێن ئاڤێ هەی هاتییە، ئانکو شێوی گوندی وەکی گومایە.

## پێکهاتا گوندی:

پێکهاتا وی هەمی زێباری نە، خزم و کەس و کارێن ئێکن، دگەهنە (٣١) سەرۆکخێزان کو نها دبنە (١٣٠) کەس. پشتی گوند ئاڤابووی کارەب ژی هاتە گوندی و خواندنگەهـ ژی ل سالا (٢٠٠٠)ێ لێ هاتە ڤەکرن، دو مزگەفت لێ هەنە، ئێك ل سالێن نۆتان هاتییەئاڤاکرن و یا دی ژی ل سالا (٢٠١٢)ێ.

ژ جهێن ناڤدارێن گوندی گرێ قسرۆکی ل بەرێ قەسرەك ل سەر هەبوو و نها ژی مالەك ل سەر هاتییە ئاڤاکرن.

ژیارا خەلکێ ڤی گوندی ل سەر دەخل و دانی و رەز و سماقێ یە، ژبلی خودانکرنا مەر ۆ مالاتی ، لێ نها پتر ل سەر مووچانە[٤٥].

## گوندێ بامشمش:

گوندەکێ ب ئاڤ و داروبارە، دکەڤیتە دووریا نێزیکی (٢٠کم) ژ سەنتەرێ ناحیا دینارتە، ل سەر ناڤێ گوندی ژی بۆچوونێن جودا هەنە، دبێژن یێ ژ مشە یان ژی بای یان مژمژا هاتی.

د ژێدەرەکیدا هاتییە: دبیت ناڤێ دروست بانیشمونی بیت، گوندەکێ مەسیحی نشین بوو، بادجەری ل سالا (١٨٥٠)ێ سەرا ڤی گوندی دایە و دیتییە پەرستڤان (کاهن)ەك و دەهـ خێزانێن مەسیحی لێ هەبوون[٤٦].

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ مێرداڤیا.

**باشووری:** گوندێ کانی هژیرێك.

**رۆژهەلاتی:** گوندی ئەرتوون.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن دوودی ژێری و ژووری.

پرانییا خەلکێ وی دبنیاتدا خەلکێ گوندێن (گادانا، مێرداڤی، نیاخی، بانی، شەهی، دیی... هتد) هەر ل دەڤەرا زێباری نە، نها پتر ژ (٢٤٥) خانی لێ هەنە، دبنە (٤٠٠) سەرۆکخێزان.

شوینوار و جهێن ناڤدارێن گوندی: گرێ تاوکێ و ماوەت و داراچەمی کو گۆرستانەکا ب ناڤ و دەنگ و کەڤنارە. دیسان دێرەك ژی لێ هەیە و نها مالەك تێدا دژیت.

## ژێدەرێ ئاڤا گوندی:

زۆر کانی لێ هەنە و ئاڤا وی یا زۆرە، ژ وان کانییا: زێوە، محمد، بن توی، قەرەپێ، رەزی، رەزێ نك قەرەج، جەوەری....

ژیانا خەلکی وی پتر ل سەر چاندنا فێقی یە، وەکی سێڤ و خۆخ و هناروك و هژیر و گویز و و مەر و مالات ژی هەیە.

هەر وەسان ڤی دو مزگەفت ژی لێ هەنە، ئێك ل سالا (١٩٨٨)ێ و یا دووێ ل سالا (٢٠١٤)ێ هاتینە ئاڤاکرن. دو خواندنگەهـ ژی لێ هەنە، ئێك ل سالا (١٩٨٨)ێ و یا دووێ ل سالا (٢٠١١)ێ هاتینە ڤەکرن، هەروەسا بنەکەهێ ساخلەمیێ و سێ دەرمانخانە و دوکانێن پلاستیکی و فیتەر و کومرکێن فێقی و سێ سەرتراشخانە ژی لێ هەنە.

سالا (١٩٨٥)ێ خواندنگەهەکا سەرەتایی و سالا (٢٠٠١)ێ یا ئامادەیی ل گوندی هاتینە دامەزراندن .

## گوندێ میرداڤیا:

گوندەکێ بچویکێ عەشیرەتا زێباریان بوو، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ گوندی ٨٦ کەس بوون[٤٧]،د دەمێ ئەنفالاندا هاتییەخرابکرن و هەتا نها نەهاتییە ئاڤاکرن ڤە و وەکی خرابە مایە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندی کادانا.

**باشووری:** گوندێ بامشمش.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ دۆستەك.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ زەمەن.

ژیارا گوندی ل سەر مەر و مالاتی بوویە.

## گوندێ شەهێ:

ئێکە ژ گوندێن عەشیرەتا زێبارییان، بەری ئەنفالان هاتییە بەردان و وێرانکرن و خەلکێ وی پشتی هینگێ نەزڤرینەڤە گوندی، گوندەکێ ب ئاڤە و خەلك تنێ بۆ خودانکرنا مەر و مالاتی لێ دژین، بیستان تایبەت هنار هەبوون . ئاڤا گوندی ژ دو کانییێن: گوندی و سەروکانی بوو، دیسان سالا (١٩٦٠)ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەکرن، بەلێ ژبەر ئالوزبوونا سەروبەری خواندن لێ نەهاتییەکرن و گوند هاتەبەردان، ل سالێن هەشتییان هندەك ژ گوندییان زڤرینەڤە سەر گوندی بەلێ د ئەنفالاندا سالا (١٩٨٨)ێ هاتەڤەبەردان و وێرانکرن و هەتا نها یێ بەردایە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** دەڤەرا شاری.

**باشووری،** گوندێن گسێ و چەمسنی.

**رۆژهەلاتی،** گوندێن بەرزنار و زەمەن.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ چەم شرتێ.

## گوندێ زەمەنێ:

گوندەکێ بچویکێ عەشیرەتا زێبارییانە، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ تنێ کەس ل گوندی دژیان[٤٨]، بەری ئەنفالان هاتییە بەردان و وێرانکرن، پشتی هینگێ خەلکی وی ل سەر دەڤەرێن جودا مینا دەڤەرا نەهلێ و ئاکرێ و بەردەرەش بەلاڤبووینە و گوند نەهاتییە ئاڤاکرن ڤە، ناڤێ گوندی ژی دبێژن یا ژ (زەمەن، ب واتایا دەمێ کەڤن) هاتییە. ژیارا خەلکێ گوندی ل سەر خودانکرنا مەر و مالاتی بوویە، ئاڤارەکێ بەرفرەهـ نەبوویە، گوند ب چیایڤە و ل جهەکێ بلند بوو.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** دەڤەرا شاری.

**باشووری،** گوندێ دوودی ژووری.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ مێرداڤیا.

**رۆژئاڤا،** گوندێ شەهێ.

**گوندێ دوودی ژووری**



## گوندێ چەم شرتێ:

ئەو ژی هەر ل ئەنفالان هاتیبە بەردان و وێرانکرن، هەتا نها کەس لێ ناژیت، خەلکێ وی تنی بۆ مەر و مالاتی لێ دژین. ناڤێ گوندی یێ هاتی کو چەم و ئەردێ بەرفرەه لێ هەیە و ل بەرامبەر بەرهەم زۆر بدەستڤە دهیت، لەوما بوویە چەم شرتێ.

### سنوورێن گوندی :

**باکوری،** گوندێ دەکان.

**باشووری،** گوندێ دووپرێ.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ شەهێ.

**رۆژئاڤا،** ناحیا چەمانکێ[٤٩].

## دوودی ژێری:

ئەڤ گوندە ژی ئێکە ژ گوندێن عەشیرەتا زێباریان، ژمارا سەرۆك خێزانێن وی پتریبا (١٥٠) نە د ناڤا(٧٦) مالان دا، د سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێدا ئاماژە ب دو گوندێن دودی هاتییەکرن، دودی کەڤن هژمارا خەلکێ وی تنێ ١٢ کەس بوون، دەدی مەسیحی هژمارا خەلکێ وی ٧٣ کەس بوون[٥٠] رامانا ناڤێ گوندی ژ کۆ (دو- دێ) هاتییە دبیتە دودی.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ دوودی ژووری.

**باشووری،** گوندێ زنا.

**رۆژهەلاتی،** گوندێن کانی هژریك و بامشمش.

**رۆژئاڤایی،** گوندی گسێ.

### زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیارا خەلکێ وی سەر مەر ۆ مالات و دەخل و دانی بوو، نها ئەڤ چەندە هاتییە گوهۆرین. ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی دکێمن، تنی دو کانیێن بچویك ب ناڤێن (کانییا گوندی و پەتۆك) لێ هەنە، یا دووێ خەلکێ گوندی ل رۆژەکا بهاری هەتا ئێڤاری پێکڤە دچنە سەیرانێ ل سەر ڤێ کانیێ. گوندی دو مزگەفت هەنە، ئێك سالا (١٩٩٥)ێ هاتییەئاڤاکرن و یا دی سالا (٢٠١٥)ێ. کارەب ژی ل سالا (١٩٨٨)ێ گەهشتییە گوندی و خواندنگەهـ ل (٢٠٠٠)ێ لێ هاتییە ڤەکرن.

## گوندێ دوودی ژووری:

گوند دکەڤیتە دووراتییا (٢٥کم) ژ سەنتەرێ ناحیا دینارتە، رۆژئاڤایێ گوندێ بامشمش، رامانا ناڤێ گوندی ژ دو گوند (دو- دێ) هاتییە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ زەمنێ.

**باشووری،** گوندێ دوودی ژێرێ.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ بامشمش.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ گسێ. بەرزناری

### پێکهاتا گوندی:

پرانییا خەلکێ گوندی خزم و کەس و کارێن ئێکن ژ عەشیرەتا زێباریان و دبنە (٩٠) خانی پتر و نێزیکی (١٦٠) سەرۆك خێزانان.

### زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

گوندەکێ کێم ئاڤە و مەر و مالاتی خودان دکەن، ژیانا هندەك خەلکێ گوندی ل سەر چاندنێ یە، تایبەت چاندنا ئاڤی مینا (گویز و سێڤ و خۆخ و هنار) و عەردێ چیایی ژی هەیە و سماق و تری لێ چاندینە، سالا ٢٠٠٠ێ خواندنگەهـ لێ هاتییەڤەکرن و سالا ٢٠٠١ێ ئاڤاهیێ مزگەفتێ بۆ هاتییەئاڤاکرن[٥١].

## گوندێ دوی پرێ:

گوندی ناڤ و دەنگێ خۆ وەکی جهەکێ

گەشتیاری هەیە و خەلكەكێ زۆر قەست دكەنێ، دكەڤیتە نێزیكی ناحیا چەمانكی، ل گوندی دو پر هەنە لەوما ناڤێ گوندی ژی بوویە دووپرێ.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ چەمشرتێ.

**باشووری،** گوندێ كەشكاڤا.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ پیرمەوی.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ سریان.

ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ تنێ ٤٧ كەس ل ڤی گوندی دژیان[٥٢]، ئەڤ گوندە نها (٢١) مالن و هژمارەكا كێم یا كەسان لێ دژین، خواندنگەهـ و مزگەفت ل سالا (٢٠٠٣)ێ ل گوندی هاتینە دروستكرن و كارەب ژی ل گوندی هەیە، ڤی گوندی رووبارەكێ مەزن ب رەخ را دچیت و چەند كانی ژی لێ هەنە، وەكی كانیا دێشینێ، كانیا زەرك و رەز و باغ ل بەر دهێنەكرن.

## گوندێ چەمێ سنێ:

گوندەكێ بچووكە و تنێ حەفت مالن كو دبنە (٣٠) كەس، ناڤێ گوندێ ژی ژ گەلی هاتییە، ژین و ژیارا وان ل سەر مەر ۆ مالاتی یە، و نها پتر ل سەر مووچانە.

## گوندێ بەرزنار:

ئەڤ گوندە نێزیكی گوندێ گسێ یە، ژ گوندێن بچویكێن دەڤەرا زێباریانە، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ تنێ ٢٥ كەس ل ڤی گوندی دژیان[٥٣]، نها ٢١خانی هەنە و نزیكی ١٠٠ كەسان لێ دژین، ناڤێ گوندی ژ بەر و زنار هاتییە و بوویە بەرزنار.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ شەهێ.

**باشووری،** گوندێ گوهانا

**رۆژهەلاتی،** گوندێ دوودی ژووری

**رۆژئاڤایی،** گوندێ گسێ.

سالا (٢٠٠٠)ێ كارەب گەهشتییە گوندی، سالا (٢٠٠٩)ێ ئاڤاهیێ مزگەفتا نها بۆ گوندی هاتییەئاڤاكرن، خواندنگەهـ ل گوندی نینە.

## گوندێ كەشكاڤا:

گوندەكێ مەسیحی نشینە و گەلەكێ ب ئاڤە، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلكێ گوندی ١٧٤ كەس بوو[٥٤]، نها نها نێزیكی (٣٧) مالانە كو دبنە (٤٠) سەرۆك خێزانن، ل هاڤینان لێ دژین و زڤستانان قەستا باژێران دكەن و هژمارا وان یا جێگیر نینە، گوند و ژیارا خەلكێ وی ل سەر رەز بیستانانە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ زێكێ.

**باشوور و رۆژئاڤایی،** دەڤەرا سەرسنگی یە.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ چەم سنێ.

## گوندێ بیلمەوی:

گوندەكێ بچویكێ زێباریانە و نەهاتییەڤە ئاڤاكرن، تنێ بۆ ژیانا رۆژانە نێزیكی سێ چار مال جار جار لێ دژین.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ چەم شرتێ.

**باشووری،** گوندێ گەلی كسنێ.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ دەكان.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ دووپرێ[٥٥].

## گوندێ گسێ:

گوندەكە دكەڤیتە رۆژئاڤایێ گوندێ نەهلێ ب دووریا (٣٠كم) ژ سەنتەرێ دینارتە دوورە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێن شەهێ و بەرزنار.

**باشووری،** گوندێن گاهانا و میمبەرێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێن دوودیا ژووری و ژێری.
**رۆژئاڤایی:** گوندێ چەم سنێ.

## پێکهاتا گوندی:

پرانییا خەلکێ گوندی خزم و کەس و کارێن ئێکن زێباری نە، ژ (٩٠) مالان و نێزیکی (١٦٠) سەرۆك خێزانان و ژ بنەمالێن: سیاری، سوفی، مامومەر، حجی ئیبراهیم، حەدوو، ئەحمەد، مشیر، پیر و حجی پێکهاتینە.

ئەڤ گوندە زۆر مەر و مالاتی خوداندکەن، هەر وەسان خەلکێ وی چاندنێ ژی دکەن، ب تایبەت چاندنا دەخل و دان و جەهـ و نیسك و نۆکـ و.... هتد، دیسان سماق و تری هەنە. ل ناڤەراستا سالا (٢٠٠٠)ێ خواندنگەهـ و سالا (١٩٩٤)ێ مزگەفت ل گوندی هاتینەئاڤاکرن.

دو کانی ب ناڤێن: تال و کورمار هەنە بەلێ ئاڤەکا کێمە.

شوینوارێن دێرەکێ ب بەرێن نەخشاندی لێ هەیە و گرەکێ ناڤدار ب ناڤێ گرێ گرانی و بیرەك ل گوندی هەنە.

## گوندێ گوهانا:

گوند دکەڤیتە رۆژئاڤایێ باشوورێ گوندێ گسێ، نێزیکێ (١٥) مالانە کو دبنە (٣٠) سەرۆك خێزان ژ بنەمالەکێنە ب ناڤێ بنەمالا حەجی محەمەدی، و ژیانا وان ل سەر مەر و مالاتی و چاندنێ یە، سالا (١٩٩٥)ێ کارەب گەهشتییە گوندی و سالا (٢٠٠٠)ێ خواندنگەهـ لێ هاتییەڤەکرن.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ گسێ.
**باشووری:** گوندێ شوشێ
**رۆژهەلاتی:** گوندێ زانا.
**رۆژئاڤایی:** گوندێ میمبەرێ.

## گوندێ زانا:

گوندەکێ بچویکێ دەڤەرا دینارتە یە، ژ (٢٥) مالان پێکدهێت، دبنە (٣٣) سەرۆك خێزان.. هەموو گوند ژ بنەمالا محەمەد نەعمانی یە، سالا (٢٠٠٠)ێ خواندنگەهـ و مزگەفت لێ هاتینەڤەکرن.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** کانی هژریك و دوویا ژێری.
**باشووری:** گوندك
**رۆژهەلاتی:** گوندێ کورتکا.
**رۆژئاڤایی:** گوندێ گوهانا.

## گوندێ میمبەرێ:

گوندەکێ نە یێ مەزنێ دەڤەرا نەهلێ یە، ژ (١٨) مالان پێکدهێت، دبنە (٢٤) سەرۆك خێزان. خزمەتگوزارێن کارەب و مزگەفتێ لێ هەنە و خواندنگەهـ ژی ل سالا (٢٠٠٢)ێ لێ هاتییە ئاڤاکرن.

ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی کێمن، دو کانی ب ناڤێن: گویسك و گەلی هەنە بۆ ڤەخوارنێ د باش نینن.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێن گسێ و چەم سنێ.
**باشووری:** گوندێ شووش.
**رۆژهەلاتی:** گوندێ گاهانا.
**رۆژئاڤایی:** گەلی گسنێ.

## گوندێ کورتکا کەڤن:

گوند دکەڤیتە زنارێ گوندێن نەهلێ ب دووریا (٣٥کم) و پرانییا خەلکێ وی خزم و کەس و کارێن ئێکن ژ عەشیرەتا زێباریان، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ تنێ ئێك گوند ب ناڤێ کورتکا هەیە و وێ سالێ هژمارا خەلکێ گوندی تنێ ١٦ کەس بوو[٥٦]، نها (٥٠) خانی ل کورتکا کەڤن هەنە کو دبنە نێزیکی ١٦٠ سەرۆك خێزانان، گوندەکێ ب ئاڤە و مەر ۆ مالاتەکێ زۆر لێ هەیە، ژیارا خەلکی وی پتر ل سەر چاندنێ یە، ب تایبەت چاندنا ئاڤی، مینا (گویز و سێڤ و خۆخ و هنار) و عەردێ چیایی ژی سماق و تری لێ دچینن و گوندی چەند کانی هەنە، مینا کانییا زەرك، کانییا گوندی، کانییا گیرەی.

دیسان مزگەفت ژی لێ هەیە و ل سالا (١٩٩٨)ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەكرن.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری،** گوندێن گیرەی و ئەرتوون.

**باشووری،** گوندێ خەردس.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ مێرگەرەش.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ زانا.

## گوندێ كورتكا نوی:

ئەڤ گوندە ژی ب سەر كورتكا كەڤن ڤەیە و هەمان سنوور هەنە، دو سێ برا چووینە ڤی جهی و بوویە گوندەكێ بچویك و هەتا نها ژی ئاڤایە. هەر ژ كورتكا كەڤن هاتینە ڤی گوندی .

## گوندێ مێرگەرەشێ:

گوند دكەڤیتە دووراتییا (٢٥كم) ژ دینارتە، ناڤێ گوندی ژ (مێرگ و رەش) هاتییە و بوویە مێرگەرەش.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری،** گوندێ سیان.

**باشووری،** گوندێ خەردس.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ موسلیان.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ كورتكا نوێ.

پرانییا خەلكێ گوندی خزم و كەس و كارێن ئێكن ژ عەشیرەتا زێبارییان، نێزیكی (٢٠) مالانە كو دبنە (٢٤) سەرۆك خێزان، زۆر مەر و مالاتی ب خودان دكەن، عەردێ چیایی ژی هەیە و سماق و تری لێ دچینن. ڤی گوندی كانیەكا ئاڤێ ب ناڤێ گەلی و ئێكا دی ب ناڤێ گوندی هەنە. سالا (١٩٩٩)ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ئاڤاكرن و مزگەفت ژی لێ هەیە.

## گوندێ موصلیان:

گوند دكەڤیتە دووراتییا (٢٠كم) ژ دینارتێ، پرانییا خەلكێ وی خزم و كەس و كارێن ئێكن زێبارینە، دبنە (١٠) مال و نێزیكی (١٦) سەرۆك خێزانان، ژیانا پتریا خەلكی وی ل سەر چاندنێ یە و عەردێ چیایی ژی سماق و تری لێ دچینن، هەر وەسان خەلكێ گوندی تەرش و كەوالی ژی ب خودان دكەن.

**سنوورێن گوندێ:**

**باكووری،** گوندێن سیان و دفریی.

**باشووری،** سەنتەرێ باژێرێ ئاكرێ.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ ئاڤدەلكا.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ مێرگەرەش.

## گوندێ ئاڤدەلكا:

گوندەكە دكەڤیتە دووراتییا نێزیكی (١٥كم) ژ سەنتەری ناحیێ، ناڤێ گوندی یێ ژ ناڤێ (ئاڤدەل بەگی) هاتی كو دبێژن كەسەك هەبوویە خانیێ وی یان مالا وی ل وێرێ بوویە و ناڤێ وی یێ كەفتیە سەر گوندی و ناڤ یێ سڤك بووی و بوویە ئاڤدەلكا.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری،** گوندێ دڤری .

**باشووری،** چیایی ئاكرێ و سەنتەرێ ئاكرێ .

**رۆژهەلاتی،** گوندێ شرتا.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ موسلیانێ.

خەلكێ ڤی گوندی زیباری نە و دبنیات دا (بەنی ماوەتی) نە، چونكی جاران وارێ (بەنی ماوەتیا) بوویە، هاڤینێ دهاتنە وێرێ و پاشی بوویە گوند. ڤی گوندی چەند كانی وەكی ژێدەرێن ئاڤێ هەنە، مینا كانیێن ئەڤ گوندە دەكان، ئاگر ژووری و ئاگر ژێروو هەرد ڤالانە، كەمپا ئەشغالێ و بابۆلا، زێوكە، بەراسكا ڤالایە و گرێ صور ڤالایە، خالانە، چەم شارلك...

# ناحیا گردەسێن*

سەدیق هەركی

## ناحیا گردەسین ژلایێ كارگیری ڤە:

گردەسێن ئێكە ژ سێ ناحیێن (دینارتە، بجیل و گردەسین) سەر ب قەزا ئاكری، دكەڤیتە باشووری ئاكرێ و دگەل هەردو ناحیێن (بجیل و دینارتە) قەزا ئاكرێ پێكدئینن، ب رووبەرێ خۆیێ بەرفرەهـ ژ سەنتەرێ باژێری و سنوورێن وی دبوارێ چاندنێ و پەزدارێ دا بەرنیاس و ناڤدارە.

## سنوورێن كارگێرییێن ناحیێ:

ناحیا گردەسێن دكەڤیتە باشوورێ رۆژهەلاتێ ناوەندا قەزا ئاكرێ ب دووراتیيا (١٠كم) و ل رۆژهەلاتێ سنوورێ ناحیا (بجیل) و رووبارێ (زنتا) جودا دكەت، ژ لایێ رۆژئاڤای سنوورێ ناحیا (قەسروك) و رووبارێ (خازر) جودا دكەت كو سەر ب قەزا (شێخان)ە، ل سنوورێ باشووری و دگەل قەزا (بەردەرەش) قەزا ناوەندی و گوندین سەر ب وان ڤە دكەڤنە سنوورێ باكورێ ناحیا گردەسێن[1].

## مێژووا یەكا كارگێریێ:
## بریارا ب ناحیەكرنا گردەسێنی:

گردەسێن بەری ببیتە ناحیيە گوندەكێ بچویكێ سەر ب ناحیا (بەردەرەش)بوو، ل دووڤ سەرژمێریيا سالا ١٩٥٧ێ یا عیراقێ هژمارا خەلكێ گوندی تنێ ٢٩ كەس بوو[2]، رامانا پەیڤا گردەسێن دهیت ژ پەیڤا (سێ گرد) ژبەركو دكەفیتە دناڤبەرا سێ گرێن مەزن بەلێ ب تێپەربوونا دەمی ناڤێ وێ گۆرانكاری بسەردا هاتییە بوویە (گردەسێن).

گردەسێن ل دووڤ بریارەكا كۆماری (مرسوم جمهوری) كو ل ٣١تیرمەها ١٩٧٢ێ سەردەمێ سەرۆك كومارێ عێراقێ (ئەحمەد حەسەن بەكر) بریارا ناحییە بوونا وێ هاتییەدان[3]، ئەڤەژی وەكو دەستكەفتەكێ رێكەفتننامەا دیرۆكیيا ١١ ئاداری بوو و ل سالا (١٩٧٦) ب ئاوایەكێ فەرمی وەك ناحییە دەست بكاربوو[5].

یەكەم رێڤەبەرێ ناحیێ (عەلی عەزیز) ناسراو ب (ابو عقیل) بوو، خەلكێ كەركووكێ ب رەگەز عەرەب بوو، تاكو سالا (١٩٨٥) رێڤەبەرێ ناحیا گردەسێن بوو، د وێ قۆناغێدا ئاڤاهییەك بۆ ناحیا گردەسین هاتە چێكرن ژ دو بەشان پێكدهات، بەشەك بۆ رێڤەبەریيا ناحیێ و بەشەك بۆ بنكەهێ پۆلیسێن گردەسێن[5].

پاشان (ئەردەلان عیزەدین هركی) وەكو دووەم رێڤەبەرێ ناحیێ دەست بكار بوو، ل ١١ نیسانا ١٩٨٧ێ ب بریارا كۆماری (مرسوم جمهوری) هژمار ٣٢١ناحیا گردەسێن دگەل چەند ناحیەكێن دی یێن

كوردستانێ هاتەهەلوەشاندن[٦].

ناحیا گردەسێن ژی تەڤلی قەزا ئاكرێ ل ١٩٩١/٣/١٢ دەست ب سەرهلدانێ كر و ل وی دەمی خەلكێ دەڤەرێ بخۆ یێ چەكدار بوو ئەڤەژی پالدەرێك بوو بۆ سەرهلدانێ[٧].ل سەردەمێ حكۆمەتا هەرێما كوردستانێ و سالا (١٩٩٧) سەر ژ نوو هەمی یەكێن كارگێری ئەوێن هاتینە هەلوەشاندن هاتنەڤە دامەزراندن و گردەسێن ژی یەك ژ وان ناحیەیان بوو و ل سەردەمێ كابینا سێ یێ ئەڤ بریارە جێبەجێبوو و ناحیا گردەسێن ل (٢٢نیسانا ١٩٩٧ێ) دامەزراندنەڤە[٨].

د ڤێ قۆناغێدا یەكەم رێڤەبەر كو دەست بكار بووی سالا (١٩٩٧) (بشار محەمەد عەبدۆللا)، و دووڤرا

١. عەبدۆلباقی محەمەد رشید - ١٩٩٩
٢. بەهمەن محەمەد عەبدۆللا - ٢٠٠٠
٣. عەبدولباقی محەمەد رەشید - ٢٠٠١
٤. بروا فاروق سعید - ٢٠٠٢
٥. بشار محەمەد عەبدۆللا - ٢٠٠٤
٦. سربست خالد بانی، - ٢٠٠٤-٢٠١٧
٧. سەگڤان سەبری سلێڤانەی - ٢٠١٧/١١/٢٣

ل ٢٣ چریا ئێكێ ١٩٩٧ێ بەشێ دارایی و ٢٤ گولانا ١٩٩٨ێ بنكەهێ پۆلیسان ل ناحیێ هاتنەڤەكرن و ل ١ حزیرانا ١٩٩٨ێ سەرۆكاتییا بازێرڤانییا گردەسین دوبارە هاتەڤەكرن[٩].

ناحیا گردەسێن ١٠٥ گوندا بخۆڤە دگریت، رووبەرێ ناحیێ گەلەك یێ بەرفرەهە دگەهیتە (٦١٠كم٢)ە و ئاكنجیێن سەنتەرێ ناحیێ (٧٨٠) مالن، هەروەسا گرنگترین گوندێن وێ ئەڤەنە (بەیینەوا- كونسیخور- سوسنا - ئالەیێ - باشڤال رەڤەند - جونان - نهاوا - بازێرە ژور -خەلیلكان - كوشك - سەردەریان - زنلكە فاخر - خرابە ژێر - سەركەڤروك - ئومەر خوشان - كێلەیێ - باقسێ - پیرخولین -گرگۆران)[١٠]، ل دووڤ ل سەرژمێریا تەخمینیا رێڤەبەریا ئامارا دهۆكی بۆ سالا ٢٠١٦ هژمارا خەلكێ سەرانسەری ناحیێ ٤٩٤١١ كەسە و ژ وانا ٤٢٠٨كەس ل سەنتەرێ ناحیێ ئانكو بازێركێ گردەسێن دژین[١١].

ل سەنتەرێ ناحیا گردەسێن و گوندێن وێ (٤) بنكەهێن ساخلەمیێ و (٨٩) خواندنگەهێن بنەرەتی و (٧) خواندنگەهێن ئامادەیی هەنە[١٢].

ل سنوورێ ناحیا گردەسێن چەند جهێن شوینواری ژی هەنە كو مێژوویا وان ل دووڤ هندەك سەرچاوا دزڤریتە (٢٠٠٠) سالا بەری زایینی، ئەڤ چەندەژی ل دووڤ پیزانینێن سازیەكا ئەمریكیا تایبەت ب شوینواری كو ل سالا (٢٠٠٨) سەرەدانا وان جهێن شوینواری كریە وەكی گرێ تلبوكێ و گرێ بەدریكێ و گرێ مرێبا و گرێ گرزەنكل و گرێ گردەسێن ل ناڤ گردەسێن، دبێژن مێژوویا وان ڤەدگەریت بۆ سەردەمێ (ئەسكەندەرێ مەكدونی) چونكی دەڤەرا گردەسێن جهەكێ نێزیك بوو بۆ دەربازبونێ بۆ هەولێر و جهێن وەك كەركووك و بەغدا، ئەڤ گرێن هەنێ زنجیرەكا گرا پێك دئینن هەتا دگەهیتە گرێن زاخۆ و دەربازدبن بەرەڤ جزیرێ دهاتنە بكارئینان بۆ چاڤدێریكرنا سنووران و هەروەسا د وی دەمیدا كو ئامرازێن پەیوەندییان (اتصالات) نەبوون ئەڤ گرە پێش وێ چەندێ دهاتنە بكارئینان، دەمێ دوژمنا هێرش ئینابان دا نیشانێن ئاگری سەر ڤان گران هێنە هەلكرن بۆ هایداركرنا لەشكەری، و هەروەسا (كەلەدێر) ب ناڤ و دەنگترین جهێن شوینواری یێن دەڤەرێ یە [١٣].

## بازێرڤانییا گردەسێن :

دگەل دامەزراندنا ناحیا گردەسێن بازێرڤانییا گردەسێن هاتە دامەزراندن، بەلام ناڤەكێ بێ ناڤەرۆك و هیچ كارەك بو بازێرڤانیێ نەهاتەكرن، ئێكەم سەرۆك وێ (عەباس خەلیل عەباس) بوو، پشتی وی (سەلاح حسێن) بوو سەرۆكێ بازێرڤانییا گردەسێن، سالا (١٩٨٩) سەرۆكاتیا بازێرڤانیێ هاتە هەلوەشاندن، سالا (١٩٩٨) ب بریارا حكۆمەتا هەرێما كوردستانێ سەر ژنوو هاتە دانان و (دلشاد محەمەد رەجەب) سەرۆكاتییا بازێرڤانییا گردەسێن تاكو (٢٠٠٧/٥/٢٧)

گرتەدەست، پشتی هەلبژارتنا شارەوانیێ (لەتیف سلێمان عەبدوڵلا) بۆ سەرۆکێ باژێرڤانییا گردەسین و دگەل چوار کەسێن دیکە وەکی ئەنجومەنێ باژێرڤانییا گردەسێن، پشتی هینگێ (هشیار رشید ئەیوب) بوویە سەرۆکێ باژێرڤانیێ، نها ئەندازیار (عیزەدین مستەفا میکائیل) وەکو سەرۆکێ باژێرڤانییا گردەسین کاردکەت[١٤]، گردەسێن (٦) تاخان تاخێن (ئاشتی، ئازادی، دیموکراتی، برایەتی، ئاراس و شەهیدان) بخۆڤە دگریت[١٥].

## دام و دەزگەهێن میری ل سنوورێ ناحیا گردەسێن:

١. رێڤەبەریا ناحیا گردەسێن
٢. پشکا دارایبا ناحیا گردەسێن
٣. سەرۆکاتیا باژێرڤانیا گردەسێن
٤. بنکەهێ پۆلیسێن گردەسێن
٥. بنکەهێ ئاگرڤەمراندنا گردەسێن
٦. لێکەریا پوستە و گەهاندنا گردەسێن
٧. بنکەهێ تەندروستی گردەسێن
٨. پشکا ڤیتەرنەری گردەسێن
٩. بنکەهێ دارستانا گردەسێن
١٠. هوبا کشتوکالی گردەسێن
١١. بنکەهێ تەندروستی سوسنا
١٢. بنکەهێ تەندروستی خەلانە
١٣. بنکەهێ تەندروستی سەردەریان
١٤. بنکەهێ تەندروستی کەمپا ماماليان[١٦].

ل ناڤ گردەسێن ئەڤ مولك و ئاڤاهيێن حکۆمەتێ هەنە:

١. بنکەهێ ڤیتەرنەری
٢. ئاڤاهیێ هوبا چاندنێ
٣. ئاڤاهیێ بنکەهێ پۆلیسێن گردەسێن
٤. ئاڤاهیێ پوستە و گەهاندنا گردەسێن
٥. ئاڤاهیێ ناحیا گردەسێن یا نوی
٦. خانیێ رێڤەبەرێ ناحیێ
٧. ئاڤاهیێ قوتابخانا (سەرەتایی و ئامادەیی)
٨. (١١) دوکانێن سەرۆکاتیا باژێرڤانیا گردەسێن
٩. ئاڤاهیێ باژێرڤانییا گردەسێن
١٠. دوو (٢) مزگەفت (الاداره المحليه)
١١. ساخلەمیا گردەسێن[١٧].

گردەسێن تاکە ناحیەیە زۆر دام و دەزگەهێن میری لێ نینن، تاکە ناحیەیە هەتا نها سەنتەرێ رەوشەنبیری و فەرمانگەها دادنووسی (کاتب عدل) لێ نینە، زێدەباری وێ چەندێ کو هەڤسنوورە دگەل باژێرڤانییا ئاکرێ ئەردێ وێ یێ چاندنێ بەر دابەشکرنێ بۆ ئاکنجیکرنێ دکەڤیت، ئانکو هەموو دابەشکرنا عەردی ل سنوورێن گردەسێنی تێتەکرن چنکی (دینارتە و بجیل) دەڤەرا وان چیایی نە و هەر پرۆژەکێ بهێتە چێکرن ل سنوورێن ناحیا گردەسێنی عەرد بو دهێتەتەرخانکرن، بەلێ سەرهندێ را خەلکێ گردەسێنی سودمەند نەبوونە ژوان پروژان پتر خەلکەکێ دیتر سودمەند بووینە وەکی کارگەها کومکرنا گلێشی و کارگەها غازێ و کارگەها ڤیری و کارێن دناڤا کەمپا (ماماليان) کو ل دووڤ یاسایا دڤێت خەلکێ ناحیێ ل پێشتر بیت بەلێ وەکو پێویست نی یە[١٨].

## • پێکهاتا خەلکێ ناحیێ:

ناحیا گردەسین (٧) عەشیرەتێن سەرەکی بخۆڤە دگریت، ئەوژی عەشیرەتێن (هەرکی و سۆرچی و زێباری و گۆران و مزووری و میران و موسارەشی) نە، هەرکی زۆریەی پێکهاتا ناحیێ پێکدئینیت کو نێزیکی (٨٥٪) هەرکینە.

ژبەرکو عەشیرەتا هەرکی پتریا ئاکنجیێت ناحیێ پێکدئینیت دڤێت ب کورتی سەرنجێ بدەینە سەر هاتنا وێ بۆ ڤێ ناحیێ و زاراڤێ پەیڤا (هەرکی).

پشتی شەرێ جیهانیێ ئێکێ و سەرژنوو دابەشکرنا کوردستانێ هەرکی هاتینە دابەشکرن ل سەر ترکیا و عێراق و ئێران و سەرژمێرا وان دەوروبەرێ (١,٥) ملیون کەس بوو، ٥٠٠٠ سەرۆکخێزان بوون گەرمیان و کوێستان (دەشت و زۆزان) دکرن.

بۆچوونەك دبێژت: هەركی ل بنییا چیایێ شنگالێ هاتینە بۆ لایێ تركیا، پەیڤا هەركی ب رامانا (ئەرك) یان (هەرك) دهێت ناڤە كو ل بنارا چیایێ شەنگالێ بوو مایە پێڤە[19].

هەروەسا بۆچوونەك دی دبێژیت، كو پەیڤا هەركی یا ژ (هەكاری) هاتی كو لڤێ دەڤەرێ ئاكنجی ببوون و پێن ژ وێ دەڤەرێ هاتین[20].

(هەركی عەشیرەتەكا كوردیا رەسەنن، كارێ سەرەكیێ وان (شڤانی) بوو، بنیاتێ وان دزڤریتەڤە بۆ پارێزگەها (ئورمیێ) ل كوردستانا رۆژهەلات (ئیرانێ)، بەلێ پشتی دانانا دەولەتا عیراقێ و دانانا سنوورێن دەولەتی بەشەك زۆر ژ وێ عەشیرەتێ مانە ل كوردستانا باشووری، پشتی مانا وان ل ڤی جهی فێری چاندنێ بوون و پشتی دژواربوونا كارێ كوچەریێ بەشەك زۆر ژ عەشیرەتێ هاتنە ناحیا (گردەسێن) و گوندێن دەوروبەر هەتا رووبارێ خازر و قەزایا ئاكرێ كو ب گشتی دبیتە سەنتەرێ وێ عەشیرەتێ و بەشەك دی ژوان ل پارێزگەها هەولێرێ نیشەتجێبوون[21].

### تیرەیێن عەشیرەتا هەركی و ناڤدارێن هەر تیرەیەكێ دگەل رولێ وان ب كورتی ل سنوورێ ناحیا گردەسین:

مام براهیما (خافیر علی رەشو)، مام حاجكا (جوهەر دینو حاجو)، مالە زاهێر (كامل تاهر موحەمەد)، مالە كێوی ( حەمە خانكە حجی)، مالە بەد (سەلیم موحەمەد عومەر)، مالە سوار (باسو شورو هركی)، مالە مەلا (خانو تەها ئەحمەد)، مالە پیر(جەبار عەباس مستفی)، مالە حسێن (حەجی سمایل جەلال)، ئاودیا (تەها عومەر شێخو)، بێداوی (حەسەن ابراهیم عەزو)، بابێزدینی (گەلو ئەحمەد خەواجە)، سمایلی (شەهاب سمایل سمایل)، ئاقوبا (شاهین تاهر سەلیم)، كانییە سپی (حەجی كەریم سالح)، هەسنی (دەسكو هەركی)، مالە مەمەدی (كەبیر خان ئاودەل)، مژدینی (حەجی دینو هەركی)، ستونی (محەمەد عەلی ئەبابەكر) و مام شێخا (تاهر خواجە بیرو هەركی)[22].

یا دیارە رۆلێ مەزنێ هەر تیرەیەكێ ژ چارەسەركرنا كێشە و ئاریشەیێن جڤاكی و ژن و ژنخوازتنێ دیاردبیت، هەروەسا خەلكێ ناحیێ چ جارا كێشەیێن سیاسی نەبوونە تنێ كێشەیێن جڤاكینە وەك: كێشەیێن سەرا عەردا و مەر و مالاتی و مولكداریێ ئەڤ كێشە ژی ب زۆری ژلایێ مەزنێن وان تیرا دهێنە چارەسەركرن[23].

### پەیوەندییێن خەلكێ ناحیێ دگەل هەڤدوو و خەلكێ دیتر:

ژ بەركو پێكهاتا ناحیێ ب زۆری هەركی نە و عەشائیری یە، پتر خزماتی دناڤبەرا واندا هەیە، ب خزمایەتیێ و رێكا ژنا و ژنخوازتنێ دگەهنەئێك، ڤێ چەندێ وەكرییە كو پەیوەندیێن خەلكی گەل ئێك خوش ببن و ئەڤەژی پتر د روژێن جەژنا دا دیار دبن[24].

## پەروەردە و زانست و فێركرن:

### ١. خواندنگەهێن ئایینی:

پێشی سالا (٢٠٠٠) ژبلی پەروەردەكرنا زارۆكان د خواندنگەهێن فەرمی دا، د مزگەفتاندا ژی زارۆك دهاتنە پەروەردەكرن، فێری قورئان خاندنێ و شەریعەتی و بنەمایێن دینی دكرن، بەلێ پشتی ڤێ سالێ ژبەر هندەك هوكارێن سیاسی ئەڤ چەندە نەمایە[25].

ل سنوورێ ناحیا گردەسێن (٦٩) مزگەفت هەنە و نێزیكی (٢٥) گوندا مزگەفت بۆ نەهاتینە چێكرن، سەنتەرێ ناحیێ (٢) دو مزگەفت هەنە ئەوژی پێویستی ب نوژەنكرنێ نە، هەروەسا ل سنوورێ ناحیێ دو گوندێن مەسیحیان هەنە ئەوژی گوندێ (نهاوا و خەرجەوا) و تنێ (١) كەنیسە ل گوندێ خەرجەوا هەیە ئەوژی ل سالا (٢٠١٤) هاتییە چێكرن پشتی هندەك خێزانێت مەسیحی ژ بەغدا هاتینە ڤی گوندی[26].

### ٢. خواندنگەهێن فەرمی:

پەروەردە ل سنوورێ ناحیێ تا رادەیەكی د ئاستەكێ

باش دایە، سالانە رێژەیەکا زۆر ژ قوتابییان ل سەر ئاستێ پەروەردەیا ئاکرێ نمرێن بلند د تاقیکرنێن وەزاریدا دەستڤەتینن و دبنە دەرچوییێن ئێکێ ل سەر قەزا ئاکرێ و سالانە رێژەکا زۆر ل زانکۆیان پەیمانگەهان دهێنە وەرگرتن[٢٧].

ل سنوورێ ناحیێ (١٠٠) خواندنگەهێن فەرمی هەنە، و ل سەنتەرێ ناحیێ (٣) خواندنگەهـ هەنە کو یەك ژوان خواندنگەها بنەرەتییە و هەتا پۆلا شەشێ و یادیتر بنەرەتییە هەتا پۆلا نەهێ لێ دهێتەخواندن و یا دیتر خواندنگەهەکا ئامادەیی هەیە[٢٨].

ژلایێ هۆنەریڤە وەکی سترانبێژ و باشنڤیس و هونەرمەندێن نیگارکێش :

ب گشتی ل ناحیا گردەسێن چ بزاڤێن هۆنەری و جهێن ئەنجامدانا چالاکیێن هۆنەری نینن، تنێ هونەرەکێ کێم هەیە وەك هونەرمەندی (عەبدۆللا ئەحمەد عارس) پتر دهێتە نیاسین ب (عەبدۆللا هەرکی) و سترانێن ئەڤینیێ و فولکلوری و نیشتمانی دبێژیت و پتر ل شەهیانان دهێتە دیتن، هەروەسا باشنڤیس (م: هیشام سلێمان، م: لەتیف سلێمان) و هۆنەرمەندێن نیگارکێش وەکو (ریناس ئەحمەد محەمەد) و (فەرهەنگ چەتو حسێن) کو بەشداری د چەند پێشانگەهان دا کرییە و ژوانژی پێشانگەها سەر ئاستێ کوردستانێ ل سلێمانیێ کو کەڤالێن وی پلا شەشێ دەستڤە ئینان دیبە[٢٩].

## ئامار و سەرژمێریا خەلکی و پێکهاتا وێ یا نەتەوەیی:

ل دووڤ ئامارەکا نە فەرمیا سالا (٢٠٠٩) هژمارا ئاکنجیێن ناحیێ و گوندێن سەر ب ناحیێ ڤە (٤٩٨٠٧) کەسن و هژمارا نێر و مێ یان (٢٣١٤٦ نێر) و (٢٦٦٦١ مێ) هەنە و ئاکنجیێن سەنتەرێ ناحیێ دبنە (٣٢٧٧) کەس و کو رێژەیا (٦,٥٪) پێکدئینن و ئاکنجیێن گوندان (٤٦٥٣٠) کەس و رێژەیا (٩٣,٥٪) پێك دئینن و رێژەیا ئاکنجیبویان بۆ هەر ئێك (کم٢) (١١) کەسن وهژمارا خێزانان (٧٥٣٤) خێزان و رێژەیا قەبارا خێزانان (٦,٦٪) ، و هەروەسا پێکهاتا و نەتەوەیی کورد (٩٩,٥٢٪) و کلدان (٠,٤٨٪) و پێکهاتا ئایینی موسلمان (٩٩,٥٢٪) کریستیان (٠,٤٨٪) پێك دئینن[٣٠]. بەلێ ل دووڤ سەرژمێریا تەخمینکریا رێڤەبەریا ئامارا دهۆکێ بۆ سالا ٢٠١٦ێ هژمارا خەلکێ سەرانسەری ناحیا گردەسێن ٤٩٤١١ کەسە، ژ وانا ٤٢٠٨کەس ل باژێری دژین[٣١].

## ناحیا گردەسێن ژلایێ کشتوکالی ڤە:

ناحیا گردەسێن (١٠٧) گوندا بخۆڤە دگریت، رووبەرەکێ مەزنێ چاندنێ هەیە، ب گشتی خەلکێ ناحیێ بۆ دەبارا ژیارا خۆ پشتگەرمێن چاندنا گەنم و جەهـ و نوك و نیسکا و هەمی بەروبومێن دانەوێلەی و سامانێن ئاژەلی.

ناحیا گردەسێن ئێکە ژ ناوچەیێن مەزنێن قەزا ئاکرێ و دەڤەرەکا ناڤدارە ب عەردێ خوییێ بەرفرەە بۆ چاندنێ، ژبەرکو بەروبیاڤێ وێ پتر دەشتە و هندەك گرو بەتەنێن بچویك لێ هەنە، زێدەباری دەشتا ناڤدارا (ناڤکورێ)[٣٢].

## دەڤەر ب چ ناڤدارە:

دەشتا گردەسێن ژ رێزا دوویێ دئێت پشتی دەشتا سێمێلێ (دەشتا سلێڤانەیا) ل سەر ئاستێ هەرێمێ بۆ چاندنا بەروبومێن کشتوکالی و بەرهەمێن مەر و مالاتی، هەروەسا سالانە ل وەرزێ هاڤینێ گەلەك بەرهەمێن دیتر وەکی چاندنا تەماتا و باجانکا و پتاتا و جۆرێن کەسکاتی کو رێژەیەکا زۆر ژخەلکێ ناحیێ و دەوروبەر ب ڤی کاریڤە مژیل دبن و سالانە داهاتەکێ زۆر ژڤان بەروبومان بەرهەم دئینن[٣٣].

ناحییە ب بەرهەمێ گەنمی ناڤدارە، ئاخا وێ ب پیت و بەرەکەتە بۆ چاندنا دانەوێلەی، سالانە چەندەها تەنێن گەنمی لێ دهێنە بەرهەم ئینان، ب پلا ئێکێ دئێت ل سەر قەزا ئاکرێ و پارێزگەها دهوکێ بۆ خودانکرنا مەر و مالاتی و سامانێن ئاژەلی، گوندێن (بەیبینەوا و کونسیخور و سالەیێ و سێلان و جەلان و کوزادارێ و مام خەلیفە) پیشەیا خەلکێ وێ زۆری ل سەر خودانکرنا مەر و مالاتییە و سالانە

داهاتەکێ گەلەك زۆر ژ (شیر و ماست و خوری و گوشتێ سور) بەرهەم دئینن، هەر ژبەر ڤێ یەکێ دو پرۆژەیێن مەزن ژلایێ حکۆمەتا هەرێمێ ڤە بۆ هاتینە پێشنیازکرن وەکی دروسکرنا سایلویەکێ بۆ دەخل و دانی و کارگەهەکا بەرهەم ئینانا گوشتی و سپیاتی[٣٤].

پێشی سالا (١٩٩٧) سەنتەرێ ناحیێ رووبارەك و گەلەك کانیێن ئاڤێ هەبوون، ژ کەڤنڤە دەڤەرەکا باش بوو بۆ چاندنا بەرووبومێن کشتوکالی و خودانکرنا ئاژەلی، دەشتا وێ هەر ژ ئاکرێ هەتا دگەهیتە قەزا بەردەرەش هەمی دهاتە چاندن ب بەرووبومێن وەکی تەماتە و خیار و باجان و شفتی و گندورێ ئاڤی و کەسکاتی، ب بۆرینا دەمی و وەرزێن هشکە سالیێ ئەڤ ئاڤە هەمی هشك بوو، نها خەلکێ دەڤەرێ بۆ چاندێ پشت بەستنێ دکەتە سەر بیرێن سوری و بیرێن ئیرتوازی، کو دەڤەر ب سامانێن ئاڤا ژێر ئەردی یێ ناڤداره و زێدەتر ژ (٣٥) بیرێن ئاڤێ لێ هەنە و پرۆژەیەك ژی هەیە هەمی ئاڤا قەزا ئاکرێ دابین دکەت[٣٥].

## چەند پێزانینێن کشتوکالی یێن دەڤەرا گردەسین:

رووبـــەرێ زەڤییێن کشتوکالی ب جوداکرنا مولکداری (گشتی و تایبەت) و رووبەرێ بەرئاڤ و دێمی و بەردەلان و لەڤەرگا و باخ و دارستان بڤی رەنگێ خارێ یە:

رووبەرێ زەڤییێن کشتوکالی ( ٢٧١٨٤٩) دۆنەمن، و رووبەرێ زەڤییێن کشتوکالی – گشتی (٥٧٤٠٧) دۆنەمن، و رووبەرێن زەڤییێن کشتوکالی– تایبەت (٨٨٨٣٠) دۆنەمن، و رووبەرێ بەرئاڤ (٣٠٤١٦) دۆنەمن، رووبەرێ دێم (١٤٠٢٢٢) دۆنەمن، و رووبەرێ بەردەلان (٨١٠٧) دۆنەمن، رووبەرێ لەڤەرگا (٩٠١٠٦) دۆنەمن، و رووبەرێ باخ (٨٥٠) دۆنەمن[٣٦].

رووبەرێ زەڤییێن کشتوکالی ئەوێن پشت ب بارانێ دبەستن و ئەوێن پشت ب ئاڤدێرێ دبەستن:

أ- رووبـــەرێ ئەوێن پشت ب بارانێ دبەستن (١٤٠٢٢٢) دۆنەمە.

ب- رووبەرێ ئەوێن پشت ب ئاڤدێرێ دبەستن (٣٠٤٤١٦) دۆنەم[٣٧].

بەرهەمـێن کشتوکالی یێـن زڤسـتانێ و هاڤینی:

أ- بەرهەمێن کشتوکالی یێن زڤستانێ:

گەنم (٧٥٠٠٠) دۆنەم، جەه (١٥٠٠٠) دۆنەم، نوك (٣٠٠٠) دۆنەم، نیسك ( ١٠٠٠) دۆنەمە.

ب- بەرهەمێن کشتوکالی یێن هاڤینێ:

برنج (٤٢٧٠) دۆنەم، ماش (١٥٠) دۆنەم و گوندور (٢٠٠٠) دۆنەمە[٣٨].

## گوندێن ناحیا گردەسین:

### گوندێ درین شێخ:

رامانا ناڤێ گوندی: ناڤێ گوندی ژ دو برگەیا (درین + شێخ) پێکدهێت، پەیڤا (درین) ب واتایا جۆرەکێ ژ رووەکـی دهێت کو ل جهێن ئاڤی شین دبیت، هەروەسا (شێخ) ژی دهێت ب واتایا ڤێ چەندێ کە ئەڤ گوندە مولکێ شێخا بوو و دەسپێکێ مولکێ (شێخ ئەحمەد سۆرچی) بوویە و پاشی فروتی یە (شێخ محەمەد ئەمین ئاکرەیی) ژبەر وێ چەندێ دبێژنێ (درین شێخ).

### سنوور و جوگرافیا گوندی:

گوند ژ ئالیێ باکووری و باشوورێڤە دکەڤیتە دناڤبەرا دو زنجیرە گرکاندا و هەروەسا رۆژهەلات و رۆژئاڤاییڤە دەشتە، و دکەڤیتە ئالیێ باکوورێ رۆژهەلاتی ناحیا گردەسێن ب دووراتیا ٥کم، و باشوورێ بازێرێ ئاکرێ ب دووریا ٧کم.

### پێکهاتا یاگوندی:

ژمارا ئاکنجییێن خەلکێ گوندێ (درین شێخ)ێ ٣٩٥ کەسە و ژ ٧٥ سەر خێزانا پێکدهێت و نێزیکی ٦٥ مالانە. دناڤا گوندی دا ئێك مالبات هەیە ئەوژی مالباتا (مالە سوارێ) یە و ژ تیرەیا (مەمەدی)نە و سەر ب عەشیرەتا هەرکی نە، هەروەسا گوند ژ ئالیێ خەلکێ گوندی و دەورووبەرڤە ب (بارزانا بچویك)

دهێته نیاسین، ژبەر حەژێكرنا وان بۆ بنەمالا بارزان و كورد پەروەریا وان، هەروەسا ئەڤ گوندە چ جاران نەهاتیبە وێرانكرن.

ئاڤاكرنا گوندی ڤەدگەریت بۆ سالێن شێستان و خەلكێ ڤی گوندی ل سالا ١٩٨٠ ل سەر رازیبوونا (شێخ محمەد ئەمین ئاكرەیی) لێ هاتینە ئاكنجی كرن و هەروسا ل سالا ٢٠٠٤ ل هەیڤا ٩ ئەڤ گوندە ژ ئالیێ خەلكێ گوندیڤە هاتیبە كرین و بوویە مولكێ وان.

## جهێن كەڤنار:

ل دووڤ گۆتنا خەلكێ گوندی كو دبێژن دو ئاشێن ئاڤێ یێن كەڤن ل گوندی هەنە كو مێژوویا وان ڤەدگریت بوو بەری ٨٠ سالان ژ ئالیێ خەلكێ وی دەمی كو سۆرچی بوون دهاتە بكارئینان بۆ پالدانا ئاڤێ بۆ ئاڤدانا بیستانان.

## ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

ئەڤ گوندە خودان سامانێ ئاڤی یە ب تایبەت كانییا و گرنگترین وان كانییان ژی كانییێ (چەمێ درینێنە)، و هەروەسا نها ژێدەرێ ئاڤا ڤەخوارنا گوندی ژ پرۆژەیێ ئاڤا گردەسێن دهێت.

## ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

هەتا سالێن نوتان ژیارا پتریا خەلكێ گوندی ل سەر چاندنێ بوو كو ئەردەكێ باش یێ هەی بۆ چاندنا بەرووبۆمێن ئاڤی تایبەت چاندنا برنجی، بەلێ نها بەر ب كێمی ڤە چوویە، خودانكرنا مەر و مالاتی ژی لێ هەیە، بەلێ نها پتریا خەلكێ گوندی ژیانا كارێ پێشمەرگاتیێ دكەن.

خواندنگەهەكا سەرەتایی لێ هەیە كو سالا ١٩٩٩ هاتییەئاڤاكرن. مزگەفت ل گوندی هەیە دبەرێ دا ژ ئالیێ ئیمامێن مزگەفتێ ڤە بچویك فێری خواندنا قورئانێ دكرن[٣٩].

گوندێ درین شێخ



## گوندێ سەردەریان

ناڤێ گوندی ژدو برگەیان ( سەر + دەر) پێكدهێت دگەل پاشگرێ (یان)، (سەر) ب رامانا جهێن بلند دهێت و (دەر) ل دووڤ زاراڤێ سۆرچی یان ب رامانا جهـ ئانكو شوێن دهێت، ئانكو ناڤێ گوندی دهێت ب رامانا (جهێ بلند)، بەلگە ژی سەر ڤێ چەندێ پتریا گوندی دكەڤیتە سەر گركان.

### ئاڤاكرنا گوندی:

ل دووڤ گۆتنا موختارێ گوندی و خەلكێ وێ كو مێژوویا ئاڤاكرنا گوندێ سەردەریان ڤەدگەریت بۆ سالا ١٨٦٣ و بەلگە ژی لسەر ڤێ چەندی ل دووڤ گۆتنا موختاری كو (شێخ رەقیب شێخ محەمەد سۆرچی) سەرۆك عەشیرێ سۆرچییان ل ڤی گوندی ژ دایك بوویە و هەر ل سالا ١٩٥٣ ل ڤی گوندی مرییە، كو ل ڤی دەمی تەمەنێ وی (٩٠) سال بین، ئەڤ چەندە بوومە دیاردكەت گوندێ سەردەریان گوندەكێ كەڤنارە و هەروەسا سەردەریان ژ ئالیێ خەلكێ دەڤەرێ ب پایتەختا سۆرچی یان دهێتە نیاسین، چنكی هەتا ڤی دەمی ژی (شێخ زاهد شێخ صابر شێخ رەقیب) ل ڤی گوندی ئاكنجی یە.
ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ یا عیراقێ هژمارا خەلكێ گوندی د وێ سالێدا ٣١١ كەس بوو[٤٠].

ل سالا ١٩٧١ ژ ئەگەرێ شەرێ پێشمەرگەی دگەل حكومەتا عێراقێ خەلكێ ڤی گوندی یێ نەچاربی جهێن خو بجهـ بهێلن و بچن بەرەڤ مووسل، پشتی گوند بجە هێلای گوند ژ ئالیێ حكومەتا عێراقێ ڤە هاتە وێرانكرن، پشتی سالا ١٩٧٥ێ خەلك زڤرین گوندی و دووبارە گوند ژ ئالیێ خەلكی هاتە ئاڤەدانكرن، مزگەفت دگەل بنكەهێ ساخلەمیێ ل گوندی هەنە.

### سنوور و جوگرافیا گوندی:

پێكهاتا سروشتێ گوندێ سەردەریان ژ دەشت

گوندێ سەردەریان



و دۆل و گرێن پان و بەرین پێك دهێت كو دكەڤیتە دامێنا چیایێ (سەرتە) و یێ باشە بۆ چاندنێ و خودانكرنا مەر و مالاتی، و پتریا گوندی دكەڤیتە سەر گركان و دامێنیت گركان، دكەڤیتە رۆژهەلاتێ ناحیا گردەسێن ب دووراتیا ١٠كم ژ مەلبەندێ ناحیێ، سنوورێن گوندی ب ڤی رەنگی نە:

**باكووری:** چیایێ سەرتە.

**باشووری:** گوندێ قوپكە.

**رۆژهەلات:** گوندێ میركاوا

### پێكهاتا جڤاكی:

هژمارا ئاكنجیێن گوندێ سەردەریان نێزیكی (٧٠٠) كەسان دهێت و دابەشی سەر (١٢٥) سەرۆك خێزانا دبن، و هەروەسا خەلكێ گوندی هەمی ژ عەشیرەتا سۆرچی نە و دو تیرەیێن سەرەكی (مام سال و چاربۆتی) تێدا هەنە.

### جهێن بەرچاڤ و ناڤدارێن گوندی:

دناڤا سنوورێن گوندی دا گەلەك جهێن بەرنیاس هەنە وەكی تاخ و پاوان و ئاڤاران كو ژ ئالیێ خەلكی ڤە ناڤ لێ هاتینە دانان و دهێنە نیاسین وەك:كوتانوكا، كەڤنە گوند، مێرگەبی، دۆلی ئیساق، گردەنڤێژ، هەڤێزا جەمك، كەڤرە سور و هندەكێن دی.

### ژێدەرێ ئاڤا گوندی:

گوند یێ بناڤ و دەنگە ب هەبوونا گەلەك كانیێن ئاڤێ ژوان كانییان ژی (كانیا لگبن و كانیا سەرداف) كو كەڤنترین كانیێن ئاڤێ نە ل دەڤەرێ، ل ١٩٩٨/١٢/٩ پرۆژەیێ ئاڤێ لێ هاتییە دروستكرن كو ئاڤا ڤەخوارنا گوندی ژ ڤی پرۆژەی دهێتە دابین كرن.

### ژێدەرێن زیارا خەلكێ گوندی:

هەروەسا پێشی سالا ١٩٩٩ دەشتا سەردەریا ژبەر هەبوونا گەلەك كانی و سەرچاوەیێن ئاڤی گەلەك بەروبۆم لێ دهاتنە چاندن تایبەت چاندنا برنجی یێ بناڤ و دەنگ بوو، بەلێ ب تێپەربوونا دەمی چاندنا برنجی بەر ب كێمیێ ڤە چویە ژ ئەگەرێ هندێ پتریا زەلامێن گوندی بووینە مووچەخۆر بەلێ هەتا ڤی دەمی ژی ژیانا خەلكی ل سەر چاندنا بەرووبۆمێ دانەویلەی و خودانكرنا مەر و مالاتییە، هەروەسا گەلەك ژوانا ژی پێشمەرگە و فەرمانبەرن.

### لایەنێ پەروەردە و فێركرنێ:

سالا ١٩٥٣ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەكرن و تنی خواندنا سەرەتایی لێ دهێتەخواندن، هەروەسا ژ ئالیێ ئاڤاهیێ خواندنێ ڤە خواندنگەهـ یا بەرهەڤە هەتا خواندنا ناڤنجی و ئامادەیی ژی لێ بێتەخواندن، بەلێ ژبەر نەدابینكرنا مامۆستایان خواندنا ناڤنجی و ئامادەیی لێ نەهاتییە ڤەكرن[٤١].

## گوندێ شیڤ رەزا

ل دوور ناڤێ گوندی خەلكێ وێ دبێژن، دزاراڤێ كوردی دا (شیڤ) ب واتایا دۆل دهێت، ژبەر وێ چەندێ ناڤێ گوندی دهێت ب واتایا (دۆلەكا ب رەز)، ژبەركو گوند دكەڤیتە دۆلەكا كیر و تژی رەز و باخ.

### سنوور و جهێ جوگرافی:

گوند ب دووراتیا ٢٦كم دكەڤیتە رۆژهەلاتێ گردەسێن و ١١كم ژ مەلبەندێ قەزا ئاكرێ دوورە. ژ ئالیێ سرۆشتیڤە گوند ژ هەر چار ئالیان ڤە ب گركێن بلند دەورەدراوە و دۆلەكا كویر دناڤرا دچیت و رووبارەكێ بچویك دڤێ دۆلێ را تێپەر دبیت یا تژییە ژ دارێن سرۆشتی و رەز و باخان، سنوورێن گوندی ب ڤی رەنگینە:

**باكووری:** گوندێ سمێلان

**باشووری:** گوندێ وەرملا

**رۆژهەلات:** گوندێ بانەملە

**رۆژئاڤای:** گوندێ ئومەر خوشایە

### پێكهاتا گوندی:

گوند ٥٥ سەر خێزانان بخوڤە دگریت، ژمارا وان

یا تاکە کەسی دبنە ٢٩٤ کەس، و خەلکێ وێ ژ عەشیرەتا سۆرچی و تیرەیێن (مام سال و مام لەس و ماما ئومەر )ن. ئاڤاکرنا گوندی ڤەدگەریت بۆ سالا ١٩٢٠ کو ژ ئالیێ مالباتەکێ ژ تیرەیا مام سال ڤە هاتییە ئاڤاکرن، کو وی دەمی تنێ ٤ مال بوون، هەتا نهاش ئەڤ مالباتە ئاکنجییێن گوندینە و ژمارا وان نها گەهشتی یە ٣٦ مالان.

ئەڤ گوندە ل سالا ١٩٧٤ ژ ئالیێ حکۆمەتا عێراقێ ڤە هاتی یە خرابکرن ژ ئەگەرێ هندێ کو خەلکێ وێ سەر ب بزڤا کوردینەا و پشتی بۆرینا ٣ سالان خەلکێ گوندی ڤەگەریا یە و سەرژنوو گوند ژ ئالیێ وانڤە هاتییە ئاڤاکرن.

### جهێن بەرچاڤ و ناڤدار ل گوندی:

ئەڤ جهێن ژ ئالیێ خەلکێ گوندی ڤە دهێنە نیاسین وەك: ناڤ رەزی و سەر رووباری و بن دارا کو جهێن روینشتن و بێهنڤەدانێ نە.

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

دناڤا گوندی دا رووبارەکێ ئاڤێ هەیە کو ژێدەرێ وێ ژ قەزا ئاکرێ دهێت و دناڤا گوندی را دچیت، ل ڤان سالان پرۆژەیێ ئاڤا ڤەخوارنێ ژی لێ هاتییە دروستکرن.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیانا خەلکێ گوندی ب شێوەیەکی گشتی ل سەر چاندنێ و خودانکرنا مەر و مالاتی یە[٤٢].

## گوندێ قوپك

ل دووڤ زاراڤێ سۆرچی یان پەیڤا (قوپك) بۆ وان جهان دهێتە گۆتن ئەوێن گەلەك ئاڤی و دەعل و دری و شیناتی لێ هەین، چنکی ل دووڤ گۆتنا خەلکێ گوندی د بەرێدا گەلەك دار و بار و شیناتی لێ هەبوو، ژبەر هندێ دگۆتنێ (قوپك).

هەروەسا بۆچونەکا دی یا خەلکێ گوندی دبێژن: ل پشتا گوندی گرەك یێ هەی (کوپیتکا) وی یا بلندە ژبەر هندێ بێژنێ: گوندێ (قوپك).

### سنوور و جهێ جوگرافییێ گوندی:

سرۆشتی گوندی ژ دەشت و دۆل و گرکان پێکدهێت، دباشن بۆ کارێن جۆتیاریێ و چەراندنا مەرو مالاتی، هەروسا گوند ٤کم ژ مەلبەندێ ناحیا گردەسێن دوورە.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی ١٣سەر خێزانن کو دبنە ٨٩ کەس*، ژ عەشیرەتا سۆرچی تیرەیا (مام سال)ن، هەروەسا ئەڤ گوندە د بەرێ دا هاتبوو چۆلکرن و پارچەك بوو ژ ناحیا گردەسێن، و هەتا سالا ٢٠٠٤ ژ ئالیێ حکۆمەتا هەرێمێ ڤە هاتەنوژەنکرن و خەلك زڤرینە و گوندی و مزگەفت ژی بۆ ئاڤاکرن.

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل سنوورێ گوندی گەلەك کانییێن ئاڤی هەنە کو دهێنە بکارئینان ژ ئالیێ خەلکێ گوندی بۆ ئاڤدانا بیستانان وەك: کانییا چیر و کانی کالینوك، هەروەسا ئاڤا ڤەخوارنا گوندی ژ پرۆژەیێ ئاڤا سەردەریان دهێتە دابینکرن.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیانا خەلکێ گوندی ب شێوەیەکی گشتی ل سەر چاندنێ یە، تایبەت چاندنا برنجێ کوردی کو ل سەر ئاستێ قەزا ئاکرێ برنجێ گوندێ قوپکێ ب پلا ئێکێ دهێت ژ ئالیێ باشی و خۆشیێ ڤە، هەروەسا هندەك مەر و مالاتی و تەیر و تەوالی خودانکەن.

### زانست و پەروەردە:

پشتی کو سالا ٢٠٠٤ گوند ژ ئالیێ حکۆمەتا هەرێمێ ڤە هاتییە نویژەنکرن ل سالا ٢٠٠٥ خواندنگەهـ بۆ هاتە ئاڤاکرن و خواندنا وێ هەتا پۆلا شەشێ بنەرەتییە[٤٣].

## گوندێ كولەكا مەزن

ل دووف بۆچوونا خەلكێ گوندی ناڤێ گوندی ژ پەیڤا (كول) هاتییە، (كول) بۆ وان جهان دهێتە گۆتن یێن جەە و ئالیك و دەخلی لێ ددەنە مەر و بزنان، دكەڤندا گەلەك كولێن چەراندنا مەر و مالاتی لێ هەبوونە و هەر بڤی ناڤی هاتییە ناڤكرن.

### سنوور و جوگرافیا گوندی:

گوند ب دووراتییا ٩كم دكەڤیتە باكوورێ رۆژهەلاتێ گردەسێن، سرۆشتێ گوندی گرێن پان و مەزن و دۆل و نهالن، سنوورێن گوندی ب ڤی رەنگینە:

**باكووری،** گوندێ درەشە

**باشووری،** گوندێ كولەكا گچكە

**رۆژهەلات،** گوندێ رەبەنا

**رۆژئاڤای،** گوندێ شێخانوك سۆرچی

### پێكهاتا گوندی:

گوند ژ ئێك مالبات مالباتا (مام سال) پێكدهێت، سەر ب عەشیرەتا سۆرچییا ڤەنە، ئەڤ گوندە سالا ١٦٩١ێ هاتییە ئاڤاكرن، تەكییە و خانەقایێن شێخێن سۆرچییان ل ڤی گوندی هەنە، یەكەم شێخێ سۆرچی یا ل ڤی گوندی ژیایە (شێخ ئەحمەد) كو دبیتە باپیرێ هەمی شێخێن سۆرچی، كەڤنترین گوندە سەر ب ناحیا گردەسێن ڤە، (شێخ ئەحمەدێ كولەكان) ل ڤی گوندی مرییە و هەتا نها ئەڤ جهە ل دەف سۆرچییان ب جهەكێ ئایینیێ پیرۆز دهێتە زانین.

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

گوندێ كولەكا مەزن گەلەك كانیێن ئاڤێ لێ هەنە بەلێ كانیێن وی ب زۆری وەرزی نە، تنی دو كانی نە وەرزینە، ژێدەرێ ئاڤا ڤەخوارنا گوندی ب رێكا بیرا ئیرتیوازییە كو ژ ئالیێ حكومەتا هەرێمێ هاتییە كۆلان.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیانا خەلكێ گوندی ب شێوەیەكی گشتی ل سەر خودانكرنا مەر و مالاتی یە و هەروەسا بەشەك كێم ژ كارێ جۆتیاریێ دكەن

### زانست و پەروەردە:

ل ٢٠٠٦/٩/٢٥ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەكرن، هەتا پۆلا شەشێ بنەرەتی لێ دهێتە خواندن، سەرەرای ڤێ چەندێ كو گوندێ كولەكان جهەكێ ئایینی و پیرۆزە دەڤ سۆرچی یان بەلێ تا نها مزگەفت ل ڤی گوندی نینە[٤٤].

## گۆندێ كولەكا گچكە

وەك گوندێ چوویی ناڤێ گوندی ژ (كول) هاتییە ئەو جهێ ڤەحەویانا پەزی و دانا ئالیكی و سەخبێركرنا وی. ژبەركو گوندەكێ بچویك بوو ژ كولەكا مەزن هاتە جوداكرن و ب كولەكا گچكە هاتەنیاسین.

### سنوور و جوگرافیا گوندی:

سرۆشتێ گوندی گرێن پان و مەزن و دۆل و نهالن، گوند ب دووراتییا ٩كم دكەڤیتە باكوورێ رۆژهەلاتێ گردەسێن، ١٠كم ژ مەلبەندێ ناحیا گردەسێن یا دوورە.

**باكووری،** گوندێ كولەكا مەزنە

**باشووری،** گوندێ كولەكا مزگەفتە

**رۆژهەلات،** گوندێ رەبەنا

### پێكهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە ژ ئێك مالبات پێكدهێت ئەوژی مالباتا (مام سال)ن، سەر ب عەشیرەتا سۆرچییا ڤەنە، گوندێ كولەكا گچكە ل سالا ١٩٧٥ێ هاتییە ئاڤاكرن، دەسپێكێ ئەڤ جهە (كوزا) مەر و بزنان

بوو ب تێپەربوونا دەمی مال لێ هاتنە ئاڤاكرن و بوو گوندەكێ بچویك، و ژ كولەكا مەزن هاتەجوداكرن[٤٥].

## گوندێ كونسیخور

ناڤێ گوندێ تێت ب واتایا (كونا سیخورا) كو ژمێژە ژمارەكا گەلەك ژ گیاندارێن سیخور لێ هەبوونە و جهەكێ باشە ژی بۆ ڤان گیانداران چونكی گەلەك ئاڤ و دەعل لێ هەیە.

### سنوور و جوگرافیا گوندی:

سرۆشتێ گوندی ژ دەشتێن درێژ و گرێن پان و بەرین پێكدهێت خاكێ وێ گەلەك یێ باشە بۆ زەڤیێن كشتوكالی، هەروەسا گوند دكەڤیتە باكوورێ رۆژئاڤایێ گردەسێن ب دووراتییا ٣٥كم، و ب دووراتییا ٣٠كم دكەڤیتە رۆژئاڤاییێ مەلبەندێ قەزا ئاكرێ.

**باكووری،** كانیبا شیڤە كوترێ

**باشووری،** گوندێن جەلان ئامەدین و جەلان عەرەب

**رۆژهەلات،** گوندێ سیلان سالح

**رۆژئاڤای،** گوندێ بانورە

### پێكهاتا گوندی:

گوندی هەمی هەركی نە، ژ دو مالباتان ( مالەسوار و پسەغا) پێكدهێت، ل پێشی سالا ١٩٧٥ هژمارا مالان بتنێ ١٤ مال بوون لێ نها هژمارا گوندییان زێدەكرییە و گەهشتینە ٣٥ - ٤٠ مالان، گوند دناڤبەرا سالێن ١٩٧٥ - ١٩٨٥یدا هاتییە ئاڤاكرن، و پرۆژەیێن ئاڤ و كارەب و ریگاوبان ژی بۆ هاتینە كێشان.

### جهێن ب ناڤ و دەنگ دگوندی دا :

ژ ئالیێ خەلكێ گوندیڤە ناڤ ل سەر گەلەك جهێن دەڤەرێ هاتینە دانان وەك: رەزێ سیسەی و شیڤە كوترێ و گەلی و دۆلا ژن مریا و دۆلا نزاری و كانیبا شازەمانێ و بەرۆژكێ و دۆلا شینكەلا.

### زێدەرێن ئاڤا گوندی:

گوند یێ دەولەمەندە ب كانیێن ئاڤێ ژ وان كانییان: (كانیبا شڤانا و كانیبا سەردەعل و كانیبا شازەمانێ)ی كو گرنگترین كانیێن وی نە، پرۆژەیێ ئاڤا ڤەخوارنێ بۆ هاتییە دروستكرن.

### زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ئەڤ گوندە خودان پاوانەكێ زۆرە ژبەر هندێ زۆربەیا خەلكێ گوندی مژوولی خودانكرنا مەرەمالاتی نە و هندەكێن دی جۆتیار و مووچەخور و پێشمەرگەنە.

### پەروەردە وفێركرن:

سالا ٢٠٠٢ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەكرن و هەتا شەشێ بنەرەتی لێ دهێتە خواندن، سالا ٢٠٠٠ مزگەفت لێ هاتییە ئاڤاكرن[٤٦].

## گوندێ مەلكێ حەسەن ئاغا

مەلكێ حەسەن تێت ب واتایا (مولكێ حەسەن) ئەڤ گوندە خودانێ وی ناڤێ وی (حەسەن ئاغا) بوویە و ببۆرینا دەمی پەیڤا مولك هاتییە گهورین بوویە پەیڤا (مەلكێ)، ل داویێ ناڤێ وی بوویە مەلكێ حەسەن ئاغا، گوند ١ كم ژ باژێركێ گردەسین دوورە.

### سنوور و جوگرافیا گوندی:

سرۆشتێ گوندێ مەلكێ حەسەن ئاغای ژ گرێن پان و بەرین پێكدهێت، گوند كیلەمەترەكی ژ مەلبەندێ ناحیا گردەسین دوورە. سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ مەلكێ حاجی

**باشووری،** گردەسین

**رۆژهەلات،** دۆلەكا پان

**رۆژئاڤای،** هەمان دۆلا پان

### پێكهاتا گوندی:

ژ ئالیێ جڤاكیڤە خەلكێ گوندی ژ عەشیرەتا هەركی نە، دو مالبات لێ هەنە ئەوژی (مالە پیر

و مەمەدی) نە، گوند سالا ١٩٨٢ێ هاتییە ئاڤاكرن، هەتا سالا ١٩٩٨ وەك جهێ خودانكرنا پەزی دهاتەدیتن و تنێ ٤ مال لێ هەبوون، ببۆرینا دەمی خەلك لێ ئاكنجی بوویە و هەتا هژمارا وان گەهشتی یە ٢٠ مالان، خواندنگەهـ و مزگەفت ل گوندی نینن.

**ژێدەرێن ئاڤا گوندی:**

دبەرێ دا گوند گەلەك یێ ب ئاڤ و دەنگ بوو ب ئاڤا كانییان ژ گرنگترین و كەڤنترین كانییا گوندی كو دهێتە نیاسین ب (كانییا كتانێ) و لێ نها ئاڤ ل سنوورێن وێ بەر ب كێمی ڤە چویە، سالا ٢٠٠٢ێ بیرەكا ئاڤێ بۆ ڤەخوارنێ ژ ئالیێ رێكخراوا فاو بۆ گوندی هاتییەكۆلان.

**ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:**

ژیانا خەلكێ گوندی ل سەر خودانكرنا مەر و مالاتی و هندەك ژ وانا ژی ب چاندنێ مژوولن و هەروەسا بۆ كارێ رۆژانە و پێدڤیێن خو قەستا گردەسێن دكەن[٤٧].

## گوندێ مەلكێ حاجی

مەلكێ حاجی تێت ب واتایا (مولكێ حاجی) ناڤێ خودانێ وی (حاجی) بوویە و ب بۆرینا دەمی پەیڤا مولك هاتییە گۆهارتن و بوویە پەیڤا (مەلكێ)، داویێ ناڤ بوویە مەلكێ حاجی.

**سنوور و جوگرافیا گوندی:**

سرۆشتێ گوندێ مەلكێ حاجی ژ دەشتەكا پان و بەرین پێكدهێت، گوند دكەڤیتە دناڤا پانتاییا ڤێ دەشتێدا، ٥ كم ژ باكوورێ مەلبەندێ ناحیا گردەسین و ٢٢كم ژ ئاكرێ دوورە، سنوورێن گوندی :

**باكووری**، دەشتەكا درێژە

گوندێ مەلكێ حاجی



**باشووری:** گوندێ مەلكێ حەسەن ئاغا یە

**رۆژهەلات:** گوندێ زیلكا فاخرە

**رۆژئاڤای:** گوندێ مام خەلیفەی

ئەڤ گوندە یەك ژ وان ٥٤ گوندێن قەزا ئاكرێ بوو یێن ل دوابیا سەدسالیا نوزدێ دەسپێكا سەدسالیا بیستێ ژ ئەنجامێ زێدەگاڤیێن عەشیرەتان و نەمانا ئاسایش و تەناهیێ هاتینەبەردان و ڤالابووین ژ ئاكنجییان، لەوما دەستەلاتداریا ئوسمانی ب بریارەكێ ل ٢٤ نیسانا ١٩٠٧ێ ئەڤ گوندە دانە دگەل مولكێن سولتان عەبدولحەمیدێ دووێ و ب ڤی رەنگی مان هەتا راگەهاندنا دەستووری ئوسمانی ل ٢٣ تەباخا ١٩٠٨ێ ئەو بوو سولتانی ب ناچاری دەست ژ مولكینییا ڤان گوندان بەردا كەتنە سەر گەنجینا گشتیا دەولەتێ، وی دەمی رووبەرێ گوندی ٤٠٠٠ دۆنەمێن عەردی بوو[٤٨].

**پێكهاتا گوندی:**

گوندی سێ مالبات لێ هەنە ئەوژی (مەمەدی و پسەغا و باب یەزدینی)نە، ژ عەشیرەتا هەركی نە، ئەڤ گوندە ل سالێن حەفتێیان هاتییەڤە ئاڤاكرن، ل دەسپێكێ تنێ ٦ مال لێ هەبوون، لێ نها ٢٧ مال لێ هەنە و ئەگەرێ نە زێدەبوونا ئاكنجییان ب رێژەكا زۆر ڤەدگەریت بۆ وێ یەكێ كو هەر سال چەند مالەك قەستا گوندی بكەن دهەمان دەمدا هندەك ژی ژ گوندی باردكەن.

**زێدەرێ ئاڤا گوندی:**

ئەڤ گوندە خودان ژێدەرەكێ ئاڤی یێ دەولەمەندە و ژمارەكا زۆر یا كانییان لێ هەنە تایبەت ل چەمێ گوندی كو ب چەمێ مەلكێ بەرنیاسە، رووبارەكێ ئاڤێ لێ هەیە و هەروەسا ژێدەرێ ئاڤا ڤەخارنا گوندی ب رێكا كۆلانا بیرێن ئاڤێ یە كو ژ ئالیێ حكومەتا هەرێمێ ڤە هاتینە لێدان.

**ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:**

خەلكێ گوندی مژوولی خودانكرنا مەر و مالاتی و كارێن كشتوكالی نە، یێ دەولەمەندە ب چاندنا بەرهەمێ (برنج و باجانك و زەرزەواتی) و هەروەسا هندەك ژ خەلكێ گوندی پێشمەرگە و فەرمانبەرن، خواندنگەهـ ل سالا ٢٠٠٤ لێ هاتییە ڤەكرن.

**جهێن شوینواری:**

ل گوندی جهەكێ شوینواری لێ هەیە كو دبێژن: ل دووڤ گۆتنا خەلكەكێ دەڤەرێ مێژوویا ڤی جهی ڤەدگەریت بۆ سەردەمێن گەلەك كەڤن، دهێتە نیاسین ب (كەوێ زەر) ئانكو (كەوێ زێری) خەلك ب مەبەستا شیفایێ ژ نەخۆشیان سەرەدانا وی دكەن و هەروەسا دبێژن: ل ڤی جهی هەروەك دهێتە گۆتن گورێ سەحابییەكی لێ هەیە و بەلێ چ زانیارێن دروستاهی و باوەرپێكری ل سەر نینە[٤٩].

## گوندێ لەكان

واتایا ناڤێ گوندی یێ ژناڤێ عەشیرەتەكێ هاتی وەكی موختارێ گوندی ئاماژە پێ كری ئەوژی عەشیرەتا لەكانە كو د پێشی سالا ١٩٥٠ ل ڤی گوندی ئاكنجی ببوون و نها ئەو عەشیرەت ل دەڤەرا سوران ئاكنجی نە.

**سنوور و جوگرافیا گوندی:**

سرۆشتێ گوندی ژ دەشت و دۆلێن كویر و درێژ پێكدهێت، جهەكێ ئاڤی یە و یێ دەولەمەندە ب بەرهەمێن چاندنێ، ب دووراتیا ٣٥كم دكەڤیتە رۆژئاڤاییێ گردەسێن و ٣٧كم ژ مەلبەندێ قەزا ئاكرێ دوورە.

**باكووری:** گوندێ مام داویدان ژووری

**باشووری:** گوندێ كیشكی

**رۆژهەلات:** گوندێ بەدریكێ

**رۆژئاڤای:** رووبارێ خازر

### پێكهاتا گوندی:

ئاكنجیێن گوندی هەمی ژ عەشیرەتا هەركی نە، شەش مالبات ل ڤی گوندی هەنە ئەوژی مالباتێن: مالەشەلال، مالە براهیم، مالە زین، مالە كاكە حەم، شابی و مالەسێن)ن و ژ هەر چوار تیرەیێن (مالەپیر و مام شێخ و پسەغا و كاوانیا)نە، ئەڤ گوندە ل سالا ١٩٤٢ یێ هاتیە ئاڤەدانكرن، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلكێ گوندی ١٠٨ كەس بوون[٥٠]، هەتا سالا ١٩٧٠ هژمارا خەلكێ گوندی تنێ ٦٥ - ٧٥مال بوون، لێ نها ژمارا وان بەر ب زێدەبۆنێ ڤەیە و ١٨٠ - ٢٠٠ مالان لێ هەنە، هەروەسا ل سالا ٢٠٠٣ جادە بۆ هاتینە چێكرن.

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

گوند دەولەمەندە ب ئاڤا سەر عەردی چونكی رووبارێ خازر تێرا دەرباز دبیت و هەروەسا ژێدەرەكێ سەرەكیێ ئاڤا ڤەخوارنا گوندی بوویە هەتا ل ٢٠٠١/٩/١٥ پرۆژەیەكێ ئاڤدێریێ بۆ هاتیە چێكرن.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ب شێوەیەكێ گشتی خەلكێ گوندی بۆ بژێویا ژیارا خۆ پەنا بریە بەر چاندنێ تایبەت بەرهەمێن (باجانكا و فلفلا و تەماتە و بامی)، هەروەسا بەرهەمێن داروباران وەكی (خۆخ و مژمژ و هنار) و كارێ خودانكرنا پەزی و هەروسا بەشەك ژوانا پێشمەرگە و فەرمانبەرن.

### پەروەردە و فێركردن:

هەر ل سالا ١٩٨٩ خواندنگەهـ ل گوندی هەبوو یە لێ ئاڤاهیەكێ بچویك و كەڤن بوو یە هەتا سالا (٢٠١٤ – ٢٠١٥)ێ ئاڤاهییەك بۆ خواندنگەها گوندی هاتیە چێكرن ژ ئالیێ حكۆمەتا هەرێما كوردستانێ ڤە[٥١].

## گوندێ پیرخولینا كەڤن

دوو بۆچوون ل سەر واتایا ناڤێ گوندی هەنە ئێك ژ وان دبێژیت: د وەختێ خودا بنەمالەكا مەسیحی لێ بوویە و مەزنێ وان ناڤێ وی (خولی) بوویە و پشتی كو ئەڤ كەسە مری ئەڤ بنەمالە ل ڤی گوندی چوون و هەركی هاتنە شوینا وان و گوتە ڤی جهی پیرخولین ب رامانا (خولیێ كەڤن).

هندەكێن دی دبێژن: ئەڤ گوندە و چەند گوندەكێن دی یێن دەوروبەرێ ڤی گوندی كو پێشیا ناڤێ وان ب پەیڤا (پیر) هاتییە گوندێن ئێزدییان بوون و هەر گوندەكی بنەمالەك لێ بوو دگۆتنێ گوندێ (پیر فلان كەس) چونكی ئەڤ پەیڤە د بنیاتدا د ناڤائێزدیاتیێ دا دهێتە بكارئینان.

### سنوور و جوگرافیا گوندی:

سرۆشتێ گوندی هەمی گركێن پان و بەرینن و بۆ چاندنێ و خودانكرنا پەزی یێ باشە، گوند ب دووراتیا ١٢كم ژ مەلبەندێ ناحیا گردەسێن و ١٨كم ژ مەلبەندێ قەزا ئاكرێ دوورە، سنوورێن گوندی ب ڤی رەنگینە:

**باكووری،** گوندێ بێناتان

**باشووری،** گردەسین

**رۆژهەلات،** گوندێ خرابەژوور

**رۆژئاڤای،** گوندێ تلبۆك

### پێكهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە ژ ئێك مالبات پێكدهێت ئەوژی مالباتا (مام شێخ)ن، ژ عەشیرەتا هەركی نە، كا كەنگی گوند هاتییە ئاڤاكرن چ زانیارێن دروست ل بەر دەست نینن لێ دبێژن: سالێن حەفتێیان ژ ئالیێ خەلكێ گوندی ڤە هاتییە ئاڤاكرن، ل گوندی نێزیكی ٤٥ مالان هەنە، ل سالا ٢٠٠٢ جادە بۆ گوندی چێكرن و كارەب بۆ هاتییە كێشان.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیانا وان ل سەر چاندنێ و خودانكرنا مەر و مالاتی یە و هندەك ژ وانا پێشمەرگە و فەرمانبەرن، و بیرەكا ئاڤێ

ژی بۆ هاتییەكۆلان ئاڤا ڤەخوارنا گوندی دابین دكەت.

سالا ۲۰۰۱ێ خواندنگەهـ ژ ئالیێ رێكخراوا هابیتاتڤە ل گوندی هاتییەئاڤاكرن، تنێ هەتا شەشێ سەرەتایێ لێ دهێتە خواندن و مزگەفت ژێ بۆ هاتییە ئاڤاكرن[٥٢].

## گوندێ پیرخولینا نوی

ئەڤ گوندە هەر گوندێ پیرخولینە بەلێ پشتی گوند مەزن بۆی وان خو جوداكر و گوندەكێ جودا ژ پیرخولینا كەڤن ئاڤاكر و ناڤێ گوندی كرە پیرخولینا نوی، د ناڤبەرا هەردو گونداندا چ مەودایەكێ درێژ نینە، هەردو گوند گەلەك نێزیكی ئێكن، هەر گوندەكی موختارێ خویێ تایبەت هەیە، گوند ١١كم ژ گردەسێن دوورە.

### سنوور و جوگرافیا گوندی:

**باكووری،** گوندێ بێناتانە.

**باشووری،** گردەسێنە.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ خرابە ژوورە.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ پیرخولینا كەڤنە.

### پێكهاتا گوندی:

ئاكنجیێت گوندی ژ عەشیرەتا هەركیانە، تنێ ئێك مالبات لێ هەیە، ئەوژی (مام شیخ)ن، گوند ل سالا ٢٠١١ هاتییە ئاڤاكرن، ژ ١٦ مالان پێك دهێت.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا وان سەر جۆتیاریێ و خودانكرنا مەر و مالاتی یە و هندەك ژ وانا پێشمەرگە و فەرمانبەرن، و ل سالا ٢٠٠٣ بیرەكا ئاڤێ ژی بۆ هاتییە كۆلان ئاڤا ڤەخوارنا گوندی دابین دكەت[٥٣].

## گوندێ سێلان سالح

ناڤێ گوندی ژ نەخشێ جوگرافیا سنوورێ گوندی هاتییە، چونكی مولكێ گوندی دگەل گوندێن هەڤسنوورێن وی ب شێوێ سێگوشەیە، گوند دكەڤیتە دناڤبەرا سێ گونداندا ئانكو سێ لا یێن هەبین ئەوژی (گوندێ شەرمن) ژ ئالیێ باكووری و (گوندێ خێلان) ژ ئالیێ باكوورێ رۆژئاڤای و (گوندێ جەلان عەرەب) ژ ئالیێ باشووری و هەر ژبەر هندێ دبێژنێ (سێلان)، (سالح) ژی كەسەكێ گوندییە، ژبەر وێ یەكێ ناڤی گوندی بی یە (سێلان سالح).

گوند دكەڤیتە باكوورێ رۆژئاڤایێ ناحیا گردەسێن ب دووراتییا ٢٣كم و ب دووراتییا ٢٦كم ژ مەلبەندێ قەزا ئاكرێ دوورە.

ئەڤ گوندە یەك ژ وان ٥٤ گوندێن قەزا ئاكرێ بوو یێن ل دوایيا سەدساليا نوزدێ دەسپێكا سەدساليا بیستێ ژ ئەنجامێ زێدەگاڤیێن عەشیرەتان و نەمانا ئاسایش و تەناهیێ هاتینەبەردان و ڤالابووین ژ ئاكنجییان، لەوما دەستەلاتداریا ئوسمانی ب بریارەكێ ل ٢٤ نیسانا ١٩٠٧ێ ئەڤ گوندە دانە دگەل مولكێن سولتان عەبدۆلحەمیدێ دووێ و ب ڤی رەنگی مان هەتا راگەهاندنا دەستوورێ ئوسمانی ل ٢٣ تەباخا ١٩٠٨ێ ئەو بوو سولتانی ب ناچاری دەست ژ مولكینیيا ڤان گوندان بەردا كەتنە سەر گەنجینا گشتییا دەولەتێ، وی دەمی رووبەرێ گوندی ٧٠٠ دۆنەمێن عەردی بوو[٥٤].

### پێكهاتا گوندی:

دڤی گوندی دا سێ مالبات هەنە ئەوژی (مەلا رەشید و سالح و شێمەت )ن، ژ عەشیرەتا هەركی نە، گوند ٥٠ - ٦٠ مالە، سالێن حەفتێیان گوند ژ ئالیێ خەلكی ڤە هاتییە ئاڤاكرن، هەروسا سالا ٢٠٠٠ ژ ئالیێ رێكخراوا هابیتاتڤە ١٩ خانی بۆ هاتینە ئاڤاكرن، و مزگەفت و پرۆژەیێ ئاڤا ڤەخوارنێ بۆ گوندی هاتینەچێكرن

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیانا خەلكێ گوندی ب شێوەیەكێ گشتی ل سەر خودانكرنا مەر و مالاتی و جۆتیاریێ یە و بەشەك ژ واناژی پێشمەرگە و فەرمانبەرن، سالا

٢٠٠٢ێ ژ ئالیێ رێكخراوا فاو بیرەكا ئاڤێ بۆ هاتییە كۆلان، سالا ٢٠٠١ خواندنگەهـ بۆ هاتییە ئاڤاكرن و تنێ خواندنا بنەرەتی لێ دهێتە خواندن، و هەروەسا ل سالا ٢٠٠٢ جادا ڤێركری گەهشتییە گوندی.

## جهێن كەڤنار و جهێن بەرچاڤ ل گوندی:

دناڤا گوندی دا جهەكێ كەڤنار هەیە دبێژنێ (نانەوا خانە) ئانكو جهێ چێكرنا (نانی) كو مێژوویا وی ڤەدگەریت بۆ دەسپێكا سەدسالیا بیستی دەمێ هێزێن لەشكەرێ ئینگلیزی گەهشتینە دەڤەرێ، هەروەسا گەلەك جهێن بەرچاڤ و ناڤدار ل گوندی هەنە ئەوژی (دۆلا بهیێ و دۆلا ئەخەلێ و كانییا سەری و دۆلا تیرەشكێ و دۆلا مێرگە سورێ)نە[٥٥].

## گوندێ بەدریك

رامانا ناڤێ گوندی تێت ب واتایا ئەردێ كەڤن، و هەروەسا دبێژن لەوانەیە ناڤێ وی ژ ناڤێ تیرەیەكا هەركی یا هاتبیتە وەرگرتن ئەوژی (بەدری)نە، گوند ٩كم ژ گردەسین دوورە.

## سنوور و جوگرافیا گوندی:

سرۆشتێ گوندی ژ گرێن پان و دەشتەكا پان و بەرین پێكدهێت، سنوورێن گوندی ب ڤی رەنگینە:

**باكووری**: گوندێ نیاوكێ

**باشووری**: گوندێ سالەیی

**رۆژهەلات**: گردەسین

**رۆژئاڤای**: گوندێ تلبۆكێ

## پێكهاتا گوندی:

گوندی هەمی ژ عەشیرەتا هەركی یانە و پێنج مالبات لێ دژین ئەوژی (شینو سلتان، ئەبو بەكر،

**گوندێ بەدریك**



مام، بەحیا و بەنانی)نە، و ئەڤ گوندە ل سالا ١٩٥٨ێ هاتییەئاڤاكرن، هەتا سالێن هەشتێیان ژمارا مالێن وی ١٥ - ٢٠ مال بوون، نها بەر ب زێدەبۆنێ ڤە چوویە و گەهشتییە ٥٠ - ٦٠ مالان، مزگەفت ل گوندی هەیە و جادا ڤێركری گەهشتیێ.

## زێدەرێن ئاڤا گوندی:

گوند ب سامانێ ئاڤی یێ دەولەمەندە و رووبارەكێ وەرزی لێ هەیە دبێژنێ رووبارێ بەدریكێ، هەروەسا ١١ بیرێن ئاڤێ لێ هەنە، ٧ ژ وانا بیرێت سوری نە و ٤ ژوانا بیرێن ئیرتیوازینە و ئاڤا ڤەخوارنا گوندی ژ ڤان بیران دهێتە دابینكرن.

## زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژبەركو دناڤا گوندی دا گەلەك بیرێن ئاڤی هەنە، ڤێ چەندێ وەكرییە كو پتریا خەلكێ گوندی ب كارێ چاندنێ ڤە مژوول بن، بۆ چاندنێ گەلەك یێ بناڤ و دەنگە تایبەت چاندنا ئاڤی سالانە بەرهەمەكێ زۆر بەرهەمدئینیت تایبەت بەرهەمێ (باجان رەشكا)، سالا ١٩٩٦ خواندنگەهـ بۆ هاتییە ئاڤاكرن و هەتا پۆلا سێ ناڤنجی لێ دهێتە خواندن.

## جهێ شوینواری ل گوندی:

د نیڤا گوندی دا شوینوارەك یێ لێ هەی كو گرەكە مێژوویا وی بوو (٢) هزار سالان پێش زایینی ڤەدگەرێتەوە، ئەڤ چەندە ژی هاتییە زانین ژ ئالیێ دەزگایێ شوینوار ناسی یێ حكۆمەتا هەرێما كوردستانێ دگەل دەزگایێ شوینواری یێ ئەمریكی كو ل سالا ٢٠١٣ ڤەستا ڤی گرێ شوینواری كری یە[٥٦].

# گوندێ خرابە ژێری

دوور ناڤێ گوندی خەلكێ وی دبێژن ل ڤی جهێ دبێژنێ خرابە ژێر و خرابە ژور بەرێ دو عەشیرەت (كاوانی و گۆران) لێ بوون، دگەل عەشیرەتا هەركی یا ب شەر هاتن و هەركی یا گەلەك زەرەر گەهاندە وان و مالێن وان خرابكرن، گەلەك كەس دڤی شەری دا هاتنە كوشتن، ڤان دو عەشیرەتان گوند ب جە هێلا و گۆتنە وی جهی (خرابە) ئانكو جهێ خراب، گوند ب دووراتییا ٥كم دكەڤیتە رۆژئاڤایێ گردەسێن و ١٣كم ژ مەلبەندێ قەزا ئاكرێ دوورە.

ئەڤ گوندە یەك ژ وان ٥٤ گوندێن قەزا ئاكرێ بوو یێن ل دوایيا سەدساليیا نوزدێ دەسپێكا سەدساليیا بیستێ ژ ئەنجامێ زێدەگاڤیێن عەشیرەتان و نەمانا ئاسایش و تەناهیێ هاتینەبەردان و ڤالابووین ژ ئاكنجییان، د بەلگەنامێدا ناڤێ وی ب خرابە زیری هاتییە، لەوما دەستەلاتداریا ئوسمانی ب بریارەكێ ل ٢٤ نیسانا ١٩٠٧ێ ئەڤ گوندە دانە دگەل مولكێن سولتان عەبدۆلحەمیدێ دووێ و ب ڤی رەنگی مان هەتا راگەهاندنا دەستوورێ ئوسمانی ل ٢٣ تەباخا ١٩٠٨ێ ئەو بوو سولتانی ب ناچاری دەست ژ مولكینییا ڤان گوندان بەردا كەتنە سەر گەنجینا گشتییا دەولەتێ، وی دەمی رووبەرێ گوندی ٥٠٠٠ دۆنەمێن عەردی بوو[٥٧].

## سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ شێخانۆك مەلا حاجی

**باشووری،** گوندێ خرابەژوور

**رۆژهەلات،** گوندێ گردەسێن

**رۆژئاڤای،** گوندێ پیرخولین

## پێكهاتا گوندی:

گوندی بتنێ دو مالبات هەنە ئەوژی ( مالەزاهێر و مالەكێوی)نە، نیزیكی ٥٠ مالانە، ل نسكویا سالا١٩٧٤ خەلكێ ڤی گوندی كوچكرن بۆ سەر سنوورێن ئیرانێ و هندەك هەركی یێن دی ل ڤی گوندی ئاكنجی بوون، سالا ١٩٩١ پشتی سەرهلدانێ جارەكا دی هەركی ژ ئالیێ رێكخراوا جیهانی یا هەیڤا سور (ب ترومبێلێن زبل دووبارە هاتنە ڤەگوهاستن بوو خرابەی و دابەشی سەر دەڤەرێن دی كرن، ژڤی دەمی هندەك ل خرابێ ژووری نیشتەجێ بوون و ئەڤ گوندێ جاران ئێك گوند لێرە وێڤە بی دو گوند.

### ژێدەرێ ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیانا خەلكێ گوندی ب رەنگەكێ گشتی ل سەر خودانكرنا مەر و مالاتی و كشتوكالییە و هندەك ژوانا پێشمەرگە و فەرمانبەرن، ل ١٩٩٨/٦/٣ پرۆژەیێ ئاڤا ڤەخوارنێ بۆ هاتییە دروستكرن و مزگەفت ژێ لێ هەیە، ل ٢٠٠٤/٤/٢٨ خواندنگەهـ بۆ هاتییە ئاڤاكرن.

شكەفتەك ل ڤی گوندی هەیە كو ل سالا ٢٠١٣ رێكخراوا شوینوارناسی یا حكومەتا هەرێمێ دگەل رێكخراوا شوینواری یا ئەمریكی سەرەدانا ڤێ شكەفتێ كرییە و دایە زانین كو مێژوویا ڤێ شكەفتێ ڤەدگەریت ٢٠٠٠ سالا بەری زایینی[٥٨].

## گوندێ خرابە زوور

سەبارەت واتایا ناڤێ گوندی هەر وەكی ناڤێ گوندێ خرابە ژێرە كو دەست پێكێ (ئاڤار) ئانكو سنوورێ هەردو گوندان ئێك بوو دگۆتنێ خرابە.

ئەڤ گوندە یەك ژ وان ٥٤ گوندێن قەزا ئاكرێ بوو یێن ل دوایيا سەدساليا نوزدێ دەسپێكا سەدساليا بیستێ ژ ئەنجامێ زێدەگاڤیێن عەشیرەتان و نەمانا ئاسایش و تەناهیێ هاتینەبەردان و ڤالابووین ژ ئاكنجییان، د بەلگەنامەیێدا ناڤێ وی ب خرابە بالا هاتییە، دەستەلاتداریا ئوسمانی ب بریارەكێ ل ٢٤ نیسانا ١٩٠٧ێ ئەڤ گوندە دانە دگەل مولكێن سولتان عەبدولحەمیدێ دووێ و ب ڤی رەنگی مان هەتا راگەهاندنا دەستوورێ ئوسمانی ل ٢٣ تەباخا ١٩٠٨ێ ئەو بوو سولتانی ب ناچاری دەست ژ مولكینیيا ڤان گوندان بەردا كەتنە سەر گەنجینا گشتییا دەولەتێ، رووبەرێ گوندی وی دەمی ٢٩٢٥ دۆنەمێن عەردی بوون[٥٩].

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ شێخانوك مەلا حاجی

**باشووری،** گوندێ خرابە ژێر

**رۆژهەلات،** گردەسین

**رۆژئاڤای،** گوندێ پیر خولین

### پێكهاتا گوندی:

ئاكنجیێن گوندی عەشیرەتا هەركی ژ مالباتێن (مالە زاهێر و باب یەزدینی)نە، ئاكنجییێن گوندی ژ ٣٠ مالان پێكدهێن.

### ئاڤاكرنا گوندی:

سەبارەت ئاڤاكرنا گوندی ل دەمێ هەركی چوینە سەر سنوورێن ئیرانێ و پاشی ل سەرهلدانا ١٩٩١ دەمێ هەركی ژ ئالیێ رێكخراوا جیهانی یا هەیڤا سور هاتینە ڤەگەراندن بۆ كوردستانێ دابەشی سەر دەڤەرێن جودا جودا كرینە و هەردو گوندێن (خرابە ژێر و خرابە زوور) ژ وێ سالێ وەرە ژ ئالیێ خەلكێ گوندیڤە دوبارە هاتینە ئاڤاكرن.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیانا خەلكێ گوندی ل سەر خودانكرنا مەر و مالاتی و كارێ كشتوكالیێ و پێشمەرگاتیێ یە، و هەروەسا ل گوندی خواندنگەهـ و مزگەفت و پرۆژەیێ ئاڤا ڤەخوارنێ هەیە[٦٠].

## گوندێ خرپێ

سەبارەت واتایا ناڤێ خرپێ ل دووڤ گۆتنا خەلكێ گوندی كو دبێژن: گوندێ خرپێ گوندەكە مەسیحی لێ بوون و پەیڤا خرپێ ژی پەیڤەكە ب زمانێ وان. ئەڤ گوندە گوندەكێ كەڤنە و ل سەدساليا شازدێ زایینی ب ناڤێ خرپا و خربا دوملكا د ژێدەراندا ئاماژە پێ هاتییەكرن، ل سەردەمێ میرگەها بەهدینان دیرەك ل نیڤا گوندی هەبوو دگۆتنێ دێرا (مریم العذراء)، د دەمێن درنگتردا ژی دێرەكا دی ب ناڤێ (مار یوحنان) ل دەرڤەی گوندی هاتبوو ئاڤاكرن، دێرا گوندی نەه رەزێن تری و ١٢ زەڤی هەبوون دەهێك ددا، میرێ بەهدینان سولتان حسین وەلی خویكا دەهـ قرش و پێنج بەغدادییان (پارێ وی دەمی) ژ گوندی دستاند بۆ خواندنگەها قوپا د مەزاخت، ل دوایيا سەدساليا هەژدێ ٢٠٠ مەسیحیێن كاسولیك ل گوندی دژیان دێرەك هەبوو و پەرستڤانەكی

(کاهنەکی) سەرپەرشتییا وێ دکر[11]. رەوشەنبیر و نڤیسکارەکێ کلدانی دبێژیت: ل سالا ١٨٦٥ێ ٢٠ مالێن مەسیحیێن کلدان لێ بوون، ل سالا ١٨٨٥ێ ١٢ مال بوون، ل سالا ١٩١٤ێ ٢٠٠ کەسێن کلدانێن کاسولیك لێ دژیان، سالا ١٩١٨ێ ٢١ مال بوون دبوونە ١١٤ کەس، دوا ئامارا ئامازەپێکرییا گوندی ل سالا ١٩٦١ێ بوو د وێ سالێدا ٣٠ خێزان ل گوندی دژیان دبوونە ١٦٠ کەس، سالا ١٩٦٢ێ ژ ئەنجامێ روودانێن دەسپێکا شۆرشا کوردستانێ خەلکێ گوندی گوند بەردایە[12] و مایە ڤالا هەتا هەرکی لێ ئاکنجی بووین. گوند ب دووراتییا ١٦کم دکەڤیتە باکوورێ گردەسێن و ٣کم ژ مەلبەندێ قەزا ئاکرێ دوورە، هەژییە بێژین ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ گوندی ١٨١ کەس بوو و وی دەمی سەر ب ناحیا سۆرچی ڤە بوو[13].

**سنوورێن گوندی:**

**باشووری:** کۆمەاگەها ئالەیێ

**باکووریی:** وێ گوندێ راس العینە

**رۆژهەلات:** ئاکرێ

**رۆژئاڤای:** گوندێ کوچینە مەلا فەرزو یە

**پێکهاتا گوندی:**

نها خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا هەرکی نە و تنێ ئێك مالبات لێ هەیە ئەوژی (مالەپیر)ە، و هەروەسا ئەڤ گوندە ژ ئالیێ مەسیحییان هاتبووچۆلکرن و دووبارە هەرکی یان ل سالا ١٩٦٠ ئەڤ گوندە ئاڤاکرییە.

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

خەلکێ گوندی وەکی هەمی گوندێن دی کارێ چاندنێ و خودانکرنا مەر و مالاتی دکەن و هندەك ژوانا پێشمەرگە و فەرمانبەرن.

**ژێدەرێن ئاڤا گوندی:**

گوند یێ دەولەمەندە ب سامانێ ئاڤا ژێر زەڤی، د دەمێ کۆلانا بیراندا تنێ پێویستی ب چەند مەترەکێن کێم هەیە بۆ دەرێخستنا ئاڤێ و رووبارەکێ ئاڤێ ژی هەیە، بیرێن ئاڤێ هاتینە کۆلان و ئاڤا ڤەخوارنێ بۆ گوندییان ژێ هاتییە دابینکرن[14].

## گوندێ نیاووکێ

سەبارەت واتایا ناڤێ گوندی گەلەك هەولدان هاتنە کرن کو واتایا ناڤێ گوندی بزانین لێ جهێ داخێ یە کەسەکێ پێزانین ل سەر نەبوون. گوند ٣٥کم ژ مەلبەندێ ناحیا گردەسێن دوورە و ٣٠کم ژ مەلبەندێ قەزا ئاکرێ دوورە.

**سنوور و جوگرافیا گوندی:**

جوگرافیا گوندی ژ دەشتەکا پان و درێژ پێکدهێت، عەردەکێ باشە بوو چاندنا دەخل و دانی. سنوورێن گوندی ب ڤی رەنگینە:

**باکووری:** گوندێ جەلان عەرەب

**باشووری:** گوندێ مام داویدان ژێری

**رۆژهەلات:** گوندێ گۆران کامل

**رۆژئاڤای:** گوندێ مام داویدان ژووری

**پێکهاتا گوندی:**

ڤی گوندی شەش مالبات لێ هەنە ئەوژی مالباتێن: عزوی، قیش، سەلیم، قەتران، فارس و مەروان) ژ عەشیرەتا هەرکی نە و نێزیکی ٩٠ - ١٠٠ مالان لێ هەنە، بەری سالا (١٩٧٥) ١٥ - ٢٠ مال لێ هەبوون، سالا ٢٠٠٢ خواندنگەهـ بۆ هاتییە ئاڤاکرن و هەتا پۆلا سێ ناڤنجی لێ دهێتە خواندن و مزگەفت ژی ل گوندی هەیە.

**ژێدەرێ ژیارا خەلکێ گوندی:**

ژیانا خەلکێ گوندی ب شێوەیەکێ گشتی ل سەر کارێ جۆتیارێ یە و دەشتا وی یا ب ناڤ بانگە بۆ چاندنا دەخل و دانی و خودانکرنا مەر و مالاتی، بەشەك ژ گوندییان پێشمەرگە و فەرمانبەرن[15].

## گوندێ گلێنە

واتایا ناڤێ گوندێ گلێنەی یا ژ (گلێنا چاڤی) هاتی ئانکو گلێنا چاڤێ هەمی گوندا یان هەلبژارتی د ناڤاهەمی گوندا. گوند ب دووراتیا ١٥کم دکەڤیتە رۆژئاڤایێ گردەسێن و ١٨کم ژ مەلبەندێ قەزا ئاکرێ دوورە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ جەریدوکی یە.

**باشووری:** هەڤسنوورە دگەل شاروچکەیا قەسروك.

**رۆژهەلات:** گوندێ ئومەرسێنا یە.

**رۆژئاڤای:** گوندێ هزار جوتی یە.

### پێکهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە پێکدهێت ژ شەش مالباتان ئەوژی (مالەحەیدێ و ئاودی و پسەغا و مالە حاجێ و ناوی و کانیە سپی)نە و ژ عەشیرەتا هەرکی نە و ژمارا مالێن گوندی نێزیکی ٥٠ مالانە.

### ژێدەرێ ئاڤا گوندی:

گوند یێ دەولەمەندە ب هەبوونا گەلەك بێرێن ئاڤێ کو هژمارا وان (٢٠) بیرن و (٥) ژوان بیرا ئاڤ بخو دهێت و (١٥) بیرێن دیتر ب ماتوران ئاڤ لێ دهێتە کێشان.

### ژێدەرێ ژیارا خەلکێ گوندی:

ب شێوەیەکێ گشتی ژیانا خەلکێ گوندی ل سەر چاندنێ یە ب تایبەت چاندنا (رەزێن خۆخا) و دارێن سپیندارا و هەروەسا خودانکرنا پەزی.

سالێن حەشتێیان خواندنگەهـ لێ هاتبوو ڤەکرن، ل ٢٠٠٥/١٢/٥ خواندنگەهەکا نوی بۆ هاتە

گوندێ گلێنە



ئاڤاكرن و هەتا پۆلا نەهێ بنەرەتی لێ دهێتە خواندن، ل گوندی مزگەفت ژی هەیە(٦٦).

## گوندێ كوشكێ

كوشك ئانكو گوشك یان (گوهیشك) ناڤێ گوندی یێ ژ جۆرەكێ دارێ هاتی بەلێ ب بۆرینا دەمی ئەڤ ناڤە هاتییە گهورین ل سەر زمانێ خەلكی سڤك بوویە و هاتییە كورتكرن و ژ گوهیشك بوویە كوشك.

بەلێ ئەڤ واتایا ناڤێ گوندی ژ ئالیێ خەلكێ گوندی ڤە نەهاتییە پشتراستكرن و هندەك بۆچوونێن جیاواز ل سەر هەنە، ئەگەر ئەم بەرێ خو بدەینە رێزمانا كوردی كوشك دهێت ب واتایا (كۆچك).

**سنوورێن گوندی:**

**باشووری،** گوندێ سالەیێ یە.

**باكووری،** گوندێ لەكانە.

**رۆژهەلات،** گوندێ تلبۆكێ یە.

**رۆژئاڤای،** گوندێ خەلیلكانە.

گوند ب دووراتییا ٣٣كم دكەڤیتە باكوورێ رۆژئاڤاییێ گردەسێن و ٢١كم ژ مەلبەندێ قەزا ئاكرێ دوورە.

**پێكهاتا گوندی:**

خەلكێ گوندی هەمی ژ بنەمالا (مالە سوارێ) نە، سەر ب عەشیرەتا هەركی نە، بەری سالا (١٩٧٠) ێ ١٥ - ٢٠ مال بوون، نها بەر ب زێدەبوونێ چویە گەهشتییە ٧٥ - ٨٥ مالان، گوند ل هەیڤا چریا ئێكێ سالا ١٩٦٣ هاتییە ئاڤاكرن.

**ژیارا خەلكێ گوندی:**

ب شێوەیەكی گشتی ژیارا خەلكێ گوندی ل

گوندێ كوشكێ



سەر کشتوکالی یە، تایبەت چاندنا دەخل و دانی، ئەردێ وێ یێ چاندنێ نێزیکی ١٠٥٦ دونمە و ٩٠ جۆتیار لێ هەنە.

سالا ل سالا ١٩٩٩ خواندنگەهـ لێ هاتییە ئاڤاکرن و هەتا پێشی چەند سالەکان تنێ خواندنا بنەرەتی لێ دهاتە خواندن، لێ نها هەتا پۆلا شەشێ ئامادەیی ژی لێ دهێتە خواندن، مزگەفتەك ل گوندی گوندی[١٧].

## گوندێ کوچینە مەلا فەرزو

پەیڤا کوچینە دهێت ب واتایا ئەوێن کوچکری ئانکو ژ جهەکی هاتین بۆ ڤی جهی و لێ ئاکنجی بووین، و ب گوندێ (کوچینە مەلا فەرزو)ی دهێتەنیاسین، ژبەرکو دکەڤندا مەلا فەرزو خودانێ مولکێ گوندی بوویە. گوند د دەمێ خۆدا ٤کم ژ مەلبەندێ قەزا ئاکرێ بوو و ب دووراتییا ١٤کم دکەڤتە باکوورێ ناحیا گردەسێن. نها گوند کەتییە د سنوورێ بازێرڤانییا ئاکرێ دا.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ سماقوکێ

**باشووری:** گوندێ خرپێ

**رۆژهەلاتی:** بازێرێ ئاکرێ

**رۆژئاڤایی:** گوندێ کوشینا حەسەن بەدوی

### پێکهاتا گوندی:

دو عەشیرەتێن سەرەکی ل گوندی هەنە ئەوژی عەشیرەتێن (زێباری و هەرکی) نە، هەرکی ٩٠٪ هژمارا ئاکنجییان پێك دئینن، مالباتێن گوندی ژ هەرکییا بریتینە ژ مالباتێن: مالە شەمێ و مالە ئەویازێ و هەسنێ، مالە گورگی، مالە ئەو بازی، هەسنی مام شێخ، ئاودی و کانیەسپی) و هەروەسا مالباتا زێبارییان بریتینە ژ شنی و کاودانی و هەروسا خەلکێ گوندی ب شێوەیەکێ گشتی مووچەخورن و چاندن و خودانکرنا مەر و مالاتی کێم بوویە.

### ئاڤاکرنا گوندی:

گوند ل دەورووبەرێن سالا ١٩٤٠ هاتییە ئاڤاکرن، نها گوند گەلەك بەرفرەهـ بوویە چ سیمایێن گوندان پێڤە دیارنینە چونکی گوند گەهشتییە بازێرێ ئاکرێ، سالا ٢٠١٠ خواندنگەهـ بوو هاتییە ئاڤاکرن[١٨].

## گوندێ شیوە کوور

ناڤێ گوندێ (شیوە کوور) یا ژ جهێ وی هاتی چونکی دکەڤیتە د دۆلەکێدا کو شیوەکا کویرە، بەلێ نها پیچ پیچە ژ دۆلێ دهێتە دەرێ.

### سنوور و جوگرافیا گوندی:

سرۆشتی گوندی ژ گرك و دۆلێن کویر و درێژ پێکدهێت، سنوورێ گوندی دکەڤیتە باکوورێ رۆژئاڤای گردەسێن و رۆژئاڤایێ ئاکرێ و ٢٠کم ژ مەلبەندێ ناحیا گردەسێن دوورە و هەروەسا ٥کم ژ قەزا ئاکرێ دوور بوو نها بوویە تاخەکێ ئاکرێ..

### پێکهاتا گوندی:

گوندی هەمی ژ عەشیرەتا هەرکی نە و مالباتا (ئاودی)نە، و گوندەکێ بچویکە، نێزیکی ٢٥ مالن، گوند سالا ١٩٦٨ێ ژ ئالیێ خەلکێ گوندی هاتییە ئاڤاکرن، ژبارا خەلکێ گوندی ب شێوەیەکی گشتی ل سەر مووچەخوریێ یە و پتریا وان پێشمەرگەنە، ل ٢٠٠٢/١١/١ پرۆژەیێ ئاڤا ڤەخوارنێ بۆ هاتییە کێشان و بیرەکا ئیرتیوازی بۆ هاتییە لێدان، هەتا نها خواندنگەهـ و مزگەفت لێ نینن[١٩].

## گوندێ گرئاشور

گرئاشور یان (گر عاشیرك) ب زاراڤێ هەرکی یا ناڤێ وی دیارە یێ ژ ناڤێ (گرێ ئاشووری) هاتییە، کو گرەکە دکەڤیتە ناڤ گوندی، گرەکێ شوینوارییە بۆ سەردەمێ ئاشوورییان ڤەدگەریتەڤە، هەروەسا ناڤەکێ دی ژی ل ڤی گوندی هەیە کو دبێژنێ (چەم کشتاو)، هەروەسا گوند ب دووراتییا ٧کم دکەڤیتە

رۆژهەلاتێ گردەسێن و ١٧كم ژ مەلبەندێ قەزا ئاكرێ دووره.

### سنوورێن گوندی:

**باشووری**، گوندێ مەلكێ جبوو یە.

**باكووری**، گوندێ ئومەرخوشا یە.

**رۆژهەلات**، گوندێ نێرگزینە.

**رۆژئاڤای**، دەشتەكا درێژە هەتا خو دگەهینتە سنوورێ ناحیا گردەسێن.

### پێكهاتا گوندی:

گوند چوار مالباتان بخۆڤە دگریت ئەوژی بریتینە ژ: پسەغا و مالەپیر و كانیە سپی و مالە گیادینێ) و ژ عەشیرەتا هەركی نە، و هەروەسا ئاڤاكرنا گوندی ڤەدگەریتەڤە بۆ سالێن شیستان، و دبەرێ دا مەسیحی ل گوندی بوونە بەلێ پشتی وان گوند بجە هێلای دوباره ل سالا ١٩٨٣ گوند ژ ئالیێ خەلكەكێ ڤە هاتیە ئاڤاكرن، نها ٣٥ - ٤٥ مال ل گوندی هەنە.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیانا گوندیان هەروەكی زۆربەیا گوندێن دیتر ل سەر خودانكرنا مەر و مالاتی و كارێ كشتوكالیێ و هەروەسا بەشەك ژوانا پێشمەرگەنە..

ل سالێن شیستان خواندنگەهـ ل گوندی هەبوو، لێ د خانییەكی كەڤندا وانە لێ دهاتنە خواندن، سالا ٢٠١٢ خواندنگەهەكا شەش پۆلی بۆ هاتیە ئاڤاكرن و هەتا پۆلا شەشێ ناڤنجی لێ دهێتە خواندن.

### جهێن شوینواری:

داناڤا گوندی دا گرەكێ شوینواری هەیە كو ناڤێ گوندی هەر بڤی گری هاتییەكرن و چەند تیمەكێن شوینوارناس سەرەدانا ڤی گری كرینە و چەند كەل و پەلێن كەڤن لێ هاتینە دیتن كو هندەك ژوان كەل و پەلان نها ل موزەخانا هەولێرێ نە[٧٠].

## گوندێ بازێره ژوور

سەبارەت واتایا ناڤێ گوندی ناڤێ وی ژ دو برگەیا (با + ژوور) پێكدهێت ئانكو بایێ ژ ژوور دهێت، هەروەسا د رێزمانا كوردی دا پەیڤا بازێر دهێت ب واتایا شار، گوند ٤٠كم ژ مەلبەندێ ناحیا گردەسێن دووره و دكەڤیتە رۆژئاڤایێ ناحیێ و ٤٥كم ژ مەلبەندێ قەزا ئاكرێ دووره.

### سنوورێن گوندی:

**باشووری**، گوندێ كونسیخور

**باكووری**، دگەهیتە سنوورێت قەزا شێخان

**رۆژهەلات**، گوندێ بازێره ژێر

**رۆژئاڤای**، گوندێ باقوسپێ

### پێكهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە ژ ئالیێ ئاكنجییان ڤە جۆراوجۆره هەردو عەشیرەتێن (هەركی و مزووری) لێ هەنە، گوندەكێ مەزنە و هژمارا مالێن گوندی ١٣٥ - ١٥٠ مالە و مێژوویا ئاڤاكرنا وی ڤەدگەریت بۆ سالا ١٩٥٤ كو ژئالیی خەلكێ گوندیڤە هاتیە ئاڤاكرن، د سەرژمێریا سالا ١٩٥٧یدا ناڤێ گوندێ (بازین زۆر) كو ئەم باوەرین هەمان ئەڤ گوندێ (بازێره ژووره)ە هژمارا خەلكێ وی وێ سالێ ٨٨ كەس بوو[٧١]، نها هژمارا خلكێ وێ نێزیكی ٦٠٠ كەسانە دابەشی سەر ١٠٥ خێزانا دبیت، ل سالا ١٩٨٦ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەكرن.

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

گوند یێ دەولەمەندە ب هەبوونا ژێدەرێن ئاڤا كانییا و رووبارێ خازر كو دناڤا گوندی را دبووریت و ژێدەرەكێ سەرەكی یێ ئاڤا ڤەخوارنا گوندی پێكدئینیت، ل ٢٠٠٤/٤/٢٢ سكرەك ل سەر ئاڤا رووبارێ خازر بۆ هاتییە چێكرن.

**زێدەرێن زیارا خەلکێ گوندی:**

یا خویایە هەر گوندەکێ دەولەمەند بیت ب ئاڤا کانییا و رووبارا ژیانا پتریا خەلکێ وێ دێ ل سەر چاندنێ و رەز و بیستانا بیت، گوند یێ ناڤدارە ب چاندنا برنجی و دگەل خودانکرنا مەر و مالاتی، و هەروسا بەشەك ژ خەلکێ گوندی پێشمەرگە و فەرمانبەرن.

**جهێ شوینواری:**

ل ڤی گوندی جهەکێ شوینواری هەیە دبێژنێ (قەسرا پیر هەیڤێ) بەلێ ب مخابنی ڤە چ زانیاری ل سەر نەهاتینە پشت راستکرن کا ئەڤ شوینوارە بوو چ سەردەم ڤەدگەریتە ڤە[٧٢].

## گوندێ بازێرە ژێری

دەمێ هندەك ژخەلکێ گوندێ بازێرە ژوور ب مەرەما خودانکرنا مەر و مالاتی قەستا ڤی جهی کری و پاشی هەر ل ڤی جهێ خانی ئاڤاکرین و ناڤێ گوندێ خو هەر ب ناڤێ بازێرە کر لێ ژبەرکو دکەفتە ژێرا گوندێ بازێرە ژوور ناڤێ وی کرن بازێرە ژێر، هەروەسا گوند ب دووراتییا ٤٠کم دەڤیتە رۆژئاڤایێ گردەسێن و ٤٥کم ژ مەلبەندێ قەزا ئاکرێ دوورە.

**سنوورێ گوندی:**

**باشووری،** گوندێ جەلان ئادمین

**باکووری،** دگەهنە سنوورێن قەزا شێخان.

**رۆژهەلات،** گوندێ بانیرێ

**رۆژئاڤای،** گوندێ بازێرە ژوور

**پێکهاتا گوندی:**

ئەڤ گوندە ژ ئێك مالبات پێکدهێت ئەوژی مالباتا (ئەحمەدی)نە و ژ تیرەیا پسەغا یانە و سەر ب عەشیرەتا هەرکی یان ڤەنە و هژمارا خەلکێ گوندی ١٠ مالن ئاڤاکرنا گوندی ڤەدگەریت بوو سالا ١٩٧٠ ی یان.

**زێدەرێن ئاڤا گوندی:**

گوند یێ دەولەمەندە ب هەبوونا ئاڤا کانییا و هەروەسا ئاڤا رووبارێ خازر کو دناڤا گوندی را دبووریت و ژێدەرەکێ سەرەکی یێ ئاڤا ڤەخوارنا گوندی پێك دئینیت.

**زێدەرێن زیارا خەلکێ گوندی:**

ژ بەر دەولەمەندییا گوندی ب ئاڤا کانییا و رووبارا و ژیانا پتریا خەلکێ وێ ل سەر چاندنا بەرهەمێن کشتوکالی و رەز و بیستانا نە و دگەل خودانکرنا مەر و مالاتی[٧٣].

## گوندێ تلبۆك

بەری هەرکی بێنە ڤی گوندی ژ مێژڤە مەسیحی لێ بوون و ناڤێ گوندی (تل + بۆك)بوو ئانکو (گرێ دزا) ئەڤ ناڤەژی هەر ژ مەسیحیان بوو مایە، پشتی وان گوند ب جە هێلای، گوند ١٥کم ژ مەلبەندێ ناحیا گردەسێن دوورە و ٢٠کم ژ مەلبەندێ قەزا ئاکرێ دوورە.

**سنوورێن گوندی:**

**رۆژهەلات،** گوندێ خرابە ژێر

**رۆژئاڤای،** گوندێ بەدریکێ

**باشووری،** گوندێ پیرخولی

**باکووری،** گوندێ کیشکێ

**پێکهاتا گوندی:**

گوندی بتنێ ئێك تیرە لێ هەیە ئەوژی تیرەیا (مالەزاهێر)ە و دابەشی سەر سێ مالباتان دبیت ئەوژی بریتینە ژ مالباتێن (عوسمان محەمەد و نەبۆ مردو و مستەفا مردو) ژ عەشیرەتا هەرکی نە، و گوند ل سالا ١٩٥٦ یێ هاتی ئاڤاکرن، خەلکێ گوندی هەیا نها ٣٠ - ٤٠ مالە، جادا ڤێرکری گەهشتییە گوندی و مزگەفت و پرۆژەیێ ئاڤا ڤەخوارنێ ژی هەیە.

**زێدەرێن زیارا خەلکێ گوندی:**

ژیانا خەلکێ وێ ب شێوەکی گشتی ل سەر

جۆتیارێ و خودانکرنا مەر و مالاتی و بەشەك ژ وانا پێشمەرگە و فەرمانبەرن، سالا ٢٠٠٢ێ خواندنگەهەکا شەش پۆلی بۆ هاتییە ئاڤاکرن و هەتا پۆلا شەشێ بنەرەتی لێ دهێتە خواندن.

هندەك جهێن بەرنیاس دگوندی دا ئەوژی (دۆلا بەنوکێ و گرێ تلبۆکێ) یە[٧٤].

## گوندێ گۆرانك حەجی عەرەب

خەلکێ گوندی چ زانیاریێن پشتراستکری ل سەر واتایا ناڤێ گوندی نەبوون لێ ئاماژە ب چەند تشتەکێ کێم کرن و گۆتن: پێشدا ل ڤی گوندی گەلەك ئاڤ و دەعل و قەرەم هەبوو، دابێژن ئەڤە گورنکە دەعلە یان گورنکە قەرەمە، بەلێ ئەگەر ئەم بەرێ خو بدەینە پەیڤا گۆرانك ل دو برگا پێك هاتی یە (گۆران + ك)، گۆران ناڤێ عەشیرەتەکێ یە و پاشگرێ (ك) دزاراڤێ هەرکی یان دا دهێتە ب کارئینان دەمێ ب چاڤەکێ کێم بەرێ خو ددەنە جهەکی یان کەسەکی، وێ ژی ژیرنەکەین ل هندەك دەڤەرێن کوردستانێ ب تایبەت دەڤەرێن گەرمیان دگۆتنە خەلکەکێ نیشتەجێ ل گوندان و مژوولی کارێ جۆتیارێ گۆران، بەروڤاژی کۆچەر بوون ئانکو خەلکێ دەشت و زۆزان دکرن. گوند ٣٠کم ژ ئالیێ رۆژئاڤاییی ڤە ژ مەلبەندێ ناحیا گردەسێن دوورە، و ٢٠کم ژ مەلبەندێ قەزا ئاکرێ دوورە ژ ئالیێ باکوورێ رۆژئاڤایڤە.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلات:** گۆرانکا مەزنە.

**رۆژئاڤای:** گوندێ جەلان ئامەدینە.

### پێکهاتا گوندی:

دناڤا گوندی دا بتنێ ئێك تیرە لێ هەیە ئەوژی (مام شێخ)ن ژ ئێك مالبات پێکدهێت ئەوژی (مالا حەجی عەرەب)ە، و هەروسا ئەڤ گوندە ل سالا ١٩٨٣ خۆ ژ گوندێ گۆرانکا مەزن جوداکرییە و بوویە گوندەکێ سەربەخو، و گوند ٢٥ - ٣٥ مالە، مزگەفت و پرۆژەیێ ئاڤا ڤەخوارنێ ل گوندی هەنە.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

خەلکێ گوندی ژبۆ ب رێڤەبرنا ژیانا خو پەنا بریبە بەر خودانکرنا مەر و مالاتی و جۆتیارێ و هەروەسا بەشەك ژوانا ژی پێشمەرگەنە، سالا ٢٠١٣ خواندنگەهـ بۆ هاتییە ئاڤاکرن[٧٥].

## گوندێ جەلان ئامەدین

گوندێ جەلان ئامەدین گوندەکە دەسپێکێ مەسیحی تێدا بوون و دگۆتنە گوندی (ئامەدین) ئەڤ پەیڤە پەیڤەکە ژ زمانێ مەسیحیێن دەڤەرێ ، گوند دکەڤیتە ناڤ دۆلان ل دەوروبەرێن ئاڤێ واتە هەردو رەخێن ئاڤێ (جەلان) هەردو لا ئانکو هەردو رەخێن ئاڤێ ئەڤ پەیڤە ژی هەرکی یا ب کارئینا دەمێ ل ڤی گوندی نیشتەجێ بووین و ناڤێ گوندی دانا (جەلان ئامەدین) گوند ب دووراتیا ٢٠کم دکەڤیتە باکوورێ ناحیا گردەسێن و دووراتیا ١٥کم دەڤیتە رۆژئاڤای قەزا ئاکرێ.

ئەڤ گوندە یەك ژ وان ٥٤ گوندێن قەزا ئاکرێ بوو یێن ل دوایا سەدسالیا نوزدێ دەسپێکا سەدسالیا بیستێ ژ ئەنجامێ زێدەگاڤیێن عەشیرەتان و نەمانا ئاسایش و تەناهیێ هاتینەبەردان و ڤالابووین ژ ئاکنجییان، لەوما دەستەلاتداریا ئوسمانی ب بریارەکێ ل ٢٤ نیسانا ١٩٠٧ێ ئەڤ گوندە دانە دگەل مولکێن سولتان عەبدولحەمیدێ دووێ و ب ڤی رەنگی مان هەتا راگەهاندنا دەستوورێ ئوسمانی ل ٢٣ تەباخا ١٩٠٨ێ ئەو بوو سولتانی ب ناچاری دەست ژ مولکینیا ڤان گوندان بەردا کەتنە سەر گەنجینا گشتیا دەولەتێ، وی دەمی رووبەرێ گوندی ٢٠٦٣ دۆنەمێن عەردی بوو[٧٦].

### سنوور و جوگرافیا گوندی:

سرۆشتی گوندی هەمی گرێن پان و دۆلێن کویر و درێژن، گەلەك ب مفانە بۆ چاندنا دەخل و دانی و خودانکرنا پەزی، سنوورێن گوندی ب ڤی رەنگینە:

**باكووری،** گوندێ جەلان عەرەب

**باشووری،** گوندێ نیاوكێ

**رۆژهەلات،** گوندێ گۆرانك حەجی عەرەب

**رۆژئاڤای،** گوندێ بانیرێ

**پێكهاتا گوندی:**

دناڤا گوندیدا تنێ ئێك تیرە لێ هەیە ئەوژی تیرەیا (پسەغا)نە و دبنە سێ مالبات مالباتێن: (میرو و عەبدۆللا و عیسا)نە ژ عەشیرەتا هەركی نە و هەرەسا گوند ل سالا ١٩٢٦ یێ وەك كوخێن خودانكرنا پەزی هەبوو، سالا ١٩٤٥خانی لێ هاتینە ئاڤاكرن، خەلكێ گوندی ٢٥ - ٣٠ مالە.

**ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:**

ژیانا پتریا خەلكێ گوندی ل سەر خودانكرنا پەزی و جۆتیاریێ یە وەكی چاندنا دەخل و دانی و بەشەك ژوانا پێشمەرگەنە، و هەروسا ژێدەرێ ئاڤا ڤەخوارنا گوندی ل سەر بیرەكا ئاڤێ یە كو ژ ئالیێ حكۆمەتا هەرێما كوردستانێ ڤە هاتیبە كۆلان.

سالا ١٩٩٧ خواندنگەهـ ل گوندی هاتیبەڤەكرن و هەتا پۆلا سێ ناڤنجی لێ دهێتە خواندن[٧٧].

## گوندێ جەلان عەرەب

جەلان عەرەب یان جەلان عەرەبۆك ئەڤ گوندە دكەڤیتە رۆژهەلاتێ گوندێ جەلان ئامەدین و هەڤسنوورێن ئێكن و خەلكێ گوندی دبێژن: پێشی هەركی بێنێ و لێ ئاكنجی ببن هندەك مالێن عەرەبا لێ بوون ئەڤ ناڤە یێ ژوان هاتی و دگۆتنێ جەلان عەرەب، گوند ب دووراتییا ٣٢كم دكەڤیتە باكوورێ ناحیا گردەسێن و ب دووراتییا ٢٢كم دكەڤیتە باكوورێ رۆژئاڤای قەزا ئاكرێ.

گوندێ جەلان عەرەب



ئەڤ گوندە كو د بەلگەنامەیا ئوسمانیدا ناڤێ وی ب جەلان ئەرەبوك هاتییە، یەك ژ وان ٥٤ گوندێن قەزا ئاكرێ بوو یێن ل دوایا سەدساڵیا نوزدێ دەسپێكا سەدساڵیا بیستێ ژئەنجامێ زێدەگاڤیێن عەشیرەتان و نەمانا ئاسایش و تەناهیێ هاتینەبەردان و ڤالابووین ژ ئاكنجییان، لەوما دەستەلاتداریا ئوسمانی ب بریارەكێ ل ٢٤ نیسانا ١٩٠٧ێ ئەڤ گوندە دانە دگەل مولكێن سولتان عەبدولحەمیدێ دووێ و ب ڤی رەنگی مان هەتا راگەهاندنا دەستووری ئوسمانی ل ٢٣ تەباخا ١٩٠٨ێ ئەو بوو سولتانی ب ناچاری دەست ژ مولكینیا ڤان گوندان بەردا كەتنە سەر گەنجینا گشتیا دەولەتێ. وی دەمی رووبەرێ گوندی ٢٥٠٠ دۆنەمێن عەردی بوو[٧٨].

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ سێلان سالحە.

**باشووری،** گوندێ بەیبینەوا

**رۆژهەلات،** گوندێ جەلان ئامەدینە

**رۆژئاڤای،** گوندێ كونسیخورە

### پێكهاتا گوندی:

ئاكنجیێ گوندی هەمی ژ تیرەیا (پسەغا) نە و ژ ٤ مالباتان پێكدهێن، بریتینە مالباتێن ( سێودین و مجیدخان و شور و خانو)نە و سەر ب عەشیرەتا هەركی ڤەنە، ئاڤا كرنا گوندی ڤەدگەریت بوو ساڵا ١٩٥٥ و خەلكێ گوندی ١٣ - ١٧ مالە.

هەروەسا جهێن بەرچاڤ و ناڤدار ل گوندی وەكی (دۆلاجە و دۆلا ئەغەلێ و كەونە گوند و كەنیشكێ) نە.

### زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیانا خەلكێ وێ هەر ل سەر خودانكرنا مەر و مالاتی و جۆتیاریێ یە، بەشەك ژ وانا پێشمەرگە و فەرمانبەرن، پرۆژەیێ ئاڤا ڤەخوارنێ بۆ هاتییە كێشان و ساڵا ٢٠٠٢ێ خواندنگەهـ بۆ هاتییە ڤەكرن، هەتا پۆلا شەشێ بنەرەتی لێ دهێتە خواندن[٧٩].

## گوندێ راوێتە

سەبارەت ناڤێ گوندی خەلكێ گوندی دبێژیت: واتایا گوندی یا هاتی ژ (سلسلە) زنجیرەیەكا گرا كو ژ چەند گرەكان پێكدهێت ل پشت گوندی و دبێژنە وان گرا (راوێتە) ئانكو واتایا گوندی یا ل ڤان گركان هاتی، گوند ب دووراتیيا ١٥كم دكەڤیتە رۆژئاڤایێ گردەسێن و ب دووراتیيا ١٠كم دكەڤیتە باكوورێ رۆژئاڤای ئاكرێ.

### سنوورێن گوندی:

**باشووری،** گوندێ كوشینە حەسەن بەدو

**باكووری،** گوندێ گۆرانك حەجی عەرەب

**رۆژهەلات،** گوندێ رەزوك

**رۆژئاڤای،** گوندێ كوزادارێ

### پێكهاتا گوندی:

گوندی ژ تیرەیا (بەدری)یا نە، ژ ئێك مالبات پێكدهێت ئەوژی هەر (بەدری)نە ژبەركو بەدری بخوە دكێمن و سەر ب عەشیرەتا هەركی نە، و هەروسا گوند ل ساڵا ١٩٧٧ێ ژ ئالیێ خەلكێ گوندی ڤە ب مەرەما خودانكرنا پەزی هاتییەئاڤاكرن، خەلكێ گوندی نێزیكی ٢٠ مالانە.

ساڵا ١٩٩٧ خواندنگەهەكا شەش پۆلی بۆ هاتییە ئاڤاكرن و هەتا پۆلا شەشێ بنەرەتی لێ دهێتە خواندن.

### زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیانا پتریا خەلكێ گوندی ل سەر خودانكرنا مەر و مالاتی یە و ماستێ بەدریيا ل دەڤەرێ گەلەك یێ ناڤدارە و هەروەسا بەشەك ژ وانا پێشمەرگە نە.

ل ١٩٩٩/٦/٦ پرۆژەیێ ئاڤا ڤەخوارنێ بۆ گوندی هاتییەكێشان و ئاڤ ل مالان دابەشدبیت[٨٠].

## گوندێ درین خواجە

ل دووڤ گۆتنا موختارێ گوندی: (دری) جۆرەکێ رووەکی یە ل دەڤ ئاڤا شین دبیت و (خواجە) ژی خودانێ ڤی ئەردی یە ژبەر ڤێ یەکێ دگۆتنێ (درین خواجە)، گوند ب دووراتییا ٦کم دکەڤیتە باشوورێ ناحیا گردەسێن و ٧کم ژ مەلبەندێ قەزا ئاکرێ دوورە.

ئەڤ گوندە ژی ژ وان گوندان بوو یێن دەسپێکا سەدسالیا بیستێ بەردای و ڤالا و پاشتر ل سەر مولکێن سولتانێ ئوسمانی عەبدولحەمیدێ دووێ هاتینەتوومارکرن، رووبەرێ گوندی وی دەمی ٢٠٢٥ دۆنەمێن عەردی بوو[٨١].

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ درین شێخە.

**باشووری:** گوندێ خاتوناوا.

**رۆژهەلات:** گوندێ بەراکێ.

**رۆژئاڤای:** گوندێ مەلکێ جبۆ یە.

### پێکهاتا گوندی:

گوندی هەمی ژ تیرەیا (پسەغا)نە و دبنە دو مالبات ئەوژی (سەلیم و معین)، سەر ب عەشیرەتا هەرکی نە، گوندیێن ڤی گوندی ل سالا ١٩١٨ هاتنە گوندێ درین شێخێ و ل ڤێرێ ژیان بسەربر، سالا ٢٠٠٦ێ خو ژ گوندێ درین شێخێ جوداکر و گوندەکێ دی بۆخۆ ل باکوورێ درین شێخێ ئاڤاکر و خەلکێ گوندی ژ ١٢ مالان پێکدهێت.

ل ڤی گوندی چەند کەڤنە ئاشەکێن فەلا یێن لێ هەین و موختارێ گوندی گوت: ئەڤ ئەردە یێ شێخ ئەحمەدێ سۆرچی بوو دا بوو فەلا وان ژی بۆ خۆ برنج لێ دچاند، ل دووڤ گۆتنا موختاری ئەڤ

گوندێ ئالە رەش



چەندا هەنێ ڤەدگەریت بۆ سالا ١٩١٠.

ژیارا خەلکێ گوندی ل سەر خودانکرنا مەر و مالاتی و چاندنێ یە و هندەك ژوانا پێشمەرگەنە، ل گوندی پرۆژەیێ ئاڤا ڤەخوارنێ هەیە[٨٢].

## گوندێ ئالەرەش

ل دوور ناڤێ گوندی موختاری گوندی تنێ ئەڤ زانیارییە ل دەف هەبوو: ئالە رەش تێت ب واتایا (ئالیێ رەش) لێ ئەگەرێ ناڤکرنێ ب ڤی ناڤی چ پێزانین ل سەر نەبوون. گوند ب دووراتییا ٦ کم دکەڤیتە رۆژهەلاتێ گردەسێن و ب دووراتییا ٤کم دکەڤیتە باکوورێ ئاکرێ.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ سماقوك.

**باشووری،** گوندێ درین شێخە.

**رۆژهەلات،** گوندێ ومەرخوشا.

**رۆژئاڤای،** بازێرکێ گردەسێن.

### پێکهاتا گوندی:

گوندی هەمی ژ تیرەیا (مام شێخا)نە، ئێك مالبات ئەوژی (شینە کەیی)نە، ژ عەشیرەتا هەرکی نە، گوند سالا ٢٠٠٣ ێ هاتییە ئاڤاکرن و خەلکێ وێ ٢٠ مالن.

سالا ٢٠١٥ خواندنگەهەکا شەش پۆلی بۆ هاتییە ئاڤاکرن و هەتا پۆلا شەشێ بنەرەتی لێ دهێتە خواندن.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیانا خەلکێ گوندی ل سەر خودانکرنا مەر و مالاتی و چاندنێ یە و هندەك ژوانا پێشمەرگەنە، سالا ٢٠٠٣ پرۆژەیێ ئاڤا ڤەخوارنێ بۆ گوندی هاتییە چێکرن، ل ٢٠٠٦/٨/٤ کارەب بۆ گوندی هاتییە کێشان[٨٣].

## گوندێ سالەیێ

ناڤێ سالەیی تێت ب واتایا ڤەگەریان، ژ مێژە خەلکێ ڤی گوندی هەر سال ئەڤ جهە ب جه دهێلا و قەستا جهەکێ دی دکر و جارەکا دی دا ڤەگەریێن ڤی جهی، ئەڤ کارە هەر سال دوبارە دبوو لەورا گوند ب سالەیێ هاتەناڤکرن، گوند ب دووراتییا ١٥کم دکەڤیتە رۆژئاڤایێ ناحیا گردەسێن و ب دووراتییا ٣٣کم دەڤیتە رۆژئاڤاییێ قەزا ئاکرێ.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ گلگۆران

**باشووری،** گوندێ خرابە ژێری

**رۆژهەلات،** گوندێ کێلەبی

**رۆژئاڤای،** گوندێ کیشکی

### پێکهاتا گوندی:

دناڤا گوندی بتنێ ئێك تیرە لێ هەیە ئەوژی تیرەیا (مام حاجکا) نە، ژ چوار مالباتان پێکدهێن، ئەوژی بریتینە ژ مالباتا (کەمو و حەجی جەوەر و حەجی محو و سەلیم) و ژ عەشیرەتا هەرکی نە. گوند سالا ١٩٧٢ێ هاتییە ئاڤاکرن، وی دەمی خەلکێ وی تنێ ٢٠ - ٣٠ مال بوون، لێ نها هژمارا خەلکی بەر ب زێدەبۆنێ چویە و گەهشتییە ١٠٠ - ١١٠ مالان.

### ژێدەرێ ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیانا خەلکێ گوندی ل سەر خودانکرنا پەزی و ژمارا هەرە زۆرا وان مژوولی چاندن و باغ و بیستانانە، هەروەکی گوند یێ ناڤدارە ب چاندنا بیستانێن گندورێ دێمی.

پرۆژەیێ ئاڤا ڤەخوارنێ ل گوندی هاتییە دروستکرن، سالا ١٩٧٨ خواندنگەهـ ل گوندی هەبوو لێ دخانیەکی کەڤندا وانە دهاتنە خواندن، سالا ٢٠٠٢ ئاڤاهییەکێ نوی بۆ خواندنگەهێ هاتییە ئاڤاکرن و هەتا پۆلا شەشێ لێ دهێتە خواندن[٨٤].

## گوندێ کێلەبی

ناڤێ کێلەبی ژ ناڤێ عەشیرەتەکێ هاتییە وەختێ خۆ ل ڤی گوندی ژیاینە و ناڤێ وێ عەشیرەتێ ژی (بیێ) بوویە لەورا دگۆتنێ گوندێ کێلەبی، گوند ب دووراتییا ١٥کم دکەڤیتە رۆژئاڤایێ گردەسێن و

هەروەسا ٣٥کم ژ مەلبەندێ قەزا ئاکرێ دوورە.

ئەڤ گوندە کو د بەلگەنامەیا ئوسمانیدا ب (کیلی بی) هاتییەناڤکرن، یەك ژ وان ٥٤ گوندێن قەزا ئاکرێ بوو یێن ل دوایيا سەدسالییا نوزدێ دەسپێکا سەدسالییا بیستێ ژ ئەنجامێ زێدەگاڤیێن عەشیرەتان و نەمانا ئاسایش و تەناهیێ هاتینەبەردان و ڤالابووین ژ ئاکنجییان، لەوما دەستەلاتداریا ئوسمانی ب بریارەکێ ل ٢٤ نیسانا ١٩٠٧ێ ئەڤ گوندە دانە دگەل مولکێن سولتان عەبدولحەمیدێ دووێ و ب ڤی رەنگی مان هەتا راگەهاندنا دەستوورێ ئوسمانی ل ٢٣ تەباخا ١٩٠٨ێ ئەو بوو سولتانی ب ناچاری دەست ژ مولکینیا ڤان گوندان بەردا کەتنە سەر گەنجینا گشتیا دەولەتێ، وی دەمی رووبەرێ گوندی ١١٢٦٧ دۆنەمێن عەردی بوو[٨٥].

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری،** گوندێ جەریدوکە

**باشووری،** گوندێ خرابە ژێرە

**رۆژهەلاتێ** گوندێ شێخانوکا مەلا حاجی

**رۆژئاڤای،** گوندێ سالەیێ یە

**پێکهاتا گوندی:**

تنێ ئێك تیرە ل گوندی هەیە ئەوژی تیرەیا (مەمەدی)نە، ژ ئێك مالبات پێکدهێن ئەوژی مالباتا (مالە زیابێ) یە و ژ عەشیرەتا هەرکی نە.

گوند ل سالا ١٩٤٠ هاتییە ئاڤاکرن، هەتا سالا ١٩٧٠ێ خەلکێ گوندی ٣٠ هەتا ٤٠ مال بوون، نها هژمارا خەلکی گەهشتییە نێزیکی ١٨٠ مالان، پرۆژەیێ ئاڤا ڤەخوارنێ بۆ هاتییە چێکرن.

**زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

گوند ب خودانکرنا مەر و مالاتی گەلەك ب ناڤ و دەنگە و رووبەرەکێ گەلەك ئەردێ پاوان ئانکو جهێ چەرینا پەزی هەیە، خەلکێ گوندی کارێ وان خودانکرنا مەر و مالاتی و چاندنە و هندەك ژی ژوان پێشمەرگە و فەرمانبەرن.

سالا ١٩٨٢ خواندنگەهـ ل گوندی هەبوو لێ د ئاڤاهییەکێ کەڤندا بوو، سالا ٢٠٠٣ێ ئاڤاهییەکێ نوو بۆ خواندنگەهێ ئاڤاکرن و هەتا پۆلا شەشێ ئامادەیی لێ دهێتە خواندن[٨٦].

## گوندێ بێناتان

ئەڤ گوند ب دووراتییا ٣٠کم دکەڤیتە رۆژئاڤاییێ گردەسێن و ب دووراتییا ٢٠کم ژ مەلبەندێ قەزا ئاکرێ دوورە ژ ئالیێ باکووریی ڤە.

گوندەك د بەلگەنامەیا ئاماژەپێکریدا ب ناڤێ بیناتە هاتییە و رووبەرێ وی ٨٥٢٥ دۆنەم بوو، دوورنابینین هەر ئەڤ گوندە بیت و کەتییە د ناڤمولکییەتا سولتانێ ئاسمانیێ ناڤبری[٨٧].

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری،** گوندێ بەدریکێ

**باشووری،** هەمی دەشت و گرکن

**رۆژهەلات،** گوندێ خرابە ژوور دهێت

**رۆژئاڤای،** گوندێ گۆرانکا مەزن دهێت

**پێکهاتا گوندی:**

گوندی ژ تیرەیا (پسەغا)نە دبنە چوار مالبات، ئەوژی مالباتێن (قرتاس خاجە و ئەحمو قرتاس خاجە و مزفر قرتاس خاجە و ئەحمەد قرتاس خاجە) سەر ب عەشیرەتا هەرکی نە.

ئەڤ گوندە هەر ل سالا ١٩٣٠ێ هەبوو، وەکو کوخ بوو خودانکرنا پەزی، سالا ١٩٦٤ خانی لێ هاتینە ئاڤاکرن، نها ٣٥ - ٤٠ مالن.

سالا ١٩٧٣ خواندنگەهەکا بچویك لێ هەبوو، دخانیەکێ (تەقنێ)دا بوو، سالا ١٩٩٧ خواندنگەهەك نوو بۆ هاتە ئاڤاکرن و هەتا پۆلا شەشێ بنەرەتی لێ دهێتە خواندن.

### جهێن بەرچاڤ و ناڤدار ل گوندی:

د ناڤا سنوورێن گوندی دا گەلەك جە ژ ئالیێ خەلكێ وێ ڤە هاتینە بەرچاڤكرن و ناڤ لێكرن وەكی (ئاش جەمك و چەمێ بیرێ و گركەلەك و دۆلا كەونە گوندی و ئەخەلا سمایل و ئەخەلا بنئەرد و جماتا كەونە گوندی)، وەك گوندی دبێژن مەزارێ صەحابییەكی لێ هەیە و خەلكێ گوندی ل دووڤ باوەریا خۆ سەرەدانا وی دكەن، لێ خەلكێ گوندی چ زانیارێن روون و ئاشكرا ل سەر ڤی مەزاری و ناڤێ وی نەبوون[٨٨].

## گوندێ بانورە

سەبارەت ناڤێ گوندی گەلەك پرسیار ژ خەلكێ گوندی هاتنەكرن بەلێ كەسێ ب دروستی واتایا ناڤی نەدزانی، تنێ دگۆتن یێ ژ (بای) هاتی ئانكو (با + نور) دبیتە بانورە یان بانیرێ.

### سنوور و جوگرافیا گوندی:

سرۆشتێ جوگرافیا گوندی ژ دەشت و بانیێن پان و بەرین پێكدهێت، بۆ چاندنێ گەلەك ب مفانە، گوند ب دووراتییا ٣٥كم دكەڤیتە رۆژئاڤایێ ناحیا گردەسێن و ٣٠كم ژ مەلبەندێ قەزا ئاكرێ دوورە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** هەڤسنوورە دگەل باژێروكێ قەسروكێ

**باشووری:** گوندێ مام داویدا ژووری

**رۆژهەلات:** گوندێ لەكانە

**رۆژئاڤای:** گوندێ باژێرە ژێرە

### پێكهاتا گوندی:

د ناڤا گوندیدا پێنج مالبات هەنە: مالباتا (سالم عەبدۆللا محمود) ژ تیرەیا مام براهیما نە، مالباتا

گوندێ بانورە



(یوسف ئاغا) ژ تیرەیا پسەغایا نە، مالباتێن (جادر و رەمەزان و نادر) ژ تیرەیا ئاقیبانە و سەر ب عەشیرەتا هەرکی نە، خەلکێ گوندی ٧٠ - ٨٠ مالن.

ل دووڤ گۆتنا موختارێ گوندی دبێژیت: ئاڤاکرنا گوندی ڤەدگەریتەڤە سەردەمێ دەولەتا ئوسمانی، سالا ١٩٢٠ێ ژی ئەڤ گوندە هەر هەبوویە لێ خانیێن وێ کوخ بوون پاشتر خەلکەك لێ ئاکنجیبوویە و خانی لێ ئاڤاکرینە، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ گوندی ٧٠ کەس بوو[٨٩].

## ژێدەرێ ئاڤا گوندی:

گوند ىێ دەولەمەندە ب هەبوونا کانیێن ئاڤێ، هەروەسا رووبارێ (خازر)ی دناڤا گوندی را دبووریت، ژێدەرەکێ سەرەکیێ ئاڤا ڤەخوارنا گوندی ژ ڤی رووباری یە و پرۆژەیێ ئاڤا ڤەخوارنێ بۆ گوندی هاتییە کێشان.

## ژێدەرێ ژیارا گوندی:

ژبەر هەبوونا کانیا و هەبوونا رووبارێ خازر پتریا خەلکێ گوندی مژوولی کارێ چاندنێ نە، گەلەك رەز و باغێن فێقی ل گوندی هەنە، بەرهەمێن: خۆخ و هژیر و هنار و هرمێیا هەنە دگەل چاندنا بیستانێن باجانکا و تەماتا و فلفلا و باميا هندەك ژی خودانکرنا پەزی دکەن و هندەك ژی پێشمەرگەنە.

دناڤا گوندی دا گەلەك جهێن بەرچاڤ و ناڤدار هەنە وەکی (کانیا محەمەد خیتو و دارا شەهیدا و گرێ شێرە سیاری).

سالا ١٩٨٠ گوندی خواندنگەهـ هەبوویە، لێ دناڤا خانیەکێ ئاخێدا بوو، سالا ٢٠٠٢ێ ئاڤاهیێ خواندنگەهێ بۆ هاتییەئاڤاکرن[٩٠].

# گوندێ شکەفتا مغارا

ناڤێ گوندی ژ دو برگەیا (شکەفت + مغارا) پێکدهێت، ژ ناڤێ شکەفتەکێ هاتیبە کو دکەڤیتە سنوورێن ڤی گوندی، لێ خەلکێ گوندی چ پێزانین ل سەر پەیڤا (مغارا) نەبوون، وێ ژی ژێبرنەکەین پەیڤا (مغارە) د زمانێ عەرەبیدا ب رامانا شکەفت دهێت، ئانکو هەردو پەیڤ (شکەفتا مغارا) ئێك رامان ئەوژی شکەفتە ددەن، گوند ١٤کم ژ رۆژئاڤایێ گردەسێن و ٣کم ژ مەلبەندێ قەزا ئاکرێ دوورە.

## سنوورێن گوندی:

**باشووری:** گوندێ زەرگێزا یە.

**باکووری:** گوندێ خرابە ژوور دهێت.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ ئومەر خوشانە.

**رۆژئاڤا:** گوندێ شیوەکەر دهێت.

## پێکهاتا گوندی:

گوندی هەمی ژ مالباتا (مالە شەمزینێ) و ژ تیرەیا (مالەپیرێ) و سەر ب عەشیرەتا هەرکی نە، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ تنێ ١٥کەس ل گوندی دژیان[٩١]، بەلێ نها هەموو خەلکێ وی ٤٠- ٥٠ مالن، ئاڤاکرنا گوندی ڤەدگەریتەڤە بۆ سالا ١٩٤٥.

سالا ٢٠١٠ خواندنگەهـ بۆ هاتییە ئاڤاکرن و هەتا پۆلا شەشێ بنەرەتی لێ دهێتە خواندن.

ژیارا گوندییان ل سەر خودانکرنا مەر و مالاتی و چاندنێ یە و بەشەك ژوانا ژی پێشمەرگەنە، پرۆژەیێ ئاڤا ڤەخوارنێ بۆ گوندی هاتییە کێشان، و ل ٢٠٠٦/٧/٢٠ پرۆژەیێ کارەبێ بوو هاتی یە کێشان[٩٢].

# گوندێ شێخانوك مەلا حاجی

واتایا ناڤێ گوندی یا ژ ناڤێ شێخا هاتی کو دبەرێ دا مالا شێخەکی ل ڤی گوندی هەبوویە و هەروسا (مەلا حاجی) ژی کەسایەتیەکی مەزن و خودانێ ڤی گوندی بوویە پشتی وان شێخا ئەڤ جهە بجە هێلای، ژبەرهندێ دبێژنێ (شێخانوکا مەلا حاجی)، ب دووراتیا ٧کم دکەڤیتە رۆژئاڤایێ گردەسێن و ٢٠کم ژ مەلبەندێ قەزا ئاکرێ دوورە.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ کێلەبی

**باشووری:** گوندێ شێخانوك مەلا حاجی نوێ

**رۆژهەلاتی:** گردەسێنە

**رۆژئاڤایی:** گوندێ جەریدوکە

## پێکهاتا گوندی:

د ناڤا گوندی دا چوار مالبات هەنە ئەوژی مالباتا

(عارف محەمەد و صەدیق کەریم و مەحموود مستەفا و مەجید مستەفا) ژ تیرەیا (کانیە سپی) و سەر ب عەشیرەتا هەرکی نە، بەری سالا ١٩٧٠ێ خەلکێ گوندی ٢٠ - ٢٥ مال بوون، لێ نها گوند ب رێژەیەکا بەرچاڤ مەزن بوویە و د ناڤبەرا ١٢٠ - ١٣٠ مالانە، ئاڤاکرنا گوندی ڤەدگەریتەڤە سالا ١٩٤٠ێ، د سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ ئاماژە ب گوندەکی هاتیەکرن ب ناڤێ شێخانوك هژمارا خەلکێ وی ١٥٠ کەس بوو و سەر ب ناحیا حەفت عەشیرەتان (بەردەرەش) بوو[٩٣].

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیارا پتریا خەلکێ گوندی ل سەر خودانکرنا مەر و مالاتی و کشتوکالییە، بەشەك ژ وانا ژی پێشمەرگە و فەرمانبەرن، گوندی دو بیرێن ئیرتیوازی هەنە ئاڤا ڤەخوارنا گوندی دابین دکەن.

سالا ٢٠٠٩ ئاڤاهیەکێ نوو بۆ خواندنگەها گوندی هاتیەئاڤاکرن، کو بەرێدا د ئاڤاهییەکێ کەڤندا بوو ئەو ژی ژ ئالیێ خەلکێ گوندی ڤە هاتبوو ئاڤاکرن.

( دۆلا مەمەد و دۆلا ئەخەل و دۆلا ئادوی) ژ جهێن بەرچاڤ و دیارێن گوندی نە.[٩٤].

## گوندێ شێخانوکا نوی:

ل دەسپێکێ خەلکێ ڤی گوندی دگەل خەلکێ شێخانوکا مەلا حاجی پێکڤە دژیان، سالا ٢٠٠٠ێ خۆ ژ گوندی جوداکرن و گوندەکێ نوو ب ناڤێ شێخانوکا نوی ئاڤاکرن، گوند ب دووراتییا ٦کم دکەڤیتە رۆژئاڤایێ گردەسێن و ١٢کم ژ مەلبەندێ قەزا ئاکرێ دوورە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ گوندێ شێخانوك مەلا حاجی یە.

**باشووری،** گوندێ کێلەسپی یە.

**رۆژهەلات،** گوندێ مام خەلیفە دهێت.

**رۆژئاڤای،** گوندێ ئومەر سێنا یە.

### پێکهاتا گوندی:

گوندی ژ مالباتا (حەجی حسێن) و تیرەیا کانیە سپی و سەر ب عەشیرەتا هەرکی نە، سالا ٢٠٠١ێ رێکخراوا هابیتات ٢١ خانی بۆ گوندی ئاڤاکرن، خەلکێ وی هەتا ٣٠ مالانە، سالا ٢٠٠١ خواندنگەهـ بۆ هاتیە ئاڤاکرن و هەتا شەشێ بنەرەتی لێ دهێتە خواندن.

خەلکێ گوندی کارێ وان یێ سەرەکی خودانکرنا مەر و مالاتی و چاندنە، هندەك ژی پێشمەرگە و فەرمانبەرن، و پرۆژەیێ ئاڤا ڤەخوارنێ ل گوندی هەیە کو بیرەکا ئیرتیوازیە سالا ٢٠٠١ێ هاتییەکۆلان، د هەمان سالێدا جادە گەهشتییە گوندی[٩٥].

## گوندێ جەلیدە

موختارێ گوندی دبێژیت: پەیڤا (جەلید) پەیڤەك عەرەبی یە ب واتایا (جەمەد) دهێت ئانکو ئاڤەکا بەستی، لێ ئەڤ بۆچوونە نە هندا بەرعەقلە و پێدڤی پتر ل دووڤ چوونێ یە، ٣٥کم ژ رۆژئاڤایێ گردەسێن و ٤٠کم ژ مەلبەندێ قەزا ئاکرێ دوورە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ خەلیلکان.

**باشووری،** گوندێ کلێنە

**رۆژهەلاتی،** گوندێ ئومەر سێنا

**رۆژئاڤایی،** کۆمەاگەها خەلیلکان

### پێکهاتا گوندی:

ئێك مالبات د ناڤا گوندیدا هەیە ئەوژی (مالەحسێن)ە ژ تیرەیا (ئاودیا) و سەر ب عەشیرەتا هەرکی یە، و هەروەسا ژمارا خەلکێ گوندی ٦٠ مالن و ئاڤاکرنا گوندی ڤەدگەریت بۆ سالا ١٩٥٠،

و ل سالا ١٩٩١ خواندنگەهـ بۆ هاتییە ئاڤاکرن. د سەرژمێریا سالا ١٩٥٧یدا ل ناحیا بەردەرەش ئاماژە ب گوندێ (جریدە) هاتییەکرن هژمارا خەلکێ وی ٢٦ کەس بوو[٩٦].

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیارا خەلکێ گوندی ل سەر خودانکرنا پەزی و جۆتیاریێ یە، هندەك ژی پێشمەرگەنە، ژێدەری ئاڤا گوندی سەر سێ بیرێن ئیرتیوازییە [٩٧].

## گوندێ مام داویدا ژێری

ناڤێ گوندی (مامداویدا) بۆ ناڤێ زیارەتەکی ڤەدگەریتەڤە کو دکەڤیتە د ناڤاگوندی و قەبرێ کەسەکییە دبێژنێ (مام داود)، د ناڤا زاراڤێ هەرکییاندا گەلەك ناڤ دهێنە گوهارتن، ناڤێ (داود) ژی ب تێپەربوونا دەمی گوهارتییە و کرییە (داویدا)، خەلکێ گوندی دبێژن ئەڤە مەزارێ کەسەکێ پیرۆزە، گوند ب دووراتییا ٢٠کم دکەڤیتە رۆژئاڤایێ گردەسێن، ١٥کم ژ مەلبەندێ قەزا ئاکرێ.

گوندێ (مام داودە) یەك ژ وان گوندان بوو یێن دەسپێکا سەدساڵیا بیستێ بەردای و ڤالا و پاشتر ل سەر مولکێن سولتانێ ئوسمانی عەبدولحەمیدێ دووێ هاتینەتوومارکرن، رووبەرێ گوندی وی دەمی ٢٠٠٠ دۆنەمێن عەردی بوو[٩٨].

## سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلات،** گوندێ بەدریکێ.

**رۆژئاڤای،** گوندێ مام داویدا ژووری.

**باشووری،** گوندێ گۆرانك مەزن.

**باکووری،** گوندێ لەکان.

**گوندێ مام داویدا ژێری**



### پێکهاتا گوندی:

گوندی ئێك مالبات لێ هەیە ئـەوژی (توخمێ غەزالێ) یە ژ تیرەیا (پسەغا) سەر ب عەشیرەتا هەرکی یە، سالا ١٩٤٠ گوند هاتییە ئاڤاکرن ٢٠ - ٣٠ مال لێ هەنە.

ل سالا ٢٠٠٢ێ ژ نوو خواندنگەهـ ل گوندی هاتییەڤەکرن.

ژیارا خەلکێ گوندی هەر وەکی زۆربەیا گوندێن دیتر ل سەر خودانکرنا مەر و مالاتی و جۆتیاریا دێمە و هندەك ژوانا ژی پێشمەرگە و فەرمانبەن، بیرەکا ئیرتیوازی ل گوندی هەیە و ئاڤا وێ دابەشی سەر مالان کری یە[٩٩].

## گوندێ مام داویدا ژووری:

سالا ١٩٦٠ێ فازل بابێ موختارێ نهایێ گوندی گوندێ مام داویدا ژووری ئاڤاکرییە و کرییە گوندەکێ جودا دگەل مام داویدا ژێری، ب دووراتییا ٤٠کم دکەڤیتە رۆژئاڤایێ گردەسێن، و ٢٥کم ژ مەلبەندێ قەزا ئاکرێ دوورە.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێ مام داویدا ژێری یە.

**رۆژئاڤای:** گوندێ بانیرێ یە.

**باشووری:** گوندێ لەکانە.

**باکووری:** رۆژئاڤایی، گوندێ بانیرێ یە.

### پێکهاتا گوندی:

گوندی ئێك مالبات لێ هەیە ئەوژی (توخمێ غەزالێ) یە ژ تیرەیا (پسەغا) عەشیرەتا هەرکی یە، خەلکێ گوندی تنێ سێ مالن، ئەگەرێ نە بەرفرەهبوونا گوندی دزڤریت بۆ وێ چەندێ کو خەلك ژ گوندی بۆ جهێن دیتر کوچدکەن.

ژیارا وان هەر سەر جۆتیارێ و پێشمەرگاتییێ یە، ل ١٩٩٩/٦/٦ پرۆژەیێ ئاڤا ڤەخوارنێ بوو هاتییە کێشان[١٠٠].

## گوندێ ئێکمالەیا کەڤن:

سەبارەت ناڤێ گوندی موختارێ گوندی دبێژیت: ل دەسپێکا ئەڤ گوندە هاتییە ئاڤاکرن تنێ ئێك مال بوو لەورا ب گوندێ (ئێك مالە) هاتەناڤکرن، هەژییە بێژین گەلەك گوند ل کوردستانێ ب ڤی ناڤی هەنە و هەر هەمووژی ب ڤی رەنگی ئاڤابوونە، گوند ب دووراتییا ٢٠کم دکەڤیتە باشوورێ رۆژئاڤاییێ گردەسێن و ٣٥کم ژ مەلبەندێ قەزا ئاکرێ دوورە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ ئێمالەیا نوی

**باشووری:** گوندێ عەلی شانە

**رۆژهەلاتی:** گوندێ کێلە سپی

**رۆژئاڤایی:** گوندێ ئومەر سێنا

### پێکهاتا گوندی:

تنێ ئێك مالبات ل گوندی هەیە ئەوژی مالباتا (عەبدولعەزیز)ە سەر ب عەشیرەتا گۆران ڤەیە، و ژمارا خەلکێ گوندی نێزیکی ٤٠ مالانە و ئاڤاکرنا گوندی ڤەدگەریت بۆ سالێن پێنجیيان و هەروسا ل سالا ٢٠٠٩ خواندنگەهـ بوو گوندی هاتییە ئاڤاکرن و هەتا پۆلا شەشێ ئامادەیی لێ دهێتە خواندن و گوندێن دەوروبەر ژی ژبۆ مەرەما خواندنێ قەستا ڤێ قوتابخانێ دکەن.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

خەلکێ گوندی تا رادەیەکێ زوور پێشمەرگە و فەرمانبەرن و دگەل رێژەیەکا کێم ژ کارێ جۆتیارێ، ژێدەرێ ئاڤا گوندی ل سەر بیرەکا ئیرتیوازی یە[١٠١].

## گوندێ ئێکمالەیا نوی:

ل دەسپێکێ خەلکێ گوندی ل گوندێ ئێکمالەیا کەڤن دژیان، لێ پشتی گوندێ خۆ فروشتییە گۆرانان ژ ئەگەرێ چێبوونا کێشەیەکا کۆمەلایەتی سالا ٢٠١٣ خەلکێ وی ل جهەکێ دی گوند بۆ خۆ ئاڤاکر،

ناڤێ گوندێ خۆ كره ئێكمالەیا نوی، كو ١كم ژ گوندێ ئێكمالەیا كەڤن دووره، گوند ب دووراتییا ٢١كم دكەڤیتە باشوورێ رۆژئاڤاییێ گردەسێن و ٣٦كم ژ مەلبەندێ قەزا ئاكرێ دووره.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێ ئومەر سێنا

**باشووری:** گوندێ ئێك مالەیا كەڤنە

**رۆژهەلاتی:** گوندێ كێلە سپی

**رۆژئاڤایی:** گوندێ ئومەر سێنا

**زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:**

خەلكێ گوندی بشێوەیەكێ گشتی پێشمەرگە و فەرمانبەرن و كارێ جۆتیارییا دێمی ژی دكەن، پرۆژەیێ ئاڤا ڤەخوارنێ هەیە، سالا ٢٠١٥ خواندنگەهـ هەر ژ ئالیێ خەلكێ گوندی ڤە هاتییە ئاڤاكرن[١٠٢].

## گوندێ سەركەڤروك:

گوندی خەلكێ گوندی ڤەدگێرا و دگوت: گوند ژ رەخەكێڤە دكەڤیتە سەر كەڤرەكی ل هنداڤا گومەكا ئاڤێ ژبەر وێ یەكێ ب سەركەڤروك هاتییەناڤكرن، گوند ب دووراتییا ٦٥كم دكەڤیتە رۆژهەلاتێ گردەسێن و ٣٠كم ژ مەلبەندێ قەزا ئاكرێ دووره.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** رووبارێ گەوره دهێت

**باشووری:** گوندێ جولێره

**رۆژهەلاتی:** گوندی رووبارێ گەوره

**رۆژئاڤایی:** گوندێ سوركان یە

**پێكهاتا گوندی:**

دناڤا گوندی دا ئێك مالبات هەیە ئەوژی (مام كەكور)ە، سەر ب عەشیرەتا سۆرچی یە، خەلكێ گوندی نێزیكی ١٠٠ مالانە و گوندەكێ كەڤنە.

سەبارەت مێژوویا هەبوونا گوندی ل دووڤ گۆتنا موختارێ گوندی كو ڤەدگێریت دبێژیت: مێژوویا گوندی ڤەدگەریتەڤە بۆ سەردەمێ پاشایێ گەوره (میرێ رەواندزێ) كو دكەتە نیڤا ئێكێ ژ سەدساليیا نوزدێ، بەلگە ژی ل سەر ڤێ چەندێ كو باپیرێ شەشێ یێ موختارێ گوندی كو ناڤێ وی (چەلەبی ئاغایە) دگەل پاشایێ گەوره دەستەلاتداری ل ڤێ دەڤەرێ كرییە.

**شوینوار و جهێن كەڤنار:**

تا نها ژی گرەكێ بلند دناڤا گوندی دا هەیە شوینوارێ كەلایەكێ ل سەر ڤی گری هەیە كو مێژوویا ڤی ڤەدگەریت بۆ سەردەمێ دەستەلاتداریا (پاشایێ گەوره)، و سێ ئاشێن ئاڤێ یێن كەڤنار ل گوندی هەنە.

**زێدەرێن ئاڤا گوندی:**

گوند ب هەبوونا گەلەك ژێدەرێن ئاڤا كانییا دەولەمەندە، گرنگترینێن وان: كانییا سوفی محەمەد و كانییا گەلوك، و رووبارێ زێیێ گەوره (زێیێ بەهدینان) ئالیێ رۆژهەلات و باكوورێ گوندی ڤەدگریت و پرۆژەیێ ئاڤا ڤەخوارنا گوندی ل ١٩٩٩/٢/١٣ێ هاتییە چێكرن و ئاڤ ب سەر مالان دا دابەشكری یە.

**زێدەرێن ژیارا گوندییان:**

خەلكێ گوندی ب شێوەیەكی گشتی سێ كارێن سەرەكی بۆ دابینكرنا بژێوییا ژیانا خۆ دكەن ئەوژی (كشتوكال و مەرەمالات و پێشمەرگە)، بیستانێن ئاڤی ژی دكەن وەكی چاندنا (شفتی و باجانكا و تەماتا و فلفلان ....هتد).

سالا ١٩٧٦یڤە خواندنگەهـ ل گوندی هەیە، سالا ٢٠٠١ێ خواندنگەهەكا بەرفرەهتر بۆ گوندی هاتە ئاڤاكرن و هەتا پۆلا نەهێ بنەرەتی لێ دهێتە خواندن[١٠٣].

## گوندێ سمیلان:

ئەڤ گوند ب دووراتییا ١٩كم دكەڤیتە رۆژهەلاتێ باشوورێ گردەسێن و ٤كم ژ مەلبەندێ قەزا ئاكرێ دووره، چ زانیاری ل سەر ناڤێ سمیلان دەست

مەنەکەتن.

ئەڤ گوندە ژی ژ وان گوندان بوو یێن دەسپێکا سەدسالیا بیستێ بەردای و ڤالا و پاشتر ل سەر مولکێن سولتانێ ئوسمانی عەبدولحەمیدێ دووێ هاتینەتوومارکرن، رووبەرێ گوندی وی دەمی ٢٥٩٥ دۆنەمێن عەردی بوو[١٠٤].

## سنوورێن گوندی:

**باکووری،** قەزا ئاکرێ.

**باشووری،** گوندێ شیڤ رەزا.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ نهاوا.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ ئومەر خوشا.

## پێکهاتا گوندی:

ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ د وێ سالێدا هژمارا خەلکێ سمیلان ٧٠ کەس بوو[١٠٥]، نها گوند ژ سێ مالباتان پێکدهێت ئەوژی (مام سال و مام ساك و مامە نومەر)، سەر ب عەشیرەتا سۆرچی نە، خەلکێ گوندی نێزیکی ٨٥ مالانە، دووڤ گۆتنا موختارێ گوندی ئاڤاکرنا گوندی ڤەدگەرێت بۆ سەدسالیا حەڤدێ زایینی، هەروەسا دبێژیت تا نهاژی هندەك شوینوارێن گوندێ یێن کەڤن هەرمایینە، ب ڤێ چەندێ ئەڤ گوندە دبیتە ئێك ژ کەڤنترین گوندێن سۆرچی یان سەر ب ناحیا گردەسێن ڤە.

## جهێن بەرچاڤ و کەڤنارێن گوندی:

وەك: سەر گوم و کانیا بن چنارێ و کانی سرك لێ نها ئەڤان کانیا ئاڤ تێ نەمایە و ل گوندی گۆرستانەکا کەڤنار لێ هەیە و دبێژنێ گۆرستانا کەڤنا گوندی.

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

خەلکێ گوندی ب شێوەیەکێ گشتی کارێ وان پێشمەرگایەتییە، ژمارەکا کێم ژ خەلکێ گوندی کارێ جۆتیاریێ و مەر و مالاتی خودان دکەن.

ژ سالا ١٩٧٩ێڤە خواندنگەهـ ل گوندی هەیە و هەتا نەهێ ناڤنجی لێ دهێتە خواندن[١٠٦].

## گوندێ مام خەلیفە:

دناڤا گوندیدا ئەخەلەك ئانکو ( پەرجانەك- پەرژینەك)کێ کەڤنار هەیە گۆرێ کەسەکی یێ دناڤا وی پەرجانکیدا دبێژنێ (گۆرێ مام خەلیفە)، گوند ژی هەر ب وی ناڤی هاتییەناڤکرن، گوند ١٠کم ژ باشووری گردەسێن و ٢٤کم ژ مەلبەندێ قەزا ئاکرێ دوورە.

ئەڤ گوندە ژی ژ وان گوندان بوو یێن دەسپێکا سەدسالیا بیستێ بەردای و ڤالا و پاشتر ل سەر مولکێن سولتانێ ئوسمانی عەبدۆلحەمیدێ دووێ هاتینەتوومارکرن، رووبەرێ وی ب ٢٠٠٠ دۆنەم هاتییەتوومارکرن[١٠٧].

## سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ مەلکێ حەسەن ئاغایە

**باشووری،** گوندێ کێلەسپی

**رۆژهەلاتی،** گوندێ مەلکێ حاجی

**رۆژئاڤایی،** گوندێ شێخانوك مەلا حاجی

## پێکهاتا خەلکێ گوندی:

گوند دو مالباتان (مالا عوزێرێ و مالا گورگان) بخۆڤە دگریت، سەر ب عەشیرەتا کاوانی نە، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ خەلکێ گوندی ٩٩ کەس بوو[١٠٨]، گوند سالا ١٩٧٠ێ ١٥ - ٢٠ مال بوو، نها گەهشتییە نێزیکی ١١٠ مالان.

گوند سالا ١٩٢٨ێ هاتییە ئاڤاکرن، سالا ١٩٧٥ خەلکێ گوندی بەر ب سنوورێن ئیرانێ مشەختبوون، سالا ١٩٩١ جارەك دی ڤەگەریانە گوندێ خۆ.

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیانا خەلکێ گوندی هەر وەکی پتریا گوندێن دیتر ل سەر خودانکرنا مەر و مالاتی و جۆتیاریێ و پێشمەرگاتیێ یە.

گوندی دو بیرێن ئیرتیوازی هەنە ئێك سالا ١٩٦٦ێ هاتییە لێدان یا دی سالا ١٩٩٨ێ، ئاڤا ڤەخوارنا گوندی ل ڤان بیران دهێتە دابینکرن.

### جهێن بەرچاڤ و ناڤدار:

د ناڤا سنوورێن گوندیدا گەلەك جهێن بەرچاڤ و کەڤنار هەنە وەکی (کانی زەنگل و گوندێ گولێ و دۆلا گولێ و دۆلا تەیارێ و دۆلا بەرازا)، هەروەسا ل گوندی گورەکێ شوینواری هەیە لێ خەلکێ گوندی چ زانیاری ل سەر نەبوون تنێ دگۆتنێ (ئەخەلا مام خەلیفە)ی[109].

## گوندێ گوشینە خان ئاڤدەل

ئەڤ گوند ب دووراتییا ٢٢کم دکەڤیتە باکوورێ ناڤەندا ناحیا گردەسێن و ٤کم ژ سەنتەرێ قەزا ئاکرێ دوورە. ل دوور واتایا ناڤێ گوندی کەسایەتیێ گوندی مامۆستا خلیل قادر هوسا بەحسا ڤێ یەکێ کر و گوت: ل دەڤەرێ سێ گوند هەنە نێزیکی ئێکن ئەویش ( کوچینە مەلا فرزو و کوچینە حەسەن بەدوو و کوچینە خان ئاڤدەل ) وێ یەکێ گەلەك جاران سەهواتی ل دەڤ خەلکێ دەڤەرێ و ئیدارێن حکۆمەتێ چێدکر ژبەر وەکهەڤیا ناڤێن وان، ژبەر وێ یەکێ ناڤێ گوندێ کوچینە خان ئاڤدل سالا ١٩٨٠ێ گوهارتن بوو ناڤێ (گوشینە خان ئاڤدەل).

### سنورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ خرپێ

**باشووری،** گوندێ کوچینە حەسەن بەدو

**رۆژهەلاتی،** گوندێ کوچینە مەلا فەرزو

**رۆژئاڤاییی،** گوندێ رەزوکێ

### پێکهاتا گوندی:

گوندی دوو مالبات لێ هەنە ئەویش مالباتێن (ماله عەلێ و ماله حیرزێ )نە و ژ تیرەیا هەسنی یانە و سەر ب عەشیرەتا هەرکی یانە، و ژمارا خەلکێ وێ نێزیکی ٣٠ مالانە.

ئەڤ گوندە هەتا نێزیکی سالا ١٨٥٠ یان ژی هەر هەبوویە، گوندەکێ کەڤنارە بەلکە ل سەر ڤێ چەندێ وەکو خلیل قادر دایە زانین و ڤەدگێریت: کو ئەو بخۆ کەتییە گفتوگویەکێ دگەل حجی خدر خێلی کرییە کو ناڤبری ل ڤی گوندی ژ دایکبوویە و د تەمەنێ ٩٠ سالیێ دا وەغەرا داویێ کرییە و نها کورێ وی یێ ساخە و ژیێ وی پتری ٨٠ سالانە، لێ ئەڤ گوندە هاتییە چۆلکرن ژ ئەگەرەکێ نەدیار و پاشی ل سالێن بیستان دا سەر ژنوو ڤە یێ هاتییە ئاڤەدانکرن و هەروەسا بەلگەیەکا دیتر ل سەر کەڤناتییا گوندی ئەویش هەبوونا دو گۆرستانێن کەڤنار کو دکەڤنە سنورێن گوندی دا ئەویش گۆرستانا (کەنیشکێ و پیرا)[110]. ل دوور گۆتنا مختارێ گوندی ئەڤ گۆرستانە گەلەك پیرۆزن و بەرنیاسن ل نك خەلکێ گوندی و دەڤەرێ.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژێدەرێ ژیارا خەلکێ گوندی ل سەر خودانکرنا مەر و مالاتی و جۆتیاریێ یە و هەروسا بەشەکێ زۆر ژ گوندیان فەرمانبەرن.

ل سالا ٢٠٠٤ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییەڤەکرن، ئاڤاهیێ کەسەکی ژ گوندی هاتییە کرێکرتن بۆ مەرەما خواندنێ و هەتا پۆلا شەشێ بنەرەتی لێ دهێتە خاندن.

### جهێن شوینواری و کەڤنار:

جهێن بەرچاڤ و ناڤدار ل گوندی هەنە وەك: دۆلا تیێ، دۆلە گومکێ، کانیا کەونە گوندی، کەونە گوند، مشایێخێ پیرا و دۆلا بەقلیا، هەروەسا (کانیا بای) ژی ل سنوورێن گوندی هەیە و خەلکی قەستا کانیێ دکرن ب مەبەستا چارەسەریا نەخۆشییا (بای)[111].

## گوندێ سێلان مامك:

دهێتەگۆتن: واتایا پەیڤا (سێلان) ژ وێ یەکێ دهێت سێ رێکێن سەرەکی ژ (سێ + رەخا) ئانکو ( سێ + لایان)ڤە دهێنە گوندی ئەوژی رێکێن گوندێن (خێلافەت و شەرمن و باکرمان)ن، و واتایا پەیڤا (مامك) دهێت ژ وێ یەکێ کو ئەخەلەك (کوتانەك) ل گوندی هەیە دبێژنێ (ئەخەلا مامك) ئانکو پەیڤا مامك ژ ڤی ناڤی هاتی یە و دبێژنێ گوندێ (سێلان مامك)، گوند ب دووراتییا ٢٥کم دکەڤیتە باکوورێ گردەسێن، و ٢٠کم ژ رۆژئاڤاییێ مەلبەندێ قەزا ئاکرێ.

## سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ باكرمان

**باشووری:** گوندێ سێلان سالح

**رۆژهەلاتی:** گوندێ شەرمن

**رۆژئاڤایی:** گوندێ خێلافت

## پێكهاتا گوندی:

گوند سێ مالباتان مالباتێن: چاربوتی، بانی و متاخی بخۆ ڤە دگریت سەر ب عەشیرەتا زێباری نە، خەلكێ گوندی ١٨ مالن، ل دوور گۆتنا موختاری ئەڤ گوندە یێ (قاسمەغایێ هەرنی) بوویە و مێژوویا گوندی ڤەدگەرێت بۆ سالێن هزار و نەهـ سەدان (١٩٠٠)، د سەرژمێریا ١٩٥٧ێ ئاماژە ب گوندێ سیلان بێی پەیڤا (مامك) هاتییەكرن د وێ سالێدا ٨٣كەس لێ دژیان و سەر ب ناحیا سۆرچی (بجیلی) بوویە[١١٢].

## ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا گوندییان ل سەر خودانكرنا مەر و مالاتی و كارەشا و كشتوكالی یە هندەك ژوانا ژی پێشمەرگەنە. بیرەكا ئیرتیوازی ل گوندی هەیە ئاڤا گوندی دابیندكەت، سالا ٢٠٠٠ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ئاڤاكرن، تا پۆلا شەشێ بنەرەتی لێ دهێتە خواندن.

جهێن بەرچاڤ و ناڤدار ل گوندی وەكی (كانییا قادوی و كانییا گوندی و ئەخەلا مامك) هەنە[١١٣].

## گوندێ خەلیلكان كەڤن:

ناڤێ گوندێ (خەلیلكان) ژ ناڤێ ئاڤاكەرێ

گوندێ خەلیلكان كەڤن



گوندی هاتییە کو ناڤێ وی (خەلیل) بوویە، لێ ژبەرکو هژمارەکا ئاکنجیێن گوندی قەستا جهەک دی کرن و گوندەك ل ڤی جهی ئاڤاکرن هەر ب ناڤێ خەلیلکان، لەوما ناڤێ ڤی گوندی بوویە (خەلیلکان کەڤن)، گوند ب دووراتییا ٤٠کم دکەڤیتە باکوورێ رۆژئاڤایێ مەلبەندێ ناحیا گردەسێن و ٤٢کم ژ ئاکرێ دوورە.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** کۆمەاگەها خەلیلکانە

**باشووری:** گوندێ خرابە سەعدونە

**رۆژهەلات:** گوندێ جەریدوکە

**رۆژئاڤای:** بازێروکێ قەسروکێ

## پێکهاتا گوندی:

دناڤا گوندی دا سێ مالباتێن سەرەکی هەنە ئەوژی ژ گوندێن (بانی و چاربوتی و باکرمانی)نە و سەر ب عەشیرەتا زێباریا ڤەنە، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ گوندی ٥٧ کەس بوو[١١٤]، بەری سالا (١٩٧٠)ێ ١٠ - ١٢ مال بوون و لێ نوکە ئەڤ هژمارە بەر ب زێدەبونێ ڤە چوویە و گەهشتییە نێزیکی ٧٠ێ مالان.

ئەڤ گوندە ل سالێن پێنجییان هاتییە ئاڤاکرن، سالێن شێستان ژ لایێ حکۆمەتا عیراقێ ڤە هاتییە سۆتن و وێرانکرن، پشتی پێکهاتنا ١١ێ ئادارا ١٩٧٠ێ دوبارە خەلکێ وێ ڤەگەریایە و جارەك دی گوند ئاڤاکریبەڤە.

پشتی گوند جارەك دی هاتییە ئاڤاکرن سالا ١٩٨١ێ هێلا کارەبێ گەهشتییە گوندی، سالا ١٩٨٧ێ مزگەفت ل گوندی هاتییە ئاڤاکرن، سالا ٢٠٠٤ێ جادا گوندی هاتییەکێشان.

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

خەلکێ گوندی تا رادەیەکێ زۆر مووچەخورن، گەلەك پێشمەرگە و فەرمانبەرن، هژمارەکا کێم ژ خەلکی مەر و مالاتی خوداندکەن و چاندنێ دکەن.

سالا ١٩٧٨ێ خواندنگەهەکا بچویك بۆ گوندی هاتییە ئاڤاکرن، سالا ٢٠٠٩ێ خواندنگەهەکا ٦ پۆلی ل گوندی هاتییە ئاڤاکرن، هەتا شەشێ بنەرەتی لێ دهێتە خواندن. ل ١٢ کانوونا دووێ ١٩٩٩ێ پرۆژەیێ ئاڤا ڤەخوارنێ بۆ گوندی هاتییە چێکرن[١١٥].

## کۆمەلگەها خلیلکان:

خەلیلکان گوندەکێ بچووك بەلێ گوندەکێ کەڤنێ دەڤەرێ بوو، وەك ئاماژە پێ هاتییەکرن ل سالا ١٩٥٧ێ خەلکێ تنێ ٥٧ کەس بوون، ئەو ئاکنجیێن گوندێ خەلیلکان کەڤن بین، بەلێ ل سالا ٢٠٠٢ێ ١٩٥ خانی ژ ئالیێ حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ ڤە بۆ هاتنە ئاڤاکرن و جودا ژ گوندێ خەلیلکانا کەڤن ناڤێ وێ کرنە (کۆمەگەها خەلیلکان)، ژ دو تاخان (خەلیلکانا میران) و (خەلیلکانا زێبار) پێکدهێت، کۆمەگەهـ ب دووراتییا ٢٩کم دکەڤیتە باکوورێ رۆژئاڤایێ ناحیا گردەسێن و ٤٠کم ژ مەلبەندێ قەزا ئاکرێ دوورە.

## سنوورێن گوندی:

**باکووریی:** گوندێ گلگۆران

**باشووری:** گوندێ خەلیلکان کەڤن

**رۆژهەلاتی:** گوندێ جەریدوك

**رۆژئاڤایی:** بازەروکێ قەسروکێ

## پێکهاتا جڤاکی:

دناڤا کۆمەلگەهیدا دو عەشیرەت هەنە: عەشیرەتا (میران) دبنە دو مالبات (بەلکەلەیی و ئیسکا)، عەشیرەتا (زێباری) ئێك جوینن ئەوژی مالباتا (بانی)نە، هەردو عەشیرەتان ئێك موختار هەیە، خەلکێ کۆمەگەهێ نها بەر ب زێدەبوونێ چوویە نێزیکی ٣٠٠ مالان.

### زێدەرێن زیارا خەلکێ گوندی:

خەلکێ وی ب شێوەیکێ گشتی فەرمانبەر و پێشمەرگەنە، ژمارەکا کێم ژ خەلکێ وێ جوتیاریێ و خودانکرنا مەر و مالاتی دکەن.

### زێدەرێن ئاڤێ:

گوند یێ دەولەمەندە ب هەبوونا ئاڤا سەر ئەردی وەکی رووبارێ خازر کو ب رەخ کۆمەگەهێ را دبووریت و هەروەسا سێ بیرێن ئیرتیوازی ل گوندی هەنە ل ۱۹۹۹/۱/۱۲ بەری کۆمەاگەە بێتەئاڤاکرن هاتینە لێدان و ئاڤا ڤەخوارنا خەلکێ کۆمەگەهێ دابین دکەن.سالا ۲۰۰۳ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ئاڤاکرن، هەتا پۆلا شەشێ ئامادەیی لێ دهێتە خواندن و گەلەك گوندێن دەورووبەر ژی ب مەرەما خواندنێ قەستا ڤێ خواندنگەهێ دکەن[116].

## گوندێ زێراڤێ:

زێراڤێ ئانکو (زێر + ئاڤ) ناڤێ گوندی دهێت ژبەر ئاڤا گوندی یا زۆر و خەلکێ گوندی دبێژن ئەو ئاڤ بۆ گوندییان وەکی زێرییە ژبەرکو بۆ چاندنێ و مەر و مالاتی گەلەك مفای ژێ دبینن، لەوما ناڤ لێ کرییە (زێراڤ)، گوند ب دووراتییا ٤٥کم دکەڤیتە باشووری رۆژهەلاتێ گردەسێن و ٢٥کم ژ مەلبەندێ قەزا ئاکرێ دوورە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ خەلان مام سیدان

**باشووری:** گوندێ جولێرە

**رۆژهەلات:** رووبارێ گەورە یە

**رۆژئاڤای:** گوندێ سپیمالە.

### پێکهاتا گوندی:

سێ مالبات دناڤاگوندیدا هەنە ئەوژی مالباتێن: مالە شێخ و سەدرەدین و مورشید و ژ عەشیرەتا سۆرچی نە، خەلکێ گوندی ٤٠ - ٥٠ مالن.

سەبارەت هەبوونا گوندی موختارێ گوندی دبێژیت: ل نیڤا سەدسالییا نوزدێ ژی ئەڤ گوندە هەر هەبوویە لێ خانیێن وێ کوخ بین و ب مەرەما خودانکرنا پەزی هاتبوون ئاڤاکرن، د ناڤبەرا سالێن ۱۸۸۰ - ۱۹۰۰یدا وەکو گوندەکێ دروست هاتییەئاڤاکرن و خەلك لێ ئاکنجی بووینە، هەژییە ل ڤێرێ بێژین سالا ۱۹۵۷ێ ئەڤ گوندە ب چاڤ گوندێن دەڤەرێڤە گوندەك مەزن بوویە و دووڤ سەرژمێرییا وێ سالێ ۲۲۷ کەس ل گوندی دژیان[117].

### زێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل ڤی گوندی هژمارەکا کانیێن ئاڤێ هەنە، گرنگترینێن وان: کانییا مخەلوکا و کانییا سور و کانییا خەلانێ و رووبارێ گبێل ژی دناڤا گوندی را دبۆریت و سنوورێن گوندی دکەڤنە سەر رووبارێ زێی گەورە (زێی) ژ ئالیێ رۆژهەلاتیڤە. ل ۱۹۹۸/٦/۱٦ێ پرۆژەیێ ئاڤێ بۆ گوندی هاتییە چێکرن.

### زێدەرێن زیارا گوندی:

ژیارا خەلکێ گوندی پترییا وان ل سەر جۆتیارییا ئەردێ ئاڤییە وەك بیستانێن: تەماتا و باجانکا و فلفلا و شفتی و گندورێ ئاڤێ، هەروەسا گوند یێ ب ناڤ و دەنگە ب چاندنا برنجی و برنجێ زێراڤێ ل سەر ئاستێ قەزا ئاکرێ ب پلا ئێکێ دهێت، گەلەك مەرۆمالات ژی ل گوندی هەیە.

سالا ۱۹٥۰ێ خواندنگەهـ ل گوندی هەبوویە لێ دخانیەکی ئاخێ دابوو، سالا ۱۹۹۹ێ خواندنگەهەکا ۱۲ پۆلی بۆ گوندی هاتییەئاڤاکرن و هەتا پۆلا ۱۲ ئامادەیی لێ دهێتە خواندن و گەلەك قوتابی ژ گوندێن دەورووبەر ژی قەستا ڤێ خواندنگەهێ دکەن و سالا ۱۹۸۳ێ کارەب بوو گوندی هاتییە کێشان [118].

## گوندێ گەشکا زێری

گوند سالا ۱۹٦۰ێ ژ ئالیێ خەلکێ گوندی بخۆ هاتییە ئاڤاکرن، خەلکێ وی ١٥ مالن و١٧ سەرۆك خێزانا پێکدهێت، سالا ۲۰۱٦ێ مزگەفت لێ هاتییە

ئاڤاكرن. جهێن بەرچاڤ و ناڤدار ل گوندی هەنە وەك: كانی گەرمك و بیرگول و گرد گاران و سێ گردكان.

### پێكهاتا گوندی:

گوند دو مالباتا بخۆڤە دگریت، ئەوژی مالباتێن (مام سال و توخمە بالین)نە، سەر ب عەشیرەتا سۆرچی نە.

سالا ٢٠٠٠ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییەڤەكرن و هەتا پۆلا شەشێ بنەرەتی لێ دهێتە خواندن.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا خەلكێ گوندی ل سەر چاندنێ و مەر و مالاتی یە، بەشەك ژی پێشمەرگەنە، سالا ٢٠٠٢ێ كارەب گەهشتییە گوندی و ژێدەرێ ئاڤا ڤەخوارنا گوندی ژ بیرێن ئیرتیوازی نە[119].

## گوندێ جولێرە:

جولێرە ژ دو برگان پێكدهێت ( جو + لێرە)، پەیڤا (جو) ب واتایا (جوهی) دهێت و پەیڤا (لێرە) ئانكو (ڤێرە)، ل دووڤ گۆتنا موختاری ناڤێ گوندی دهێت ب واتایا (جوهی یێن ڤێرە) ئانكو ئەڤ چەندە ژی دزڤریت بۆ وی سەردەمی دەمێ جوهی ل دەڤەرا ئاكرێ ئاكنجی بووین و ناڤێ گوندی ب وان هاتییە ناڤكرن، گوند ب دووراتییا ٦٠كم دكەڤیتە رۆژهەلاتێ گردەسێن، و ٣٥ كم ژ مەلبەندێ قەزا ئاكرێ دوورە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ زێراڤێ

**باشووری:** گوندێ گەرێ

**رۆژهەلاتی:** رووبارێ زێی گەورە

**رۆژئاڤایی:** گوندێ سپیمال

### پێكهاتا گوندی:

گوندی دو مالبات مالباتێن (مام سال و سەكویی) لێ هەنە، سەر ب عەشیرەتا سۆرچی نە، خەلكێ گوندی ٣٥ مالن و ژ ٤٢ سەرۆك خێزانان پێكدهێن.

ل دووڤ گۆتنا موختارێ گوندی دبێژیت: ئەڤ گوندە گوندەكێ كەڤنارە و مێژوویا وی ڤەدگەریتەڤە بو ناڤبەرا سالێن ١٨٥٠-١٨٨٠ێ، باپیرێ موختاری یێ سیێ ل ڤی گوندی ژ دایك بوویە. ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلكێ گوندی تنێ ٤٨ كەس بوو[120].

### ژێدەرێن ژیارا خەلكی گوندی:

ژیانا خەلكێ گوندی ل سەر خودانكرنا مەر و مالاتی و چاندنا دێمی و ئاڤی یە، سالا ٢٠١٣ێ مزگەفت بوو گوندی هاتییە ئاڤاكرن، سالا ١٩٨٦ێ پرۆژەیێ كارەبێ بوو گوندی هاتییە كێشان، سالا ٢٠٠٣ێ بیرەكا ئیرتوازی ل گوندی هاتییە كۆلان.

جهێن بەرچاڤ و ناڤدار ل گوندی ئەڤ جهە هەنە: كانی روستەم و كانی بهاری و ئەخەلا ئەصحابەی، ژ بۆ ڤێ ئەخەلێ خەلكێ گوندی وەسان باوەردكەن كو ئەڤە گورێ صەحابەكییە لێ چ زانیارێن جهێ باوەرێ ل سەر ڤی گوری نەبوون.

سالا ١٩٩٦ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ئاڤاكرن و هەتا پۆلا شەشێ بنەرەتی دهێتە خواندن[121].

### گوندێ كوركان مزگەفت

ل دوور واتایا ناڤێ گوندی خەلكێ گوندی هوسا دا زانین كو د بەرێدا ئەڤ جهە یێ شێخا و خواندنگەهەكا (مەدرەسەكا) دینێ ئیسلامێ لێ هەبوو، ژ ڤێرێ زانایێن ئایینی بۆ ئاكرێ و دەوروبەر دهاتنە هنارتن، ژ كەڤندا مزگەفت ژی هەر ل ڤی گوندی هەبوو یە ژبەر وێ یەكێ دگۆتنێ (كوركا مزگەفت)، ئەڤ گوندە ب ١٥كم ژ باشوورێ مەلبەندێ ناحیا گردەسێن و ٣٠كم ژ مەلبەندێ قەزا ئاكرێ دوورە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** كولەكا مەزن

**باشووری:** گوندێ دریێسان

**رۆژهەلات:** زنجیر چیایێن سەرتە

**رۆژئاڤای:** گوندێ زێلکە عەبدۆلعەزیزە

**پێکهاتا گوندی:**

گوندی ژ ئێك مالبات ئـەوژی (مـام سال) ە پێکهاتیبە، سەر ب عەشیرەتا سۆرچی ڤەنە، خەلکێ گوندی نێزیکی ٤٥ مالن، گوند سالا ١٩٥٣ێ ژ ئالیێ خەلکێ گوندی هاتیە ئاڤاکرن، لێ د بەرێدا شوینوارێ گوندەکێ کەڤن بوویە.

**ژێدەرێن ژیارا خەلکی:**

ژیارا خەلکێ گوندی ب شێوەیەکێ گشتی ل سەر خودانکرنا مەر و مالاتی و پێشمەرگاتیێ یە، سالا ٢٠٠٠ێ کارەب بۆ گوندی هاتیەکێشان، سالا ٢٠٠٢ێ بیرەکا ئیرتیوازی ل گوندی هاتیە کۆلان و ئاڤا وێ ل سەر گوندی دابەشدبیت.

جهێن بەرچاڤ و ناڤدار ل گوندی ئەڤ جهە هەنە (کانییا مزگەفت و گردە هول).

سالا ٢٠٠٢ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتیەڤەکرن و هەتا پۆلا شەشێ بنەرەتی لێ دهێتە خواندن[١٢٢].

**گوندێ کورکان بەست:**

خەلکێ گوندی دبێژن: ناڤێ گوندی ژ دو برگەیا پێکدهێت (کورك + بەست) و پەیڤا (کورك) چ واتایێن روون و ئاشکەرا ل سەر واتایا ڤێ پەیڤێ ل دەڤ خەلکی نەبوون تنێ دگۆتن پەیڤەکە ژ کەڤن وەرە هاتی گۆتن بوو هندەك گوندێن دەڤەرێ، و واتایا پەیڤا (بەست) دهێت بوو وان جهان کو دێشدا ئاڤ لێ بوو یە و پاشی هشك بوویە و دزاراڤێ سۆرچییاندا دبێژنێ (بەست)، ناڤێ گوندی بوویە کورکا بەست، گوند ١٠کم ژ رۆژهەلاتێ مەلبەندێ ناحیا گردەسێن و ٧کم ژ مەلبەندێ قەزا ئاکرێ دوورە.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ چەم سماق

**باشووری:** گوندێ سەردەریان

**رۆژهەلاتی:** گوندێ کورکان کێری

**رۆژئاڤایی:** گوندێ خاتوناوا

**پێکهاتا گوندی:**

گوند تنێ ژ ئێك مالبات مالباتا (مام سال)ێ پێکهاتیبە کو مەزنترین مالباتا عەشیرەتا سۆرچی یە، خەلکێ گوندی بەری سالا (١٩٧٠)ێ بتنێ ٥ مال بوو، نها هژمارا وان گەهشتیبە ٤٥ هەتا ٥٠ مالان، ئاڤاکرنا گوندی دزڤریتە سالا ١٩٥٠ێ.

ل سالا ٢٠٠١ خواندنگەهـ ل گوندی هاتیە ئاڤاکرن، سالا ١٩٩٨ێ کارەب بۆ گوندی هاتیە کێشان و سالا ٢٠٠٣ مزگەفت ل گوندی هاتیە ئاڤاکرن.

**ژێدەرێ ئاڤا گوندی:**

ل ڤی گوندی هژمارەکا کانی و رووباران هەنە وەکی (کانییا بەرۆژ و کانییا حمەغای و رووبارێ ماخوسێ) دناڤا گوندی را دبووریت، هەروەسا سالا ٢٠٠٣ پرۆژەیێ ئاڤا ڤەخوارنێ بۆ گوندی هاتی یە دانان و ئاڤ ب سەر مالاندا دابەشدبیت[١٢٣].

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

ژیانا خەلکێ گوندی ل سەر مەر و مالاتی و جۆتیاریا ئاڤی و دێمی یە وەکی (گەنم و جوو و شفتی و گوندورێ ئاڤی و تەماتا و باجانکا و فلفلا)، هندەك ژ وانا پێشمەرگەنە.

**گوندێ کێلە شێخ بزێن:**

ناڤێ گوندی ژ ناڤێ عەشیرەتەکێ هاتیە د بەرێدا ئاکنجیێن گوندی بوون ناڤێ وێ عەشیرەتا شێخ بزێنی بوو، هەروەسا (کێلە شێخ بزێن) ناڤێ کێلیا

گوڕی شێخێ عەشیرەتێ بوو یە، گوند ب دووراتییا ٢٠كم دكەڤیتە باشوورێ ڕۆژهەلاتێ گردەسێن و ٢٨كم ژ ئاكرێ دوورە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** ڕووبارێ زێی گەورە (زێ) و زنجیرا چیایێ سەرتە

**باشووری:** گوندێ كێلە پسمیران

**ڕۆژهەلات:** ڕووبارێ گەورە

**ڕۆژئاڤای:** زنجیرە چیایێ سەرتە

### پێكهاتا گوندی:

ل ڤی گوندی ئێك مالبات هەیە ئەوژی مالباتا (پیربال)ە و سەر ب عەشیرەتا سۆرچی یە، خەلكی وێ هەتا بەری سالا ١٩٧٥ێ ٣٠ - ٣٥ مال بوون، نها بەر ب زێدەبوونێ چوویە و گوند گەهشتییە نێزیكی ١١٥ مالان، ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلكێ گوندی تنێ ٤٧ كەس بوو[١٢٤].

ئاڤاكرنا گوندی ڤەدگەریت بۆ دناڤبەرا سالێن ١٨٦٠-١٨٨٠ێ كو باپیرە مەزنێ گوندیان ل ڤی گوندی ژ دایك بوویە، سالا ١٩٩٨ێ مزگەفت ل گوندی هاتییە ئاڤاكرن، سالا ١٩٨٥ێ هێزا كارەبێ بۆ گوندی هاتییە كێشان، ڕێكا گوندی سالا ٢٠٠٤ هاتییە قیركرن.

### زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژێدەرێ سەرەكییێ ژیارا خەلكێ گوندی ل سەر خودانكرنا مەر و مالاتی و پاشی جۆتیاریێ یە، هندەك ژی پێشمەرگەنە. ژێدەرێ ئاڤا ڤەخوارنا گوندی دو بیرێن ئیرتیوازینە سالا ٢٠٠٣ێ ل گوندی هاتینە كۆلان و ئاڤا ڤەخوارنێ ل سەر مالان دابەشدبیت.

هەروەسا جهێن بەرچاڤ و ناڤدار ل گوندی ئەڤ جهە هەنە وەكی (چەمێ دوودركەی و بەستا چكچكەی و چەمێ عەرەبا و دۆلا پەقەلەم) و هەروەسا بێرەرەش ژمارەكا زۆرا بەرێن ڕەشن ل سنوورێن گوندی دا هەنە[١٢٥].

## گوندێ هشكە بەست

سەبارەت ناڤێ گوندی موختارێ گوندی دبێژیت: دەمێ گوند ل ڤی جهی هاتییە ئاڤاكرن ل سەر لێوارا بەستەكا هشك و بێ ئاڤ هاتە دانان، ژبەر وێ یەكێ ناڤێ گوندی كرینە هشكە بەست، گوند ب دووراتییا ١٥كم دكەڤیتە باشوورێ گردەسێن و ٣٧كم ژ مەلبەندێ ئاكرێ دوورە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** ناحیا گردەسێن

**باشووری:** گوندێ كولەكا كچكە و درەش

**ڕۆژهەلات:** گوندێ سەردەریا

**ڕۆژئاڤای:** گوندێ زێلكە فاخر

### پێكهاتا گوندی:

دناڤا گوندی دا ئێك مالبات هەیە ئەوژی مالباتا (مام سال)ە و سەر ب عەشیرەتا سۆرچی یە، خەلكێ گوندی نێزیكی ٣٥ مالانە، گوند سالا ١٩٦٠ێ هاتییە ئاڤاكرن، پێشتر جهێ خودانكرنا پەزی و كوخێن مەر و مالاتی بوو.

### زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیانا خەلكێ گوندی ب شێوەیەكێ گشتی ل سەر خودانكرنا مەر و مالاتی و جۆتیاریێ یە، سالا ١٩٨٩ێ كارەب بۆ گوندی هاتییە كێشان، سالا ٢٠٠١ێ بیرەكا ئاڤێ بۆ گوندی كولایە و ئاڤا ڤەخوارنێ ل سەر خەلكی دابەشدبیت.

سالا ٢٠٠٢ێ خواندنگەهەك ژ ئالیێ خەلكێ گوندی ڤە هاتییە ئاڤاكرن و هەتا پۆلا شەشێ بنەرەتی لێ دهێتە خواندن[١٢٦].

## گوندێ كێلە پسمیران :

ناڤێ گوندی ژ ناڤێ بنەمالەكێ دهێت دگۆتنێ (كێلە پسمیران) كو ئاغاوات بوونە بەری خەلكێ ڤێ كاڤێ ل گوندی دژیان ئەڤ بنەمالە ل ڤی گوندی ئاكنجی بوونە، گوند ب دووراتییا ٤٠كم دكەڤیتە باشووری مەلبەندێ ناحیا گردەسێن و ٥٠كم ژ ئاكرێ دوورە..

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ كێلە شێخ بزنە

**باشووری:** رووبارێ زێی گەورە (زێ)

**رۆژهەلاتی:** رووبارێ زێی گەورە (زێ)

**رۆژئاڤای:** گوندێ بەردە سورە

### پێكهاتا گوندی:

گوندی ژ ئێك مالباتن ئەوژی مالباتا (پیربال)ە، ب عەشیرەت سۆرچی نە، بنەمالەكا مەزنە هژمارا وان ل گوندی بەری سالا ١٩٧٠ێ ٣٥ - ٤٠ مال بوون، نها ئەڤ ژمارە گەهشتییە نێزیكی ١٥٠ مالان. ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا گوندی ٧٨ كەس بوو[١٢٧].

### ئاڤاكرنا گوندی:

گوندەكێ كەڤنارە، ل دووڤ گۆتنا موختاری مێژوویا هەبوونا گوندی ڤەدگەریت بۆ ناڤبەرا سالێن ١٨٥٠-١٨٦٠ێ و كو ژ ئالیێ وێ مالباتا دگۆتنێ (كێلە پسمیران) ڤە هاتبوو ئاڤاكرن، پشتی ڤێ مالباتێ ئەڤ گوندە ب جە هێلای تنێ شوینوارێن گوندی مابوون پاشی دناڤبەرا سالێن ١٨٨٠-١٨٩٠ێ دووبارە ئەڤ گوندە ژ ئالیێ خەلكێ وێ ڤە هاتە ئاڤاكرن كو ل ڤی دەمی بتنێ سێ یان چار مال بوون، موختارێ گوندی ئەڤ زانیارییە ژ باپیرێ خۆ وەرگرتینە.

سالا ١٩٨٣ێ كارەب بۆ گوندی هاتییە كێشان، سالا ١٩٩٣ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ئاڤاكرن و هەتا پۆلا شەشێ ئامادەیی لێ دهێتە خواندن.

### ژێدەرێن ژیارا گوندی:

بیستانێن ئاڤی وەكی چاندنا (شفتی و گندورێ ئاڤی و باجانك و تەماتە و زەرزەوات و ....هتد) و خودانكرنا مەر و مالاتی ژێدەرەكێ سەرەكی یێ ژیانا خەلكێ گوندی یە و هەروەسا هندەك ژوانا پێشمەرگە و فەرمانبەرن.

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

گوند ژ ئالیێ رۆژهەلات و باشووریڤە دكەڤیتە سەر رووبارێ زێی هەتا سالا ٢٠٠٢ێ ژێ ئاڤا رووبارێ ژێدەرەكێ سەرەكی یێ ئاڤا ڤەخوارنا گوندی بوو، سالا ٢٠٠٣ێ بیرەكا ئیرتیوازی بۆ گوندی هاتییە كۆلان ئاڤ ل سەر گوندی دابەشدبیت[١٢٨].

## گوندێ ئومەر خوشا:

ناڤێ گوندی ژدو برگا (ئومەر+ خوشا) پێكدهێت، پەیڤا ئومەر ژ ناڤێ باپیرێ مەزن یێ گوندییان دهێت كو ناڤێ وی (ئومەر) بوویە و هەروەسا واتایا پەیڤا (خـوش) دهێت ژ جهێ گوندی ژبەركو جهەكێ خوش بوو گەلەك كانیێن ئاڤێ لێ هەبوون، ژبەر ڤێ یەكێ دگۆتنێ گوندێ (ئومەر خوشا)، گوند ١٥كم دكەڤیتە باكوورێ رۆژهەلاتێ گردەسێن و ٥كم ژ مەلبەندێ قەزا ئاكرێ دوورە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ شكەفتا مغارا

**باشووری:** گوندێ گرئاشور

**رۆژهەلاتی:** گوندێ نێرگزین

**رۆژئاڤایی:** گوندێ خرابە ژوور دهێت

### پێكهاتا گوندی:

گوند ژ ئێك مالبات پێكدهێت ئەوژی مالباتا (شێخا)نە ب عەشیرەت سۆرچی نە، ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلكێ گوندی ١٣٧ كەس بوو[١٢٩]، خەلكێ گوندی بەری سالا ١٩٧٠ێ

نێزیکی ٣٠ مالان، نها گەهشتینە نێزیکی ١١٥ مالان.

گوند سالا ١٩٤٠ێ هاتییە ئاڤاکرن، سالا ١٩٧٩ێ مزگەفت ل گوندی هاتییە ئاڤاکرن، سالا ١٩٨٥ێ کارەب بۆ هاتییە کێشان و سالا ١٩٨١ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ئاڤاکرن و هەتا پۆلا سێ ناڤنجی لێ دهێتە خواندن.

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

گوندی هژمارەکا کانییان هەنە ژوانا کانییا (کانییا سپیندارا و کانییا مێرا و کانییا سماقینێ و کانییا تیرەشکێ و کانی کەلان وکانییا چەلانێ)، هەروسا گوندی رووبارەکێ ئاڤێ ژی هەیە، ژێدەرێ ئاڤا ڤەخوارنا گوندی ژ کانیێن (کانی تیرەشکێ و کانییا چەلانێ و کانییا مێرا) بوو، سالا ٢٠٠٣ێ پرۆژەیێ ئاڤا ڤەخوارنێ بۆ گوندی هاتە دانان.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

پتریا گوندی ژیانا وان ل سەر چاندنا ئاڤییە وەك چاندنا (برنجی و رەز و باغا و شفتی و زەرزەواتی)، هندەك مژوولی خودانکرنا مەر و مالاتی و هندەك ژی پێشمەرگەنە.

### جهێن بەرچاڤ و ناڤدار:

گەلەك جهێن بەرچاڤ و ناڤدار ل گوندی هەنە کو ژ ئالیێ خەلکێ گوندی ڤە هاتینە ناڤکرن، وەك (جوگا ئیسوی و جوگرکێ و نەرماسا ریجێ و دۆلا کوتانا و دۆلا لەڤەنکەرا و دۆلا کاموخەلا و دۆلا شیڤەکورێ و دۆلا کەندالێ و کەرمیا شەهیدا و کەنکە ئاستا)[١٣٠].

## گوندێ کێلەسپی:

ناڤێ گوندی ژ گۆرستانەکێ هاتییە دکەڤیتە پشتا گوندی، گۆرستانەکا کەڤنە و کێلیێن گۆرستانێ هەمی بەرێن سپینە، لەوما دبێژنێ گوندێ (کێلە سپی)، گوند ب دووراتییا ١٥کم دکەڤیتە باشوورێ گردەسێن و ٣٠کم ژ مەلبەندێ قەزا ئاکرێ دوورە..

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ مام خەلیفە

**باشووری:** باژەروکێ روڤیا یە

**رۆژهەلاتی:** گوندێ شێخانوك سۆرچی

**رۆژئاڤایی:** گوندێ ئێکمالە

### پێکهاتا گوندی:

دناڤا گوندی دا دو مالبات هەنە، مالباتا (چاربۆتی) سەر ب عەشیرەتا سۆرچی نە، مالباتا (عەبزێری) سەر ب عەشیرەتا گۆرانن، بەری سالا ١٩٧٩ێ ٥ - ١٠ مال ل گوندی هەبوون، نها گەهشتینە نێزیکی ٧٠ێ مالان.

گوند ل سالا ١٩٦٤ێ هاتییە ئاڤاکرن، سالا ١٩٩٦ێ مزگەفت لێ ئاڤاکرینە، سالا ١٩٨٠ێ کارەب بۆ گوندی هاتییە کێشان، سالا ١٩٧٦ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەکرن.

### ژێدەرێن ژیارا گوندی:

ژیانا خەلکێ گوندی ب گشتی ل سەر مەرۆمالات و چاندنێ یە، هندەك ژوان پێشمەرگەنە، ژێدەرێ ئاڤا ڤەخوارنا گوندی بیرەکا ئیرتیوازی یە.

کەڤرە سور و دۆلە درێژ ژ جهێن بەرچاڤ و دیارێن گوندینە[١٣١].

## گوندێ خاتوناوا:

ناڤێ گوندی ژ ناڤێ ژنەکێ هاتییە کو د بنیاتدا وێ ئەڤ گوندە ئاڤاکرییە، (خاتون) ناڤێ گوند ئاڤاکرییە و بوویە (خاتون + ئاوا)، دزاراڤێ سۆرچی یا دا پەیڤا (ئاواکرن) ب واتایا (ئاڤاکرن)، هەردو پەیڤ ل سەر زمانی سڤکبووینە و بوویە (خاتوناوا)، گوند ١١کم ژ باکوورێ گردەسین و ٦کم ژ ئاکرێ دوورە.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ خەرجەوا

**باشووری:** گوندێ سەردەریان

**رۆژهەلاتی:** گوندێ کورکان بەست

**رۆژئاڤایی:** گوندێ بەراك

**پێکهاتا گوندی:**

د بنیاتدا گوند ژ ئێك مالبات ئەوژی مالباتا (مام سال)ە پێکهاتییە سەر ب عەشیرەتا سۆرچی یە، گوند ١٥ماله، سالا ١٩٧٥ێ هاتییە ئاڤاکرن، سالا ٢٠١٢ێ کارەب بۆ گوندی هاتییە کێشان.

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

ژیارا خەلکێ گوندی ل سەر خودانکرنا مەر و مالاتی و چاندنی یە و هندەك ژ وانا پێشمەرگەنە، و ژێدەرێ ئاڤا ڤەخوارنا گوندی بیرەکا ئیرتوازی یە [١٣٢].

## گوندێ درەش:

گوند ب ناڤێ جۆرەکێ روەکی هاتییە ناڤکرن ئەوژی (دری رەشك)ن، د بەرێ دا ئەڤ جۆرە رووەکە ل دەڤەرێ هەبوو، بۆ سڤککرنا سەر زمانی دگۆتنێ (درەش)، گوند ب دووراتییا ٧کم دکەڤیتە باشووری رۆژهەلاتێ گردەسێن و ٢٠کم ژ مەلبەندێ قەزا ئاکرێ دوورە..

ئەڤ گوندە ژی ژ وان گوندان بوو یێن دەسپێکا سەدسالییا بیستێ بەردای و ڤالا و پاشتر ل سەر مولکێن سولتانێ ئوسمانی عەبدولحەمیدێ دووێ هاتینەتوومارکرن، رووبەرێ گوندی وی دەمی ٢٥١٦ دۆنەمێن عەردی بوو [١٣٣].

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ سەردەریان

**باشووری:** گوندێ کولەکا بچوکە

**رۆژهەلاتی:** گوندێ رەبەنا

**رۆژئاڤایی:** گوندێ زنلکە فاخر

**پێکهاتا گوندی:**

دناڤ گوندیدا تنێ مالباتا (مام سال)ە ئەو سەر ب عەشیرەتا سۆرچی یە، گوند نێزیکی ٣٧ مالانە.

سالا ١٩٦٠ێ گوند هاتییەڤە ئاڤاکرن، مزگەفت سالا ٢٠١٢ێ لێ هاتییە ئاڤاکرن، سالا ٢٠١٢ کارەب بۆ گوندی هاتییە کێشان، سالا ٢٠٠٠ێ خواندنگەها گوندی هاتییە ئاڤاکرن.

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

هەروەکی پتری یا گوندێن دیتر ژیانا خەلکێ وێ ل سەر خودانکرنا مەر و مالاتی و چاندنا دێمە و هندەك ژی پێشمەرگەنە، ژێدەرێ ئاڤا ڤەخوارنا گوندی ل سەر بیرەکا ئیرتیوازی یە.

جهێن بەرچاڤ و ناڤدار ل گوندی ئەڤ جهە هەنە ئەوژی (کانییا قامیشوك و هەڤێزا حاسێ و دۆلا چێلێ و دۆلا قورنیك) [١٣٤].

## گوندێ ئسپیمال:

گوند سالا ١٩١٥ێ ژ ئالیێ خەلکێ گوندی ڤە هاتییە ئاڤاکرن، ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ گوندی ٧٢ کەس بوو [١٣٥]، بەری سالا ١٩٧٠ێ ژمارا مالێن وی ٣٠ - ٤٠ مال بوو، ئەڤ ژمارەیە بەر ب زێدەبوونێ چویە نها هژمارا گەهشتییە ١٤٥ - ١٥٥ مال، گوند ب دووراتییا ٣٧کم دکەڤیتە رۆژهەلاتێ گردەسێن و ٢٨کم ژ مەلبەندێ قەزا ئاکرێ دوورە.

سالا ١٩٨٠ێ مزگەفت لێ هاتییە ئاڤاکرن، سالا ١٩٨٤ێ هێلا کارەبێ بۆ گوندی هاتییە کێشان، سالا ١٩٨٨ێ خەلکێ گوندی خواندنگەهـ بۆ خۆ ئاڤاکرییە بەلێ ئاڤاهییەکێ بچویك بوو، ل ١٠ چریا ئێکێ ٢٠٠٥ێ ئاڤاهیێ نوویا خواندنگەها گوندی ژ ئالیێ حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ ڤە هاتییە ئاڤاکرن.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ کورکان مەسجد

**باشووری:** گوندێ رەبەنا

**رۆژهەلاتی:** گوندێ گەرێ

**رۆژئاڤای:** گوندێ باسەرێ

### زێدەرێن ژیارا گوندی:

هژمارەك ژ خەلكێ گوندی مەر و مالاتی خواندكەن، هژمارەكا دیتر چاندنا دێمی و ئاڤی دكەن، بەرهەمێن ئاڤی وەكی (شفتی و تەماتە و خیار و باجانكا و زەرزەواتی) هەنە، هندەك ژی پێشمەرگەنە، ژێدەرێ ئاڤا ڤەخوارنا گوندی بیرەكا ئیرتیوازیە، ل ١٩٩٨/٦/١٦ هاتییە كۆلان.

جهێن بەرچاڤ و ناڤدار ل گوندی هەنە وەك: كانیا ئسپیمالێ، بانیا كێلە سپی یێ، گۆرستان، دۆلە كەنیشك و شكەفتا حافز)، شكەفتا حافز شكەفتەكا مەزنە دكەڤیتە سنوورێن گوندی لێ خەلكێ وێ چ زانیاری ل سەر نەبوون[١٣٦].

### گوندێ ئیسماوا:

سەبارەت ناڤێ گوندی بۆچوونەكا جهێ باوەریێ و بەرئاقل دەست مە نەكەت، گوند ب دووراتییا ٤٢كم دكەڤیتە باكوورێ رۆژئاڤایێ ناحیا گردەسێن و ٣٠كم ژ مەلبەندێ قەزا ئاكرێ دوورە.

### ئاڤاكرنا گوندی:

ژ گۆتنا موختارێ گوندی و جهێن شوینواریێن ناڤا گوندی دیاردبیت گوندەكێ كەڤنە و ژ مێژڤە ئاڤەدانی و ژیان لێ هەبوویە مخابن ب دروستی ڤەكولین ل شوینوار و ئاڤاهیێن شوینواریێن گوندی نەهاتییەكرن كو ب دروستی مێژوویا وی بێتەزانین.

دووڤ گۆتنا موختاری بابێ وی (عەلی) ل سالا ١٩٠٥ێ ل ڤی گوندی ژ دایك بوویە، باپیرێ وی (میرو) ئەوژی ل ڤی گوندی ژ دایك بوویە، هەروەسا باپیرێ

گوندێ ئیسماوا



موختاری یێ چوارێ (مامند) ل ڤی گوندی ژیایە و ل دووڤ گۆتنا موختاری كو باپیرێ وی (مامند) ل سەردەمێ میرێ ئامێدیێ ل ڤێ دەڤەرێ ( ماست و پەنیر و ژاژی .....هتد) بوو میرێ ئامێدیی برینە، ل دووڤ وان ڤەگێرانان بیت گوند ل دەسپێكا سەدساڵیا نوزدێ هاتیەئاڤاكرن، ل دووڤ سەرژمێریا ساڵا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلكێ گوندی د وێ ساڵێدا ٢١٣ كەس بوو و گوند سەر ب ناحیا (العشائر السبعە) بەردەرەش بوو[١٣٧].

### سنوور و جوگرافیا گوندی:

سرۆشتێ گوندی ژ چیایێن بلند و دۆلێن كویر و سەخت پێكدهێت، تژینە ژ دار و رەز و باغان و كانیێن ئاڤێ و هەبوونا رووبارێ خازر.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ باكرمان

**باشووری:** گوندێ باقسپێ

**رۆژهەلاتی:** گوندێ خێلافتا خارێ

**رۆژئاڤای:** رووبارێ خازر

### پێكهاتا گوندی:

گوندی ژ عەشیرەتا زێباری ژ مالباتا (محەمەد سەلیم شوشی)نە، ١١مالن و خەلكێ وێ نێزیكی ٩٥ كەسانە و دابەشی سەر ١٤ سەرۆك خێزانا دبن.

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

گوند یێ دەولەمەندە ب هەبوونا گەلەك كانیێن ئاڤێ وەك: كانیا ناڤ رەزی و كانیا بادین و كانیا عاقدی و كانیا ژنكا و كانیا زەلاما و كانیا مەندا و كانی قیرێ و كانیا ئاڤدەل و كانیا گەراڤا، كانیا گەراڤا بوو نەخۆشیێن پێستی دهێتە بكارئینان و ژێدەرێ ئاڤا ڤەخوارنا گوندی ژ كانیا بادین دهێت و دابەشی سەر مالان دبیت، هەروەسا رووبارێ خازر ژی دبەر گوندی را دبۆریت.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا خەلكێ گوندی پتر ل سەر چاندنێ یە و ترێ و هنار و هژیر و سێڤ و زەیتون و ....هتد بەرهەمدئینن، بەرهەمێن دێمی (وەك سماق و باهیڤ... هتد) هەنە، و ژبلی خودانكرنا گارەشا و هندەك ژی ژوانا پێشمەرگەنە.

### جهێن ناڤدارێن گوندی:

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە: گەلیێ مەندێ، رێكا دەركا ستارەی، رێكا گەراڤی، كەلی كەڤن، كەلا مراد پاشای و رێكا كانیا عاقدی).

### شوینوار و جهێن كەڤنار:

دڤی گوندی دا هژمارەكا جهێن كەڤنار و شوینوارێن جودا هەنە وەكو شوینوارێ مزگەفتەكێ ل گوندی هەیە كو مێژوویا وێ وەك ڤەدگێرن بۆ بەری هاتنا دەولەتا عوسمانی ڤەدگەریت، خانیەكێ دیتر ب شێوازێ (عاقد) كانیەكا ئاڤێ تێدایە، هەروەسا دو شكەفتێن مەزن ل گوندی هەنە ئەوژی (شكەفتا كافر)ە ل دووڤ گۆتنا موختارێ گوندی جهێ سێ تا چوار مالان تێدا هەیە، هەردیسان شكەفتا (پی پور) كو جهێ ١٥٠٠ مەر و مالاتی تێدا هەیە[١٣٨].

## گوندێ باقسپێ

ل دوور واتایا ناڤێ گوندی دگۆتن: ل سنوورێ هەر چوار گوندێن (باقسپێ و باژێرە ژوور و باژێرە ژێر و ئیسماوا) دبەرێ دا هەرگاڤ بایەكێ ب هێز ئەڤ گوندە ڤەدگرتن و ناڤێ وی ژ ڤی بایی هاتیە و باقسپێ ژی هەر ژ ڤی بایێ بهێز هاتیە و لەوما دبێژنێ (باقسپێ)، گوند ب دووراتیا ٤٥كم دكەڤیتە رۆژئاڤایێ گردەسێن و ٣٥كم ژ مەلبەندێ قەزا ئاكرێ دوورە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ ئیسماوا

**باشووری:** گوندێ باژێرە ژوورە

**رۆژهەلاتی:** گوندێ كونسیخورە

**رۆژئاڤای:** رووبارێ خازرە

### پێکهاتا گوندی:

دناڤا گوندی دا دو عەشیرەت هەنە عەشیرەتا زێباری کو دبنە سێ جوین ئەوژی: (نەپاخی و هیرتی و چالی)، عەشیرەتا مزووری ئەوژی ئێك پێکهاتە کو (چارگوتی)نە، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ گوندی ١٣٩ کەس بوو(١٣٩)، بەری سالا (١٩٧٠)ێ گوند ٤٥ - ٥٥ مال بوو، نها گەهشتیە ٢٢٠ - ٢٥٠ مالان.

ل دووڤ گۆتنا خەلکێ گوندی و موختاری ئەڤ گوندە دەسپێکا سەدسالیا نوزدێ هەبوویە وەك دبێژن باپیرێ وان یێ پێنجێ ل ڤی گوندی ژ دایکبوویە، پشتی وان چەند جارەکان گوند هاتیە بەردان، ل سالێن (١٩٦٥ و ١٩٧٣)ێ ژ ئالیێ حکۆمەتا بەعسیڤە هاتیەخرابکرن، پشتی سالا ١٩٧٥ێ جارەکا دی هاتیەڤە ئاڤاکرن.

گوندی سێ مزگەفت هەنە سالێن (٢٠٠٠، ٢٠٠٧، ٢٠١٥)ێ هاتینە ئاڤاکرن، سالا ٢٠٠٣ێ جادا ڤێرکری گەهشتیە گوندی.

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

گوند یێ دەولەمەندە ب هەبوونا ئاڤا سەر عەردی وەکی رووبارێ خازر و هندەك کانیێن ئاڤێ تایبەت کانیا گوندێ باقسپێ و چێکرنا سکرێ ئاڤێ ل سەر رووبارێ خازر ل٢٢/٤/٢٠٠٤ێ کو ژێدەرێ ئاڤا گوندی ل کانیا باقسپێ بوو لێ نها پرۆژەیێ ئاڤێ ل گوندی هاتیە چێکرن.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

پرانیا خەلکێ گوندی مژوولی کارێ چاندنێ نە، بەرهەمێن وەك: خۆخ و هنار و هژیر ....هتد) هەنە و یێن دێمی وەکی سماق و باهیڤ و رەزا، هندەك ژی مژوولی خودانکرنا تەرش و کەوالینە و هندەك ژی ژوانا پێشمەرگەنە.

سالا ١٩٧٨ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتیە ڤەکرن و هەتا پۆلا شەشێ ئامادەیی لێ دهێتە خواندن(١٤٠).

## گوندێ نێرگزین

ل وەرزێ بهارێ هژمارەکا زۆر ژ نێرگزا ل ڤێ دەڤەرێ دهێنەدیتن، گوند ژی ب ناڤێ نێرگزان هاتیەناڤکرن، گوند ب دووراتیا ٣٠کم دکەڤیتە باکوورێ رۆژهەلاتێ گردەسێن و ١٠کم ژ مەلبەندێ قەزا ئاکرێ دوورە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ شیڤرەزانە

**باشووری:** گوندێ خەرجاڤا

**رۆژهەلاتی:** گوندێ کەشکا ژووری

**رۆژئاڤای:** گوندێ گرئاشورە

### پێکهاتا گوندی:

دناڤا گوندی دا چوار مالبات هەنە ئەوژی مالباتا (مام سال و مامانومەر و مەنتك و پیرازی)نە سەر ب عەشیرەتا سۆرچی نە، بەری سالا ١٩٧٠ێ ٨ - ١٢ مال بوون، نها گەهشتیە نێزیکی ٩٠ مالان.

گوند سالێن پێنجیيان ژ ئالیێ خەلکێ گوندی ڤە هاتیە ئاڤاکرن، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٧٥ێ هژمارا خەلکێ گوندی ١٠٠ کەس بوو(١٤١). سالا ١٩٧٣ێ ژ ئالیێ حکۆمەتا بەعسڤە هاتیە وێرانکرن و سۆتن ب هەجەتا هەبوونا پێشمەرگا ل ڤی گوندی، سالا ١٩٧٤ێ کارەب گەهشتیە گوندی و دو مزگەفت ل گوندی هەنە ژ ئالیێ کەسێن خێرخوازڤە هاتینە ئاڤاکرن، ل سالا ١٩٨٨ێ کارەب بۆ گوندی هاتیە کێشان.

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

گوندی هژمارەکا کانییان هەنە ئەوژی: کانیا گوندی، کانیا زرگێزا، کانیا ژنکا، کانیا خرپێ ژێدەرێ ئاڤا ڤەخوارنا گوندی ژ کانیا زرگێزا بوو، ل ٤ کانوونا ئێکێ ١٩٩٨ێ پرۆژەیێ ئاڤێ ل گوندی هاتیەچێکرن.

### زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژبەر هەبوونا گەلەك كانیێن ئاڤێ و هەبوونا رووبارەكێ بچویك خەلكێ گوندی ب رێژەیەكا زۆر بەرێ خو دایە چاندنا برنجی و كەسكاتی جۆرێن فێقی بەرهەمدئینن، هندەك ژێ چاندنا دێمی دكەن گەنم و جەهی دچینن، هندەك ژێ مژوولی خودانكرنا تەرش و كەوالی نە و هندەك ژێ مووچەخۆر و پێشمەرگەنە.

خەلكێ گوندی سالا ١٩٨٠ێ بخۆ خواندنگەهەك بۆ گوندی ئاڤاكریبە، پشتی سەرهلدانا كوردستانێ ئەو خواندنگەهـ ژ ئالیێ حكۆمەتا هەرێمێ ڤە هاتییەنووژەنكرن و بەرفرەهكرن[١٤٢].

## گوندێ سماقوك

دەربارەی ناڤێ (سماقوك) دهێتەگۆتن كو دبەرێ دا ل ڤێ دەڤەرێ گەلەك دارێن سماقێ لێ هەبوون و هەر ژبەر وێ یەكێ دەمێ گوند هاتییە ئاڤاكرن ب (سماقوك) ناڤكرن، گوند ب دووراتییا ١٥كم دكەڤیتە باكوورێ گردەسێن و ٦كم ژ مەلبەندێ قەزا ئاكرێ دوورە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوشینە خان ئاڤدەلە

**باشووری،** ئاكرێ (ئاڤاهیێ كولیژا پەروەردەیا ئاكرێ)

**رۆژهەلاتی،** كۆمەاگەها ئالەیێ

**رۆژئاڤای،** گوندێ كوچینە حەسەن بەدو

### پێكهاتا گوندی:

دناڤا گوندی دا سێ عەشیرەت هەنە ئەوژی بریتینە ژ عەشیرەتا (هەركی) كو دبنە دوو مالبات (مام شێخ و سمایلی) و عەشیرەتا (زێباری) ئەوژی (نەپاخی) نە و عەشیرەتا (خێل)، ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلكێ گوندی ١١٥ كەس بوو[١٤٣]، بەری سالا ١٩٧٠ێ ٢٠ - ٣٠ مال بوون، نها بەر ب زێدەبوونێ ڤەیە و هژمارا وان گەهشتییە نێزیكی ١٢٠ مالان.

ئاڤاكرنا گوندی ڤەدگەریتە سالا ١٩٤٨ێ، هەرەسان ئەڤ گوندە دو جاران توشی وێرانكرنێ بوویە، جارا ئێكێ ل سالا ١٩٦١ێ هاتەسۆتن، سالا ١٩٦٥ جارەك دی هاتە ئاڤەدانكرن دیسان ل ئادارا ١٩٧٤ێ جارەك دی هاتە چۆلكرن و دووبارە ل هەیڤا ١١ هەمان سالدا هاتە ئاڤەدانكرن.

هەروەسا تاكە گوندە ل كوردستانێ كو پەیمانگەهـ لێ هاتییە ڤەكرن ئەوژی ژبەر جهێ وێ یێ باش و نێزیكی ئاكرێ، سالا ١٩٧٩ێ خەلكێ گوندی خواندنگەهەك بۆ خۆ ئاڤاكریبە و سالا ٢٠٠٤ێ ژ ئالیێ حكۆمەتا هەرێما كوردستانێ ڤە ئاڤاهیێ وێ هاتە بەرفرەهكرن و نوژەنكرن.

### زێدرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیانا خەلكێ گوندی ل چاندنا گەنم و جەهی یە، هندەك ژێ ژوانا پێشمەرگەنە، سالا ١٩٧٦ێ مزگەفت ل گوندی هاتییە ئاڤاكرن، ل١٩٩٨/٦/١٦ێ پرۆژەیێ ئاڤا ڤەخوارنێ بۆ گوندی هاتییە چێكرن[١٤٤].

## گوندێ وەرملان

ل دوور واتایا ناڤێ گوندی خەلكێ گوندی دبێژیت: دناڤا گوندی دا شوینوارەكێ مێژوویی ب ناڤێ (هورملا) هەیە دزڤریتەڤە سەردەمێن كەڤن، ناڤێ گوندی ژ ڤی شوینواری هاتییە ب تێپەربوونا دەمی هاتییە گوهارتن و بوویە (وەرملان)، گوند ب دووراتییا ٢٠كم دكەڤیتە باكوورێ رۆژهەلاتێ گردەسێن و ١٥كم ژ مەلبەندێ قەزا ئاكرێ دوورە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ بانەمل

**باشووری،** گوندێ نێرگزین

**رۆژهەلاتی،** گوندێ خەلین

**رۆژئاڤای،** گوندێ شیڤرەزان

## پێكهاتا گوندی:

ل ڤی گوندی دو مالبات هەنە ئەوژی مالباتێن (مام سال و شێخ زادە)نە و سەر ب عەشیرەتا سۆرچی نە، هەروەسا هژمارا خەلكێ گوندی نێزیكی ٧٠ێ مالانە.

ئاڤاكرنا گوندی ڤەدگەریتەڤە بوو سالا ١٩٥٧ێ ، ئەڤ گوندە ل سالا ١٩٧٤ێ ژ ئالیێ حكومەتا عیراقێ ڤە هاتە وێرانكرن و سوتن، ل سالا ١٩٧٥ێ خەلكێ گوندی زڤرینەڤە سەر گوندی و ئاڤاكرەڤە.

سالا ٢٠١٠ێ مزگەفت ل گوندی هاتیە ئاڤاكرن، سالا ٢٠١٥ێ خواندنگەهـ بوو گوندی هاتیە ئاڤاكرن.

## ژێدەرێ ژیارا خەلكێ گوندی:

ژبەر هەبوونا رووبارەكێ بچویك دناڤا گوندی دا خەلكێ گوندی مژوولی چاندنا بەرهەمێن ئاڤی نە وەك: چاندنا برنجی و چێكرنا بیستان و رەز و باغان، چاندنا دێم ژی ب تایبەت یا گەنم و جەهی دكەن و تەرش و كەوالی خودان دكەن، هندەك ژی پێشمەرگەنە.

ل رێكەفتی ١٩٩٨/١٢/٥ پرۆژەیێ ئاڤا ڤەخوارنێ ل گوندی هاتیە چێكرن [١٤٥].

## گوندێ باسەوێ:

ئەڤ گوندە ل سالێن پێنجییان هاتیەئاڤاكرن، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ د وێ سالێدا ٤٤ كەس ل گوندی دژیان[١٤٦]، هەروەسان ئەڤ گوندە دو جاران سالێن (١٩٧٤و ١٩٨٨)ێ ژ ئالیێ حكومەتا عیراقێ ڤە هاتیە وێرانكرن، سالا ١٩٩١ێ پشتی سەرهلدانا خەلكێ كوردستانێ دوبارە خەلك زڤرینە گوندی و گوند جارەك دی ئاڤاكریەڤە، گوند ب دووراتییا ٢٥كم دكەڤیتە رۆژهەلاتێ گردەسێن و ٦٥كم ژ مەلبەندێ قەزا ئاكرێ دوورە.

د بەلگەنامەیێدا ناڤێ گوندێ (باسوبی) هاتییە ئەم د وی باوەرێدانە ئەو ئەڤ گوندێ باسەوێ یە و ژ وان ٥٤ گوندێن قەزا ئاكرێ بوو یێن ل دواییا سەدسالییا نوزدێ دەسپێكا سەدسالییا بیستێ ژ ئەنجامێ زێدەگاڤیێن عەشیرەتان و نەمانا ئاسایش و تەناهیێ هاتینەبەردان و ڤالابووین ژ ئاكنجییان، لەوما دەستەلاتداریا ئوسمانی ب بریارەكێ ل ٢٤ نیسانا ١٩٠٧ێ ئەڤ گوندە دانە دگەل مولكێن سولتان عەبدولحەمیدێ دووێ و ب ڤی رەنگی مان هەتا راگەهاندنا دەستوورێ ئوسمانی ل ٢٣ تەباخا ١٩٠٨ێ ئەو بوو سولتانی ب ناچاری دەست ژ مولكینیا ڤان گوندان بەردا كەتنە سەر گەنجینا گشتیا دەولەتێ، د وی دەمیدا رووبەرێ ڤی گوندی ٢٥٠٠ .دۆنەمێن عەردی بوون[١٤٧].

## سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ بەردەسم.

**باشووری:** گوندێ رەبەنا یە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ سپیمالە.

**رۆژئاڤای:** گوندێ سەردەریانە.

## پێكهاتا گوندی:

گوند ژ دو ماباتان مالباتێن (مام سال و جاخومەر) پێكهاتییە، سەر ب عەشیرەتا سۆرچی نە، خەلكێ وی تنێ ١٥ مالن، سالا ٢٠١٢ێ مزگەفت ل گوندی هاتییە ئاڤاكرن، سالا ٢٠١٣ێ كارەب بۆ گوندی هاتییە كێشان و سالا ٢٠٠٣ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەكرن.

## ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا خەلكێ گوندی ل سەر خودانكرنا مەر و مالاتی و جۆتیاریا دێمی یە و هەروەسا هندەك ژوانا پێشمەرگەنە، و ل رێكەفتی ٢٠٠٦/٧/٣ێ پرۆژەیێ ئاڤا ڤەخوارنێ بوو گوندی هاتییە كێشان[١٤٨].

## گوندێ سیتكا:

گوندێ سیتكا سالا ١٩٥٠ێ هاتییەئاڤاكرن، هەروەسا گوند ل سالا ١٩٧٣ێ ژ ئالیێ حكومەتا عیراقێ ڤە هاتەوێرانكرن، سالا ١٩٧٦ێ دوبارە ژ ئالیێ

خەلکێ ویڤە هاتییە ئاڤەدانکرن، گوند ب دووراتییا ٢٠کم دکەڤیتە باکوورێ رۆژهەلاتێ گردەسێن و ٧کم ژ مەلبەندێ قەزا ئاکرێ دوورە.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری،** گوندێ بەهراوە فەقی عەلی

**باشووری،** گوندێ وەرملا

**رۆژهەلاتی:** گوندێ دوستان

**رۆژئاڤای،** گوندێ شیفرەزان

**پێکهاتا گوندی:**

گوندی دو مالبات هەنە ئەوژی مالباتا (مام سال و مامانومەر)ن و سەر ب عەشیرەتا سۆرچی نە، ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ گوندی ٣٦ کەس بوو[١٤٩]، نها خەلکێ وێ نێزیکی ٨٠ێ مالانە.

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

ژیارا خەلکێ وێ هندەك ل سەر خودانکرنا مەر و مالاتی یە و چاندنا دێم و هندەك ژوانا ژی پێشمەرگەنە.

سالا ١٩٨٥ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییەڤەکرن و هەتا پۆلا شەشێ سەرەتایی لێ دهێتە خواندن، سالا ١٩٨٨ێ کارەب بۆ گوندی هاتییە کێشان و سالا ٢٠٠١ێ مزگەفت ل گوندی هاتییە ئاڤاکرن و سالا ٢٠٠٢ێ پرۆژەیێ ئاڤا گوندی هاتییەچێکرن[١٥٠].

## گوندێ چەم سماق:

ژ ناڤێ گوندی را دیارە کو ل ڤی جهی گەلەك سماق لێ هەبوویە و چەمەکێ ب سماق بوویە لەورا ناڤێ گوندی کرییە (چەم سماق)، ئانکو چەمەکێ ب سماق، گوند ب دووراتییا ٣٥کم دکەڤیتە رۆژهەلاتێ گردەسێن و ١٧کم ژ مەلبەندێ قەزا ئاکرێ دوورە.

ئەڤ گوندە ژی ژ وان گوندانە یێن کەتینە سەر مولکییەتا سولتان عەبدولحەمیدێ دووێ و د وی دەمیدا رووبەرێ وی ٢٠٠٠ دۆنەمێن عەردی بوو[١٥١].

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری،** گوندێ بەهراوە موسا

**باشووری،** گوندێ کورکان بەستە

**رۆژهەلاتی،** گوندێ بڤزێ

**رۆژئاڤای،** گوندێ دوستانە

**پێکهاتا گوندی:**

گوندی هەمی ژ عەشیرەتا سۆرچی نە و ژ مالباتا (مام سال)ن، و هژمارا خەلکێ گوندی ٣٥ مالن و گوند ل سالا ١٩٥٠ێ ژ ئالیێ خەلکێ ویڤە هاتییە ئاڤاکرن.

سالا ١٩٩٠ێ جادە بۆ گوندی هاتییە چێکرن، هەروەسا سالا ٢٠٠٢ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەکرن، ژیارا خەلکێ گوندی ل سەر خودانکرنا مەر و مالاتی و چاندنێ و هندەك ژی پێشمەرگەنە، پرۆژەیێ ئاڤا ڤەخوارنێ سالا ٢٠٠٢ێ ل گوندی هاتییە چێکرن[١٥٢].

## گوندێ قەسروك مام بال:

ناڤێ گوندی: ل دووڤ گۆتنا خەلکێ گوندی ل ڤی جهی شوینوارێن خانییەکی هەنە دگۆتنێ (قەسرا مام بال)، ژبەر ڤێ چەندێ دەمێ گوند ئاڤاکرین ب گوندێ (قەسروك مام بال) ناڤکرینە، گوند ب دووراتییا ٤٠کم دکەڤیتە باشوورێ رۆژهەلاتێ گردەسێن و ٢٥کم ژ باژێرێ ئاکرێ دوورە.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری،** گوندێ سەرشنا و باراڤا

**باشووری،** گوندێ زێراڤ

**رۆژهەلات،** گوندێ ماندیا و گەویلان

**رۆژئاڤای،** گوندێ خەلانە

**پێکهاتا گوندی:**

دناڤا گوندیدا ئێك مالبات هەیە ئەوژی مالباتا (مام سال)ە و سەر ب عەشیرەتا سۆرچی نە، گوندەك

ب ڤی ناڤی ل دووراتییا ١-٢كم ژ جهێ گوندێ نها هەبوو ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلكێ گوندی ٨٣ كەس بوو[١٥٣]، موختارێ گوندی دبێژیت: د وان سالاندا ئەو گوند ژبەر كێشەكا جڤاكی هاتیبەردان و خەلكێ وی ژ دەڤەرێ دووركەتینە. ئەڤ گوندە ل سالا ٢٠٠١ێ ب هەمان ناڤ هاتیبەئاڤاكرن، بەس خەلكێ گوندێ نوو ب چ رەنگەكی ناگەهنە خەلكێ گوندێ كەڤن، نها خەلكێ ڤی گوندێ نوو تنێ ١٢ مالن، د هەمان سالێدا جادە بۆ گوندی هاتیەچێكرن و سالا ٢٠١١ێ كارەب گەهشتییە گوندی.

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

ژێدرێ ئاڤا ڤەخوارنا گوندی ژ كانییا قەسروكێ دهێت و ب سەر مالاندا دابەشدبیت، و هەردیسان رووباركێ گبێر دناڤا گوندی را دبووریت.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

خەلكێ گوندی ب شێوەیەكێ گشتی دو كارێن سەرەكی دكەن: خودانكرنا مەر و مالاتی و هندەك ژی پێشمەرگەنە [١٥٤].

## گوندێ گەرێ:

ناڤێ گوندی: سەبارەت واتایا ناڤێ گوندی موختارێ گوندی دبێژیت: دبەرێدا ئاڤا زێیێ مەزن هاتییە سەر ڤی گوندی و بویە گەرا ئاڤێ، ژبەر هندێ گوند ب (گەرێ) هاتییەناڤكرن، گوند ب دووراتییا ٧٠كم دكەڤیتە رۆژهەلاتێ گردەسێن و ٤٥كم ژ سەنتەرێ قەزا ئاكرێ دوورە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ جولێرە

**باشووری:** زێیێ مەزن و گوندێ سەركەڤروكە

**رۆژهەلات:** زێیێ مەزن

**رۆژئاڤای:** گوندێ ئسپیمالە

### پێكهاتا گوندی:

گوندی تنێ ئێك مالباتە ئەوژی (پسەغا)نە، سەر ب عەشیرەتا سۆرچی نە، گوند نها ١٠ مالن. گوند سالا ١٩٦٥ێ بێ ژلایێ خەلكێ ویڤە هاتییەئاڤاكرن، سالا ٢٠١٠ێ هێلا كارەبێ بۆ گوندی هاتییە كێشان، هێژ جادا ڤێركری بۆ نەهاتییەچێكرن هەر سال رێكا گوندی ژ ئالیێ بازێرڤانییا ئاكرێ ڤە دهێتە خوشكرن و پەستان.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژبەركو گوند بێ نێزیكی زێیێ مەزنە هژمارەكا زۆر ژ خەلكێ گوندی چاندنا ئاڤی تایبەت برنجی و باجانك و تەماتە و خیار ....هتد دكەن، هندەك ژی مەر و مالاتی و كارەشان خوداندكەن.

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

ئاڤا ڤەخوارنا گوندی ژ بیرەكا ئیرتیوازی بوو، پشتی ئەڤ بیرە هشكبووی ل ٣ چریا ئێكێ ٢٠٠٧ێ بیرەكا سوری بۆ گوندی هاتییە كۆلان و ئاڤا وێ ب سەر مالاندا دابەشدبیت[١٥٥].

## گوندێ گەشكا زووری:

خەلكێ گوندی هەتا سالا ١٩٨٨ێ ئاكنجیێن كوگجەلی بوون ل مووسلێ پشتی كو حكومەتێ خانیێن وانا خرابكرین قەستا ڤی جهی كرن، سالا ١٩٨٩ێ ئەڤ گوندە ئاڤاكرن ب رەخ گوندێ گەشكا و ناڤێ گوندێ خو كرنە گەشكا زووری، گوند ب دووراتییا ٥٠كم دكەڤیتە رۆژهەلاتێ گردەسێن و ١٥كم ژ ئاكرێ دوورە.

### سنوورێن گوندی

**رۆژهەلات:** گوندێ چەم سماق

**رۆژئاڤای:** گوندێ خەرجاڤا

**باكووری:** گوندێ وەرملان

**باشووری:** گوندێ خاتوناوا

### پێکهاتا گوندی:

گوند تنێ ئێك مالباتە ئەوژی مالباتا (شێخا)نە و ب عەشیرەت سۆرچی نە، هژمارا خەلکێ گوندی ١٩ مالن.

ل ٢٠٠٥/٥/١٧ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییەڤەکرن، هەتا شەشێ بنەرەتی لێ دهێتە خواندن، سالا ١٩٩٣ێ هێلا کارەبێ گەهشتییە گوندی، سالا ٢٠١٠ێ پرۆژەیێ کارەبێ ب شێوەیەکێ باشتر ژلایێ حکۆمەتا هەرێمێ ڤە بۆ هاتییە کێشان، سالا ٢٠٠٨ێ مزگەفت لێ هاتییە ئاڤاکرن، ل ٢٠٠٧/٥/١٣ێ جادە بۆ گوندی هاتییە چێکرن.

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

ژێدەرێ ئاڤا گوندی ژ چوار بیران دهێت، بیرەکا ئیرتیوازی سالا ٢٠٠١ێ ژلایێ (رێکخراوا فاو) ڤە هاتییە کۆلان، سێ یێن دیتر بیرێن سوری نە، ئاڤا ڤەخوارنا گوندی ژ بیرا ئیتیوازی دهێت.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیانا خەلکێ گوندی هەمەجوورە وەك: خودانکرنا مەر و مالاتی و کارەشا، جۆتیاریا عەردێ ئاڤی وەکی برنج و بیستانا و کو ب رێکا بیرێن سوری دهێنە ئاڤدان، هندەك ژوانا ژی پێشمەرگەنە [١٥٦].

## گوندێ کورکان کێری:

ل دووڤ گۆتنا موختارێ گوندی ئاڤاکرنا گوندی ڤەدگەرێتە سەردەمێ ئینگلیزا ناڤبەرا سالێن (١٩٢٥-١٩٣٠)ێ هاتییە ئاڤاکرن، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ گوندی ١٦١ کەس بوو[١٥٧]، سالا ١٩٧٤ێ گوند ژلایێ حکۆمەتا بەعسڤە هاتییە وێرانکرن و سۆتن، سالا ١٩٧٥ێ خەلکێ وی ڤەگەریایە گوندی و جارەك دی ئاڤاکرییە ڤە، گوند ب دووراتییا ٤٠کم دکەڤیتە رۆژهەلاتێ گردەسێن و ٢٧کم ژ سەنتەرێ قەزا ئاکرێ دوورە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ چەم سماق

**باشووری،** گوندێ کورکان مسجد

**رۆژهەلات،** گوندێ گومکێ

**رۆژئاڤای،** گوندێ کورکان بەست

### پێکهاتا گوندی:

دناڤا گوندیدا تنێ ئێك مالبات هەیە ئەو (چاریوتی)نە ب عەشیرەت سۆرچی نە، و هژمارا خەلکێ گوندی بەری سالا (١٩٧٠)ێ ١٥- ٢٠ مال بوون، لێ نها هژمارا خەلکێ گوندی گەهشتییە نێزیکی ١٢٠ مالان.

سالا ١٩٨٢ێ هێلا کارەبێ بۆ گوندی هاتییەکێشان، سالا ٢٠١٤ێ مزگەفتا گوندی هاتییەچێکرن، هەر سال جادەیا گوندی ژ لایێ حکۆمەتێ ڤە دهێتە خوشکرن و پەستان، سالا ٢٠١٤ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ئاڤاکرن و هەتا پۆلا نەهێ لێ دهێتە خواندن.

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

د ناڤا گوندیدا هندەك کانی هەنە ژ وانا: کانییا ڤەدیم و کانییا گوندی، هەردیسان دو رووبارکێن بچویك دناڤا سنوورێن گوندی را دهێن، ئەوژی رووبارێ ئاکرێ و رووبارێ ئومەرخوشا نە، ژێدەرێ ئاڤا ڤەخوارنا گوندی ل سەر بیرەکا ئیرتیوازی یە کو ل سالا ١٩٩٩ێ هاتییە کۆلان و ئاڤا وێ ب سەر مالاندا دابەشدبیت.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیانا خەلکێ گوندی هەمەجوورە وەك: خودانکرنا مەر و مالاتی و کارەشا و هەردیسان جۆتیاریا عەردێ ئاڤی وەکی برنج و بیستانا و رەز و باغا وەك: خۆخ و هنار و هژیر ....هتد، هندەك ژی پێشمەرگە و فەرمانبەرن[١٥٨].

## گوندێ باشقال رەڤەند:

ڤەگێرانەکا نە بەرعاقل ل دور ناڤێ گۆندی ژ ئالیێ هندەك کەسانڤە دهێتەڤەگێران، هەژی ئاماژەپێکرنێ یە، ئەم دوورنابینین ئەڤ (باشقال)ە ژ هەمان ناڤێ (باشکال- باشقالا) باکوورێ کوردستانێ هاتبیت کو باژێرکەکە نێزیکی وانێ و خەلکێ وێ ژ (باشکال)ا باکوورێ کوردستانێ مشەخت بین

و هاتبنە ڤی جهی، ئانکو رەڤەندێن وێرێ بن ئەڤ باشکالە ل ڤێرێ ئا ڤاکربیت و ب باشکالا رەڤەندان هاتبیت ناڤکرن، د دەمێ نڤیسنێدا د نڤیسینێن حکۆمەتێدا کو ب ترکی و پاشتر ب عەرەبی بوونە ب باشقال هاتبیتەنڤیسین و نها ژی (باشکال) ا باکوورێ کوردستانێ ل جهم ترکان (باشقال)ە و دوور ناهێتەدیتن هەردو ژی د بنیاتدا (باش کەلا، باش قلعە) بن، گوند ب دووراتییا ١٥کم دکەڤیتە باکوورێ رۆژهەلاتا گردەسێن و ٥کم ژ ئاکرێ دوورە.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ گویسکێ

**باشووری:** گوندێ سیتکا مێرگین

**رۆژهەلات:** گوندێ جونا

**رۆژئاڤای:** گوندێ باشقال ئاغا

## پێکهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە د بنیاتدا ژ ئێك مالباتە ئەوژی مالباتا (حسێن)ە کو دبنە سێ برا و سەر ب عەشیرەتا زێباریا نە، ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ گوندی ١٥٧ کەس بوو[١٥٩]. خەلکێ گوندی بەری سالا (١٩٧٠)ێ ٤٠ - ٤٥ مال بوو، نها گەهشتینە نێزیکی ١٧٠ مالان.

دووڤ گۆتنا خەلکێ گوندی ئاڤاکرنا گوندی ڤەدگەریتەڤە بۆ چارێکا ئێکێ ژ سەدسالییا نوزدێ، سێ مزگەفت ل گوندی هەنە ئێك ل دووڤ گۆتنا خەلکێ دەڤەرێ سەردەمێ خەلیفە (عومەر کورێ عەبدۆلعەزیزی) هاتییەئاڤاکرن، ئەڤ گۆتنە یا بێ بەلگە و ژێدەرە لێ دیارە مزگەفت مزگەفتەکا کەڤنە و ئەڤە ژی نیشانا هندێ یە گوند ژ ڤێ مێژووا ئاماژە پێکری کەڤنترە یان ئەڤ گوندە ل سەر کاڤلێن گوندەکێ کەڤنتر هاتییەئاڤاکرن، نها ئەڤ مزگەفتە ژلایێ خەلکێ گوندی ڤە هاتییە نویژەنکرن و دوویێن دیتر ل سالێن ١٩٨٦و ٢٠١٢ێ هاتینە ئاڤاکرن، سالا ١٩٧٥ێ خواندنگەهـ ل گوندی هەبوویە و ل رێکەفتی ٢٠٠٤/٦/١٢ێ هەمان خواندنگەهـ هاتییە نووژەنکرن و بەرفرەهکرن، نها هەتا پۆلا نەهێ لێ دهێتە خواندن، سالا ١٩٦٩ێ هێلا کارەبێ بۆ گوندی هاتییە کێشان و سالا ١٩٧٨ێ جادە بۆ گوندی هاتییەچێکرن[١٦٠].

## شوینوار و جهێن کەڤنار:

دناڤا سنوورێن گوندی دا گەلەك جهێن شوینواری و کەڤنار هەنە تایبەت شکەفت وەك: شکەفتا مەلا زادە و شکەفتا خولی و شکەفتا بلند و شکەفتا خەمە گوری و شکەفتا تاوکێ و شکەفتا حەجی یونسی و شکەفتا مێوژێ و شکەفتا بنچەلکێ، ئەڤ شکەفتە هەمی کەڤنارن خەلکێ گوندی ناڤ دانانە سەر، هەردیسان عاقد ژی ل گوندی هەنە.

## جهێن بەرچاڤ و ناڤدار:

دناڤا سنوورێن گوندی دا گەلەك جهێن بەرچاڤ هەنە کو ژ لایێ خەلکێ گوندی ڤە دهێنە نیاسین وەك: شیڤا پەلکێ و هەوێزا حەجی عەلی و رەزێ بروناس و نەرمێ و دۆلا بەنا و دۆلا مشکوی و دۆلا حەمەغای و دۆلا بێیێ و دۆلا کوتانێ و دۆلا بادینی و دۆلا بیوکێ و کەڤ زێنوا و پاشگر و دۆلا بکتری و گرێ کوتانێ، و هەروەسا هندەك گۆرستانێن کەڤن ژی ل گوندی هەنە وەك: گۆرستانا پیر بداغ و گۆرستانا پیر ئومەر و گۆرستانا گەلوا جری و پیر گول و گۆرستانا دارکە کروسکێ و گۆرستانا گیرکە کنجر کو گەلەك ژوان گۆرستانان وەکو (عاقد) یێن هاتینە چێکرن، ل دووڤ گۆتنا خەلکێ گوندی کو ئەڤ گۆرستانە یێن ئێزدیا بوون دەمێ ل ڤی جهی فەرمانا وانا هاتییەکرن.

## ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل ناڤا گوندی هژمارەکا کانیێن ئاڤێ هەنە ژوانا: کانییا ژنکا، کانییا مێرا، کانییا سارکێ، کانییا کورکی، کانییا ژووری و کانییا دازینگ، و پرۆژەیێ

ئاڤا ڤەخوارنا گوندی هەتا سالا ٢٠٠٣ێ ژ پرۆژەیێ ئاڤا گردەسین دهات، سالا ٢٠٠٣ێ بیرەکا ئیرتیوازی بۆ گوندی هاتە کۆلان و سالا ٢٠١٤ بیرەکا دی ژی هاتە کۆلان و ئاڤا وان ب سەر مالان دابەشدبیت.

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیانا خەلکێ گوندی ل سەر خودانکرنا مەر و مالاتی و هەروەسا جۆتیاریا عەردی دێمی و چاندنا سماق و تری و باهیڤ، و هندەك ژی پێشمەرگە و فەرمانبەرن[١٦١].

## گوندێ بەهراوا موسا:

ل دووڤ گۆتنا خەلکێ گوندی هەردو گوند (بەهراوا موسا و بەهراوا فەقی عەلی) د ئێك دەمدا هاتینە ئاڤاکرن، موسا و فەقی عەلی خودانێت ڤان گوندا بوون لەوما ناڤێ گوندی کرنە (بەهراوا موسا و بەهراوا فەقی عەلی) ئانکو پشکا موسای و پشکا فەقی عەلی. گوند ب دووراتیا ٢٥کم دکەڤیتە باکوورێ رۆژهەلاتێ گردەسێن و ١٥کم ژ سەنتەرێ قەزا ئاکرێ دوورە.

## سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلات:** گوندێ کێلان

**رۆژئاڤای:** گوندێ سیتکان

**باکووری:** گوندێ بەهراوە فەقی عەلی و کەشان

**باشووری:** گوندێ دوستان و چەم سماق

## پێکهاتا گوندی:

دو مالبات مالباتێن (مام سال و مامانومر) ل گوندی هەنە، سەر ب عەشیرەتا سۆرچی نە، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ تنێ ٣٨ کەس ل گوندی دژیان[١٦٢]، خەلکێ گوندی بەری سالا (١٩٧٠)ێ ٧ - ١٠ مال بوون، نها نێزیکی ٧٠ێ مالانە.

ئاڤاکرنا گوندی ل دووڤ گۆتنا موختاری ڤەدگەریتەڤە سالێن بیستان کو دبێژیت باب و باپیرێن مە هەر ل ڤی گوندی ژیاینە، ل سالا ١٩٧٩ێ خەلکێ گوندی خواندنگەهـ بۆ گوندێ خۆ ئاڤاکرییە، سالا ١٩٨٨ێ هێلا کارەبێ بۆ گوندی هاتییە کێشان، سالا ١٩٩٦ێ ل هەمان جە حکۆمەتا هەرێمێ خواندنگەهەکا شەش پۆلی ئاڤاکرییە، د هەمان سالدا مزگەفتەك بۆ گوندی ئاڤاکرییە، ل سالا ٢٠١٠ێ جادە بۆ گوندی هاتییە چێکرن.

## ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

د ناڤا گوندی دا گەلەك کانی هەنە ژوانا: کانییا کوراڤ، کانییا مناسم، کانییا تورەشك و کانی سیێ، هەروەسا رووبارێ گەلیێ زەنتە دناڤا سنوورێن گوندی را دبووریت، ل ٨ کانوونا ئێکێ ١٩٩٨ێ پرۆژەیێ ئاڤا ڤەخوارنێ بۆ گوندی هاتییە چێکرن و ئاڤ ب سەر مالان دا دابەشدبیت.

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیانا خەلکێ گوندی ل سەر خودانکرنا مەر و مالاتی و هەروەسا چاندنا عەردێ ئاڤی تایبەت چاندنا چاندنا برنجی یە، هەردیسان رەز و باغا وەك: هنار و سێڤ و هژیر....هتد هەنە و چاندنا عەردێ دێمی وەکی گندورا و گەنم و جەهی ژی دکەن، هندەك ژوانا ژی پێشمەرگەنە[١٦٣].

## گوندێ بەهراوا فەقی عەلی:

هەمان بۆچوونا گوندێ بەهراوا موسا یە، گوند ب دووراتیا ١١کم دکەڤیتە باکوورێ رۆژهەلاتێ گردەسێن و ١٣کم ژ سەنتەرێ قەزا ئاکرێ دوورە.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ چەمەسێل

**باشووری:** گوندێ بەهراوا موسا

**رۆژهەلاتی:** گوندێ کەشان

**رۆژئاڤای:** گوندێ سیتکان

### پێكهاتا گوندی:

گوندی تنێ مالباتەك هەیە ئـەوژی مالباتا (مامانومر)ن و سەر ب عەشیرەتا سۆرچی نە، ل سالا ١٩٥٧ێ تنێ ٤٧ كەس ل گوندی دژیان[١٦٤]، نها خەلكێ گوندی ٢٠ مالن.

ئاڤاكرنا گوندی ڤەدگەریتەڤە سالێن بیستان، سالا ٢٠٠٠ێ خواندنگەهەكا سەرەتایی ل گوندی هاتیە ڤەكرن، سالا ٢٠١٣ێ مزگەفتەك ژی بۆ گوندی ئاڤاكرینە، سالا ١٩٧٨ێ هێلا كارەبێ گەهشتیە گوندی، سالا ٢٠٠٤ێ جادا گوندی هاتیە چێكرن.

### ژێدەرێ ئاڤا گوندی:

دناڤ گوندی دا گەلەك كانی هەنە ژوانا: كانییا دری و كانییا جوك و كانییا شور، ل ٣/١٠- ٢٠٠٧ێ پرۆژەیێ ئاڤا ڤەخوارنێ بۆ گوندی هاتیە چێكرن و ئاڤ ب سەر مالان دا دابەشدبیت..

### ژێدەرێ ژیارا گوندی:

ژیانا خەلكێ گوندی ل سەر خودانكرنا مەر و مالاتی و چێلا و هەروەسا جۆتیاریا عەردێ ئاڤی یە وەكی چاندنا برنجی و چاندنا عەردێ دێمی وەكی گەنم و جو، و هندەك ژوانا ژی پێشمەرگەنە[١٦٥].

## گوندێ كەندێ

ئاڤاكرنا گوندی ل دووڤ گۆتنا موختارێ گوندی ڤەدگەریتەڤە ناڤبەرا سالێن (١٩١٠-١٩٢٠)ێ كو دبێژیت باب و باپیرێن مە هەر ل ڤی گوندی ژیاینە، سالا ٢٠٠٣ێ جادە بۆ گوندی هاتیە چێكرن. گوند ب دووراتییا ٦٥كم دكەڤیتە باشوورێ رۆژهەلاتێ گردەسێن و ٧٠كم ژ سەنتەرێ قەزا ئاكرێ دوورە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ بەهراوە فەقی عەلی و كەشان.

**باشووری:** گوندێ دوستان و چەم سماق.

**رۆژهەلات:** گوندێ كێلان

**رۆژئاڤای:** گوندێ سیتكان.

### پێكهاتا گوندی:

گوندی ئێك مالبات هەیە ئەوژی مالباتا (مام سال)ن و سەر ب عەشیرەتا سۆرچی نە، و هژمارا خەلكێ گوندی ١٥ مالن.

ئەگەرێ زێدە نەبوونا مالان ب رێژەیەكا بەرچاڤ سەرەرای ڤێ چەندێ كو گوندەكێ كەڤنە دزڤریت بۆ وێ چەندێ كو ژ ئەگەرێ نەبوونا خزمەتگوزارییا بـەردەوام خەلكێ گوندی كوچكرییە بۆ گوند و دەڤەرێن دیتر.

هەروەسا ل سالا ٢٠٠٠ێ مولیدە یەكا حكومی بوو گوندی دانایە و كارەبا گوندی دابین دكەت، ژبەركو هەیا نها هێلا كارەبێ نەگەهشتییە گوندی سەرەرای نەبوونا خواندنگەهـ و مزگەفتێ.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیانا خەلكێ گوندی ل سەر خودانكرنا مەر و مالاتی و هندەك ژوانا ژی پێشمەرگەنە، هەیا نها چ پرۆژەیێن ئاڤا ڤەخوارنێ بۆ گوندی نەهاتینە چێكرن و خەلكی گوندی بخۆ ژبۆ ڤەخوارنا خۆ بیرێن ئاڤێ كولاینە [١٦٦].

## گوندێ سوسنا:

سەبارەت واتایا ناڤێ گوندی موختارێ گوندی دبێژیت: جۆرە بالندەیەك هەیە دبێژنێ (سوسك) كو هەر دبەرێدا هەتا ڤی دەمی ژی ئەڤ بالندەیە ل دەڤەرێ گەلەك یێ زۆرە و خەلكی دگۆتنێ گوندێ سوسكا و ب بوورینا دەمی گوهۆرین ب سەر ناڤی دا هاتییە و بوویە گوندێ (سوسنا)، گوند ب دووراتییا ١٥كم دكەڤیتە باكوورێ گردەسێن و ٧كم ژ سەنتەرێ قەزا ئاكرێ دوورە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ خەردس

**باشووری:** گوندێ راوێته
**رۆژهەلات:** گوندێ رەزوك
**رۆژئاڤای:** گوندێ كوزادارێ

## پێكهاتا گوندی:

دناڤا گوندی دا چوار عەشیرەت هەنە بەلێ دو ژوانا سەرەكینە و پتر ژ ٩٨٪ ئاكنجیێن گوندی پێكدئینن ئەوژی عەشیرەتا (خێل)ە، ئەڤ عەشیرەتە خۆ ب عەشیرەتا (جاف) ژی ددەنە نیاسین و دبنە چوار مالبات ئەوژی مالباتێن: مالا ئەحمەد، مالا حەمەی، دوكانی و مالە سورانی)نە، یا دیتر ژی عەشیرەتا زێباری نە دبنە دو مالبات (هەرنی و چاربوتی)نە و هژمارەكا كێم ژ هەردو عەشیرەتێن هەركی و گۆرانا ل گوندی هەنە.

ئاڤاكرنا گوندی ڤەدگەریتە ڤە بوو نیڤا ئێكێ ژ چەرخێ نوزدێ زایینی، هژمارا خەلكێ گوندی بەری سالا ١٩٧٠ێ ٩٠ - ١٠٠ مال بوو، نها ئەڤ ژمارە ب رێژەیەكا زۆر بەر ب زێدەبونێ ڤەیە و گەهشتییە نێزیكی ٨٠٠ مالان و ئەگەرێ ڤێ زێدەبونێ ژی دزڤریت بۆ جهێ گوندی كو جهەكێ ستراتیجییە و نێزیكە ژ بازێرێ ئاكرێ و دكەڤیتە سەر جادەیا سەرەكییا (ئاكرێ – قەسروك) كو ئەڤ جادە ل بەری سالا ١٩٩١ێ هاتییە چێكرن.

هەروەسا ئەڤ گوندە ل سالێن شێستان ژلایێ حكۆمەتا بەعسڤە هاتە سۆتن و وێرانكرن و پشتی بەیانا ١١ێ ئادارا ١٩٧٠ێ خەلكێ وی زڤرین گوندی جارەك دی گوند ئاڤاكرەڤە.

ل گوندی (بنگەهێ ساخلەمیا سوسنا) و (بنگەهێ شیرەتكارێ كشتوكالییا سوسنا) و پێنج مزگەفت هەنە كو ل سالێن:١٩٧٠، ٢٠٠٩، ٢٠١٠، ٢٠١٤ێ هاتینە ئاڤاكرن و هێلا كارەبا ل سالێن حەفتێیان گەهشتییە گوندی.

**گوندێ سوسنا**



### زێدەرێن ئاڤا گوندی:

دناڤا گوندی دا شەش بیرێن ئیرتیوازی هەنە كو سێ ژوانا ل رێكەفتی (٢٤-تیرمەها ١٩٩٩)ێ هاتینە چێكرن و هەروەسا یێن دیتر ل سالێن ١٩٩٨، ٢٠٠٢، ٢٠٠٦ێ هاتینە چێكرن و ئاڤا وان ب سەر مالاندا دابەشدبیت.

### زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیانا هندەك ژ گوندیان ل سەر خودانكرنا مەر و مالاتی و چاندنا دێمە و هەروەسا بەشەك زۆر ژ خەلكێ گوندی پێشمەرگەنە.

ل گوندی سێ خواندنگەهە هەنە خواندنگەهەكا بنەرەتی سالا ١٩٧٩ێ هاتییە ئاڤاكرن و خواندنگەهەكا ناڤنجی و ئامادەیی ل سالا (٢٠١٢-٢٠١٣)ێ هاتییە ئاڤاكرن و خواندنگەهەكا دی یا بنەرەتی ئەوژی ل سالا ٢٠١٤ێ هاتی یە ئاڤاكرن.

### جهێن بەرچاڤ و ناڤدار:

دناڤا گوندی دا گەلەك جهێن بەرچاڤ و ناڤدار هەنە كو ژلایێ خەلكی ڤە دهێنە نیاسین وەكی (دۆلا ساریجێ و دۆلا بەنوكێ دۆلا كفرێ و مغبەرا كەڤنیێ و باسكێ زیارەتوكا و دۆلا عەولای و خەلیلانێ و سافردارێ و عەردێ مهەندسی و كانی خاتین زەلیخایێ و كەڤنە بیرێ)[١٦٧].

## گوندێ كەلەدێرێ:

ناڤێ گوندی ژ دوو برگەیان پێكدهێت (كەل+دێر) كو ناڤێ دو جهێن شوینواری نە كو دكەڤنە ناڤا سنوورێن گوندی دا ئەوژی شوینوارێ كەلهەكێ یە كو بانێ كەلهێ دێرەك ل خۆ گرتبوو ژبەر وێ یەكێ ناڤێ گوندی كرینە (كەلەدێر)، گوند ب دووراتییا ٣٠كم دكەڤیتە رۆژهەلاتێ ناحیا گردەسێن و ٥٠كم ژ سەنتەرێ قەزا ئاكرێ دوورە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ باسەوێ

**باشووری:** گوندێ بەردەسور

**رۆژهەلات:** گوندێ گەرێ

**رۆژئاڤای:** گوندێ رەبەنا

### پێكهاتا گوندی:

دناڤا گوندی دا ئێك مالبات هەیە ئەوژی ب مالباتا (كەلەدێری) ناڤدارن، سەر ب عەشیرەتا سۆرچی نە، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلكێ گوندی ٦٤ كەس بوو[١٦٨]، نهاژی خەلكێ گوندی ٤٦ مالن.

و ئەڤ گوندە یێ كەڤنارە كو دبەرێ دا (جوهی) لێ بوونە و پاشی (فەلە)، و پاشی دناڤبەرا سالێن (١٩١٠-١٩٢٠)ێ عەشیرەتا سۆرچی چوینە سەر ڤی گوندی پشتی فەلەیان ل ڤی جهی كوچكری بۆ دەشتا موسل.

ل ٢٩ تیرمەها ٢٠٠٦ێ خواندنگەهەكا بنەرەتی ل گوندی هاتییە ئاڤاكرن، سالا ٢٠٠٥ێ مزگەفت ل گوندی ئاڤاكرینە، سالا ٢٠٠٩ێ هێلا كارەبێ بۆ گوندی هاتییە كێشان، جادەیا گوندی زفتە و هەر چەند سالەكان جارەكێ دهێتە نویژەنكرن ژلایێ بازێرڤانییا ئاكرێ ڤە.

### زێدەرێن ئاڤا گوندی:

دناڤا گوندی دا هندەك كانی هەنە ژ وانا (كانییا گورگەما و كانییا صەفێ و كانییا گوندی)، و رووبارەكێ بچویك ژی دناڤا گوندی را دبووریت و هەروەسا بیرێن ئاڤێ ژ لایێ گوندییان ڤە هاتینە كۆلان و ئاڤا ڤەخوارنێ ژ وان بیران هەلدكێشن.

### زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا خەلكێ گوندی ل سەر خودانكرنا مەر و مالاتی و چاندنا ئاڤییە، هەروەسا هندەك ژوانا ژی پێشمەرگەنە[١٦٩]

### شوینوار و جهێن كەڤنار:

د ناڤا گوندیدا كەلایەك هەیە ژ ئاخێ هاتییە

دروستکرن، بانێ کەلهێ دێرەك ل خۆ گرتبوو، پرانییا سیمایێ کەلهێ ب ئەگەرا بارانان هاتییە تێکدان و رامالین و بوویە ئەگەرێ نەمانا شویرهە و رێکێن وێ و پرانییا شوینوارێن کەلایێ، ژ ئەنجامێ بارانێن وەرزێ زڤستانێ، ل دووڤ گۆتنا خەلکێ گوندی چەندین جاران دگەل رامالینا ئاخێ پارچەیێن جەرك و کوسك و ئامانان ژ لایێ وانڤە هاتینە دیتن، ئەگەرێ نەبوونا رێکێ و رك و لویسییا ئەڤرازی کێم کەس دکارن بگەهنە بانێ کەلێ کو ژ بانییەکا شێوە بازنەیی پێکهاتییە، ژ چەند ئالانڤە هاتییە خۆشین و هەرفتییە، ژبلی شوینوارێ گۆرستانەکێ و ئێك بنەدار و چەند کویراتییان تشتەك دی بەرچاڤ نابیت.

هەرچەندە سەردەمێ دەسپێکا ئاڤاکرنا کەلایێ نە ئاشکەرایە و بەلگەیێن پشتراست ل دوور سەردەمێ وێ و هەروەسا گرنگیا رولێ گێرای بەردەست نینن، لێ تێ هزرکرن ئەڤ کەلایە بوو سەردەمێ ساسانیان ڤە بگەرێتەوە.

هەردیسان دێرا کەلایێ بنگەهەکێ ئایینی یێ گرنگ و کاریگەر بوویە ل دەڤەرێ و سەر کێشیا تیرا فەلێن سریانی ئەوێن ل گوندێن دەڤەرێن رۆژئاڤای زێ بادینان د چارچوڤێ دەڤەرێدا کری یە[۱۷۰].

## گوندێ بەردەسمت:

ل دوور گۆتنا موختارێ گوندی ل ڤی جهی بەردەکێ مەزن و کەڤنار هەیە و ئەڤ بەردە یێ کونە ئانکو یێ (سمتی)یە و ناڤێ گوندی ژ ڤی بەردی هاتییە و ب (بەردەسمت) هاتییەناڤکرن، گوند ب دووراتییا ۱۰کم دکەڤیتە رۆژهەلاتێ ناحیا گردەسێن و ۲۰کم ژ سەنتەرێ قەزا ئاکرێ دوورە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ کورکان مەسجد

**باشووری،** گوندێ درەش

**رۆژهەلات،** گوندێ باسەوێ

**رۆژئاڤای،** گوندێ سەردەریان.

### پێکهاتا گوندی:

دناڤا گوندی دا ئێك مالبات هەیە ئەوژی مالباتا (مام سال)ن و سەر ب عەشیرەتا سۆرچی نە، هژمارا خەلکێ گوندی ۳۰ مالن.

ئەڤ گوندە ل سالا ۱۹٤۳ێ ژ لایێ خەلکێ گوندی هاتییە ئاڤاکرن، ل سالا ۱۹۷۳ێ گوند هاتییە سۆتن و وێرانکرن ژ لایێ حکۆمەتا بەعسڤە و خەلکێ وی ب ناچاری گوند هێلایە، هەتا ل سالا ۱۹۹۹ێ زڤرینە گوندی و گوند دووبارە ئاڤاکرییە.

هەروەسا ل سالا ۲۰۰۰ێ خواندنگەهەکا سەرەتایی ل گوندی هاتییە ئاڤاکرن، سالا ۲۰۰۷ێ مزگەفت ل گوندی ئاڤاکرینە و سالا ۲۰۱۲ێ هێلا کارەبێ گەهشتیە گوندی و سالا ۲۰۱۲ێ جادا گوندی چێکرینە.

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

گوندی هندەك کانی هەنە ژ وانا: کانییا زەردك و کانییا بەرۆژێ و کانییا کورەدارێ، و سالا ۲۰۱۰ێ بیرەکا ئیرتیوازی بۆ گوندی هاتییە کۆلان و ئاڤا وێ ل سەر مالان دابەشدبیت.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیانا خەلکێ گوندی ل سەر خودانکرنا مەر و مالاتی و چاندنا دێمە و هندەك ژی پێشمەرگەنە[۱۷۱].

## گوندێ بانەسور:

ناڤێ گوندی ژ سرۆشتێ ئاخا گوندی هاتییە کو ئاخەکا سورە، هەردیسان دناڤا گوندی دا بانییەك هەیە ئاخا وێ یا سورە و ژبەر ڤێ یەکێ ناڤێ گوندی کری یە (بانە سور)، گوند ۲۵کم ژ گردەسێن دوورە ژلایێ باکووری ڤە و ۹کم ژ سەنتەرێ قەزا ئاکرێ دوورە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** کەلیێ زنتا

**باشووری،** گوندێ نهاوا

**رۆژهەلات:** گوندێ دزوك

**رۆژئاڤای:** گوندێ مێرگین

## پێکهاتا گوندی:

گوندی هەمی ژ ئایینێ مەسیحی نە، خەلکێ وێ نێزیکی ٨٥ مالانە، ئەڤ گوندە ل سالا ٢٠٠٧ێ ژلایێ حکومەتا هەرێمێ ڤە بۆ وان هاتە ئاڤاکرن، د هەمان سالدا دێرەك بۆ گوندی ئاڤاکرییە و کارەبێ گەهاندییە گوندی، سالا ٢٠١٥ێ جادا گوندی هاتییەچێکرن.

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیانا خەلکێ گوندی سەر خودانکرنا مەر و مالاتی و هندەك ژوانا ژی پێشمەرگەنە، سالا ٢٠٠٧ێ پرۆژەیێ ئاڤا ڤەخوارنێ ل گوندی هاتییە چێکرن [١٧٤].

## گوندێ بانەمل:

ئاڤاکرنا گوندی ڤەدگەریتە ڤە بوو سالا ١٩٥٠ێ کو ژلایێ خەلکێ گوندی ڤە هاتییە ئاڤاکرن، سالا ٢٠٠٢ێ خواندنگەها گوندی هاتییە ئاڤاکرن و هەتا پۆلا شەشێ بنەرەتی لێ دهێتە خواندن، دناڤا گوندی دا دو مزگەفت هەنە سالێن (٢٠٠٠ و ٢٠١٤) ێ هاتینەئاڤاکرن، ئێك ژوانا ژ لایێ خێرخوازەکیڤە هاتییە ئاڤاکرن، سالا ١٩٨٧ێ هێلا کارەبێ گەهشتییە گوندی، گوند ٣٠کم ژ باکوورێ گردەسێن دوورە و ٨کم ژ سەنتەرێ قەزا ئاکرێ دوورە.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ سیتکان

**باشووری،** گوندێ وەرملا و نێرگزین

**گوندێ بانەسور**



**رۆژهەلاتێ:** گوندێ خەلین

**رۆژئاڤای:** گوندێ شیڤرەزان

## پێكهاتا گوندی:

دناڤا گوندی دا ئێك مالبات هەیە ئەوژی مالباتا (مام لەست)ە سەر ب عەشیرەتا سۆرچی یە، و هژمارا خەلكێ گوندی بەری سالا ۱۹۷۰ێ تنێ سێ مال ل گوندی دژیان، نها هژمارا وان گەهشتییە ۲۰ مالان.

## ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

دناڤا گوندی دا رووبارەكێ ئاڤێ هەیە كو ژ ئاكرێ دهێت و دناڤا گوندی را دبووریت، و ل دەسپێكێ ژێدەرێ ئاڤا گوندی یا ڤەخوارنێ ل سەر كۆلانا بیرێن سەر عەردی بوو، هەتا سالا ۲۰۱۰ێ بیرەكا ئیرتیوازی ل گوندی هاتییەكۆلان و ئاڤا وێ ل سەر مالان دابەشدبیت.

## ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

خەلكێ گوندی چاندنا دێم و ئاڤی دكەن و هندەك ژی پێشمەرگەنە.

جهێن بەرچاڤ و ناڤدار ل گوندی: ئەڤ جهەنە: دۆلا شیومارێ رەش و دۆلا قەسەلكێ و ئاڤ گوردەم[۱۷۳].

## گوندێ بەراك:

هەبوونا گوندی ڤەدگەریتە ڤە بوو سەردەمێ (جوهی)یان كو ل ڤی جهی ژیاینە، و پشتی كوچكرنا (جوهی) یان بۆ ئیسرائیلێ ل دووڤرا فەلە ل ڤی گوندی ئاكنجی بووینە و پاشی وانا ژی كوچكرییە دەشتا مووسل، دووڤرا بوویە مولكێ (شێخ تەقێ دینێ سۆرچی) كو شێخەكێ سۆرچی یانە و پاشی ل سالا ۱۹۵۸ێ ئاكنجیێن گوندی ئەڤ جهە ژ شێخ تەقێ دینی كرییە و بوویە مولكێ وان.

گوندێ بەراك



### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ گەشكا ژێری.

**باشووری:** گوندێ درین شێخ و مەلكێ حەسەن ئاغا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ خاتوناوا.

**رۆژئاڤای:** گوندێ درین خواجە.

هەروەسا گوند ١٥كم ژ باكوورێ رۆژهەلاتێ سەنتەرێ ناحیا گردەسێن دووره و ١٣كم ژ سەنتەرێ قەزا ئاكرێ دووره.

### پێكهاتا گوندی:

دناڤا گوندی دا ئێك مالبات هەیە ئەوژی مالباتا (چاربوتی)نە و سەر ب عەشیرەتا سۆرچی نە، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلكێ گوندی ١٦٤كەس بوو[١٧٤]، خەلكێ گوندی بەری سالا ١٩٧٠ێ ١٥ - ٢٠ مالان بوو و نها هژمارا وان گەهشتی یە نێزیكی ٩٠ مالان.

هەر ژ سالا ١٩٧٧ێ خواندنگەهـ ل گوندی هەبوویە لێ ئاڤاهیەكێ كەڤن و بچویك بوو، هەتا ئاڤاهییەكێ نوو ژ لایێ حكۆمەتا هەرێما كوردستانێ ڤە بۆ هاتییەئاڤاكرن و ئاڤاهی ل رۆژا ٥ێ كانوونا دووێ ٢٠٠٥ێ هاتەڤەكرن، و ل سالا ١٩٨٧ێ هێلا كارەبێ بۆ گوندی هاتییە كێشان، سالا ٢٠٠٠ێ مزگەفت ل گوندی هاتییە ئاڤاكرن، سالێن نوتان جادا گوندی هاتییە چێكرن.

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

دناڤا گوندی دا دو رووبارێن بچویك هەنە كو ئێك ژ خەرجەوا دهێت و یێ دیتر رووبارێ بەراكێ یە، دەسپێكێ ژێدەرێ ئاڤا گوندی یا ڤەخوارنێ ل سەر كۆلانا بیرێن سەر عەردی بوو، هەتا ل ٢٤ تیرمەها ١٩٩٩ێ بیرەكا ئیرتیوازی بۆ گوندی هاتییە كۆلان.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا خەلكێ گوندی پتر جۆرێن چاندنا دێم و ئاڤییە، هندەك ژی پێشمەرگەنە[١٧٥].

### شوینوارێن گوندی:

بەراك ئێك ژ وان گوندێن دەڤەرێ یە یێن هژمارەكا زۆر ژ پاشمایێن جڤاكێن دەسپێكی یێن كەڤن لێ هاتینەدیتن، ئەو شوینوارێن ل ڤی جهی هاتینەدیتن بۆ چەرخێ بەردینێ ناڤین ڤەدگەرنەڤە، هەروەسان ئەو پاشمایێن ل ڤی گوندی و گوندێ بێخمێ هاتینەدیتن ژ هەمان توخم و تەرزێ پاشماییانە یێن زانایێ ئەمریكی (دورتی گارود) ل سالا ١٩٢٨ێ ل هەردو شكەفتێن زەرزی و هەزار مێرد دیتین و بۆ چاخێ بەردینێ كەڤن ڤەدگەرنەڤە و ژیێ وان ژ دوازده هزار سالان پترە[١٧٦].

### گوندێ سوركان:

ل دووڤ گۆتنا خەلكێ گوندی و موختارێ وێ ناڤێ گوندی یێ ژ ناڤێ كەڤرێن سور هاتی كو گەلەك كەڤرێن سور ل ڤێ دەڤەرێ هەنە لەوما ناڤێ گوندی كرینە (سوركان)، گوند ٦٠كم ژ رۆژهەلاتێ گردەسێن دووره و ٣٠كم ژ سەنتەرێ قەزا ئاكرێ دووره.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** زێیێ مەزن.

**باشووری:** گوندێ كێلە شێخ بزن.

**رۆژهەلات:** زێیێ مەزن.

**رۆژئاڤای:** گوندێ سەركەڤركو گوندێ گەرێ.

### پێكهاتا گوندی:

دناڤا گوندی دا ئێك مالبات هەیە ئەوژی مالباتا (مام كەكور)ن، سەر ب عەشیرەتا سۆرچی نە، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلكێ گوندی ٢٢٠ كەس بوو[١٧٧]، خەلكێ گوندی بەری سالا ١٩٧٠ێ ١٠ - ١٥ مالان بوو و نها هژمارا وان گەهشتییە نێزیكی ٦٥ مالان.

ئاڤاكرنا گوندی ڤەدگەریتە سالێن بیستان، سالا ٢٠٠٢ێ خواندنگەها گوندی هاتییە ئاڤاكرن، هەتا پۆلا شەشێ سەرەتایی لێ دهێتەخواندن، سالا ١٩٨٩ێ هێلا كارەبێ گەهشتییە گوندی، سالا ٢٠٠١ێ مزگەفتا گوندی هاتییە ئاڤاكرن، سالا ٢٠٠٠ێ جادە گەهشتییە گوندی.

**ژێدەرێن ئاڤا گوندی:**

ژێدەرێ ئاڤا گوندی هەیا سالا ۲۰۰۷ێ ژی ل سەر بیرەكا ئیرتیوازی بوو كو ژلایێ حكۆمەتا هەرێمێ ڤە هاتبوو كۆلان، لێ ئەڤ بیرە هشك بوویە نها ئاڤا ڤەخوارنا گوندی ل سەر بیرێن سەر عەردە نە ژ لایێ خەلكێ گوندی ڤە هاتینە كۆلان.

**ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:**

ژیانا خەلكێ گوندی پتر ل سەر جۆتیاریا عەردێ ئاڤی یە وەكی بیستانێن باجانكا و لوبك و خیار و تماتا....هتد و هەردیسان جۆتیاریا عەردێ دێمی گەنم و جو و هندەك ژوانا ژی پێشمەرگەنە(۱۷۸).

## گوندێ خەلێن:

ئاڤاكرنا گوندی ڤەدگەریتە داویا سەدسالیا نوزدێ كو ژلایێ باب و باپیرێن خەلكێ گوندی هاتییە ئاڤاكرن، گوند سالا ۱۹۷٤ێ ژلایێ حكۆمەتا بەعسڤە هاتییە سۆتن و ویرانكرن و پاشی هەر ل سالا دووڤرا خەلك زڤرینە گوندی و دووبارە گوند ئاڤاكرییە ڤە، گوند ۳۰كم ژ باكوورێ رۆژهەلاتێ گردەسێن دوورە و ۲٥كم ژ سەنتەرێ قەزا ئاكرێ دوورە.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێ سیتكان و بەهراوە فەقی عەلی و بەهراوە موسا.

**باشووری:** گوندێ كەشكا ژووری و كەشكا ژێری.

**رۆژهەلاتێ:** گوندێ دوستان و چەم سماق.

**رۆژئاڤای:** گوندێ وەرملان.

**پێكهاتا گوندی:**

دناڤا گوندی دا سێ مالبات مالباتێن: ماما نومە و مام سال و مام بال هەنە، سەر ب عەشیرەتا

گوندێ خەلێن



سۆرچی نە، ل سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ گوندی ١٤٧کەس بوو[١٧٩]، خەلکێ گوندی بەری سالا ١٩٧٠ێ ١٥ - ٢٠ مالان بوو و نها هژمارا وان نێزیکی ٧٠ مالانە.

سالا ٢٠١٥ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ئاڤاکرن و هەتا پۆلا شەشێ سەرەتایی لێ دهێتە خواندن، سالا ١٩٨٨ێ هێلا کارەبێ بۆ گوندی هاتییە کێشان، سالا ٢٠٠٢ێ مزگەفت لێ هاتییەئاڤاکرن و سالا ١٩٩٨ێ جادە گەهشتییە گوندی.

## ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

دناڤا گوندی دا گەلەك كانیێن ئاڤێ هەنە ژوانا: كانییا شفكە گاعونێ و كانییا سەردارا و كانییا هەڤێزە ساردێ كانییا گوماڤا و كانییا سۆرچێ، و د ناڤا گوندی دا رووبارەکێ ئاڤێ ژی هەیە کو ژ ئاکرێ دهێت و دناڤا گوندی را دبووریت، دەسپێکێ ژێدەرێ ئاڤا گوندی یا ڤەخوارنێ ژ کانییا سۆرچێ بوو، سالا ٢٠٠٥ێ بیرەکا ئیرتیوازی بۆ گوندی هاتەچێکرن و ئاڤا وێ ب سەر مالان دابەشدبیت.

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیارا خەلکێ گوندی پتر ل سەر چاندنا دێم و ئاڤییە، ئاڤی برنجی و لوبیك و خیار و تەماتە کەسکاتیێن دیتر و دێم گەنم و جەهی دچینن، هندەك ژوانا ژی پێشمەرگەنە[١٨٠].

# گوندێ جونان:

ئاڤاکرنا گوندی ڤەدگەریتە نیڤا ئێکێ ژ سەدسالیا نوزدێ کو ژلایێ باپیرە گەورەیێ گوندییانڤە هاتییەئاڤاکرن، ئەڤ گوندە ل دەسپێکا سالێن حەفتییان ژلایێ حکۆمەتا بەعسڤە هاتییەسۆتن و وێرانکرن، سالا ١٩٧٥ێ خەلك زڤرینە گوندی و دووبارە گوند ئاڤاکرییە ڤە، گوند ٣٠کم ژ باکوورێ گردەسێن و ٥کم ژ سەنتەرێ قەزا ئاکرێ دوورە.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری**، گوندێ سەرگەلی
**باشووری**، گوندێ باشقال رەڤەند و ئێکمالە
**رۆژهەلاتێ**، گەلیێ زنتا و گوندێ مێرگین
**رۆژئاڤای**، گوندێ باشقال ئاغا

## پێکهاتا گوندی:

دناڤا گوندی دا ئێك مالبات هەیە ئەوژی مالباتا (جونا)یە و سەر ب عەشیرەتا زێباری یا ڤەنە، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ گوندی ٩٣ کەس بوو[١٨١]، خەلکێ گوندی بەری سالا ١٩٧٠ێ ٥ - ١٠ مال بوو و نها هژمارا وان گەهشتییە ٣٠ مالان، هەرچەندە گوندەکێ کەڤنارە لێ هەیا نها هژمارا گوندییان ب رێژەیەکا زۆر و بەرچاڤ بەر ب زێدەبونێ ڤە نەچوویە.

سالا ١٩٩١ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ئاڤاکرن و هەتا پۆلا شەشێ سەرەتایی لێ دهێتە خواندن، سالێن حەفتێیان هێلا کارەبێ گەهشتبوو گوندی، دو مزگەفت ل گوندی هەنە و گوند دکەڤیتە سەر جادەیا (ئاکرێ – هەولێر).

## ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

دناڤا گوندیدا گەلەك كانیێن ئاڤێ هەنە ژوانا: کانییا مسلیان و کانی مام دەلا و کانییا شیوە کیرێ و ل دەسپێکێ ژێدەرێ ئاڤا گوندی یا ڤەخوارنێ ژ کانییا مسلیان بوو و پاشی ل ١٣ چریا ئێکێ ٢٠٠٧ێ بیرەکا ئیرتیوازی ل گوندی هاتە کۆلان و ئاڤا وێ ب سەر مالان دابەشدبیت.

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیانا خەلکێ گوندی ل سەر چاندنا دێم و ئاڤییە، گەنم جەە جۆرێن فێقی و کەسکاتی بەرهەم دئینن، هندەك ژ وانا ژی پێشمەرگەنە[١٨٢].

# گوندێ دوستان:

ل دووڤ گۆتنا موختارێ گوندی ئاڤاکرنا دزڤریتەڤە دەسپێکا سەدسالیا بیستێ، گوند ٣٠کم ژ باکوورێ رۆژهەلاتی گردەسێن دوورە و ٢٥کم ژ ئاکرێ دوورە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ بەهراوە موسا

**باشووری:** گوندێ گەشکا ژووری

**رۆژهەلات:** چەم سماق

**رۆژئاڤای:** گوندێ خەلین

### پێکهاتا گوندی:

دناڤا گوندیدا ئێك مالبات هەیە ئەوژی مالباتا (ماموسەر)ن و سەر ب عەشیرەتا سورچی یە، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ گوندی ٦٩ کەس بوو[١٨٣]، بەری سالا ١٩٧٠ێ ٥ - ١٠ مال ل گوندی دژیان، نها هژمارا وان گەهشتی یە ٤٥ مالان.

سالا ٢٠٠٢ێ خواندنگەهـ بۆ گوندی هاتیە ئاڤاکرن و هەتا پۆلا شەشێ سەرەتایی لێ دهێتە خواندن، دو مزگەفت ل گوندی هەنە سالێن (٢٠٠١ و ٢٠١٦)ێ هاتینە ئاڤاکرن سالا ١٩٨٧ێ هێلا کارەبێ بۆ گوندی هاتیەکێشان و جادەیا گوندی هەیا نها ژی ئاخە و هەر سال دهێتە خوشکرن.

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

دناڤا گوندی دا گەلەك کانیێن ئاڤێ هەنە ژوانا: کانیا کژێ عەرەبا و کانیا گرکە رەبەن و کانیا ئاشوکە و هەردیسان رووبارێ ئاکرێ دناڤا گوندی را دبووریت و ل سالا ٢٠٠٣ێ بیرەکا ئیرتیوازی بۆ گوندی هاتیە چێکرن و ئاڤا وێ ل سەر مالان دابەشدبیت.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

خەلکێ گوندی هەردو جۆرێن چاندنێ دێم و ئاڤی دکەن و هندەك ژوانا ژی پێشمەرگەنە[١٨٤].

## گوندێ گرگۆران:

ل دووڤ گۆتنا خەلکێ گوندی د بەرێدا عەشیرەتا گۆران ل ڤی گوندی لێ بوونە، د ناڤا سنوورێن گوندیدا گرەك هەیە دگۆتنێ گرێ گوارنا، ب بوورینا دەمی ئەڤ ناڤە هاتیە گوهۆرین سڤك بوویە و بوویە (گرگۆران)، گوند ٤٢کم ژ باشوورێ رۆژئاڤای گردەسێن و ٤٣کم ژ سەنتەرێ قەزا ئاکرێ دوورە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ سالەیێ و کیشکی و لەکان.

**باشووری:** باژەروکێ قەسروك.

**رۆژهەلاتی:** کۆمەاگەها خەلیلکان.

**رۆژئاڤای:** باژێروکێ قەسروکێ.

### پێکهاتا گوندی:

دناڤا گوندیدا دو عەشیرەت هەنە ئەوژی زێباری ژ چوار گوندێن زێبارێ: بانی، سرانی، کافی و باکرمانی نە، عەشیرەتا مزووری ئەوژی ژ گوندێن (شێخکی و خنسی)نە، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ گوندی ١٤١ کەس بوو، وی دەمی سەر ب ناحیا بەردەرەش بوو[١٨٥]، خەلکێ گوندی بەری سالا ١٩٧٠ێ ١٠٠ - ١٢٠ مال بوون، نها ئەڤ ژمارەیە گەهشتی یە نێزیکی ٢٨٠ێ مالان.

ئاڤاکرنا گوندی ڤەدگەریتەڤە داویا سەردەمێ دەولەتا عوسمانی، سالا ١٩٧٤ێ گوند ژ لایێ حکۆمەتا بەعسڤە هاتیە سۆتن و وێرانکرن، دووڤرا خەلکێ گوندی زڤرینە سەر مالێن خوە و دووبارە گوند ئاڤاکرەڤە، سالا ١٩٧٧ێ هێلا کارەبێ بۆ گوندی هاتیە کێشان و هەر ل سالێن حەفتێیان جادە گەهشتیە گوندی، سالا ١٩٨٠ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتیە ئاڤاکرن و هەتا پۆلا دوازدێ ئامادەیی لێ دهێتە خواندن، سالا ٢٠١١ێ مزگەفتەکا مەزن ل گوندی هاتیە ئاڤاکرن.

### ژێدەرێ ئاڤا گوندی:

دناڤا سنوورێن گوندی دا هندەك کانیێن ئاڤێ هەنە ژوانا: کانیا بەرگوندی و کانیا مزگەفتێ و کانیا مغبەرێ و کانیا حەجی محێ دینی و رووبارێ خازر دبەر گوندی را دبووریت، ئاڤا ڤەخوارنا گوندی

ل سەر دو بیرێن ئیرتیوازی نە کو ل سالێن (١٩٨٠ و ٢٠٠٤)ێ ل گوندی هاتینە کۆلان و ئاڤا ڤان ل سەر مالان دابەشدبیت.

### زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیارا خەلکێ گوندی پتر ل سەر چاندنێ دێم و ئاڤی و خودانکرنا مەر و مالاتی یە و هندەك ژوانا ژی پێشمەرگەنە[١٨٦].

### گوندێ خرابە شاهـ:

سەبارەت واتایا ناڤێ گوندی خەلکێ گوندی دبێژن: هەر ژ کەڤندا ئەڤ جهە گوند بوویە لێ ژبەر هوکارەکێ نادیار گوند هاتییە بەردان و وێرانکرن، ناڤێ (خرابە شاهـ) ژی هەر ژ گوندی وێرانکری ڤە بۆ مایە. هەژییە ل ڤێرێ بێژین پەیڤا خرابە د کوردەواری دا بۆ وان گوندێن بەردای د هێتەگۆتن یێن ژ ئەنجامێ دوورکەتنا خەلکێ گوندی ژ گوندی خرابووین و بسەرێکدا هەرفتین و چەندین گوند ل دەڤەرێ ب ناڤێ خرابە... هەنە. گوند ٣٦کم ژ مەلبەندێ ناحیا گردەسێن دوورە ژلایێ باکووری رۆژئاڤایڤە و ٤٣کم ژ ئاکرێ دوورە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ لەکان.

**باشووری،** گوندێ جەریدوك و ئومەر سێنا .

**رۆژهەلات،** گوندێ کیشکی.

**رۆژئاڤای،** گوندێ کرگۆران.

### پێکهاتا گوندی:

دناڤا گوندیدا ئێك مالبات هەیە ئەوژی مالباتا (مالە سوار)ن و سەر ب عەشیرەتا هەرکی نە، و هژمارا خەلکێ گوندی ١٥ مالن.

گوندێ خرابە شاه



گوند ل سالا ۲۰۰۷ێ هاتییە ئاڤاكرن، دكەڤیتە سەر جادەیا گوندێ كیشكی كو سالا ۲۰۰۰ێ هاتییەچێكرن، سالا ۲۰۰۸ێ هێلا كارەبێ بۆ گوندی هاتی یە كێشان.

## ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیانا خەلكێ گوندی ل سەر جۆتیاریا عەردێ ئاڤی وەكی برنج و ماش و كونجی كو ل بەر ئاڤا بیرەكا سووری دهێنە چاندن و هەردیسان جۆتیاریا عەردێ دێمی گەنم و جو دكەن و هندەك ژ وانا ژی پێشمەرگە و فەرمانبەرن.

سالا ۲۰۱۲ێ بیرەكا ئیرتیوازی بۆ گوندی هاتییە كۆلان و ئاڤا وێ سەر مالان دابەشدبیت[۱۸۷].

## گوندێ شاب ئومەر:

ل دوور واتایا ناڤێ گوندی موختارێ گوندی دبێژیت: جهێ گوندی جهەكێ كەڤنارە كو مێژوویا ڤی ڤەدگەریتە ڤە بۆ سەردەمێ (جوهی) ل ئاكرێ ئاكنجی، (شاب ئومەر) ل ی سەردەمی ل ڤی جهی هاتییەكرن، ئانكو ئەڤ ناڤە ژ (جوهی)یان بۆ مایە.

## سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ دزوك و مێرگین.

**باشووری،** گوندێ سمێلان و شیڤرەزان و سیتكان.

**رۆژهەلات،** گوندێ نەهاوا و بەهراوە فەقی عەلی.

**رۆژئاڤای،** گوندێ زەرگێزا باشقال رەڤەند.

هەروەسا گوند ۳۵كم ژ باكوورێ رۆژهەلاتێ مەلبەندێ ناحیا گردەسێن و ۱۵كم ژ سەنتەرێ قەزا ئاكرێ دوورە.

## پێكهاتا گوندی:

دناڤا گوندیدا ئێك مالبات هەیە ئەوژی مالباتا (مامانومەر)ن و سەر ب عەشیرەتا سۆرچی یا ڤەنە،

گوندێ شاب ئومەر



و هژمارا خەلکێ گوندی بتنێ ٨ مالن.

گوند سالا ١٩٩٧ێ پێ هاتییە ئاڤاکرن، سالا ٢٠٠٣ێ جادە بۆ گوندی هاتییەچێکرن و سالا ٢٠١٢ێ هێلا کارەبێ بۆ گوندی هاتییەکێشان.

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

دناڤا گوندیدا تنێ هندەك کانییێن ئاڤێ هەنە ئەوژی: کانی تیرەش و کانیا مشروعی و کانی شاب و کانی کەندەرەشن، رووبارێ زنتا ژی دناڤا سنوورێن گوندی را دبووریت، ژێدەرێ ئاڤا گوندی ل سەر کانیا تیرەش بوو هەتا ل ٢٠٠٧/١٠/٣ێ بیرەکا ئیرتیوازی بۆ گوندی هاتییە کۆلان و ئاڤا وێ ب سەر مالاندا دابەشدبیت.

### ژێدەرێن زیارا خەلکێ گوندی:

ژیانا خەلکێ گوندی ل سەر جۆتیاریا عەردێ ئاڤی یە وەکی برنج و لوبك و خیار و تماتا....هتد و هەردیسان جۆتیاریا عەردێ دێمی گەنم و جو و هندەك ژوانا ژی پێشمەرگەنە.

### شوینوار و جهێن کەڤنار:

جهێ ڤی گوندی جهەکێ کەڤنار و شوینوارییە، هەتا نهاژی دگەل کۆلانا عەردی گەلەك گوسك و ئامان و کەل و پەلێن ناڤ مالێ لێ دەردکەڤن، لێ ئەو شوینوار ژبەر هەر ئەگەرەکی بن هاتینەژناڤبرن، هەروەسا کاڤلەك ل گوندی هەیە خەلکێ گوندی دبێژنێ کاڤلێ (پیرەش) کو جهەکێ کەڤنارە.

### جهێن بەرچاڤ و ناڤدار:

دناڤا گوندی دا هندەك جهێن بەرنیاس هەنە وەك: کەندە زیارەتوك، شێلاڤوك، کەندە مەختیار، کەندە رەشا گچکە و کەندە رەشا مەزن[١٨٨].

## گوندێ خێلافت:

ئاڤاکرنا گوندی ڤەدگەریتەڤە دەسپێکا سەدسالیا بیستێ، ب گۆتنا خەلکێ گوندی کو باب و باپیرێن وانا ل ڤی گوندی ژیاینە، گوند ٢٨کم ژ باکوورێ رۆژئاڤایێ مەلبەندێ ناحیا گردەسێن و ٢٢کم ژ باژێرێ ئاکرێ دوورە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ کانی بادێ و شەرمن و باکرمان.

**باشووری،** گوندێ باقسپێ و باژێرە ژوری .

**رۆژهەلات،** گوندێ سێلان مامك و سێلان سالح.

**رۆژئاڤای،** گوندێ ئیسماڤا.

### پێکهاتا گوندی:

دناڤا گوندیدا ئێك مالبات هەیە ئەوژی مالباتا (بەرنی)نە، سەر ب عەشیرەتا زێباری نە، و هژمارا خەلکێ گوندی ٨ مالن. ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ گوندی ٧٨ کەس بوو[١٨٩]، ئەڤە ژی دیاردکەت کو هژمارا خەلکێ گوندی پشتی حەفتێ سالان گەلەك ب کێمی زێدەبوویە.

سالا ١٩٧٦ێ مزگەفت ل گوندی هاتییەچێکرن و سالێن حەفتێیان کارەب و جادە بۆ گوندی هاتینە کێشان.

### ژێدەرێن زیارا خەلکێ گوندی:

ژیارا خەلکێ گوندی ل سەر چاندنا عەردێ دێمە وەك هژیر و زەیتوین و تری و باهیڤ و سماق و دیسان گەنم و جەهی دچینن و هندەك ژوانا ژی پێشمەرگەنە.

ژێدەرێ ئاڤا ڤەخوارنا گوندی هەتا نهاژی ل سەر کانییا ئاڤێ یە ئەوژی (کانییا خێلافت) تنێ ئەڤ کانییە ل گوندی هەیە[١٩٠].

## گوندێ رەزوك:

ئاڤاکرنا گوندی ڤەدگەریتە ڤە بۆ سالێن شێستان، گوند ٢٥کم ژ باکوورێ مەلبەندێ ناحیا گردەسێن و ٧کم ژ سەنتەرێ قەزا ئاکرێ دوورە. سالا ١٩٩٦ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەکرن،

گوندێ رەزوك



دو مزگەفت ل گوندی هەنە سالێن ١٩٧٢و ٢٠١٣ هاتینە ئاڤاکرن، سالێن هەشتێیان هێلا کارەبێ بۆ گوندی هاتیەکێشان، هەتا نها جادەیا گوندی ئاخە.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری،** گوندێ خرپە هەرکی و راس العین.

**باشووری،** گوندێ راویتە .

**رۆژهەلات،** گوندێ گوشینە خان ئاڤدەل و کوچینە مەلا فەرزو

**رۆژئاڤای،** گوندێ سوسنا.

**پێکهاتا گوندی:**

دناڤا گوندیدا دو مالبات هەنە ئەوژی مالباتێن (هیتی و شوشی)نە، ب عەشیرەت زێباری نە، خەلکێ گوندی بەری سالا (١٩٧٠)ێ ٥ - ٦ مال بوون، نها هژمارا وان گەهشتیە نێزیکی ٨٠ێ مالان. ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ گوندی ٥٠ کەس بوو[١٩١].

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

ژیارا خەلکێ گوندی ل سەر چاندنا دێم و خودانکرنا مەر و مالاتیە و هندەك ژوانا ژی پێشمەرگەنە.

سالێن نوتان بیرەکا ئیرتیوازی بۆ گوندی هاتبوو کۆلان لێ هشك بوو پاشی ل ٢٠٠٦/٨/٢٤ێ بیرەکا ئیرتیوازی دی ل شوینێ هاتیەکۆلان و نها ئاڤا وێ سەر مالان دابەشدبیت[١٩٢].

## گوندێ گۆرانك مەزن:

خەلکێ گوندی چ زانیاریێن پشتراستکری ل سەر واتایا ناڤێ گوندی نەبوون لێ ئاماژە ب چەند تشتەکێ کێم کرن و گۆتن:

ل ڤی گوندی پێشدا گەلەك ئاڤ و دەعل و قەرەم

لێ هەبی و دابێژن ئەڤە گورنکە دەعلە یان گورنکە قەرەمە، بەلێ ئەگەر ئەم بەرێ خو بدەینە پەیڤا گۆرانك ل دوو برگا پێك هاتی یە (گۆران + ك) گۆران ناڤێ عەشیرەتەکێ یە و پاشگرێ (ك) دزاراڤێ هەرکییان دا دهێتە ب کارئینان دەمێ ب چاڤەکێ کێم بەرێ خو ددەنە جهەکی یان کەسەکی.

گوند ب دووراتیيا ٨کم دکەڤیتە باکووری رۆژئاڤایێ گردەسێن و ١٢کم ژ سەنتەرێ قەزا ئاکرێ دوورە.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ گۆران حەجی عەرەب.

**باشووری:** گوندێ مامداویدان ژێری و بەدریك.

**رۆژهەلات:** گوندێ بێناتان و پیرخولین.

**رۆژئاڤای:** گوندێ نیاوك و جەلان ئامەدین.

## پێکهاتا گوندی:

دناڤا گوندیدا تنێ ئێك مالبات هەیە ئەوژی مالباتا (مالەزاهێر)ێنە و سەر ب عەشیرەتا هەرکی نە، و خەلکێ گوندی بەری سالا ١٩٧٠ێ ١٠ - ١٥ مالان بوو نها ئەڤ هژمارە بەر ب زێدەبونێ ڤە چوویە و گەهشتی یە نێزیکی ٨٠ێ مالان.

گوند سالا ١٩٤٩ێ هاتییەئاڤاکرن. سالا ١٩٧٩ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەکرن، هەتا پۆلا نەهێ بنەرەتی لێ دهێتە خاندن. سالا ١٩٩٩ێ مزگەفت ل گوندی هاتییە ئاڤاکرن. سالێن هەشتێیان هێلا کارەبێ گەهشتییە گوندی و سالا ٢٠٠٨ێ جادا گوندی هاتییە چێکرن.

## زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

خەلکێ گوندی ژبۆ رێڤەبرنا ژیارا خۆ پەنا برییە بەر خودانکرنا مەر و مالاتی و کارێ چاندنی و هەروەسا بەشەك ژێ پێشمەرگەنە.

سالا ١٩٦٧ێ بیرەکا ئیرتیوازی بۆ گوندی هاتییەکۆلان، ئاڤا وێ ل سەر مالان دابەشدبیت[193].

## گوندێ کوچینە حەسەن بەدو:

ل دوور واتایا ناڤێ گوندی موختارێ گوندی دبێژیت: دەمێ گوند هاتییە ئاڤاکرن یێ نێزیك بوو ژ گوندێ (کوچینە مەلا فەرزو)ی و هەروەسا جهێ گوندی مولکێ (حەسەن بەدو)ی بوو ژبەر وێ یەکێ گوند ب (کوچینە حەسەن بەدو) هاتییەناڤکرن.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ رەزوك و سوسنا.

**باشووری:** گوندێ سماقوك و خرابە .

**رۆژهەلات:** گوندێ کوچینە مەلا فەرزو.

**رۆژئاڤای:** گوندێ گۆران مەزن.

گوند ١٤کم ژ باکوورێ مەلبەندێ ناحیا گردەسێن و ٣کم ژ سەنتەرێ قەزا ئاکرێ دوورە.

## پێکهاتا گوندی:

دناڤا گوندی دا شەش مالبات هەنە ئەوژی مالباتێن خەلکێ گوندی د بنیاتدا ژ گوندێن (کادانی و بانی و باکرمانی و شەهی و شنی و هێتی)یێن عەشیرەتا زێباری یا ڤەنە، خەلکێ گوندی دناڤبەرا ٣٥٠ هەتا ٤٠٠ مالان دایە.

گوند ل سالا ٢٠٠٦ێ یێ هاتییە ئاڤاکرن، و ئەگەرێ زێدەبوونا هژمارا خەلکێ گوندی ب شێوەیەکێ زۆر دزڤریتەڤە بۆ جهێ گوندی یێ ستراتیجی کو دکەڤیتە سەر جادەیا (ئاکرێ – قەسروك – دهۆك) و هەردیسان نێزیکییا وی ژ سەنتەرێ قەزا ئاکرێ، و نها چ سەر و سیمایێن گوندا پێڤە دیارنینە چنکی بەر ب باژێرەکێ بچویکڤە چوویە، سالا ٢٠٠٦ێ هێلا کارەبێ بۆ گوندی هاتییەکێشان، سالا ٢٠١٤ێ خواندنگەهەکا سێ نهومی ژلایێ حکۆمەتا هەرێمێ ڤە ل گوندی هاتییە ئاڤاکرن، هەتا پۆلا نەهێ بنەرەتی لێ دهێتە خواندن و هەردیسان دو مزگەفت ل گوندی هەنە سالێن ٢٠٠١ و ٢٠١٦ هاتینە ئاڤاکرن، گوند کەتیە د سنوورێ باژێرڤانییا ئاکرێ دا.

# عەشیرەتێن پارێزگەها دهۆكێ

**بەشیر سەعید سلێڤانەیی**
**وەرگێران: خالد سالح**

ل دەستپێكا سەدسالیا بیستێ ژمارا عەشیرەتێن كوردی دناڤ دەولەتا ئوسمانی دا دگەهشتنە نێزیكی (٣٧٩) عەشیرەتان، ب بوورینا دەمی و ژبەر زۆربوونا خەلكێ وان گەلەك بنەمال و گوند ژی بوونە عەشیرەت، ژبەر ڤێ چەندێ دەستنیشانكرن و ئامارکرنا وان عەشیرەتان كارەكێ ب ساناهی نینە، لەوما دێ بابەت پتر ل سەر وان عەشیرەتێن كەڤنتر بیت و ل سەر وان عەشیرەتان یێن گەلەك مرۆڤ هەین، ب تایبەت ل وان دەڤەران كو ئەو عەشیرەت هەر ب ناڤێن كەڤن ل جهێن خۆ ماین. ڤەگەریانا عەشیرەتا كوردی بۆ ناڤێ كەسەكی یان بابكالەكی یان بۆ رێكەكا ئۆلی ناگونجیت دگەل جڤاكێ كوردی، چونكی كورد یێ گرێدای عەردی یە و ئەو جهێ تێدا دژیت و خۆ بۆ وی جهی ڤەدگەرینت، واتە عەشیرەتا كوردی عەشیرەتا عەردی یە نە یا كەسان، هەر چەند گەلەك عەشیرەت ب ناڤێ هندە سەرۆكێن كاریگەر دهێنە نیاسین، یان بۆ هندە كەسان كو هاتینە جهەكی و لێ ئاكنجی بووین و ب ناڤێن وان هاتنە ب ناڤكرن[1].

ل ڤێرە ڤەرە ئاماژە ب وێ چەندێ بێتەكرن كو بزاڤا نەتەوەییا كوردی یا چەكدار و بەرگریكەر دژی وان دەولەتێن كورد دناڤخۆدا دابەشكرین نەشیایە دەست ژ زەلامێن زیرەكێن عەشیرەتان هەلگریت، لێ ژبەر وان پێشكەتنێن سیاسی یێن كوردستانێ پشتی جەنگا جیهانییا دووێ بخۆڤە دیتین، عەشیرەت و سیستەمێ عەشیرەتینیێ و هەستا عەشیرەتینیێ ئێك ژ وان هۆیان بوویە كو ببنە ئاستەنگ و رێگر دراستا نویبوونا جڤاكێ كوردی د گەلەك بواراندا. تا گەهشتییە وی رادەی وەكی رۆژهەلاتناس مینورسكی دبێژیت گەلەك ژ عەشیرەتان ل گەلەك جهان (دژی بزاڤا نەتەوەییا كوردی) راوەستیان[2].

جڤاكێ بەهدینانی یێ بەرنیاسە ب سیستەمێ خۆ یێ عەشیرەتینی و گیانێ عەشیرەتینی دناڤدا یێ خورت و موكمە، دبەرێ دا سێ جۆرێن عەشیرەتینیێ دناڤ واندا هەبوون، و شێوازێ ژیانا وان دژێك جودابوون، هندەك ل ژێر دەسەلاتەكا ئایینی ڤە بوون، مینا شێخێن بارزان و شێخێن بریفكان و هندەك عەشیرەت هەبوون ل ژێر دەسەلاتا ئاغایان ڤەبوون، ڤێجار ئەو ئاغا چ ژ عەشیرەتێ بخۆ بان یان نە[3].

جڤاكناس پەیڤا (قەبیلە) وەسان ددەنە نیاسین كو یا پێكهاتییە ژ كۆمەكا عەشیرەتان و هەر عەشیرەتەك یا پێكهاتییە ژ چەند بنەمالان، ئەڤ سیستەمە یێ پەیرەو كری یە ل ناڤ هەمی قەبیلان و هەمی جڤاكێن عەشیرەتینی.

خواندنەك بۆ عەشیرەتێن كوردی بۆ مە خۆیا دكەت كو چ جیاوازی دناڤبەرا هەردو زاراڤێن (قەبیلە و عەشیرە) دا نینە، هەڤدژی جڤاكێ عەرەبی كو ئەڤ چەندە دناڤدا خۆیا دكەت[٤].

پروفیسور مینورسكی وەسان دیاردكەت كو عەشیرەتێن كوردی پێكهاتینە ژ دو چینان، یا ئێكێ شەرڤان كو دبێژیتێ (سوپاهی)، ئەو ژی سەرۆكن - ئاغا - و خودان ئەرد و خزمەتكارێن وان، و یا دووێ جۆتیارێن وەراز، كو ب كوردی دبێژنێ (گۆران)[٥]و ل هندەك دەڤەران ژی ب كرمانج دهێنە ناڤكرن.

نهو ل كوردستانێ ژمارەكا مەزنا عەشیرەتان هەنە، هەر ئێك ژ وان جهێن خۆ یێن دەستنیشانكری یێن تایبەت ب وانڤە هەنە، ڤان عەشیرەتان ب درێژاهییا سەدان سالان هەمان ناڤێن بەرێ پاراستینە.

دچەرخێ نوی ژی دا ڤەكۆلەر و رۆژهەلاتناسان هەر ژ سەدسالییا نۆزدێ پویتەداینە دیرۆكا عەشیرەتێن كوردان، چەندین پەرتووك و ڤەكۆلین ل سەر ڤی بابەتی هاتینە نڤیسین، مینا نڤیسینێن رۆژهەلاتناسێ رۆسی بیوتەر لیرج و رۆژهەلاتناسێ ئەمریكی هنری فیلد و نڤیسینێن رۆژهەلاتناسێن ئەلمانی و رۆسی و ئەو راپۆرتێن فەرمی یێن هەر ئێك ژ مارك سایكس و مێجەر ئیلی باتسترسون و ئای. جی. ئار ل سەر قەبیلەیێن كوردان بۆ دەسەلاتێن ئنگلیزی ل بەغدا بلندكرین، زێدەباری كابتن های و محەمەد ئەمین زەكی و عەباس ئەلعەزاوی و ولیەم ئیگلتن و یێن دی[٦].

## كورتییەك ل سەر عەشیرەتێن پارێزگەها دهۆكێ

### عەشیرەتا زێبارییا:

عەشیرەتەكا كەڤن و زیرەكە، ژ هەمی عەشیرەتێن دەڤەرێ كەڤنترە، هندەك وەسان ددەنە خویاكرن كو رەنگە گرێدانەك دناڤبەرا ناڤێ ڤێ عەشیرەتێ و ناڤێ سوباریان دا هەبیت[٧].

ناڤێ عەشیرەتێ یێ ژ (زێبار)هاتی، (زێ) د زمانێ كوردیدا ب واتایا (رووبار) دهێت، (بار) ب واتایا (پەراڤ - كنار)، یان: پەراڤێن ئاڤێ، یان پەراڤێن زێیی و دبیت ناڤ ژ (زێ — زێ بادینا — زێ مەزن) هاتبیت كو هندە جاران دبێژنێ (زێ دین) هندی خۆش دچیت، ب تایبەت ل دەمێ لەهییان، بار ژی ب واتایا (پەراڤێن زێیی) و ناڤێ (زێبار) یێ ژ وێ چەندێ هاتی[٨].

ب هەمی واتایان ناڤێ وێ یێ ژ رەنگە گرێدانەكا ئاخا وێ، یان نێزیك بوونا ئاخا وێ دگەل رووبارێ زێ ڤە هەی.

یەكەم جار ناڤێ زێبار ب ڤی شێوەی یێ ل ناڤەراستا سەدسالییا حەفتێ مشەختی/ سێزدێ زایینی هاتی.

ئەڤ عەشیرەتە ل سەردەمێ میرگەها بەهدینان ژ عەشیرەتێن وێ یێن گرنگ بوون، دەرگەهێ رۆژهەلاتیێ كەلا ئامێدیێ ب (دەرگەهێ زێبار) دهاتە نیاسین، عەشیرەتا زێبار ل سەردەمێ میرگەهێ د بلندترین ئاستێن سەروەرییا خۆ دا بوو و ئارامی دناڤدا یا بەرلاڤبوو و پێشكەتن ژلایێ زانستی ڤە بخۆڤە دیتن[٩].

رهێن وان تا ویلایەتا هەكاری ل باكوورێ كوردستانێ دچن، جوگرافیەكا بەرفرەهـ یا هەی، ژ باژێرێ ئاكرێ ل باشوور دەست پێدكەت تا دگەهیتە چیایێ پیرس ل باكوور و ژ زێیێ مەزن (زێ بادینا) ل رۆژهەلاتی، تا دگەهیتە رووبارێ خازر ل رۆژئاڤایی، كو دبیتە ناڤبرەك دناڤبەرا عەشیرەتا زێبارییان ژ لایەكی و هەردو عەشیرەتێن بەرواری ژێری و مزووری ژێری ژ لایەكێ دی ڤە، پتریا دەڤەرا وان دبێژنێ (نەهلە) ئەو ژی دكەڤیتە دناڤبەرا زنجیرە چیایێ پیرس و چیایێ برات، كو خەلكێ دەڤەرێ ب (سەرێ صادا) دنیاسن و ئەڤ دەڤەرە ناحیەكێ پێكدهینت، ئەو ژی ناحیا (دینارتە — نەهلە) یە.

پشتی كارگێرییا دەڤەرا بەهدینان كەتییە دەست حوكمەتا ئوسمانیدا، كاروبارێن وێ دەڤەرێ هاتنە پشتگوهـ ئێخستن، ژبەر كو دەڤەرەكا ئاسێ بوو و ب ساناهی نە دگەهشتنە وێ دەڤەرێ و دەسەلات

کەتە دەستێ هندە کەسێن دلرەق کو ب ئاغا دهاتنە نیاسین و دگۆتن کو ئەو ژ میرێن بنیانشییا بوون[١٠].

دەڤەر یا دابەش کرییە بۆ سەر سێ جهان:

١- دەڤەرا زێبار (هەرن).

٢- دەڤەرا دۆلا نەهلە کو ئاغاتی یا بنەمالا مستەفا ئاغایە.

٣- دەڤەرا شۆش و شەرمن، درێژاهییا ئەردێ وێ دەست پێ دکەت ژ ئاکرێ ل رۆژئاڤایی تا دگەهیتە رووبارێ خازری. شۆشێ بخۆ جهەکێ شوینواری یە، ناڤێ وێ د پتریا ژێدەرێن دیرۆکی دا یا هاتی و ئاغاتی یا ددەست بنەمالا (نعمەت ئاغای) دا.

عەشیرەتا زێباریا ژ عەشیرەتێن شارستانییە، کارێن وان چاندنا دەخل و دانی و برنجی و توتنێ و مێوا و ب خودانکرنا پەزی بوو. وان پتر ژ ٧٠ گوندان هەنە، کو دبنە پتر ژ ١٠ هزار خێزانان[١١] و پتر ژ ٢٠ بابکان.

**ژ وان گوندان ژی:** (بیرەکەپرا، پرێسە، هەرن، بازێ، هنارێ، خۆشانا، هۆکێ، چاربووت، چالێ، شنی ژووری، شنی ژێری، گورگاڤێ، گادانا، بانێ، نپاخێ، ئاگل، سەرانی ژێری، سەرانی ژووری، بابۆلا ژێری، بابۆلا ژووری، کافیا، هلۆرا، خاستو ژێری، خاستو ژووری، سەرۆکانی، بێریژگێ، بیاڤ، هاریکا، لاتکا و... هتد.

## عەشیرەتا مزووری ژێری:

ئێك ژ عەشیرەتێن مەزنێن دەڤەرێ، ل هەردو پارێزگەهێن دهۆك و هەولێرێ دبەربەلاڤن، دهێتە هەژمارتن کەڤنترین عەشیرەت پشتی عەشیرەتا زێباریان[١٢]، هندەك وەسان بۆ دچن ئەڤە عەشیرەتا (مضر) یا عەرەبی یە، لێ وەکهەڤییا ڤان وێ چەندێ ناگەهینت کو ئەو دهەڤپشکبن د جۆری یان رەگەزی دا، چونکی عەشیرەتا (مضر) یا عەرەبی چ جاران ل دەڤەرێ ئاکنجی نەبوویە، ئەڤ زاراڤە پتر نێزیکی (میسوری – میسری) یا ئاشووری یە کو ل سەردەمێ شاهـ (سنحاریب) دناڤبەرا هەردو جووێن رووبارێ خازر دا یا ئاکنجی بوو. یا مە پتر پشتراست دکەت کو ئەو نە عەرەبن ژ (مضر) سالۆخەت و سەروبەرێ وان یێ گشتی، هەر وەسان سنج و رەوشت و تیتالێ وان[١٣]. (کارل مای) پتر وەسان بۆ دچیت کو پەیڤا (مزووری) یا ژ پەیڤا (موسوری) هاتی[١٤]، یان باشتر یا ژ پەیڤا (میەزوری) یان (میوسوری) هاتی.

عەشیرەتا (مـزووری) یێن ل قەزا مێرگەسۆر (پارێزگەها هەولێرێ) ژی هەین، لێ ئەو ب (مزووری ژووری) دهێنە نیاسین، مزووری ژێری و مزووری ژووری هەردو ئێك بنیاتن و ب زەحمەت دهێتە زانین کا ل کیژ چاخی ژ جهێ خۆ چووینە و ئەڤ جهە وەکە وار هەلبژارتینە[١٥].

ڤێ عەشیرەتێ دەڤەرەکا جوگرافییا بەرفرەهـ ڤەگرتییە، دەست پێ دکەت ژ دهۆکێ ل لایێ رۆژئاڤایی تا دگەهیتە رووبارێ خازر ل رۆژهەلاتی و باژێرکێ ئێسفنێ ل باشوور تا دگەهیتە دەڤەرا بەرواری ژێریان ل رۆژهەلاتی. دەڤەرا وان پتر چیایی یە، ژبەر هندێ چاندنا دان و دکاکان مینا گەنم و جەهی لێ یا کێمە، ژبلی برنجی کو ل هندە دەڤەران دهێتە چاندن، ژیارا وان یا سەرەکی ل سەر ب خودانکرنا تەرش و کەوالی و پەزی یە، هەر وەسان پویتەی ددەنە چەمێن فێقی و فێقیێ خۆ دهنێرنە ناڤ بازارێن ناڤخوو.

مزووری عەشیرەتەکا ئاکنجی یە، ژمارا گوندێن وان دگەهنە (١٠٥) گوندان، ژمارا خەلکێ وێ دگەهنە (٢٠٠٠٠) کەسان. سەرۆکاتییا ڤێ عەشیرەتێ ل بەرێ ددەستێن (عەلی ئاغایێ بالەتەیی) ل گوندێ (بالەتە)دا بوو و ناڤێ وی د گەلەك ژێدەرێن دیرۆکی دا یێ هاتی، لێ پشتی کوشتنا وی ل سەردەمێ سەعید پاشایێ ئامێدیێ[١٦]، سەرۆکایەتی چوو ددەست نعمان ئاغای دا، پاشی چوو ددەست شێخێن بریفکا دا، تا بنەمالا حەجی نەبی ئەرگوشی پەیدابووی، ئێدی خەلکەکێ مشە ژ عەشیرەتێ لێ ڤەجەمیان و ژ بەر ناکۆکیێن دناڤبەرا هەردو بنەمالاندا، هەر ئێك ژ وان لایەنگرێن خۆ هەبوون و هەر ئێك ژ وان سەرۆکاتییا هندەکان دکرن[١٧].

**گوندێن مزووریان،**
چەمان، كزو، خروە، مێرینا (مێرونا)، كۆرەدێرێ، خرابە، پێدە، بێدیل، دزێ، بالەتە، گەلی رمان، ئێتویت (نهو تاخەكێ دهۆكێ یە)، ئەترویش (ناڤەندا ناحیەكێ ب وی ناڤی یە)، خوركی، شێخەسن (شێخ هەسن)، پیرمویس، بابلۆ، زاویتە، هەسنەكا، ربەتكێ، گابێركێ، خورینی، كانیا باسكا، بلانا، مێرسیدا، دۆستەكا، تلخش، خورتوداكان، بلان، ئاژاخ و ئارماش (كو دو گوندێن مەسیحی نشینن و بنیاتێ هەردوان ژ مەرگەهێ نە)، بێبۆزێ، ئالوكا، بێنارینكێ، بانیێ، صۆریا، ئەڤریكێ، تەلوە (طەلوە)، ئێمینكێ.

## ژبابكێن عەشیرەتێ:

١- بابكێن ئەرگۆشی: جهەكێ هێژا دناڤ هەمی بابكێن دی دا هەیە، پتر ژ ٣٠ گوندان هەنە و بنەمالا حەجی نەبی سەركێشییا وان دكەت.

٢- بابكێن بریفكان: ئەو ژی شێخێن بریفكانە و ژمارەكا بۆشن.

٣- بابكێن ئەترێش

٤- بابكێن ربەتكێ

٥- بابكێن دێركێ

٦- بابكێن یەزدین

٧- بابكێن گەلیێ رمان

٨- بابكێن بالەتە

٩- بابكێن ئێتویت

١٠- بابكێن ئێمینكێ

١١- بابكێن ركاڤا

١٢- بابكێن خوركی

١٣- بابكێن شەمكان[١٨].

## عەشیرەتا سلێڤانەییا:

ئێكە ژ عەشیرەتێن كەڤنێن مەزن و دئاكنجی، ل سەردەمێ ئیسلامێ یێ پەیدابووی، بۆ جارا ئێكێ ناڤێ وێ یێ ل سەدسالییا (٨-٩مش/١٤-١٥ز)دناڤ ژێدەرێن دیرۆكیدا یا هاتی، ناڤێ وێ یێ ژ (سلێمان) هاتی، دبیت ئەڤ ناڤە ژ میرەكی یان بابكالەكێ وان ب ناڤێ سلێمان هاتبیت و پاش ئەو ناڤ یێ بوویە (سلێڤان)، جوگرافییەكا بەرفرەهـ یا هەی، دكەڤنە دناڤبەرا هەردو رووبارێن دیجلە و خابووری دا[١٩]، سنوورێن وێ ل باكوور رووبارێ خابوورە تا دگەهیتە رووبارێ دیجلە ل نێزیك گوندێ (قەراولا)، و ل هەردو لایێن رۆژئاڤا و باشوور یێ دووریێچكرییە و رۆژهەلات ئەو گرن یێ دكەڤنە دكەڤنە رۆژهەلاتی گوندێ (مەرینا) و هندە گوندێن دۆسكییان ژ لایێ (لیڤنێ) ڤە و یێ پێكهاتییە ژ چوار دەڤەرا:

(لیڤنێ، زیبارییا، سینا، دودبادا)، ناحیەك ب ناڤێ وێ ل گوندێ (ئاسیهێ) كو سەر ب زاخۆڤەبوو هاتبوو دامەزراندن و تا سالا (١٩٧٨)ێ ئەڤ ناحیە هەبوو. ئەو ژی یا دابەشكری بوو بۆ سەر دو تایان (سینا، دودبادا)، توبوگرافییا هەردو دەڤەرێن ئێكێ و دووێ پتر چیایی نە، گر و دۆلێن كویر مشە لێ هەنە، چاندنا دان و دكاكی لێ یا كێمە و ژبەر هەبوونا ئاڤێ ئەردێ وان پتر یێ گونجایە بۆ ب خودانكرنا پەزی و چاندنا داروبارێ فێقی، لێ هەردو دەڤەرێن دی (سینا و دودباد) ئەردێ وان دەشتە، دەستپێدكەت ژ گوندێ پێشابیرێ تا دگەهیتە ئالوكا، ل بەرێ كو دگۆتنێ (باهدرا- بانەهدرا)[٢٠]. بەدلیسی دبێژیت دبیت ناڤێ وێ ژ (سلیمانیە- سلیڤانیە) هاتبیت كو ژ نەڤیچركێن سلێمان كورێ عەبدولمەلك كورێ مەروان ژ شاهێن مەروانی بن[٢١]. مێژوونڤیس محەمەد ئەمین زەكی دبێژیت ناڤێ وێ یێ ژ سلێمان هاتی، چونكی كورد سلیمان دكەنە (سلیوان - سلیڤان)[٢٢]و ئەڤە پتر نێزیكی راستیێ یە كو سلێمان بوویە سلێڤان و ژێدەر وەسان ددەنە خویاكرن كو ڤێ عەشیرەتێ ب درێژاهییا ڤێ مێژوویا درێژ ئەڤ ناڤە پاراستییە.

د بەرێ دا وان تایەك ل قەزا دهۆك و تایەكێ دی ل قەزا زاخۆ - سندی هەبوو كو هێشتا لێ دئاكنجی نە[٢٣]. ڤێ عەشیرەتێ د گەلەك سەردەمانێن خۆدا ب دەهان عەشیرەت هاتینە بەر پەرێن وێ[٢٤].

ژمارا گوندێن ڤێ عەشیرەتێ ژ سەدسالییا چوویی دگەهشتە (١٠٩) گوندان[٢٥]، كو دبنە (٣٠٠٠-٤٠٠٠)

خێزانان.

رۆژهەلاتناسێ ئەمریکی (هنری فیلد) وان دابەش دکەتە سەر شەش بابك و ئویجاخان، ئەو ژی:

١- سەعید ئاغا حاجی ئاغا (قولی) و یا دروست (کۆلی)، کو دبنە (٨) گوند .

٢- شەمسات: (شەمسکان) عەلی ئاغا کورێ محێ ئاغا صوفی ل گوندێ (پێ بزنێ)، ئەو ژی شەش گوندن.

٣- ترکیژان: مەسعود ئاغا کورێ محەمەد ئاغا ، گوندێ (گرشین)، چوار گوندن.

٤- بابلا: جندی ئاغا کورێ ئەحمەد ئاغا، گوندێ (بەورەت) و یا دروست (باوەردێ)، شەش گوندن.

٥- مالا ئاتی: مەبەست ژێ (عەتی) حسێن ئاغا کورێ فەرحان ئاغا، گوندێ (کبیرك) (گرعوصمان- گرئوسمان) (ئاسیهێ)، سێ گوندن.

٦- ملا تایە: مەبەست ژێ (مەلا تەیب) ب سەرۆکاتییا نەجم کورێ عەبدی، گوندێ (گیرەش). دووازدە گوندن[26]. بنەمالا (مەرعان) ل باتێلێ ژی هاتییە زێدەکرن سەر لیستا هنری کو ئەو ژی (٤٠) مالن[27]، رۆژهەلاتناسێ ناڤبری ل دووماهییا هەر وی بەرپەری بخۆ دبێژیت کو (٢٦) گوند ب چ ئویجاخان ڤە دگرێدای نینن و ب راست نە قەبیلە نە، هەر ئێکی موختارەك هەیە و یێ ژ هەمیان هینگێ ب شیانتر (عەزیز ئاغا) ل گوندێ پێشابیرێ بوو، کو ئێك بوو ژ ماقویلێن بەرنیاسێن دەڤەرێ، ژیانا وان ل سەر چاندنێ و ب خودانکرنا پەزی و تەرش و کەوالی یە.

ژ گوندێن وێ (ئاسیهێ، کۆلێ، کواشێ، براڤ، کلیین، گرکل، شکەفتێ، بەراڤۆك، چەم زراڤ، کنیل، شکراڤ، سۆریا (صۆریا)، باڤیا، بالقوس، قەرقویر، ئاڤزریك شنی، ئاڤزریك میری، بفلوجە، هەورێسك، گهنیکرك، میرگەسۆر، سیڤدینجن، پیچك زێری و ژووری، باتێلا، بامیر، سولاڤ، باگرشا، میروینا، فصلە، سەرکانی، ئەفخانی، قەسرا مەلا تەیبی، خراب دێم، هاجیا، قلما، دێرەبوین، پێشابیر مشارا، توسانا، بێتاس، بێزە، دۆلێ، ئەرمشت، سلکا، خێلخ، ئافرما، باکرما، باجۆکا، قراسوك، قادیا، خرینور.

## عەشیرەتا سندی:

ئێکە ژ عەشیرەتێن کەڤن و دئاکنجی، ناڤێ وێ بۆ جارا ئێکێ ل نیڤا دووێ ژ سەدسالیا (٧مش/ ١٣ز)ێ دا یێ هاتی وەکی چەوان (ئەلعومەری) د (مسالك الابصار) دا گۆتی (٧٤٩مش/١٣٤٨ز)، هەر وەسان ناڤێ وێ د (حوادث) یا (ئەلمەقریزی) ژی دا هاتی (٨١٧مش/١٤١٤ز). ناڤێ وێ یێ (البختیە) دا هاتی، ئەو ژی ئێکن ژ کۆمێن کوردان و یێن ل گەلەك جهان بەلاڤبووین و ئەو ل بەرامبەری حەمیدییان بوون. مەزن و ماقویل هەبوون، میرێن وان ژ ناڤچوون و مەزنێن وان هاتنە ژبیرکرن، کەس دناڤ واندا نەما ژبلی چەندەکێن بێ سەر و بەر نەبن، ئەو ژی دناڤ هۆز و مللەتاندا بەربەلاڤبوون[28]ژ جهێن گرنگ کو سەر ب میرگەها ئامێدیێ ڤەبوون دەڤەرا زاخۆ بوو، کو دو عەشیرەتێن شەرکەر لێ هەبوون، ئەو ژی سندی و سلێمانی (سلێڤانی)، خەلکێ وێ دەڤەرێ دگۆتنە وی جهی (سندیان) ژی[29]، ڤێ عەشیرەتێ جوگرافییەکا بەرفرەهـ یا هەی، دەست پێ دکەت ژ باژێرێ زاخۆ ل باشوور تا دگەهیتە سنوورێ باکوورێ کوردستانێ ل باکوور و ژ رووبارێ هیزل ل رۆژئاڤا تا دگەهیتە سنوورێ عەشیرەتا گولییان ل رۆژهەلات، ڤێ عەشیرەتێ ناڤەندا ناحیەکێ هەر ب ڤی ناڤی یا هەی، ئەو ژی (شەرانش ئیسلام) ە، پاشی ئەو ناڤەند هاتە ڤەگوهاستن بۆ دەرکار عەجەم[30]، کو دبێژنێ ناحیا دەرکار، ڤێ عەشیرەتێ (٨٠) گوند هەنە[31]، کارێ وان یێ سەرەکی چاندنا دان و دکاکا و برنجی بوو، هەر وەسان تویتنێ و جۆرێن فێقی، گویز و مێو مشە لێ هەنە، دیسان مفای ژ دارستانان ژی وەردگرن، ب تایبەت دەرامەتێن گرۆسك و گوهیشك و کەزانان. ئەڤە زێدەباری ب خودانکرنا مێشێن هنگڤینی و پەزی، چونکی سرۆشتێ ئەردێ وان یێ وەسانە کو چەروانێن باش لێ هەبن. خەلکێ وێ ل دووڤ پەزی هاتن و چوونێ دناڤبەرا زۆزانان ل هاڤینێ

کو ئاڤا تەزی لێ هەی و پلێن گەرمایێ نزمتر ژ رێژەیا سرۆشتی و کۆزان ل زڤستانانداا دکەن. سندی ژ چەندین تایان پێکدهێت، وان چ پەیوەندیێن مرۆڤانیێ دگەل ئێکدا نین، هەمی نە ژ بابکالەکی نە، لێ یا ئەو لێك خرڤەکرین دەسەلاتا عەشیرەتینیێ یە. سندی عەشیرەتەکا زیرەکە و هندەك جاران هەلویست دژی ئینگلیزان دگەل عەشیرەتا گولییان وەرگرتینە. ژ تایێن سندیان

١- بنەمالا یەعقوب ئاغا

٢- تیری

٣- شیف ارمنی

٤- جونکی

٥- مچۆلی

٦- صۆفی بابلا

٧- بۆصەلی

٨- بەنستانی

٩- مندۆزا

١٠- شەرانش ئیسلام

١١- پەرەخی

١٢- بەلەك

١٣- مام یەزدین

١٤- مالا عەجەمێ

١٥- شێخ یەزدینی.

**ژ گوندێن وان ژی:**

بۆصەلێ، شەرانش ئیسلام (ژێری)، شەرانش فەلا (ژووری)، بێرسڤێ (فەلا)، لێڤو (فەلە)، سەنات (فەلە)، دەشتە تەخ (فەلە)، پیرەکا (فەلە)، سەرکو، بەهنونە، پەرخ، قەسرۆك، ماسیس، لکوك، باگولادك، خرخیکا، سپیندارۆك، بەرزۆر، هفش، نوردینا، دۆرنەخ، کرنی، دەشتماسکێ، دملك، هیزاوا، تیرك ژێری و ژووری، کرکی، دارهۆزان، تاووکێ.

## عەشیرەتا گولی:

ئێکە ژ وان عەشیرەتێن ئاکنجی ل باکووری زاخۆ، ڤێ عەشیرەتێ ناڤێ خۆ یێ ل ناڤ عەشیرەتاندا هەی، ناڤێ عەشیرەتێ یێ ژ وێ چەندێ هاتی کو دەڤەر مینا دۆلەکا کویرو درێژە، لێ ئەڤ بۆچوونە یا لاوازە و ئەڤ توبوگرافییە ل گەلەك جهێن دی تر ژی یا هەی لێ ب وێ چەندێ نەهاتینە ب ناڤکرن. بۆچوونا دی ئەوە دبیت ناڤێ وێ ژ (گول)ێ هاتبیت، چونکی دەڤەر یا ب ناڤ و دەنگە ب چیایێن بلند و کانی و رووباران و دار وباری و ئەڤ هەمی دیمەنە مینا گولەکێ نە ژ گولێن بهارێ. بۆچوونەکا دی یا هەی کو دبیت ناڤێ وێ ژ (گولیێ) هاتبیت، گولیێن دەخل و دانی کو گوپیتکا دەرامەتی یە و نیشانا خێر و بێرێ یە[٣٢].

سنوورێن وێ ل رۆژئاڤا عەشیرەتا سندیانە، ل رۆژهەلاتی رووبارێ خابوورە، ل باکوور توخیبێ باکووری کوردستانێ و ل باشوور ژی عەشیرەتا دۆسکییانە.

ژبەر ئەردێ وان یێ نەگونجای بۆ چاندنا دەخل و دانی، چاندنا برنجی دناڤدا یا بەرلاڤە، زێدەباری چاندنا داروبارێ فێقی و توتنێ و ب خودانکرنا پەزی و تەرش و کەوالی و مێشێن هنگڤین.

خەلکێ عەشیرەتێ زیرەك و ب هێزن، ئەڤ چەندە دناڤ وان رویدانێن ناڤەراستا ئەیلوولا سالا (١٩١٩) ێ دا دیاربوون، دەمێ بەرەنگاری هێرشێن ئینگلیزی بووین بۆ سەر دەڤەرێ و ئینگلیز تێدا شکەستین[٣٣].

ژ بابکێن ڤێ عەشیرەتێ:

١-ب نەمالا سادقێ بروی ل گوندێ بەهنوینێ.

٢- بنەمالا سلێمان ئاغا قتێ، شیرخواس.

٣- بنەمالا حەسەن برو ل باتویفێ (باتویفا گولییان).

٤- بنەمالا سەیدا (صەیدا) ل گوندێ گۆفکێ.

٥- بنەمالا سەلیم ل گوندێ بلێجان.

### ژ گوندێن دەڤەرا گولیا:

گوندێ باتیفا، گوندێ دەحلك گوللی، گوندێ صارکا، گوندێ بێغەبارا سەری، گوندێ بێغەبارا بنی، گوندێ بەهنونێ، گوندێ ئاڤا تویکا، گوندێ بیرکێ، گوندێ پەلکیشك، گوندێ حەفتەنین، گوندێ کورکا، گوندێ بێکوڤا، گوندێ زرێزە، گوندێ ئاڤا خرابا، گوندێ کلاخوار، گوندێ میرگێ، گوندێ سیرکوتك، گوندێ خوك گوللی، گوندێ خەندەك

گوللی، گوندێ چەم جهور، گوندێ گری، گوندێ خیزاڤا، گوندێ شودن، گوندێ گوفك گوللی، گوندێ درەنگ ئاڤا، گوندێ ملاعرب، گوندێ كانی تو، گوندێ بلێجانێ، گوندێ شێڤێ، گوندێ صوریا، گوندێ دێمكا، گوندێ سەركێ بێسرێ، گوندێ گریێ بیێ، گوندێ نزۆرێ، گوندێ رویسێ، گوندێ سویلێ، گوندێ ئێكمالێ، گوندێ ئاڤهێ، گوندێ دێریشكێ، گوندێ نەرمك، گوندێ رێوانێ، گوندێ بارهولێ، گوندێ شێرخاسك و بانێ، گوندێ كەشان، گوندێ شیلان، گوندێ شلون.

## عەشیرەتا بەرواری:

عەشیرەتەكا مەزنە ل پارێزگەها دهۆكێ، ژ سالۆخەتێن خەلكێ ڤێ عەشیرەتێ ب هێز و شەرڤانن، لێ دهەمان دەمدا حەز ژ شەرا ناكەن و ددویر بەلانە، زوی ب زوی زیانا یێ بەرامبەری خۆ ناكەن، بۆ سەرۆك و مەزنێن خۆ گەلەك گوهدارن، پەیڤا بەرواری یا د شەرەڤنامێ دا ب (بروری) هاتی. بەرواری دابەش كرینە بۆ سەر دو عەشیرەتان:

### ١- بەرواری ژووری:

ئێكە ژ وان عەشیرەتێن ئاكنجی، جوگرافییا ئەردێ وان دەستپێدكەت ژ رووبارێ زێیێ مەزن ل رۆژهەلاتی تا دگەهیتە رووبارێ خابووری ل رۆژئاڤایی و ژ سنوورێ باكوورێ كوردستانێ ل باكوور تا دگەهیتە چیایێ مەتینا ل باشوور، ڤێ عەشیرەتێ (٨٣) گوند هەنە، (٦١) گوند ژێ كورد و موسلمانن و (٢٢) گوند ژێ ژ بنیات تیاری نە[٣٤].

سەرۆكاتییا عەشیرەتێ ددەستێن (تاتار خان بەگ) دا بوو، پاشی چوو ددەستێن برایێ وی (محەمەد بەگی) دا و پشتی وی چوو ددەستێن (رەشید بەگی) دا. ژ هەلویستێن وان یێن نیشتمانی ئەو ژێ دژی ئینگلیزی مل ب ملێ ئامێدیێ ڤە راوەستیابوون.

دەڤەرا بەرواری ژووریا یا ب ناڤ و دەنگە ب چاندنا برنجی و تویتنێ و حلیك و هرمیكا و ل ڤان دووماهییا چاندنا سێڤا ژێ گەهشتە دەڤەرێ كو سێڤەكا ب ناڤ و دەنگە و ب سێڤا (شێخ مەزهەر) دهاتە نیاسین، چونكی ئەڤ شێخە (كو شێخەكێ روحانی بوو ل دەڤەرا بەرواری ژووریا) یەكەم كەس بوو ل ڤێ دەڤەرێ ئەو رەنگە سێڤ ل عیراقێ چاندی و بوویە لایەنەكێ گرنگێ ئابووریا دەڤەرێ[٣٥].

سەرەرای ڤێ چەندێ خودانكرنا پەزی و بزنی ژێ لایەنەكێ گرنگێ ئابووریا دەڤەرێ بوو، مفا ژ مویێ بزنا (مەرەزی) وەردگرتن بۆ چێكرنا جلكێن كوردی (شەلوشەپكا)[٣٦].

ڤێ دەڤەرێ دارستانێن مشە لێ هەنە، مفا ژ بەرووی و مازی گوهیشك و كەزان و گرسكێن وێ دهێنە كرن، چ ل بەرێ ب رەنگەكێ بەرفرەهـ و چ نهو لێ ب رێژەیەكا كێمتر. هەر وەسان گویز و توی و سپیندار ژێ لێ هەنە، مفا ژ وان سپیندارن دهێنە كرن كو دكەنە گاریتە بۆ بانێن خانیان و دیسان پشتی سپی دكەن دهنێرنە بازاری بۆ فرۆتنێ ژێ[٣٧].

**ژ بنەمالێن ڤێ عەشیرەتێ :**

١- بنەمالا خەلیل یوسف تروانشی
٢- بنەمالا حەجی حەم
٣- بنەمالا حەسەن عەزو ل گوندێ بێدە
٤- بنەمالا سەعدولا ئوسمان ل گوندێ بێتكارێ
٥- بنەمالا موسا بەگێ ل گوندێ دەرگەلكێ
٦- بنەمالا گولایی بەگ ل گوندێ چمبلكێ
٧- بنەمالا محیەددین بەگ ل گوندێ سەرەرو
٨- بنەمالا شێخ مەزهەر ل گوندێ مایێ
٩- بنەمالا مایی
١٠- بنەمالا سالح سیدی ل گوندێ ئورمانا
١١- بنەمالا مەترانێ دویرێ.

ژ گوندێن مەزنێن دەڤەرێ د بەرێ دا بێدهـ و تروانش و هرۆر و یێ دووماهیێ ناڤەندا میرگەهەكێ بوو هەر ب وی ناڤی.

دەڤەرا بەرواری ژووریان ناحیەكێ پێكدهینت، ناڤەندا وێ (كانی ماسێ) بە، ژمارا خانیێن وێ (٨٠) خانی نە و هەمی تیاری نە.

ژ گوندێن بەرواری ژووریان:

(كانی ماسێ، چەقەلا، چەلكا فەلا، چەلكا بسورمانا، چەمسەیدا، چەمیكێ، چمبلكێ، گركا، گیلكا، قەسركێ، قومریێ، كارە، كانی ساركێ، كانی مەزنێ، كری، كێستە، مایێ یا فەلا، مایێ یا بسورمانا، مەگلانا، مەلختە، مێردینكێ، مێرگا جویا، میسكا، هەترشێ، بێدە، باتیفا سەیدا، بارزانكێ، بازێ، بەربویر، بالۆكا، بریفكا، بناڤێ، بێتەنویر، بێتكار، بێشیلێ، بیگدادا، بێلیزانێ، تروانش، تشیش، تیشەمبیكێ، جدیدكێ، خانكێ، خرابەی، خشخاشا، دەرگەلا موسا بەگێ، دەرگەلا سەیدا، دۆرێ، دێریشكا فەلا، دێریشكا بسورمانا، دێشیش، راڤینا، زەكەریا، سەرەرو، سەردەشت، سەرزێرێ، سەفەریا، سپیندارێ، شمایلا، شێلازا، هەدێنە، هەلوا بسورمانا، هەلوا فەلا، هرور، هرور بازیڤێ، هێسێ، ئاسهێ، ئاڤساركێ، ئەدنێ، ئەلكیشكێ، ئۆرە، ئۆرمانا، ئۆرمەدادا، ئێكمالە، ئیاتێ، كانی ماسێ، بێقۆلكێ، تویلەر).

۲- بەرواری ژێری:

هندەك بۆچوون هەنە دبێژن پەیڤا بەرواری پێكهاتییە ژ دو برگان، (بەر) واتە زێرەڤان (ل بەر)، دگەل برگا وار ب واتایا (جهـ) واتە پارێزگەرێ واری (ل بەر واری راوەستیای)[٣٨] و دبیت ئەڤ بۆچوونە یا لاواز بیت.

ژێدەر وەسان ددەنە خویاكرن كو دو عەشیرەت ڤی ناڤی هەلدگرن (ژووری و ژێری)، هەردو ژی ئێك عەشیرەتن مینا مزووریان (ژووری و ژێری)[٣٩]. بۆچوونێن دیرۆكنڤیسان ل سەر دەستنیشانكرنا جوگرافییا وان دژێك جودانە، هندەك وەسان ددەنە خویاكرن كو دەڤەرا وان دەستپێدكەت ژ باشووری دەڤەرا بەرواری ژێریا و هندەك دەڤەرا سپنە (صپنە) ژی ل سەر زێدە دكەن، سنوورێن وێ ل باكوور چیایێ گارەیە و ل باشوور چیایێ خێرێ یە (خێرات)، یان دەڤەرا مزووری ژێریا، ل رۆژهەلاتی رووبارێ زێ مەزن و دەڤەرا زێبارییانە و ل رۆژئاڤا ژی دەڤەرا دۆسكییانە[٤٠].

ڤێ دەڤەرێ (٦١) گوند هەنە، ژ گوندێن وان یێن مەزن هەردو گوندێن (سویارێ و سپیندارێ) نە كو پتر ژ (١٠٠) مالانە. ژبلی ڤان گوندان كو ئاكنجیێن وان موسلمانن: (بەراش، بابیاكێ، چەمانكێ (ناڤەندا ناحیێ)، سۆسیا (صۆصیا)، مەرانێ، كانی مازێ، بێبادێ، شكەفتێ، ملبركێ، بێركیات، مسەللەكا، شلیا، ستوكوركێ، خرابیا، غەلبۆكێ، مێمەدەلێ، مێرگەهەلێ، سپیاڤێ و ...).

سەرۆكاتییا ڤێ عەشیرەتێ ددەست (حسێن ئاغا)ی دابوو ژ گوندێ چەمانكێ، ئەو جێگرێ سولتانێ ئوسمانی بوو، پشتی وی كورێ وی نعمان سەرۆكاتییا عەشیرەتێ گرتەدەست، وی ژی دو كور ب ناڤێن (عومەر ئاغا) كورێ مەزن و (مەحمود ئاغا) یێ بچویكتر هەبوون، پشتی وی نەڤیێ وی (خالد ئاغا) ئاغاتییا عەشیرەتێ گرتەدەست.

ژنەمالێن ناڤدارێن ڤێ عەشیرەتێ، بنەمالا ئەحمەد میرخان ژ گوندێ بارەمینكێ، و بنەمالا (فازل ئاغا) ژ گوندێ بەراشێ و بنەمالا (سەلیم ئاغا) ژ گوندێ خرابیا و بنیاتێ ڤان هەمی مالان، بنەمالا (حسێن ئاغا) یێ چەمانكی یە[٤١].

دەڤەر یا داپووشی یە ب دارستانێ، ب تایبەت چیایێ گارەی، داروبارێ بەروی و مازی و گوهیشك و كەزان لێ هەنە. دیسان دارێن كاژا ل چیایێن گوندێ كانیكا ل بەرامبەر ئەتریش هەنە. رووبارێ خازر دناڤ ئەردێ ڤێ دەڤەرێ را دەرباز دبیت و خەلكێ وێ چاندنا دەرامەتی دكر، ب تایبەت مێو و تویتنێ و تویتنا گارەی ناڤ و دەنگێن خۆ هەبوون. دیسان خەلكێ دەڤەرێ پویتە ددا ب خودانكرنا پەزی و تەرش و كەوالی و خەلكێ دەڤەرێ ل بەرێ دچوونە كاروانان، تری و مویژ و تویتن دبرنە دەشتێ و دگوهارتن ب گەنمی[٤٢].

## عەشیرەتا دۆسكی ژووری:

جهێ ڤێ عەشیرەتێ دكەڤیتە سەر سنوورێ باكوورێ كوردستانێ. سنوورێن وێ ل باشوور عەشیرەتا رێكانییانە، ل باكوور دگەهیتە سنوورێ باكوورێ كوردستانێ، ل رۆژهەلات هەركی بنەجی و ل رۆژئاڤا ئەرتووشی. پشتی دابەشبوونا كوردستانێ

دەڤەرا دۆسکی ژووری ژی بوونە دو پشك، پشکا مەزن کەتە دناڤ ئاخا (ترکیا ئەڤرۆ) دا و پێکدهێن ژ (٢٠) گوندان و پشکا بچویکتر کو (٩) گوندن کەتنە دناڤ ئاخا (عیراقا ئەڤرۆ) دا ئەو ژی ئەڤ گوندەنە:

(چێبی، بیری، چەم تیا، شێخ مەما، ئەرتیس، زیروە، تتم، نێروە سیتو، شتونس).

ئەڤ عەشیرەتە یا هەڤجێمکە دگەل عەشیرەتا دۆسکی ژێریا و هەردو ئێك بنیاتن[٤٣]، دۆسکی ژێری یێ ژ دەڤەرا دۆسکی ژووری مشەخت بووین و هاتینە خوارێ و هەمان ناڤێن کەڤن مینا (چیایی، ئەرتیس، همبی و... یێن مایی)[٤٤] یێن دگەل خۆ هینایێن.

ژیانا وان یا ئابووری ل سەر ب خودانکرنا پەزی و تەرش و کەوالی و چاندنا مێوا و فێقیێ دێم بوو، ژبەر دەڤەر یا کێم ئاڤ بوو. دیسان کو دەڤەرا وان دکەتە سەر سنوورێ (دو) وەلاتان خەلکێ وێ کارێ بازرگانیێ ژی دکر.

## عەشیرەتا دۆسکی ژێری:

عەشیرەتەکا مەزنە و سنوورەکێ جوگرافییێ بەرفرەه یێ هەی، دەستپێدکەت ژ باژێرێ دهۆکێ ل باشوور تا دگەهیتە بلنداهیێن چیایێ مەتینا ل باکوور و ژ رووبارێ خابوور ل رۆژئاڤا تا دگەهیتە باژێرێ ئامێدیێ ل رۆژهەلات، ئەڤ عەشیرەتە یا دابەشکرییە ل سەر دو قەزایان[٤٥]. ل پشتی هزارا ئێکێ مشەختی ئەو یێن مشەختبووین و هاتینە خوارێ، چونکی تا (١٠٠٥مش)ێ کو شەرەفنامە هاتییە نڤیسین، ناڤێ وێ دناڤ عەشیرەتێن بەهدینان دا نەهاتییە گۆتن، ڤێجار ئەگەر ب ناڤەکێ دی هاتبیتە گۆتن، چونکی گەلەك ژ عەشیرەتێن بەدلیسی ناڤێن وان هینایێن نهو چ شوینوارێن وان نینن و پتریا عەشیرەتێن بەهدینان ژ نەچاری و برس و خەلا و شەران یێن ژ چیایێن هەکاری ژووری هاتینە دەڤەرێ[٤٦].

دەمەلوجی دیەرتووکا خۆ یا ب ناڤی (اماره بهدینان) دا سالۆخەتا ڤێ عەشیرەتێ دکەت و ب باشی ل قەلەم ددەت، ئەردێ وان وەسان ددەتە خویاکرن کو یێ ب زاخ و پری ئاڤە لەوما خەلکێ وێ دحالەتەکێ خۆشگوزەرانی دبەنە سەر و درەحەتن و سالۆخەتێن خەلکێ ئاکنجی و شارستانی گرتینە. جهێ وان ئەردەکێ ب خێر و بێر و ب دەرامەتە، ئاڤاهی لێ هەنە و مشە مێویژ و هژیرێن هشککری و باهیڤ و گویز و سماق و جۆرێن فێقی لێ هەنە. دیسان ئەردێ وان یێ گونجایە بۆ ب خودانکرنا پەزی و تەرش و کەوالی و مشە پەز و بزن لێ هەنە، چ مال نینن ئەگەر چێلەك و دو چێل و دەهـ بزن و مریشك و سەلەمێشکێن مێشێن هنگڤینی و رەزێن تری و ئەردێ چاندنێ نەبیت. ئەڤە زێدەباری هەبوونا کابانییەکا گوهدار و یا هەڤپشك دگەل کار و ژیانا وی و هەر ئەڤەیە خۆشی[٤٧].

ڤێ عەشیرەتێ پتر ژ (٢٠٠) گوندان هەنە، ناڤەندا ڤێ عەشیرەتێ ناحیا مانگێشکێ یە، خەلکێ وێ تێکەلن ژ موسلمان و مەسیحییان.

**ژ گوندێن وان:**

بەرۆشکا سەعدوین (سەعدون)، هەمزا، دەرگەلا شێخا، مەمانێ، تلاکرو، کۆرەمارکێ، کوریمێ، کۆڤلی، زێوکا کەندالا، زێوکا عەبوی، بادێ، پیرومەرا، زۆراڤا، شویکەیا ژێری و ژووری، کەمەکا، لیناڤا، باخورنیف، پیرەفاتێ، بۆتیا، باکۆزێ، گەرماڤا، باجلۆر، گرێ قەسرۆکا، سندۆرێ، قارقاراڤا، پشتاگری، رشێورێ ، ئۆزمانا، زیناڤا، تنێ، حۆجاڤا، دولیا، زرهەوا، ئەلکیشکێ، گرێبتێ، کەربلێ، بروهەجەرا (بروحەجەرا)، ملهمبانێ، راسلعەینێ، سەراڤکێ، چرانێ، ئەلندکێ، برجین، خازیاڤا، مەجلمەختێ، دیهێ (دهێ) کو گوندەکێ مەسیحی یە، بانکا، کانیکا، تاژێکا، ئاشەوا، سویارەتویکا، بەندا، بیباڤا، سەیداڤا، زڤنگێ، گەرەگو، ئالەکینا، ناڤدارا، شاوریکێ، بابۆخکێ، چەم ترێ، ئەردا، لۆمانا، سارکێ (صارکێ)، دێرکێ، ئێکمالە، ئێکمالا بەرخابویری، بابیرێ، وەرمێلێ، بێسکێ، گوندك نەبی، بەرێ بهار، دێرکا شویکەیا، کانی بەلاڤێ (گوندەکێ مەسیحینشینە)، بابیرێ و ل سەردەمێ ئوسمانییان سەر ب ئامێدیێ ڤەبوو[٤٨]. داوودیێ، هەمزا، پاسێ (پاصێ)، شێخ مەما، وەرمێلێ، گەرەگو، باڤیا،

بانەسۆرا (بانەصۆرا)، ئەرزا، بێسفکا ژووری، ناڤشکێ، بێسفکا ژێری، دێراگژنیك، بێشینکێ.

سەرەرای ڤان گوندان کو ئەڤرۆ بووینە تاخ و کەتینە دناڤ باژێرڤانیا دهۆکێ دا:

(بەرۆشکێ، شندۆخا، شاخکێ، بێسرێ، نزارکێ، ماسیکێ).

هندە دیرۆکنڤیس ڤێ عەشیرەتێ دکەنە چوار تا (تیم)، هەر ئێك یا سەربخوویە ژ یا دی، لێ دۆسکیباتی هەمیان لێك خرڤەدکەت و ئەو چوار تا ژی ئەڤەنە: (چیایی، ئەرتیسی، همبی، کاتۆلی)[49]، لێ عەباسی دکەتە پێنج تا و (کرمانجان) ژی لێ زێدە دکەت[50]، دیسان (پس ئاغا) ژی هەنە.

١- تایێ چیایی: ئەو ژ هەمی تیمێن دی مەزنترە و سەر ب گوندێ گەرماڤانە ل پشتا سکرێ دهۆکێ.

٢- تایێ ئەرتیسی: پتر ژ (١٥) گوندان هەنە، دابەشکرینە بۆ سەر دو جینان، یا ئێکێ ل گوندێ زێوکا محەمەدێ یاسینی (زێوکا عەبوی)، یا دووێ ل گوندێ هەمزا کو ناڤەندا ئاغاتیێ بوو.

٣- تایێ همبی: ئێکە ژ تیمێن گرنگێن عەشیرەتێ، چەند گوندێن ئاڤا هەنە، دابەشکری نە بۆ سەر دو جینان: یا ئێکێ (ژێری) ل گوندێ زێوا شەفیق، جینا دووێ (ژووری) ل گوندێ (بێسفکا ژووری)، کو ناڤەندا ئاغاتیێ بوو.

٤- تایێ کاتۆلی: وان ژی چەند گوند هەنە، جهێ ئاغاتیێ ل گوندێ نزارکێ (نهو تاخەکێ دهۆکێ یە) بوو.

٥- تایێ کرمانج: ژ گوندێن وان: (بەرۆشکێ، زێوکا کەندالا، بەندا، کورێمێ)[51].

٦- تایێ پس ئاغا: پەیڤا (پس) دهێت ب واتایا (کور)، واتە (کور ئاغا)، واتە هەر ئاغا، وان ژی ئەڤ حەفت گوندە هەنە:

(شندۆخا، شاخکێ، لیناڤا، باخورنیف، بێسرێ، پیرەفاتێ، بۆتیا).

## عەشیرەتا رێکانی:

ئێکە ژ عەشیرەتێن مەزن ل دەڤەرا بەهدینان، کەڤنترین ژێدەر بەحسێ ڤێ عەشیرەتێ کری پەرتووکا (شەرەفنامە) یە، کو ناڤێ وێ ب (رادکان) ئینای، پاش بێ سڤك بووی بوویە (رێکان)، چەند بۆچوون ل سەر ناڤێ وێ هەنە:

- رێکان ژ دو برگان یێ پێکهاتییە کو هەردو پەیڤێن کوردی نە: یا ئێکێ (رێ)، کو مرۆڤ ل سەر دچیت، و (کانی) واتە ئەو جهێ ئاڤ تێ دزێت، واتە ناڤێ رێکانی یێ ژ (رێیا کانیێ) هاتی(٥٢).
- رێکان ژ دو پارچە پەیڤان پێکدهێت (رێکا + نی)، واتە دبیتە رێکا نوی (رێکانی).
- ل دۆر پەیڤا (رادکان) نڤیسەر (نزار ئەیوب گولی) دبێژیت (راد) د زاراڤێ لوری دا ب واتایا (جوامێر) دهێت، رادکان ژی بۆ کۆمێ یە، واتە کۆما جوامێران.

## سنوورێن ڤێ عەشیرەتێ:

ئەڤ عەشیرەتە دکەڤیتە رۆژهەلاتێ باژێرێ ئامێدیێ، سنوورێن وێ ل باکوور چیایێن ئۆرەمارن، ئەڤ چیایە دگەل چیایێن (ئاشوتێ) دبنە سنوورێن سیاسی یێن ئەڤرۆ دناڤبەرا (هەردو وەلاتێن عیراق و ترکیا) دا. عەشیرەتا دۆسکی ژووری یاو عەشیرەتا هەرکی بنەجی (واتە بنە جهـ) دکەڤنە باکوورێ رۆژهەلاتێ جوگرافییا ڤێ عەشیرەتێ. ل رۆژهەلاتی عەشیرەتێ رووبارێ (شەمزین صو- شەمزینان) یە کو دبێژنێ (رویێ شین)، ئەڤ رووبارێ شین ناڤبرا جوداکرنێ یە ژ دەڤەرا بارزان و عەشیرەتا مزووری ژووریا، کو دکەڤنە باشوورێ رۆژهەلاتێ ڤێ عەشیرەتێ. ل باشوورێ ڤێ عەشیرەتێ ژی شێلادزێ یە و عەشیرەتا نێروە دکەڤیتە رۆژئاڤایێ وێ[53].

دەڤەرا رێکان ل سەردەمێ ئوسمانییان ناحیەکا سەربەخۆ بوو، رێڤەبەرێ وێ ژلایێ حوکمەتێ ڤە ژ ناڤ مەزنێن وێ یێن خودان دەسەلات دهاتە هەلبژارتن، بەلێ پاشتر هەر دو عەشیرەتێن رێکان و نێروە بوونە

ئیك ناحیە بناڤێ ناحیا نێروە رێكان كو ناڤەندا وێ ل گۆندێ بێبوو بوو، سالا ١٩٧٩ ئەو ناحیە ژی هاتییە هەلوەشاندن، ئەو رێڤەبەرێ بۆ ناحیێ دهاتە دانان ئێك بوو ژ خودان دەسەلاتدارێن دەڤەرێ و ژ لایێ حوكمەتێ ڤە دهاتە دامەزراندن[٥٤]. (٧٩) گوند سەر ب ڤێ ناحیێ ڤەبوون و یێ ژ هەمیان مەزنتر گوندێ (هور) بوو كو ژمارا مالێن وان دگەهشتە (٨٠) خانییان، پاشی (بێبو) كو دبوونە (٤٠) خانی. ژ گوندێن دی یێن گرنگ ل دەڤەرا رێكانی یا گوندێن وەرخەل و مروانس و سیتان، كو شێخێن بامەرنێ ژوێرێ یێن هاتین و وان گەلەك گوند ل وێرێ هەنە، سەر ب تەكیا بامەرنێ یا نەقشەبەندی ڤەنە، ئەو ژی گوندێن (هورە، هیل، ئاوكا، هوجی، رێشمە، كێریادێرێ، بیدە، كوكەرێ). ژبەر سرۆشتێ جوگرافیێ دەڤەرێ و بارینا بەفر و بارانەكا زۆر ل زڤستانان و هەبوونا چیایێن ئاسێ و دۆلێن كویر، چاندنا گەنم و جەهان لێ یا كێمە، ئابوورێ دەڤەرێ پتر بێ گرێدای خودانكرنا پەزی و تەرش و كەوالی یە، هەر وەسان پویتەی ددەنە رەزا و دار و بارێ فێقی.

ڤێ عەشیرەتێ گوند ل ناڤ سنوورێ (تركیا ئەڤرۆ) ژی دا هەنە، ژوانان گوندێ شیڤارەزا. سەرۆكاتییا عەشیرەتێ هەر دكەڤن دا یا ددەستێ خێزانا (زاهر ئاغای) دا ، پشتی وی (فەتاح ئاغای) و پاشی (تاهر ئاغای) و ل دووڤدا (كەلحێ ئاغا) و نهو یا ددەستێ كورێ (محەمەد ئاغای) دا. هۆزا رێكانییا مینا مزووری ژووریان سیستەمەكێ دناڤ خۆدا هەی دبێژنێ بەلیك و هەر بەلیكەك چەند گوندان بخۆڤە دگریت، ئەڤ بەلیكە كاروبارێن رێڤەبرنا عەشیرەتێ ب ساناهی دئێخیت. ڤێرە یا دابەش كرییە بۆ سەر هەشت بەلیكا:

١- بەلیكا شیڤا رەزا (سەرێ بەلیكێ)، بەرپرسیارەتی یا ل هەمان گوندی، پێكهاتییە ژ ڤان (٧) گوندان: (جانمەدا، خارێ، قەسركێ،مەیدانێ، مركانش، برجێل، جبلی).

٢- بەلیكا شابا بێدە: بەرپرسی یا ل گوندێ بێدە، ئەو ژی پێنج گوندن: (هیش، پیر ئاڤدەلا، گەڤزونە، میرگاڤا).

٣- بەلیكا مەرزا، بەرپرسیارەتی یا ل گوندێ سنجێ. پێكهاتییە ژ (٨) گوندان، ئەو ژی : (سنجێ (سەرێ بەلیكێ)، ئستپ، شامكێ، رەزگە، هول (هولیان)، شابەكەما، دەعلكێ، پیرەسنا).

٤- بەلیكا مشار، یان (كێریا دێرێ)، بەرپرسیارەتی یا ل گوندێ كریادێرێ، پێكهاتییە ژ (٥) گوندان: (مێز، هنێش، بیارێ، رەبا).

٥- بەلیكا پرسۆك (دێم)، بەرپرسی یا ل گوندێ باوان، پێكهاتییە ژ (٥) گوندان: (باوان (سەرێ بەلیكێ)، وەرخەل، هریاش (هریاشك) ، سوریان، سیدان).

٦- بەلیكا خالكا (سەرێ بەلیكێ)، بەرپرسێ وێ یێ ل گوندێ خالكا، پێك هاتییە ژ (٧) گوندان، ئەو ژی گوندێن (مامیسا، بەنستان، مروانس، دێركێ، دهیك رۆژهەلات، رزێ).

٧- بەلیكا پشت چیا، یان دبێژنێ بەلیكا (حولیكا)، ژبەر هەبوونا گەلەك دارێن حولیكا، بەرپرسیارەتی یا ل گوندێ پێبەرخا و پێكهاتییە ژ ڤان (١٤) گوندان: (پێبەرخا (سەرێ بەلیكێ)، سیتە، شاجا، ساركێ، دهیك رۆژئاڤا، كوكەرێ، بێزەلێ، كاڤلكا، بێباكرێ، باغەلا، بێستەپێ، چەمێ جی (چەمجی)، هادیسڤا، رێنجبراخە).

٨- بەلیكا روبار (ئاڤی)، بەرپرسی یا ل گوندێ هیل[٥٥]، پێكهاتییە ژ (١٠) گوندان: (هیل (سەرێ بەلیكی)، مازی، هورە، بانسرا، ئاوكا، بالەسینا، زێوكێ، ئەرتش، هوص، رێشمە).

ڤێ دەڤەرێ گەلەك گوندێن دی یێن كەڤن هەبووینە كو نهو كاڤلە گوندن، وەكی:

(فەقیان، كونیشكا، بەرشكەفتنا، بێبنێ، باڤێ، بەرباڤێ، مرەزە، بێبشرێ، كانیتێ، پیرئومەرا، ئاتێ، ئاشیش، مازی ژێری، بێكروب، گوندكێ، بیشێ، بێسەلمێ، خانی خەزالێ، بەنستانكێ، كولا، باغەلا، ئاوكا خراب، باژێرێ، بلبل، رەبا، قەلەندەرا، خالكا خراب، مامكا، گەراڤ، نەهشك).

## عەشیرەتا نێروە[٥٦]

ئێکە ژ عەشیرەتێن کەڤن و د ئاکنجی، ب ناڤێ کەلا (نێروە) هاتییە ب ناڤکرن کو کەلایەکا بەرنیاسە ب کۆچکێن ئاغایا و یا ل سەر کەلایەکا کەڤن هاتییە ئاڤاکرن. دبێژن یا میرەکێ ئامێدیێ بوو، ئەو ژی ب بەر و گێچا یا هاتییە دروستکرن، دهێتە هەژمارتن ئێك ژ شوینوارێن کەڤن ل دەڤەرێ، دکەڤیتە سەر گوپیتکا چیایەکی و یا پێکهاتییە ژ شەش نهۆمان، ژمارا ژوورێن وێ تەمەت ژمارا رۆژێن سالێ یە. ل نهومێ ئێکێ کانییەکا ئاڤا زەلال یا لێ هەی، نهۆمێ دووێ یێ تایبەتمەندە بۆ عومبارکرنا دەرامەتێن چاندنێ و قویتێ زڤستانێ.

سنوورێن وێ دەست پێدکەن ژ شێلادزێ ل باشووری تا دگەهیتە سنوورێ باکوورێ کوردستانێ ل باکووری. و ژ عەشیرەتا رێکانییا ل رۆژهەلاتی تا دگەهیتە رووبارێ زێیێ مەزن و دەڤەرا بەرواری ژووریيا ل باشووری.

ڤێ عەشیرەتێ (٢٩) گوندێن ئاڤا هەبوون، پشتی نەخشەکێشانا سنووری دناڤبەرا عیراق و ترکیا دا، سێ گوندێن نێروەییان ب ناڤێن (ئارش، شلوکو، هەرکاش) کەتنە دناڤ ئاخا ترکیا دا و هێلا سنووری دنیڤا گوندێ (جارمندا) را دەرباز بوو، کو ئەو ژی ئێکە ژ گوندێن نێروەییان و گوند بۆ دو پشك، هەر پشکەك ل وەلاتەکی و (٢٦) گوند ژێ مانە دناڤ سنوورێن عیراقێ دا، چوار ژ وان گوندان مەسیحی نە کو ئەو ژی (نێروە ژێری، وێلە، باشێ، کرو) و یێن دی موسلمانن و د پێکهاتینە ژ ڤان گوندان:

(نێروە (هێشەت)، دووتازا، زێوا سەری، زێر، ساکا، سەرنێ، سپێر، بێتفە، سینیا، کارۆکا، بێرومان، شیڤێ، ئەلەهێ، بێزنۆر، کانیسارکێ، زێواشکان، دزگە، جەمکا، خادورا، شیڤا ئوسمانکا، بێبو، کو ناڤەندا ناحیا نێروە و رێکان بوو).

سرۆشتێ ڤێ دەڤەرێ ب رەنگەکێ گشتی یێ چیایی یە، چیایێن بلند و دۆلێن کویر و کانی و جۆکێن ئاڤا و داروبارەکێ تێکئالیایی و دارستانێن مشە لێ هەنە، لەوما بوویە جهێ چەروانەکێ باش و دەرامەتێ دارستانی ژی مینا گرۆسك و گوهیشك و کەزان و بەرِوی و مازی لێ هەنە، هەر وەسان ب گویز و باهیڤا ژی یا ب ناڤ و دەنگە. ژبەر بارینا بەفر و بارانەکا زۆر ل زڤستانان، چاندن یا لێ کێمە و پتر پالپشتییێ ل سەر ب خودانکرنا پەزی و تەرش و کەوالی دکەن، دیسان مێشێن هنگڤینی ژی ب خودانکەن و پویتە ددەنە مێوا و جۆرێن داروبارێ فێقی.

ڤێ عەشیرەتێ ژی مل ب ملێن عەشیرەتێن دی یێن دەڤەرێ، شەر دژی ئینگلیزان ب سەرکێشیا سەعدولا ئاغای کرینە[٥٧].

## عەشیرەتا سۆرچی:

عەشیرەتەکا کەڤن و مەزن و ئاکنجییا بەرنیاسە، هەر ژ سەدسالییا (٤ مش/١٠ ز) ناڤێ وێ یێ ب (سرنجی) هاتی .

ئەڤ عەشیرەتە یا ل دەڤەرا ئاکرێ ئاکنجی یە، هەروەسان یێن ل دەڤەرێن شەقلاوە و رەواندز ژی هەین، ل هەردو لایێن رووبارێ زێیێ مەزن دئاکنجی نە، ئەوێن ل لایێ چەپێ ژ رووبارێ زێیێ مەزن دژین رووبەرەکێ مەزنێ ئەردی ڤەدگرن، ژ بەستورە دەست پێدکەت تا دگەهیتە کانی عەتمان، ئەردێ وان پتریا دەشتا هەریر ڤەدگریت، نێزیکی (٢٥٠) گوندان هەنە و ئەڤە بەلگەیە کو عەشیرەتەکا گرنگ و مەزنە و سەنگ و جهێن خۆ یێن دناڤ عەشیرەتێن دی دا هەی، یا بەرنیاسە ب وێرەکی و زیرەکییا خۆ.

مەزنێن ڤێ عەشیرەتێ ژ بنەمالێن ئۆلی نە، شێخن ل سەر رێبازا (نەقشەبەندی)، تەکیایەك ل گوندێ کولکانا دانان، پاشی ل بجێل، وان ژی هەلویستێن نیشتیمانی هەنە و بەرگری دژی ئینگلیزان ل شەرێ (گردەسین) ل ٦/کانوونا دووێ سالا (١٩١٩)ێ کرینە. دڤان شەراندا زیانێن مەزن گەهاندینە ئنگلیزان[٥٨].

**زاراڤێ خەلکێ دەڤەرێ کرمانجییا ژووری یە و پەیڤێن کرمانجییا خوارێ ژی ل ناڤ هەنە.**

ژیانا وان ل سەر ب خودانكرنا پەزی و تەرش و كەوالی یە. سۆرچی ژ (٥٠) بابكان پێكدهێن[59]، سەرۆكاتیا عەشیرەتێ ددەستێن (شێخ سابر كورێ شێخ رەقیب سۆرچی) یە كو ل سالا (١٩٩٩)ێ وەغەر كری.

## ژ گوندێن ڤێ عەشیرەتێ:

سۆسناوا، خانەگە، شەرەفونا، قەسرۆك، ئەستریان، زرگێنە، شارانێ، روولكا كەریم خان، روولكا ژووری و ژێری، شانەسۆر ژێری، چەمەسێل، كەندەگول، بیێ، بانەسۆر، گۆجار، سۆریا ژێری، خولێ، دازین ژێری، دازین بنزویر، دەشتیل، دازین ژووری، خەلان مامگرد، سۆریا، نێروا، سەروكانی، بوسێل، گەلۆك مامگرد (كانی دری)، سامەدین، داروك ژووری و ژێری، جۆنەلە، زنتا، شانەسۆر ژووری، مێرگەمۆشك، بێخمە، بنهەڤراز، ماندیان ژێری و ژووری، زیوە، كێلان، گەلۆك مامساك ژێری، دزۆك، میربالیان، كەندەسۆر ژێری و ژووری، كەشانە، بیبا ژێری، زراڤكێ، بانیە قولێر، كێلی سینان، مەمەندۆك، هیزان، گەرمكا ژووری و ژێری، دۆبێ، سەرسول، گەویلان، كەلات (كەلاتی)، گەلووك مامساك ژووری، بێسمەكەران.

## عەشیرەتا گۆران:

گۆران وەكی گۆتن ب چەند واتایان دهێت، گۆران ناڤێ ئێك ژ چوار زاراڤێن كوردی یە، دیسان دبێژنە وێ دەڤەرا دكەڤیتە دناڤبەرا كەركووك و دەشتا شارەزۆر تا دگەهیتە خانەقین و حەلوانا كەڤن گۆران[60].

یەكەم جار ناڤێ عەشیرەتا گۆرانا مەزن ل سەر مەیدانا رویدانێن مێژوویی ڤەدگەریت بۆ نیڤا ئێكێ ژ سەدسالیا دەهێ زایینی[61]، مێژوونڤیس و جوگرافیناسێن موسلمانان ناڤێ وێ ب چەندین شێوا یا نڤیسی وەكی جابارقە، جابادقە، جورقان. د ژێدەرەكێ فارسی یێ كەڤندا كو مێژوویا وێ ڤەدگەریت بۆ سالا (١١٢٦)ێ ناڤێ جورقان ب گۆرانان هاتیە و ئەو یەكەم ژێدەرە كو ل سەر رێكەفتین بۆ ناڤێ وێ. شەرەفخانێ بەدلیسی (١٥٤٣-١٦٠٣)ێ دبێژیت ئەو ئێك ژ چوار پشكێن مەزنێن كوردانە كو پێك دهێن ژ (كرمانج، لۆر، كەلهور، گۆران)، و هەمی كوردێن ل ئیرانێ گۆرانن، لەوما زاراڤێ وان ژی دهێتە هەژمارتن ئێك ژ زاراڤێن سەرەكیێن كوردی. هەژی ئاماژێ یە كو ناڤێ گۆران (گۆرانیە) ب رەنگەكێ دروست د ژێدەرێن چاخێ مەملوكی (١٢٥٠-١٥١٧)ێ دا هاتیە، پتریا وان ژێدەران پشتراست كریە كو گۆران عەشیرەتەكا كوردی یە[62].

واتایا گۆران وەكی پەیڤ بۆ وان كەسان دهێت یێن د كەڤن دا ژ عەشیرەتێن خۆ ڤەبووین[63] یان وەكی مەلا مەحمودێ بایەزیدی دبێژیت بۆ وان كەسان دهێت یێن ئاكنجییێن گوندان و بۆ وان جۆتیارێن بنەجهـ هەڤدژی كۆچەراتان كو هاتن و چوونێ دكەن. نەژادێ عەشیرەتا گۆران ل دەڤەرا بەهدینان ڤەدگەریت بۆ دەڤەرێن كەركووك و هەولێر و سلێمانیێ و دیالا، دیسان بۆ باكوور و رۆژهەلاتێ كوردستانێ، ئەو ژی ژ سەدەمێن ئابووری و جڤاكی و سیاسی قۆناغ قۆناغ هەر ژ ناڤەراستا سەدسالیا هەژدێ یێن هاتینە دەڤەرێ. ناڤێ هندەك ژ وان ل سالا (١٧٩٤)ێ یێن دناڤ عەشیرەتێن ویلایەتا مووسلا ئوسمانی دا هاتین[64]، دووماهیك كۆما گۆرانان ل سالا (١٨٣٢ز)ێ دگەل میرێ سۆران (محەمەد پاشایێ رەواندزی (١٧٨٤-١٨٣٦ز)ێ دەمێ ب سەر دەڤەرێ دا گرتی و كوردێن ئێزدی ژبەر درندایەتی وی رەڤین[65]، یێن هاتین و ل دەڤەرێ ئاكنجیبووین.

د راستی دا ئەڤ عەشیرەتە نە ئێك عەشیرەت ب تنێ یە، بەلكی كۆمەلەكا عەشیرەتانە و دبێژنە هەمیان پێكڤە (گۆران) مینا: (رەژووگەری، زەنگەنە، بۆتانی، گێژ، ئومەری، رۆژبەیانی، داوودی)، هەمیان نهو ئەردێ چاندنێ هەنە و دئاكنجی نە[66]، وەكی د پەرتووكا (مێژووی بەردەرەش) ژی دا هاتی دبێژیت پێكدهێت ژ: (رەژووگەری، گێژ، زەنگەنە، موسەیی، بۆتان، شەبەك، شێخ بزێنی، بەرازی، رۆژبەیانی، چۆپانی، باجەلان، خدری، ئۆمەریل، داودی، شارك، بەرزنجی، بلباس، زەند)[67]. د دابەشكری نە ل سەر دەڤەرێن ڤەزایێن مووسل و بەردەرەش و ئاكرێ و

شێخان، ژ گرنگترین عەشیرەتێن گۆران كو ل دەڤەرا بەهدینان هەین (رۆژگەری، گێژ، بۆت (بۆتان)هەر وەسان عەشیرەتێن بچویكتر ژی هەنە. عەشیرەتا گۆران چ سەركردەیێن بلند یان فەرمانرەوایێن بلند نینن، بەلكی هەر گوندەكی یان عەشیرەتەكێ یان بابكەكی سەرۆكەكێ تایبەت ب وان ڤە یێ هەی[٦٨].

پتریا گۆرانان ل وێ دەڤەرێ دژین یا كو دەست پێ دكەت ژ گوندێ چەمە ل باكووری تا گوندێ وەردەك ل باشووری، كو هەردو دكەڤنە لایێ راستێ ژ رووبارێ زێ یێ مەزن (زێ بەهدینان)، و تا دگەهیتە رووبارێ خازر و رووبارێ گومر و هەردو چیایێن مەقلۆب و زەردك ل رۆژئاڤایی. ل لایێ باكووری ڤە سنوورێن وێ دەست پێ دكەت ژ سنوورێن كارگێری یێن هەردو ناحیێن مرێبا و گردەسین. باژێركێ بەردەرەش (ناڤەندا قەزایێ) و ناڤەندێن ناحیێن كەلەك و دارەتوو رۆڤیا و كەلەكچی و گوندێن بشیریان و گردەپان و زەنگەنان و گەلۆك و مەم و زین و كۆمەلگەها چرە ، دهێنە هەژمارتن مەزنترین جهێن ئاكنجیبوونا ڤێ عەشیرەتێ، ژبلی كو یێن ل نێزیكی (١٥٠) گوندان ژی هەین. پتریا خەلكێ ڤێ دەڤەرێ كارێ جۆتیاریێ دكەن و تەرش و كەوالی ب خودان دكەن، سەرەرای كارێن ئازاد و كاركرن دناڤ فەرمانگەهێن میری دا، گرانیا عەشیرەتا گۆران یا ل سەر عەشیرەتێن (بۆتانی و رەژووگەری و گێژ) ی[٦٩].

## ١- عەشیرەتا رەژووگەری:

مەزنترین عەشیرەتا گۆرانانە، وەسان دهێتە هزركرن كو ئەو یێن ژ هەردو دەڤەرێن رانیە و رەواندز ل هەولێر و سلێمانیێ هاتین، ئەڤ عەشیرەتە دكەڤیتە دەڤەرا رووبارێ زێیی ل نێزیكی عەشیرەتا سۆرچییا، هەر وەسان یێن ل ناحیا كەلەكێ ژی هەین. ڤێ عەشیرەتێ ٢٥ گوند هەنە و رێژەیا وان نێزیكی ٥٥٪ ێ ژ هەمی گۆرانانە[٧٠]، جهێ ئاكنجیبوونا وان یێن ل ناڤەندا ناحیا دارەتوو و ناڤەندا قەزا بەردەرەش، ژبلی گەلەك گوندێن دی مینا: (زەنگەنان، گربەدەو، مۆریلان، خێركی، زمزمۆك، گومەزەرد، خاریك، دلاری، كەونەپاك، بەردەرس گەورە، دۆستەك و ...)[٧١].

چیرۆكەكا دناڤ ڤێ عەشیرەتێ دا هەی دبێژن ل بەرێ ل سالا (١٤٣٣ز)ێ ل دەڤەرا رانیە چوار برا ب ناڤێن (شاسوار، جوبان، میران و قەنبەر) هەبوون، ب بوورینا دەمی دۆندەها وان زێدەبوون و نەڤی و نەڤی چركێن وان مشەبوون تا چوار عەشیرەت ژێ دەركەتین. سەرۆكاتیا عەشیرەتێ د بەرێ دا ددەست (وەلی ئاغای) دابوو كو ل سالا (١٤٧٧ز)ێ ل گوندێ رەشگری وەغەركری و چوار بابك ژێ دەركەتین و هەر ئێك ب ناڤەكی، نهو سەرۆكاتیا وێ یا ددەستێ (عەبدولقادر ئاغای) دا .

ژ سەرۆكێن ڤێ عەشیرەتێ و كەسایەتیێن وان یێن بەرنیاس و خودان دەستەلات، ئەمین ئاغا دارەتوو و كورێ وی عاسم، و قادر ئاغا زەنگەنان و عەبدولا ئیسماعیل مەعرۆف بەردەرەش و یاسین ئاغا عەجاج ژ گومەزەرد و یونس ئیسماعیل گربدو.

د راپوورتەكێ دا ل سەر عەشیرەتێن كوردی ل دەڤەرا ئاكرێ كو ل ناڤەراستا سالا (١٩٦٤ز)ێ ژ پارێزگەها مووسل دا هاتیە: (خەلكێ وێ ل ناڤەندا ناحیا (عشائر السبعه) ل لایێ رۆژهەلاتی ژ رووبارێ زێ مەزن دا دژین).

دیسان هاتیە: (ژمارا خەلكێ وێ نێزیكی ٧٠٠٠ كەسان و د زالن ل سەر دەڤەرێ).

## ٢- عەشیرەتا زەنگەنە:

عەشیرەتەكا مەزن و بەربەلاڤە ل باشوورێ كوردستانێ و یا ب ناڤ و دەنگە، د بەلاڤن ل پارێزگەهێن كەركووك و دیالا و مووسل، ناڤێ وێ یێ د شەرەفنامە دا هاتی. ل سەردەمێ شاهـ (ئیسماعیلێ سەفەوی) پایا وێ بلند بوو و سەر ب هەمی عەشیرەتان دكەت. پشتی نەمانا سەركردەیێن عەشیرەتێ، عەشیرەت نەچار بوو بەربەلاڤ بوو و كەتنە دخزمەتا قزلپاشیا دا ل هەردو ویلایەتێن عیراق و خوراسان و هندەك شیان خۆ ب گەهیننە تیما زێرەڤانێن شاهی (قورجیان). دبێژن ئەو یێن ل سالا (١٨١٠)ێ ل دەڤەرێ ئاكنجی بووین.

بنیاتێ ڤێ عەشیرەتێ ل دەڤەرا بەهدینان ڤەدگەریت بۆ کەرکووك و خانەقین و کفری، ژ گوندێن وان (بەردەرەشا بچویك)، هەر وەسان یێن ل دەڤەرا نافکورێ و ناڤەندا مووسل و دەردوڕێن ناحیا حەمدانیە ل گوندێن (بازگرڤان، ترجلە، شێخ ئەمیر) هەین. ئەڤە عەشیرەتەکا ئاکنجی یە، کارێن چاندنێ و خودانکرنا پەزی دکەن. ژ سەرۆکێن وان یێن بەرنیاس عەبدولکەریم ئاغا و حەسەن ئاغا و محەمەد کەریم ئاغا و عەلی حەسەن ئاغا و ئیبراهیم خانچی. ژ بنەمالێن وان یێن ناڤدار، بنەمالا محەمەد وەردەك، ژ کورێن وی بنەمالا رەشید محەمەد وەردەك کو ئاکنجیێن چرەینە، و بنەمالا سەدیق محەمەد وەردەك ل گوندێ گرك سوپاشی و تەقیەددین سەدیق کو نهو ئاکنجیێ بازێرێ دهۆکێ یە. پشتی سەرۆکێ وان حەجی محیەددین ئەحمەد خەلیل بەردەرەشی ل سالا (١٩٨٤)ێ وەغەرکری، کورێ وی یێ مەزن (عەبدولمەجید) سەرۆکاتیا عەشیرەتێ گرتەدەست و پشتی ئەو ژی ل سالا (١٩٨٦)ێ هاتییە کوشتن، دەستەلاتیا عەشیرەتێ کەتە ددەست ئەحمەد بەردەرەشی دا. ڤێ عەشیرەتێ چەند بابکال ژی هەنە[٧٢]. دیسان ژ ماقویلێن وان یێن بەرنیاس کویخا محیەددین ئەحمەد موختار ژ گوندێ بەردەرەش بچویك. ڤێ عەشیرەتێ دو گوند یێن ل دەڤەرا گۆرانان هەین، ئەو ژی بەردەرەش بچویك و شیورە و رێژەیا ڤێ عەشیرەتێ ١٪ ێ ژ هەمی گۆرانان.

### ٣-عەشیرەتا بۆت (بۆتی):

ئێکە ژ عەشیرەتێن گۆرانان و دهێتە هەژمارتن عەشیرەتا سیێ ب مەزنیا خۆ دناڤ هەمی گۆراناندا، زاراڤێ وان مینا زاراڤێ گۆرانا نەو رێژەیا وان ١١٪ ێ[٧٣]، ئەڤ عەشیرەتە گەلەکا کەڤنە و مێژوویەکا دێرین یا هەی، ناڤێ وێ یێ د شەرەفنامێ دا هاتی، هەر وەسان ناڤێ وێ یێ دناڤ عەشیرەتێن ویلایەتا مووسل ل سالا (١٧٩٤)ێ دا هاتی. سەرۆکێن وان دبێژن ئەو یێن ژ باکوورێ کوردستانێ ل جزیرا بۆتا هاتینە دەڤەرا سۆران و پاشی یێن هاتینە دەڤەرا بەهدینان، ناڤ و دەنگێن ڤێ عەشیرەتێ یێ ل ناڤ عەشیرەتێن کوردان هەی. ناڤێ وێ یێ ژ (بوت- ان) یان (بت – ئان) هاتی، کو ئەو ژی جهێ پەرستنا (بوتان) ە کو ئەڤ جهە هەر دکەڤندا یێ بەرنیاسە ب هەبوونا بوتان و شوینواران[٧٤].

گەلەك ژ خەلکێ ڤێ عەشیرەتێ مشەخت بوون و بەرەڤ باشوور ڤە هاتن و پتریا وان ل باشوورێ کوردستانێ ئاکنجی بوون و دەڤەرا نافکورێ وەکی جهوار بۆ خۆ هەلبژارتن و ئەون دبێژنێ (بۆتان)، کو دەڤەرەکێ ڤەدگریت هەر ژ رووبارێ زێیێ مەزن تا دگەهیتە جسر مەندان ل خازری، ل باشووری هەڤتوخیبن دگەل عەشیرەتا گێژ و ل باکووری دگەل عەشیرەتا رەژووگەری و ل رۆژهەلاتی پارێزگەها هەولێر و ل رۆژئاڤا حەمدانیێ. پتریا خەلکێ وێ ل ١٥ گوندان سەر ب ناحیێن کەلەك و دارەتوو ڤەنە ل قەزا بەردەرەش، ژ گوندێن وان: (گەڵوك، گردەپان، کو بنگەهێ ئاغانە، بشیریان، گوندێ قاتسی مەزن کوتەڤدا بۆتانن، دوسرە، گەویلان، تربە سپی، شێخالك، دریت بۆت، کوراف، هنجیرە کۆن، هنجیرە نوی، کانی هرچ).

ژ مەزنێن بەرنیاسێن عەشیرەتێ مەجید عەبدولەحمان ئیسماعیل ئاغا ژ گوندێ گردەپان، محەمەد نەجم حسێن ئاغا ژ گوندێ گەلۆك.

چونکی ئەڤ عەشیرەتە یا ئاکنجی یە، لەوما کارێ وان یێ سەرەکی و چاندن و ب خودانکرنا پەزی و تەرش و کەوالی یە.

ژ تایێن ڤێ عەشیرەتێ: ئاغا (سەرۆکاتیا عەشیرەتێ دکەن، ژوانان عەبدولرەزاق ئاغا)، بالاتی، کزی، خۆشلی، خەمانی، لۆلکی، خێرکی[٧٥]. ژمارا خەلکێ وێ وەکی د راپوورتا پارێزگەها مووسل ل سەر عەشیرەتێن کورد ل دەڤەرا ئاکرێ ل ناڤەراستا سالا (١٩٦٤)ێ دا هاتی (نێزیکی ٢٠٠٠ کەسانە)[٧٦].

### ٤- عەشیرەتا گێژ:

تایەکێ دی یە ژ عەشیرەتا گۆران و دهێتە هەژمارتن عەشیرەتا دووێ ب مەزنیا خۆ پشتی (رەژووگەری)،

یێن ژ دەڤەرا کفری ل کەرکووکێ هاتین دبەربەلاڤن ل قەزایێن مووسل و بەردەرەش و شێخان، ناڤەندا وان گوندێ رۆڤیا و دوبەردان ل چیایێ مەقلۆبی یە. یێ هاتی کو ئەلگیژ (ئال گاژ – Gaj) هەر ئەون یێ ناڤێ وان د شەرەفنامێ دناڤ عەشیرەتێن کوردی ل ئیرانێ دا هاتی بێ کو پتر ل سەر نڤیسیبت. رێژەیا وان ٢٣٪ێ یە، خەلکێ ڤێ عەشیرەتێ جۆتیارن و درەحەتن، ل دو گوندان ل سەر رووبارێ نارین دژین و کێم پێزانین ل سەر مێژوویا ڤێ عەشیرەتێ هەنە. خەلکێ ڤێ عەشیرەتێ دبێژن کو ئەو دبەرێ دا عەشیرەتەکا بۆش بوون و گەلەك بوون، سنجەقەکا تایبەت ب وانڤە هەبوو، لێ تەراوبەرا بوون هندەك ژ وان چوونە (بادمان) نێزیکی مووسل[٧٧]. و باوەری هەیە کو ئەو عەشیرەتەکا بۆش بوون، ڤێ عەشیرەتێ ٢٥ گوند هەنە، ژوانـان: (رۆڤیا «ناڤەندا ناحیێ»، بامەرزێ، حەسەنیێ، دوبەردان مەزن، کانیلان، ئاسماوا، دولیجان مەزن، خمس کجا، حسینیکا، کرکا جویا، کرکایا).

د راپوورتەکێ دا ل سەر عەشیرەتێن کوردی ل دەڤەرا ئاکرێ کو ل ناڤەراستا سالا (١٩٦٤ز)ێ ژ پارێزگەها مووسل دا هاتییە: (خەلکێ وێ ل وێ دەڤەرا دکەڤیتە دناڤبەرا رێکا گشتیا مووسل – ئاکرێ و رووبارێ خازری ل ناحیا (عشائر السبعە) دا دژیت و ئاغایێن وان هەر ئێك ژ ئەحمەد و مشیر و عارف و عەزیز کورێن ئیسماعیل ئاغایێ رۆڤی نە).

دیسان هاتییە: (ژمارا خەلکێ وێ نێزیکی ٢٠٠٠ کەسانە)[٧٨].

ئەڤ عەشیرەتە ژی ژ عەشیرەتێن ئاکنجی یە و ژیانا وان یا ئابووری پتر ل سەر چاندنێ و ب خودانکرنا پەزی یە، تەکیایەك ل رۆڤیا هەیە، ژ کەسایەتیێن بەرنیاسێن عەشیرەتێ بنەمالا ئیسماعیل سالح ئاغا کو نهو ل گوندێ بامەرزێ، دیسان ژ کەسایەتیێن بەرنیاسێن ڤێ عەشیرەتێ ئەحمەد و مشیر ئیسماعیل ئاغا، هەر دیسان بنەمالا خدری. سەرۆکاتیا عەشیرەتێ دکەڤندا یا ددەست (مشیر ئاغا کورێ ئیسماعیل ئاغای) دا ل گوندێ رۆڤیا و عەبدولغەفور ئاغا کورێ خالد ئاغا ل گوندێ دوبەردان[٧٩].

عەشیرەتا گۆران گەلەك عەشیرەتێن دی بخۆڤە دگریت کو دبنە رێژا ٧٪ێ ژ هەمی گۆرانان، مینا داوودی، ئومەربل (ئومەری)، شارك، لك، چۆپانی، شکاك[٨٠]، بلباس، مووسیی، رۆژبەیانی، زراری، باجلان، شێخانی، شەبەك. هەر دیسان هندە عەشیرەتێن دی ژی ل دەڤەرا گۆرانان دژین، مینا زێباری و هەرکی و سۆرچییان.

## ٥- عەشیرەتا ئومەری:

ل جهێن بەلاڤ ل کوردستانێ هەنە، ژوانان ل دەشتا هەولێرێ و ل ناڤ باژێرێ هەولێرێ بخۆ ژی دا، گوندەکێ تایبەت ب وانڤە ل دەڤەرا هەولێرێ ب ناڤێ ئومەریك هەیە، دیسان یێن ل باکوورێ کوردستانێ ل ئامەدێ و ل رۆژئاڤایێ کوردستانێ ژی هەین. ژ گوندێن وان (کلاشین و نێجەهێ و برازی بچویك و برازی مەزن و گداد و هنجیرۆك دبایا). خەلکێ ڤان گوندان هەمییان ژ عەشیرەتا ئومەریانە. هندەك ژ خەلکێن ڤێ عەشیرەتێ دەمێ ژ باکوورێ کوردستانێ هاتین ب سەرۆکاتیا حەسەن ئاغا و رەشید بوون، یێ ئێکێ ل چیایێ مەقلۆبی ئاکنجی بوو کو نهو وارێ عەشیرەتێ و یێ دووێ ل نێزیکی باژێرێ مووسل ل گوندەکی ب ناڤێ (رەشیدیێ) ل سەر ناڤێ ڤی رەشیدی ئاکنجی بوو، نهو دووندەها وی ب سەرۆکاتیا حەجی رەشید ب ناڤێ مالا شەمامێ مانە. سەرۆکاتیا عەشیرەتێ نهو یا ددەست خەلەف سەدیق عومەر ئاغا دا کو ئاکنجیێ کەلەکچی یە. ژیارا خەلکێ ڤان گوندێن ئاماژە پێ هاتییەدان ل سەر چاندنێ و ب خودانکرنا پەزی و تەرش و کەوالی یە. ڤێ عەشیرەتێ چەند بابك ژی هەنە[٨١].

## ٦- عەشیرەتا رۆژبەیانی:

ئەڤ عەشیرەتە ل نێزیکی عەشیرەتا ئومەریان ل دەڤەرا چیایێ مەقلۆبی دژین، ژ گوندێن وان: (زیلکان، خاتین ئاوا) هەر وەسان یێن ل دەڤەرا سۆران ژی هەین، خەلکێ وێ ژی دکارێ چاندنێ و ب خودانکرنا پەزی دا کاردکەن.

### ٧- عەشیرەتا داوودی:

ژ گوندێن ڤێ عەشیرەتێ: (گر فەقیر، طاق، شەمخر). ئاغاتییا عەشیرەتێ ل بەرێ ددەستێن حەجی ئەنوەری دا بوو، نهو ژی یا ددەستێن سالح حەجی یونسی دا. خەلکێ وی ژی مینا پتریا خەلکێ دەڤەرێ هەر جۆتیاریێ دکەن و پەزی ب خوداندکەن.

### ٨- عەشیرەتا شێخ بزێنی:

ئەڤ عەشیرەتە ٢٪ ێ ژ هەمی گۆرانان پێکدهینت، دبنیاتدا ژ قەزا زاخۆ هاتینە دەڤەرا سۆران دناڤبەرا کۆیە و چەمچەمال دا ئاکنجی بووین. ژ سەرۆکێن وان یێن بەرنیاس: فارس رەشید ئاغا (سەرچنار) و مەحمود عەبدولا هەمزە ئاغا (سەردك) و توفیق ئاغا (قەسرۆك)[٨٢]. ل دەڤەرا بەهدینان ژی دبێژن ئەو یێن ل سالا (١٨٠٨)ێ ل ڤێ دەڤەرێ ئاکنجی بووین، جهێن ئاکنجیبوونا وان ژی کەلەکا یاسین ئاغای (ناڤەندا ناحیێ) و گوندێن خارۆك و چەمە و زیلکە عەتکو و جویجر بچویك. ژ سەرۆکێن وان یێن بەرنیاس یاسین ئاغا ژ کەلەکێ.

### ٩-عەشیرەتا خدری:

ئەو ژی یێن ل چوار گوندان (پیرچاوش، کانی ئەسپان، خرابە، اش).

## عەشیرەتا کۆچەر:

وەکی دیار ئەڤە عەشیرەتەکا گەرۆك بوو، ل هاڤینان دچوونە زۆزانان و ل هاڤینان ڤەدگەریانەڤە دەشتێ، وەکی دبیرهاتنێن مەلا قاسم کۆچەر دا هاتی دبێژیت: (ل هاڤینا ئەم دچوونە زۆزانا ل دەڤەرا جولەمێرگێ باسکێ فەراشینێ ملکێ مە بوو، زڤستانان ئەم دهاتنە دەشتێ ل دەڤەرا زاخۆ و دهۆکێ و دۆبانێ ل سەر کۆزا، ئەڤە ل سەر دەمێ دەولەتا ئوسمانی ل سەر وەختێ سولتان عەبدولحەمید ئەم مانە ل سەر ڤی حالی، کو مە هاتن و چوون ل ناڤبەرا دەشتێ و زۆزانا دکر هەتا سالا (١٩٠٨)ێ*. ڤێ سالێ محەمەد رەشاد ئینقیلاب ل سەر سولتان عەبدولحەمیدی کر، و ل سالا (١٩١٤)ێ محەمەد رەشاد شەر دگەل دەولەتێن بیانی کر و بوو سەفەر بەرلك، دەمێ شەر دناڤبەرا محەمەد رەشاد و دەولەتێن بیانی دا پەیدابووی، روسیا ب سەر وەلاتێ زۆزان دا گرت و خرابکر، ژ وان جهێن خرابکرین ژی ئەڤەبوون: لیوا وانێ، لیوا جولەمێرگێ، لیوا باشقالا، ژبەر ڤێ چەندێ ئەم مانە ل دەشتێ)[٨٣].

## عەشیرەتا کۆچەر پێکهاتییە ژ حەفت تایان ب ڤی رەنگی:

### ١- عەشیرەتا شەرەفان:

عەشیرەتەکا ب هێزە، ژیانا هاتن و چوونێ د ناڤبەرا هاڤین و زڤستانان و دناڤبەرا کۆز و زۆزانان دا ل چیایێن باکووری کوردستانێ دا دکەن و ل زڤستانێ جارەکادی ڤەدگەرێنەڤە باشووری کوردستانێ ل سەرکۆزان ل وان جهێن نهو لێ دئاکنجی. ئەڤ عەشیرەتە پێکهاتییە ژ بابکێ (گوهـ رەشا) کو ئاغایێن عەشیرەتێ ب سەرڤەنە، دیسان پێکهاتییە ژ بابکێن (منگلان، ناصرا، جانا، شاقلیا، بەهرافا) و دبێژنە ڤان هەمی تایان (ئەرتووشی). پشتی نەخشێ سنووری دناڤبەرا باکوور و باشووری کوردستانێ هاتییە کێشان (عیراق و ترکیا ئەڤرۆ)، عەشیرەت ژی بۆ دو پشك و پشکا مەزن ب سەرۆکاتییا (ئەسکەندەر ئاغا کورێ مەحمود ئاغا کورێ سەعدی ئەفەندی کورێ حەسەن بەگ کورێ عەبدولرەحمان ئاغا) مانە ل باکوور و پشکا بچویکتر ل باشووری کوردستانێ ئاکنجی بوون کو ئەو ژی دو پشکن: پشکا ئێکێ ئاکنجی بوو ل گوندێن (کرماوا، جۆمجهات، داری، هێژیرکی، هاجسنی، کانی سپیا سەری، کانی سپیا ژێری، کەربیل کو کاڤلە گوندە) و ئەڤ هەمی گوندە دکەڤنە دەڤەرا سێمێلێ ب سەرۆکاتییا محەمەد ئاغا کورێ حاجی پاشا کورێ مستەفا ئاغا. پشتی وی کورێ وی حاجی ئاغا دەسەلاتیا عەشیرەتێ گرتەدەست. پشکا دووێ دئاکنجی نە ل قەزا شێخان و گوندێن نێزیکی وێ ب سەرۆکاتییا عەبدولا ئاغا

شەرەفانی ل گوندێ مرێبا. خەلكێ ڤێ عەشیرەتێ ل سەر پتر ژ ٥٠ گوندان دبەربەلاڤن، لێ پتریا وان یێن ل كۆمەلگەها قەسرۆك و قرەتۆك. ژ گوندێن وان یێن ب ناڤ و دەنگ: (سێ گرك شەرەفان، گرزەنگل، لك، كەڤرسۆر، زیناڤا، زیناڤا غازی، مەلكیشان، كوبی، كمێ، درین و گوندێن دی تر[٨٤].

## ٢- عەشیرەتا ئەرتووشی:

ژ عەشیرەتێن گرنگێن كوردانە، پتریا وان ب سەرۆكاتییا (كسو فەتاح ئاغا) یێن ل باكوورێ كوردستانێ. ل باشوورێ كوردستانێ ژی ژمارا وان پتر ژ (٦٠٠) خێزانان. ل چەند گوندان دبەربەلاڤن وەكی (سیتكی، تلخش، كانی گولان، سالحیێ، دۆستەكا، شتیا، قسرون، عین حلوە، عمیری) ئەڤ عەشیرەتە ب سەرۆكاتییا فەتاح ئاغا كورێ حاجی ئاغا كو ئاكنجیێ باژێرێ دهۆكێ بوو و ل ٢٠٠٥/١٢/١٩ وەغەرا داویێ كرییە.

ڤێ عەشیرەتێ دبەرێ دا هاتن و چوونا زۆزانان دكر و پەزێ خۆ دبرنە چیایێن باكوورێ كوردستانێ ل زۆزانان، لێ پشتی نەخشێ سنووران هاتییە راكێشانان، ئەو سەروبەر نەما، ئەو هاتن و چوون لێ هاتە قەدەغەكرن و بەرە بەرە ئاكنجی بوون و بەرێ خۆ دانی چاندنێ ژی. ڤێ عەشیرەتێ دەهـ بنەمالێن سەرەكی هەنە، هەر ئێك ژ وان تایەكێ عەشیرەتێ نە، ئەو ژی ئەڤ بنەمالەنە: (حەیدەرا (مالێن ئاغا)، حەموا، بریڤا، بەدرا، بریم بیبا، كەمالا، ریباریا، مهندا، تاجدینا، ولیا).

## ٣- عەشیرەتا گەودا:

عەشیرەتەكا بەرنیاسا كۆچەرانە، وان ژی دبەرێ دا دەشت و زۆزان دكرن، ل هاڤینان دچوونە چیایێن باكوورێ كوردستانێ و ل زڤستانان جارەكادی دهاتنە سەر كۆزان ل جهێن ئاكنجیبوونا وان ل باشوورێ كوردستانێ. لێ ئەو ژی پشتی نەخشەكێشانا سنووری دناڤبەرا (عیراق و تركیا) دا مینا كۆچەرێن دی ژ هاتن و چوونا زۆزانان هاتنە بێ بەهركرن و پتریا وان مانە دناڤ سنوورێن (تركیا) دا ل قەزایا (بیت الشباب) و ل (عیراقێ) ژی ل دەشتا سلێڤانەیا تا دەردۆرێن قەزا سێمێلێ ل جهێن بەلاڤ ئاكنجی بوون، ب تایبەت ل گوندێ ئالۆكا و كارێ چاندنێ و ب خودانكرنا پەزی دكرن. سەرۆكاتییا وان دەستێ (محەمەد تەیار) دا بوو و پشتی وی كورێ وی (عەبدولعەزیز محەمەد تەیار) ل گوندێ بازەلانێ و نهو ئاكنجیێ باژێرێ دهۆكێ یە[٨٥].

## ٤- عەشیرەتا زێدكا:

ئەو ژی تایەكێ گرنگێ عەشیرەتا كۆچەرانە ل دەڤەرا شێخان، دابەشكری نە ل سەر ١٣ گوندان، دگەل هەبوونا وان دناڤ ئاخا باكوورێ كوردستانێ دا، وان ژی مینا تایێن دی یێن كۆچەران دەشت و زۆزان دكرن، لێ نهو دئاكنجی نە و كارێ چاندنێ دكەن و پەزی ب خودان دكەن، وان شازدە بابك ب ڤی رەنگی هەنە: بارانی (سەرۆكێن عەشیرەتێ نە و ئاغاتییا وان ل بەرێ ددەست حەسەن جهانگیر ئاغای دا بوو كو پلا یوزباشی دناڤ لەشكەرێ حەمیدی دا هەبوو[٨٦]و پشتی وی ئاغاتی كەتە ددەستێن عەبدی ئاغای دا، ل دووڤ وی دا كەتە ددەستێن كورێ وی سمكو ئاغای دا).

ژ بابكێن دی: (گهارا، میرزا، دوشان، كمالیات، نوردینا، گهوری، هەمەزێدكی، بنەمالا شەمامێ، بنەمالا حسێن، بنەمالا سالح، بنەمالا عەبدولا، مالیك، ئەحمەد گویی، بنەمالا عبە رەش، بنەمالا حەمێ)[٨٧].

## ٥- عەشیرەتا هاجانی:

ناڤێ وێ دژێدەراندا ب (هانیجان) یێ هاتی[٨٨]، وان ژی مینا هەمی كۆچەران دەشت و زۆزان دكرن تا سنوور هاتینە دانان، ئێدی ئەو هاتن و چوون نەمان و پتریا وان مانە دناڤ باكوورێ كوردستانێ دا و یێن ماینە دناڤ ئاخا باشوور ژی دا ل دەردۆرا سێمێلێ و ل پشكا رۆژهەلاتی ژ دەشتا سلێڤانەیا كو ب (سینا) یا ناڤدارە دژین، هەر وەسان هندەك ژێ یێن ل دەڤەرا

لێڤێ ژی هەین، خەلكێ گوندێن خوالش و كرزیوك و چەم باهیڤ و هاجانە و ژ مالێن وان یێن ناڤدار ل ڤێ دەڤەرێ بنەمالا عومەر ئەفەندی و ل كرزیوك و بنەمالا حسو محو حتە و بنەمالا حەجی ل گوندێ بێزهێ و بنەمالا ئەحمەد هیرا ل گوندێ دویلێ و بنەمالا عید و عەبو بنەمالا یاسین حەمێ و بنەمالا عەلی شێخو ل گوندێ بێتاس و بنەمالا سیسو سدقی عومەر ل گوندێ خوالش. خەلكێ ڤێ عەشیرەتێ كارێ چاندنێ و ب خودانكرنا پەزی دكەن. ئەڤ عەشیرەتە ١٢ بابكن ب ڤی رەنگی: (بنەمالا شێرو كو سەرۆكێن عەشیرەتێ نە ل گوندێ هەورێسكێ، بنەمالا جندو ل گوندێ سەید زاری، بنەمالا سیزكا ل گوندێ كردیس، بنەمالا هسا ل گوندێ كونسیخور، بنەمالا رەشا ل گوندێ هەڤشە رەش، بنەمالا پوبان ل گوندێ كێلەكێ، بنەمالا ئالان ل گوندێ گرێ گەورێ، بنەمالا كوركا، بنەمالا سیڤان ل گوندێ سیلاڤ باستكێ، بنەمالا بەدران ل گوندێ بەدەلیا، بنەمالا بەكر، بنەمالا نوما ل گوندێ سەرشۆرێ)[٨٩].

### ٦- عەشیرەتا مەهمەدا:

تایەكن ژ عەشیرەتا كۆچەرێن ئەرتووشی، هندەك ژ وان ل ناڤ جوگرافییا دەڤەرا گولی یا دژین و هندەكێن دی ل جهێن جودا جودایێن رۆژهەلاتا دەشتا سلێڤانەیا و تا دەردۆرێن بازێرێ دهۆكێ دژین، ئەو ژی د كەڤنن و مینا هەمی كۆچەرێن دی دەشت و زۆزان دكرن، ل زڤستانان د هاتنە وان جهێن نهو لێ دئاكنجی. نهو ژی خەلكێ وێ كارێ چاندنێ و ب خودانكرنا پەزی دكەن. ژ تایێن ڤێ عەشیرەتێ:

أ- سەیدا (صەیدا): دكەڤندا دگەل عەشیرەتا گولی یان دژین.

ب- قولیا: ئەڤ تایە ل سێمێلێ و دهۆكێ دژین.

ت- سمایلا:

### ٧- عەشیرەتا زێوكی:

ئەو ژی عەشیرەتەكا كەڤنە و ل سەردەمێ میر بەدرخان بەگێ سەر بۆتانییان ڤەبوون ل جزیرا بۆتا ، وان ژی مینا هەمی كۆچەران هاتن و چوونا زۆزانان دكر، ل هاڤینان دگەل پەزێ خۆ دچوونە زۆزانێن (فەرەشینێ و مەیدان و جالیان) ل باكوور و ل زڤستانان دهاتنە دەڤەرا زێبار ل نێزیكی زاخۆ. ژ گوندێن وان (حەسەن ئاڤا، صلكا، ئاڤرما). وان پتر ژ ٢٠٠ مالباتان ل زاخۆ هەنە و نێزیكی ٤٠ مالباتان ل هەردو گوندێن (چەم زراڤ و باجۆكا) هەنە. نە هاتییە زانین كا بۆچی ب ڤی ناڤی هاتینە ناڤكرن.

خەلكێ ڤێ عەشیرەتێ نهو كارێ چاندنێ دكەن و پەزی و تەرش و تەوالی ب خودان دكەن و باغێن فێقی هەنە و چونكی گوندێن وان نێزیكی باژێرێ زاخۆنە و هەڤسنووره دگەل (تركیا ئەڤرۆ)، گەلەك ژ خەلكێ ڤێ عەشیرەتێ كارێ بازرگانیێ ژی دكەن.

### عەشیرەتا هەركی:

عەشیرەتەكا بەربەلاڤ و ب هێزە، هندەك ژ وان ل دەڤەرا ئاكرێ ل ناحیا (گردەسین) و قەزا (بەردەرەش) دژین، هەر وەسان یێن ل رەخ و رووێن هەولێرێ و ل ناحیا خەبات و پیرمام و عێنكاوە و ل سلێمانیێ ل دەڤەرا (چرمكا) و ل رۆژهەلاتی كوردستانێ ل هەردو قەزایێن (تەرگەوەر و مەرگەوەر) و ل دەشتە بێلێ ژی یێن هەین. ژێدەر وەسان ددەنە خویاكرن كو ئەو ئێك مال بوون و وەسان بەرفرەهـ بوون، بابێ وان یێ مەزن ب ناڤێ (ئەبو بەكر) بوو، وی چوار كور ب ناڤێن (مەندو، سەیدو، سەرحان، مشیر) هەبوون، هەرسێ یێن ئێكێ بوونە سەرۆكێن هەرسێ تایێن عەشیرەتا هەركییان[٩٠]. هندەك دیرۆكنڤیسێن دی وان دكەنە چوار تا (پشك)، ئەو ژی:(مەندان، سراتی، سیدان، حاجی ئاغا)، خۆجهییا وان یا بەردەوام یا ل رۆژهەلاتی كوردستانێ ل نێزیكی ئورمیێ و سەرۆكێ عەشیرەتێ حاجی ئاغایە[٩١]، ئەڤ عەشیرەتە كۆچەریاتێ دناڤبەرا كۆز و زۆزانان‌دا دكەن، ل زڤستانان دچنە جهێن نزم و تا رادەكی دگەرم كو دكەڤنە رۆژهەلاتی مووسل و ل هاڤینان قەست دكەنە زۆزانان، كو ئەو ژی جهەكێ بەرفرەهە، درێژاهییا وی ژ ئەرزەرۆمێ دگەهیتە دەڤەرا هەكاریا. ل سالا (١٩٢٤)ێ حوكمەتا تركیا هاتن و چوونا وان قەدەغەكر، لەوما ئەو زۆزانێن خۆ ب هندەكێن دی ل ئیرانێ گوهارتن و ڤێ چەندێ ژی بارێ وان گرانكر، چونكی دڤێت پەزێ خۆ ژ رووبارێ زێیێ مەزن دگوهیتكا لەهمشتێن خۆدا دەرباز كەن و

نەچار بوون ژ سەر هندە پران ب پارە دەرباز ببن کو ژ لایێ هندە کەسێن نە ژ عەشیرەتا وان ڤە دهاتنە دروستکرن[٩٢].

ژیانا سەرەکییا ڤێ عەشیرەتێ ل سەر ب خودانکرنا پەزی و تەرش و کەوالی بوو. پشتی ئاکنجی بووین ژنوی دەست دانە چاندنێ.

ل سەر ژمارا وان محەمەد ئەمین زەکی دبێژیت: ژمارا خێزانێن وان دگەهنە (٥٠٠٠) مالان، کو ژمارا خەلکێ وان پتر بوون ژ (٢٠٠٠٠) کەسان و پشتی بوورینا ب دەهان سالان، بێگومان ژمارا وان دێ گەلەك پتر لێ هێن.

## ژ گوندێن وان ل دەڤەرا ئاکرێ (پارێزگەها دهۆکێ):

(خرابا، اش، خمیان، گردەسین، ژووری، خرابەدیری، کورا، لانکر، پیاداکی، بیرخولی، کێلە سپی، مالکی، سماقوق، کوچینە، گوشینە، راوێتە، بێناتە، کۆزادایێ، بیبنەوا، گۆرانکی، نیاواکێ، بەریکێ، کەلیوکێ، کویزك، جەلا ژووری، جەلا ژێری، سێلا، کونسیخور، لەکا، بانۆرێ، دوو باجێرا، سالەیی، کێلێ، پیرخورین، خرابە ژووری، خرابە ژێری، شێخانۆك، ئێکمال، کلیتە، جەلیدا، جوجە ، زیلکێ، گراسیووك، شیڤە کیرێ، درینێ، دوستك، خرابەوار، خرابە یاسین، مەم و زین، ئامییان، قرەناس، نەدراوا، دم دمۆك، سێ خالکی، دووگوندان، بنێنان، نێروەك، کلبژینا).

ڤێ عەشیرەتێ هەلویستێن نیشتیمانی دژی حوکمێ ئوسمانییان و ئنگلیزان هەبوو. سەرۆکاتییا عەشیرەتێ ل هەولێرێ ددەستێن (ئەسعەد ئاغامین جانگیر ئاغا) دایە و ل ئاکرێ ددەستێن (جەوهەر ئاغا کورێ محیەددین ئاغا) دایە، وان سێهـ و دو بابکال هەنە[٩٣] و هەمیان ژی ددەمێ خۆدا کۆچەراتی دکرن و ئەو ژی دپێك هاتی بوون ژ:

(حاجی ئاغا، کانی سپی شێخانۆك، مالا تاهر، هاجیا سوری (وستك)، ناوی، مالا شین، مالا حم، مالا حید، سمایلی، مالا مەلا، مالا بیر، مام براهیما، بیداوی، مالا سۆر، هەسنی، مالا کوی، مام شێخا، ئاودیا، باب یەزدینی، بەدری، مژدینی، شایی، مالا حسێن، سیدا، ئاقویا، بیری، ئاشوتی، دری، مالا حەج و...هتد).

## عەشیرەتێن ئێزدییان ل هەردو قەزایێن شێخان و دهۆك:

دکەڤندا جهێ ئاکنجیبوونا وان دەست پێدکر ژ رووبارێ زێیێ مەزن تا رووبارێ خابوور، و ل دەڤەرێن بەردەرەش و شێخان و چیایێ مەقلوبی و دەڤەرا سلێڤانەیا تا رووبارێ دیجلە و ژ وانان دهۆك بخۆ ژی و ژ ئەنجامێ گەلەك کاودانان ئەو دەڤەر هەر بەر کێمی ڤەچوو، ئەڤە ژی ئەو گوندن کو نهو ئێزدی لێ هەین و دکەڤنە قەزایێن دهۆك و شێخان:

(ئەلمەمان، ئیسیان، باپیرە، باعەدرێ (جهێ میران)، باقەسرێ، باوەر، باقاق، بۆزا، بێبان، بێرستەك، بیوژ، تلخش، جەراحیێ، جەروانە، جکان، چەم بەرەکات، حەسەنیێ، خانکێ، دهکان، دوشینان، دیدبات، دۆغاتا، ریێبیێ، رکاڤا، زنیات، سریشکە، سینا، شاریا، شێخدرێ، صورکە، گفتیاك، ئێسفنێ، قەسر یەزدین، قەپاغ، گابار، کەبەرتو، گرخالس، گرشکست، گرێ پانێ، کەندالا، مام رەشان، مەحمودان، مشرفە، موقبلێ، موسکان، نەسیرێ).

دەمەلوجی دپەرتووکا خۆ یا ب ناڤێ (الیزیدیە) دا دبێژیت: (ئەڤ گوندە نە مولکێن وانن، کێم ژ وان ئەرد هەنە و کار تێدا دکەن ژێلی گوندێ باعەدرێ کو مولکێ میرانە و هندەکان دڤێن ژ دەستێن وان دەربێخن.

دووڤچوونا عەشیرەتێن ئێزدییان ل دەڤەرێ دێ بینین دژێك دویر و دبەربەلاڤن کێمەك نەبن، ژ گرنگترین ڤان عەشیرەتان:

### ١- عەشیرەتا هەکاری:

ئێکە ژ عەشیرەتێن دەڤەرا شێخان، عەشیرەتەکا مەزن و بەردریایی یە، دهێتە هەژمارتن بنواشێ هەمی عەشیرەتێن دی یێن ئێزدییان و هەمی میرێن ئێزدییان سەر ب ڤێ عەشیرەتێ ڤەنە، مینا دارەکێ یە یا پری تا ، وان دیرۆکا پری دەردەسەری یا هەی و ناڤ و دەنگێن خۆ یا ل ناڤ عەشیرەتا هەی.

ناڤێ عەشیرەتێ یێ ژ وێ چەندێ هاتی کو بنیاتێ وان یێ کەڤن ژ دەڤەرا هەکاری یانە، سەرۆکاتیا عەشیرەتێ نهو یا ددەست (حەیدەر دەروێش مجێور) دا.

هەبوونا ڤێ عەشیرەتێ یا ل دەڤەرا شێخان، هەر وەسان سەریەشێن وان یێن ل باشیکێ ل نێزیکی مووسل ژی هەین[٩٤].

### ٢-عەشیرەتا دوملی:

عەشیرەتەکا گەلەك بەربەلاڤە، پتریا وان یێن ل کۆمەلگەها مەهەتێ و قەزا شێخان و گوندێ خۆشابا، ئەڤ عەشیرەتە ب سەرۆکاتیا (کریت جومان)ە.

### ٣-عەشیرەتا ماموسیا:

ئەو ژی ژ عەشیرەتێن بەربەلاڤە، پتریا وان ل شێخان و کۆمەلگەها مەهەتێ دژین، هەر وەسان یێن ل باشیك و بەحزانی ل دەردۆرێ مووسل ژی هەین، سەرۆکاتیا عەشیرەتێ یا ددەست (مهەمەد خدر ئوسمان) دا.

### ٤-عەشیرەتا حەرافی:

گەلەکا بەربەلاڤە و پتریا وان ل شێخان و دەردۆرێن وێ دژین، عەشیرەت نهو ب سەرۆکاتیا بنەمالا عەلی ئاغا و کورێن وی یە.

### ٥- عەشیرەتا قائیدیا (قایدی):

کەڤنترین عەشیرەتە ل شێخان، دبێژن ئەو ژ نفشێ کەسەکی نە ب ناڤێ (قائید)ی، کو خزمەتکارێ شێخادی بوو، وان ساخلەتێن تایبەت هەنە و ب تایبەت د چەژنا جەمایێ دا[٩٥]. ئەڤ عەشیرەتە ژی یا بەربەلاڤە، لێ پتریا وان یێن ل گوندێن سینا و شێخدرێ و بۆزا و شاریا ل ناحیا فەیدێ، نهو سەرۆکایەتی یا ددەست (نەجم حسێن) دا.

### ٦-عەشیرەتا هەوێری:

ئێکە ژ عەشیرەتێن بۆش ل دەڤەرا زاخۆ، دیسان هندەك ژ وان یێن ل سلۆپی ل باکوورێ کوردستانێ ژی هەین. خودانێ پەرتووکا (خلاصە تاریخ الکرد وکردستان) ئەو یێن ب (هاوری و هاوراکا و هویرکان و هاوراکانی) ب ناڤکرین[٩٦]. دبەرێ دا دناڤ کویناندا دژیان، کارێ وان یێ سەرەکی ب خودانکرنا پەزی و تەرش و کەوالی یە و کێمەك ژێ دناڤ کەرتێ چاندنێ ژی دا کاردکەن، زەلامێن وێ هەمی خودان چەکن. ئەڤ عەشیرەتە نهو ب سەرۆکاتیا (معاویە سەعید مام بین) ی یە[٩٧].

### ٧- عەشیرەتا ماسكی:

عەشیرەتەکا کەڤنە، دبەرێ دا ل دەڤەرا (طنزە) سەر ب جزیرا بۆتان ڤە دژیان. نهو یێن ل (دێرەبوینێ) سەر ب قەزا زاخۆ ڤە هەین، سەرۆکێ وان نهو دەروێش پوری) یە[٩٨].

### ٨- عەشیرەتا رەشکان:

عەشیرەتەکا زیرەکە، ناڤێ وێ یێ د (شەرەفنامێ) دا هاتی کو ئەو (رەشکی) نە، ل کەلا (دێردە) ل دەڤەرا (طنزە) دژیان و ئەو ڤەدگەرینەڤە بۆ سەدسالیا هەشتێ مشەختی[٩٩]، ل گەلەك جهان یێن هەین، لێ پتریا وان دگەل عەشیرەتا هەوێریا و ل (دێرەبوینێ) دژین. سەرۆکاتیا عەشیرەتێ نهو یا ددەست (حەسەن حەبەش) ی دا[١٠٠].

### ٩-عەشیرەتا بلسینی:

عەشیرەتەکا بەربەلاڤە، لێ پتریا وان یێن ل شێخان و و سەرۆکاتیا وان نهو یا ددەست (شێخ مراد گاڤان) دا.

### ١٠- عەشیرەتا پیدا:

چ پێزانین ل سەر بنیاتێ ڤێ عەشیرەتێ نینن، لێ گوندەك ب ناڤێ (پێدە) یێ ل دەڤەرا مزووری ژێریا هەی، لێ نەهاتیە زانین کا ئەڤە ژ وی بنیاتی نە یان نە ؟![١٠١].

### ١١- عەشیرەتا دنا:

عەشیرەتەکا بۆشە و ژ عەشیرەتێن گرنگێن ئێزدییانە ل دەڤەرا شێخان، هندەك وان ب (دنابی) ددەنە نیاسین، ناڤێ وێ یێ د (تاریخ الاکراد) دا هاتی،

دبێژن کو ئەو یێن ژ (وێران شەهر) ل (مێردینێ) هاتین، پاشی هندەك ژ وان ڤەگەریانە جهێن خۆڤە و هندەکێن دی چوونە شنگالێ[١٠٢]، هەروەسان یێن ل کۆمەلگەها خانکێ سەر ب سێمێلێ ژی ڤە هەین، سەرۆکاتییا عەشیرەتێ (شێخ حەسەن رەشو) یە[١٠٣].

## عەشیرەتێن مەسیحی:

دبەرێ دا مەسیحییان تیم و عەشیرەت هەبوون، ب تایبەت نستورییێن تیاری، ئەو ددابەش کری بوون سەر چەند تیمەکان وەکی (تخوب، جیلو، گال، نێروە، بەروار، ئاشوت، ئەلمونی، گرەموس). هەر پێنج تیمێن سەری تیاری نەژاد بوون، لێ نەژادێ هەرسێ تیمێن دی نە تیاری نە و ژ وان دجودابوون، چونکی تیاری ژ باژێرێ (میدیات) ل جزیرا بۆتان هاتبوون و ئەو ژ بنیات بۆتانی نە[١٠٤]، عەشیرەتێن وان دناڤخۆدا ددابەش کری بوون بۆ سەر چەند بابکان و دپێکهاتن ژ چەند گوندان و رەنگە گرێدانەك دناڤ واندا هەبوو دگۆتنێ (ماتا). هەر وەسان بابك ژی دابەشکری بوون بۆ سەر بنەمالێن مەزن دگۆتنێ (کولیاتا)، ژمارا وان ل هندە جاران دگەهشتنە (٤٠-٦٠) کەسان و بابکێ ژ هەمیان مەزنتر و ب روی تر بۆ جهێ شێخی دهاتە هەلبژارتن[١٠٥]. ژبەر وان دەردومەبنەتێن ب سەرێ وان هاتین و وار و جهێ خۆ هێلاین.

نهو عەشیرەت وەکی تێکەهـ دناڤ هەمی تایێن مەسیحیان دا (کلدان، سریان، نستوری، ئەرمەن) دا نینە، یان وان چ جوگرافییێن دەستنیشانکری مینا موسلمانان ب ناڤێ عەشیرەتەکا دەستنیشانکری نینن و ئەو دناڤ باژێرێن (دهۆك، زاخۆ، ئامێدیێ، ئاکرێ، سێمێلێ، شێخان)دا دژیــن[١٠٦]، وان (٨٤) گوندێن بەربەلاڤ دناڤ عەشیرەتێن موسلماندا ل دووڤ ڤی خشتێ ل خوارێ دیارکری هەنە:

١- بەرواری ژووریان: ژمارا گوندێن وان ئەڤ (٢٣) گوندەنە:

مایا فەلا، دێریشکا فەلا، کانی ماسێ (ناڤەندا ناحیێ)، دیرێ، یاتێ، شمایلا، هەلوە، خوارنە، کری، سەردەشت، مەلختە، هێسێ، مێرگ ئاژیا، نیکا، چمبلکێ، بازێ، تشیشێ، جدیدکێ، ئاقارێ چەلکێ (چەلکا فەلا)، چەقەلا ژووری، چەقەلا ژێری، دەرگەلکێ[١٠٧].

٢- بەرواری ژێری: ئەڤ دەهـ گوندە سەر ب ڤێ عەشیرەتێ ڤەنە:

مێزێ، ئاتۆشێ، سیانێ، مێریکێ، چەم ربەتکێ، بێلمەندێ، هێزانیك، ژۆلێ، خلیاسان، گشکاف[١٠٨].

٣- سلێڤانەیی: وێ ژی دەهـ گوندێن مەسیحی ب سەرڤەنە ب ڤی رەنگی:

قەراولا، دێرەبوین، پێشابیر، ئاڤزریك شنێ، بنلۆجە، سۆریا (صۆریا، کو موسلمان و مەسیحی نە)، ئاڤزریك میری، هەورێسك، ئەشکندل، باجد بەراڤ.

٤- سندی: ئەو ژی دەهـ گوندن ب ڤی رەنگی:

لێفو، نافکەندال، پیرەکا، مێرگەسۆر، بێرسڤێ، شەرانش ژووری، سەناتێ، دەشتە تەخ، ئێرێ، دێرەشیش[١٠٩].

٥- نێروە: کو ئەو ژی چوار گوندن ب ڤان ناڤان:

نێروە شیری، رێلا، باش، کرو[١١٠].

٦- رێکانی: ئەڤ سێ گوندەنە:

هیشێ، ئاشتب، مەیدان[١١١].

٧- گولی: چ گوندێن تایبەتمەند ب مەسیحیان سەر ب ڤێ عەشیرەتێ ڤە نینن، لێ مالەك یان دو مال یێن ل گوندێ ملا عەرەبێ هەین.

٨- زێدك: وان ژی ئەڤ سێ گوندە هەنە:

زهێرا، کەڤنە کۆلکا، گیلکێ[١١٢].

٩- دۆسکی: ئەڤ پێنج گوندە هەنە:

مانگێش (ناڤەندا ناحیێ)، گوند کۆسە، دهێ (دیهێ)، کانی بەلاڤێ، ل کۆمەلگەها کۆرێت گاڤانا، باگێرا[١١٣].

١٠- شەرەفان: هەردو گوندێن سێجێ و قەشەفرێ، ژبلی هێژێرکێ کو گوندەکێ بەردایە[١١٤].

١١- دەردۆرێن ئامێدیێ: ل (١٢) گوندان ب ڤی رەنگی

# ئێزدی
# ناڤ - ڕەهـ و بنیات

پیر خدر سلێمان

## ئێزی ئێزدی ئێزدیاتی

ئێزی: ناڤەکە ژ ناڤێت خودێ هەروەکی د ڤان سەبەقان دا ژ تێکستێن پیرۆزێن ئێزدییاندا دیار دبە:

**سلتان ئێزی ب خۆ پادشایە**
**هەزار و یەك ناڤ ل خۆ دانایە**
**ناڤێ شرینی مەزن هەر خودایە**

* * *

**سلتان ئێزی دزانە ل بەحرا چەند کەشوول ئاڤە**
**ئەڤ دنیا ل باوی وی سەعەت و گاڤە**
**ئەوی حەوا کرە بووك ئادەم کرە زاڤە[1]**

**کەوا بوو ئەوێ خۆ دای و ئەڤ کنیات ئافراندی و ئەز دایم ئەو ـ ئەزدا ـ خودایە ..**

**ئێزدی:** ئەو مللەتەیە یێ ل پەیی ئێزی ـ خودێ ـ و تاوسی مەلەك دچت.

و ئێزدی پشکەکا رەسەنن ژ گەلێ کوردستانێ ژ کنارێ زمان، ئاخ، کلتوور وهەستێ نەتەوایەتی ڤە.

ئێزدیاتی: یەکە ژ وان دین و بیر وباوەرێن کەڤنار و دێرین یێ گەلێ کوردستانێ ل میسوبوتامیا وکوردستانا ئەڤرۆ، سەبارەت پاراستنا ڤێ باوەرێ بابکالێن ئێزدییان رووبارێن خوونێ گۆری دینێ خۆ کرینە، ئەڤ دین وکولتوور پاراستینە و ئێزدیاتی باوەرییەکە ژ ئەنجامێ بیر وهزرکرنێ (تأمل)ێ هاتییە (ئەوێ ـ یان ئەوێن ـ ل دێرزەمان ئەڤ باوەرییە دانایێن، ل دەردۆری خۆ مەیزەکرینە، ل دیاردە و ئەلەمنتێن خوەزا وسروشتێ رێنینە، هزار و شرۆڤە ژێرا دانایێنە، بۆ هەر ئەلەمنتەکی، دیاردەیەکێ و دەردەکی خودانەك ناسینە، ب تایبەتی (ئاخ، ئاڤ، بای، ئاگر) چوار ئەلەمنتێن سەرەکی یێن ژیانێ: [2]

**هەر چار کو د فاخرن**
**ب چی ئاوایی دئینان و د برن**
**ب چی مەرسوومێ ژ دورێ فاریقەکرن**

نە بەس خودان بۆ ڤان هەر چوار ئەلەمنتان ناسینە بەلکو ژ بۆ شەڤ و رۆژێ، بوون و مرنێ و هەر گیاندارەکی یان دەردەکی خودانەك ناسینە، رێز و حورمەت ژێرا گرتینە، دەم ب دەم، سال ب سال هلکەفت ژێرا دانایینە قوربانی پێشکێش کرینە ب تایبەتی ژ بۆ رۆژێ کو گەرمی و رۆناهی یە بۆیی رۆژ بوویە ئەلەمنتێ هەری مەزن و پیرۆز و شێشمس خودانێ رۆژێ یە، مەفەرێ تەڤ گیاندارا بوویە بەیتا



شێشمس رند ڤێ خۆیا دکە، جەژن و رێ ورسمێن ئێزدییان باش خۆیا دکەن، ئێزدیباتی دین و باوەرییەکە ب سروشتێ ڤە یە گرێدایە و ژ ئەنجامێ بیر و هزرکرنێ هاتییە و د چەند قۆناغان را دەرباز بوویە، مرۆڤ دکارە سێ قۆناغێن سەرەکی بینە زمان:

**١- قۆناغا خودانان:**

بەری چەند هەزار سالا هەر وەکی مە د سەری دا ئاماژە پێ کری کو بۆ هەر دیاردەیەکێ، دەردەکی خودانەك ناسینە و رێز و حورمەت ژێرا گرتینە بوون و هلکەفت بۆ را دانانە و هەتا نها ژی رۆلی خودانان دباوەریا ئێزدیان دا یی بەرچاڤ و خۆیایە.

**٢- قۆناغا خودێ ناسینێ:**

ل سەر دەمێ براهیم خەلیل بابێ پێغەمبەرا :

براهیم خەلیل ژ نوفتەکە سادقە
هەرۆ ب سێ حەرفا دبوو منتەقە
خودێ خۆ ناس کر ب هەقە
خودێ خۆ ب حەق ناسکر
دگەل عازر و نەمروود و سەنەما باسکر
هەتا گیانێ خۆ ژ کفرێ خلاسکر [٣]

**٣- قوناغا هاتنا شیخادی ژ شامێ بۆ لالشێ:**

هەی جانە و هەی جانە
ئەو سلتانێ مێرانە
شیخادی ژ شامێ هاتە
ل لالش دکەت خەباتە [٤]

بەلێ شیخادی دی ژ شامێ هاتە هەکارێ ولالش کو بەری زایینی پەرستگەها میترایا بوو و کرستیانا

کربوو کەنیسەیەك، شیخادی ل جەرخێ پێنج یێ مشەختی جارەکا دن ژ ئێزدییان را ڤەگەراند و وی و برازا و پس و نەڤیێن برازیێ وی حەد و سەد و هنەك رێ ورسمێن نوو د کراسێ عرفان ودەروێشی وتەصەوفێ دا دناڤ ئێزدییان دا دانان، ئانکو ئێزدیاتی نووژەن کرن، شیخادی ل سالا ٥٥٧ کۆچی (١١٦٥ز) ل لالشێ کراس گهۆری.. و برازیێ وی شێخ سەخەر (ابو البرکات) پشتێ وی شێخانی یا مللەتی کر و پاشی شیخادیێ دووێ و کورێ وی شێخ حەسەن کو ل سەر دەمێ ڤی شێخ حەسنی ئێزدیاتی گەهشتیە ئەو پەری گەشبوون وفرابوونێ لەو دەسهەلاتدارێن دەردۆر ئاریان نەخاسمە (بدر الدین لؤلؤ) پاشایێ مووسل بەرنگاری ئێزدییان بوو، شێخ حەسەن ب غەدر ل مووسل دۆراند ئەڤ فرمانا لۆلۆی بۆ سەر ئێزدییان خەلەکەکە ژ زنجیرا درێژا دیرۆکا تراژیدیا ئێزدییان .

تایبەتمەندییا ئێزدیاتی یا ئەڤرۆ مرۆڤ دکارە دڤان چەند خالادا پوخت بکە:

١ـ ئێزدی ملەتەکی خودێ پەرێسن وباوەرییا وان ئەوە: خێر وشەڕ ژ دەرگەهێ خودێ تێن.

٢ـ خودێ تەعالا هەفت ملیاکەت ژ نۆرا خۆ ئافراندنە کو

(عزرایل، جبرایل، میکایل، دەردایل، شەمقاییل، عەزازییل، وئەسرافیل)

**ئەون هەر هەفت مەلەکێن کبیر**

**بەری خاسا چەند بەدیل**

**ئەو ژی د راوەستاینە ل حزرەتا مەلکێ جەلیل** [٥]

تاوسی مەلەك ئەوە یێ شیرەتا خودێ ژ بیر نەکری ویەکانییا خودێ دوویات کری لەو خودێ تەعالا ئەو خەلاتکر و کرە سەرۆکێ هەر هەفت ملیاکەتا [٦].

٣ـ لالشا نۆرانی کولیلکا کوردستانێ. کو کانیا سپی، زمزم، قوب وئاقد ونیشانگەهێن پرانییا خاس و چاکێن ئێزدییان لێ هەنە، جهێ هەرە پیرۆزێ ئێزدیاتیێیە و ب ئاڤا کانیا سپی خۆ و زاروکێن خۆ پێ مۆر دکەن، هێڤێنێ نان و ماستێ خۆ لێ نووژەن دکەن و پرانییا رێ و رسم وچەژنێن خۆ ل لالشێ دکەن.[٧]

٤ـ دوعا و درۆزە، قەول وبەیتێن ئێزدییان هەنە کو ب زمانێ کوردینە وئێزدیاتی ل بەر رۆناهییا وان تێکستان تێ خۆیاکرن، خۆدی و ملیاکەت، تەرزێ ژیانێ هەر ژ بوونێ هەتا مرنێ، چاوانییا دان وستاندنێ ل نێڤا جڤاکی. ئەو تێکست میتۆلوگییا کوردی، فەرهەنگا زمانێ کوردی دەولەمەند دکەن بەرکا ئەدەبیاتا کوردی درێژتر دکەن هەر وەکی دبابەتێن بێت دا پتر رۆناهی لێ تێتە کارکرن.

٥ـ قوبلەتا ئێزدییان رۆژە.

٦ـ ئێزدی باوەریێ ب کراس گهۆرینێ دئینن لەش ژ ئاخێ یە و ڤەدگەرە بن ئاخێ ڤە لێ:[٨]

**روحا رەحمانی**

**ئابت فانی**

**هەر دێ زڤەرتە جەم خودانی.**

٧ـ ئێزدی دپێکهاتینە ژ سێ چینا: شێخ، پیر، و مرید شێخ ژی دبنە سێ تا و پیر دبنە چل بەرە باب ژن و ژنخوازی دنێڤا ڤان هەر سێ چینان دا هەروەها دنیڤا هەر سێ تایێن شێخان دا نابە.

٨ـ ئێزدیاتی دینەکی بازن داخستی یە، نەی تەبشیری یە.

٩ـ ژ ئێزدییان را پێغەمبەرەکی تایبەت نەی خۆیایە، هەر چەند رێز و حورمەتا ل تەڤ پیغەمبەرا دگرن، نەخاسمە براهیم خەلیل بابێ پیغەمبەران، لێ ئێزدییان خودان و خاس و چاك هەنە کو هندەك ژ وان خاس و چاکان ستی و ژنن کو ئەو ژی پشکەکن ژ خودانێن ئێزدییان...

# ئێزیاتی ناڤ و نژاد[1]

عزەددین سەلیم باقەسری
وەرگێران: ئەحمەد عەبدوللا زەرو

## دەرازینك:

ئێزدی ب درێژاهییا دیرۆكا وانا درێژ بەرهنگاری هێرشێن ستەمكاری و كوشتن و براندنا ب كۆم بوونە و بەردەوام د گەل هەڤسیێن خۆ ب ڤەكێشك بوون، جارنا ژ ئەگەرێ ئۆلداریێ و جارنا ژی ژ ئەگەرێ نەتەوەیی ڤە. ئەڤ چەندە - پتریا جاران- بۆ ئەگەرێ نە ئاكنجیبوونا وان و وێرانكرنا گوند و باژێركێن وانە و بەرهنگاری مشەختكرن و تالان و شەلاندنێ بوون و جڤاكێ ئێزدی گەلەك دەردەسەری دیت، پترتر ژ هەر جڤاكەكێ دی ئەو ژی نە ژ بۆ چو ئەگەرا تنێ وەكو بەرەڤانی ژ ئاخا خۆ و بوونا خۆ یا نەتەوەیی و پێگیری ب پەیرەوێن خۆ یێن ئۆلداری ... ژ ئەنجامێ وان هێرشان كێمبوونا هژمارا وان و گوهۆرینا روویێ ئۆلی ژبۆ خەلكێ دەڤەرێ و تێك ئالینا نەخشەیا وان یا جوگرافی ژ ئەگەرێ هنداكرنا وان بۆ وان دەڤەرێن لێ د ئاكنجی ... ژ ئەنجامێ ئەڤان كارەسات و وێرانییان كارتێكرنەك كەچ ل سەر دەروونێ ئێزدییان چێبوو و وەلێهات ئێدی باوەری ب كەسێن دی نەبن، و ژ ترسا تێكدانا وێ نهێنیێن ئایینێ خۆ كێكرن و نەدانە ڤەكۆلەر و نڤیسكاران تا كو ئەو باوەری بێنە پاراستن. سەرەرای هندابوونا پەرتووكێن وان یێن ئۆلی و دیرۆكی و نە دكارین وێ ئازادییا ئۆلی ب دەست خۆڤە بینن، تا كو ئۆلدارێن وانە بكارن ئەوان ژ ئالیێ ئایینی و جڤاكی هشیار بكەن و ژ ئەنجامێ وێ ئەڤ دو رەوشە پەیدابوون:

**ئێك،** بەرهەمێن ڤەكۆلەر و نڤیسەرا دەربارەی ئێزدییان ب ئاوایەك ل دووڤ زانین و هزركرنێن وان و دوور ژ راستیێ دەركەتن و كەتنە د گەلەك لەنگی و شاشییاندا، لەوما بەرهەمێن وانە د لاواز بوون و نە د باوەرداربوون و دەلیڤە ژ بۆ هندەك نڤیسەرێن كرێگرتی و پالدای پەیدابوون كو رویێ راستێ (ئێزدیباتییێ) تێك بدەن، ئەو ژی ژ ئەنجامێ تاگرییا وان یا ئایینی یان نەتەوەیی یان ژ ئەگەرێن سیاسی و ... هتد. و هەر یەكی بزاڤ د كرن كو ئەوا خۆیا كری راستییە و چو دی نە، و پتریا وان د ڤەكۆلینێن خۆدا نە د راستگۆ بوون تا كو وەلێهات هندەك رابوون ب دانانا پەرتووكا یان نڤیسینا دەستخەتا ژ لایێ خۆ ڤە و دانانە پال ئێزدییان ... !! .

**دو،** ڤێ وەكر كو نفشێن دووڤدا هاتین ژ ئێزدییا بخۆ نە دكارین نەوەیی و راستیێ ژێك ڤاڤێرن دەربارەی چاوانییا باوەریێن وانە چونكە ب وان ئەركێن ئایینی نەرابووینە و ئۆلدارێن وان خوە د پارستن ژ بۆ وان ئەركێن ل سەر ملێن وان د بەلاڤكرنا

دەقێن ئایینی و پارستی ل نك وان و ژ بەر ... و هندەك جارا خوە خۆیا د كرن مینا ئایینێن دی د هندەك رەوشت و تیتالاندا ئەوێن نە د راستییا جڤاكێ ئێزدی دا هەی، تا كو بكارن خوە دوور بكەن ژ شەرخوازییا وان ... لەورا خۆیاكرنا راستییا ئایینێ ئێزدی و راستییا ڕهێن وێ یێن مێژوویی ژ كاروبارێن ب دەگمەن بوو ... سەر هندێ را (ئێزدیاتی) نە مامكەكا ب گرێكە كو ناهێتە ڤەكرن ... ئەوێ پێداچوونێ ل سەر دەقێن وانێن ئایینی بكەت و ب هووری راوەستیانێ ل سەر بكەت رەوشت و تیتال و كاروبارێن ئایینی و جڤاكی، بكەی و شارەزایی و باوەرییێن رۆژهەلاتی یێن كەڤن دا هەبیت دێ كارت (ئێزدیاتیێ) و گرنگییا ڕهێن وێ یێن مێژوویی د شرۆڤەكرنەكا بەرئاقل و دروست دا شرۆڤە بكەت.

## بنیات:

ئەم ناخوازین بچینە د ناڤ ئالیێ نەتەوەیێ ئێزدی دا چونكە ناخوازین گەنگەشا ئەوا پێ نەڤێت بكەین، چونكە چو بسپۆر، یان ڤەكۆلەرێن دەربارەی ئێزدیاتی نینن نەوەیێ یان نە پشتراستیێ ژ كوردایەتییا ئێزدییا بكەتن، ئانكو حاشاتیێ ژ ئێزدیاتییا پرانییا كوردان و بەری ببنە مسلمان دكەت، ژ بلی هندەك كرێگرتییان ئەوێن بزاڤ دكرن ژ بۆ گهۆڕینا پێناسا نەتەوەیی و باوەرییێن ئێزدییا و ئەگەرێن وان د خۆیانە ... پترییا مێژوونڤیس و بسپۆرێن زانستا جڤاكی و مێژوویی د رێككەفتینە كو ئێزدی ژ نەتەوێن ئاری نە و ژ ملەتێ میدی نە (ماد) ئەوێ كورد بۆ دزڤرن و (ئێزدیاتی) « ئایینێ وان یێ ئێكێ بوو (یێ كەڤن) و دكتور عەبدولقادر مارونسی بسپۆرێ كاروبارێن ئێزدیاتیێ دبێژت:هەكە مە ئایینێ ئێزدیاتی زانی دێ هەمی ئالیێن دی یێن ژیانا كوردان بەری ئیسلامێ زانین



شوینوارێن پەرسگەها لالش

چونکە ئەو خەلەکا هندایە د میژوویا کوردان دا[٢].

پتریا میژوونڤیسا داکۆکیێ د کەن کو دەڤەرا (میسوپوتامیا) ئاڤەدانبوو ژلایێ نەتەوێن (شەمسی) ڤە ئەوێن د قوناغێن جودا دا بەرەڤ باکووری ڤە مشەخت بووین و ل کوردستانا ئەڤرۆ ئاکنجی بووین و تایبەت ل دەڤەرا دۆلا لالش و دۆرمانێن وێ ... وەلێ کۆمێن ئاشووریان پشتی شکەستنا (نەینەوا) ل سالا ٦١٢پ.ز لێ ئاکنجی بوون. هەر وەسان هندەک کۆمەلێن دی سەر ب ئایینێ میترائە و پشتی کەتنا (حەزەر-Hatra) ل ناڤەندا سەدسالیا سیێ زایینی و د گەل کۆمێن شەمسی و زەرادەشتی ژ ئیرانێ ژ دەڤەرا (ئیزد) و (چیایێن داسن) پشتی لەشکەرێن ئیسلامێ ئیران رامالین د سەردەما خەلیفە عومەر کورێ خەتابی دا ئاکنجی بوون.

ژبەر کو هزرێن ڤان کۆمان هەڤ نێزیکن ژ ئالیێ هزرا ئایینی ڤە وەکو نێرینا وان بۆ سیستەمێ ئافراندنێ یا ئەسمانی و فەلسەفەیا وان د چێکرن و چێکەریدا و پەرستن و پیرۆزکرنا هندەک توخمێن سرۆشتی مینا رۆژ و هەیڤێ و ستێر و ئاگری و ئاخێ و بای و ئاڤێ و ... هتد. چونکە پرانیا د بنیاتدا ب رهێن ئایینێ ئاری یێ کەڤن (مزدە یەسنا) پشکدارن.

سەرەرای وەکهەڤیا رەوشت و تیتال و کاروکریار و پێرابوونێن جڤاکی ژ ئەنجامێ ژیانا هەڤپشک و ل ئێک جهـ دا ب ڤی رەنگی دێ سرۆشتی بیت کو ئایدولوژیێن ڤان کۆمەلا تەڤلی ئێک ببن و ببنە ئایدولوژیەکا نوو دا کو ببیتە باوەریەکا رێکخستی و لێکدای و ئەم د کارین ب (ئێزدیاتی) ل چەرخێ وێ یێ نوو ناڤبکەین. ل ڤێرە د خوازین هندەک بۆچوونێن نڤیسەر و ڤەکۆلەران د ڤی واریدا بناسین، ئەوێن ل سەر ڤی بابەتی نڤیسین گەلەکن و د کارین بۆچوونێن وان هەڤجودا بکەین بۆ گەلەک جۆران:

هندەک ژ وان بۆ هندێ دچن کو ئەو بسورمان بوون و پێکهاتن ل سەر دەستێ شێخادی کورێ مسافری وەکو ئەحمەد تەیمور پاشا د پەرتووکا خۆ دا (الیزیدیە ومنشأ نحلتهم) دبێژیت: (کو ئەڤ توخمە ل سەر دەستێ شێخ عودەی کورێ مسافری ل چەرخێ شازدێ مشەختی یێن چێبووین و ل دووڤ وی ب (عـەدەوی) هاتینە ب ناڤکرن و پاشی هاتە ناڤکرن ب ئێزدی).

عەباس عەزاوی د پەرتووکا خۆ دا (میژوویا ئێزدییان و بنیاتێ باوەریێن وان) دبێژیت:

(ئەو بسورمانێن زاهدن... هندەک رەوشتێن نەتەوی و ئایینی و سۆفیێتیێ و هزرێن سیاسیێن تێکەل ب خۆشتڤیتیا ئەمەویان ژ باب و باپیرانڤە بۆ ڤەماینە.

بەلێ سەعید دیوەجی دبێژیت : ئێزدیاتی بزاڤەکا سیاسی خورستییە، بەلێ مۆرەکا ئایینی ل سەرە و خوە تێدا پاراستییە. پاشی دبێژیت (ئەو تیمەکا بسورمان و ئەمەوی یە)[٣].

بەدلیسی دبێژیت: کو ئەو (ئێزدییە) ل دەستپێکا سەردەمێ خۆ سەر ب دینێ یەزیدی - یەزدانی - ڤەبوون). پاشی د بێژی: هۆزا دنبەلی بەری ببنە بسورمان یەزدانی بوون[٤].. پاشی وەرار کەتێ و کەتنە د نیڤ ئاینزایا (مذهب)خەلکێ سنە و جەماعەتدا و چەند ژ وان (ئانکو ژ هۆزێ) بەردەوام مان د وێ باوەریێ دا[٥]. ئەڤە بەلگەیە کو باوەریا ئێزدییان بەری بسورمانەتیێ هەبوو.

هندەک بۆ وێ دچن کو (مانەوینە) و باوەری ب هەبوونا دو خوداوەندان هەنە وەکو قەشە سلێمان سائیغ - خودانێ پەرتووکا میژوویا مووسل - و دەمەلۆجی ئەوێ دبێژیت:

(کو ئەو د کەڤن دا سەر ب مانەویان ڤەبوون) و باوەری ب دو خوداوەندی و سەر بەردانا ئایین و سورا باتنێ (الحلول) هەین و ل سەر ڤێ باوەریێ مان و داخوازێن ئیسلامەتیێ کارتێکرن ل وان نەکرن و ل دووڤ نەکەتن تا کو شێخادی کورێ مسافری گەهشتییە وان ... و ئینانە ل سەر رێیا ئیسلامەتیێ و ژ پەرستنا ئابیدەیا رزگارکرن)[٦]. ئەوێ ڤێ هزرێ ب نەوەیی رەد دکەت کو ئێزدیاتی نە جووت باوەری بوو و باوەر یێ ب بوونا دو خوداوەندان نائینتن لێ ئێکانە باوەریینە ل سەر دەمێ شێخادی بسورمان نەبووینە وەکی دێ ڤێ چەندێ خۆیاکەین.

هندەک بۆچوون دبێژن: د بنیاتدا فەللە بوون و یێن

لادایێن وەكو بۆچوونێن دو ئەرمەنییان (تشمتسیان) و (ئابو ڤیان) دەما دبێژن: (كو ئێزدی هەرتەقەبوون و ژ كنیشتا ئەرمەنییا جودا بوون)[٧].. و ئەڤ تیۆرە د لاوازن و چو راستی بۆ نینن چونكە بەلگێن مێژوویێن د بەرئاقل پشتەڤانیێ لێ ناكەن.

گەلەك ژ رۆژهەلاتناسان مینا (هنری لایارد و مینورسكی و باسیلی نیكیتین و ئەدمونزی ... هتد) و دیسان ژ نڤیسەرێن كورد (ئەنوەر مایی و شاكر فەتاحی و سالح قەفتانی و حسێن حوزنی موكریانی و محەمەد ئەمین زەكی و جەلادەت بەدرخان و ئیحسان نوری و كەریم زەند و هندەك دن) وەسان ڤەدگێرن كو ئێزدی ژ بەرماهیكێن ئۆلێ زەرەدەشتیانن، هەر وەك ئەنوەر مایی دبێژیت: ئێزدی ژبەرماهیكێن ئۆلا زەرەدەشتیا كەڤنە ئەوا د بتە ئۆلا كوردان تا كو خۆیابوونا ئیسلامەتیێ د گەل پێڤەكرنا هندەك هزر و باوەریا و زاراڤێن نوو و هندەك تاك ژێ كێمكرن مینا گەلەك ئۆلێن دی یێن كەڤن دەما گەلەك هزر و باوەری و زاراڤ كەتینە د ناڤدا كو تێدا نەبوون و گەلەك مژار ژی ژێ هاتنە لادان)[٨] و دەمەلوجی پێڤە دچیت و دبێژیت: د گۆتارا پروفیسور جاكسنی دانەرێ ناڤدار دەربارەی ئایینێن ئیرانی دا: كو یەزیدی ب سەروبەر و پێزانینێن خۆڤە ل وەلاتێ ئیرانێ خۆیابوون و ژ وێرێ هاتنە ڤەگوهاستن بۆ گەلەك جهان یێن نها لێ دبینین، و (أمبسن) دانەرێ پەرتووكا (تاووس مەلەك) پێڤە دچت دەربارەی تیۆرا جاكسنی (كو رێبازێن ئایینیێ یەزیدی یا كەڤن ژ زەرەدەشتیێ چێبوویە و دیرۆكا ئێزدی یا نوو و كەتییە ژێر باندۆرا نێزیكبوونا وێ دگەل مەسیحییان و بندەستیا وان یا ل ژێر حوكمێ ئیسلامێ ڤە ئەوا بوویە ئەگەرێ ژ بۆ هندەك گۆرانكاریا د باوەریا وان دا)[٩]، لێ جورج حەبیب بۆ وێ چەندێ دچت كو ئێزدی تەڤلیبوونەكا شەمسی- میترائی بابلی هەیە — و دبێژت:

(ل ڤێ پنیا ئەردی - دۆلا دو رووباران (وادی الرافدین)— پەرستنا شەمسی میترائی چێبوویە و ناڤكرییە ب پەرستنا نابو... ئەو ب هێمایێ وی (ئانكوێ نابو یە) ب ناڤێ وی یێ ئارامی (تاووس مەلەك)[١٠] و پاشی دبێژت:(ئەم دكارین پەیدابوونا ڤی رەنگێ پەرستنا بابلی ئیرانی (شەمسانی) یا تێكەل ب دەستپێكا دروستبوونا وی ئایینێ ئێزدی بزانین یێ نهو ئەم دبینین). وەلێ دكتور عەبدولقادر مەلا حسێن مارونسی - ڤەكۆلەر د بوارێ ئێزدی دا — دبێژیت[١١]:

وەكو ئەز گەهشتیمێ كو ئایینێ بەربەلاڤ د نێڤ كورداندا ، ئایینێ (مزدە یەسنا) بوو، ئەڤ ئایینە بخۆ ئایینێ ئێزدی یانە.. بەری كارتێكرنا ئایینێن ئەسمانی ل سەر ئێزدییان، هەر دیسان ئایینێن دی ل كوردستانێ دبەربەلاڤبوون لێ ئەو ئایین وەكو لقێن ئایینێ (مزدە یەسنا) بوون یان ل بن كارتێكرنا وێ بوون، و ل هندەك جهان (میترائیە) هەبوو و رۆژ كاركتەرێ سەرەكی بوو د ژیانا واندا و دیسان دبینین كو هندەك رەوشتێن وان مینا نێزیكی ئایینێ ئێزدی بوو ... د كارم بێژم: ژ بلی ئایینێن یەهودی و بسورمانەتی و مەسیحییەتێ، هەمی ئایینێن دی چقبوون ژ ڤی ئایینی (مزدە یەسنا یان ئێزدی). و دیسان دبێژت:(بەری پەیدابوونا ئایینێن ئەسمانی ئێزدی ئەو ئایینێ بەربەلاڤ بوو ل دەڤەرا «میسوپوتامیا» - ئەو دەڤەرا سومەری و ئەكەدی و بابلی تێدا د ژیان و د ئاكنجی... و باوەریێن بەربەلاڤ د نێڤ ڤان نەتەوا دا ئەو بۆ ژ ئایینێ ئێزدی هاتین چونكە (ئێزدیياتی) د گەل بەلاڤبوونا مرۆڤان د قۆناغا سیێ دا ل سەردەمێ حەزرەتێ (نوح.س)بەلاڤبوویە، و بەلگە ژ بۆ وێ هەنە ، و شوینوارێن زانستی هەنە ئەوا ئەم دبێژین پشتراست دكەن ئەوا). و پشتراستیێ دكەت كو هێما و باوەریێن هەیی ل نك ئێزدییا بەلگەیە ژ بۆ كو ئێزدی ئایینەك گەلەك كەڤنارە و كەڤنترە ژ ئایینێن ئەسمانی ئانكو هەرسێیان (جوی، مەسیحی، بسورمانەتی)، ئەڤجا دبێژت:

ژ ئەگەرێ دووراتییا دەمی د ناڤبەرا مە و ڤی ئایینی دا مە باوەری هەیە كو هندەك تشت هەنە كو ئێزدی ژ نێڤ ڤان سێ ئایینان (ئایینێن ئەسمانی) دوور دكەت. و هەكە كوورتر چووینە د بۆچوونا خۆ دا دێ بینین سەرەدەریا بەرپرسێن بسورمان دگەل وان تایبەت د سەردەمێ خیلافەتا ئیسلامی دا (خلفاء الراشدین)، سەرەدەریا دگەل خودان پەرتووكانە

مینا سەرەدەریا وانە دگەل جوی و مەسیحی و سوبیان،- د نامەیەکا- ئەوا خەلکێ دەڤەرا (شێیز) بنگەهێ پەرستنا ئێزدیاتیێ ل دەڤەرێ - پێشکێشی - حەزرەتێ عومەر کورێ خەتابی (خ ژێ رازی) و داخواز ژێ کرن کو رێ بدەنە وان کو هندەك رەوشت و تیتالێن خۆ بکەن وەکە (سەما) یێ، دێ بینین عومەری رێ دایە وان و هەکە عومەری ئەو دانابان (گاور) و نە ب سەر چو ئایینێن ئەسمانی ڤە، نە د هێلا وان رێ و رەسمێن ئایینی و تایبەت ل با وان بکەن).

هندەك نڤیسەر و ڤەکۆلەرێن دی هەنە ژوان هندەکێن ئێزدی مە ئاماژە ب بۆ چوونێن وان نەکر ژ بەر کو هەمان تەوەر ڤەگرتینە. و نهو پشتی ئەم ب سەر هزر و بۆچوونێن نڤیسەر و ڤەکۆلەرا دا چووین و ئەنجام ژی ئەوە کو ئێزدی ژ نەتەوێن ئاری و کەڤنە و دبتە خورستیا مللەتێ کورد ژ ئالیێ رە و خوینێ ڤە.

ئایینێ ئێزدی د هزرا خۆ یا گیانی دا د بتە پاشمایێ کەڤنترین ئایینێن ئاری ئەوا د بێژنێ (مزدە یەسنا) ئایینێ میدیا یان مادی یان (ئەوێن د بنە بابکالێن کوردان)... لێ بیروباوەرێن دی ئەوێن بەربەلاڤ هاتین (وەکو زەرەدەشتیێ و مانەوی و مەزدەکی و هندۆکی و میترائی) دبنە لقێن وێ و ژنڤەبوون پشتی گهۆرینا هندەك بۆچوونێن وان ل دووڤ ئایدیولوژیا هزرمەندێن وان.

(ئێزدیاتی) و تێکەها خۆ یا ئایینی یا نهادا ئانکو ئەوا رێکخستی و چارچۆڤەکری پشتی هەڤکرتنا ئایدیولوژێن مللەتێن شەمسی ئەوێن ل دۆلا لالش و دەڤەرێن دۆرمانێن وێ ژیاین و ئەوا هاتییە ناڤکرن ب دەڤەرا مەرگەهـ- میهرگە- یان وەلاتێ (شەمسانی یان).

ئێزدیاتی د گەلەك قۆناغێن میژوویی دا بووری یە، و بەرهەنگاری گەلەك گهۆرینێن هزری بووینە و سەرەرای گهۆرینێن جڤاکی و ل پەی وەرارا جڤاکی... وەلێ دشێن ڤان قۆناغا پارڤە بکەین بۆ دو قۆناغێن سەرەکی:

## ١- قۆناغا بەری هاتنا شیخادی بۆ لالشێ:

ئەڤ قۆناغە یا درێژە د میژوویا ئێزدییادا و بۆ دەمێ سێ هزار سالا ڤەدکێشیت و د کارێن پارڤە بکەین بۆ دو چاخا:

### أ- چاخێ پەرستنا دیاردەیێن سرۆشتی:

ئێزدیان مینا گەلەك مللەتێن ئاری دیاردەیێن سرۆشتی د پەرستن یان پیرۆز رادگرتن بەری پەیدابوونا هزرا ئایینی ل جەم وان و هەر دیاردەك سرۆشتی ژ خوەرا دکرنە خوداوەندەك (خودان) و پەرستگەهـ ژێرا دانان و قوربانی و نەدر ژێرا دان.

پەرستن و پیرۆزکرنا ڤان دیاردەیا ژ بۆ دو ئەگەرا بوویە: یان ژ ترسا وان مینا ئاڤ رابوون و لەهی و بروبسی و بیڤەلەرزا ... هتد چونکە ئەو ژێدەرێن شەرخوازیێ بوون و زیان د گەهاندنە سرۆشتی و مرۆڤی و پەرستنا وان وەکو خۆ ژێ پاراستن ژ وێ شەرخوازیێ بوو ... یان ژ بۆ ئەڤینیا وێ چونکە ژێدەر بوو ژ بۆ چاکیا مرۆڤاتیێ و مانا ژیانێ، وەکو رۆژێ و هەیڤێ و بارانێ ... و هتد و تا نها دیاردا پیرۆزکرنا ڤان دیاردان ل جەم ئێزدییان یێ هەی.

### ب-چاخێ بەرەڤ یەکانییێ (تاکە پەرستنێ):

هزرا ئایینێ ئێزدی ژ قۆناغا پەرستن و پیرۆزکرنا دیاردەیێن سرۆشتی هاتە ڤەگوهاستن ژ بۆ قۆناغا هزرکرنێ ب هەبوونا راستیێ و شاشیێ و چاکی و شەرخوازیێ، لەوا هزرا ئایینێ (مزدە یەسنا) وەکو ب جهـ ئینانا یاسایێ (راستیێ)و دەستپێك بەرەڤ یەکانەییێ (تاکە پەرستنێ) ل جەم وان پەیدابوو و باوەرئانی کو راستی و چاکی د رۆژێ دا د خۆیانە وەکو خوداوەندێ ژیانێ و سرۆشتی و پاشی وەك ب خوداوەندیێ مەزن ب ناڤێ (میهر- میترا) باوەری پێ ئینان و ئەوە گەردوونی ب رێڤەدبەت و دگەل قانوونێن سرۆشتی و هەر ئەوە بخۆ (ئاهرومەزدا) ئانکو خوداوەندی راستیێ و دابیێ ژیانێ یە ل جەم زەرەدەشتیان ... ئەوە خودایێ چاکی و ژیانێ ل جەم پتری نەتەوێن شەمسی یێن ئاری و بۆ دەمەکێ درێژ ل سەر ڤێ باوەریێ بوون تا کو ئیبراهیم کورێ عازەری (ئەلخەلیل) خۆیابووی و هزرا یەکانەییێ

بەردەستکری و گەشەپێدای و دەما رابووی ب گازیا خۆ دگەل خەلکی و دیارکری کو خودا یەکە و ئەوێ هەتاف و هەیڤ و ستێر و مرۆڤ دای و هەر تشتەکێ دی ل ڤی گەردوونی ب شیانا وی چێ دبت و ل بن دەسەلاتا وی یە. و ڤێ هزرێ خۆیاکر د ناڤ ئێزدییاتییێ دا و تا ئەڤرۆ ئاشکەرایە.

## ٢-چاخێ پشتی هاتنا شێخادی بۆ لالش:

پشتی خۆیابوونا ئایینێن ئەسمانی و ئایدیولوژیێن خوە ل سەر جڤاکێن دی ل دەڤەرێ ب رێکا بەلاڤکرن و گازیکرنێ ل رۆژهەلاتا ناڤەراست ب گشتی و ل دەڤەرا میسوپوتامیا و کوردستانێ ب تایبەتی سەپاندین. یان ب هێزا چەکی دەما بەلاڤکرنا بسورمانەتیێ. و ژ ئەنجامێ وێ ئایدیولوژیێن کەڤن بەرەف نەمانێ چوون و گرنچکرن و ژ وان ژی (ئێزدییاتی) ئەوا کەتی د بن فاکتەرێ ڤەشارتنێ و خۆ پاراستنێ، وەلێ هات کو ئەو بازنێ گرندای د گەل تێکەها خۆ یا راست و دیرۆکا وێ هندا بکەت هەکە سەرکردەیێن وێ یێن هزری پەیدا نەببان دەما رابووین ب لێکدان و رێکخستنا وێ ل سەر بنیاتێ کەڤن د گەل هندەك گهۆرینان ل پەی چەرخی... ژ وان سەرکردا ئادی کورێ مسافر و یێن دووڤدا... هاتنا وی بۆ پەرستگەها لالشا نۆرانی و ئاکنجیبوونا وی تێدا بوویە قۆناغەك گرنگ د دیرۆکا ئێزدییاندا و دبتە ڤەبرەك د ناڤبەرا کەڤن و نوودا و دەستپێکەك ژ بۆ مێژوویا ئێزدییا هەڤچەرخ... ئەڤجا د ڤێ قۆناغێ دا (ئێزدییاتی) هاتە نووکرن و هاتە دانان د چارچۆڤەك رێکخستی دا و سیستەمەکێ ئایینی جڤاکی ژێرا هاتە دانان و دەڤێن ئایینی و جڤاکی وەسان هاتنە رێکخستن وەکو دەربرینێ ژ فەلسەفا خۆ بکەت تا کو ژ گهۆرینێ و شێواندنێ بهێتە پاراستن.

## ناڤکرن (ناسناف):

گەلەك بۆچوون و هزر سەبارەت ناڤکرنا ئێزدی پەیدابوونە و هندەك بۆ دچن کو هەڤبەندێن کەسایەتیێ خەوارج یەزید کورێ ئەنیسەینە و ب ناڤێ وی هاتینە ناڤکرن[١٢]. هندەك دی بۆ دچن کو ژ بازێرێ ئیرانی (یەزد) ن ئەوێ د بتە گرنگترین بنگەهێن ئایینێ شەمسیا (مترائی- زەرەدەشتی) و ژ وێرێ مشەخت بوونە بەرەڤ باکوورێ عیراقێ و سوریا و دەریا وانێ و قەفقاسیا و ب ناڤێ جهێ ژێ مشەخت بووین هاتینە ب ناڤکرن.

پتریا نڤیسەرێن عەرەب ئەوێن ڤەکۆلین کرین بۆ هندێ دچن کو ئەو هەڤبەندێن یەزیدێ کورێ معاویە کورێ ئەبی سفیان کو د بتە خەلیفەیێ دووێ یێ (بەنی ئومەیە) ئەوێ سێ سال و نیڤا (٦٠-٦٤ مش/٦٨٠-٦٨٣ز) حوکم کری.

تیمەکا دی پشتراستیێ ددەن کو ناڤکرنا وان ژ پەیڤا (یەزدان) ئانکو یا ئافرێنەر (الخالق) د هەردو زمانێن کوردی و فارسی وەرگرتییە.

قەشە سلێمان سائیغ دبێژیت: (گۆتنا دروست ئەوە کو ئێزدی ڤەدگەرن بۆ خوداوەندێ وان د پەرست و ناڤێ وی یەزدان یا ئێزدان و ئێزد بوو و ئەڤە یا هاتی د پەرتووکا (تاریخ کلدو) ژ توما مرجی (چەرخێ نۆزدێ زایینی) ڤەگوهاستییە ئەوێ د پەرتووکا خۆدا (الرؤساء): دەربارەی خەلکێ بازێرێ موغان دبێژیت ئەوان خودایەك د پەراستن ب ناڤێ یەزد و نڤیسەرێ (تاریخ کلدو) دبێژت: (دبت ئەوا توما مرجی گێرای دەربارەی بنیاتێ ناڤکرنا ئێزدی ب ڤی ناڤی بیت)[١٣].

جورج حەبیب پشتراست دکەت کو ناڤکرنا وان ژ پەیڤا (ئێزیدا) میترائی زەرەدەشتی (شەمسی) ب رامانا هەڤکار یان فریشتە ددەت هاتییە[١٤]، ژ هەمیا چوویی تنێ مایە بۆچوونێ ل سەر هندەك نڤیسەران د ڤی بواری دا بدەین، و ئەوێن کو نەسەبا وان بۆ یەزید کورێ ئەنیسەیێ خارجی ڤەگەراندی وەکو پشت بەستن ب گۆتارا عەبدولقادرێ بەغدادی (کرییە ئەوێن ل سەر ئایینێ حلولییە (سورا باتنێ) و یان ئایینێ خودانێن کراس گوهۆرین (تناسخ) یان مەیمونییە یان ئێزدی ئەو نە ژ کۆما بسورمانن ... ئەو ژ هەڤبەندێن یەزید کورێ ئەنیسەیێ خارجی نە و ئەو ل بەسرا بوو، پاشی بەرەڤ (تون ) ژ ئاخا فارس چوو)[١٥].

لێ ل نك ئێزدییان چ بەلگە نینن ئاماژە ب یەزید کورێ ئەنیسەی کریبت و میژوویا ئێزدی و دەقێن وان یێن ئایینی ئاماژە ب وی نەکرینە، و ئێزدی ئەوا بەغدادی بەحس ل وان کری دبت نە ئەو ئێزدی بن یێن کو بابەتێ مە ل سەر وان. لێ ناڤکرنا وان کو ڤەدگەریتن بۆ باژێرێ (ئێزد)د میژوویا واندا نەهاتییە، لێ نە دوورە کو باژێرەك ب ڤی ناڤی بێتە ناڤکرن و ڤەگەریتن بۆ وان چونکە ئەو جهێ رەسەنێ وان بوو. لێ تیما کو هزردکرن ژ بۆ ناڤکرنا وان ب پەیڤا (یەزدان) ئانکو ئافرێنەر یان (ئێزیدا) ب واتەیا فریشتە و ئەو هندەکێ نێزیك د بن ژبۆ راستیێ لێ چو بەلگەیێن مکوم و ب تێروتەسەلی نە ئانینە چونکە ئەوان ئاگەهـ ل دەقێن ئایینێ ئێزدییان نەبوونە و هەکە وەکـــریـــان دبـــت دا سەرکەفتنێ ئینن.

وەلـــێ بـــاوەری یا ناڤکرنێ و ڤەگەراندنێ بەرەف یەزید کورێ معاویە چو راستی بۆ نینن و نابیت ئەو ئێزیدێ ئێزدییان هەر یەزیدێ کورێ موعاویەی بیت، و هەر چەندە ڤی باوەریێ رۆلێ خوە د ناڤ ئێزدییاندا بخۆ گێرایە:

١- ل پەی روهنییا دەقێن ئایینێ ئێزدییان وەکو خۆیا دکەین وەلێ (ئێزید) ئەوە دایبێ فریشتا و پەیداکەرێ بەهەشت و ئاگری (دۆژە) و جووتبوونا ئادەم و حەوایێ ب فەرمانا وی بوویە، ئەڤجا ئەرێ بەرئاقلە کو ئەڤ کەساتییە یەزید کورێ موعاویەی بت یان هەر ئێك ژ مرۆڤان بت؟ وەلێ نە و سەرەرای هندێ کو دەقێن هەین د ئاشکەرا پشتراستیێ ددەن کو (ئێزید) هەر خودا بخۆیە یان ناڤەکە ژ ناڤێن وی یێن پیرۆز. بنێرە (قەولێ شێخادی شێخێ شارا، قەولێ سلاڤێت جەبێرا، قەولێ بەحرا).

٢-خیلافەتا یەزیدێ کورێ موعاویەی بۆ دەمێ سێ سالا ڤەکێشا، ئەڤجا نە بەرئاقلە کو شیابیت ئایینەکی چێکەت د ڤی دەمێ کورت دا و سەرەرای کو پەرتووکێن میژوویی دەستنیشانا ناکەن کو (یەزید) ئایینەك چێکریبت و کەسەك ل دووڤ چووی بت.



شوینوار

٣- یەزید بسورمان بوو هەر ژ باب و کالارا و ل سەردەمێ وی بسورمانەتی ئایینێ دەولەتا ئەمەوی بێ فەرمی بوو وەکو ل دووڤ پەرتووکێن میژوویی هاتی، و ئێزدییاتی ل هیچ دەمەکی ل دووڤ ئایینێ ئیسلامێ نەکەتینە و ژ بۆ ڤێ ژی ئەو هێرش و وێرانی و زیانێن ئایینی ل سەر وان پشتراستیێ ددەتێ: وەکو هێرشا بەدرەددین لوئلوو میرێ مووسل ل سالا (٦٥٢مش/١٢٥٤ز) و هێرشێن نادر شاهی ل سەر وان و داوی هێرش ل سالا (١٧٤٣ز)[١٦] بوو و هێرشا میرێ کۆر ل سالا (١٨٣٤ز)[١٨]و هێرشا ئیبراهیم پاشا بابان ل سەر شنگالێ ل سالا (١٢١٤مش/١٧٩٩ز) و هێرشا محەمە شەریف پاشا ل سەر شنگارێ ل سالا (١٨٤٤ز) و هێرشا فەریق عومەر وەهبی پاشا والیێ ئوسمانییا ل سالا (١٨٩٢ز) و ژ بلی وان ژی ئەو فەتوایێن ئایینی دژی وان بەلاڤبووین ئەوێن کۆمەلەك ژ زانایێن بسورمانا دەرئێخستین، وەکو فەتوایا ئەبو

ئەلسعود ل سالا (٨٩٦-٩٨٢مش) كو ب فەرمانا سولتان سلێمان قانونی بوو و فەتوا شێخ عەبدولا ربەتكی و ناڤدار ب مودەرس ل سالا ( ١١٣٧مش)[١٩].

ڤان هەمی هێرش و فەتوایێن ئایینی بۆ دەمێ سێ سەدسالیيان ئێزدی ڤەكێشانە د گێلەشۆكا شەرێن دژواردا و خوە ل بەر وان هەمی جۆرێن ستەمكاریيا گرتن وەكە بەرەڤانی ژ وێ باوەریيا خۆ و هیچ رۆژەكێ ژ رۆژا ژ بۆ خۆشكرنا خاترا ژ بلی باوەریيا خۆ ب باوەریەكا دی رازی نەبوون.

٤- ئێزدیياتی د نیڤ پەرتووكێن مێژوویێ دا بەری خیلافەتا یەزیدێ كورێ موعاویەی[٢٠] ب دەمەكێ نە كورت دا پێ هاتی، لێ چەوا یەزید كورێ موعاویەی هاتیە د نیڤ مێژوویا ئێزدییاندا؟ بەرسڤ ئەوە:

١- عەقیدا ئێزدیياتیێ بەرهنگاری گەلەك جۆرێن زیانێن ئایینی بوون و ل سەر دەمێن جودا و وەلێهات كو باوەریيا خوە ب نخێڤن و هندەك كاروباركرن تا كو خوە ژ شەرێ وان ستەمكاریيا ب پارێزن، ئەڤجا خۆ پاراستن (تەقیە) د سەردەمێ ئەمەوی دا هەر ناڤێ یەزیدی بوو وەكە وەكهەڤیيا وی دگەل ئێزدی. و خوە ب بسورمانەتی د هندەك دەمادا د ئینادەر، خۆ گەهاندن ب یەزیدێ وەكو نەسەب وەكو پاراستن بوو پارێزی هەكە ددلدا ما ژبۆ دەمەكی درێژ و دبتن ببیتە باوەری و ئیمان تایبەت دەما مژارێن باوەریێ ب رەنگەكێ وەسان نە هاتبنە نڤیسین كو نەهێتە گوهارتن، ڤێ پارێزی یە و پارستنە كارێ خوە كر د ناڤ ئێزدیياتیێ دا[٢١].

٢- بوونا هەڤركیێ دناڤبەرا یەزیدێ كورێ موعاویەی د گەل مالباتا پێغەمبەرێ ئیسلامێ (س) و راوەستاندنا هێرشێن ئیسلامی ل سەردەمێ وی وەكر ئێزدی بمینن د تەناهییەكێ دا ژ غەزا و هێرشێن ئایینی دژی وان و مانەڤە ددەمەكێ ڤەژیكرنا كاروبارێن ئایینی دا بێ ترسا ل دووڤچوونێن باوەری و عەقیداڤە ژ لایێ بسورماناڤە و ژ بەر وێ چەندێ پشتگیریێ لێ كرن و ڤیان نەكو وەكو باوەری پێ كرن وەكو هندەكان هزركری.

هەژی گۆتنێ كو ئێزدیياتیێ هەلبەستەكا هەی د چیرۆكا بوونا یەزیدی و ناكۆكییا وی دگەل بابێ وی (موعاویە) و چاوانییا گرتنەدەستا دەسەلاتێ. وەلێ هەلبەست تنێ پەسنەك بوو ژبۆ روودانێن تایبەت چو هاڤلی ب دۆزێن باوەریێن ئێزدییان ڤە نەبوون، سەرەرای وێ كو روودانێن مێژوویی ئەوێن مە خۆیاكرین ئەفسانەبوون و نە د دروستبوون و دیسان ئێزدییان گەلەك هەلبەست و قەولێن ئایینی د پەسنا روودانێن مێژوویی یا ل سەر كەساتیێن نە ئێزدی هەنە و ژبلی یەزیدێ كورێ موعاویەی. هەلبەست هەنە ب كەساتیێن مەسیحی و جویان مینا پێغەمبەر عیسا (س) و مریەمێ و پێغەمبەر موسای (س) و كەساتیێن سوفیگەر و بسورمان مینا حەللاجی و عەبدولقادر گەیلانی و قەضیب ئەلبانێ مووسلی و عەلی و عومەر ... و هتد. ئەڤە وێ نادەت كو بێژین ئێزدی فەللەنە یان جوی یان بسورمانن ... هتد . هەكە ئێزدییان هەلبەستەك ب (یەزیدی) هەبیت ئانكو وێ ناگەهینت كو بێژین د گەهنێ ... ئەو ژی وەك یێن دی.

پێ نەڤێت ناڤكرنا ئێزدی ژ پەیڤا (ئێزید) هاتیە گەلو ئێزدێ ئێزدییان كی یە؟ و ژ ڤەكۆلین و دووڤچوونان دیار دبیت كو ژ كەڤن وەرە پەیڤا (ئێزید) هاتیە و ڤەدگەریت بۆ هزاران سال بەری زایینی و ئەڤ پەیڤە ل سەر كەلپیچێن ئاخێ د سەردەمێ سومەری دا ب ئاواكی (ئی-زی-دی) نڤیسیيە و ل دووڤ ڤەكۆلینێن شارەزایێن شوینوارا ئانكویا گیانێن پاك ددەت یان نە هەرمی یان ئەوێن ل رێكا راست د چن ... و دیسان ژبۆ نەتەوێن شەمسی یێن كەڤن گەلەك پەرستگەهـ هەبوون ژ بۆ هەتاڤێ ب ناڤێ (ئیزیدا) و تێدا بكارێ ئایینی رادبین و (ئیزیدا) ئانكویا وێ ل جەم وان خودایێ بلند و هێزا مەزن ددەت ... ئەڤجا (مزدە یەسنی) پەی دووڤێن ئایینێ (مزدە یەسنی) د گۆتنە خوداوەندێ مەزن (ئێزدان) و چونكە ئێزدی ژ بەرمایكێن ڤان ئایینێن كەڤن بوون لەورا د گۆتنە خودای (الله) (ئێزدی – ئێزید – ئێزدان) و دەڤێن ئایینێ ئێزدییان وێ چەندێ پشتراست دكەتن كو (ئێزید) ناڤەكە ژ ناڤێن خودایێ چاك ئەو ژی

خودایە ئەوێ فریشتە و گەردوون و مرۆڤ داین و ل ڤێرە چەند دێرەكێن ژ ڤا ن دەقا :(قەولێ سلاڤێت جەبێرا)[22]

**سولتان ئێزید ب خۆ پەدشایە**
**هەزار و ئێك ناڤ ل خۆ دانایە**
**ناڤێ مەزن هەر خودایە**

* *

بنێرە ڤان هەردو سەبەقان ژ (قەولێ شێخادی شێخێ شارا)[23]:

**سلاڤێت من ل وێ دیوانێ**
**ل وێ مەتبەخێ ل وێ شیلانێ**
**ئەوە جی یێ دین و ئیمانێ**

* * *

**دین و ئیمانێت مە ژ وێ یە**
**حەقیقەتا مە ژ وێ حەودێ یە**
**كو ئێزی ب خۆ خودێ یە**

* * *

**زوو حاسل د كەن مرازا**
**سلتان ئێزی خالقە د گەرێت ب هەزار و ئێك لباسە**
**دڤێت ئەم ب وێ سۆرێ بكەین ناسە**

* * *

ئەڤە دەقەكێ دی یە ژ قەولێ (ئافرینا دونیایێ)[24]

**سلتان ئێزید رەب ل سەمەدە**
**ئەفراند هەفت ملیاكەتە**
**جودا كرن دۆژ و جنەتە**

* * *

ئەڤە مالكێن دی نە ژ قەولێ (سلاڤێت جەبێرا)[25]:

**سولتان ئێزید د زانە ل بەحرا چەند كەشكول ئاڤە**
**ئەڤە دونیا ل باوی ساعەت و گاڤە**
**ئەوی هەوا كرە بووك و ئادم كرە زاڤا**

* * *

دەما مە نێری یە ڤان دەقێن بەرێ ژ مەرا خۆیا دبیت كو ئێزید ئەوە خۆدایێ خۆراگر و دائیێ فریشتا و پەیداكەرێ بەهەشت و ئاگری (دوژە) و زانایە چ د ئەرد و ئەسمانی دا هەیە و هەر ئەوە دائیێ ئادەم و حەوایێ، و فەرمان دایە وان ببنە جووت و ئەو دائی یە و د خودان شیانە د هەر تشتەكی دا . .

ئەو ناڤەكە ژ ناڤێن خودایێ ژ هەژی یێ ئێزدییاتی پێڤە بەندبووی چونكە ئەوان هەر ژ كەڤندا خودایێ مەزن ب ڤی ناڤی (ئێزید) ناسی.

هەر وەسان ئێزدی ب داسن هاتینە ناڤكرن ژ بەر ئایینێ وان یێ كەڤن (مزدە یەسنا (بوو) داسنی) ئانكو هەڤبەندێن راستیێ و گرتنا رێكا راست و ئەو ژی (مزدە یەسنی)نە ئەوا بابێ مێژوویێ هیرودویت لێ بەحسكری[26] و جهێن داسنی تێدا د ئاكنجی د كەڤنە ئالیێ رۆژهەلاتی ژ دەریا (خەزەر) و پاشی بۆ گەلەك دەڤەرا بەلاڤ بوون و تێدا ئاكنجی بوون و بازێرێن وان ب (دهستان) د هاتنە ناسین ئانكو وەلاتێ (داهە- داسە - داسن).

حامد عەبدولقادر دبێژت كو تاگرێن زەرەدەشتی دگۆتنە خۆ (مزدا یەسنی) و مزدا ئانكو (راستی یان خودا) و سنی واتە (رێكا ئیمانێ و باوەریدانێ)[27] و ئەو دبنە داسنی ئەوێن رێكا راست (مزدا) گرتین و دبیتن چیایێ داسن ب وان هاتییە ناڤكرن چونكە وەلاتێ وان بوویە.

# پەرستگەها لالش

داود خەتاری
وەرگێران: موسەدەق توفی

پەرستگەها لالش دهێتە هژمارتن گرنگترین جهێن پیرۆز یێن ئایینێ ئێزدیاتیێ و سالانە خەلكەكێ زۆر ژ جهێن جودایێن جیهانێ سەرەدانا ڤێ پەرستگەهێ دكەن و جهەكێ تایبەت د دلێ عیراقییان ب گشتی و كوردستانییان ب تایبەت هەیە، ژكەڤندا هەتا نها پەرستگەها باوەریدارێن رۆژێ (شەمسانی)بوو، بەری هاتنا شێخ ئادی كورێ مسافری (س) و پشتی وی ژی گەلەك ژكەسایەتیێن سەر ب رێبازا سوفیاتیێ ڤە سەرەدانا ڤی جهی كرییە، لالش پەناگەها وان بوو و ئەو جهـ بوو یێن وان ژ پرانییا خەلكی ڤەدەركەت و جهەكی پڕی ئاڤا سازگار كو ژ كانییێن پیرۆز دەردكەفت، ئێزدی د وێ باوەرێدانە كو ئەڤ جهە وارگەها بابێ مرۆڤایەتیێ ئادەم پێغەمبەری (س) بوو.

## پشكا ئێكێ

### جهـ و دیرۆك:

پەرستگەها لالش دكەڤیتە باكوورێ باژێرێ مووسلێ ب دووراتییا (٤٥كم) و (١١كم) دكەڤیتە ژووریێ باژێرێ شێخان (ئێسفنی) و رێكێن وێ دناڤ گەلیەكیرا دبۆریت دبێژنی گەلیێ خودێدا، هەروەسان ئەڤ پەرستگەهە ب دووراتییا (٥١كم) دكەڤیتە ژێریێ رۆژهەلاتێ دهۆكێ، ل سەر خیچا پانی ٣٨,٤٥ باكوور و ٤٣,٢٠ باشوور[1]، بلنداهیا ڤێ پەرستگەهێ ل سەر ئاستێ دەریای نێزیكی ٣١٠٠



دەرگەهێ قاپی ل پەرستگەها لالش

پییانە و دکەڤیتە ناڤبەرا سێ چیان چیایێ حەزرەت (Hizrat) ل رۆژئاڤا و مشەتێ (Mishat) ل ژێری و عەرەفات (Arafat) ل ژووری، ژ بلی چەند رێکەکان چ تشتەکێ دی ڤان چیایان ژهەڤجودا ناکەت و بلنداهیا وان دگەهیتە ٢٠٠٠ مەتران، دارێن بەڕوی و توی و چنار و کەزان و گوهیشك ڤان چیان د نخێڤن زێدەباری سرۆشتێ وانێ جوان و پیرۆزیا وی جهی.

د ڤی گەلیدا هژمارەکا زۆرا دارێن زەیتوونێ و دارێن دیتر ل بەر جوویێن ئاڤێ هەنە، چەند گوند ل دەشت و پاناڤێن دەوروبەر و دناڤ گەلی و چیاندا هەنە، ناحیا ئەتریشێ ب دووراتییا (١٣کم) دکەڤیتە ژووریێ پەرستگەهێ، گوندێ شکەفتهندیا تنێ دو کیلەمێتران گوندێ مەغارە تنێ سێ کیلومەتران ژێ دوورن، د دەمێ خۆدا هندەك گوندێن دی ژی ل وان دەوروبەران هەبوون وەك گوندێ مکێریس ئەوێ شێخ فەخرەدین کورێ ئێزدی میر[٢] لێ دژیا، ب رەخ گوندێ بەربویرێ ڤە بوو، هەروەسان هندەك گوندێن دی ل گەلیێ خودێدا هەبوون وەك گوندێ زێوا ئێسیبیا و کانی بەربۆری و مۆسەکا.

(خانا ئیزی) دکەڤیتە ب رەخ پەرستگەهێ ڤە و ل دەسپێکا رێکا، ئەڤە ویستگەها رێڤینگان و جهێ مێهڤانان زێدەباری هندێ کو خواندنگەهەك بوو خەلکەکی زانستێن دین و دنیایێ لێ وەردگرتن، دەمێ ژ ویرێ بەرەڤ پەرستگەهێ دهێی دێ قەنتەرکا سیراتێ (پرا سیراتێ) کەڤیتە بەرسنگێ تە، پشتی کو تو بێنەکا دی ب رێڤە دچی دێ هەموو تشت تەنا و ئارامبن و ل وی دارستانێ د ناڤ وان جووێن ئاڤێدا دێ هەست ب تەنایێ کەی[٣].

کانیێن ئاڤا سازگار هەردەمێن سالێ تەژی پەرستگەهێ نە، د مەها هاڤینێ دا ئاڤەکا تەزی و د وەرزێ زڤستانا ب بەفر و باراندا ئاڤاکا گەرمە و دبهاراندا ئاڤەکا ل ئاستێ سەقایێ وەرزی یە، دەنگێ تەیرو تەوالا ب تایبەت خواندنا کەوان دگەل بێهنا گۆل و کولیلکان د وەرزێ بهارێدا هێژ جوانییەکا سرۆشتی ددەنە پەرستگەهێ، ئەڤ جوانییە دگەل هاتنوچوونا بەردەواما مجێوران د ناڤبەرا قوب و نیشانێن چاك و سالحاندا سەنگەکا ب بهاتر د دەنە وی جهی، ڤێ هەموویێ ژی پیرۆزییەکا مەزن دایە ڤی جهی کو ب چاڤ هەر ئێزدیەکی ئەو جهێ پیرۆزە یێ مرۆڤ تێدا خۆ بۆ وی خودای د چەمینیت یێ ژیان دایە هەر تشتەکی.

یەکەمین کەسێ ئەوروپی یێ پەسنا ڤی جهی کری ئەنیسورس ولیام (فرەنسیس) بوو، هەر ئەو ژی یەکەمین ئەوروپی بوو یی سەرەدانا ڤێ پەرستگەها پیرۆز کری، هەر وی ژی ل ڤی جهی گولێن فریبیون یێن پنیێن سور خەملاندی دیتینە کو درێژیا وان د ناڤبەرا (٣- ٤) ئینجانە دگەل بەژنەکا گونجای، رۆماننڤیسا ناڤدار ئاجاسا کریستی ژی د پەسنا ڤی جهی دا گۆتییە: (ب تەناهی و سەرنجراکێشیا خۆ چ جهەك ل جیهانێ مینا ڤی جهی نینە...)[٤].




پەرستگەها لالش

گەلەك ژ دیرۆکنڤیسێن سەرەدانا وەلاتێ ناڤبەرا دو رووباران کری و ل دووڤ شوینوارێن وی گەریاین ل سەر لالشێ نڤیسییە، ژ وانا ئیبنولئەسیر و ئیبن لخەلەکان و ئەبو ئەلفیدا و یێن دی، دەمێ دەربارەی شێخ ئادی پەیڤین بۆچووونا هەموو نڤیسکار و ڤەکولەران ل سەر پەستگەهێ یا هەڤکرتییە، یاقوت ئەلحەمەوی د پەرتووکا خۆدا ب (لێلش) ناڤکرییە کو گوندەکە ل بنارا چیای ل دەڤەرێن دکەڤنە رۆژهەلاتێ مووسلێ[٥]، د دەقەکێ ئایینی دا کو ب قەولێ (زەبۆنێ مەکسور) دهێتەنیاسین و

ئێزدییانە[٢٤] گەلەك جاران هەردو دەسەلاتێن ئایینی و دونیایی د کەڤنە دەدەستاندا و ژ ئەرکێن وی:

١- پاراستن و سەرکێشیکرنا ئێزدییان و نوینەراتییا وان د ناڤ دام و دەزگایێن فەرمیدا.

٢- ئاڤاکرن و نویژەنکرنا جهێن پیرۆز ل لالش ژ داهات و دابینکرنا تاووسی یان سنجەقێ و مەزارێن پیرۆز و ئەو خێرێن د گەهنە لالش.

٣- هاریکاریکرنا ژار و کەسێن پێدڤی ژ ئێزدییان.

٤- چارەسەرکرنا ئەو ناکۆکیێن د کەڤنە دناڤبەرا ئێزدییان دا.

**٢-بابێ شێخ[٢٥]:**

بنیاتێ وی ڤەدگەرێتەڤە بنەمالا شێخ فەخر کورێ ئێزدین ئەمیر و ژ بنیات شەمسانی یە، ئەو سەرۆکێ ئایینی یێ ئێزدییانە و پێشەنگێ شێخانە و راوێژکارێ میری یە د کاروبارێن ئایینی دا، ژ ئەرکێن وی:

١- سەرەدانا گوندێن ئێزدییان ل سالێ جارەکێ یان دو جاران، دا شیرەتان ل وان بکەت و وان ل سەر کاروبارێن ئایینی و جڤاکی هشیار بکەت و ناکۆکیێن وان چارەسەرکەت.

٢- ئاراستەکرنا شیرەتان بۆ زەلامێن ئایینی دا ب ئەرکێن خۆ یێن ئایینی رابن.

٣- گرتنا رۆژێن چلێ هاڤینێ و چلێ زڤستانێ سالانە (واتە چل رۆژان ل هاڤینێ و چل رۆژان ل زڤستانێ یێ ب رۆژی بیت).

٤-سەرەدانا لالش ل جەژن و ئاهەنگێن ئایینی، دا رێورەسمێن وان بکەت کو ل وێرێ دهێنە گێران.

بابێ شێخ بەدلەکا سپی (نفسی) ل بەر خۆ دکەت و کەمەرەکا رەش ژ مویێ بزنێ د بێژنێ (رستە) حەفت گەرێ ل سەر گرێددەت و هندەك خەلەکێن سفری یێن پیرۆز د ناڤدانە. کولاڤەکێ سپی (کۆلك) ل سەری یە پارچە ترگالەکێ سپی دبێژنێ (شاشك)، چەند جاران تێ د ئالینن.

ڤەخوارنا مەی ل سەر وی و ل سەر هەمی زەلامێن ئایینی یێن روحانی حەرامە و نابیت (بابێ شێخ) پشتی ڤێ پلێ وەردگریت هەڤژینیێ بکەت، لێ بەری ببیتە (بابێ شێخ) دشێت پتر ژ ژنەکێ بینت.

ئەگەر (بابێ شێخ) مر، میر دێ دگەل کەسایەتیێن ئێزدی و جڤاتا روحانی ل لالش یان ل خانیێ میرنشینیێ کۆمڤە بیت دا ئێکێ دی ل پشتی وی ژ بنەمالا شێخ فەخر کو دڤێت بابێ شێخ ژ مالباتا وی بیت هەلبژێریت و ئەو ژ جهێ وی ناهێتە ڤەدەرکرن یێ دهێتە هەلبژارتن دڤێت چەند مەرج تێدا بن و ناڤ و دەنگێن وی د باش بن و ژیانناما وی یا ئایینی و جڤاکی یا پاقژ بیت و شەهرەزایی د کاروبارێن ئایینی دا هەبیت.

جهێ رابوون و روینشتنا وی یا ل لالش کو ئەو جهێ روینشتنا شێخ فەخرە دەمێ ل جەژن و هەلکەفتێن ئایینی بەرهەڤ دبیت.

**٣-فەقیر:**

ئەو پەروەردەکارەکێ ئایینی یە کو دونیا پشت گوهڤە هاڤێتی و خۆ ژ خۆشیێن وێ دویرئێخستی و ژیێ خۆ بۆ پەرستنێ تەرخان کری. خەلك رێزێ لێ د گرن و فەقیر ب واتایا خودێ ترسێ و پەرستیار دهێت.

فەقیر (خەرقە پۆشە) و (خرقە) کو ژ هریێ چێکری د کەتە بەرخۆ، (ڤی خەرقەی) بەلگێن زرگویزا رەش دکەن کو ئاڤێ و بەلگا د کەلینن و ڤی خەرقەی د کەنە د ناڤدا) و کەمەرەکا سوور کو ژ هریێ چێکری د بێژنێ (رستە) ل سەر گرێددەت و خەلەکەك یان چەند خەلەکێن سفری یێن د ناڤدا و ریباتەك یا د ستووی د بێژنێ (مەفتول) و کولاڤەك یێ د سەری ددانیتە بن دەرسۆکا رەش کو د بێژنێ (کۆلك) و هەر ئێزدییەك دشێت ببیتە فەقیر پشتی ژیانا خۆ بۆ پەرستنا خودێ تەرخان دکەت و پشتی سەرۆکێ فەقیران باوەریێ پێ دهینت کو ب کێر ڤی کاری د هێت و (پێشیمامێ فەقیرا) جلکێن فەقیران ب دەستێن خۆ دناڤ رێورەسمەکێ تایبەت دا ل بەر وی دکەت و فەقیر ریهێن خۆ نا تراشیت. و ئەو ژنکا دونیایێ پشتگوهڤە د هاڤێت و د ژیانا خۆ بۆ

پەرستنا خودێ تەرخان د کەت دبێژنێ (فەقرا).

**٤- کۆچەك:**

چاکەکێ ئایینی یە ئەوێ خودێ ترس و خۆشیێن دونیایێ پشتگوهڤە هاڤێتین و ئەو زانایێ نهێنیانە و عیرفانی ل بال هەیە، پەیڤا (کۆچك) یا ژ (گوهـ چاك) ب واتایا (گوهدار)هاتی و یا فەرە هەمی نهێنیێن ئایینی بزانیت، و ژ بەر گەلەك هزرکرنا وی د کاروبارێن خوداوەندی و ئایینی دا ل هندە جاران ژیرڤە دچیت و های ژ خۆ نامینت و دبێژیت ئەو دوی دەمی دا ل سەر نهێنیێن ئایینی د راوەستیت و چارەنڤیسێ مرۆڤان و گیانێ مریان دزانیت و ئەو کاروبارێن دنیایا نە بەرچاڤ (الآمور الغیبیة) ژی د زانیت.

کۆچەك چل رۆژان ل هاڤینێ و چل رۆژان ل زڤستانێ رۆژیان دگریت (هەردو چلێن هاڤین و زڤستانان).

ئەو جلکێن کۆچەك ل بەر دکەت مینا وان جلکانن کو بابێ شێخ ل بەر دکەت.

**٥-قەوال [٢٦]:**

واتە ئەوێ قەولا دبێژیت و قەوال قەولان و دەقێن ئایینی د ناڤ رێورەسمێن ئایینی دا د بێژیت و قەوال ل گوندێن ئێزدییان د گەریێن و تاووس (سنجەق) یێ د گەل وان دا دا ئێزدییان ل سەر ئایینی هشیار بکەن و ئەو د مەشق کرینە ل سەر لێدانا دەفێ و گۆتنا شبابێ و قەوال ژ تەخا مریدانە و ئەو ژ (تاژیانە)[٢٧].

**٦-پێشی مام:**

زەلامەکێ ئایینی یە ژ بنەمالا (شێخ حەسەن، یان شێخ شەرفەددینی یە) واتە ژ نەژاد ئادانی یە و پێشی مام ئەوێ ژ شێخێن شەرفەددینی یە و دەمێ بابێ شێخ د جەژن و هەلکەفتێن ئایینی دا ل لالش بەرهەڤ دبیت ئەو یێ دگەل دا و ئەو ژ زەلامێن جڤاتا بابێ شێخە و ژ وان کاروبارێن ئەو پشکداریێ د گەل (ئادانی) ناندا نەکەت نڤێژە ل (شەڤا بەرات)، چونکی پێشیماهێ شەمسانیایە ... هەر چەند هندەك جاران یێ هاوکارە د گەلدا[٢٨]... ئەڤ کارە ل سەردەمێ شێخ حەسەنی پەیدا بوویە و ب دروستی ل شەڤا شەڤ بەراتێ، پێشی مام هەمان جلکێن بابێ شێخ ل بەر دکەت.

**٧-بابێ گاڤان:**

ئەو ژ بنەمالا (ئامادین)ە کورێ شێخ شەمسە، واتە ژ نەژاد شەمسانییە و ئەو ژ زەلامێن جڤاتا بابێ شێخە د جەژن و هەلکەفتێن ئایینی یێ د گەلدا و د سەرەدانێن بابێ شێخ دا یێ هەڤرێ یە د گەلدا و رادبیت ب هشیاریا ئایینی و وان جلکێن مینا جلکێن بابێ شێخ ل بەر دکەت.

**٨-بابێ چاویش:**

پەروەردەکارەکێ ئایینی یە و رابوون و روینشتنا وی یا بەردەوام یا ل لالش و ئەو ب کاروبارێن خزمەتکاریێ رادبیت و جلکێن سپی ل بەر دکەت و کەمەرەکا پیرۆز (رستە) ل نیڤا خۆ گرێددەت و نابیت هەڤژینیێ بکەت چونکی ژیانا خۆ یا بۆ ڤی کارێ ئایینی تەرخان کری، و جلکێن وی مینا جلکێن بابێ شێخە.

# ژێدەر:


١. هەکار، ئەو دەڤەرە یا کو د کەڤیتە د ناڤبەرا وەلاتێ عەجەم ل رۆژهەلاتی و ویلایەتا وان ل باکووری و ماردین ل رۆژئاڤایی و مووسل ل باشووری .

٢. مباحث عراقية – يعقوب سركيس ص ٢١٨ .

٣. مجلة المشرق – العدد الثانی – سنة ١٨٩٩، مادة اليزيدية، لانستانس الكرملی البغدادی .

٤. انور المائی، الاكراد فی بهدينان، ص ٧٢.

# پەرتووکا پیرۆز یا ئێزدییان

شەمو قسم کلو

ئێزدییاتی وەك باوەر، هزرەکا کەڤنارە ل دەڤەرا میسوپوتامییا سەرهلدایە، و هەر بیروباوەرەك هەبیت یا ل دەم و جهەکی دیارکری هاتییە بەلاڤکرن و ب رێکا پێغەمبەرەکی یان وەلییەکی یان خاس وچاکەکی کو خوەدی هندەك سەخلەتێن جودا ژ کەرامەت و شیانێن زێدە ژ مرۆڤێ نورمال داینە وی دا بشێت پەیامەکێ بگەهینتە سەر ئەردی بۆ ب جهئینان و پەیداکرنا رێکخستنەکا ئەخلاقی و رەوشتێن باش دناڤ جڤاکی دا.

بیرو باوەرێن ئێزیباتیێ ژی ب ڤی ئاوایی پەیدا بووینە و بەلاڤبووینە و ئێزدییاتی د چەند قۆناغارا دەربازبووییە و ل پێ رووداێن سرۆشتی بیر و باوەرێن خۆ ئاڤاکرینە و هەر مللەتەکی دەمێ بیروباوەر دناڤ واندا پەیدادبن و ژبۆ بتر بێنە پاراستن هەموو ل سەر دل دهاتنە ژبەرکرن یان نڤیسین ل سەر بەرا و بەلگا یان پیستی یانژی ل سەر کاغەزا وپاشی هاتینە کۆمکرن دپەرتووکەکێدا و ناڤەکی پیرۆز کەتییە سەر.

پەرتووکا ئێزدییان ب چەندین ناڤێن پیرۆز هاتییە ب ناڤکرن ل دەم و قۆناغێن جودا یێن ئێزدییاتیێ وەك (مژدەها رۆژ) یان (مەسحەفا رەش) یان (جەلوە)، بەلێ ژبەر وان فەرمان و دەربەدەری و زولما ل سەر ئێزدییان هاتی ل درێژیا مێژوویێ ئەڤ پەرتووك ژ لایێ داگیرکەرانڤە هاتنە ژ ناڤبرن یان سۆتن یانژی ونداکرن[1]، لەوما خاس و چاکێن ئێزدییان و ئولدارێن دینی ئەو دەق ژبەرکرن و پاراستن و هەر نفشەکی بۆ ئێدی ڤەگوهاستن.

بەلگە ژ بۆ هەبوونا ڤان پەرتووکا ئەو دەقێن دینی نە ئەوێن ل ناڤ ئێزدییان دبەربەلاڤن و بەحسێ هەمو رێ ورەسم و دابونەریت و رێکخستنا دینی دکەن، دیارە ژێدەرەکی ڤان دەقا هەبوویە[2] و تایبەت ل قۆناغا هاتنا شێخ ئادی و شێشمس و شێخ حەسەن چونکە ئەوان خاس و چاکا ئەو دەقێن دینی ب شێوەیەکی زۆر رێکخستی و ب ئاوایەکی ئەدەبی، ساناهی و ساکار دارشتن دگوتنێ قەول و بەیت و قەسیدە و دوعا ومشور[3].

ئەگەر ئەم ڤەگەرنە هەبوونا پەرتووکا پیرۆزا ئێزدییان دێ بینن گەلەك نڤیسەر و گەرۆکا ژ کەڤندە بەحسێ هندەك پەرتووکا کرینە و ناڤ دانانە سەر، بەلێ کەسی نکارییە دەمێ دانانا ڤان پەرتووکان ب دورستی دەست نیشانکەت[4].

## زمانێ پەرتووکا پیرۆز

هەر مللەتەکی زمانەك بۆ تێگەهشتنێ هەیە

و هەر زمانەکی ژی تیپێن خۆ یێن تایبەت هەنە و ب دەنگێ تایبەت دئێنە خواندن و ب شێوەیێ جودا دئێنە نڤیساندن، لەوما زمانێ کوردی ژی دڤیا تیپ و دەنگ و نڤیسینا جودا ژ زمانێن دی هەبت. و ئەڤە نیشانا وێ ددەت کو مللەتێ کورد خودان ئەلیف وبێیەکا سەربەخۆ و خۆسەرە[٥]. لەوما خەتەك کەفتیە بەردەست و چەندین گەرۆك وزمانزان دبێژن دبە ئەڤ خەتا جودا کوردی بە و هەرسێ زانایێن زمانی (ماکسیمیلیان بێتنر) یێ ئەلمانی و پرۆفیسور (قەناتێ کوردۆ) و نڤیسەر (بەرویز جیهانی) داکوکیێ ل سەر دکەن کو ئەو رینڤیسا کوردییە [٦].

و ئەڤان زانایا خویبا کرینە کو پەرتووکا مسحەفا رەش یان جەلوە ب ڤان تیپێن جودا هاتینە نڤیساندن ونیشانا وێ یەکێ ددە کو مللەتێ کورد ژی خودان شارستانیا خوەبوویە وخودان ئەلیفبایەکا خووسەرە ودیسا خوەیی بیر وباوەرەکی جودایە و ئەو کتێب ژ ئالیێ کەسانەکی کورد ڤە هاتییە ئامادەکرن[٧].

## دەڤین هاتینە دیتن ژ پەرتووکا پیرۆز

گەرۆك (جرمیا شامیر) دبێژت ل دەمێ گەریانەکا شاندەکی رۆسی پێکهاتیبوو ژ (کارستوڤ وبروجسکی) بۆ پەرستگەها لالشی، پەرتووکەکا پیرۆز دگەل هەفت مۆرێت کەڤن دیتن، و دبێژیت هندەك ژ ڤێ پەرتووکێ هاتە کوپیکرن پشتی دناڤ پارچەکا حەریری دا یا ڤەشارتی بوو و ئەڤ دەستخەتە ژ جهەکی بۆ جهەکی دی ژبۆ پاراستنێ دهات ڤەگوهاستن [٨].

چەندین دەست خەتێن دی ژ لایێ (داود الصائغ) و (ئەنسئانس ماری ئەلکەرملی ) ڤە هاتنە دیتن هندەك ب عەرەبی دنڤیسیبوون و هندەك ب کوردی و ب تیپێن تایبەت هاتبوونە نڤیسین ب نەخش و هێمایێن نەی ئەشکەرا، و ئەوان هەولدان گریکێن وێ نڤیسینێ ڤەکەن و ب هاریکاریا ماکسیمیلیان بیتنەری، و ئەوی تەئکیدکر کو ئەو دەڤە ژ زمانێ کوردی هاتییەوەرگرتن و وەرگێران بۆ زمانێ عەرەبی

ئێك ژ پەرتوکێن پیرۆزێن دهێنە پالدان بۆ ئیزدیان



و هاتییە ب کارئینان ب ئەبجەدیا عەربی دنڤیسینا فارسی دا، و بیتنەری تەئکیدکر کو ئەو دەق ب زمانێ کوردی و ب ئەدەبیاتەکا باش هاتبوو نڤیسین و دبێژت ئەز ب باوەرم ئەڤە هندەك بت ژ پەرتووکا پیرۆزا ئێزدییان [9].

دیسا دەستخەتەکا دی ب ناڤێ اسحاق بەرتلی ژ لایی بروفسکی و کارستوف ڤە ل دیرا رەبان هرمز ل ئەلقوشی ل سالا ١٨٨٤ هاتە دیتن و دبت ئەوا جرمیا شامیر دیتی هەر ئەڤ پەرتووکە بت بەلێ پەیدا کرنا ڤێ پەرتووکێ ژ لایێ جرمیا ڤە جهێ شکێ یە [10].

نڤیسەرێ ژێهاتی (هرمزد منطنە) شارەزایی د زمانێ سریانی و عەرەبی و کوردی دا هەبوو و مامۆستا بوو ل ئەکادمییا بریتانی، ئەوی گەلەك رەخنە ل جرمیا شامیر و ئەنستانس ماری ئەلکەرملی گرتن، و گۆت ئەز هاتمە هنگافتن دەمێ من ئەنجامێن نە سرۆشتی یێن باب ئەنستانسی دیتین و ئەز گەهشتمە راستییەکی ژی کو ئەو دەقێ (جرمیا) ئەوی بخۆ دانابت و گوتبت ئەڤە پەرتووکا ئێزدییانە، چونکە (جرمیا) ب شێوەیەکی وەسا نڤیسیبوو و کلیل دانابوونە سەر وەکی وی ڤیایی و ئەو کلیلە تێکەلییەکا زمانێ عەرەبی و فارسی بوون [11].

هەر دیسا عیزەددین باقەسری د دبێژت هەبوونا پیتا (ڤ - ص - چ - ژ) د ڤان دەست خەتادا وێ یەکێ دیار دکت کو ئەو پیت نەی کوردی نە، لەوما دوێ باوەریێ دایە کو ئەو پیت هەر ئەنستانسی ژ نك خو دورستکرین، دیسا دبێژت ئەو پەرتووکا وی ڤەگوهاستی تنێ چەند لاپەرەکن نە ممکنە ئەو پەرتووکا پیرۆزا ئێزدییانبت [12].

ب ساناهی دیار دبت کو انستانسی د سالا (١٩٠٦) ێ دا دەقەکی عەرەبی ئەوێ هاتییە ڤەگوهاستن ژ کوردی ل جەم وی هەبوو و ئەوی ئەو دەقە دایە بیتنەری کو شارەزایەکا باش د زمانێ فارسیدا هەبوو، بەلکی ئەو دەقێن هاتینە ڤەگوهاستن زێدە هاتییە گهورێن ژی، لەوما ئەوی دەقێن رەسەن یێن کوردی سۆتن. قەناتێ کوردوییف دەربارەی ڤێ یەکێ دبێژیت ئەز یێ ل وێ باوەریێ مە کو دەقێ کوردی یێ بەرێ

ل شنگارێ بت و دبە ئەو دەست خەت هەتا نها ل جیایێ شنگارێ دڤەشارتیبن [13].

## پەرتووکێن پیرۆز

دباوەریا مە ئێزدییاندا، هاتییە سەلماندن کو پەرتووکا پیرۆز وا هەی و بیروباوەرێن ڤی دینی ب زمانێ کوردی ب ناڤێ (مژدەها رۆژ) ئانکو مزگینیا رۆژێ (خێرێ) هاتنە بەلاڤکرن، پاشی گۆتنێ (مسحەفا رەش) ئانکو پەرتووکا پیرۆز یان (جەلوە)دەسخەتا رەسەن.

## مژدەها رۆژ

یەکەم کەسێ بەحسێ ڤێ پەرتووکێ کری (ئەنوەر مایی ) بوو دپەرتووکا (الاکراد في بهدينان) دیسا (مەعسوم مایی) دەست خەتەك ب ناڤێ (مژدەها رۆژ) ب زمانێ عەرەبی بەلاڤکرییە و د پێشەکیێ دا دبێژیت ئەڤ پەرتووکە ژ دەقەکی ب زمانێ کوردی هاتییە ڤەگوهاستن کو ل نك بابێ من (ئەنوەر مایی) بوو و ئەڤ پەرتووکە پێکهاتبوو ژ ٤٣ لاپەرا ب قەبارێ ١٥X٢٠ سم و تێدا خویا دکەت و دبێژیت ئەڤ پەرتووکە ژ دانانا شێخ هەسنێ داسنیی یە کو ل سەدسالییا یازدێ زایینی دانایە [14].

عزەددین باقەسری دبێژت (ئەڤ کتێبا ئەنوەر مایی بەلاڤکری جوداهییەکا مەزن دناڤبەرا وێ و مەسحەفا رەش و جەلوە دا هەیە و نابت ئەم ئیعتمادێ ل سەر ڤێ پەرتووکێ بکەین بۆ ڤەکۆلین و دیارکرنا بیر و باوەرێن ئێزدییان، چونکە پێزانینێن پەرتووکێ هەڤدژی ئەوان تێکستێن دینی و باوەرێن ئێزدیاتیێ نە [15] و دیسا (کەریم زەند) دپەرتووکا (باوەری و ئایین ل کوردستان) دا گەلەك بەحسێ ڤێ پەرتووکێ کرییە.

دبە (مایی) ناڤێ ڤێ پەرتووکێ ژ ژێدەرەکی دەرخستبە یان ژ ئێزدیەکی وەرگرتبە، چونکە ئەوی گەلەك تێکەلی دگەل ئێزدییان هەبوو.

دڤیا هەولەکە مەزن بهێتە دان ژ بۆ دیارکرنا ڤان پەرتووکا و ژێدەرێ ژێ هاتی و باشترین بەلگە

ئەو تێکستێن دینی نە ئەوێن ئۆلدارێن ئێزدییان ب زارەکی ژ بەرکرین و ل ئێکی بۆ ئێکی ڤەگوهاستین و هەتا نها د ناڤا قەول وبەیتێن دینیدا و چەندین تێکەست تەئکیدێ ل هەبوونا ڤێ پەرتووکێ دکەن وهندەك ژ ناڤەرۆکا ڤێ پەرتووکێ خویا دکەن وەکی قەولێ (مەلاك سالم) کو پێکهاتییە ژ ١٤ سەبەقا تێدا بەحسێ هاتنا (مەلاك سالم) دکەن وچاوانییا گەهاندنا ڤان تێکستا بۆ براهیم خەلیل ورێ و رەسم و بیر و باوەرێن ئەزدایێ بەلاڤکرین، وئەڤە چەند سەبەقەنە ژ وی قەولی [١٦]:

**مەلەکەك نازلبوو ژ سامە**
**عێرف و زانا و ب فامە**
**جەبێری هنارتە بامە**

※※※

**مەلاکی ئەو دنووسە**
**دناڤ یارادە ل جەم تاووسە**
**بەری عیسا و بەری مووسە**

※※※

**سالم سولتانی ئانی**
**مشوور و خەتا سویحانی**
**حەد و سەد هنگی دانی**

※※※

**نوقتەیەك ژ علمێ حەقیقەتێ**
**هاتەخوارێ ب سورا قودرەتێ**
**بوو خەتا پیرۆز بۆ ئۆمەتێ**

※※※

**براهیمی ژ سادق ماشێ خۆ وەرگرت**
**براهیمی ژ سالم علمێ خۆ پر گرت**
**فەقیرا ل عەردی ئەو عیلم هەلگرت**

## مصحەفا رەش و جیلوە

پشتی چەندین بەدیلا و ل دەمێ هاتنا شێخادی ناڤێ پەرتووکێ کرنە (مصحەفا رەش) ئانکو پەرتووکا پیرۆز یان (جیلوە) ئانکو دەست خەتا رەسەن، بێ شك ئەڤ پەرتووکە دناڤ ئێزدییان دا هەبووینە و بەلکی هەتا نها دڤەشارتی بن، و ئەو دەڤێن (ئەنوەر مایی) (ماری ئەلکەرملی) و (بێتنەری) و چەند گەرۆکێن ئەورووپی بەحس لێ دکەن نە جهێ باوەریا ئێزدییانە، بەلکی ئەو هندەك بن ژ لاپەرێن پەرتووکا ئێزدییان و هاتینە ڤەگوهاستن بۆ زمانێن بیانی.

ئەڤە ژ ئالییەکی ڤە ژ ئالییەکی دیڤە پەرتووکا مەسحەفا رەش ئەوا کو هاتییە کۆمکرن ژ ئالیێ شێخ ئادیێ کورێ مسافر و هاتییە رێکخستن ب شێوەیەکی باش ل سەدسالییا دووازدێ زایینی، و دیسا پەرتووکا (جەلوە) ئەوا هاتییە دروستکرن ژ ئالیێ شێخ حەسەنێ پسێ شێخ ئادیێ دووێ ڤە وەك شرۆڤەیەکە بۆ پەرتووکا پیرۆزا ئێزدییان، پشتی شەش سالا د شکەفتەکێ دا ل پەرستگەها پیرۆزا لالش ل سەدسالییا سێزدێ زایینی خۆ خەولە کری و ئەو کتێب ژ تێکستێن پیرۆزێن ئێزدییان و بیروباوەرێن وان ئامادەکرین.

## پەرتووکا پیرۆز د قەول و بەیتاندە

چەندین قەول و بەیتێن دی بەحسا کتێبا پیرۆزا ئێزدییان دکەن وەکی قەولێ قەرەفرقان و قەولێ جەلەوێ و ئەڤە چەند سەبەقەنە ژ قەولێ قەرەفرقان ئەم دێ ددنە خویاکرن، خۆ بخۆ رامانا قەرەفرقان ئانکو (پەرتووکا پیرۆز) و ئەڤ قەولە بەحسێ خودێ ناسینێ و ئافراندنا کنیاتێ و پەیدا بوونا ئێزدیباتیێ دکەت [١٧].

**چی سبەیەکە سەودا بوو**
**حال ل مەلك فەخرەدین پەیدا بوو**
**ژ ئەول و ئاخر پەدشا ل وی خویا بوو**

※※※

**چی سبەیەکە خۆشە**
**پەدشایی ئەز خومندمە عەرشە**
**دا دەستێ من خەتەکە رەشە [١٨]**

※※※

**چی سبەیەکە سوورە**
**پەدشایی ئەز خومندمە ژوورە**
**پەدشایێ من نازل کربوو خەت و بەرات و مشوورە**

※※※

دۆر مەوجی بووە بەحرە
پەدشا و هەر چار یارە
ل مەركەبێ دبوون سوارە
سەیرین ل چار كنارە
ل لالشێ سەكنین گۆتن ئەڤە هەق وارە [19]

***

دیسا قەولێ جەلەوێ ب تێر و تەسەلی بەحسێ پەرتووكا پیرۆز یا ئێزدیيان دكەت و گرێدانەكێ دناڤا هەرسێ پەرتووكێن (مژدەها رۆژ) و (مەسحەفا رەش) و ( جیلوە) دكەت ، وەكی دڤان سەبەڤاندە خویا دبت :

چی جەلوەكە بێ قیاسە
وێ تێدا ئەركان و ئەساسە
ئێزدییاتی پێ دبوو ناسە

***

كتێبا سۆر و پیرۆزە
یە كاملە یە بێ عوزە

***

كتێبەكە بەرفرەهە
حێوكی كتێبا قەرەهە [20]
ناڤێ وێ یێ پیرۆز مژدەهە

***

ب مەلەك شێخسن ئەڤ جەلەوە كەملی
شەش سالا دمغارێ دە خەوولی
هەتا جەلەوا مە پێ خەملی

***

بەری پەرتووك شەش پارا بوون
هەر شەش ب ناڤێ تاووسی مەلەك بوون
پشتی چەندین سالا هندەك لێ زێدە بوون

***

ژ مە ئێزدییا رە بوویە مەفەر و كتێب
ل مالا مەزن داهربوو ب دەف وشبێب [21]
تێدە هەیە دەم و حسێب

***

ژ مەرە ئەڤ كتێب نیشانە
وێ تێدا هەین رێ و رەسم و ئەركانە
تاووسی مەلەك تانجە و ئێزی سولتانە [22].

## پێكڤە گرێدانا ڤان پەرتووكان

ل دۆر گرێدانا ڤان هەرسێ پەرتووكا ب هەڤرە، بەرێز (سەعیدێ سلۆ) بابەتەك د كوڤارا لالش ژمارە ١٦ لاپەرێ ١٣٠ داەلاڤكرییە و تێدا دبێژیت:

پەرتووكا مژدەها رۆژ هەمان پەرتووكا جەلوە یە كو رامانا (الوحی) خویا دبت، و مامۆستا توفیق وەهبی دبێژیت نیشانا دیاربوونێ یە یان رامانا سروشتی ددەت، بەلێ مژدەها رۆژ رامانا مزگینییا رۆژێ دئێت، دیسا مەسحەڤا رەش هندەك تەفسیر دكەت ب رامانا پەرتووكا ب هێز و هۆنەر، هندەك دبێژن مەسحەڤا رەش دبنیات دا مەسحەڤا رۆژە، ئانكو پەرتووكا رۆژ. ڤێجا نەیا دوورە كو مژدەها رۆژ و مەسحەڤا رەش ئێك رامان، یان ئێك پەرتووك بن.

ل پێ ڤان گۆتنا ئێزدییاتی (ئێزدایی) وەكو سیستەمەكی هەری كەڤنار و چاڤكانییەكا گرنگە ژ گەلێ كورد را، چ ژ ئالیێ باوەری ب خودایەكی تاك یان ژی ب زمانێ رەسەنێ كوردی دوعا و درۆزێن خوە ب جهـ دئینن و بیر و باوەرێن خوە ب زارگۆتنەكا پر ب لەڤزەت خویا دكەن. هەر دیسا رامانێن پر بالكێش و قایم ژ پەیڤێن كوردی پاراستینە و جۆرەكی رەنگین و زەنگین یێن ئەدەبیاتا كوردی سەلماندینە و دبنە شەنگشتا پاراستنا زمانێ شرین د وان دەقێن دینی د ژ قەول و بەیتێن مە ئێزدییان.

ئێزدییاتی دیرۆكا مرۆڤایەتیێ دسەلمینت و هزر و رەوشتێن باش و جوان دناڤا واندا خویادكەت، هەلبەت ئەڤ یەكە ژی تایبەتمەندیێن كوردایەتیێ یێن رەسەنن و ژ كارناما جڤاكێ خۆمالی یێن كوردەواریێ دەركەتییە، دیسا جەلوە و مەسحەڤا رەش هەلویستێ مرۆڤی دەربارەی ژیان و مرن و پەیوەندییان توومار دكەن [23].

د ئەدەبیاتا رۆژهەلاتیێ دا گەلەك رەمز و هزرێن نهینی هەنە، هندەك پەیڤ و داخوازی ب ئاشكرا ناهێنە گۆتن وەكو د قەول و بەیتێن ئێزدییان دا خویا دبت كو ئەم دبێژن ئەڤە پاشمایێ وێ پەرتووكا پیرۆزا ئێزدییانە د سینگێ قەولبێژ و زانایێن ئۆلێ دا مایێ. بەلكی ئەو تێكستێن كەڤن ب زمانەكی

هاتینە دارشتن کو مرۆڤێن وان چاخێن کەڤن پێ ئاخفتبن، لەوما ل جەم مرۆڤێ ڤی چاخی دبنە پەیڤێن نهێنی یان ژی بێن گران، بەلێ ئەگەر بچنە کووراتییا زمانێ کوردی دێ خویا بت کو چقاس ب هونەر و ئەرکانێکن، د ناڤا وان تێکستێن ئێزدییان دا گرنگییا دیرۆکی و جڤاکی و فەلسەفی خویا دکەت و ئەدەبیاتەکا پر هێزا دناڤ خوەدا خوەدی کرییە و هێزا زمان و چاندا کوردستانێ تێدا ئاشکرا دبت [٢٤]، چونکی ژ چاڤکانییا کەشکولا وان زانا و ئۆلدار و خاس و چاکێن ب پلیمەت هاتینە گۆتن و دبنە بەشەک ژ پەرتووکا پیرۆزا ئێزدییان.

## شێوەیێ دانانا پەرتووکا پیرۆز

پتریا بابەتێن دناڤا ڤێ پەرتووکێ دا ل دۆر پەسن و ئێکانییا خودێ دکەن و مرۆڤی بەرەڤ راستییێ و دووربوون ژ کار و کریارێن خراب و پێگیری ب رێ و رەسم و بیرو باوەرێن ئێزدیاتیێ دبەت، دیسا هاندانە بۆ مرۆڤایەتیێ و خێرێ و هاریکارێ و لێبوورینێ و یەکسانیێ.

رۆژهەلاتناس (لیسکو) دەربارەی ڤان قەول و بەیتا دبێژت (قەول و بەیتێن ئێزدییان خەزینا قانون و رێ و رەسمێن ئێزدیاتیێ و فەلسەفە و ژیانا جڤاکی وەک خۆدیکەک تێدا خویا دبت)[٢٥].

ل پێ ئەوان کۆمێن تێکستێن دینی ژ قەول و بەیت و قەسیدە و دوعا و درۆزە، مرۆڤ دکارت ڤەگەرینتە شێوەیێ دانانا پەرتووکا پیرۆزا ئێزدییان کو پێک هاتییە ژ چەند بەشا وەکی ژێدەر بەحس لێ دکەن[٢٦].

ل دووڤ وان بەشا ئەم دکارن خواندنەکێ بدەینە ڤێ پەرتووکێ و فەرەستەیەکێ ژێرا پەیداکەین.

**بەشێ ئێکێ** دیارکرنا هەبوونا هێزەکا قودرەتی (ئەزەلی) و ئەڤ هێزە ب ناڤێ خودێ ) (xudê یان ئێزدان (êzdan) هاتییە ب ناڤکرن.

**سولتان ئێزی بخۆ پادشایە**
**هەزارو ئێک ناڤ ل خۆ دانایە**
**ناڤێ مەزن هەر خودایە**

***

و ئەوی (دورەک) گەردوون ژ نەهێنیا خوە (سورا خوە ) ئافراند و پاشی هەر هەفت ملیاکەت ژ نوورا خوە ئافراندن و تاووس مەلک کرە سەروەرێ وان،

**پەدشێ من دنیا ئاڤا کر ژ دۆرا گەوهەرە**
**سپارتبوو هەر هەفت سورێت هەرو هەرە**
**مەلەکەک بناڤێ تاووس کرە سەروەرە** [٢٧]

وئەڤە هندەک ژ وان قەول وبەیتێن گرێدای ڤی بابەتی (قەولێ پەدشایی- قەولێ تەختا- قەولێ قەندیلا - قەولێ هەزارو ئێک ناڤ – قەولێ نادر- قەولێ تاوسی مەلەک- قەولێ سلاڤێت جەبێرا - قەولێ سورا، دوعایا شەهدا دینی).

**بەشێ دووێ** ئافراندنا کنیاتێ ب درێژایی بەحس لێ دئێتەکرن هەر ژ دەما هەبوونا (دورەکێ) و پاشی پەقینا ڤێ دۆرێ بوو ئەگەرێ پەیدا بوونا هەر چوار توخمان (ئاخ و ئاڤ و با و ئاگر) وجەبرینا عەردی و پەیدابوونا عەرد و عەسمانی د شەش رۆژان دا، و ل دووڤدا خولقاندنا زیندەوەران و تایبەت خولقاندنا ئادەم و هەوا ل سەر عەردی (بوون و ژیان و مرن و کراس گهۆرینا مرۆڤی) دکەت و ب دەهان قەول و بەیت ب تیر و تەسەلی بەحس لێ دکەن وەکی:

قەولێ قەرەفرقان - قەولێ ئافراندنا کنیاتێ ـ قەولێ زەبوونی مەکسور ـ قەولێ شێخ و ئاقووب ـ قەولێ گای و ماسی ـ قەولێ عەرد و عەزمان ـ قەولێ مەها ـ قەولێ قیامەتێ ـ قەولێ شێخوبەکر- قەولێ دوعایا هەیڤێ )[٢٨].

**بەشێ سیێ** - بەحسێ بیرو باوەرێن ئێزدیاتیێ دکەت. وەک فەرزێن راستیێ (حەقیقەتێ) و دبنە پێنج (پیر و شێخ و هۆستا و مەرەبی و برایێ ئاخرەتێ ) وەکو دڤێ سەبەقا قەولێ ئەبابەکرێ ئۆمەرا دە هاتی:

**شێخ فەرە و پیر نیشانە**
**هوستا و مەرەبی وەکی وانە**
**فەرزا برایێ ئاخرەتێ فەرزەکا گرانە**

دیسان فەرزێن رێ (تەریقەتێ)، پتریا وان دبنە رێبازا ئێزدیاتیێ و دڤیا هەر ئێزدییەک دژیانا خوە دا ڤان فەرزا پەیرەو بکەت وەکو شەهدا دینی و دوعایا سبێ و هێڤاری و مۆرکرن ب ئاڤا کانییا سپی و رۆژی گرتن و توک و

گریڤان و سونەتكرن و چەندی تر و رێ و رەسمێن تایبەت بۆ جێبەجێكرنا ڤان بیروباوەران دڤان قەولاندە بەحس لێ دهێتەكرن وەكی قەولێ ئەبابەكرێ ئۆمەرا و قەولێ شەرفەددین و دوعایا سبێ و هێڤاری و شەهدا دینی و دوعایا مۆركرنێ و قەولێ گریڤانی و قەولێ ئێمان ب چ نیشانە، و قەولێ ئاشێ موحبەتێ، قەولێ چاكێ مە ب سەردا و قەولێ مریدی، قەولێ لاوێ پیران ،قەولێ سورا، قەولێ كاسا، قەولێ ئەساسێ، قەولێ سلافێت مەلك فەخرەدین، قەولێ جڤاتی، قەولێ چارشەمبووێ، قەولێ بەدیلا غەدارا ،قەولێ شێشمس، و قەولێ مەرسوما جەبێرە و دوعایا ئیمانێ و بەیتا ئێزدیباتیێ و بەیتا پیرانیێ و بەیتا مریدیێ و بەیتا شێخینیێ و چەندی تر.

**بەشێ چوارێ** ژ پیرۆزیێن ئێزدییان كو بەهرا بتر تەرخانكریە بۆ پەرستگەها پیرۆزا لالش و پەسنا خاس و چاكا ئەو رێ و رەسم و داب و نەریتی ل پەرستگەهێ دهێنە گێران وەكو سەما و قەنتار و بەرێ شباكێ و قەباغ و پەری سواركرن و مۆركرن ب ئاڤا كانییا سپی و چێكرنا سماتێ و زیارەتبوون و داخوازی و سەرەدانا نیشانگەهێن خاس و چاكا. و دیسا ئەڤ بەشە بەحسا رێ و رەسمێن تاووس گێرانێ و پیرۆزییا رۆژێ وەك قوبلەتا ئێزدییان و گرنگییا رۆژا چوارشەمبوویێ و تۆك و بەرات و خەرقە دروستكرن و هلێل و پەرتووكا پیرۆز و ئەڤە خویا دبیت دڤان دوعا و قەول و بەیتاندە دوعایا فەجرێ و دوعایا هێڤاری و دوعایا مۆركرنێ و دوعایا توكێ و قەولێ شێخ و بەكر و قەرەفرقان و قەولێ ئاخرەتێ قەولێ هەڤساریێ و قەولێ سلاڤێت مەلكێ كەریم و قەولێ شێخ و ئاقوب و قەولێ مشەتێ قەولێ سەرەمەرگێ و قەولێ شەقەسەری و قەولێ دسترێمە و قەولێ موهرا مێرا و قەولێ خەرقە و قەولێ شەرفەدین و قەولێ شێشمس و قەولێ خودانێ مالێ و چەندی تر .

**بەشێ پێنجێ**، ل دۆر گونەهـ و بەدكارییا ب تیر و تەسەلی چەندین قەول و بەیت بەحس لێ دهێتەكرن وەكـی گونەهێن دەرحەقێ دینی و پێگیری نەكرن ب ئەركانێن دینی و سزایێ وان گونەها د پەیوەندیێن جڤاكیدا و دەرەو و غەیبەت و پۆختانی و ئەنیەت خرابیێ و دامان پیسی و سەلەف و كوشتنا بێ سوج و ستەمكاری و تالانكرن و سزایێ هەر كارەكی ژ ڤان چی یە، ئەڤە ب چەندین قەول و بەیتا دهێنە خویاكرن وەكی: قەولی قیامەتێ و قەولێ شەقەسەری و قەولێ مشتاقێ سێ بۆرم و قەولێ هەسەدێ ئال تەوری و قەولێ چارشەمبویێ و قەولێ شێخ و ئاقوب و قەولێ بەدیلا غەدارا و قەولێ چی سبەیەكە تاری یە و قەولێ ئیمانێ و قەولێ ئاشێ موحبەتێ و قەولێ مسكینو ژارو و قەولێ ئەساسی و قەولێ مەستم ژ قەدەهێ و قەولێ بەدیل غەدارا و قەولێ نەفسێ و قەولێ هەڤساری و قەولێ مەرسوما جەبیرا وقەولێ مەرسوما باری تەعالا و قەولێ شیرێ راستیێ .

**بەشێ شەشێ**، چیرۆك و ئەفسانەیێن دینی و خاس و چاكا. وەكی تۆفانا نۆح پێغەمبەر، و ئەفسانەیا میر مح و چیرۆكا براهیم خەلیل و چیرۆكا سلێمان پێغەمبەر و چیرۆكا سولتانێ زەنگ و چیرۆكا جمجمێ سولتان ئەڤ دناڤ قەول و بەیتاندا خویا دبن. وەكی قەسیدا رابیا عەدەویا، شیخادی و مێرا ، قەولێ بازا و قەولێ براهیم خەلیل، قەولێ ئوسفێ نەبیا، قەولێ ئەبابەكرێ ئومەرا، قەولێ فروارا موسێ، قەولێ دۆتا قازی، قەولێ قەدیبلبان. و قەولێ رۆژەكێ ئەز سەفەریووم و قەولێ جمجمێ سلتان.

**بەشێ هەفتێ**، نەسیحەت و شیرەتێن ژ بۆ مرۆڤی بەرەڤ باشیێ ببەت و دوور كەت ژ خرابكارییا، دا دژیانا خۆدا ل دونیایێ یێ سەرفەراز بیت و ل ئاخرەتێ جیێ وی بەهەشت بیت، وەكی قەولێ ئاخرەتێ، قەولێ سلاف سەد سلاڤ، قەولێ نەفسێ، قەولێ دای و بابا، قەولێ سلافێت مەلكێ كەریم، قەولێ مشتاقێ سێ بۆرم، قەولێ بۆرێ فەقیرا، قەولێ بەیگوا، قەولێ مستم ژ قەدەهێ، قەولێ خەورێ، بەیتا نەسیمەتا، بەیتا بلبلا، بەیتا شێخ و پیرا، دوعایا مەعریفەتێ، دوعایا تفاقێ، دوعایا سەبرێ و چەندی تر.

# جەژن و هەلكەفتێن ئێزدییان

عیزەدین باقەسری
وەرگێران: خالد سالح

ڤەكۆلین ل سەر جەژن و هەلكەفتێن ئایینی یێن ئێزدییان و ئەو رێ و رەسمێن تێدا دهێنەگێران گەلەك لایەنێن گرنگ و ڤەشارتی ژ ئێزدیاتییێ بۆ مە ددەنە خویاكرن، هەر وەسان ئەو رێ و رەسمێن كەڤنار و ئەو گهۆرینێن ب سەر بیروباوەرێن ئێزدییان دا هاتین ددەتە دیاركرن، و ژ بەر كو ئەڤ جەژنێن ئایینی گەلەك جاران تووشی گۆڕانكاریيان بووینە ل دەمێ پەیرەو كرنا وان رێ ورەسما ژ لایێ خەلكێ ئێزدی ڤە ، مە هەول دایە ب تێروتەسەلی ل سەر ڤان جەژنا و ئەو رێ و رەسمێن د هێنەگێران ب ئاخڤین و ئەو جەژن ژی ئەڤەنە:

## جەژنا سەر سالێ[1]:

سەر سالا ئێزدییان ژ چارشەمبیا ئێكێ ژ مەها نیسانا رۆژهەلاتی (یولیانی) دەست پێ دكەت و ئەڤ رۆژە دهێتە هژمارتن جەژنەكا كەڤنارە و هێمایە بۆ دەستپێكرنا ژیانێ ل سەر عەردی د باوەریا ئێزدییاندا[2]، هەر وەسان دبێژنە ڤێ جەژنێ (جەژنا مەلەك زان) یان ژی فریشتەیێ نووبوونێ كو ئەو ژی (تاووس مەلەك) ە د باوەریا ئێزدییاندا، و ل هندەك دەڤەرێن دی یێن ئێزدییان نەخاسمە ل باكوورێ كوردستانێ و ئێكەتیيا سوڤیەتا بەرێ دبێژنێ (جەژنا چار شەمبا سور).

جهێ ئاماژێ یە هەیڤا نیسانێ ل دەڤ هەمی مللەتێن ئاری و یێن كەڤن ل میسوپوتامیا مەهەكا پیرۆز بوو و ڤان مللەتان ب ئاهەنگ و رێ و رەسمێن ئایینی پێشوازی لێ دكرن، وەكی ئاهەنگێن (زاكمۆك - زك ماك) یان ژی ژ دایكبوون ل دەڤ سۆمەریان و ئاهەنگێن (ئەكیتو) ل دەڤ بابلیان و (نورۆز — سەرسال) ل دەڤ میدییان، و ئەڤ جەژنێن سەرسالێ و ژ وانان ژی سەرسالا ئێزدییان، ژێدەرێ وان هەمووان ئێكە و هەموو ژی د بنەرەتدا ئێكن سەرەرای ناڤێن وان یێن جودا، و ئەو ژی هەموو ڤەدگەرنە وێ چەندێ كو ڤان مللەتان پێشوازیيا وەرزێ بهارێ دكر وەكی وەرزێ خێر و خۆشییێ و بەرەكەتێ و نووبوونێ ل سەر رووبێ عەردی. ئەڤ جەژنە ژی ژ رامانا پەیڤا (نیسان) یا كوردی د هێت ئانكو (نوو زان) واتە ژ دایكبوونا نوو.

مەها نیسانێ ل جەم ئێزدییا پیرۆزیيا خۆ یا تایبەت هەیە و د ڤێ مەهێ دا ئێزدی گرنگییەكا مەزن ددەنە سرۆشتی، چونكی عەرد ل ڤێ هەیڤێ گەلەك ب جوانی د هێتە خەملاندن ب كەسكاتی و گولێن رەنگا و رەنگ و هەر ژ بەر ڤێ چەندێ ئێزدی دبێژنە هەیڤا نیسانێ (بووكا سالێ) و ل جەم ئێزدییان، ژنئینان د ڤێ هەیڤێ دا نابت ژ بەر كو د باوەریا وان

دا نیسان بخۆ بووکە و چ بووکێن دی ل سەر خۆ رە قەبول ناکەت.

ژ بەر پیرۆزیا ڤێ جەژنێ بەری هینگێ ب چەند رۆژان ئێزدی کاروبارێ وێ دکەن، ژن و کابانێین مالێ ب کۆمکرنا هێکا رادبن و زەلام ژی سەربرا (پەزی) ئامادە دکەن و ل ئێڤاریا جەژنێ (واتە ل ئێڤارا رۆژا سێ شەمبی)[٣] ژنك هێکا د کەلینن و پاشی رەنگ دکەن و زەلام سەربرا سەرژێدکەن دا گۆشتی بۆ رۆژا جەژنێ بەرهەڤ بکەن، هەر وەسان ژنك نانەکێ تایبەت د پێژن دبێژنێ (سەوك)[٤]، ئەڤ سەوکە ل سەر هەمی مالێن گوندی وەکی خێر دهێنە بەلاڤکرن و پاشی ل سپێدەهیا جەژنێ ماست دناڤبەرا جیراناندان دهێتە بەلاڤکرن.

هەر دیسان ژ رێ و رەسمێن ڤێ جەژنێ ل ئێڤارا جەژنێ و ل هندەك دەڤەرا ل رۆژا جەژنێ ژن سەرەدانا مەزارگەها دکەن و سەوکا و شرینا هییان د گەل خۆ دبەنە سەر تربا (گۆڕێ) مرێ خۆ، وهەر ل ئێڤارا جەژنێ زارۆك و گەنج دچنە دەور و بەرێن گوندی بۆ ئینانا کولیلکا (نیسانۆکان) دا کو سپێدەهیا جەژنێ دگەل کاریێ[٥] و ب ئاخا تەر ل سەر دەرگەهێن مالا خۆ ڤەدکەن. هەر دیسان ب شەڤ چرا دهێنە هەلکرن ل مەزارگەهێن خاس و بابچاکێن ئێزدییان.

ل پەرستگەها لالش بابێ شێخ یێ ئێزدییان د گەل قەوال و زەلامێن ئایینی ل ئێڤارا جەژنێ بۆ گێرانا رێ و رەسمێن سەمایێ ئامادە دبن. هەر وەسان ل سەرانسەری پەرستگەهێ و ب شەڤ (٣٦٥) فتیل (چرا) دهێنە هەلکرن و ب ڤی رەنگی دیمەنەکێ جوان ددەتە پەرستگەهێ و د باوەریا ئێزدییاندا ئەڤ رێ و رەسمە ژ بۆ هندێ یە کو شەر و گیانێ شەری نەمینت و رێ بهێنە خۆشکرن ژیانەکا ئارام و بۆ پێشوازیکرنا سەروەرێ فریشتەیان (تاووس مەلەك یان ژی مەلەك زان) وەکی د ڤی تێکستێ ئایینی دا خویادبت:

**چارشەمبوا سەرێ نیسانێ**
**مەلەك زان تێتە خوارێ**
**دەنگ دکەت ل بەهارێ**

ل سوبەهیا جەژنێ خەلك دەردکەڤن و دچنە دەشتێ دا کو دەست و چاڤێن خۆ ب ئاڤا خوناڤێ جوانکەن و د باوەریا وان دا ئەڤ چەندە سەر و چاڤێن مرۆڤی ساخلەمتر لێ دکەت، و پاشی کۆم کۆم سەرەدانا مەزارگەهێن خاس و چاکین ل گوندی دکەن و پاشی مال ب مال ل گوندی دگەرێن ب مەبەستا پیرۆزکرنا جەژنێ و پشتی ئەڤ چەندە هەمی ب داوی د هێت هەمی ل جەم هەڤ ل جهێ تەرخانکری بۆ جڤاتا گوندی کو پتریا جاران ل جەم مەزارێ چاکەکی ل مالا مجێورێ[١] گوندی کۆمڤە دبن و بەحسی رەوشا جەژنێ و دەڤەرێ دکەن دگەل ڤەخوارنا قەهوێ هەتا د بیتە دەمێ زادێ بۆ جەژنێ هاتیە بەرهەڤکرن .

هەر ل رۆژا جەژنێ زەلامێ مالێ سەرەدانا ناڤ زەڤیێن خۆ یێ چاندنێ دکەت و هێکەکا جەژنا سەرێ سالێ ل ناڤ دخۆت و قالکێ وێ د هاڤێژتە ناڤ عەردێ خۆ ب مەبەستا زێدەبوونا خێر و بەرەکەتێ. دیسان د ڤێ رۆژێ دا پەز و بەرخێن ئێزدییان ژی بەهرا خۆ د خۆشییێ دا هەیە چونکی ل رۆژا جەژنێ ئێزدی پەزی نادۆشن و شیری ژ پەزێ خۆ وەرناگرن، بەلکی د هێلن بۆ بەرخ و کارێن وان و هەتا ئێڤاری بەرخ و کار ل بەر سینگێ ماکێن خۆ دمینن و دبێژنە ڤێ چەندێ (ستیکۆش) کو پەز ناهێتە دۆشین بەلکی شیرێ وێ بۆ بەرخان دهێلن.

بەری جەژن ل ئێڤاری ب داوی بێت کابانێین مالا دگەل هەڤ بەرەڤ شڤانێ گوندی ڤە دچن و ئەو ژی پەزێ خۆ ل رەخەکێ نێزیکی گوندی د دچێرینت، و ژن هەر یەك ژ وان سێنیەکا زادی دگەل هندەك هێك و شریناهیا بۆ شڤانی دگەل خۆ د بەن، و پاشی شڤان پەزەکێ د گرت و ددەتە خودان پترین پەز هەی کو د بێژنێ (سەرهەڤکەر)[٧] و ئەو ژی بەر ب شڤانیڤە د چن و گۆپالێ وی ژێ دستینن و (سەرهەڤکەر) یان ژی ئەو ژنا خودان پترین پەز گۆپالێ وی د شکێنیت و پرت پرت دکەت و هەر یەك ژ وان پرتەکێ بۆ خۆ دبەت و د کەنە بەر (مەشکا شیری).

هەر دیسان د ڤێ جەژنێ دا چەندین یاری دهێنە ئەنجامدان، ژ وانان:

- هێکانێ:

ئەو ژی د ناڤبەرا دو کەسان دا د هێتە ئەنجامدان ب لێکدانا دو هێکان، کو هەر یەك ژ وان هێکەکێ حازر دکەت و ب باوەرییا وی یا ژ هەمویان ساخلەمتر و ب هێزتر، پاش ئێك هێکا خۆ ل یا یێ دی ددەت و چی کەسێ هێکا وی شکەست خودانێ وێ ب هێکا خۆ خوسارەت دبیت.

- کابانێ:

ئەڤ یاریبە د ناڤبەرا ژمارەکا کەسان ژ کچ و کوراندا د هێتە ئەنجامدان، ئەو ژی ب رێکا (کابێ) و (کاب) ژی ئەو هەستیکێ پەزی یە کو د کەفتە د ناڤ چۆکا وی دا و وی هەستیکی چوار رەخ هەنە، دو دراستن و دو د تیژن، پشتی دو کەس خۆ هەلدبژێرن هێکێن خۆ د گەل خۆ دئینن ب مەبەستا بەریکانێ و پاش ئێك ژ وان وێ کابێ هەلدهاڤێت، ئەکە هەردو رەخ وەکی ئێك دەرکەتن ئەڤە ئەو ب سەرکەت و ژمارەکا هێکان ب دەست خوڤە ئینان و ئەگەر هەردو رەخ نە وەکی ئێك بوون ئەڤە ئەو خوسارەت بوو .

## رامان و هێمایێ رێ و رەسمێن جەژنا سەرێ سالێ:

- چارشەمبا ئێکێ ژ مەها نیسانێ.

د ڤێ رۆژێ دا پروسیسا ئافراندنا دونیایێ دووماهی هات، دمیتولوجیا ئێزدییان دا و گیانێ ئادەمی د قالبێ وی دا جێگیر بوو، هەر وەسا د ڤێ رۆژێ دا (تاووس مەلەك - مەلەك زان) ژ ئەسمانی دهێتە خوار دا کو جارەکادی رێنماییێن خودێ و پەیاما وی ب گەهیتە مرۆڤان ل سەر عەردی.

- هەلکرنا فتیلا (چرا) ل پەرستگەها لالش:

کەیف خۆشییا ب هاتنا (تاووس مەلەك) و ئاگر و رۆناهی هێمایێ خۆشییێ و خێرێ و ژیانێ یە.

- هێك، هێمایە بۆ رۆژا دروستکرنا عەردی و پەیدابوونا وی.

- شکاندنا هێکێ نیشانە بۆ بژکینا وێ دۆرێ و پەیدابوونا ژیانێ ل سەر عەردی.

- کەلاندنا هێکێ هێمایە بۆ جەبراندنا عەردی.

- رەنگکرنا هێکان هێمایا جوانی و خەملا عەردی یە.

- پێکڤە روونشتن و پێك گوهۆرینا خێر و خێراتا و جەژن و پیرۆزکرن کارەکە ژ بۆ پتر خورتکرنا پەیوەندیێن جڤاکی و بەلاڤکرنا خۆشییێ.

- ژن نەئینان ل هەیڤا نیسانێ رێزگرتنە ل هاتنا سەروەرێ فریشتەیان (تاووس مەلەك) .. هەروەسان چێدبت وەك ساخکرنا وی نەریتی بت ئەوێ ل دەڤ مللەتێن رۆژپەرستێن کەڤن دهاتە پەیرەوکرن کو وانژی ژنئینان د ڤێ هەیڤێ دا نە دکر.

- نە کۆلانا عەردێ (بوور) کو هەتا هینگێ نە هاتییە چاندن رێزگرتنە بۆ پاك راگرتنا سرۆشتی و پاراستنا تۆڤێ وان شینکاتییانە ئەوێن ل بهارێ چێدبن.

- هەلاویستنا کولیلکێن (نیسانۆکان) ب بەردەرگەهێ مالێ و خانییانڤە نیشانا خۆشییێ و پێشوازیکرنا جەژنێ یە.

- شکاندنا کۆپالێ شڤانی ژ لایێ (سەرهەڤ کەرێ) ڤە نیشانا ب دووماهی هاتنا ماوەیێ شڤانی یە ل بەر پەزی و نووکرنا ڤی ماوەیە بۆ سالەکا دی ل پشتی کۆپالەکێ نوو ددەنێ.

- هەر دیسان هەلاویستنا پرتەکا ڤی کۆپالی ب مەشکێ ڤە هێمایە بۆ زێدەبوونا بەرهەمێ پەزێ وێ مالێ.

- نە دۆشانا پەزی ل ڤی رۆژێ دلۆڤانییە بەرامبەر بەرخ و کارێن وان دا کو رۆژەکا خۆش د گەل ماکێن خۆ ببەن.

## جەژنا چلێ هاڤینێ:

ل (١١خزیرانا رۆژهـەلات) هەتا (٢٠تیرمەها رۆژهەلاتی) جڤاتا روحانی و علمدار و دیندارێن ڤولبیژ رۆژییان دگرن، واتە ژ (٢٤ خزیرانێ هەتا ٢ تەباخێ رۆژئاڤا). ئەڤ جەژنە سێ رۆژان ل پەرستگەها لالش د هێتە گێران، ل رۆژا دووماهیێ ژ جەژنێ هەمی ئێزدی ل پەرستگەها لالش کۆمڤە دبن بۆ بەشداری کرنێ

، رێ و رەسمێن ڤێ جەژنێ و هەر ئێك ل دووڤ رۆل و پێگەهێ خۆ ، جڤاتا روحانی بەری رۆژا جەژنێ ب رۆژەکێ ل پەرستگەها لالش بەرهەڤ دبن بۆ گێرانا رێ و رەسمێن ئایینی و مجێور و سەرەدەرێن مەزارگەهان بەری هینگێ ب دو رۆژان بەرهەڤ دبن بۆ پێشوازیکرنا ئێزدیێن سەرەدانا وان دکەن، هەر وەسان خەلکێ ئێزدی ژ هەمی دەڤەرێن ئێزدی نشین سەرەدانا لالش دکەن و یەکەم رێ ورەسمێ ئایینی ژی ئەوە ل بەر دەرگەهێ پەرستگەهێ ل جهەکی کو د بێژنێ (پرا سەلاتێ)[8] و ل وێرێ دەست و چاڤێن خۆ دشوون و خۆ پێخاس دکەن (پێلاڤێن خۆ دئێخن) ژ بەر پیرۆزیا وی جهی و نابیت بپێلاڤێ هاتن و چوونێ د ناڤ پەرستگەهێ دا بکەن.

د سەردەمێن بەرێ دا خەلکێ گوندێن دەورو بەری پەرستگەهێ ب پییان د هاتنە پەرستگەهێ و ل رەخێ باشووریڤە د هاتنە جهەکی د بێژنێ (سلاڤکەهـ)[9] کو جهەکێ بلندە ل هنداڤی پەرستگەها لالش. ل وی جهی ل دەمێ گەهشتنا خەلکی ل وێدەرێ هندەکان تڤەنگ ل بەر وان د هاڤێتن نیشانا گەهشتنا وانە بۆ لالش و دەربرین بوو ژ کەیف و خۆشییاندان (بەلێ نهو ئەڤ دیاردە نەمایە)، و زۆربەی خێزانێن ئێزدی یێن سەرەدانا لالشێ دکەن ل دەمێ جەژنا چلێ هاڤینێ بۆ ماوەیێ چەند رۆژەکا لێ دمیننەڤە و خوارن و هەمو پێداویستیێن خۆ د گەل خۆ دئینن، و د ماوەیێ ڤان رۆژان دا دێ بینی گەلەك جاران گەنج ل بەر دەنگێ موزیکا ئایینی (دەف و شبابا) ل بەر دەرگەهێ کانییا سپی کو د بێژنێ (گۆڤەندا کانییا سپی)[10] دگێرن. هەژییە بێژین لالش وەکی پەرستگەهەکا پیرۆز تێدا کوشتن و دزی[11] و ڤەخوارنا مەی و خرابکاری حەرامن. دیسان لالش گەلەك جاران بوویە جهێ ئاشتی و ئارامی و نەهێلانا شەرێن د ناڤبەرا عەشیرەتێن ئێزدییان و ل لالش پێکهاتینە، ب شێوەیەکێ گشتی ئەڤ رێ و رەسمێن ئایینی ل پەرستگەها لالش دهێنە گێران. لێ ئەرك و رێ و رەسمێن گشتی کو ل جەژنان ل لالش د هێنە گێران دپێکهاتینە ژ:

١- فەرە ل سەر هەر ئێزدییەکی دەمێ سەرەدانا لالش دکەن سەرەدانا مەزارگەهێ شێخادی و زمزمی و مەزارگەهێ شێخ فەخر و شێشمس و کانییا سپی بکەن.

٢- هەر مجێورەك یان سەرەدەرێ مەزارگەهی د ڤێت پەزەکێ سەرژێبکەت و بکەتە (سمات)[12] و ل سەر خەلکێ بەرهەڤبووی بەلاڤبکەن .

٣- دیسان د ڤێت سەردەری (مجێور) رۆژانە چرایی[13] مەزارگەهی هەلکەت .

٤- ل هەمی رۆژان قەوال و زەلامێن ئایینی دوعایا و قەولێن ئایینی دبێژن د گەل دەنگێ (دەف و شبابا) و ل سبێ (بەیتا جندی و بەیتا سبێ) و ل ئێڤاری (بەیتا هێڤاری)[14] دبێژن.

٥- رێ و رەسمێن قەنتەرێ: پشتی بەیتا سوبێ د هێتە خواندن زەلامێن ئایینی خۆ بەرهەڤ دکەن بۆ رێ و رەسمێن (قەنتەرێ) و ئەو ژی دبنە دو بەش، بەشێ ئێکێ ژ هندرێ پەرستگەهێ دەردکەڤتن و بەرەف کانییا سپی ڤە و ب شێوەیێ رێڤەچوونەکا رێکخستی و ب ڤێ زنجیرێ: مجێور ل پێشیێ و پاشی پێشیمامێ بەحزانی پاشی میر حەج و ل دووڤ دا شێخەك ژ شێخێن سمائیلا و ل دووڤ دا ئێك ژ بنەمالا پیرێ ئیسیبیا و ئەڤ بەشە ل کانییا سپی دمینن ل چاڤەرێی بەشێ دووێ کو ئەو ژی پێك د هێن ژ:

شێخێ وەزیر (ژ بنەمالا شێخ شمس) پاشی ئێك ژ شێخێن شێخ مەندوی و ل دووڤ دا شێخێ ناسردین و خاتونا فەخرا و شێخێ ئامادین و شێخ بابك و ئەڤە ژی بەرەڤ کانییا سپی ڤە د چن و پاشی هەردو بەش دگەهنە ئێك و پێکڤە سەرەدانا مەزارگەهێن لالش د کەن و زیارەتی دبن.

ل جڤاتا بابێ شێخ (جڤاتا شێخ فەخر) بابا شێخ و هەڤالێن خۆ ل وێرێ د روونە خوار، پاشی فەقیر (سەردەرێ پەرستگەها لالش) د هێتە دووڤرا و داخوازێ ژێ دکەت سەرەدانا مەزارگەهـ و قوبێن ل لالشێ بکەت و ئەو ژی ب ڤی کاری رادبت و هەمی زەلامێن ئایینی پێن وی ل دووڤ وی دا ب ڤێ زنجیرێ د چن:

فەقیر ل پێشیێ و ل دووڤ دا پێشمام یێ بابێ شێخ ژ خێزانا شرفەدین و پاش شێخەك ژ خێزانا شێخ فەخر و ل دووڤ دا ئیختیارێ بەحزانی و باشیكێ پاشی بابێ چاویش و هەمی پێكڤە رادبن ب زیارەتا مەزارگەهێن ئێزدییان ل لالش و ب ڤی شێوەی:

مەزارێ شێشمس- خاتونا فەخرا – شێخ مەند – سجادین – شێخ حەسەن – ئێزدین ئەمیر – كانییا سپی – و پشتی بۆ ماوەیەكێ كورت ل كانییا سپی دروونن ڤەدگەرنەڤە جڤاتا بابێ شێخ ل بەردەرگەهێ سەرەكیێ پەرستگەهێ.

هەژی گۆتنێ یە ئەڤ رێ و رەسمە دەربرینە ژ ساخكرنا وان هەول و بزاڤایە ئەوێن هاتینە كرن بۆ چارەسەركرنا وێ هەڤركیا سیاسی و جڤاكی یا ل چەرخێ سێزدێ زایینی د ناڤبەرا شەمسانی و ئادانییان دا چێ بووی و ئەڤ پێكهاتنا شەمسانی و ئادانییا ل بەر پەرستگەها لالش چێبوو پشتی هندەك لایەنان مایتێكرن كرین و هەمی لایەن ل لالشێ كومبوون و رێكەفتنەك د ناڤبەرا وان دا هاتە كرن و هەڤركی ب دووماهی هات.

دیسان ل دەمێ جەژنا ل پەرستگەها لالش ل هەمی ئێڤارا قەوال ل جهێ خۆ یێ تایبەت د روونە خوار و قەول و بەیت و دوعایا دكەن و بۆ ئامادەبوویا شرۆڤە دكەن، و پشتی ڤێ چەندێ خۆ دگەل جوقەتەكا ئایینی بۆ ئەنجامدانا رێ و رەسمێن گێرانا (سەمایێ) ئامادەدكەن كو رێ و رەسمەكێ ئایینیێ كەڤنە و چەندین زانایێن ئایینی پشكدارێ تێدا د كەن و ب ڤی رەنگی دەست پێ دكەن:

فەقیر ژ هوندرێ پەرستگەهێ ب جل و بەرگەكی تایبەت كو د بێژنێ (تانج و حلە) دەردكەڤت و د باوەریا ئێزدییان دا جل و بەرگێن شێخادی بوون:

**شێخادی خەرقە ل بەر دكر**

**تانج و حلێت رەشی نورانی ل سەر كر**[١٥]

پاشی قەوال دەست ب لێدانا (دەف و شبابێ) دكەن و ل بەر تلیلیێن ژنكا هندەك تێكستێن ئایینی یێن ب (سەمایێ) ڤە د گرێدای د بێژت، فەقیر ل بەرامبەر زەلامێن ئایینی یێن پەیوەندیدار كو ب ئێك رێز راوەستیان د راوەستیت و ل دۆر چرایەكی كو د بێژنێ (چەقەلتو) دزڤرن[١٦]، و پشتی هەمی پشكدارێن گێرانا سەمایێ جل و بەرگەكێ تایبەت ل بەر خۆ دكەت كو د بێژنێ (مەرزو) ب دو رێزێن ل بەرامبەر هەڤ د راوەستێن و فەقیر ل بەرامبەر هەردو رێزان یێ راوەستیایە و بەشێ ئێكێ پێك دهێت ژ:

پێشمامێ بەحزانێ (ژ شێخێن شێخ حەسەنە) پاشی میر حەج (ژ پسمیرایە) و ل دووڤدا شێخێ وەزیر (ژ شێخێن شێشمس)، و ئێك ژ شێخێن شێخ سمائیل پاشی شێخێ بابادین پاشی پیرێ ئیسیبیا.

بەشێ دووێ ژ ڤان پێك دهێت:

پێشیمامێ بابێ شێخ ژ (شێخێن شرفەدین) پاشی بابێ شێخ، بابێ گاڤان، سەردەرێ كانییا سپی، ئیختیارێ مەرگەهێ، پاشی ئیختیارێ بەحزانی و ل دووماهیێ و ل دووڤ هەردو رێزكان بابێ چاویش و رادوەستیێت.

ئەڤ رێ و رەسمە دەست پێ د كەت ب زڤرینا ڤان هەردو رێزكان ب پێنكاڤێن هێدی هێدی ل دۆر ئاڤدكا ئاگری كو د بێژنێ (چەقەلتو) و بۆ سێ جاران ل دۆر دزڤرن دگەل دانا دەستێ خۆ یێ راستێ ل سەر سینگێ خۆ و ب ڤی شێوەی هەتا ب دووماهی دهێت هەردو رێزك ل بەر دەرگەهێ سەرەكی یێ لالشێ د گەهن ئێك.

هەژی گۆتنێ یە حەفت جۆرێن (سەمایێ) هەنە كو د بێژنێ (سەما ئێزدی، سەما قانونی، شێخ شمس (شێشمس)، شەرفەدین، بلند، زەرزا، وسەمابا ل سەر گۆرا[١٧] كو ب تنێ یا تایبەتە ب سەر قەبرانڤە)، ئەڤ هەر حەفت جۆرێن سەمایێ ب ناڤەرۆك و گێرانا وێ ژ ئالیێ لڤیناڤە وەكی ئێكن، ب تنێ ئەو قەول و دوعایێن دبێژن هەر یەك ژ یا دی یا جیاوازە.

سەبارەت رامان و كەڤناتییا سەمایێ بۆچوون بۆ هندێ دچن كو ئەڤ رێ و رەسمە رێ و رەسمەكی ئایینی یێ كەڤنە و ڤەدگەریتەڤە سەردەمێ میترائی، شەمسانی (مزدە یەسنی) و زەردەشتییان، و وەكی تێكستێن پەهلەوی دا هاتی دەمێ (جەم

جەمشید) ی قوربانی ب گایەکی ددا د گەل دا جۆرەکێ کەسکاتیێ د سۆت کو د گۆتنێ (ھۆما- سۆما - یان ژی سەما) و د گەل سۆتنا ڤی شینکاتی زەلامێن ئایینی ب جۆرە دیلانەکا ئایینی رادبوون و ب ھەمان شێوە ئەڤ رێ و رەسمە ل جەم میترائیان ژی د ھاتنە گێران. ل دەڤ زەرادەشتییان ژی جۆرە کەسکاتییەك کو د گۆتنێ (ھۆما- سۆما) یێ پیرۆز بوو و جۆرە شیرەك ژی چێدکرن و ڤەدخوارن د گەل ئەداکرنا ڤی رێ و رەسمی[18].

میترائیان ل دەعوەتنامان ڤەخوارنا رووەکێ (ھوما) پێشکێشی باوەرداران دکرن وەکی ھێما بۆ خوداوەندێ مانێ ددەتە باوەرداران[19].

وەسان د ھێتە خویاکرن سەمایا ئێزدییان ژی ھەر ئەو رێ و رەسمێن ئایینێ کەڤن بت ژ بەر کو ئێزدی ل دۆر چرایێ پیرۆز (چەقلتویێ) د زڤرن و ب لڤینێن تایبەت د گەل گۆتنا ھندەك تێکستێن ئایینی و پێشکێشکرنا ئاڤا کانیا سپی (ئاڤا کانیا سپی) ب ئامانەکێ تایبەت کو دبێژنێ (شێربك).

## تاووس جوانکرن:

تاووس (گاووس) یان ژی د بێژنێ (سەنجەق) ھێما و ئالایێ پیرۆزێ ئێزدییانە، ب شێوەیێ فرندەیێ تاووسە و ل سەر ستوونەکا سفری و پشتا وی ددەنە حەفت بالیفکا و جەرەکێ سفری (شێربك) یێ ئاڤێ دانن بەرامبەر کو تێدا ئاڤێ ل سەر بەرھەڤبوویا د گێرن، دیسان ھندە تشتێن دی ھەنە ھەڤگرێدای تاووسی نە مینا پارچە قوماشەکێ کەسك ھەیە د بێژنێ (کەفیا کەسك)[20].

تاووسێ ئێزدییان ل جھێ تایبەت کو د بێژنێ (خزنەت ال رەحمان)[21]ل گوندێ باعەدرێ د ھێتە پاراستن و ل دەمێ تاووس گێرانێ د ئیننە لالش ب رێ و رەسمێن ئایینی یێن تایبەت و ل بەراھیێ دبەنە کانیا سپی دا ب ئاڤا وی مۆر بکەن (د شوون) ب ئاڤەك و قوماشەکێ پاقژ د گەل گۆتنا قەولەکێ تایبەت دبێژنی (دسترێمە) و پاشی ل بەر لێدانا دەف و شبابا[22] جارەکادی پارچێن وی لێکددەن د گەل ڤێ

چەندێ قەوال دوعایەکا تایبەت د بێژن (درۆزا خاسا) و پاشی ل مەزارێ (شاھـ سواری) د ھێتە پاراستن ھەتا رۆژا تاووس گێرانێ ل گوند و ناڤەندێن ئێزدییان، کو ئەو ژی رێ و رەسمەکێ تایبەتە ل ناڤ ئێزدییان د ھێتە گێران[23].

## جەژنا جەمایێ:

رێ و رەسمێن ڤێ جەژنێ ل پەرستگەھا لالش بۆ ماوەیێ حەفت رۆژان د ھێنە گێران. ژ (٢٤ ئیلۆنا رۆژھەلاتی ھەتا ٣٠ ڤێ ھەیڤێ). واتە ژ (٧ ھەتا ١٣ ھەیڤا چریا ئێکێ رۆژئاڤایی). ئێزدی ل ھەمی جیھانێ بەرێ خۆ ددەنە پەرستگەھا لالش دا پشکداریێ د رێ و رەسمێن جەژنا جەمایێ دا بکەن کو ھەر ھەمان ئەو رێ و رەسمن کو ل جەژنێن دی یێن ل پەرستگەھا لالش دھێنەگێران، بەلێ ھندەك رێ و رەسمێن دی یێن تایبەت ب جەژنا جەمایێ ڤە ھەنە وەکی (پەری سوارکرن) بەرێ شبایکێ و قەپاغ).

*** پەری سوارکرن :**

پەری پارچە قوماشەکێ رەنگاو رەنگە ل دۆر سندروکا خاس و چاکێن ئێزدییان د وەرینن پشتی ب ئاڤا کانیا سپی دھێتە مۆرکرن (تعمید) و ل رۆژا چوارێ یا جەژنا جەمایێ ئەڤ رێ و رەسمە د ھێتە گێران و پشتی د ھێتە مۆرکرن ل بەر دەنگێ دەف و شبابا دبەنە د ھوندرێ پەرستگەھێ دا و پاشی ددانە سەر سندرۆکا وی خاسێ ئێزدی یێ دەستنیشانکری ئەو ژی ئەڤەنە:

(ستیائێس، شێخادی، شێشمس، شێخ حەسەن، شێخو بەکر، شێخ فەخر).

*** قەپاغ**[24]:

رێ و رەسمێن قەپاغێ ل رۆژا پێنجێ ژ جەژنا جەمایێ دگێرن و ب تنێ سێ عەشیرەتێن ئێزدییان بەشداری ڤان رێ و رەسمان دبن و یێن دی ب تنێ د بنە تەماشەڤان، پشتی ھەرسێ عەشیرەتێن (قائیدی، ترك، ماموسی) ل بەر دەرگەھێ سەرەکی یێ پەرستگەھێ کۆمڤە دبن. ھەلگرێ (چەقەلتو) دگەل قەوالا ئامادە دبت و د گەل ژنەکێ کو ھەلگرا

سێنییەكا (بخۆر)ێ یە و هەمو پێكڤە دگەل دەنگێ دەف و شبابا تلیلیێن ژنان بەرەڤ جهەكی ڤە د چن كو دبێژنێ (بەرێ قەپاغێ)[٢٥] و پشتی دگەهنە جهێ ناڤبری زەلام خۆ بەرهەڤ دكەن بۆ هاڤێتنا شێلكەكا تڤەنگان پشتی میر یان سەرپەرشتێ قەپاغێ ئاماژێ ددەتە وان و ل وی جهی دزڤرنەڤە دەرێ پەرستگەهێ و جارەكادی زەلام شیلكەكا تڤەنگان دهاڤێژن و هەر ل وی جهی دیلانەكا حەفت رێزكی ب شێوەیێ بازنەیی گرێددەن و ل ڤی دەمی (فەقیر) ستویێ گایەكی دگریت و دئینتە دناڤ خەلكێ گوڤەندێ دكەن پاشی هەمی ل دووڤ گای دبەزن هەتا دگەهینە مەزارێ شێشمس و ل وێرێ ڤەدكوژن و دكەنە قوربانی بۆ خودانێ رۆژێ و گۆشتێ وی دكەنە (سمات) و خێر و ل سەر بەرهەڤبوویان بەلاڤ دكەن و (مجێورێ) سەر دەرێ شێشمس پارچە قوماشەكێ سپی ددەتە هەمی ئەو كەسێن پشكداری د ڤان رێ و رەسمان دا كری و ئەو ژی ب سەرێ خۆڤە دكەن و ب شاهی و دیلان ڤە بەرەڤ چیایێ عەرەفاتێ ڤە دچن و ل سەرێ چیای ژی دیسان دەهواتەكێ گرێددەن و پاشی بەرەڤ پەرستگەهێ دهێنەڤە و ل جەلسا میری بەرهەڤ دبن و میر هەر یەك ژ وان خەلاتەكی ددەتێ[٢٦].

سەبارەت دیرۆك و كەڤناتییا ڤی رێ و رەسمی بۆ چوونێن جیاواز هەنە، سەرەرای كو هندەك دبێژن كو رێ و رەسمێ قەپاغێ دەربرینێ ژ وان رێ و رەسمان دكەت ئەوێن هاتینە ئەنجام دان، ل دەمێ شێخادی ل پەرستگەهێ چوویە بەر دلۆڤانییا خودێ، بەری هەر كەسەكی ئەو هەرسێ عەشیرەتێن ئێزدییان (قائیدی، ترك، ماموسی) ل دەمێ گوهـ ل خەبەرێ مرنا وی دبن دگەهنە پەرستگەهێ لالش و هندەك تڤەنگان د هاڤێژن كو ئاماژەیە ب گەهشتنا وان.

بەلێ نڤیسەرێ عەرەب (جورج حەبیب) بۆچوونەكا دی دەربارەی قەپاغێ هەیە، ئەو ژی دبێژت

رێ و رەسمێن جەژنا جەمایێ



ڕی و رەسمەکێ میترائی یە، چونکی میترائیبیا ل رۆژا میهر و ل هەیڤا میهر (مهر- مەهر- رۆژ) و ل بەر پەیکەرێ خوداوەندێ میترا گایەك ڤەدکوشتن وەکی ئاماژە ب دووماهی هاتنا وەرزێ پاییزێ و ڤورتالبوونا کشتوکالێ وان ژ شەری و تالانکرنێ، ئەڤجا گایەك بۆ خوداوەندێ (میترا- میهرا) دکرنە خێر.

وەکی ڤەکۆلینێن ئارکولوژی ددەنە دیارکرن ل زۆربەیا پەرستگەهێن میترائیبیان شوینوارێن قوربانیکرنا گای ل بەر پەیکەرێ میترا دیارن کو ئەو ژی هێمایێ خێر و بەرەکەتا عەردی بوو[27]، هەر وەسان ل جەم ئێزدییان گا ل بەر دەرگەهێ مەزارێ شێشمس د هێتە سەرژێکرن و ئەڤ چەندە ژی وێ پەیوەندیێ د ناڤبەرا رۆژێ و ڕێ و رەسمێن قەپاغێ ددەتە دیارکرن، دیسان دیلانەکا حەفت ریزی ب شێوەیێ بازنەیی ئاماژەیا زڤرینا حەفت هەسارێن کنیاتێ یە یە (کواکب سیارە) ل دۆر عەردی.

**بەرێ شبایکێ:**

بەرێ شبایکێ ژمارەکا بازنێن سفری یە (٨١ بازنن) و ب یەك ڤە ل سەر بەرگەکێ رەنگا و رەنگ دگرێدانە و هەردو ب دو دارێن درێژ ل سەر بەرکێ ب شێوەیێ لاکێشەیی دگرێدانە کە چار دەستك هەنە و ئێزدی د بێژنێ (داربەست).

بەرێ شبایکێ ل جهەکی تایبەت و ل مالا شێخ بریم شەمسانی ل بەحزانی دهێتە پاراستن هەتا رۆژا بەری جەژنا جەمایێ ب ڕێ و رەسمێن تایبەت د هێتە ڤەگوهاستن بۆ پەرستگەها لالش و ل دەمێ دگەهت و ل وێ جهێ دبێژنێ (پرا سەلاتێ) بابێ شێخ و قەوال و مجێور و فەقیر و هەلگرێ (چەقەلتو) و هەلگرێ بخۆرێ دگەل دەنگێ دەف و شبابا ڤەدگوهێزنە کانیا سپی و ل وێرێ دمینت هەتا رۆژا شەشێ ژ جەژنێ ڕێ و رەسمێن تایبەت دهێنە گێران.

ڕێ و رسمێن بەرێ شبایکێ



ل ئێڤارا بەری ڕێ و ڕەسمێن بەرێ شبایکێ بێنە گێران، میر و بابێ شێخ و قەوال و هەمی زەلامێن ئایینی، بەرێ شبایکێ ژ کانییا سپی دبەنە هوندرووی پەرستگەهێ دا (رواقا شێخادی) و ل وێرێ ل بەر لێدانا دەف و شبابا و قەولێ (تەختا) ئەو زنجیرە جارەکادی پێکڤە دهێتە گرێدان ب باشی و وەسا هەتا رۆژا شەشێ ژ جەژنێ ژمارەکا خەلکی ئێزدی ئامادە دبیت دا کو بەرێ شبایکێ مۆربکەن (تعمید) و پشتی مۆرکرنێ ب ئاڤا پیرۆزا لالشێ، قەوال دەف و شبابا ب ئاوازەکا خەمگین لێددەن، پاشی بەرێ شبایکێ سێ جارا دهێتە راکرن و دانان و پاشی ژ دەرگەهێ سەرەکی یێ پەرستگەهێ دەردکەڤن و ل پێشییا وان میرێ ئێزدییان دچیت هەتا دگەهیتە کانیکەکا ئاڤێ کو د بێژنێ (حەودا کەلۆکێ) و د ڤی دەمی دا ژن تلیلیا ڤەددەن و بەرهەڤبوویی بزاڤێ دکەن خۆ نێزیکی بەرێ شبایکێ بکەن دا کو لێ زیارەتی بت (ماچی بکەت) و ب ڤی رەنگی جارەکادی دبەنە د هوندری پەرستگەهێ دا و ل جهێ وی یێ تایبەت دانن کو دبێژنێ (دیوانا بەرێ شبایکێ) و دیسان سێ جاران ژ عەردی هەلدگرن و دانن و وەسان ڕێ و ڕەسم ب دووماهی د هێن.

ئەڤ ڕێ و ڕەسمێن دهێنە گێران ب بەرێ شبایکێ بێ گومان هێما و ئاماژەیە بۆ مرن و ڤەشارتنا شێخادی، ژ بەر کو بەرێ شبایکێ وەکی (داربەستێ – تابووتێ یە) دەمێ مری دکەنە تێدا و دبەنە زیارەتا و ل ناڤ سندرۆکێ دا ڤەدشێرن و ل دەمێ بەرێ شبایکێ ب ئاڤا پیرۆزا لالش مۆر دکەن ئەو ئاماژەیە بۆ شووشتن و پاقژکرنا مری بەری ڤەشێرن، دگەل هندێ دا ئێزدی بەری لەشێ مری ڤەشێرن و بن ئاخ کەن سێ جارا ژ عەردی هەلدگرن و دانن پاشی بن ئاخ دکەن، هەژی گۆتنێ یە عەشیرەتا (بەرگعیا) ئەوێن دگەل شێخادی ژ شامێ هاتین ڕۆلەکێ مەزن د ڤان ڕێ و ڕەسمان دا دبینن.

**جەژنا قوربانی:**

ڕێ و ڕەسمێن جەژنا قوربانی ل جەم ئێزدییان ب بابێ پێغەمبەرا (ئیبراهیم ئەلخەلیل) ڤە دگرێدانە و ئەو چیرۆکا دبێژن ل دەمێ خودێ مەزن ئیبراهیم خەلیل ژ ئاگری قورتال کری پاشی وی ژی ڤیایی کورێ خو (ئیسماعیل) ب کەتە قوربانی بۆ خودێ، لێ خودێ ئەو چەند قەبوول نەکر و (بەرانەك) ل جهێ ئیسماعیلی وەکی قوربان فرێکر.

ئێزدی ب ڤێ هەلکەفتێ بەرێ خۆ ددەنە پەرستگەها لالش بۆ گێرانا هندەك ڕێ و ڕەسمێن ئایینی یێن تایبەت ب وانڤە، ژ وانان ژی هەمی زەلامێن ئایینی ل پەرستگەهێ بۆ چەندین جاران ڕێ و ڕەسمێن سەمایێ دگێرن و پاشی ل سەرێ چیایێ عەرەفاتێ هەمی کۆم دبن و ڕێ و ڕەسمەکێ تایبەت دا بابێ شێخ و میر حەج دچنە جهەکی بلندتر ژ هەمووان و هندەك پرتێن نانی دهاڤێژن و ئامادەبووی دچنێ و وان پرتا وەردگرن و دبەنە کانییا سپی ب ئاڤا وێ مۆر دکەن کو هێمایێ خێر و بەرەکەتێ یە.

هەر دیسان د کەلتۆرێ ئێزدییان دا هاتییە (وەکی ئاشکەرا ل دەڤ زۆربەیا ئایینێن دی) کو (ئیبراهیم ئەلخەلیل) و ژنا خۆ دگەل کورێ خۆ کۆچکرینە مەکەیێ و پاشی ب فەرمانا خودێ ئیبراهیمی کەعبە ئاڤاکرییە و ببوو جهێ حەجا عەرەبا هەتا بەری ئیسلامێ ژی و مایە هەتا نهو، ئەڤجا ئێزدی ژی باوەریێ ب ڤێ چەندێ دئینن و وەك ڕێزگرتن بۆ ئیبراهیم ئەلخەلیل ئەو ژی قەستا لالشێ دکەن و جەژنا قوربانێ ساخ دکەنەڤە[٢٨].

## جەژنا چلێ زڤستانێ:

ئەڤ جەژنە د کەڤیتە رۆژا دووماهیێ ژ چلێ زڤستانێ یان ژی رۆژا (١٩ کانوونا دووێ یا رۆژهەلاتی) کو دبیتە (١ شواتا رۆژئاڤایی)، ژ بەر کو چلێ زڤستانێ ل رۆژا (١١ کانوونا ئێکێ دەست پێ دکەت هەتا ١٩ کانوونا دووێ یا رۆژهەلاتی) واتە ژ (٢٤ کانوونا ئێکێ هەتا ١ شواتێ رۆژئاڤایی)، وئەو کەسێ ب رۆژی دبن دبێژنی (چللە گر)، ل رۆژا جەژنێ بابێ شێخ و قەوال و زەلامێن ئایینی ئەوێن ل ماوەیێ چلێ زڤستانێ ب رۆژی بووین ل پەرستگەهێ ئامادەبن بۆ گێرانا ڕێ و ڕەسمێن (سەمایێ) و پاشی سەرەدانا مەزارگەهێن لالش دکەن.

## جەژنا رۆژیێن ئێزی:

ئێزدییان سێ رۆژیێن فەرز هەنە و رۆژا چوارێ دکەنە جەژن دبێژنێ جەژنا رۆژیێن ئێزی، ئەڤ جەژنە دکەڤیتە رۆژا ئەینیێ ژ مەها کانوونا ئێکێ یا رۆژهەلاتی و بەری هینگێ ل رۆژێن سێ شەمب و چوارشەمب و پێنچ شەمبی ژ بۆ خودێ (ئێزی) ب رۆژی دبن.

ل سپێدەهیا جەژنێ خەلك کۆم کۆم سەرەدانا مەزارگەهێن گوندی دکەن و پاشی ب مەرەما پیرۆزکرنا جەژنێ سەرەدانا مالا دکەن، ئەو ژی ب رۆلێ خۆ رادبن ب بەرهەڤکرنا هەمی پێدڤیێن جەژنێ ژ خوارنێ و شریناهییان، دیسان ئەگەر هندە کەس ل گوندی هەبن پەیوەندیێن وان دگەل ئێك نەخۆش بن، ب هاریکاریا گوندییان پێکدهێن، دیسان ژن ژی سەرەدانا مەزارگەهان دکەن و پاشی دزڤرنەڤە مال و کارێ خوارنێ دکەن و هندەکێ ب خێر بۆ جیرانان ژی دبەن.

سەبارەت کەڤناتییا ڤێ جەژنێ گەلەك بیرو بۆچوونێن جودا هەنە، بەلێ هەموو بۆچوون شرۆڤەکرنێن تاکە کەسی نە، هندەك دبێژن رۆژا ژ دایکبوونا ئێزی یە[٢٩] و هندەك ژی دبێژن ژ دایکبوونا (میترا) یە[٣٠]. دیسان هندەکێن دی دبێژن جەژنا خوداوەندێ (تەموزە) ئەوێ ب رامان و هێمایێ (گیانێ گەنمی و کەسکاتی) ل جەم سۆمەرییان دهێت[٣١]، یان ژی جەژنا گهۆرینا مەزنا زڤستانێ یە چونکی د ڤێ رۆژێ دا رۆژ بەرەڤ درێژیێ ڤە دچیت هەتا ل (٢١ئاداری) - رۆژا نەورۆزێ - وەکی ئێك لێ دهێت و ئێزدی ب ڤێ هەلکەفتێ و نەمانا تاریتی و هاتنا رۆژەکا درێژتر خۆشییێ دگێرن وەکی ئەڤ چەندە ل جەم زۆربەیا مللەتێن ئاری یێن کەڤن هەی[٣٢].

هەر چەوان بیت وەکی ژ ناڤێ ڤێ جەژنێ دیار (جەژنا ئێزی- جەژنا رۆژیێن ئێزی) ل جەم ئێزدییان گرێدانەك ب ناڤێ خودێ (ئێزی) ڤە هەیە، دیسان گرێدای چیرۆکا تۆفانا (نۆح) پێغەمبەرە، چونکی ئەو یەکەم کەس بوو رۆژی بۆ خودێ ل دەمێ تۆفانێ گرتین و پشتی چەندین رۆژانێن باو بارۆڤە و بارانێن ب هێز هاتین (نۆح)ی داخواز ژ وان کەسان کر ئەوێن د پاپۆرێ دا رۆژیا بۆ خودێ بگرن دا قورتال بن و ئەو ژی سێ رۆژا ب رۆژی بوون و تۆفان کێم بوو و پاشی گەهشتنە هشکاتی[٣٣]و ب ڤێ هەلکەفتێ خۆشی و جەژن گێران و ئەڤ چەندە دهێتە پشتراستکرن ئەگەر ئەم بزانین هەمی رێ ورەسمێن ئێزدییان ب ئافراندنا کنیاتی و چیرۆکا تۆفانێ ڤە د گرێداینە.

## جەژنا بێلندێ [٣٤]:

جەژنا بێلندێ د کەڤیتە ئەینییا دووێ ژ چلێ زڤستانێ، یان ژی ئەینییا دووێ ژ هەیڤا کانوونا ئێکێ یا رۆژهەلاتی، ماوەیێ ڤێ جەژنێ رۆژەکە، بەلێ بەری هینگێ ب چەند رۆژەکان ئێزدی خۆ بەرهەڤ دکەن و ب چەندین کاران رادبن وەك بەرهەڤی بۆ ڤێ جەژنێ، ژ وانان کرینا شریناهی و سەرپرا (پەزی) و ئامادەکرنا گیایەکێ هشك کو د بێژنێ (رەشك)[٣٥] دا ب کار بینن بۆ رێ و رەسمێن (گورگا گای)، دیسان ژن ژی جۆرە نانەکی چێ دکەن د بێژنێ (خەولێر) د گەل چێکرنا سەوکا و دابەشکرنا وان ل سەر خەلکی ب ناڤ و خێرا مرییێن خۆ پشتی سەرەدانا قەبران د کەن. و ل ئێڤارا رۆژا پێنچ شەمبی رێ و رەسمێن (گورگا گای) دگێرن، ئەو ژی بەری جۆتیار ژ جۆتی بهێتە مال (رەشکێ) ددانە بەر دەرگەهێ هەمی مالا و پاشی خەلکێ گوندی زەلام و زارۆك و ژنان خۆ ئامادە دکەن هەتا جۆتیار دهێنە مال و پشتی دگەهن هەمی دچنە پێشوازیێ و ب کەیف خۆشی دگەهنە مال دگەل ئەو گیاندارێن جۆت پێ دکرن (ئەو ژی گایێ جۆتی بوو ل سەردەمێن کەڤن) و ل دەمێ هەمی دگەهن، ئاگری بەرددەنە وی (رەشکی) و جۆتیار ب گایێن خۆڤە د سەرا دچن و پاشی زارۆك خۆ د سەررا د هاڤێژن و ژن شریناهییان بەلاڤ دکەن و هەتا ل بەر دەرێ هەمی مالان ڤی کاری دکەن پاشی هەمی پێکڤە دەهواتێ گرێددەن.

هەر ژ رێ و رەسمێن ڤێ جەژنێ چێکرنا (خەولێرێ)[٣٦]، کو ئەو ژی جۆرە سەوکەکا مەزن و ستوورە و مێویژەکێ د ناڤدا ڤەدشێرن و پاشی ل ئێڤاریا جەژنێ خودانێ مالێ یان ژی یێ ژ هەمیان ب تەمەنتر

وێ سەوکێ[٣٧] ل دووڤ ئەندامێن خێزانێ پرت پرت دکەت و هەر ئێکی پرتەکێ ددەتێ و پاشی هەمی ل وێ مێویژێ د ناڤ پرتا خۆ دا لێ دگەریێن و هەچیێ دیت ئەو خودان بەختە و بەختێ باشێ مالێ یە و هەمی پیرۆزباهیا وی دکەن.

ل رۆژا ئەینی، واتە ل سپێدەهییا جەژنێ وەکی هەر جەژنەکا دی خەلك ل هەڤ کۆم دبن و پیرۆزباهییان ل ئێك دکەن و پاشی خوارنەکێ ل مالا مەزنێ گوندی پێکڤە دخوون[٣٨].

سەبارەت مێژوو و کەڤناتییا ڤێ جەژنێ گەلەك بۆچوون هەنە، لێ هەمی شرۆڤەیێن کەسی نە ل سەر ژ دایکبوونا شێخادی[٣٩]، و ئەڤ چەندە ژی ژ چەند رێ و رەسمان دیار دبیت، یان ژی هندەك د بێژن پتر گرێدای دووبارە پەیدابوونا ژیانێ یە و دووبارە چاندنا گەنمی و جەهی یە پشتی وەرزێ پاییزێ چونکی چاندنی و جۆتیاری دو هێمایێن سەرەکیێن ڤێ جەژنێ نە.

دیسان د باوەریا هندەکان دا گرێدای مریا ڤەیە، چونکی سەرەدانا قەبرا و دابەشکرنا خوارنا و سەوکا ب ناڤێ مریا رێ و رەسمەکی سەرەکی یێ ڤێ جەژنێ یە[٤٠].

هەر بۆچوونەکا دی یا نێزیکی بۆچوونا ئێکێ دبێژیت پەیڤا (بێلندا- بێرندە- یەلدا) پەیڤێن ئارامی- سریانی نە و ب رامانا (ژ دایکبوون) دهێت و پاشی ئەڤ پەیڤە و ب هەمان رامان گەهشتییە دەڤ گەلێن ئاری کو د گۆتنێ (شەب یەلدا) یان ژی شەڤا ژ دایکبوونێ و رامان ژێ ژ دایکبوونا خوداوەندێ رۆژێ (میترا) بوو.

دیسان ل سەردەمێن کەڤن مللەتێن ئاری شەڤا پشتی (شەڤ یەلدا) دکرنە شەڤەکا ئایینی و ب ئاهەنگ و هەلکرنا ئاگری د بووراندن و د گۆتنێ (خۆر رۆز)، واتە (رۆژا رۆژی) و د باوەریا وان دا د وێ رۆژێ دا خوداوەندێ رۆناهییێ ل سەر خوداوەندێ تاریتیێ سەرکەفت، و وەسان ئەڤ رۆژە دبوو رۆژا سەرکەفتنا خوداوەندێ (میترا) و جارەکادی گەرماتی و رۆناهی ل سەر روویێ عەردی.

بێ گومان جەژنا بێلندێ پەیوەندییەکا موکم ب سرۆشتی و کشتوکالی و چاندنا دەخل و دانی ڤە هەیە[٤١] و دهێتە هەژمارتن رۆژ ب داوی هاتنا کارێ جۆتیاری ژ جۆتی و ژ بەر هندێ دوور نینە پەیڤا بێلندە ژ پەیڤا (بێن هلدا) یا کوردی هاتبیت، ئەو ژی ب رامان و واتایا بێهنڤەدانا جۆتیاری و ب دووماهی هاتنا کارێ وی بت.

## جەژنا خدر ئەلیاس:

ئەڤ جەژنە دکەڤیتە رۆژا پێنج شەمبیا ئێکێ ژ مەها سباتا رۆژهەلاتی و هەرسێ رۆژێن بەری هینگێ ب رۆژی نە و دبێژنێ رۆژیێت (خدرلیاس).

تشتێ هەرە سەرەکی د ڤێ جەژنێ دا ئەوە چێکرنا (پێخونێ)، ئەو ژی پشتی قەلاندنا حەفت جۆرێن کەرەستێن هشك، ئەو ژی (گەنم و جەهـ و باقلك و نۆك و تۆفکێن گوندۆر و گولبەرۆژ و گەنمۆکی) نە و هندەك تۆفکێن شتی (زەبەشی) دگەل تیڤلێن پرتەقالێ ژی دکەنە د گەلدا و دبێژنێ (قەلاتك) و پاشی ڤان (قەلاتکا) ب دستاری (یان نهو ب ئاشی) دهێرن و دبیتە (پێخۆن) و دیسان دۆشاڤێ یان ژی هنگڤینی دکەنە سەر و وەکی تۆپکێ ژێ چێدکەن و ددەنە مێهڤانان.

ل شەڤا بەری جەژنێ (واتە ل رۆژا چارشەمبی)، هندەك ژ ڤێ (پێخۆن)ێ د سینییەکا تایبەتدا ددانە جهەکێ پاقژ و بێ دەنگ ل جهەکێ مالێ و د باوەریا ئێزدییان دا وێ شەڤێ (خدرلیاس) ل ناڤ مالا دگەریێت و دێ چیتە مالەکێ ب تنێ لێ بێ ئاگەهییا وان دێ نیشانەك یان شوینوارەکێ خۆ ل سەر پێخۆنا وێ مالێ هێلێت و هەر چی مالا ئەڤ ئەڤ چەندە لێ پەیدابوو وێ سالێ دێ رزق و بەرەکەت کەڤیتە ناڤ مالێ وان و دێ گەلەك زەنگین بن. دیسان جۆرەکێ دی یێ خوارنێ ل ڤێ جەژنێ بەرهەڤ دکەن دبێژنێ (چەرخوس) کو ئەو ژی سافارێ قەلاندی دگەل گەنمێ قوتای (دانقوت) و دگەل ئێك د کەلینن و ددەنە مێهڤانان وەکی زۆربەیا جەژنێن دی زەلامێن گوندی ل هەڤ کۆم دبن و پێکڤە خوارنەکێ دخۆن.

دیسان جۆتیار دچنە سەر زەڤیێن خۆ و پێخۆنێ و چەرخۆسێ دناڤدا د خۆن و هندەکێ لێ درەشینن.

هەژیە بێژین نەریتەك ل جەم ئێزدییان د ڤێ جەژنێ دا هەیە کو د ماوەیێ رۆژێن خدرلیاس نێچیر حەرامە و کوشتنا گیانداران ژی قەدەغەیە، ژ بەر کو پتریا وان ل ڤی دەمی د دو گیانن.

کەسایەتییا (خدرلیاس) ل جەم زۆربەیا مللەتێن دەڤەرێ کەسایەتییەکا ناڤدارە و ل دووڤ ناڤ و رامانێن جیاواز، هەر وەسان ئەو رێ و رەسمێن ل ڤێ جەژنێ دهێنەگێران ل دەڤ پتریا ڤان مللەتان گەلەك د وەك هەڤن دگەل هندێ دەمێ ڤان هەلکەفتان و ئەو رێ و رەسمێن دهێنەگێران هەمی ل ئێك دەمی نە و هندەك ژی ل ئێك رۆژێ، ئەو ژی رۆژا پێنج شەمبی یە کو رۆژا هەسارا (موشتەری) یە.

بۆ نموونە مەسیحی سێ رۆژان ل ژێر ناڤێ (باعوثة نىواىء) ب رۆژی دبن، واتە بانگەوازەك ژ بۆ رزگارکرنا خەلکێ نەینەوا ژ رووداندێن سرۆشتی و تۆفانا، هەر وەسان هندەك ژ موسلمانێن تلەعفر ژی جەژنا (خدرلیاس) دکەن و ل رۆژا پێنج شەمبیا سێ ژ مەها شوواتا رۆژهەلاتی و ب رۆژی دبن و سەرەدانا مەزارێ (خدرلیاس) د کەن کو د کەڤیتە باشوورێ باژێری ل سەرێ گرەکێ بلند.

وەکی یا ئەشکەرا (خدرلیاس) کەسایەتییەکێ ئەفسانەیی یە و ل سەردەمێن کەڤن ب خوداوەندێ کشتوکالی یان ژی یێ بارانێ دهاتەناسکرن و خەلکی دوعا ژێ دخواستن و قوربانی بۆ وان دان، دیسان د پەرتووکێن ئەسمانی دا ژی بەحسێ وی هاتییە کرن (پەرتووکا پیرۆز، تەورات (سفرا ملاحی) ئنجیلا مەتی و لوقا، قورئانا پیرۆز (هەردو سورەتێن صافات و الانعام).

هەر وەسان جەژنا (خدرلیاس) پەیوەندییەکا مەزن دگەل وەرزێ ب دووماهی هاتنا چاندنا دەخل و دانی هەیە، ژ بەر کو دگەل هاتنا جەژنێ ئێدی چاندنا دەخل و دانی ب دووماهی د هێت، ئێزدی دبێژن (خدرلیاس و تۆڤ خلاس).

د میتولوژیا ئێزدییان (خدرلیاس) هەر سال ب شێوەیێ مرۆڤەکی کو پاراستنا دەخل و دانی دکەت و وەك فریشتە ل کەلا مێردینێ ل باکوورێ کوردستانێ دهێتەخوار و پەیڤا (خدر) وەکی سالوخەتەکێ خودایی دهێت نە وەك ناڤ یان (خدر) ناڤەکە ژ گیانێ پیرۆز و دانە سەر (الیاس النبی) ژ بەر هندێ (خدر) نە ناڤەکە، بەلکی سالۆخەتەکێ خودایی یە و ل جەم کوردێن موسلمان د بێژنێ (خدرێ زیندی).

ل دووماهیێ ئەم د کارین بێژین ئاهەنگ و رێ و رەسمێن جەژنا (خدرلیاس) پەیوەندی ب وان ئاهەنگان ڤە هەیە ئەوێن بۆ خوداوەندێ بارانێ و کشتوکالی د هاتنە گێران.

## توافێن ئێزدییان:

تواف ئاهەنگەکا ئایینی جڤاکی ناڤخوویی یە[٤٢]، ب دەڤەرەکێ یان گوندەکێ تایبەت ڤە ل جەم ئێزدیێن کوردستانێ و عیراقێ ڤە دهێتە ئەنجام دان و ژ وان ژی ل دەڤەرێن شێخان و تلکێف و هەردو ناحیێن باشیك و ئەلقۆش و ئێزدیێن پارێزگەها دهۆکێ و قەزا سێمێلێ و دەڤەرا (دنا و قائیدیا) و هەوێریا، بەلێ ئەڤ ئاهەنگێن ئایینی ل جەم ئێزدیێن سوریا و ترکیا و ئێکەتیا سوڤیەتا بەرێ ناهێنە گێران.

ئەڤ تواف وەکی کەرنەڤالێن ئایینی ب هەلکەفتا ساخکرنا بیرەوەریێن خاس و بابچاکێن ئێزدییان ڤە دهێنەکرن، و ل هەر گوندەکی ب کەسایەتیەکێ ئایینی یێ ئێزدی دهێتەگێران و ل وی گوندی د بیت مەزارێ وی هەبیت، و ئەڤ توافە ل حەفتیا ئێکێ یا پشتی جەژنا سەرێ سالێ دەست پێ دکەن و بۆ ماوەیێ هەیڤ و نیڤا دبەردەوامن و ل هەمی توافا ئەو رێ و رەسمێن ئایینی و جڤاکی یێن د هێنە گێران وەکی ئێکن، ژ بەر هندێ دێ ب گشتی بەحسی هەمووان کەین.

بەری چەند رۆژا ژ هەر توافەکێ خەلك خۆ ژ کرینا جل و بەرگا بەرهەڤ دکەن و بەرهەڤکرنا سەرپەکی (پەزەکێ) و داخوازکرنا کەس و کارێن خۆ بۆ توافا وان و پاشی مجێوری وی گوندی مەزارگەهێ توافا وی ب سەروبەرکەت و لێ ئامادە دبت بۆ پێشوازیکرنا

مێهڤانێن وی ل ئێڤاری و رۆژا توافێ [٤٣].

ل ئێڤاریا توافێ خەلك ل مەزارگەهی کۆم د بن و ئاهەنگان دگێرن و دەهواتا ل بەر دەنگێ دهۆل و زورنایان گرێددەن و هەمی خەلکێ پشکداری د چێکرنا شیڤێ دا دکەت بۆ مێهڤانێن ژ دەڤەرێن دی هاتین.

دیسان ل سپێدەهییا توافێ شازبەند (خودانێ دهۆل و زورنایێ) ل جەم مەزارگەهێ وی خاسێ توافا وی شازێ ئێزی - سرروودا شرفەدین) لێ ددەت و پاشی جارەکادی خەلك لێ کۆم دبن و دەست ب دیلان و شاهیا هەتا دەمێ فراڤینێ دکەت و زۆربەیا ئامادەبوویا ل وی جهی خوارنەکێ دخۆن دبێژنێ (سمات)، ئەو ژی ژ خێرا خەلکی هەمیێ دهێتە بەرهەڤکرن و پاشی مجێور دهێت و سەرێ پەزەکی (گۆشتێ کەلاندی) د دەستی دایە و کەسێن ئامادەبووی یێ دەولەمەند ئەوی سەری وەردگریت بەرامبەر کوژمەکێ پارەی بۆ مجێوری وی خاسی و پشتی فراڤینێ خەلکێ گوندی مەزارگەهێ گوندی جارەکادی ب سەروبەر دکەنەڤە[٤٤]و ئەڤ (هلێلێن) ب سەرێ قوبانڤە نوو د کەنەڤە و هندەکێن نوو ددانە سەر کو ئەو ژی قوماشەکێ رەنگاو رەنگە.

توافەك ل جەم ئێزدییان ژ عەشیرەتا قائیدیان هەیە و ب رێ و رەسمەکێ تایبەت د بێژنێ (ئێشیك) و د بێژنە توافێ (کەرەجال) کو مەزارگەهێ وی د کەڤیتە سەر چیایێ سینا (ل کۆمەلگەها شاریا – باشوورێ باژێرێ دهۆك)، و ئەڤ رێ و رەسمە پشتی خەلك سەرەدانا ڤی مەزاری ل سەرێ چیای دکەن هێتە ئەنجامدان، پاشی دزڤرنەڤە بەلێ پشتا خۆ نادەنێ بەلکی ب دەهوات و دەست قوتان پشت و پشت دزڤرن و ل بەرامبەر وان ژن بخۆرێ هەلدگرن و ئەو ب دروستی ب رێڤە دچن، واتە نە پشت و پشت و هنداڤی ڤان هەمووان ل سەرێ چیای ژمارەکا زەلامان ب تڤەنگێن خۆڤە د راوەستیاینە د گەل دەستپێکرنا

رێورەسمێن توافەکا ئێزدییان



رێ و رەسمێن شێلكەكا تڤەنگان دهاڤێژن.

سەبارەت دیرۆك و كەڤناتییا ڤان توافان ئەم د كارین بێژین ئاهەنگێن ئایینی و جڤاكینە گرێدای خاس و چاكێن ئێزدییانە ل هەر دەڤەرەكێ، هەر توافەك ژی ب ناڤێ وی كەسایەتیێ ئایینی یە، ئەڤ تواف و هەمی ژی ل بهارێ و تایبەت ل مەها نیسانێ دهێتە گێران و نیسان مەهەكا پیرۆزە ل جەم ئێزدییان و ژن و ژنخوازی دڤێ مەهێدە نابت، و دبە ئەڤ چەندە ژی وەك ساخكرنا وی نەریتێ كەڤن بیت ئەوێ ل دەڤ مللەتێن كەڤنێن میسوبوتامیا هەی كو وانژی ل مەها نیسانێ ئاهەنگێن ئایینی دگێران و ب تایبەت ل دەڤ سۆمەریان كو ل بازێرێ (جرسو) ل دەستپێكا هەر سالەكێ ب هەلكەفتا ژنئینانا خوداوەند (ننجرسو) دگەل خوداوەندا (باو) دگێرن، و دبیت ژ بەر هندێ ژنئینان ل دەڤ مرۆڤێن ئاسایی ل مەها نیسانێ حەرام بت، چونكی خوداوەندا ل ڤێ مەهێ ژن دئینان[٤٥].

## هندەك هەلكەفتێن ئایینی یێن ئێزدییان:

### سەفەرا ماستا (نەقلا نان وماستی):

هەرسال ل بهارێ خەلكێ هەمی دەڤەر و گوندێن ئێزدییان سەرەدانەكا ب كۆم و تایبەت بەرێ خۆ ددەنە پەرستگەها لالش د گەل خۆ پەزەكێ و ماستێ خۆ و نانێ تەنك دبەنە لالش و ل جهەكێ تایبەت ل وێرێ د هێتە پاراستن بۆ مێهڤانێن پەرستگەهێ. دیسان هەر مالەك هندەك زەیتێ ژی بۆ هەلكرنا چراێن مەزارگەها دبەت و ل دەمێ جەژن و هەلكەفتا ل لالش دهێنە هەلكرن، خەلك ڤان و خوارنا خۆ دبەتە بەر كانییا سپی دا كو ب ئاڤا پیرۆزا وێ مۆربكەت ب هیڤیا خێر و بەرەكەتێ.

هندەك ئێزدیێن دەڤەرا شێخان ب ڤی كاری رادبن بۆ بەر مەزارگەهێ (مەهمەد رەشان) ل چیایێ مەقلوبی، سەرەرای چوونا وان بۆ پەرستگەها لالش.

**داوە نەبی:**

ئەو ژی وەكی داخوازیەكێ یە، یان ژی بانگەوازیەكە مجێوری گوندی ل ئێڤاریا چارشەمبیا یان ئەینیێ داخوازێ ژ خەلكێ گوندی دكەت (ب رێیا چوونا سەر بانەكێ بلند و ب دەنگەكێ بلند ب ناڤێ خاسەكێ ئێزدییان داخواز د كەت) و ل رۆژا پاشتر بێهنڤەدانە ل وی گوندی و خەلك ل مەزارگەهێ گوندی كۆم دبن ل دووڤ وێ داخوازێ و ئەو ژی بۆ چارەسەركرنا كێشەكا گرێدای گوندییە یان ژی ئاریشەیەكا جڤاكی یان نووژەنكرنا كومپەتا مەزاری یە.

دیسان دو هەلكەفتێن تایبەت ب دو عەشیرەتێن ئێزدییان ڤە هەنە ئەو ژی د بێژنێ (باتزمیا چێلكا) و (زێوا باسیان).

**تێبینی:**

١- دووماهی تواف توافا (شەخسێ باتێ) یە ل گوندێ بابیرێ (دەڤەرا بەرئاڤێ) یە ل رۆژا چوارشەمبی بەری جەژنا سەرێ سالێ.

٢- بەری نها هندەك تواف بۆ هندەك خاسێن ئێزدییان ل هندەك دەڤەرا دهاتنەگێران، بەلێ نها ناهێنە گێران، بەلكی خەلك ب تنێ سەرەدانا مەزاری د كەن و سماتێ چێدكەن.

٣- ل دەڤەرا شنگالێ تواف هەمی ل رۆژێن پێنج شەمبیا دهێتە گێران و پشتی جەما (شەرفەدین) ی ل مەها تەباخێ دەست پێ دكەت و ب ڤی رەنگی:

توافا (پیرێ هاجیال) ل پێنج شەمبیا پشتی جەمایا (شەرفەدین) ی و ل پێنج شەمبیا دووڤرا توافا (پیرێ ئەورا) و ل یا دووڤدا (شێشمس) و پاشی یا (شێبل قاسم).

خشتەیێ توافێن ئێزدییان ل دووڤ ئێك، ئەوێن ل پشتی جەژنا سەرێ سالێ دهێنە گێران كو ژ چارشەمبووا ئێكێ پشتی سەرسالێ ژ مەها نیسانا رۆژ هەلاتێ دەست پێدكەن و ئەڤە خشتیەكە بۆ وان توافان:

# چەوانییا دامەزراندنا میرگەها شێخان

داود خەتاری

ناڤێ (ئێسفنێ) ب زمانێ ئارامی وەكی د ژێدەرێن كلدانی دا هاتی ب واتایا (پاپۆر) دهێت. هەردو گەریدان ئیبن ئەلفوتی و شەمسەددین زهایی بەحسێ وێ یێ كرین. ژ بەر هەبوونا گەلەك گۆڕێن شێخان و ژ وانان گۆڕێ (شێخادی كورێ مسافرێ هەكاری) و گۆڕێ شێخ حەسەن و شێخ شەمس و شێخ فەخرەددین دبێژنێ شێخان. ئەم دكارین بێژین مینا میرگەهەكا بچووك بوو ل باشووری و ل داوییا سەدسالییا حەفتێ مشەختی هاتییەدامەزراندن و میرێ وێ ئاكنجیێ باعەدرێ بوو هەروەسان وەك میرگەها داسنییان ئەوا ل سالا ٣٠٠مشەختی هاتییەدامەزراندن و هەتا ٦٣٠ مشەختی ١٢٣٦ زایینی ڤەكێشای[1].

بەری سالا (١٦٩٨)ێ ئێسفنێ گوندەك بوو و ناڤێ وێ د دیرۆكا كەڤندا هاتییە، د پەرتووكا (الرهاوي المجهول) یا دانەرێ وێ (ئەلبێر ئابونا)دا هاتی، هەر وەسان دپەرتووكا جورج رو یا ب ناڤێ (عیراقا كەڤن- العراق القديم) ژی دا ناڤێ وێ هاتییە كو دبێژیت: دەمێ ئەسكەندەرێ مەقدونی رووبارێ دیجلە دەرباز بووی و وەلاتێ (ئیزیتا) فەتاندی و بەری كو لەشكەرێ (داریـــوس)ێ شاهێ فارسان روو ب روو ببیت ل خواندنگەها (ئیسین) بێهنا خۆ ڤەدا، ئەو ژی گوندێ ئیسیانا نهایە، كو سەر ب قەزا شێخان ڤەیە و دكەڤیتە دووراتییا (٧كم) ژ رۆژئاڤایێ قەزایێ. هەر دیسان دبێژیت كو ئەو یێ ل خواندنگەها (بریستیاق) ژی روینشتی، واتە گوندێ (بیرستەك)ێ نها كو ئەو ژی هەر سەر ب شێخانڤەیە، د ڤان هەردو گونداندا شوینوارێن كەڤن بەرچاڤ و دیارن، ژ وانان گرەكێ بلند ل رۆژئاڤایێ ناڤەندا قەزا شێخان ب ناڤێ (گرێ كەرخی)، ب زمانێن عیراقی یێن كەڤن واتە كەلایا شویرهەكری ددەت، لێ د زمانێ كوردی دا ب واتایا (گر) دهێت دگەل پەیڤا (كەرخ) واتە گەلەك كەڤن. سەرەرای هەبوونا پاشڤەمایێن شوینوارێ (جەروانە)، كو ئەو ژی سكرەكێ ئاڤێ بوو، شاهێ ئاشووری (سەنحاریب) ی دروست كربوو دا ئاڤێ ب گەهینتە دەشتا نەینەوا و تا نها ژی یا دیارە كو دكەڤیتە باشوورێ رۆژهەلاتێ قەزایێ[2].

## دەستپێكا دامەزراندنا میرگەهێ:

دەستەلاتداریا خیلافەتا عەباسی دناڤ خۆدا یا ناكۆك بوو و د لاوازترین قۆناغێن ژیێ خۆ دابوو و دەستەلاتێ وێ نە دگەهشتە هەمی جهـ و دەڤەران، گەلەك پێ نەچوو مەغولان ئەڤ سەروبەرێ خراب ب دەلیڤە دیتن و دەست ب داگیركرنا ئەردێ وان كرن و ژمارەكا مەزن ژ وان كوشتن، سەرەرای ئەو زیانێن

درافی و رەوشەنبیری کو گەهشتینە وان، چونکی عەباسییان گەنجینەکا مەزنا پەرتووکێن زانستی و رەوشەنبیریێن پر بها هەبوون، لێ مەغولان سوتن.

ژ ئەنجامێ فێ لاوازیا عەباسییان هەرێمێن نیمچە سەربەخۆ دناڤ ئەردێ خیلافەتێ دا هاتنە دامەزراندن. دوێ قۆناغێ دا ژمارەکا میرگەهێن کوردی پەیدابوون، ل ڤێرە (شێخ حەسەن کورێ شێخ ئادیێ دووێ کورێ سەخەر - شێخ هەسن یێ ناڤدار ب ئەبی ئەلبەرەکات-) پێنگاڤەك ژبۆ دامەزراندنا کیانەکێ تایبەت هاڤێت، و ئەڤ کیانە نە تنێ یێ ئایینی بوو، لێ هەمی ئۆل و ئایین ل ژێر حوکمێ وی ڤەدگرتن.

### شێخ حەسەن و دانانا میرگەها ئادیان

د ڤێ قۆناغێ دا، واتە ل سەدسالیا سێزدێ زایینی، ئەو دەڤەرێن ل ژێر دەسەلاتا ئێزدییان (هەردو میرگەهێن حەلەب و کلس ب فەرماندەیا شێخ مەند کورێ شێخ فەخرەددین ل رۆژئاڤا و میرگەها حەریر ب فەرماندەیا پیر هەسن مەمان ل رۆژهەلات و ل باشووری ڤە حوکمێ ئێزدییان تا کەرکووك ل باشوور و گزیرتا وان ل باکوور و دچوو و تا ئامەد گەلەك ئێزدی لێ هەبوون، هەژی گۆتنێ یە کو میرگەها داسنی ل دەڤەرا دهۆکێ هەبوو، ژ سەرۆکێن وێ عەیالێ میر جەعفەرێ داسنی، باژێرێ مووسل د ڤێ دەمیدا ل ژێر هێلا هەژاریێ دا بوو، لەوما شێخ حەسەن کورێ ئادیێ دووێ داخواز کر کیانەکێ سیاسی یێ مەزن بهێتە دامەزراندن و رووبەرەکێ مەزنێ ئەردی و ژمارەکا مەزنا مرۆڤان ڤەگریت. ل دەستپێکا سەدسالیا هەڤدێ سنوورێ دەسەلاتێ وان ل کێمیێ دا کو تنێ گرێن چیایێ مەقلوبی و گوندێن وان و ئەو دەڤەرا دکەڤیتە دناڤبەرا خابوور و دیجلە دا و ل چیایێ شنگالێ ل رۆژئاڤایێ مووسل ب خۆڤە دگرت[٣].

پشتی (شێخ حەسەن) ی پشتەڤانی ژ مورید و لایەنگرێن خۆ ل ناڤ کوردستانێ و ژ شامێ و مسرێ و عیراقێ وەرگرتین، بزاڤکرن دەولەتەکا مەزن دابمەزرینت و ئۆلی و دونیایێ تێدا پەیرەو بکەت و حوکمێ هەر میرگەهەکێ هێلا ددەستێ میرێ وی بخۆدا[٤].

شێخ حەسەن بۆ سەرۆکێ ئۆلی و دونیایی و جڤات و لیژنێن تایبەت دامەزراندن، و هەر کەسەکی دیارکری پلەیەك دایێ، وەکی دەستپێکەك بۆ دامەزراندنا کیانی.

رێکخستنا کارگێری ئەوا شێخ حەسەنی بۆ ب رێڤەبرنا حوکمێ میرنشینێ دانای ب ڤی رەنگی بوو:

میر، سولتان شێخادی/ شێخ حەسەن
شێخێ وەزیر شێخ شەمس
بابێ شێخ و زانا شێخ فەخرەددین
دادوەر وسزادان ناسرەددین
مێهڤانداری ئامادین
ئاشتی و تەناهی سجادین
دارایی ئیسیبیا
پەرپرسێ جەلوێ و پەرتووکان پیر چەروان
خۆگۆریکەر و سویندخۆر پیر مەهەمەد رەشان
ئــاوازێ رێورەسمێن ئایینی(دەف و شباب) پیر کەمال[٥]

سەخمەرات دامەزراندنا کیانەکێ سەربەخۆ ئەو یێ پێدڤی هاریکاریێن ناڤخۆ و دەرڤە بوو، هەروەسان پێدڤی گرتنە بەرا سیاسەتەکا تایبەت بوو و بزاڤکرن خۆ نێزیکی سەرکردەیێن خیلافەتێ بکەت و وان رازی کەت کو ئەو نە دژی خیلافەتا ئیسلامێ و ئایینێ ئیسلامێ نە، ڤێ نێزیکبوونێ رەنگڤەدانەکا هەڤدژ دپەیوەندیێن وی یێن ناڤخۆیی دگەل بنەمالا ئێزدین میری پەیداکر، ب تایبەت دگەل شێخ شەمس و کورێن وی، ئەڤ هەڤرکییە بۆ ئەگەرێ وێ چەندێ کو هزرا دامەزراندنا کیانێ سەربەخۆ لاواز ببیت و تا رادەیەکی هەر ناڤ بوو، ب تنێ چەند کارێن بچویك دناڤ لالش دا دکرن، بێی بەرفرەهکرنا سنوورێن میرگەهێ، ل دووڤدا شەر دناڤبەرا واندا پەیدابوو، بۆ ئەگەرێ وێ چەندێ کو شێخ حەسەن مشەخت ببیت، ژ لالش دەرکــەت و قەستا باشیکێ کر. بەدرەددین لوئلوئێ حوکمدارێ مووسل ئەڤ رۆژەڤە ب دەلیڤە دیت و هێرش کرە سەر ئێزدییان، ب بهانەیا وێ چەندێ ئێزدی ناهێلن موسلمان فەریزا حەجێ

بۆ مەكەیێ ئەنجامبدەن و شێخ حەسەن ل سەر دەستێ بەدرەددین هاتە شەهیدكرن و خەونا ئێزدییان ب سەربەخوویێ هەلوەشییا. پشتی ڤێ رویدانێ شێخ مەند پسێ شێخ فەخر هات گەهشتە شەرفەددین پسێ شێخ حەسەنی و ب ئارمانجا تۆلڤەكرنێ هێرش كرنە سەر مووسلێ.

پشتی شەهیدبوونا شێخ حەسەنی، دۆرا شێخ شەرفەددینی هات، ب مەرەما گرتنەدەستا حوكمدارێ و پەیداكرنا گیانەكێ برایەتیێ دناڤبەرا ئێزدییاندا، وی بزاڤكرن برینێن كەڤن دەرمانبكەت، ب تایبەت دناڤبەرا شەمسانی و ئادانیاندا، لەوما بریار دا سەرۆكاتییا ئۆلی و دونیایی رادەستی قاتانیان بكەت و شێخ محەمەدێ باتنی یێ قاتانی حوكم ل میرگەهێ كر و خیلافەتا ئۆلی و میرگەها شێخان ژ هینگێ وەرە دەستپێكر.

قاتانیان ژ ئەنجامێ رێككەفتنەكێ كو پیرێن لالش پێ رابووین دەسەلاتا میرگەهێ وەرگرتن دا ئێكرێزییێ بپارێزن و ئێدی خوین نەهێتە رێتن، ب تایبەت ئەو شەرێ دناڤبەرا شەمسانی و ئادانیاندا. هەژی گۆتنێ یە كو ئەڤە نە تاكە میرگەها ئێزدییان بوو، بەلكی چەند میرگەهێن دی تر ژی هەبوون، مینا حەلەب دونبەلی و مەحمودی و یێن دی، لێ میرگەها شێخان بوو میراتگەرا وان میرگەهان یێن ژ ئەنجامێن هێرشێن خویناوی یێن سەر ئێزدییان ژناڤچووین بوو. ب هزرا من گرنگییا میرگەها ئێزدییان یا د كەڤناتییا وێ دا، كو بێگومان مالا میرگەها ئێزدییان گەلەك قوربانی ژبۆ بەرگریكرنێ ژ مانا خۆ و مانا ئێزدییان داینە [٦].

**شێخ حەسەن،** ئەو كورێ شێخ ئادیێ دووێ (ئەبی ئەلمەفاخر) كورێ سەخەر (هەسن) كورێ سەخەر كورێ مسافر، فەیلەسوف و زانایەكێ سەردەمێ خۆ بوو، گەلەك پەرتووك یێن دانایێن. ل سالا (٥٩١مش) هاتییە سەر دنیایێ، سالا (٦٤٤مش) ل سەر دەستێ بەدرەددین لوئلوئێ والیێ مووسلێ هاتییە شەهید كرن[٧]. پەرتووكا (تحفة الاحباب) یا (سەخاوي)دا د پەسنا وی گۆتییە:

(هزر و بیرێن وی یێن زانا بوون و سەنگا خۆ د ئەدەب و شعر و ڤاڤارتنێن عیرفانێدە دا هەبوو، و گەلەك مورید و ئالیگر هەبوون[٨]. ژ كورێن وی (شەرفەددین، زەینەددین، ئیبراهیمێ خەتمی، موسایێ سوور)و ژ كچێن وی ژی (تاووس و گولێ) بوون. ئیبن ئەلموستەوفی دبێژیت[٩]: شێخ حەسەن كورێ ئادیێ دووێ سالا (٥٩٢مش)ی ل گوندەكی ژ گوندێن هەكارییان دبێژنێ لالش كو سەر ب مووسلێ ڤەیە هاتییە سەر دنیایێ. ل سالا (٦٢٧مش) ژ ئەنجامێ روودانەكا ئالیگرێن وان هاتییە ئەربلێ (ئەربیل) و چەند رۆژەكان لێ مایە، گەنجەكێ جوان، خوەدی رەوشتەكێ باش، روح سڤك بۆ تێكەلیێ، د هەلبەستەكێدا ب بابێ خۆ گۆتییە:

**عيل اصطباري ونأي تجلدي**
**وبان عني بعدهم أرتحل**
**وقد بقيت حائرا مرتهنا**
**أندب ربعا بعد عز قد عطل**
**وأسال الاطلال عن حبي وهل**
**يفيد تسال المحب للطل**
**وفي الحشى نار تشب كاللظا**
**ودمع جفوني قد هطل**
**هذا وقد حملت من فرط الاسى**
**أمرا مهولا ما يكاد يحتمل**
**أيسره لو أنه القى على**
**طور عظيم شاهق لما حمل**

د چاخێ شێخ حەسەنی دا ئێزدی ب هێز كەتن، وان لەشكەرەك هەبوو و هندە پلەیێن سەربازی هاتنە دانان، وەكی شێخێ وەزیر و نەقیب و جاویش (زێرەڤانی كاری)، و شێخ حەسەنی والی دانانە سەر وان هەرێمێن دەسەلاتێن وان لێ ب هێزكەتین. ژ وانان میرگەها مێردین و كلس و حەلەب و شنگار و بیرمام و حەریر و سۆران و دیاربەكر و هەمی گرێدای میرگەها ئادیان بوون كو بارەگایێ وێ ل پەرستگەها لالش بوو، و ب شێوەیەكێ فەرمی سیستەمێ خویكێ ب رێژەیا ١٠٪ ێ ل سەر دەرامەتی هاتە دانان و كو ژ لایێ

(پیر خەتیب بەسێ كورێ بیتاری) نڤیسەرێ وی د هاتە نڤیسین، ئەڤ چەندە بۆ دستوورێ باجان كو ل بەری هینگێ ژی سیستەمێ باجان ژ لایێ دەسەلاتێن ئایینی ڤە دهاتە پەیرەو كرن، لێ وی ب شێوەیەكێ رێكخستی و دابەشكرنەكا فەرمی نڤیسی (وەكی چەوان دێ ل پاشتر د بابەتەكێ دی دا دیار بیت)، سەپاندنا ڤان خویكان بۆ هندەك ئێزدییان نەخۆش بوون و ب بارگرانی دیتین، چونكی وان پێ چێ نەدبوو بدەن، وەكی دێ ل ڤێرە دیار د بیت:

**(پشتی ڤان خەبەرا، پەدشێ من ئەلنەدەرە، ئێزیاتە ملك شێخ سن جەلوە، مەلك شێخ سن جەلەو دخوونە، لێ دمەیزینە مێرەكی ژ خۆ چاكتر نابینە).**

شێخ حەسەنی ڤیا تۆلا حسێنێ حەلاج ئەوێ ل سالا (٩١٢ز) هاتییەكوشتن ژ حوكمدارێن بەغدا ڤەكەت، وەكی چەوان د قەولێ (مال و مێرا) دا هاتی، و دبێژن د وەختێ خۆدا خەدیجا خویشكا حسێنێ حەلاج هاتبوو ئێزدیخانێ دا تۆلا برایێ وێ ڤەكەن، كو هێشتا (نیشانێن) وێ یێن ب فەتیلە ل هەمی رۆژێن چوارشەمبی ل پەرستگەها لالش دهێنە سۆتن، وەكی رێز و قەدرگرتنەك بۆ هاتنا وێ و بۆ برایێ وێ شەهیدێ تەسەوفێ[10]، بەدرەددین لوئلوئەیێ ئەتابكی والیێ مووسل شەر دگەلدا كر و ب فێل و خاپاندن شیا شێخ حەسەنی بگریت، دەمێ نامەك بۆ هنارتی كو بێتە مووسل، بەری شێخ حەسەن ژ لالشێ دەركەڤیت گۆتە جڤاتا خۆ، دێ چم و نافەگەرێمەڤە، جڤاتێ ژێ داخوازكرن نەچیت، وی گۆت: دڤێت بچم، ئەڤە قەدەرا منە و خودێ یا بۆ من نڤیسی، دڤێت قوربانیێ سەخمەراتی ئۆلێ خۆ پەیرەوا شێخادی بدەم، من گەلەك پێزانین ل سەر ڤی مرۆڤێ خائین هەنە كو چ سۆز و وەفاداری ل نك نینە، دەمێ گەهشتییە مووسل، بەدرەددینی ئەو زیندانكر و رۆژانە حەفت جاران دهاتە ئەشكەنجەدان كو دەستبەرداری ئایین و باوەریا خۆ ببیت و ئێزدییان ئاگەهدار بكەت كو ل شوینا لالش بچنە مەكەیێ، لێ ئەو رازی نەبوو و رابوو حەفت پەرداغێن ژەهرێ ڤەخوارن، دا ئێدی نەشێت ل ژێر كارتێكرنا ئەشكەنجەدانێ باخڤیت یان پەیڤەك بێی وی ژ دەڤی دەركەڤیت، لوئلوئی گۆتێ: ئەگەر تۆ دەست بەرداری ئێزدیاتیێ بی دێ تە بەردەم.

ئەڤ دەقێ ل خوارێ لایەكێ ژ چیرۆكا شەهیدبوونا شێخ حەسەنی دیار دكەت:

**هەفت قەدەح ژ ژەهـــــرە**
**مەلك شێخ سن ڤەدخوارە**
**خەبەرەك نە هاتـــە زارە[11]**
**شێخ حەسەن دبێژە**
**چەند مالێ خۆ مـــە**
**هەموو یێ بتە دەمــــــە**
**ئەز سونەتێ بەرنادەمە**
**چەندی مالی د دەرم**
**هەموویێ ب تە دسپێرم**
**ئەز سونەتێ قەد نائازێرم[12]**
**دبێ چیببوو، چی جریا**
**شێخ مەند رابوو، بوو ستێرا رەشە**
**سەر موسل دا خورجیا**
**موسل وەرگێرانديە[13]**

هندە راڤەكەر دبێژن: ئەشكەنجەدانا شێخ حەسەنی بەرامبەری ئێشانا (ئـازارا) ڤەخوارنا حەفت پەرداغێن ژەهرێ یە، هەر وەكی وی ئەو پەرداغ ڤەخوارین دا نەئاخڤیت.

پاشی ب كنفەكێ خەندڤاند و بۆ شەهیدێ ئۆلا ئێزدییان، پشتی هینگێ شەرێن درێژ دناڤبەرا ئێزدییان و لەشكەرێ بەدرەددین لوئلوئی دا روودان و بۆ دەمێ دووازدە سالان ڤەكێشان، ڤەكۆلین دبێژن ئەو یێ ل مووسل هاتییە ڤەشارتن.

مستەفا جەواد ژ (اسماء الأعیان من تاریخ الذهبي) دانەیا پەرتووكخانا نیشتیمانی ل پاریس ڤەدگوهێزیت كو (ل سالا ٦٤٤حەسەن كورێ ئادی كورێ ابی بەرەكات كورێ سەخەر كورێ مسافر مریە)[14]. پشتی شەهیدبوونا شێخ حەسەنی، كورێ وی شەرفەددینی كاروبارێن میرگەهێ و ئۆلا ئێزدییان وەرگرتن.

هندیكە ئەگەرێن لاوازیا شێخ حەسەنی د

رێڤەبرنا میرگەهێ و بەرگری نەکرن بۆ دەمەکی ڤەدگەرینەڤە ڤان خالان[15]:

- کاودان دبەرهەڤبوون بۆ راگەهاندنا کیانەکێ سەربخوو و بزاڤ دکرن دەستێ خۆ داننە سەر باژێرێ مووسل، لێ چ ژ وان رەنگە بزاڤان دڤی دەمیدا نەکرن، هەر وەسان گرنگی نەددا پەیوەندیێن خۆ یێن ناڤخۆیی و ب تایبەت دگەل شەمسانیان، کو دهاتنە هەژمارتن هێزەکا ژ هەمیان مەزنتر و کاریگەریەکا راستەخۆ ل سەر ئێزدییان هەی.

- پشتی مرنا شێخ ئادیێ دووێ، گەلەك دەنگێن نەرازیبوونێ هەبوون کو شێخ حەسەن دەسەلاتێ بگرتەدەست، چونکی گەلەك هەڤرکمان و بەرهەلستکار هەبوون، لێ شێخ فەخرەددینی ب هەمی هێزا خۆ پشتەڤانی لێ کر و گۆت (سلاڤ و سەد سلاڤ)، کو پەسن و ناڤتێدانا شێخ حەسەنی دکەت، ئەڤ پشتەڤانییە بۆ پالدەر کو شێخ حەسەن دەسەلاتێ بگریتە دەست[16]. و هاتە نیاسین ب (ئیمامێ زەمانی و شێخێ کوردان و پەیامبەرێ مللەتی و دناڤ قەول و دەڤێن ئایینی دا یێ ب خۆشتڤیێ خودێ و شێخێ داسنییان هاتییە ب ناڤکرن). شێخ حەسەنی ڤیا نوویاتییان بێخیتە دناڤ ئێزدییاندا، لێ گەلەك ژ ئێزدییان دگەل وان نوویاتییان نەبوون و ئەڤە بۆ ئەگەر کو هندە دەنگێن نەرازیبوونێ ل هزرو بیرێن وی پەیدابن.

- بۆ ماوەیێ شەش سالان چوو خەلوێ و ژ بەرچاڤان بەرزەبوو، دا پەرتووکا (الجلوة لارباب اهل الخلوة) ب دانیت، ڤێ بەرزەبوونێ کاریگەری ل دەسەلاتا وی کر و رەنگە راوەستیانەك کەتە دناڤ کاروبارێن ئێزدییاندا و دەسەلات رادەستی کەسێ نەهاتە کرن، دڤی دەمی دا بەدرەددین لوئلوئی، حاکمێ مووسل هێزەکا دژی شێخ حەسەنی دروستکر. هەر دیسان ل دەڤەرێن دی ژی یێن ئێزدیخانێ رەنگە راوەستیانەك کەتە دناڤ کاروبارێن ئێزدییاندا و ئەڤە بوونە پالدەر کو خەلکەکێ دی ژی تەماکاریێ د سەرداگرتنا دەڤەرێن واندا بکەت.

- هەر دیسان ژ ئەنجامێ ڤێ بەرزەبوونێ، میرگەهـ نیمچە سەربخوو لێ هاتن و چ ناڤەند نەبوون (نە مەلبەندی بوون) و ناکۆکی دناڤبەرا ئێزدییان بخۆدا پەیدابوون و دەسەلاتێن وان لاواز بوون.

- فەرماندەکێ نەهـ میرگەهـ ل ژێر دەسەلاتا میرگەها وی (ئادیان) بن، نابیت دەسەلاتێ بۆ دەمەکێ درێژ بهێلیتە بێ سەر و بێگومان ئەڤ چەندە دێ بێ ئاقوبەتی وتەقە لەڤێ ئێخیتە دناڤدا.

- نەبوونا چ سیستەمێن کارگێری بۆ میرگەهێ.

- نامەیا شێخ حەسەنی ب دامەزراندنا کیانەکێ خۆ بخۆیی بۆ ئێزدییان یا رەوا و ئاشکەرا نەبوو و ئەڤە ژی خالەکا لاوازیێ بوو.

- ئاریشەیێن جڤاکی و خێزانی باندۆرێن نەرێنی ل سەر دەسەلاتا وی کرین.

- ناکۆکیێن کەڤنێن ئادانی و شەمسانیان.

- بەدرەددین لوئلوئی هێزەکا لەشکەری و جەبەخانەکا چەکی یا مەزن هەبوو.

- هەبوونا فەرماندەیێن کورد کو سەرکێشیا لەشکەرێ بەدرەددین لوئلوئی دکرن، ئیبن شەداد دبێژیت ئەو (عیمادەددینێ هەکاری و حیسامەددین کورێ یوسف کورێ رەش هەردو کوردن[17]، لێ ژێدەران چ پێزانینێن پتر ل سەر دیار نەکرینە[18].

## میرێن ئێزدییان:

کورتییەك ژ ژیاننامێ چەند ژ وان میران، وەکی چەوان دەمەلوجی و چەند نڤیسەرێن خەمخۆرێن دیرۆکا میرگەها شێخان نڤیسین:

١- میر مهەمەد رەحمانی
٢- میر بەرکات کورێ شێخ مهەمەد رەحمانی
٣- میر ئیسماعیل کورێ بەرەکات
٤- میر ئیبراهیم کورێ ئیسماعیل
٥- میر بەکر کورێ ئیبراهیم
٦- میر مەلك کورێ شێخ بەگری
٧- میر مهەمەد باتنی کورێ مەلك
٨- میر هادی کورێ مهەمەد باتنی
٩- میر حەمزە کورێ هادی
١٠- میر زەینل کورێ حەمزە

١١- میر حسێن بەگێ مەزن كورێ زەینەل
١٢- میر سالح كورێ حسین بەگێ مەزن
١٣- میر سلێمان كورێ سالح بەگ
١٤- میر عەبدوللا (عەبدی بەگ) كورێ سلێمان
١٥- میر شەریف كورێ عەبدی بەگی
١٦- میر حەسەن كورێ شەریف بەگی
١٧- میر سلێمان كورێ حەسەن
١٨- میر میرخان كورێ سلێمان
١٩- میر بداغ كورێ میرخان
٢٠- میر چولی بەگ كورێ بداغ بەگی
٢١- میر حەسەن كورێ چولی بەگی
٢٢- میر عەلی بەگێ مەزن كورێ حەسەن بەگی
٢٣- میر حسێن بەگ كورێ عەلی (وی دو برا ب ناڤێن سەلیم بەگ وعەبدی بەگ هەبوون).
٢٤- میر عەلی بەگ كورێ حسێن
٢٥- میر سەعید بەگێ كورێ عەلی بەگی(د چاخێ وی دا ئیسماعیل عەبدی داخوازا دەسەلاتا میرگەهێ دكر).
٢٦- میر تەحسین بەگێ كورێ سەعید بەگی (شوونگر/ حازم كورێ تەحسین بەگ).

**بداغ بەگ:**

ل سالا (١٧٧٠-١٧٧١)ێ بداغ بەگ میرێ شێخان گەهشتە شورشەكێ دژی ئیسماعیل پاشای میرێ ئامێدیێ، لێ هاتە دەستەسەركرن و سزایێن دراڤی ل سەر هاتنە سەپاندن و پشتی شازدە سالان، كورێ وی چولو بەگ شورشەكا دی كر و نەچار بوو ب رەڤیت و خۆ ل چیا بدەت.

## چولو بەگ:

ژ بنەمالێن پسمیریانە، ئاكنجیێن گوندێ (كەنداله)نە، نەڤی و نەڤی چركێن وان هێشتا یێن ل كۆمەلگەها (مەهەد)ێ دناڤ سنوورێ ئاقارێ گوندێ كەنداله ل رۆژئاڤایێ شێخان دژین، هەتا سالێن (١٧٨٩-١٧٩٠)ز)ێ دەمێ عەشیرەتا (طیا) یا عەرەبی هێرش دهینانە سەر شێخان و وان شەر دگەلدا دكرن میر بوو، ل سالا دووڤدا ئەو دگەل برایی خۆ هاتنە دارڤەكرن ژبەر كو ئیسماعیل پاشا، میرێ ئامێدیێ ل سالا (١٢٠٥مش/١٧٩٠ز)ێ كوشتبوون و (خەنجەر بەگێ بسمیری) ل جهێ وی هاتە دانان و ئەو ژی پشتی هینگێ ژێ ئێخستن و هاتە دەستەسەركرن. ل سالا (١٧٩٠-١٧٩١ز)ێ (حەسەن بەگ) كورێ چولو بەگ هاتە دانان میرێ شێخان[19].

**حەسەن بەگ:**

ل سالا (١٧٩١)ێ ل شوینا بابێ خۆ هاتەدانان، پشتی بابێ وی ژ لایێ ئیسماعیل پاشایێ ئامێدیێ ڤە هاتییەكوشتن، ل سالا (١٨٠٩)ێ ل سەر دەستەلاتێ حاكمێ ئامێدیێ (كەی قوباد)ی پشتەڕێ دبیت و دڕەڤیتە جزیرا بۆتان (باكوورێ كوردستانێ) و د بەرامبەردا (كەی قوباد) لەشكەرەكی ب سەركێشیا برایێ خۆ (بەهائەددین بەگی) دبەتێ دا شەرێ وی بكەن، لێ (بەهائەددین) دشكێت و چەندەك ژ لەشكەرێ وی ژی دهێنە كوشتن د بەردەوامیا رووداناندا د ڤێ سالێدا والیێ بەغدا هاندانا ئێزدیێن شێخان بۆ تالانكرن و شەلاندنێ دكەت، ئەڤە ژی نیشانا لاوازیا میرگەها جەلیلیان بوو د وی سەردەمیدا كو پەیوەندیێن ناڤبەرا وان د باش نەبوون، ل ڤێرە حەسەن بەگێ داخوازا لێبۆرینێ ژ محەمەد پاشایێ جەلیلی ژبەر رەفتارا برایێ خۆ عەبدی بەگێ كر و وی ژی داخوازا وی قەبوولكر.

ل شێخان و ل ژێر دەسەلاتداریا حەسەن بەگێ خۆشگوزەرانییەك دكەڤیتە دناڤ ئێزدییاندا و ل سالا (١٨٠٦)ێ پەرستگەها لالش جارەكادی ئاڤاكرنەڤە، لێ پشتی چەند سالەكێن كێم، ب خاپاندن ژ لایێ میرێ ئامێدیێ ڤە دهێتە كوشتن و یادگارێن مرنا وی بۆ چەند سالێن درێژ دمینە ل سەر هزرێن خەلكی، ل شەڤەكێ سالا (١٨٢٠)ێ (ریچ) و ژنا وی ل گوندەكێ ئێزدییا ل شەڤبێریەكێ بوون، ژنمارەك دهاتە گوهێن وان، سترانبێژەكێ كۆرە ب ناڤێ (لاسو)، كو لێدەرێ بزڤێ بوو ب میرێ كوشتی د هاتە گۆتن.

پشتی پێنجی سالان، رۆژهەلاتناسەكێ ئەلمانی

قەسیدەیەك كوپیكر، تێدا بەحسی شەرەكێ دناڤبەرا دو میرێن بادینی دا روودای دكەت. و تێدا هۆزێن شێخان تۆلا (حەسەن بەگێ) ڤەكەن.

كاوە ئامێدی دبێژیت: حەسەن بەگێ مفا ژ وان هەڤركیێن دناڤبەرا جەلیلیان[٢٠] و میرێن ئامێدیێ كو ل سەردەمێ وی دژوارتر لێ هاتین نەدیتن، پشتی ئەو پێكهاتین ئێدی حەسەن بەگ نەشیا خۆ ژ دەستێن قوباد بەگێ قورتال بكەت[٢١].

## میرزا بەگ:

ل سالا (١٨٩٩ز)ێ مریبە، ل هەیڤا ئادارا هەمان سالێ، گەریدەكێ ئەلمان دبێژیت: كو والیێ مووسل فەرماندا میری و برایێن وی كو ئەو بخۆ بچنە شنگال دا خویكا كۆم بكەن[٢٢].

## عەبدی بەگ:

ل سالا (١٨٣٢ز)ێ ددەمێ هێرشا میرێ رەواندزێ محەمەد پاشا، یێ ناڤدار ب (میرێ كۆرە) كچا وی (فاتمە خاتون) و كورێ وی حەسەن بەگ هاتنە ئێخسیركرن، ئەو ژی مشەخت بوو شنگالێ، ل وێرێ ل دووڤ داخوازا میرێ ئامێدیێ (زوبەیر پاشای) زڤریڤە ئامێدیێ، ژ كەرێن والیێ جەلیلی دا و ب مەرەما رازیكرنا والیێ بەغدا ئەو هێلا ل جەم خۆ.

هادی بەگ و سلێمان بەگ و حەسەن بەگ، هەمی سالا (١٨٣٢ز)ێ ژ لایێ میرێ رەواندزێ ڤە هاتنە دیلكرن[٢٣].

## عەلی بەگ:

ئەو كورێ حەسەن بەگ كورێ چولو بەگی یە، ل سالا (١٨٣٢ز)ێ میرێ شێخان بوو و هاتە دیلكرن، ل جهەكێ گوزاری، كو سیپەلەكا مەزنا ئاڤێ لێ هەیە هاتە سێدارەدان، پشتی رویدانێ ئاخفتن هاتنە گۆتن كا ل كیرێ هاتییەسێدارەدان و ناڤێ وێ دەڤەرێ و سیپەلی ب ناڤێ وی (گەلیێ عەلی بەگێ) هاتەناڤكرن كو دكەڤیتە باكوورێ هەولێرێ[٢٤].

## جاسم بەگ:

ئەو كورێ سالح بەگە، دەمێ عەلی بەگ كورێ حەسەن بەگ شەهید بووی، میراتیبا خۆ ل سەر ئێزدیخانێ راگەهاند و حوكمدارییا وی سێ سالان ڤەكێشا پشتی حسێن كورێ عەلی بەگ كورێ حەسەن بەگ ئەو ل گوندێ ئیسیان ل رۆژهەلاتی باعەدرێ كوشتی و میراتیبا خۆ ل سەر ئێزدییان راگەهاند، جاسم بەگێ سێ خویشك ب ناڤێن (رەوشێ) كو حسێن بەگ كورێ عەلی بەگ مارە كری و (شرین) كو سەلیم بەگ كورێ عەلی بەگ مارەكری و (خەمێ) كو ئەو ژی عەبدی بەگ كورێ عەلی بەگ مارەكری و ئەو دەیكا (مەیان خاتون) ێ یە.

## حسێن بەگ:

دەمێ بابێ وی عەلی بەگێ مەزن ژ لایێ میرێ كۆرەڤە هاتییە سێدارەدان هێشتا ئەو یێ بچویك بوو، لەوما پسمامێ وی جاسم بەگێ كورێ حسێن بەگێ میرگەهـ وەرگـرت، پشتی مـەزن بـووی و پێكەهشتی جاسم بەگ كوشت و دەسەلاتێ میرگەهێ گرتەدەست، پشتی ئەوا هێرشێن میرێ كۆرە ب سەر ئێزدییان ئینای ئەو شیا جارەكادی ئێزدییان لێك خرڤەكەتەڤە و دناڤبەرا (١٨٣٨-١٨٧٩ز) ێ دەسەلاتێ بگریتە دەست، ئەو هەڤالێ لێكۆلەر و ڤەكۆلەرێ ئینگلیزی سیر هنری لایارد ی بوو و ل دووڤ شیرەتا وی چوو ستەنبۆلێ و گەهشتە نك سولتان عەبدولمەجیدی و گازندێن خۆ ل سەر وان دەرد و كارەساتێن ب سەرێ ئێزدییان هاتین بۆ كرن، سولتانی هەڤسۆزی و هەڤخەمیبەك بۆ دیاركرن و پلا (قابی جوخەداری- دەرگەڤانێ دەرگەهێ رەسمی) یێ دایێ، پشتی ل سالا (١٨٤٩)ێ ژ ستەنبۆل ڤەگەریای، گەریدە (جون ئشر) ئەندامێ كۆمەلا جوگرافییا شاهانەیا بریتانی ل ١٠ كانوونا بچویك (١٨٦٤ێ) سەرەدانەك برە نك و شەڤەكێ بۆ مێهڤانێ میری، وەسان میری سالۆخەت دكەت كو یێ هێمنە و نیشانێن ژیریێ دناڤ سەروچاڤێن وی

دا ددیارن و نامەیەك ژ جێگرێ قونسولێ ئینگلیزی (مستر رەسام) گەهاندە وی[٢٥].

ل سالا (١٨٥٣ز)ێ میر حسێن بەگ ژ نشكەكێڤە ژلایێ (حلمی پاشا) والیێ مووسل ڤە هاتەئێخستن، هەر چەند دناڤ مللەتێ خۆدا میرەكێ ب جەماوەر بوو، ئەگەرێ بوویە پالدەر كو میری بێخن، ئەو مەرج و ناكۆكیێن دناڤبەرا وان دا ل سەر وی دراڤی بوو یێ ژ پێش ب سەربازكرنا ئێزدییانڤە دهاتەدان. حسێن بەگ دگەل خێزانا خۆ مشەخت بوونە دەڤەرا شنگال[٢٦].

كاودان ل شێخان تێكچوو و ئەو ب وێ چەندێ هاتە گونەهباركرن، لەوما هاتە دەستەسەركرن و بۆ ماوەیێ سێ سالان ما د زیندانێدا، د ڤێ ڤۆناغێدا هەردو كورێن وی هادی بەگ و حەسەن بەگ داخوازی ب میراتییا میرگەهێ كرن، لێ كەسێن دی ژ بنەمالێ رازی نەبوون و شەر و هەڤركی دناڤبەرا واندا پەیدابوون و د ئەنجامدا هەردو هاتنە كوشتن.

**بداغ بەگ** ١٧٧٠- كورێن وی (یێ مەزنتر چولو بەگ، یێ بچویكتر غرز بەگ).

**حەسەن بەگ** كورێ چولو بەگ، ژ كورێن وی (هادی، عەلی بەگ، سلێمان بەگ، سالح بەگ كو حسێن بەگی ئەو ل سالا (١٨٤٦)ێ كوشت.

**عەلی بەگ،** ژ كورێن وی حسێن بەگ و (حەمزە بەگ كو یێ بێ دویندەە بوو).

**حسێن بەگ،** ژ كورێن وی: هادی بەگ، حەمزە بەگ، میرزا، سلێمان، عەلی، بەدیع.

**عەلی بەگ،** ژ كورێن وی: سەعید بەگ.

**سەعید بەگ،** ژ كورێن وی: خەیری بەگ، جەلال بەگ، تەحسین بەگ.

## ژێدەر و پەراوێز:


١. انور المائي، الاكراد في بهدينان، ط٢، دهوك- ١٩٩٩، ص٤٤.

٢. داود مهمد، شيخان/ موقعwww.hakar.net

٣. عدنان زيان، الايزدية فى كردستان الجنوبية، سليمانية- ٢٠٠٥، ص ٦٢.

٤. بدل فقير حجى، هەڤركیا شەمسانى و قاتانى، كۆڤارا لالش، ژمارە٢٢،دهۆك- ٢٠٠٥.

٥. د. خلیل جندی، پەرند ئەدەبێ ئێزدییان، بەرگێ دووێ، دهۆك- ٢٠٠٤، بپ ٦٨٤، بپ ٦٨٤.

٦. حاجی علو، www.bahzani.net

٧. بەدرەددین لوئلوئە: كەسەكێ ئەرمەنی بوو، كولەیەكێ (مملوك) نورەددین ئەرسەلان شاهـ كورێ عزەددین مەسعود خودانێ مووسل بوو، سەرپەرشتییا دەولەتا شاهێ خۆ و كورێ وی ئەلمەلك كورێ عزەددین كورێ مەسعودی، دەمێ ل سالا (٦١٥مش) ل قاهیرە مری، كورێ وی نورەددین ئەرسەلان شاهـ ل شوونا وی دانا، لێ دانانا وی تنێ یا بەرچاڤ بوو، و وی كارێ ئەتابەگیێ ب رێڤەدبر، تا پشتی دەمەكێ كێم مری و وی دەسەلات گرتەدەست، خۆ ب شیعاتیێ دهینادەر و دشیعاتیێ دا یێ هشك باوەر بوو، خۆ كت كتە ژ كورێن نورەددینی خلاسكر، دا مەیدان بۆ وی ڤالا ببیت و دەسەلاتا مووسل بكەڤیتە دەست، كەسەكێ زۆردار و خائین بوو، چونكی خیانەت ل حوكمدارێن خۆ كر و زولم ل مللەتێ خۆ كر و درەندەترین رێك ل دژی وان بكارهینان، شەرەكێ دژوار دناڤبەرا وی و ئێزدییاندا كو بۆ ماوەیێ دووازدە سالان ڤەكێشای رویدا و ب درندایەتییا خۆ بزاڤكرن ئێزدییان ژ ناڤببەت و شێخ حەسەن كورێ ئادیێ دووێ ل سالا (١٢٤٦ز)ێ كوشت، ڤی كەسی رێورەسمێن جەژنێن مەسیحییان بەری ببیتە شیعە دگێران، گەلەك حەز ژ خۆشی و رابواردنان دكر، حوكمێ وی بۆ نێزیكی پێنجی سالان ڤەكێشا و ل سالا (٦٥٧مش) د ژیێ نێزیكی نۆت و شەش سالیێ دا مریە و ل مووسل هاتیە ڤەشارتن، پاشی گۆرێ وی ڤەگوهاستینە (مشهد ئیمام عەلی كورێ ئەبی تالیب ی.

٨. احمد تيمور، اليزيدية و منشا نحلتهم، ط٢، القاهرة ١٣٥٢ه، ص ٣٦.

٩. ابن المستوفي، تاريخ اربل، حققه سامي الصفار، القسم الثاني، بغداد- ١٩٨٠، ص ١٧١.

١٠. هەمان ژێدەر. هەژیە بێژین دەمی هولاكوی بەغدا داگیركری و وێرانكری گۆت: من تۆلا حەلاجێ شەهید ڤەكر.

١١. د. خلیل جندی، پەرن، ص ٤٥٧.

١٢. قەولێ شێخ حەسەن.

# جهێن پیرۆز یێن ئێزدییان ل پارێزگەها دهۆکێ

بەرهەڤکرن: مەروان شێخ حەسەن رەشکانی

## دەرگەهـ

ل سەرانسەری دونیایێ و دناڤ هەمی مللەتان و ئایینانداا جهێن پیرۆز هەنە و خەلك و هەر یەك ل گۆرەی بیروباوەرێن خوە عیبادتا خوە تێدا دکەت، ئێزدی ژی وەکو دینەکی دێرین و کەڤن کو کەڤنترین ئایینە ل سەر رویێ زەمین. جهێن پیرۆزێن ئێزدییان ژ مەزارگەهـ و قوب و ئاقد و نیشانگەهێن خاسێن خودێ و شێخادی هەنە و ل رۆژێن عید و هەلکەفتان رێورەسم لێ دهێنە گێران، زێدە باری پەرستگەها لالش کو مەزنترین و پیرۆزترین و دێرینترین جهێ ئێزدیبیایە و رۆژانە خەلکێ ئێزدی قەست دکەنێ و دەرچکێن پیرۆز تواف دبن و داخوازا ساخی و سلامەتیا خوە



ژ خودێ دخوازن، دیسان ئێزدییان وەكو دینەكێ دێرین یێ كو هەتا نها كارییە هەمی رێورەسمێن دیانەتا خۆ پەیرەو بكەن و بپارێزن، سەر ڤێ جەندێ را ژێ ل دەور و بەرێن وی هەمی دژی وان رادبن و چەندین هەول و بزاڤا دكەن داكو ڤی دینێ كوردەواریێ زەلال و پاقژ ژناڤ ببەن و بنبڕبكەن، لێ رۆژ بۆ رۆژێ باوەریا ئێزدییان ب سەر دیانەتا وان موكومتر لێ دهێت.

## پێشگۆتن

ل ناڤ سنوورێ پارێزگەها دهوكێ و دگەلەك دەڤەرێن وێ ژ گوند و باژێران جهێن پیرۆزێن ئێزدییان هەنە، هەتا نها دیار و خویانە وەك قوبا، نیشانگەهـ ئاڤد دكەڤنە دناڤ جهێن ئاكنجیبونا ئێزدییان، وەك ل دەڤەرا ڤایدیا گوندێن (سینا، شاریا، شێخدرێ، كەلەبەدرێ، ركاڤا، خەرشەنیا، گرێ پان)، دەڤەرا دنا گوندێن (خانك، خێراڤا، زەینیا، ریێبی، سوركا، مام شڤان، گودبە، قەسر ئێزدین و كەبەرتو)، دەڤەرا هەوێریا گوندێن (دیرەبون، قەرەولا، گەورێنی، خان تەوەر، ئنجكاسو، كێلا سپی، قەرودە، پێ بزنێ، كانی عەرەب، باجد كندال، باجدمیری، باجد بەر ئاڤ)...هتد.

هەبوونا ڤان جهێن پیرۆز وەكو پەرستگەها لالش دزڤرتە بەریا هزاران سالا بەری زایینی ل پەی قەولێن پیرۆزێ ئێزدییان كو د سەبەقەكا قەولیدا دیار دبت لالش هێڤێنێ ئەردییە دەمێ دبێژیت:

كو لالش دهاتە
ل ئەردێ شین دبو نەباتە
پێ زەینی جڤاس كنیاتە

دیسان ئایینێ ئێزدییان ب سروشتی ڤەی گرێدایە وەكو دانا شێوەیێن پیرۆزێن قوبێن خاسان هەر ژ بنیاتا وان هەتا پەریێن سۆر و زەر و سپی و كەسك یێن ب سەرێ هلێلێ ڤەی گرێدای و دیسان كرنا دوعا سبا و هێڤاران دەمێ كەسێ ئێزدی دكەت بەرێ خۆ ددەتە رۆژهەلات و رۆژ ئاڤا لەوا ژی ئەڤ جهێن پیرۆز ژ قوب و نیشانگەهان هەر ژ كەڤندا بوونە جهێن

هیڤی و داخوازیێن وان، هەلبەت ئێزدی قەستا ڤان جهێن پیرۆز دكەن ل رۆژێن جەژن و جەما و عید و هەلكەفتان ل داوەنەبی و ئوغلەمێن خاسان و سەر ل بەر دەرجكێن وان خاسان دانن و لێ تواف ببن و بۆ خۆ دوعا دكەن و داخوازا ساخی و سلامەتی ژێ دكەن و ل رۆژێن رۆژیا خەلكێن ئێزدی قەستا ڤان جهێن پیرۆز دكەن و بەریا فتارێ ل دەرجكێن ڤان جهێن پیرۆز زیارتی دبن و فتاردبن ئەڤەژی نیشانا وێ چەندێ یە كو ئێزدی رێز و بهایەكێ مەزن دەنە خاسێن خوە و جهێن وان ژبەر هەبوونا ڤان جهێن پیرۆز ژ هەبوونا خاس و ملیاكەت و خوداوەندایە كو ب رێكا وان دوعا و داخوازیێن ل دیوانا حەقیێ دیوانا خودێ دگەهن و قەبوول دبن، ئەڤان جهێن پیرۆز كەسێن تایبەت هەنە كو دبێژنێ مجێور ل ئێڤارێن چار شەمبووا و ئەینیا چرایێ وان ڤێدخن و ل عید و هەلكەفتان سماتێ چێدكەن و دوعا و درۆزا دبێژن، دیسان ئەڤان جهێن پیرۆز و هەریەكی ژوان رۆژەك تایبەت هەیە ژ تواف و داوەنەبی و بیرئانینان كو دزڤرتە بۆ خوداوندەكی، خاسەكی و ئەڤ بیرەوەری و رێ و رەسمێن وی دهێنە ساخكرن، هەر یەكی درۆژێن واندا ل سالێ ئەڤ جهێن پیرۆزێن ئێزدییان هەمی ژ قوب و نیشانێن خاس و باب چاكان، دەروێش و قەلەندەران یەك بیەك دكەڤنە پەرستگەها پیرۆزا لالش و ل مەهدەرا بۆزا و ل هەر هەفت زێوان كو ئەو ژی (زیوا مەمێ شڤان، مەهمەد رەشان، ئیسبیا، هەسن چناری، پیرافات، شەخسێ باتێ، هەسلمەمان) گەلەك دەڤەرێن ئێزدییان پتر ژجهەكی یێ خاسەكی هەیە هەر وەكی پیرافات پتر ژ شەش حەفت جهێن وی ل دەڤەرێن ئێزدییان هەیە، ئەڤەژی وێ چەندێ دگەهینیت كو ئەوی خاسی، خوداوندی سەرا وێ دەرێ كرییە و ئەو جهـ ژێرا بوویە شوون و جهـ یێن پیرۆز كو هەتا رۆژا ئیرو رێز و پیرۆزیێ ددەنێ و ئەوێ رۆژێ سالانە ساخ دكەن و دیسان گەلەك ژڤان جهان شێخادی كەرەمكرییە و سەرا وان دایە نەخاسمە ل مەهدەرا بۆزا و ل هەر هەفت زێوا لەوا ئێزدی دبێژنە ڤان جهان كجك لالش. دڤێ نڤیسینیدا من رۆناهی گەلەك

نەدایە سەر ژیان و رۆلێ خاس و قەلەندەران و قەولێن وان، ژبەر بابەت تنێ جهێن پیرۆز یێن ئێزدیبانە لێ ئەو خاسێن زانیاری ل دۆر هەبانا مە پەیدا کربان ب کورتی مە باس لێ کرییە.

ل داویێ تشتێ گرنگ ئەز خویا بکەم ئەوە دەمێ فەرمانا قرکرنا مللەتەکی دهێتە راکرن هەر وەکی یا ئێزدیبان کو حەفتێ و دو فرمان ب سەردا هاتینە بنیاتی وان دهێتە هەرفاندن، بگرە ژ کوشتن و تالانکرنێ و وێرانکرنا مالان هەتا ب هەرفاندنا قوب و ئاقدێن خاسا، نموونەژێ دیرن. گەلەك جهێن پیرۆز دەمێ من سەرەدانا وان دای تەنی وەکی کۆمەکا بەرا و کیچێ بوو، ئەڤەژی وی جەندێ دگەهینت کو ئەو کێلا بەران رۆژەکێ قوب یان ئاقد یان نیشانگەهـ بوویە لێ هاتییە هەرفاندن و بێ پویتە مایە و ڤایە ل سالا (٢٠١٤)ێ ئەڤێ هوڤاتییا دوژمن جارکا دن خویاکر.

ژ ئەنجامێ دووڤچوونا مە ئەڤ جهێن پیرۆز یێن ئێزدیبان د کەڤنە د سنوورێ نها یێ پارێزگەها دهۆکێ دا:

١- پەرستگەها لالش /قەزا شێخان
٢- زێوا مەمێ شڤان/ل دەڤەرا دنا
٣- شێشمس/دەڤەرا قاییدیبا/دەڤەرا دنا
٤- شێخ حەسەن/دەڤەرا قاییدیبا
٥- شێخو بەکر/دەڤەرا قاییدیبا
٦- شێخ عەنزەروت/دەڤەرا قاییدیبا
٧- شەمسێ پیرا/دەڤەرا قاییدیبا
٨- شەخسێ زەینیا/دەڤەرا دنا
٩- بازیدێ بەستامی/دەڤەرا دنا/دەڤەرا قاییدیبا/ دەڤەرا هەویریبا
١٠- شێخێ زەری/دەڤەرا دنا /دەڤەرا قاییدیبا
١١- شێخ بابك/دەڤەرا قاییدیبا
١٢- شێخالێ شەمسا/دەڤەرا قاییدیبا
١٣- خاتونا فەخرا/دەڤەرا قاییدیبا/دەڤەرا دنا
١٤- شێخدری شمسا/دەڤەرا قاییدیبا
١٥- ملك فەخرەدین/دەڤەرا هەویریبا
١٦- کەرەجال/دەڤەرا قاییدیبا
١٧- پیرافات/دەڤەرا قاییدیبا/دەڤەرا دنا/دەڤەرا هەویریبا
١٨- عەڤدی رەش/دەڤەرا قاییدیبا/دەڤەرادنا/دەڤەرا هەویریبا
١٩- گاڤانێ زەرزا/دەڤەرا دنا/دەڤەرا هەویریبا
٢٠-چاویشێ سەعدەتێ/دەڤەرا دنا
٢١-چاویشێ کجك/دەڤەرا دنا
٢٢-چل مێران/دەڤەرا قاییدیبا
٢٣-شێخ مەند/ دەڤەرا دنا
٢٤-حاجی عەلی/دەڤەرا دێرەبوونێ
٢٥-شێخ موس/دەڤەرا قاییدیبا
٢٦-سەخری جن/دەڤەرا قاییدیبا
٢٧-ستیا مەمێ/دەڤەرا قاییدیبا
٢٨-خدر لیاس/دەڤەرا هەویریبا
٢٩-سوارێ بتەنی/دەڤەرا قاییدیبا
٣٠-شێخ حەمسی/دەڤەرا قاییدیی
٣١-شێخ حەراج/دەڤەرا قاییدیی
٣٢-شەخسێ ناڤاگوند/دەڤەرا دنا
٣٣-بوقەتار بابا/دەڤەرا دنا
٣٤-شێخ دانو/دەڤەرا ریێبیی
٣٥-زیارەتا خەلیفە/دەڤەرا هەویریبا
٣٦-شێخ مەقبول/دەڤەراقاییدیبا
٣٧-پیر باکوز/دەڤەرا قاییدیبا
٣٨-ئیزی/دەڤەرا قاییدیبا/دەڤەرا هەویریبا
٣٩-هەسنالکا/دەڤەرا قاییدیبا
٤٠-کانی باوی/دەڤەرا دنا/دەڤەرا دێرەبوونێ
٤١-سولبەندێ پیرا/دەڤەرا قاییدیبا
٤٢-بابی هورکا/دەڤەرا قاییدیبا
٤٣-خەند خەندۆك/دەڤەرا قاییدیبا/دەڤەرا دنا
٤٤-بەرێ بەدوکا/دەڤەرا قاییدیبا
٤٥-پیر بل/دەڤەرا قاییدیبا
٤٦-شێخێ بوخە/دەڤەرا دنا
٤٧-شەخسێن پیرێ/دەڤەرا دنا
٤٨-پیر خەلیل/دەڤەرا دنا
٤٩- پیر شێرێ/ دەڤەرا قایدیبا
٥٠- پیرێ خەلات/ گوندێ وشتیانا

٥١- پیر بووب/ دەڤەرا ڤایدیا
٥٢-مەهمەدی جندار/ دەڤەرا دنا
٥٣- ئالوبەکر/ دەڤەرا دنا
٥٤- شێخ بل/ دەڤەرا ڤایدیا
٥٥- ستیا ئێس/ دەڤەرا ڤایدیا

## - پەرستگەها لالش:

**پەدشێ من ل مەرکەبێ دبوو سوارە**
**پادشایە و هەر حەفت یارە**
**تێك سەیرین چار کنارە**
**ل لالشێ سەکنین گۆت ئەڤە حەق وارە**

پەرستگەها لالش دێرینترین شارستانیەتە ل سەر رووبێ عەردی جهێ هەرێ پیرۆزێ ئێزدییایە. جهێ پیرۆزێ ڤوبا شێخادی و خاس و بابچاکێن وی یە. دەست پەرستگەها لالش (لالشا نۆرانی) پەرستگەها هەرە مەزن و هەرە پیرۆزا ئێزدییایە، ل گۆرەیی میتولوژیا یزدیان لالش هیڤینێ ئەردێ یە دڤێ سەبەڤا ژ ڤەولێ (زەبونی دل مەکسور) دا دیار دبت:

**لالش کودهاتە**
**ل ئەردێ شین دبوونە باتە**
**پێ زەبینین چقاس کنیاتە**

ژ بەرکو ڤەکۆلینەکا بەرفرەهـ و تایبەت ب پەرستگەها لالش د ڤێ ئینسکلۆپیدیایێدا گرتییە، لەوما یەکسەر ئەم دێ چینە سەر جهێن دیترێن پیرۆز.

## مەمێ شڤان:

ئێکە ژ خاس و ڤەلەندەرێ خودێ و شێخادی، هەر وەکو د ڤێ سەبەڤا ڤەولی دا هاتی:

**بۆرێ مەمێ شێ یە**
**رەش کریوو دەست و پێ یە**
**مەم خاسێ خودێ یە**[1]

ژچینا پیرانیێ یە، ئانکو ئێکە ژ هەر چل ئۆجاخێن پیرانیێ و سەبارەت ناڤێ وی کو دناڤ ئێزدییاندا ب دو رەنگان دهێتە بکارئینان:

١ - مەم شڤان یان مەمێ شڤان (چ گوهۆرینێ ل واتایێ ناکت).

٢- مام شڤان ( گوهۆرینێ دواتایێ دا پەیدادکەت بەرامبەر مەم ).

دیسان هندەك دبێژن ناڤێ وی (مام)ە ژبەر کو رێزێ ل کەسایەتییا وی دگرن و پەیڤا (مام) بکارتینن[2] لێ پسێ کێ یە ئەڤ چەندە و زانیاری ل سەر پەیدانەبوون و دهێتە زانین کو برایێ (عەبدولرەحمان) ە هەروەکو دڤێ سەبەڤا ڤەولیدا دیاردبیت:

**ئەو ڤویا ل دویانە**
**دوو شێر ل سەر راوەستانە**
**یەك مەمە یەك عەبدولرەحمانە**[3]

دیسان دناڤ ئێزدییاندا دهێتە ناسین خودانێ زێوێ.

**جهێ وی ل دەڤەرا دنا،**

جهێ وی یێ پیرۆز دکەڤیتە گوندێ مام شڤان ل دەڤەرا دوبانا دنا و گوند ژی ب ناڤێ وی جهێ پیرۆز دهێتەناڤکرن ب زێوا مەمێ شڤان کو ل سەر دەمێ شێخادی حەفت زێو دناڤ دەڤەرێن ئێزدی لێ دئاکنجێ هەبوون و زێوا مەمێ شڤان ئێك ژوان حەفت زێوا بوو و هەر نیشانگەهەکا خاس و بابچاکێن ئێزدییان بێن ل پەرستگەها پیرۆزا لالش ل زێوا مەمێ شڤان هەنە ول گۆرەی ژێدەرێن دەڤکی ل سەر دەمێ شێخادی وی بخوە ڤەستا ڤی جهێ پیرۆز کرییە و ب پەیڤا خوەیا شیرین گۆتییە:

**خوەش چی یە**
**لێ ل بەرێ یە**[4]

ئانکو جهەکێ خوەشە، لێ رەخ و دورو بەرێن وی بەردینە و ل بەر پییانە. جهێ پیرۆزێ مەمێ شڤان وەکو ژوورەکا بچوکە (٣م ×٣م) ب شێوەیێ ئاڤدێ هاتییە چێکرن و پەرێن سۆر و سپی و زەر و کەسك دیوارێ ئاڤدێ ڤە هاتینە خەملاندن و چرایێ وی

دناڤدایە، ئانکو دناڤ ئاقدێ دایە و ل بەر دەرگەهێ ئاقدێ وەکو سڤدەرەکێ یە کو ژبەر دەرچکا ئاقدێ هەتا بەر دەرگەهێ سڤدەرێ نێزیکی (٤م) و فرەهیا وی ژی (٤م) و ل رۆژێن تواف و جەژنا دەمێ خەلك قەستا ڤی جهێ پیرۆز دکەن ل ڤێ سڤدەرێ دروونن و دیوارێن وی جهێ چرایێ هەشت خاسان دهێتە ڤێخستن و ئەڤ ئاقد دکەڤیتە دناڤ حەوشەکێدا کو بلندییا دیوارێ وی پتر (٢م) یە و دەرگەهی مرۆڤ تێرا دەرباسێ ڤێ حەوشێ دبە بەری وی دکەڤیتە ئالییێ باشوور بەرامبەر قوبا شێشمس و قوبا ملك شێخسن و شێخ مەند و ل سەر دەرگەهێ حەوشێ پەیکەرێ دووشێرانە دکەڤنە بەرامبەر ئێك، ئەو ژی ب رامانا هەردوبرا مەمێ شڤان و عەبدولرەحمان و ل هەردو دیوارێ حەوشێ یێ رۆژهەلاتی دەرگەهێ و یێ رۆژئاڤایی دەرگەهـ وێنەیێن دو پەزا ل سەر بەرەکی نکراندی هاتییە چێکرن، ئەو ژی ب رامانا خوداوەندێ پەزی یە. دناڤ حەوشا مەمێ شڤاندا ئاڤاهیێ شێخادی تێدایە هەروەکو دەرگەهی قاپیا شێخادی ب ئارامێ وی ئەڤ دەرگەهـ ژی ل سەر بەرەکی هاتییە نکارندن و ل هەردو ئالییێ دەرگەهی ئاڤاهیێ شێخادی، لێ ژبەر بوورینا سالان و بارینا بارانێ ب سەر دا، ئەو وێنە وەکو بەرێ نەمایە و د هندر وی ئاڤاهیدا یێ کو رووبەرێ وی دبتە (٤م ×٣م) کو سەرێ وی یێ بەردایە، ئانکو نەیێ گرتییە ب دەهان نیشانێن خاس و بابچاکا هەنە و دناڤ حەوشێدا ئاڤاهیا عەبدولرەحمانی ل سەر رووبەرێ (٥م×٤م) و چەندین نیشانێن دن یێ خاس و بابچاکا هەنە. دناڤ سنوورێ زێویدا قوب و ئاڤاهی و ئاقد و نیشانگەهێن خاس و بابچاکان هەنە، وەکو من ل پێشی ئاماژە پێدای گۆرستانەك گەلەك کەڤن و مەزن دکەڤیتە د سنۆرێ زێوێ دا و هەتا نها ژی سێ چارێکێن خەلکێ دەڤەرا دنا مرێن خوە ل بەر گۆڕ دکەن.

**توافا وی:**

سالانە ل مەها گولانێ توافا وی دهێتە گێران کو توافەکا ب ناڤ و دەنگە ل ناڤ ئێزدییان و ئێزدی ژ پتریا دەڤەرێن ئێزدیخانێ قەست دکەنە ڤێ ئوغلەما خاسا و ل دەرجکێن وان جهێن پیرۆز تواف دبن و ل رێ و رەسمێن توافی بەشداردبن. هەر وەکو من دیار کری کو ل گولانێ توافا وی دهێتە گێران ژ بەر ئەگەر جارنا هندەك کەس نزانن کا کەنگێ توافا مەمێ شڤانە و ئەگەر ئەو کەسی بپرسن گۆتنەك ل سەر زارێ خەلکێ دەڤەرێ هەیە کو دبێژن کی رۆژگولانە ئەو رۆژ توافا مەمێ شڤانە.

## هەڤشیێ مەمێ شڤان:

دکەفتە دناڤ ئاقارێ گوندێ زەینیا دا و ل سالا (١٩٨٤)ێ ل دۆر وی بوونە ئاڤاهی و مال، ل گۆرەی ژێدەرێن دەڤۆکی یێ دەڤەری دبێژن ئەڤە هەڤشیێ پەزێ مەمێ شڤانە کو ب شێوەیێ بازنەیی هاتییە لێکرن ب فرەهیا پتر (٧٠م)، لێ مخابن ل سەر دەمەکی کو ل سالێن هەشتییان بەرێن وی هەڤشی وەکو پاشمایەکی کەڤن و دێرین و ب شێوەیەکی ئەندازیاری و ب بەرێن مەزن و جوان هاتبوولێکرن کو دیرۆکا وی دزڤرتە بەریا سەدان سالان ژلایێ خەلکی ڤە ئەڤ بەر هاتن راکرن و بێ پویتە ما، دەمێ دامەزرندنا بازێرڤانییا خانکێ ل سالا (٢٠٠٣)ێ ئەو هەڤشی جارەکا دن ل سەر بنیاتێ وی یێ بەرێ و ب بەران هاتە ئاڤاکرن و هەتا داوییا سالێن هەفتییان دەمێ ئێشا کوخکێ کەسەك گرتبا، خەلکی قەستا ڤی جهی دکر، ب ئنیەتەکا زەلال سێ جاران و ب مەشەکا ب بەز ل دۆر وی هەڤشی را گەریابا ئەو ئێش (کوخك) لێ نەدما.

## سلاڤگەها مەمێ شڤان:

دکەڤیتە تەنشت گوندێ زەینیا ل ئالییێ باکوورێ رۆژئاڤا، بەریا سالا (١٩٨٧)ێ تەنێ کێلەکا بەرا بوو، دەمێ خەلك ب پەیادە ژ گوندێ زەینیا و خێراڤایێ و خانکێ دبەر وی سلاڤگەهێ را بووربیا، ئێکسەر ب وی دووراتییا پتر ژ (٦کم) چاڤێ وی ب زێوا مەمێ شڤان دکەت ول وێ سلاڤگەهێ تواف بوو، هەر وەکو تواف بوون ل جهێ پیرۆزێ مەمێ شڤان، لێ پشتی سالا

(١٩٨٧)ێ و راکرنا گوندێن دەڤەرا دوبانێ و کۆمکرنا وان د ئاقارێ گوندێ زەینیا دا کو کۆمەلگەها خانکێ ئاڤا بوو، هێدی هێدی ئەڤ سلاڤگەه کەتە دناڤ مالاندا و نها ژی وەکو ئاقد ل سەر بنیاتا ژورەکا (٣م × ٣م) هاتییەچێکرن کو بلندییا وی پتر ژ (٢م) و ل دۆر ئاقدێ وەکو شوورهەکێ هاتییەلێکرن و خەلکێ دبەرا ببوورت لێ تواف دبت.

## شێشمس:

ژ بنەمالا شەمسانیێ یە، پسێ ئێزدین ئەمیرە، خاسەکی ستوونا ئێزدیاتیێ یە، مەفەرێ ئێزدییایە، خوداوەندێ رۆژێ یە، وەزیرێ جڤاتا شێخادی بوو، کو هەتا نها ژی شێخێ وەزیر دڤێت ژ شێخێ شەمسان بت، و ئێکە ژ ئەندامێ جڤاتا رۆحانی یا ئێزدییان.

د بیر و باوەرێن ئێزدییاندا، کو سور و کەرامەتا شێشمس ژ با سۆر و کەرامەتا مەلك شەمسەدینە، کو ئێکە ژ هەر هەفت ملیاکەتان و ل هەر تەنگاڤییەکێ دا ئێزدی بانگ و هاوارێن خوە دگەیننێ و ب وانڤە دهێت کو مەفەرە.

ناڤێ شێشمسێ پیرۆز د دەهان قەول و بەیت و قەسیدە و دوعایان دا هاتی یە.

## قوبا شێشمس:

قوبەك بلند ژ دووراتییا (٤کم) خویا دکە، ئەڤ قوبە دکەڤیتە سەرێ گرەکێ بلند و پان و فرەهـ ئەڤ گرە ژی دکەڤیتە ل رێزا گرێن دکەڤنە دناڤبەرا چیایێ زاوا ل ئالییێ باکووری و چیایێ داکا ل ئالییێ باشوور و دیسان دکەڤیتە نێزیك رێکا گشتی ئەوا پارێزگەها دهوك و مووسل ب هەڤرا گرێددەت، جهەکێ پیرۆزێ ئێزدییان و ل نێزیکی چیایێ داکا، ل فەرمانا فەریق پاشا کەتییە بەر وێرانکرنێ، لەو ل سالا (٢٠٠٥)ێ هاتییە نووژەنکرن و بەریا وی وەکو هجرکێ بوو بەرێ قوبێ دکەڤتە ئالییێ باشوور و بلندییا وی ژ دەرگەهێ وی هەتا هلێلا وی دۆرێ (٨ م)، ل پێشیا دەرگەهێ قوبێ وەکو سفدەرێ یە کو ل سەر دەرگەهێ قوبێ (ب٤م × ٤م) سیبەرێ جێ دکە و ل زڤستانێ ناهێلە باران بکەفە د ژووردا و ل سەر ڤێ سفدەرێ ب کونکریت وەکو نیڤ بازنەیێ



هاتییە چێکرن و ب شێوەیی رۆژێ و ب دو شاخێن پەز کۆڤییان هاتییە خەملاندن و راسەری دەرگەهێ قوبێ یێ کو دکەڤیتە بەرەڤ ئالییێ باشوور هاتییە نڤیسینە:

**یا الله یا تاووسی ملك**
**الشیخ شمس الشمسانی**

هەلبەت گۆرستانەك كەڤن و دێرین ل بەر هەیە كو پاشماوەیێن گۆرا لێ دیارن، نها ژی مریان ل بەر گۆر دكەن كو ئەو ژی خەلكێ گرێ پانێ نە، و گۆرستان هەمی هاتییە پەرژانكرن، دیسان ل زێوا مەمێ شڤان ژی هەر ل دەمێ مرۆڤ ژ سێمێلێ بەرەڤ كۆمەلگەها خانكێ دچیت و ل ملا گوندێ لەزەكا، ئێكسەر و ب وێ دووراتییا پتر (٦كم) چاڤێن مرۆڤی ب قوبێن بلندێن سپێیت خاس و چاكان دكەڤیت كو ئێك ژوان قوبان قوبا شێشمسە، دكەڤیتە ئالییێ ژێری یێ زێوا مەمێ شڤان، دیسان بەری دەرجكا قوبێ دكەڤیتە بەرامبەر دەرجكا زیوی ب دووراتیا (١٥م).

**توافا شێشمس:**
سالانە ل مەها خزیرانێ ل گوندێ گرێپانێ ل جهێ وی یێ پیرۆز دهێتە گێران و خەلك ژ گەلەك دەڤەرێن ئێزدییان قەستا ڤێ توافێ دكەن و بەشداری رێ و رەسمێن توافێ دبن.

## شێخ حەسەن:

شێخ حەسەن ئێك ژ وان هەفت خاسایە یێ نەفەس و كەرامەتا ئێك ژ هەر هەفت ملیاكەتا كەتی د بەردا، ناڤێ وی د گەلەك قەول و بەیت و قەسیدا دا هاتییە. پسێ شێخادیێ دووێ یە، كەسانەكی متەسەوف و فەیلەسوف و ژیر و زانایێ دەمێ خوە بوویە و چەندین پەرتووك دانایە[5].

جهێ وی ل دەڤەرا قایدییا: ئەڤ جهێ پیرۆز دكەڤیتە د پەسارا چیێ دا ل رۆژئاڤا گوندێ ركاڤا و ژ دوور خویا دكە و ب ٥٢ پێنچی و دوو پێچكا مرۆڤ سەر دكەڤیت هەتا دگەهە بەر دەرگەهێ ئاڤدێ و ب بەرێن حەلان هاتییە چێکرن، بلنداهییا وی پتر ژ ٢ م یە و ب شێوەیێ ژوورەكا (٤م × ٦م) هاتییەئاڤاكرن و بەرێ دەرگەهێ وی دكەڤیتە بەر ب باكوور و راسەر دەرگەهێ ئاڤدێ وەكو نیڤا رۆژ ب رێژەیا (٨٠سم) ل سەر بەرێ حەلان هاتییە نكراندن و خواری رۆژێ ل سەر بەرەكی حەلان ب شێوەیێ لاكێشە هاتییە نڤیسن.

**یا خودێ**
**یا تاووسی مەلەك**
**ئاڤدا شێخ حەسەن**

و نووژەنكرنا ئاڤدێ ل سالا (٢٠١٣)ێ و بەریا بهێتە نووژەنكرن، ب خوە وەكو شوورهەیەكی بوو ب شێوەیێ بازنەیی و دارەك تێدا بوو و قەرقودێ دارێ خویا دبوو كو دارەكا زێدە كەڤنە و ئەوی قورمێ دارێ كاتە دابوو و شین ببوو و ل ئالییێ دەرگەهێ ئاڤدێ ژ لایێ راستی و دیواریدا جهێ چرایە.

**جهێ وی ل گوندێ كەلەبەدرێ:**
ئەڤ جهە دكەڤیتە دناڤ گوندێ كەلەبەدرێ دا و هجركە و ب شێوەیێ بازنەیی و ب هشكە بەران ب بلندییا (١،٥ م) هاتییە ئاڤاكرن.

## شێخو بەكر:

ئێكە ژ خاس و چاكێن شێخادی و ئێكە ژ وان حەفت خاسا یێ كەرامەت و نەفسا ملیاكەتێ عەزمانا كەتی بەردا. ژ چینا شێخایە و ژ ئۆجاخا قاتانیێ یە و ژ بنەمالا دەروێش ئادەمێ قاتانی یە كو ئەڤ ئۆجاخ پێكدهێت ژ شێخ مەهمەد، شێخوبەكر، شێخ سمایل، شێخ عەبدولقادر[6].

**جهێ وی ل دەڤەرا قایدییا:**
ئەڤ جهێ پیرۆز دكەڤیتە گوندێ ركاڤا ل ڤونتارا چیایێ داكا و دكەڤیتە راسەر گوندێ ركاڤایێ و

دیسان دكەڤیتە رۆژهەلاتێ ئاڤدا شێخ حەسەن ب نێزیكی (١٠٠م) وەكو بنیاتا ژوورەكا (٥ م × ٤م) و بلندیا (٢م) هاتیە ئاڤاكرن و دیوارێ ئاڤدێ یێ ژ دەرڤە هەموو ب بەرێن حەلان هاتیە چێكرن و بەرێ ئاڤدێ دكەڤە چیایێ داكا، ئانكو دكەڤیتە ئالیێ باشوور و هندرویێ ئاڤدێ دا وەكو قوبەكا بچووكە بخوە ئەو قوبا بچووك نیشانگەها وێ یا دێرینە ئانكو یا كەڤنە و ب باوەرم ل سەر دەمێ فەرمانێن ئێك ب ئێك ل سەر ئێزدییان ئەڤ جهێ پیرۆز ژی كەتیە بەر هێرشان و چرایێ ئاڤدێ دهندرێ ئاڤدێ دایە و چەند دار د هندرێ ئاڤدێ دا هاتینە چاندن و مالێن كاڤلكرى ل دەور و بەرێن نێزیك ئاڤدێ دخوەیانە و گۆرێن كەڤن ژی ل دۆر خویانە ئانكو گۆرستانە. راسەر دەرگەهێ ئاڤدێ ب بەرێن حەلان ب شێوەیێ نیڤەكا رۆژێ ب رێژەیا (٨٠سم) هاتیە نكراندن و دناڤدا وێنەیێ رۆژێ، دیسان هاتیە نكراندن و ل هەردو ئالیێ رۆژێ هاتیە نڤیسین یا خودێ یا تاووسێ مەلەك و د بندا و ل سەر حەلانەكى ب شێوەیێ لاكیشەیی هاتیە نڤیسین (عاڤدا شێخو بەكر هاتیە نووژەنكرن)، ل رێكەفتی ٢٠١٢/٤/٢٠ و ل رۆژێن چەژن و عید و هەلكەفتا، خەلك قەستا ڤی جهێ پیرۆز دكەن و لێ تواف دبن و مرازا خوە ژی دخوازن و دوعا دكەن .

## شێخ عەنزەروت

یان شێخێ عەنزەل ، ئەنزەل ، ئەزەلی.

ب ڤی ناڤی دهێتە ناسكرن كو ئەو ژی میر ناسردینە ژ ئۆجاخا شێخێن شەمسا یە پسێ ئزدینەمیرە برایێ شیشمس و شێخ فەخر و میر سجادینە[7] كو قوەت و كەرامەت و نەفەسا ئێك ژ هەر حەفت ملیاكەتایە كو هەبوونا وێ ژ هەبوونا دنیایێ یە و ژ هەبوونا ملیاكەتایە لەو دبێژنێ شێخ عەنزەل، ئەنزەل، ئەزەل ، ئەزەلی.

#### جهێ وێ ل دەڤەرا ڤاییدییا،

ئەڤ جهێ پیرۆز ب شێوەیێ قوبێ (گونبەت) هاتیە ئاڤاكرن. دكەڤیتە سەرێ چیایێ داكا و دیسان دبێژنە ڤی جهی بێدەرا حەڤیێ و ل پەیی ئاخفتنا خەلكێ گوندی كو ل دەمەكی دەروێش ل ڤێ جهێ هەبوون و خلمەت و عیبادەت دكرن و هەر كەسەكی د ڤێ دەرێ را بووربا و یێ پێدڤی قویتی ژ گەنم و جەه و مالێ دنیایێ با قەستا ڤان بابە دەروێشا كریان داخوازیا وان بجهـ دئینان بێ كو بزانن كا كەسێ داخوازێ ژ وان دكەت خەلكێ كی دەرێیە و گۆتنێ هەرە ببە هەتا تۆ ژمەرا دزڤرینی، ب حەق و باوەری مە داخوازا تە بجە ئانی، ڤێ یەكێ ئەڤ جهە بوویە بێدەرا باوەریێ. هەلبەت دەمێ مرۆڤ دگەهیتە بەر قوبێ هەمی دەڤەرا خویا دكەت ژبەر بلندیا جهێ قوبێ.

هەلبەت ل ئێریشێن فەریق پاشا قوب هاتبوو هەرفاندن، ژبەر ئوردگایی لەشكەرێ فەریق ل سەرێ چیایێ داكا بوو، لێ ل وی دەمی ئەو قوب مەزناتیا وی چەند بوو ئەڤ چەندە نەهاتە زانین، لێ پشتی ئێمناهی كەتیە دەڤەرێ و فەریق پاشا چووی، جارەك دن قوب ب بەران و كێچێ هاتیە ئاڤاكرن لێ نەهند یا مەزن بوو، هەلبەت ل گۆرەی ئاخفتنا خەلكێ دەڤەرێ ل سالا (٢٠٠٥)ێ قوب ب شێوەكێ جوان و بەرز و بلند هاتیە نووژەنكرن و قوب ب خۆ ل سەر رووبەرێ ژوورەكا (٣م×٤م) هاتیە ئاڤاكرن و دەرەچكا قوبێ هەتا هلێلاوێ بەلكو پتر ژ (٩م) یا بلندە، و ل پێشیا قوبێ سڤدەرك ژبۆ روونشتنێ ل رۆژێن عەید و هەلكەفتا ب رووبەرێ (١١م × ٤م) هاتیە چێكرن و بەرێ دەرگەهێ قوبێ دكەڤیتە ئالیێ باكوور و د هندرێ قوبێدا جهێ چرایێ لێ هەیە و پەرێ دداەرنەڤە و وەكو لاكێشەكێ یە دناڤ ژوورا قوبێدا و پەری ل سەر هەنە و دیسان ل دۆر قوبێ ب بەران وەكو شوورهەیەكی لێكرییە، ل سەر بنیاتێ شوورها بەرێ ب حەوشەكە نەگەلەك مەزن ژ ئالیێ پێشیا قوبێ هاتیە وەراندن و ل ڤێ داوێ ب پشتەڤانیا چڤاتا گوندێ خەرشەنیا پەژانەك ب درێژیا (٣كم) ب بلۆك و چیمەنتوی هاتیە ئاڤاكرن و بلندیا دیواری پتر ژ (٢م) هەیە و بۆ هەر رووبەرەكێ دەرگەهەك لێ دانانە ژبۆ هاتن و چوونا خەلكێ دگەل دانانا دەرگەهەكێ

سەرەکی کو دچە ناڤ گۆڕستانێ، ئاڤاکرنا ژوورەکێ کو درێژیا وێ پترە ژ (١٠م) یە دگەل ژوورەکێ وەکو جهەکی بۆ جێکرنا زادی ل رۆژێن عید و هەلکەفتا و ژ لایێ رێڤەبەریا کار و بارێن ئێزدییان یا سەر ب حکۆمەتا مەرکەزی ڤە هاتییە ئاڤاکرن.

گۆڕستانەك مەزن ل دۆر قوبێ هەیە، ترێن کەڤن لێ دخوبانە. نها ژی پێنج گوند مرێن خوە ل بەر گۆڕ دکن ئەو ژی ئەڤەنە (خەرشنیا، رکاڤا، گرێ پان، داکا کچك، کەبەرتو).

**توافا وی:**

سالانە ل مەها خزیرانێ توافا وی دهێتە گێران و خەلك ژ هەموو دەڤەرێن ئێزدییان قەستا ڤێ توافێ دکەن و رێ و رەسمێن توافێ ل دانێ ئێڤاری ل گۆمەلگەهێ دهێنە گێران.

**جهێ وی ل گوندێ کەلەبەدرێ :**

ئەڤ جهە دکەڤیتە ژێریا گوندی، بەریا سالێن (٢٠١٠)ێ ب شێوەیێ شوورهەی و ب بازنەیی یا ئاڤاکری بوو، پاشان وەکو ژوورەکێ هاتییە ئاڤاکرن و گۆڕستانەکا کەڤنە دکەڤیتە دۆرا ڤێ جهی[٨].

**شەمسێ پیرا:**

ل گۆرەیی بیر و باوەرێن ئێزدییان شێشمس پسێ ئێزدینە میرە[٩]، بەحسێ وی د ڤێ نڤێسینێ دا هاتییە کرن، ژبەر شێشمس ب چەندین ناڤان دهێتە ب ناڤکرن وەکو شێشمسێ تەورێزی، شێشمسێ تەتەری، شێشمسێ وەزیر، شێشمسێ سێ دەرێ یان سێ دەرا شێشمس و شەمسێ پیرا.

**جهێ وی ل دەڤەرا ڤاییدیا:**

ئەڤ جهە دکەڤیتە ژێریا گوندێ سینا، ئەڤ جهێ پیرۆز ب شێوەیێ ژوورەکێ هاتییە چێکرن و ئاڤاکرن، ئەڤ ئاڤاکرنا ب ڤی شێوەیی وێ چەندێ دگەهینیت کو نووژەنکرنە، ئانکو بەریا نها ئەڤ جهێ پیرۆز قوب یان ئاقد بوویە، هەر وەك من دگەلەك جهێن دندا ژ ڤێ نڤێسینێ خویاکری دەمێ هێرش و فەرمانا هاتنە سەر ئێزدییان ئارمانجا ئێکێ نەهێلانا جهێن پیرۆزێن ئێزدییان و براندنا ئێزدییاتی بوویە، لەورا ژی هەر جهەکێ پیرۆزێ ئێزدییان ئەز ب باوەرم چەندین جاران ب دەستێن دوژمنان هاتنە هەرفاندن و جارەکا دن ئێزدییان نووژەن نکرینە، گۆڕستانەك کەڤن و مەزن دۆر ڤی جهێ پیرۆز هەیە و ئەڤێ گۆڕستانێ گۆڕا کێلا میر ئەتلەس یا خودانا بەیتا ب ناڤ و دەنگ دناڤ خودا هەمبێز کرییە و خەلکێن دەڤەرێ ژی مرێن خوە ل بەر گۆڕ دکەن.

**توافا وی:**

سالانە توافا وی دهێتە گێران و خەلکێ دەڤەرێ ژ گەلەك دەڤەرێن ئێزدییان قەستا ڤی جهێ پیرۆز دکەن و ل دەرجکا وی یا پیرۆز تەواف دبن.

**شەخسێ زەینیا:**

گەلەك دەڤەرێن ئێزدییان جهێن پیرۆز هەنە و خەلك ل دەرجکێن وان تواف دبن قوربانییان ژێرە ددەن تەنێ دبێژنێ شەخس، ل گۆرەیی میتولوژیا ئێزدییان نیشانا تاوس مەلەکە هەر چەندە تاوسێ مەلەك

مەزارێ شەخسێ زەینیا



نەهاتییە ئەردێ لێ هەر ژ کەڤندا ب ڤی رەنگی جهەك ژێرا هاتییە چێکرن و ئێزدی لێ تواف دبن و سەر ل بەر دەرچێن وان شەخسان دتەوینن و دوعا ژخۆرا دکەن و داخوازا سلامەتییا خۆ ژێ دکەن[10].

جهێ وی ل دەڤەرا دنا:

ئەڤ جهێ پیرۆز دکەڤیتە گوندێ زەینییا ل کۆپەکی بلند، هەر ژ کەڤندا وەکو شێوەیێ لاکێشە ب بەران هاتبوو ئاڤاکرن و وەکو بنیاتا دو ژوورێن بچووك لێ ئێك ژ ئێکێ مەزنتر بوو، و دو دەرەچك لێ بوون خەلکێ بەر ل سەر ل دانێ و لێ تواف دبوون، سالا (١٩٨٥)ێ ئەو بەر راکرن و ب شێوەیێ قوبێ و ئاقدی ئەڤ جهێ پیرۆز ل سەر بنیاتا وان هەردو ژوورێن بچووك هاتە ئاڤاکرن، لێ بوورینا سێ سالا ئەو قوب و ئاقد هاتن ئێوراندن و جارەك دن وەکو شێوەیێ بەری هاتە ئاڤاکرن، ل دەمێ ئێشا تایێ کەسەك دگرت ب باوەریەکا زەلال قەستا شەخسێ زەینیا دکەن و داخوازا سلامەتییا خوە ژێ دکەن.

دیسان ب هەبوونا کاسیلوتك و بەرێن جهێن بنیاتێن ئاڤاهییان ل دۆر و بەرێن ڤی جهێ پیرۆز و گۆرێن کەڤن دخویانە کو د سەر دەمەکیدا ژیان ل ور هاتییەکرن، نهاژی خەلکێ گوندی مرێن خوەبێن زارۆك ل بەر گۆڕدکەن.

هەر سال ل رۆژا ١/١٢ داوەنەبیا شەخسێ زەینییا دهێتەکرن و خەلکێ گوند ژ مالێن خوە دەرناکەڤن و هەر مالەك سەربرەکێ سەر ژێدکەن ب خێرا شەخس و هەمی ژی ژن و زەلام گچك و مەزن دچن و تواف دبن و مجێورێ گوندی قەهوا شەخس ئامادە دکەت.

## بازیدێ باستامی:

دەرویش و قەلەندەر خودێ ناس، ئختیارێ مەرگەها شێخادی کو پلەیا بابێ شێخ ل سەروی دەمی وەرگرتبوو، ناڤێ وی یێ دورست (زەینەدین پسێ باپیرێ مقدار پسێ تەیفور پسێ عیسا پسێ سروشانە (ب بازید ) هاتییە ناڤکرن، دیسان ژبەر ناڤدارییا وی ب هاڤێتنا رمان ب بازیدێ رم هاڤێژ هاتییەناڤکرن، لەورا ئێزدی دبێژنێ بازیدێ رم زراڤ، هەروسا ناسناڤێ وی بازیدی بەستامی ژی ڤەدگەرە باژارێ وی بەستامێ، یێ بابکالێن وی و ئێلا بەستامی ل وێرێ دژیان، هەروسا ژ بەر وەرگرتنا وی پلەیا ئختیارییا مەرگەهێ ل پەرستگەها لالش کو پلەیا بابێ شێخە د ئۆلا ئێزدییاندا ب ئختیار هاتییە ناڤکرن[11]. زەینەدین ل باژارێ یەزدێ ئیرانێ ل نێزیکی (٩٧٦ - ٩٨٩ز) ژ دایك بوویە و ل ژیێ سەد و بیست و چوار سالیی دا ل باژارێ شیتاغونغ ل بەنگلادیش کراس گهۆرییە و ل وێرێ هاتییە گۆڕکرن .

جهێ وی ل دەڤەرا دنا:

جهێ وی یێ پیرۆز ب شێوەیێ قوبێ هاتبوو ئاڤاکرن کو دکەڤیتە گوندێ بەرزور سەر لێڤا رووبارێ دیجلە نێزیکی گوندێ خانکا کەڤن یێ سەر پارێزگەها دهوکێ ڤە و گۆڕستانەك کەڤن دکەتە دور قوبی[12]. ل دەمێ ئاڤاکرنا سکرێ مووسل ل سالا (١٩٨٤)ێ و دەمێ خەلکی ژبەر ئاڤێ گوندێن خوە بەردایین ئەڤ جهێ پیرۆز ژی کەتە دبن ئاڤێ دا، هەلبەت بەریا ئاڤ قوبا پیرۆز نقو بکەت خەلکی گوندێ خانکێ و مجێورێ قوبا بازید دەرجکا قوبی ب رێورەسم راکرن و جارەکا دن قوب ئاڤاکرن و دەرجا وی دانا نێزیك گوندێ زەینیا و د ناڤ ئاقارێ وان کو نها بوویە کۆمەلگەهەکا مەزن دب ناڤێ کۆمەلگەها خانکێ کو قوبەك مەزنا بەرچاڤە و ژ دۆر خویا دبیت و دکەڤیتە باشووری کۆمەلگەها خانکی و دیسان خەلکێ گوندێ خانکا کەڤن و گوندێ خێراڤای مرێن خوە ل بەرڤی جهێ پیرۆز گۆڕ دکەن.

### توافا وی:

هەرسال ل وەرزێ بهارێ توافا وی دهێتە گێران و خەلك ژ گەلەك دەڤەرێن ئێزدییان قەستا ڤێ توافی دکەن و رێورەسم دهێتەگێران، هەلبەت بەریا سالا (١٩٨٤)ێ و ئاڤا سکرێ مووسل دەڤەرێ داگیربکەت، سالانە و ل رۆژا توافا بازید خەلکێ دەڤەری قەستا

گوندێ بەرزۆر دکرن و رێورەسمێ توافی ل ورهاتن کرن کو ل وی دەمی پتریا خەلکێ ب پەیادە هاتن و چوون دکرن. چەندین نیشانگەهێن دن یێن خاسان دکەڤنە دناڤ مەزارێ بازید دا کۆمەلگەها خانکێ مینا نیشانا بوقدار، نیشانا شەخسێ ناڤا گوند، نیشانا شێخ حەمسی کو ئەمێ ل جهەکی دن ژ ڤێ نڤیسنێ بەحس ل وان بکەن.

### سلاڤگەها وی ل گوندێ خانکێ:

بەریا سالا (١٩٨٤)ێ ئەڤ سلاڤگەهە دکەتە بەرامبەر قوبا بازید یا کو دکەتە سەر لێڤا رووباری دیجلە ل گوندێ بەرزۆر، من پتر ژ جهەکی ل ڤی نڤیسنی ئاماژە پێدایە کو دەمی کەسەك ل سلاڤگەها هەکە نێزیك نیشانا خاسەکی تواف دبت، هەر وەکو ل وی جهی پیرۆز تواف بووی، ئەڤجا مەعمی کەسەك بوو[١٣] خەلکی خانکێ وەکو بەرەکی دانا بوو دکەتە هێلا قوبا بازید کو ببتە سلاڤگەه و هەر کەسەکی دبەررا بووریبا بەر دانان سەر و ل وێ سلاڤگەهێ تواف بوو. ل دەمێ دەرجکا قوبا بازید ل خانکا نوو دانابیت سلاڤگەها بازید یا مەعمێ ئاڤاکری جارەکادن نێزیك قوبا بازید ئاڤاکرن کو ب شێوەیێ نیشانگەها چوارگوشەیە و سەرێ وی توژە و بلندیا وێ نێزیك (٢م) و هەر کەسەك دچتە جەم مەزارێ بازید دچت ل ڤێ نیشانگەهێ زیارەتی دبت .

### سلاڤگەها وی ل گوندێ خێراڤا:

سلاڤگەها وی کو کێلکەکا بەرایە دکەڤیتە دناڤبەرا گوندێ خێراڤایێ و گوندێ قەباخێ ل سەر گرەکێ نەیێ بلند و هەر رێبوارەك گەهشتبا بەر روویێ سلاڤگەهێ ئێکسەر چاڤێ وی ژ دوورڤە ل قوبا شێخ بازید دکەت و ل وێ سلاڤگەهێ تواف بوو، لێ ب ئاڤاکرنا سکرێ مووسل ئەڤ سلاڤگەه دبن ئاڤێ داما[١٤].

#### جهێ وی ل دەڤەرا ڤایدییا:

ب شێوەیێ هەجرکی و بازنەیی ب هشکە بەران هاتییە ئاڤاکرن، دکەڤیتە ژێریا گوندێ خەرشنییا ل ئالییێ باکوورێ رۆژئاڤا، دیسان دکەڤیتە بەرامبەر قوبا عەڤدێ رەش ل ئالییێ رۆژهەلات و ب دووراتییا (١٥م) سلاڤگەهەکە دکەڤیتە رۆژهەلاتی هەجرەکا بازید وەکو کێلەکا بەرایە دبێژنێ سلاڤگەها بازید.

#### جهێ وی ل دەشتا سلێڤانەیا:

نیشانگەها بازیدی بەستامی دکەڤیتە ڤونتارا گرەکێ شوینواریێ بلند ل ئالییێ باکوورێ رۆژهەلاتی گری ل کۆمەلگەها باستکێ ل سەر رێکا سەرەکی یا دناڤبەرا قەزا سێمێلێ و زاخۆ دا[١٥].

#### جهێ وی ل دەڤەرا دێرەبوونێ:

وەکو شکەفتەکێ یە دکەڤیتە باکوورێ گوندێ دێرەبوونێ، دبۆ ماوەیەکی ل ورمایە و دڤێ خەلوەتگەهێ دا عبادەتا خوەکرییە لێ ب بوورینا سالا و دەما ئەڤ جهێ وی ئانکو شکەفت وەکو بەرێ نەمایە و ب ئاخێ و بەران هاتییە داگرتن. و نێزیك ڤێ خەلوەتگەهێ ب (٢٠م) سلاڤگەها بازید یا خوبایە کو هەر کەسەك بگەهیتە بەر سلاڤگەهێ لێ تواف دبت، هەروەکو ل خەلوەتگەهێ تواف بووی و ل ئالییێ ژێری یێ خەلوەتگەهێ نێزیك (٣٠م) کانییەکا ئاڤێ یە دبێژنێ کانییا بازید، کو ئاڤەکا زەلالە و خەلك پیرۆزیەکی د دەنە ڤێ کانییێ ژی، هەلبەت یا ئاشکەرایە کو بازید ل وی سەر دەمی ئاڤا ڤێ کانییێ ژ بۆ ژیانا خوەیا رۆژانە ب کارئینایە.

## شێخ زەری:

شێخێ زەری ئێکە ژ خاس و بابچاکێن ئێزدییان و هەتا نها ژی ب دورستی نە هاتییەزانین کا ئەڤ خاسە کی یە و بۆچوون هەنە وەکو بۆچوونەك هەیە دبێژیت: شێخێ زەری میر سجادینە[١٦] و بۆچوونەك

دبێژیت شێخ بابكە[17] ژبەر پتریا خاسێن ئێزدیيان پتر ژناڤەكێ هەنە، بەلكو بۆچوونا ئێكێ پتر نێزیكی راستیێ بت ژبەر گەلەك جارا مریدێن میر سجاددین دبێژن سجادینێ گوهار زێرین.

شێخێ زەری وەكو خوداوەندێ ئێشا زەركێ دهێتە ناسكرن، لەوا ژی دەمێ ئێشا زەركێ كەسەكی دگرت ب ئنیەتەكا سافی و زەلال دبەنە بەر جهێ پیرۆزێ شێخێ زەری و لێ تواف دبن و مجێور هندەك توبەركی ل ئەنیيا وی نەساخی ددەن و ژخوەرا دوعا و داخـوازا سلامەتیێ ژێ دكەن، هەلبەت ل رۆژێن چارشمبووا و ب باوەریێ ئەو نەساخی نامینیت.

**جهێ وی ل دەڤەرا دنا:**

ب شێوەیێ قوبێ هاتیە ئاڤاكرن، دكەڤیتە ئاقارێ گوندێ ریبیێ دا و دبێژنە دەڤەرێ گوهار زەر، هەتا سالێن هەشتێیان ژی ئەڤ جهێ پیرۆز تەنێ وەكو هەجرەكی بوو و ب بەران ب شێوەیێ بازنەیی هاتبوو لێكرن، لێ پشتی هنگی قوبەك ل جهێ وی هەجرەكێ هاتەئاڤاكرن و بەرێ قوبێ دكەڤیتە ئالییێ باشووری، ل ئالییێ رۆژهەلاتێ قوبێ گۆڕستانەك مەزن و كەڤن هەیە.

**جهێ وی ل دەڤەرا ڤایدییا:**

ئەڤ جهێ پیرۆز دكەڤیتە دناڤ گۆڕستانا شەمسێ پیرا دا و ب دروستاهی دكەڤیتە رۆژهەلاتێ شەمسێ پیرا ب دووراتیيا (٢٠٠م) و وەكو ژوورەك بچووك كو دبێژنێ ئاقدا سەر ب رووبەرێ (٢ X٢م) كو دبێژنێ ئاقدا شێخێ زەری.

## شێخ بابك:

ئێكە ژ خاس و بابچاكێ شێخادی و ژ بنەمالا شەمسانیێ یە، پسێ شێشمسە و گەلەك جاران ئێزدی ل دەمێ سوندێ پێ دخۆن دبێژنێ شێخ بابكێ شەمسا. دیسان ناڤێ وی د چەندین قەول و بەیتا و قەسیدادە هاتییە. و ل گۆرەی قەول و بەیت و قەسیدێن مە ل سەر دەمێ شێخادیێ دووێ ژیایە.

**جهێ وی ل دەڤەرا ڤایدییا:**

نیشانا وی دكەڤیتە دناڤ گۆڕستانا شەمسێ پیرا ل گوندێ سینا، وەكو ئاقدەكێ یە و سەرێ ئاقدی نە هاتییە گرتن و گۆرەك دناڤ ئاقدێدایە، لێ نەهاتە زانین كا ئەڤ گۆرە یێ كێ یە، لێ خویا دبت كو گۆڕ گەلەك كەڤنە.

**جهێ وی ل گوندێ كەلەبەدرێ:**

ئەڤ جهە دكەڤیتە رۆژئاڤایی گوندێ كەلەبەدرێ ب دووراتیيا ١كم نێزیكی سنوورێ گوندێ زاوا و ب شێوەیێ چوارگوشەی ل سەر رووبەری (٢م ×٢م) هاتییەئاڤاكرن، بلندییا دیواری ئاقدی (٢م)، خەلكێ گوندی زارۆكێن مری ل بەر گۆڕ دكەن[18].

## شێخالێ شەمسا:

بسێ شێشمسە و ئێك ژ خاسێن شێخادییە، ناڤێ وی د هندەك قەول و بەیتاندا هاتییە و خودێ كەرەم دگەل كر بوو.

**جهێ وی ل دەڤەرا ڤایدییا:**

جهێ وی ئەڤ جهێ پیرۆز دكەڤیتە گوندێ شێخدرێ ل دەڤەرا ڤایدیيا دهندرێ حەوشا شێخدرێ شەمسا ل ئالییێ ژووری و شێوەیێ قوبەكا بچووك هاتییە ئاڤاكرن، بەرێ وی دكەڤیتە بەر ب قوبا شێخدرێ شەمسا.

## خاتونا فەخرا:

دو بۆچوون سەبارەت ناڤێ وێ هەنە: بوچوونەك دبێژیت: ناڤێ وێ (غەزل)ە[19] وبۆچوونەك دن دبێژیت: ناڤێ وێ (عەیش)ە[20] دوتا شێخ فەخرێ ئادیایە خۆشكا شێخ مەندێ فەخرایە ژ ئۆجاخا شەمسانی یە و دهێتە ناسكرن ب خوداوەندا ژنان و خودێ كەرەم دابوویێ و ئێكە ژ قەنج و چاكێن شێخادی یە، هەر ژنەكا ئێزدی بشتی زارۆكبوونێ زادەكی ب خێرا خاتونا فەخرا چێدكەن .

**جهێ وێ ل دەڤەرا ڤایدییا:**

جهێ وی یێ پیرۆز دكەڤیتە د هندرێ حەوشا قوبا شێخدرێ شەمسا ل گوندێ شێخدرێ تەنشت قوبا شێخدرێ شەمسا ل ئالییێ باشوور و ب شێوەیێ قوبەكا بچووك هاتییە ئاڤاكرن.

## شێخدرێ شەمسا:

ژ ئۆجاخا شەمسانییێ یە، پسێ شێشمسە كو ناڤێ وی دهندەك قەولا و بەیتا دا هاتییە و ئێك ژ خاسێن شێخادی یە و خودان كەرەم بوو.

**جهێ وی ل دەڤەرا ڤایدییا:**

جهێ وی دكەڤیتە گوندێ شێخدرێ، ب شێوەیێ قوبێ هاتییەئاڤاكرن، سالا (١٩٨٧)ێ حكۆمەتا عیراقێ دگەل چەندین جهێن دن یێ پیرۆز و گوندان كاڤلكرییە، پشتی سەرهلدانێ وەكی چەوان ل سەر دەرگەهێ قوبێ هاتییە نڤیسین سالا (١٩٩٢)ێ هاتییە نووژەنكرن، و جارەكا دی خەلكێ گوند ب رێ و رەسم قوب ئاڤا كرن و هلێلا وی سوار كرن.

## ملك فەخرەدین :-

ملك فەخرەدین ئێكە ژ هەر حەفت ملیاكەتێن خودێ، و خودێ مەزن ژ نۆرا خۆ ئافراندین و هەلبەت ملیاكەت نە هاتنە ئەردایە لێ ئێزدی جارنا دبێژنە شێخ فەخر ملك فخرددین ژبەر ل گۆرەیی بیروباوەرێن مە كەرامەت و قـووەت و نەفەسا هەر حەفت ملیاكەتێن عەزمانایە دایە یێن ئەردا ئەوژی (شێخادی، شێخو بەكر، شێخ حەسەن، شێشمس، شێخ فەخر ، سجادین ، ناصردین) ئانكو ئەڤ نیشانكەهـ یا شێخ فەخرە شێخ فەخرێ ئادیا ، پسێ ئێزدین ئەمیر، ئەختیارێ مەرگەهێ.

**جهێ وی ل دەڤەرا دێرەبوونێ:**

ئەڤ جهێ پیرۆز دكەڤیتە دناڤبەرا گوندێ باجد میرێ و گوندێ گەورینێ ئەو ژی تەنێ وەكو كێلەكا بەرا یە.

## كەرەجال:

د سەبەقەكا قەولی دا هاتییە دبێژیت:

**كەرەجال خوەش پاشایە**
**دجهێ خوە دا زیهایە**
**لحف بناڤێ وی یا ئاڤایە**
**دایم ل هاوار و گازیایە** (٢١)

ئێكە ژ خاس و چاكێن شێخادی و ژ چینا پیرانیێ یە، ئانكو ئێك ژ هەر چل ئۆجاخێن پیرانیێ یە و بۆچوونەك هەیە كو كەرەجال و هاجال و صدیق برایێ ئێك دو بوون لێ پسێ كێ نە ئەڤ نەهاتە زانین.

**جهێ وی ل دەڤەرا ڤایدییا:**

ئەڤ جهێ پیرۆز دكەڤیتە سەرێ چیایێ سینا راسەر گوندێ سینا ل دەڤەرا ڤایدییا وب شێوەیێ ئاڤدێ هاتییە ئاڤاكرن، یا خویایە كو ل سەر دەمەكی ئەڤ ئاڤد ب گێچ و بەران هاتبوو ئاڤاكرن، لێ ب راكرنا هێرشان بۆ سەر دەڤەرێن ئێزدییان ئەڤ جهێ پیرۆز ژی بێ بەهرنەبوویە لەوا پاشماوێ گێچ و بەران ل ڤی جهێ هەنە و ل سەر دەمەكی ب بەران و چیمەنتویێ هاتییە نووژەنكرن.

**توافا وی:**

ل وەرزێ بهارێ توافا وی دهێتە گێران كو ئێزدی ژ دەڤەرێن جوداجودا ڤەستا ڤی جهێ پیرۆز دكەن و بۆ خوە دوعا و داخوازا سلامەتییا خوە ژی دكەن و رێورەسمەكا دیرۆكی دهێتەگێران كو دبێژنێ ئیشك، هەلبەت ئەڤی رێورەسما ئیشكی رامانەكێ د دەت لێ زانیاری ل دۆر وی ب دەست من نەكەتن.

**جهێ وی ل سەرێ چیایێ داكا ژی هەیە:**

وەكو كێلەكا بەرایە دكەڤیتە سەرێ چیایێ داكا نێزیك قوبا شێخ عەنزەل، دەمێ مرۆڤ ل بەر ڤێ نیشانكەهێ دراوەستیت و بەری خوە د دەتە ئالییێ باكوور، ئێكسەر نیشانكەها كەرەجال یا ل

چیایێ سینا دکەڤە بەرامبەر مرۆڤی و ئەڤ چەندە د ئێزدیياتیێ دا هەیە دەمێ ل جهەکی دسەکنن و چاڤێن وان ژ دۆر ب جهەکێ پیرۆز دکەڤیت ئێکسەر دەستێ خوە دسیمایێ خۆدا دئینیت و سەرێ خوە بەرامبەر وی جهێ پیرۆز دچەمینیت و دبێژنێ سلاڤکەهـ بۆچوونەك دن سەبارت ڤی جهی هەیە کو خەلکێ دەڤەرێ دبێژن ل دەمەکی کەرەجال ژ بال حەکیفێرس زڤری ل ڤێ جهـ راوەستایە و بێهنا خوە ڤەدایە لەوا بوویە جهی وی و ب ناڤێ وی هاتییە ناڤکرن.

**جهێ وی ل گوندێ شێخدرێ :**

ئەڤ جهێ پیرۆز دکەڤیتە د هندرێ حەوشا شێخدرێ شەمسال گوندێ شێخدرێ و دکەڤیتە نێزیك قوبا شێخدرێ شەمسا و ئەڤ جهێ پیرۆز ب شێوەیێ قوبەکا بچووك هاتییە لیکرن.

## پیرافات:

بۆچوون د جیاوازن سەبارەت پیرافات کو هندەك دبێژن پیر فات، ئانکو پیر بوهری، و هندەك دبێژن پیر ئافات، ئانکو خوداوەندێ ئافاتایە، لەوا ژی دبێژن:

**یا پیرافات**
**تو مە بسترینی ژ ئافات**
**و هندەك دبێژن سورا تاوسی مەلەکە.**

**جهێ وی ل دەڤەرا ڤایدییا:**

نیشانا پیرافات ب شێوەیێ ئاقدێ هاتییە ئاڤاکرن: دکەڤیتە نێزیك قوبا عەڤدێ رەش ل گوندێ خەرشەنیا و ل ئالییێ باشوورێ قوبێ و دناڤ کافلێن مالاندا، ل سەر دەمەکێ دا وەکو هجرك بوو ل ٢٠٠٦/٣/١٢ێ هاتییە نووژەنکرن و وەکو ژوورەکێ ب بلندیيا (١،٥٠م) هاتییە ئاڤاکرن و سەرێ ئاقدێ یێ بەردایە و ناڤدا ئەو هجرکا وی وەکو قوبەکا بچووك ب بلندییا (١م) و چەندین دارێن زەیتوونان و قەسپا و کاژا دناڤدانە و بەرێ دەرگەهێ ئاقدێ دکەڤیتە ئالییێ رۆژئاڤا.

**داوانەبیا وی:**

سالانە ل ئێڤارا ئەینیێ ل داوییا هەیڤا نیسانێ مجێورێ پیرافات دکەتە داوانەبی و خەلکێ گوند بەرەو جهێ پیرۆزێ پیرافات دچن و لێ تواف دبن و پشتی ڤەگەرانێ دچنە مالا مجێور و سماتێ ل وێرێ دخون.

**جهێ وی ل گوندێ گرێ پانێ:**

دکەڤیتە ژێریا گرێ شێشمس ب دووراتیا (٣٠م) وەکو ژوورەکا (٢،٥م×٢،٥م) و بلنداهیيا (٢م) سەرێ ئاقدێ نەیێ گرتییە و تەنشت قوبێ ب (٥م) راسەر ئاقدێ پیرافات سلاڤگەها ئاقدێ یە، گەلەك جاران و کەسێ نکارییە بچە ل دەرەجکا پیرافات تواف ببە ل وێ سلاڤگەهێ تواف دبە ل شوونا تواف بوونا ئاقدێ.

**جهێ وی ل گوندێ رکاڤا:**

ئەڤ جهێ پیرۆز دکەڤیتە ژێریا نیشانگەها سوارێ بتنێ و نێزیك ئاقدا شێخوبەکر ب (٢٠م)، ب شێوەیێ ئاقدێ هاتییەئاڤاکرن، هاتییە نووژەنکرن و ل سەر رووبەرێ (٣م×٣م) و بلندیيا (٢م) هاتییە دورستکرن و ب حەلان دیوارێ وی یێ ژ دەرڤە هاتییە چێکرن و خەملاندن و دناڤدا وێنەیێ رۆژێ هاتییە چێکرن و ل سەر حەلانەکی ب شێوەیێ لاکێشە هاتییە نڤیسین: یا خودێ، یا تاووسی مەلەك، ئاقدا پیرافات، د هندرێ ئاقدێ دارەکێ خەملا خوە بەردایە سەر و چرایێ وی تێدایە و مریيان ل بەر گۆڕ دکەن.

**جهێ وی ل دەڤەرا دێرەبوونێ :**

دکەڤیتە ئاقارێ گوندێ دێرەبوونێ، ب شێوەیێ هەجرکێ و بازنەیی هاتییە ئاڤاکرن، پتریا بەرێن ڤی جهێ نەماینە و هندەك کەتنە دبن ئاخێدا.

**جهێ وی ل گوندێ قەرەولا:**

ئەڤ جهە دکەڤیتە دناڤ زەڤیەکێدا ل رۆژهەلاتی گوندێ قەرەولا، پاشماوەیێ ڤی جهی تەنێ بنیاتێ شوورهەکێ بازنەیی مایە و یاخوبایە و هەر

کەسەکی ڤی جهێ پیرۆز تەماشە بکەت ئێکسەر دێ گۆڕستانا کەڤن یا ل دەوروبەرێ نیشانگەها بینت، ئانکو دەمەکی زەهمان بوو، لێ ببوورینا سالا و ژبۆ بکارئینان بۆ چاندنی ئەڤ رەهمان سێ جارێکێ وی هاتییە ونداکرن.

#### جهێ وی ل دەڤەرا دنا:

دکەڤیتە دناڤبەرا ئاقارێ گوندێ قاهیرا و ریبیێ، هەجرە ب شێوەیێ بازنەیی هاتییەئاڤاکرن و گۆڕستانەك کەڤن ل دۆرا وێ هەیە ل خەلکێ دەڤەرێ، ب بوورینا سالا گەلەك تریێن کەڤن ئەردێ وان ژبو چاندنێ کێلانە.

## عەڤدێ رەش:

سەبارەت ناڤێ وی کا ئەڤ خاس کی یە، دو بۆچوون هەنە: بۆچوونەك هەیە دبێژیت: ناڤێ وی عەڤدی یە پسێ رەشۆیە، ئێکە ژ خاسێن شێخادی، ژ چینا پیرانێ یە[22] ، یا دی دبێژیت: ناڤێ وی عەڤدێ رەشە ژ چینا شێخایە و ئێکە ژ خاسێن شێخادی، دهێتە ناسکرن ب خوداوەندێ کانی و بیرا و شێخادی ئەڤ ماش دابوویێ[23].

#### جهێ وی ل دەڤەرا دێرەبوونێ:

ئەڤ جهێ پیرۆز ب شێوەیێ قوبێ ل قونتارا چیایێ بێخیردا ل سەر شکەفتەکێ کو کانییەکا ئاڤێ یا بۆش و زاڤ ژێ دەرکەڤە هاتییەئاڤاکرن دبێژنێ کانیا عەڤدێ رەش، ل گوندێ دێرەبوونێ قوب ب بەرا و چیمەنتویێ و گێچێ هاتییەئاڤاکرن و چرایێ وی دهندرێ قوبێدا دهێتە هەلکرن و دیوارێن ژوورا قوبێ دهندردا ب پەرییێن سۆر و زەر و سپی دهێنە خەملاندن، بلندییا قوبێ هەر ژبنیاتێ هەتا هێلا وی دۆرێ (٦م) شەش مەترایە و سالانە دهێتە سپیکرن. بەرێ دەرگەهێ قوبێ دکەڤیتە ئالییێ باشوور. جهێ چرایێ عەڤدێ رەش بەریا کو قوب بهێتەئاڤاکرن دکەڤیتە تەنشت شکەفتا کو کانیا ئاڤێ ب دووراتییا (١٠م) ژێ دەرکەڤیت، ئەو ژی وەکو شکەفتە بچووك. گۆڕستانەك کەڤن و مەزن دکەڤیتە باشوورێ قوبێ ب دووراتییا (٣٠٠م) و پتریا هۆزا هەوێریا مرێن خوە ل بەر گۆڕ دکەن و گۆڕستان ژی هەمی هاتییە پەرژانکرن.

#### توافا وی:

هەرسال و رۆژا ئەینیێ پشتی چارشەمبوویا سەرێ سالێ توافا وی دهێتەگێران و هێلا قوبێ دهێتە نووکرن و ئێزدی ژ گەلەك دەڤەرا قەستا ڤێ توافێ دکەن و دەرجکا قوبێ تواف دبن و بۆ خۆ دوعا و دروازا دکەن.

#### جهێ وی ل گوندێ خەرشەنیا:

ئەوژی ب شێوەیێ قوبێ هاتییە ئاڤاکرن. ئەڤ قوب دکەفتە گوندێ خەرشنیا، هەلبەت وەك گەلەك جهێن دن یێن پیرۆزێن ئێزدییان ئەڤ قوب ژی ل سالا (١٩٨٧)ێ دەمێ گوندێن کوردان وێران کرین کەتبوو بەر هەرفاندنێ. لێ ل سالا (٢٠٠٣)ێ دەست ب نووژەنکرنا وی هاتەکرن، قوب ل سەر رووبەرێ (٣م × ٣م) هاتییە ئاڤاکرن و بلندییا وی دگەهنە نێزیکی (٦م) و بەرێ دەرگەهێ قوبێ دکەڤیتە ئالییێ رۆژئاڤا و ب حەلان هاتییە ئاڤاکرن، ل دۆرێ قوبێ دیوارەك ب بەران وەکو حەوشەکێ بۆ قوبێ لێکرییە و دارێن زەیتونا دناڤدا د چاندینە. دهندرێ قوبێدا چرایێ عەڤدێ رەش دهێتە هلکرن دگەل دو جهێن دن ب تەنشت قوبێ ڤە کو چرا تێدا دهێتە هلکرن، ئەوژی چرایێ عەبدولرەحمانێ جوزی یە کو مەرەبیێ ئێلا دوملیایە و یێ دن چرایێ کوچك برهیمە و ل گۆری ئاخفتنا قەولبێژ و خلمەتکار شرو ابراهیم کو جارەکێ کوچەك بریم ل ڤی گوندی بوویە مێڤان کو ل وی دەمی ئختیارێ مەرگەهێ بوو و چرایەك دن هلدکەن، ئەوژی چرایێ ناسردینە کو خودانێ ئێلا دوملیایە، مەزارێ عەبدێ رەش ل رۆژا چوارشەمبووا ٢٠٠٣/١١/٥ ژ کیستێ شێخ مەروان بەرەکات خەلات و ب هاریکارییا هەموو خەلکێ گوندێ خرشنیێ هاتییەئاڤاکرن.

**داوانەبیا وی:**

سالانە جارێ مجێور دكەتە داوەنەبی و رۆژا ئەینیێ خەلكێ گوند دچنە بەر قوبا عەڤدێ و تواف دبن و ل زڤراندنێ دچن مالا مجێور سماتێ دخون[٢٤].

**جهێ وی ل دەڤەرا ڤایدییا:**

ئەڤ جهێ پیرۆز ل گوندێ سینا ب شێوەیێ ئاقدی و ب بەرێن چوارگوشەیێ نكراندی هاتییە ئاڤاكرن، دكەڤیتە دناڤ مالاندا ل ئالییێ ژووری و نێزیك دەرێ گەلیێ دادیسان رووبەرێ ئاقدێ (٣م× ٣م) و ب بلندییا (٢م) یە و سالا (١٩٥٠)ێ هاتییە نووژەنكرن، دیسان چەندین بەرێن نەقشاندی دیوارێ ڤێ ئاقدێ دانە وەكو وینەیێ رۆژێ و تەیرتاووس و گۆپال و هەیڤ و چوارگۆشە، هەلبەت دەرگەه لێ نینە تەنێ وەكو (٣٠سم، ب شێوەیێ چوارگوشە جێ تواف بوونێ یە.

**جهێ وی ل دەڤەرا دنا:**

نیشانكەهەكا ڤێ خاس و بابچاكی دكەڤیتە كۆزا گوندی كو دبە وەكو كۆمەكا بەرابە و دكەڤیتە ئالییێ رۆژهەلاتێ گوندێ كو دبە ب دووراتییا (١كم) و سەر جادا گشتی را ئەوا سێمێلێ و كۆمەلگوها خانكێ پێكڤە گرێدەت و دۆرێ نیشانكەهێ گۆڕستانەكە، خەلكێ گوندێن كودبە و سۆركار و قەسر ئێزدین مرێن خوەیێن زارۆك ل بەر گۆڕ دكەن.

## گاڤانێ زەرزا:

زانیاری دەستمە نەكەتنە تاكو ل سەر ژیانا وی بنڤیسین تەنێ دهێتە زانین كو گاڤانێ زەرزا ژ چینا پیرانیێ یە و ئێكە ژ ئۆجاخێن پیرانیێ و خوداوەندێ چێلایە .

**جهێ وی ل دەڤەرا دێرەبوونێ:**

نیشانكەها وی دكەڤیتە باكوورێ گوندێ دێرەبوونێ ل جهەكێ كەتی، هەر ل دەمێ مرۆڤ ل وان كوپێن بلند راستێ نیشانكەهێ دسەكنت و ژ دوور خویا دبت كو وەكو بازنەكێ هاتییە ئاڤاكرن و بەرێن مەزنن و هەڤشی پێ هاتییە لێ بەر دبەلاڤەنە و ل گۆرەی ئاخفتنا خەلكێ دەڤەرێ كو چیرۆك وەسا ژ وانرا هاتییە گۆتن ل دەمەكی ئەڤ بەر هەموو چێل بوون دگەل گاڤان ب هێزا خودێ و گاڤانێ زەرزا هەمی بوونە بەر كو گاڤان دوعا ژ خودێ كر د گۆتیا خودێ تو كانییەكا ئاڤێ ل ڤر ڤەكە، كو ئەز و چێلێن خوە ئاڤێ ژێ ڤەخۆن ئەز چێلەكێ ب خێرا گاڤانێ زەرزا سەرژێ دكەم، خودێ دوعا وی قەبوولكر و كانییا ئاڤێ زا، پشتی وی و چێلێن وی تێر ئاڤ ڤەخوارین گۆت ب خودێ ئەز چێلێ سەر ژێ ناكەم لەو خودێ لێ ب غەزەب گەرییا و هەمی كرنە بەر[٢٥].

**جهێ وی ل دەڤەرا دنا:**

ئەڤ جهە دكەڤیتە گوندێ زەینیا ل ڤونتارا گوزا گوندلێ، ل سالێن هەشتێیاندا و پشتی خەلكێ گوند حەوش و ئاڤاهیێن خوە ل دۆر و بەرێن گوند ئاڤاكرین ئەڤ جهە كەتە د ناڤ حەوشا مالەكێدا و ب شێوەیی بازنەیی و ب بەران هاتییە ئاڤاكرن و بەرێ دەرجكا وی دكەڤیتە ئالییێ رۆژهەلات و چرایێ وی دهێتە هلكرن .

**جهێ وی ل كەبەرتو:**

ب شێوەیەكێ شوورهەكێ هاتییەچێكرن، دكەڤیتە دناڤ زەڤیەكێ دا ل ئاقارێ گوندێ كەبەرتو و گەلەك بەرێن وی هاتنە راكرن.

**جهێ وی ل دەڤەرا ڤاییدییا :**

ئەڤ جهە دكەڤیتە دناڤبەرا گوندێ شاریا و گوندێ كەلەبەدرێ و ب شێوەیی بازنەیی وەكو شوورهێ ب هشكە بەران هاتییەئاڤاكرن.

## چاویش (چاویش سەعدەتی، چاویش مەزن)

هەلبەت ئێزدی ب گشتی و خەلكێ گوندێ كەبەرتو ب تایبەتی ڤان ناڤان دانن سەر چاویش.

چاویشێ سەعدەتێ ل گۆر بیروباوەرێن ئێزدییان ئانكو تاووس مەلەكە وەكو دڤێ سەبەڤا دوعایێ ژ (دووعایا مرازا) داهاتی یە دبێژیت:

**مەلك عزراییل نوت و نەه سال سەکنی ل خلمەتێ**
**پەدشا رونشتی ل وێ حزرەتێ وی سەعدەتێ**
**مراز حاسل بوو ل حەقیقەتێ**
**ئەو بو چاویشێ سەعدەتێ**[٢٦]

دیسان مەلکێ خێرێ د ئێزدیياتیێ دا (چاویشێ سەعدەتێ) یە ئانکو تاوس مەلەك وەکو دڤی سەبەقێ ژ دوعایا مەعریفەتێدا هاتی و دبێژیت:

**پێ خەملی دەرێ جنەتێ**
**ئاڤا وان بو ژ مەعریفەتێ**
**ئەساسێ وان ژ حەقیقەتێ**
**مفتا خێرێ ل دەستێ چاویشێ سەعدەتێ**

و دبێژن چاویشێ مەزن بەلکو ژبەر نیشانا تاووس مەلەك و بەلکو رێ و رسمان ل بەر دگێرن و مریان ل بەر گۆڕ دکەن، بەروڤاژی چاویشێ کچك یێ کو رێ و رسم ل بەر ناهێنە گێران .

**جهێ وی ل دەڤەرا دنا :**

ئەڤ جهێ پیرۆز دکەڤیتەسەر گرەکێ گوندێ کەبەرتوی، هەتا داوییا سالێن حەفتییان وەکو ئاقدێ بوو، ب هشکە بەران هاتبوو ئاڤاکرن کو بلندییا دیوارێ وی (١،٥م) بوو و رووبەرێ ئاقدێ کو ب شێوەیێ چوارگۆشە هاتبوو ئاڤاکرن وەکو (٣م ×٣م) و پاشان خەلکێ گوند و ب رێ و رسم ئەڤ ئاقدە ب شێوەیێ قوبێ ئاڤاکرن و دەرگەهێ ڤێ جهی بەر ب ئالییێ رۆژهەلات بوو، لێ وەکو گەلەك جهێن دن یێن پیرۆز حکۆمەتا بەعسی گوند و وارێن کوردان وێرانکرین ل سالا (١٩٨٧)ێ هاتە هەرفاندن، گۆڕستانەك کەڤن ل دۆر و بەرێ ڤی جهی هەیە، خەلکێ گوندێ کەبەرتوی مریێن خوە ل بەر گۆڕکرن[٢٧].

هەلبەت پشتی گوندێن ئێزدییان یێن دەڤەرا دۆبانێ ل ناڤ ئاقارێن گوندێ زەینیا کۆمکرین و هەمی ل کۆمەلگەها خانکێ نیشتەجیکرن، د رێورەسمەکێ هەژیدا دەرجکا قوبا چاویش ژ گوندێ کەبەرتوی راکرن و ل کۆمەلگەها خانکێ ب شێوەیێ قوبێ ئاڤاکرن کو دکەڤیتە سەرێ گرەکی بلند بەرامبەر گوندێ کەبەرتوی و سالانە رێورەسمێن توافا وی دهێتە گێران و هندەك ژ خەلکێ خانکێ مریێن خوە ل بەر گۆڕ دکەن. دیسان دەرێ قوبێ دکەڤیتە ئالییێ رۆژهەلات و سەر دیوارێ پێشی یێ قوبێ هاتییە نڤیسین (باب چاویش سنە ٨٥٤)، ئایا ئەڤ مێژوویە هاتنا چاویشە بۆ گوندی یان ئاڤاکرنا ڤی جهێ پیرۆزە ل وێ مێژوویێ، یان مێژوویا کراس گوهۆرینا وی کەسی یە ئەوێ گۆڕا وی دناڤ ئاڤاهیێ قوبا چاویشدا ل گوندێ کەبەرتوا کەڤن، زانیاری دۆر ڤێ چەندێ ب دەست مە نەکەتن .

**توافا وی:**

سالانە ل هەیڤا نیسانێ و ئێڤارا رۆژا چوارشەمبی رێورەسمێن توافێ دهاتنە گێران، خەلکێ گوند و گوندێن دەور و بەر ژی قەستا ڤێ توافێ کرن هەر ل ڤێ ئێڤارێ مجێوەر گازی دکر و کرە داوەنەبی کو سوباهی توافا چاویشە، هەلبەت ل رۆژا سێ شەمبی پشتی نیڤرۆ خەلکێ گوندی وەسا دزانی کو ئەڤ رێورەسمێن رۆژا سێ شەمبی وەکو توافی بۆ شێخ بوغەنە کو ئەوژی جهەکی پیرۆزە دکەڤیتە گوندێ کەبەرتو .

## سلاڤگەها چاویشێ مەزن:

وەکو کێلەکا بەرا بوو، خەلکێ گوند دگۆتنێ کێلکێ دکەتە جهەکی دبێژنێ گرحەسۆ و ل رۆژهەلاتی گوندێ کەبەرتو ب دووراتییا (٢کم) ل سەر رێکا گوندێ کەبەرتو و گرێ پان، دەمێ رێبوار دگەهشتنە بەرسلاڤگەهی چاڤێ وان ب جهێ پیرۆزی چاویش دکەت و ل سلاڤگەهی تواف دبوون[٢٨].

## چاویشێ کچك :

ل گۆڕ ئاخفتنا خەلکێ گوندێ کەبەرتویێ دگۆتنێ چاویشێ کچك ژبەر چ رێورەسم ل بەر ناهێنە گێران، سالانە تواف ژبرە ناهێتەکرن، مریان ل بەر گۆڕ ناکەن، دیسان ئەڤ جهێ پیرۆز جهێ چاویشێ شێخادییە و پەیڤا چاویش ژ دو برگا پێك دهێت: چاوو + ئیش بۆ سڤکرنێ بوویە چاویش

ئانکو یێ چاڤدێریا ل لالشا نورانی کاردکەت، نها ژی بابا چاویش ل لالشا نورانی ب هەمان کارێ چاویشی شێخادی رادبت کو چاڤدێری و سەرپەرشتییا هەمی کار و بزاڤ و رێورەسمان دکەت، ئێك ژ شکەستیێن لالشێ یە، خوە ژ هەمی خوەشی و لەفزەتێن دنێ کریە تەنی کارێ وی چاڤدێری و خزمەت و عبادەتێ ل لالشێ، دبت چاویشێ شێخادی ژ چینا پیرانیی بت لەوا ژی کونها بابێ چاویش ژ چینا پیرایە .

**جهێ وی ل دەڤەرا دوبانا دنا:**

ب شێوەیێ ئاڤدێ یە و هشکەبەران یێ ئاڤاکریبوو، بلندیا دیواری وی (١،٥م) بوو ل سەر رووبەرێ (٣م × ٣م) هاتبوو ئاڤاکرن و بەرێ ئاڤدێ دکەتە ئالییێ رۆژهەلات کو دکەتە بەرامبەر قوبا چاویشێ مەزن ب دووراتییا (١کم)، جهێ وی یێ بلند بوو ئانکو ئەو ژی ب سەر گوندی دکەت و سلاڤکەها وی دکەتە بنیا گرێ ئاڤد ل سەر رێکا ژ گوندێ کەبەرتو دگەها باختمێ و خەلکێ رێبوار دەمێ گەهشتنە ڤێ سلاڤکەهێ لێ تواف دبوون ژبەر دووراتییا جهێ چاویش ژ رێکێ.

## چل مێران:

ل گۆرەی پێزانینێن من دەربارەی چل مێران کۆمکرین بۆچوونەك دبێژیت: ل دەمێ نەخۆشی کەتیە دناڤبەرا ئادانیێ و شەمسانیێ دا چل مێر هاتنەکوشتن، پشتی ل هەڤ هاتین دەمێ زاد خوارنێ دگۆتن کا سماتا چل مێرا بینن و پەیڤا مێرا ب بۆرینا سالا بوویە مێران و هندەك دبێژن چل سوارێ مالا ئادییا یان سوارێ باتنێ دگۆتنێ چل مێران[٢٩].

**جهێ وی ل دەڤەرا ڤایدییا:**

ئەڤ جهە دکەڤیتە رۆژهەلاتێ نیشانکەها بابێ هورکا و دیسان نێزیکی زیارەتا شەمسێ پیرا ل گوندێ سینا، وەکو کێلکەکا بەرایە، دەمێ ریبوار دبەرا دەرباس دبنو لێ تواف دبن.

## شێخ مەند:

ئێکە ژ خاس و چاکێن ئێزدییان، بسێ شێخ فەخرێ ئادیایە و سەردەمەکێ میراتییا کەلا (کلس) کریە کو ئێزدی دبێژنێ کەلا شێخ مەند. ئەڤی خاسی رولەکێ بەرچاڤ دپێکهاتن و هەڤگرتنا بنەمالێن شەمسانیێ و ئادانیێ دا هەبوو و دهێتە ناسکرن خوداوەندێ مارا، کو هەتا نها ژی بنەمالێن شێخێن شێخ مەندان ماران دگرن ناڤێ وی د گەلەك قەول و بەیتێن ئێزدییان دا ژ سەبەڤا داوی دا دهێت:

**ژ قەولێ شێخ مەندێ فەخرانە**
**راستە مالێ میرا ئیمانە**
**تەمامەتیا ڤی قەولی ل خودێ خودانە**
**ئەم دکێمن خودێ تەمامە[٣٠]**

جهێ وی ل دەڤەرا دنا:

قوبەك سپی و بلند سەرێ کوزا گوندێ زەینیا ل داوییا سالێن نۆتان هاتینە ئاڤاکرن.

**توافا وی:**

سالانە توافا وی ل چوارشەموا پشتی جەژنا سەرێ سالێ دهێتەگێران و خەلك ژ دەڤەرێن ئێزدییان قەستا ڤێ توافێ دکەن.

**جهێ وی ل ل گوندێ کەبەرتویێ:**

ئەڤ جهێ وی دکەفتە دناڤ گوندێ کەبەرتویێ دا ب شێوەیێ بازنەیی ب بەران هاتبوو ئاڤاکرن، لێ پشتی هەرفاندن و کاڤلکرنا گوندێن کوردان ژ بال حکومەتا عیراقێ ئەڤ جهێ پیرۆز ژی کەتە بەر هەرفاندنێ، لێ پشتی بهارا سالا (١٩٩١)ێ مجێور و خەلکێ گوندی دەرچکێن پیرۆزێن خاسان ب رێورەسم جارەك دن ل ناڤ کۆما ئێزدییان ل کۆمەلگەها خانکێ و ب تەنشت قوبا چاویش قوبا شێخ مەند ئاڤاکرن. دیسان جهێ وی یێ پیرۆز دکەتە سەرێ دیارەکێ بلند بەرامبەر گوندێ کەبەرتویێ.

## حاجی عەلی:

سەبارەت ناڤێ وی هندەك دبێژن حەجی عەلی یان حاجی عەلی، ژ چینا پیرانیێ یە کو ئێکە ژ هەر

چل ئۆجاخێن پیرانیێ و ناڤێ وی د دروٚزا خاسا دا هاتیه كو ئێكه ژ خاسێن شێخادی[31].

**جهێ وی ل دەڤەرا دێرەبوونێ:**

دارەكا بەرز و بلند و هەردەم یا ب خەمل و رەوشە، چ ل دەمێ كەسكاتیا وی یان ژی ل پاییزێ ژ بەر ئەوان پرتێن چاوێن رەنگا و رەنگ یێن خەلك دەمێ قەست دكەنێ ب چقلێ وێڤە دكەن و داخواز و مرازێ و هیڤیا ژێ دكەن و دوعا ژ خودێ و خودانێ وی داری دكەن. ئەڤ دارا پیروٚز دكەڤیتە بەر رەخێ چەمەكی دنەوالەكا كووردا ل روٚژهەلاتێ گوندێ پێ بزنێ ل دەڤەرا دێرەبوونێ و ل دوٚرڤورمێ دارێ وەكو شوورهەكی ب بەران هاتیەلێكرن كو كەڤناتییەك ل وێ چەندێ خویادبت، ل گوٚرەی گوٚتنا خەلكێ دەڤەری كو باب و باپیرێن وان ئێكی بوٚ ئێكی گوٚتییە كو ل دمەكی ئەو چەم هەمی دار و بار بوو دگوٚتنێ دارێن حاجی عەلی و نیشانگەها حاجی عەلی ژی لێ بوو، لێ ب هاتن و پەیدابوونا قڕ و فەرمانا و خەلكێ جهێ خوەبەردای تەنی ئەو دارا پیروٚز و ئەو شوورها ل دوٚر وی مایە. دیسان خەلكێ هاتن و چوونێ د وێ رێكا ب نێزیك دارێ را دكەن كو سێمێل و دێرەبوونێ ب هەڤراگرێدەدەت دڤێت سلاڤا ل وی دارێ بكەت، هەلبەت ئەو خەلكێ ئەڤی چەندێ بزانت لەوا ژی جارنا دبێژنێ دارا سلاڤێ .

## شێخ موس:

ژ چینا شێخایە، ئوٚجاخا ئادانیێ یە، ژ بنەمالا شێخسنە ئێكە ژ خاس و چاكێن شێخادی[32].

**جهێ وی ل دەڤەرا ڤائیدیا:**

ئەڤ جهە ب شێوەیێ ئاڤدی هاتیەئاڤاكرن ب بەرێن نكراندی یێن چوارگوٚشە كو بلنداهیا دیوارێ ئاڤدێ (٢م) و ل سەر رووبەرێ (٢م ×٢م) هاتیەئاڤاكرن، دكەڤیتە دناڤ مالاندا ل گوندێ سینا و دیسان دكەڤیتەبەر رەخا نەوالەكێ ئەوا ژ گەلیێ كانیێ دهێت و دارەكا توویێ ل بەر دەرگەهێ ئاڤدێ یە سەر بەرەكی راسەر دەرچكا ئاڤدی هاتیە نڤیسین ب زمانێ عربی:

بسم الله الرحمن الرحيم

هذا مكان شێخ موس ١٩١٧/١١/٥

العامل خديدا أزدين

هەلبەت ژڤێ مێژوویی دیارە كول وی دەمی هاتیە نووژەنكرن.

## سەخری جن:

ئوٚجاخا شەمسانیی یە، ئێكە ژ خوداوەندێ جنا ناڤێ وی و دوعایا ستێرا د مبلقالی دا هاتیە وەكو: تەیاری جن، كەوكبی جن، مەهەدی جن[33]. دەمی كەسەك دەروونێ وی نەیێ دروست بیت ب ئنیەتەكا زەلا و سافی دچن بەرنیشانگەها سەخری جن و هندەك توبەركا وی رادكەن و ل نەساخی د دەن و بوٚ خوٚ دوعا و داخوازا سلامەتیێ ژێ دكەن.

**جهێ وی ل دەڤەرا ڤائیدیا:**

دكەڤیتە نێزیك ئاڤدا شەمسێ پیرا ل ئالیێ روٚژئاڤاڤە و چرایێ وی دهێتە ڤێخستن، ئەڤ جهێ پیروٚز دكەڤیتە گوندێ سینا.

## ستیا مامی:

هەلبەت ژ ژنێن ئوٚجاخزادە و خوەدێ كەرەم دگەل كری دبێژنێ ستی وەكو ماكا شێخادی ستیا ئێس و دوتێن شێشمس ستیا بلغان و ستیا نسرەت و دوتێن شێخ حسن ستیا حبیب و ستیا تاوس و ستیا نڤیسە و ماكا سجادین ستیا عەرەب ستیا مامی ژی ئێك ژوان ماكایە كو خوەدێ كەرەم دگەل كری، لێ نەهاتە زانین كا ژ كیژ بنەمالێ و چینێیە و ل كی سەردەمی ژییایە، دبت ناڤێ وی نە ستیا مامی بت كومامی ژی هەر ب مەرەما ماكێ یان داكێ بت وناڤەكێ دن هەبت، هەلبەت ئەڤ ژی نەهاتە زانین تەنێ دهێتە زانین كو جهەكی پیروٚزە ب ناڤێ ستیا مامی .

**جهێ وی ل دەڤەرا قائیدیا:**

دکەڤیتە سەرێ دیارەکێ بلند ل ئالییێ رۆژ ئاڤایێ گوندێ خەرشنیا بەرامبەر قوبا عەڤدێ رەش وەکو شوورهەکێ یە ب شێوەیێ بازنەیی هاتییەدورستکرن، جهێ توافبوونێ هەیە دکەڤیتە ئالییێ رۆژهەلات، گۆڕستانەك گەلەك کەڤن دکەڤە دۆر ڤی جهێ پیرۆز. ل رۆژێن چەژن و هەلکەفتا ئێزدی قەستا ڤی جهێ پیرۆز دکەن و لێ تواف دبن، نها ژی خەلکێ گوندێ خەرشنیا هندەك ژوان مرییێن خوە ل بەر گۆردکەن، ڤێ داویێ رێڤەبەریا کاروبارێن ئێزدییان ب درێژیا (٨٠٠٠م) گۆڕستان پەرژانکرییە، دیسان ئەڤ جهێ پیرۆز دکەڤیتە نێزیك نیشانگەها بازید ژ ئالییێ رۆژئاڤاڤە و نێزیك دەرێ گەلیێ عەڤدی[٣٤].

## خدر ئەلیاس:

ئێزدی هندەك جارا دبێژن خدرلیاس و خدر نەبی و هندەك جارا دبێژن خدرلیاس، دو کەسایەتینە لێ ناڤێ وان دگەل ئێك دهێت، ل گۆر بیروباوەرێن ئێزدییان کو د زندینە و دنیایینە وەك د ڤان سەبەڤاندا ژ قەولێ پیر شەرەف هاتی:

**شەرەف دەنگ دکەت ژ ئەساسە**
**فەهمێ من زۆر قیاسە**
**تو خدری ئانی ئەلیاسە؟**
**خدرۆ یا خدری**
**ل بەر هیمەتا قادری**
**ل هەموو جەوابا یێ حازری[٣٥]**

**جهێ وی ل دەڤەرا دێرەبوونێ:**

ئەڤ جهێ پیرۆز ب شێوەیێ قوبەکا بچووك کو بلندیا (١،٥م) هاتییەئاڤاکرن، ب بازنەیێ (١م) قوبێ ب گێچێ و بەران هاتییەئاڤاکرن، دکەڤیتە دناڤبەرا گوندێ باجد میری و باجد کندالا.

**توافا وی:**

ل هەیڤا سباتێ و ل چەژنا خدرالیاس توافا وی دهێتەگێران، خەلك ژ دەڤەرێ قەستا وی جهێ پیرۆز دکەن و لێ تواف دبن و بەشداریێ د رێورەسمێن توافێ دا دکەن.

## سوارێ ب تنێ:

خەلکێ دەڤەرێ هۆسا دزانن کو سوارێ بتنێ ئێزی یە، ژ بەر د ئێزدییاتیێ دا ب تنێ بۆ خودێ دهێتە بکارئینان کو دبێژن خودێ ئێکێ ب تنێ یە. لەورا ژی دبێژن سوارێ بتنێ ئێزی یە [٣٦].

**نیشانگەها سوارێ بتەنێ:**

دکەڤیتە سەرێ گرەکی کویەکی ل ڤونتارا چیایێ داکا یێ کو دکەڤیتە راسەر گوندێ رکاڤا و ئالییێ رۆژهەلاتێ گوند و ژ دۆر ئەڤ نیشانگەهـ ژ بەر بلندییا جهێ وی خویا دکە و ل پەی داخوازییا خەلکێ گوند و ژ بەر نیشانگەهـ رێ چوونا وی یا چەڤا و زەحمەت بوو دەمێ قەستکرن و لێ تواف بوون د رێورەسمەکا ژ هەژیدا و ل پەی رازیبوونا جڤاتا روحانی بەرەك ژوێ نیشانگەهێ راکرن ل نێزیك ئاقدا شێخو بەکر دانان ل ئالییێ ژێری و نیشانگەها سواری بتەنێ ل سەر بنیاتێ وەکو ژوورەکا (٢،٥م×٢،٥م) و بلندیا (٢م) و ب بەران ئاڤاکرن، دکەڤیتە ئالییێ باکوور و د هندرێ نیشانگەهێ دا وەکو قوبەکا بچووك ئانکو نیشانگەهـ و چرایێ نیشانگەهی تێدایە و راسەر دەرگەهێ نیشانگەهێ وەکو شێوەیێ نیڤ بازنەیی و تیرۆژێن رۆژێ ل سەر بەرێ حەلان هاتییەنکراندن و دناڤدا وێنەیێ رۆژێ هاتییەدورستکرن و ل ژێریا وێنەیێ رۆژێ و سەر حەلانەکی ب شێوەیێ لاکێشە هاتییە نڤیسین یا خودێ یا تاووسی مەلەك نیشانگەها سوارێ بتنێ.

## شێخ حەمسی:

ئێکە ژ خاس و چاکێن شێخادی لێ زانیاری ب دەست مە نەکەتنە تاکو بزانن ئەڤ خاس کی یە و خوداوەندی چ یە .

**جهێ وی ل دەڤەرا دنا،**

ئەڤ جهێ وی دکەڤیتە ب رەخ مەزارێ بازیدێ بەستامی ڤە ل ئالییێ باشوور ب شێوەیێ نیشانکەهەکا چوارگۆشە وسەرێ نیشانکەهێ توژ دبت بلنداهییا وی نێزیکی (٢م).

**جهێ وی ل گوندێ جەم حزنێ ،**

ئەڤ جهە دکەڤیتە گوندێ جەم حزنێ یێ سەر ب ناوچا فەیدێ وەکو شکەفتەکێ یە و نیشانا وی وەکو بەرەکی یە ل بەر ڤێ شکەفتی و خەلك پیرۆزیێ د دەنە ڤی جهی.

## شێخ حەراج:

ئێکە ژ چاکێن خودێ و ژ ناڤێ وی دیارە ژ چینا شێخایە. لێ ژ کی چینییە و رۆلێ وی دئێزدیاتییێدا چ بوو ئەڤ زانیارە دەربارەی ڤی خاسی ب دەست مە نەکەتن.

**جهێ وی ل ناوچا فەیدیی ،**

ئەڤ جهـ دکەڤیتە پشت بنکەهێ پۆلیسان ل ناوچا فەیدێ، ب شێوەیێ قوبەکا بچووك هاتییە لێکرن، دیسان ژ هەمی رەخێن دنڤە دکەڤیتە دناڤ مالاندا.

## شەخسێ ناڤا گوند:

ل گۆرەی بیروباوەرێن ئێزدییان هەر جهەکی پیرۆز هەبت و ناڤێ وی شەخس بت ئەو نیشانا سلتان ئێزییە ئانکو ئەڤ جهێ پیرۆز نیشانا سلتان ئیزییە.

**جهێ وی ل دەڤەرا دنا،**

ل گوندێ خانکا کەڤن یێ کو سالا (١٩٨٤)ێ کەتییە بەر ئاڤا سکرێ مووسل، جهێ ڤی شەخسی دناڤا گوندی بوو پشتی خەلکێ گوندی مالێن خوە ل ناڤ ئاقارێ گوندێ زەمینیا ئاڤاکرین و دەرجکێن قوب و نیشانکەهێن خاسا راکرن و ل خانکا نوی ئاڤاکرین، هوسا ب ڤی رەنگی ئەڤ نیشانکەهـ ژی ل بەر مەزاری بازید ل کۆمەلگەها خانکێ ئاڤاکرن و دکەڤیتە نێزیك مەزارێ بۆ قەتار بابا و ب شێوەیی ژوورەکێ (٣م ×٣م) و بلندییا (١.٥) هاتییە ئاڤاکرن. وخەلکی گوند مرییێن زارۆك ل بەر گۆڕ دکەن [٣٧].

## بوقەدار:

ناڤێ ڤی خاسێ دهێتە گۆتن بوقەدار بابا و هندەك دبێژن بوقەتار بابا و ئێك ژ خاسێن ئۆلا ئێزدییایە. بوقەتار بابا ژئالییێ شێخادی ڤە هاتییە حەزکرن و شێخادی ئەو گەلەك مەزن دیتییە لەورا ژی ژێرا گوتی یە:

**تو بخێرهاتی بو قەتاربابا**
**مەزنێ چەندی سحابا** [٣٨]

لێ پتر زانیاری دەست مە نەگەتنە کا بوقەتار بابا ژ چینا شێخایە یان ژ چینا پیرایە و پسێ کی یە (ژبەر کو ب نەرینا من دبت بوقەتار بابا ناسناڤەك بت بۆ خاسەکی).

## شێخ دانو:

ئێکە ژ خاس و چاکێن شێخادی و ژ ناڤێ وی دیارە کو ژ چینا شێخایە، لێ دانو کی یە و ژ کیژ بنەمالێ یان کیژ تایێ شێخایە ئەڤ هاتە زانین.

**جهێ وی ل دەڤەرا دنا،**

دکەڤیتە سەرێ گوزا گوندێ ریبێ ل کویەکێ بلند و راسەر رووبارێ ژ دهۆکێ دهێت و دگەهتە ئاڤا سکرێ مووسل و دیسان دکەڤیتە بەرامبەر گوندێ ریبێ. ئەڤ جهە ب شێوەیێ بازنەیی ب هشکە بەران هاتییەئاڤاکرن و بەرێ دەرجکا وی دکەڤیتە ئالییێ رۆژهەلات و دەمێ خەلك دبەرا دبۆرت لێ تواف دبن.

## شێخ مەقبول (گەمبول)

یان ژی دهێتە گۆتن شێخ کەمبول، چ زانیاری دەربارەی ڤی خاسی ب دەست مەنەکەتن، لێ هندەك بۆچوون هەنە دبێژن نیشانا شێخادییە ژ بەر سەبەقەکا قەولیدا هاتییە و دبێژیت شێخادی

شێخ مەقبولە [٣٩].

مخابن سەبەقا قەول ب تەمامی ب دەست مە نەکەت لەوا ژی گەلەك نێزیك راستیێ یە کو ئەڤ نیشانا شێخادی بت.

**جهێ وی ل دەڤەرا ڤائیدیا:**

شێخ مەقبول نیشانا وی وەکو ئاقد دکەڤیتە سەرێ گرەکێ مەزن ئەو گرێ کو دکەڤیتە رێزا گرێن شێخدرێ ل ئالییێ رۆژهەلات و گرێ نیسکا و گرێ هەسنالکا و گرێ کرەش ل ئالییێ رۆژئاڤا، دیسان دکەڤیتە دناڤبەرا گوندێ رکاڤا ل ئالییێ باکوور و کۆمەلگەها شاریا ل ئالییێ باشوور ب (١کم) بەرێ نیشانگەهێ دکەڤیتە بەر گوندێ رکاڤایێ و بەرامبەر چیایێ داکایێ راسەر گوندێ رکاڤایێ و ئاقد ب حەلان هاتییەئاڤاکرن، ل سەر بنیاتێ وەکو ژوورەکا (٣م ×٣م) و بلندیا ٢(م)، ل راسەری دەرگەهێ ئاقدێ و دناڤ شێوەیێ نیڤ بازنەییدا کو ب تیرۆژەکا رۆژێ هاتییە خەملاندن و وێنەیێ رۆژێ تیدا هاتییە دورستکرن و ل سەر حەلانێ ژێریا وێنەیێ رۆژێ ب شێوەیێ لاکێشەی هاتییە نڤیسین:

**یاخودێ یا تاووسی مەلەك**

**ئاقدا شێخ مەقبول**

## پیر باکوز:

ئێکە ژ ئۆجاخێن پیرانیی و قەنجەکی خودێ یە و خودێ کەرەم دگەل کربوو. لێ زانیاری ل دۆر ڤی بابچاکی ب دەست مەنەکەتن کاکیە و رۆلێ وی دئێزدیاتیێدا چییە.

**جهێ وی ل دەڤەرا ڤائیدیا:**

وەکو نیشانگەهەکێ یە دکەڤیتە سەرێ ملەکی یان گرەکی کو دبێژنێ ملا پیرباکوز، دکەڤیتە دناڤبەرا گوندێ خەرشەنیا و کۆمەلگەها شاریا و گۆرستانەکا گەلەك کەڤن دکەڤیتە دوور ڤی جهێ پیرۆز و خەلکی دەڤەری رێز و بەهایەکی ددەنە ڤی جهی.

## ئێزی:

ل گۆرەیی قەول و بەیت و دوعا و درۆزێن ئێزدییان ئێزی ناڤەکە ژ ناڤێ خودێ وەکو دڤێ سەبەقا قەولیدا هاتی:

**سلتان ئێزی ب خوە پەدشایە**

**هەزار و ئێك ناڤ ل خوە دانایە**

**ناڤێ مەزن هەر خودایە** [٤٠]

گەلەك نیشانگە ژ قوب و ئاقدا ل دەڤەرێن ئێزدییان هەنە دبێژنێ ئەڤ قوبا ئێزییە، ئەڤە ئاقدا ئێزییە یان ئەڤە نیشانگەها ئێزدییە ل ڤێ دەرئایا ئەڤ نیشانگەهـ ژ قوب و ئاقدا و ب ناڤێ ئێزیە ناڤێ خاسەکی ئێزدییان.

**جهێ وی ل دەڤەرا ڤائیدیا:**

وەکو کێلکەکا بەرایە دکەڤیتە ژێریا گوندێ سینا، ل رۆژئاڤایێ جهێ پیرۆزێ شەمسێ پیرا و هەر کەسەکی دبەررا بهورت ل ڤی جهی تواف دبت.

**جهێ وی ل گوندێ دەڤەرا هەویریا:**

هەلبەت هەریەکی ڤی جهی ببینیت ئێدی دێ ژێرا ئاشکەرابت کو ئەڤ جهە ل سەر دەمەکی قوب بوویە، ژبەر پاشماوەیێ بەرا و گێچێ لێ هەنە، لەوا ژی تەنێ ئەو بەر و گێچ هاتییە کۆمکرن و دبێژنێ قوجا ئێزی و هندەك خەلکێ دەڤەرێ دبێژنێ قوجا قول، دکەڤە ناڤبەرا ئاقارێ گوندێ خان تەوەرێ و گوندێ سۆریا ل سەر جهەکێ بلند کو راسەری گوندێ سۆریایە.

**جهێ وی ل چیایێ داکا:**

وەکو شوورهەکێ یە ب شێوەیێ بازنەیی ئاڤاکرییە، سەر دەمەکی دارەك دناڤدابوو، سەردەمێ فەرمانا فەریق عومەر وەهبی پاشا بۆ سەر ئێزدییان (فەریق) ل بن وێ دارێ روونشت و خورتێن ئێزدییان ژ عەگید و بوغ و بەرانا سێدارەدان و سەرێ وان ب وی دارێ ڤە دالقاندن و سەلیم ئێك ژ هۆزا دوملیا بوو، ژ وان بوو یێ سەرێ خوە ل رێیا ئێزی دا لەو سەرێ

بن وێ دارێ بڕين كو هەتا نها حەجرا وێ نێزيك
شوورهێ يە و يا خويايە [٤١]. ئەڤجا زانيارى ب
ـحتى دەستى مە نەكەڤتنە داكو بزانن ئايا ئەو دار
افێ داركا ئێزى بوو ژبەر ئێزديان سەرێ خوە ل رێ
ێزى دا ل بن وێ دارێ و هاتە ناڤكرن ب ناڤێ داركا
ن يان ژێ وەكو نيشانگەها ئێزى يە؟ هەلبەت ب
ـنا سالان و پشتگوهـ ڤەهاڤيتن ئەو دار نەما
ها شوورهە مايە.

**جهێ وى ل گوندێ كەلەبەدرێ :**

وەكو ئاڤدێ يە ل سەر رووبەرێ (٢.٥ م ×٢.٥م)
يە ئاڤاكرن و بلنديا ديوارێ وێ (٢م)[٤٢].

**هەسنالكا:**

هەسن ئال، هەسن ئالك. ئێك ژ هەر چل ئۆجاخێن
نێ يە، بۆچوونەك هەيە كو دبێژن هەسنالكا
ايێ هەسن مەمانە ئانكو ژ بنەمالكێ نە بەلكو
ب بۆچوون نەيا دورستە ژبەر ئەگەر ژ بنەمالكى
زواج دناڤبەرا واندا يا حەلال بوو. چ زانيارێن دن ل
ـر ناڤ و ژيانا ڤى خاسى دەست مە نەكەتن تەنێ
ێتە زانين ئێك ژ خاسێن شێخاديە و شێخادى
رەم دگەل كريوو لەو دڤێ سەبەقا قەول دا هاتيە:

**پير ژ وێڤە تێيە**
**مورا شێخاديەلێ يە**
**كرە پيرێ شێخ مەند و شێخ فەخرى يە**[٤٣] .

و هندەك قەولبێژ ڤێ سەبەقێ ب ڤى رەنگى
ژن:

**ژ وێڤە تێيە ژ وێڤە تێيە**
**هەسنالكا ژ وێڤە تێيە**
**نيشانا شێخادى يە لێ يە**
**كرە پيرى شێخ مەند و شێخ فەخرى يە**[٤٤].

ئاشكەرا دبيت كو هەسنالكا پيرێ ئۆجاخێن
ێخێن شێخ فەخر و شێخ مەندە ديسان دڤێ
ـبەقێ دا ديار دبت هەڤدەمێ شێخادى يە.

**جهێ وى ل دەڤەرا ڤايبديا :**

ب شێوەيێ نيشانگەهێ يە و دكەڤيتە سەرێ گرەكى، ئەڤ گر ژ دۆر خويادكە بەلكو نەگەلەك يێ مەزنە و گر ب ناڤێ گرێ هەسنالكا هاتيە ناڤكرن، گۆڕستانەك كەڤن دكەڤيتە دوور ڤێ نيشانگەهێ، نيشانگەهـ دكەڤيتە نێزيك گوندێ خەرشەنيا و رێزا گرێ شێخ كەمبور (شێخ مەقبول) و گرێ شێخ خدرێ و گرێ نيسكا و گرێ كەرەش و گرێ پان و ئەڤ رێزا گرا دكەڤنە دناڤبەرا چيايێ داكا و چيايێ مەجرمافا (چيايێ زاوا).

## كانى باوى:

هەلبەت ئاڤ ئێكە ژ هەر چوار ئەلەمەتێن ژيانێ وەكو (ئاخ، ئاڤ، باى، ئاگر)، ديسان ل گۆر بير و باوەريێن ئێزدييان ئاڤ ئێكە ژ پێكهاتيێن قالبێ ئادەم پێغەمبەر وەكو دڤێ سەبەقا قەولى دا هاتى:

**كو كنيات پێ زەينى**
**چار قسمەت ئێك هنجينى**
**ئاخە و ئاڤە و بايە ئاگركى**
**قالبێ ئادەم پێخەمبەر پێ نزنى**[٤٥]

هەلبەت ئێزدى پاشماويێن مللەتێن كەڤنن كو بۆ هەر ديارەدەكا سرۆشتى خوداوەندەك دانانە لەوا ژێ ئەڤ كانيە بوويە خوداوەندا ئێشا باويا، لێ زانيارى دەست مە نەكەڤتنە هەتا بزانن كا ئەڤ كانى بۆ كێ خاسى دزفريت.

**جهێ وێ ل دەڤەرا دێرەبوونێ:**

كانى باوى كانيەكا ئاڤێ يە خەلكێ دەڤەرێ و ئێزدى ب گشتى پيرۆزيەكێ ددەنێ. هەلبەت ژ ناڤێ وێ ديار و خويايە كانيا كەسێن باوى يە، ئەوێن ئێشا با د لنگ و چۆكێن واندا و ب باوەريايەكا پاقژ دچنە بەر وێ كانيێ و ئاڤا وێ ژبو ئێشا خۆ ب كاردئينن و دوعا ژ خودێ و خودانێ ڤێ كانيێ دكەن و داخوازا سلامەتيا خۆ ژێ دكەن، ئەڤ كانيە دكەڤيتە ناڤبەرا گوندێ باجد ميرى و گوندێ گەورێنيێ، د دەمەكيدا ئاڤا وێ يا بۆش بوو و دار و بارێن جۆراوجۆر ل دۆر و بەرێن وێ هەبوون، لێ سەر دەمەكيدا و ب سالان دەڤەر مايە چۆلكرى و پويتە پێ نەهاتيەدان لەوا ژێ ئاڤا وێ كێم بوويە و دار و بەرێن وێ نەمانە

هەلبەت هەوبوونا دختور و دەرمانا و دیتنا زانستێن جۆراوجۆر ل سەر ئێشان بەرێ خەلکێ ژڤێ چەندێ کێم کریە لێ هەتا نها ژی خەلکەك قەستا ڤان جهان دکەن[٤٦] .

**جهێ وێ ل دەڤەرا دنا:**

ئەڤ کانییە دکەڤیتە گوندێ رێبیێ و خەلکێ دەڤەرێ ژبۆ چارەسەریا ئێشا با قەست دکەنە بەر ڤێ کانیێ.

## لاوکێ پیرا:

سولبەندێ پیرا یان ژی جارنا ئێزدی دبێژن لاوکێ پیرا ئێك ژ چل ئۆجاخێن پیرانیێ یە ئێك ژ خاسێن شێخادی یە و شێخادی کەرەم دگەل کربوو، ناڤێ وی وەك لاوکێ پیرا دگەلەك قەول و بەیت و قەسیدا دا هاتییە، لێ پسێ کێژ چاکێ خودێیە ئەڤ چەندە نە هاتییەزانین[٤٧].

**جهێ وی ل دەڤەرا قائیدیا:**

وەکو کێلەکا بەرایە و هەر رێڤینگەکێ ئێزدی دبەرا دبۆریت لێ تواف دبت. ئەڤ جهێ پیرۆز ب (٣٠٠م) دکەڤیتە ژێریا گوندێ سینا.

## بابێ هورکا:

نە هاتییەزانین کا کییە، قەنجەکی خودێ یە، خاسەکی شێخادییە، قەلەندەرەکە؟ لێ ژ ناڤ و جهێ وی دیاربت و خەلکێ دەڤەرێ ژی هوسا دزانن کو مرییێن زارۆك ل بەر گۆردکەن کو زارۆك د کجکۆکن، بچووکن، هۆرکۆکن، هورن لەوا دبێژنێ بابێ هورکا و ئێزدی رێزێ لێ دگرن.

**جهێ وی ل دەڤەرا قائیدیا:**

بەرەکی مەزنە و خویادبت کو ل دەمەکی وەکو شوورهەکی دۆر ڤی بەری هەبوویە، دکەڤیتە ژێریا گوندێ سینا نێزیك شەمسێ پیرا و مرییێن زارۆك ل بەر گۆر دکرن و گۆرستان یا خویایە.

## مەم خنوق

هەلبەت جهـ و نیشانا خاسەکی ئێزدییایە و خوداوەندی ئێشا کوخکێ یە، لێ کێژ خاسە نە هاتییەزانین، ژبەر گەلەك خاسێن ئێزدییان پتر ژ دو ناڤان هەبوونە، وەك وەصفەکییە، لێ نیشانگەهەك ل شنگال هەیە دبێژنێ مەم خنوق و یەك ل پەرستگەها لالش هەیە دبێژنێ پیر خنوق، ئەڤە ژی خوداوەندێن ئێشا کوخکێ نە، ل ڤێ دەر دبێژم ئایا (خەند خەندۆك و مەم خنوق و پیر خنوق) هەرسێ ئێکن یان نەی ئەڤە ژی نەیا خویایە لێ پتر نێزیك ئێك دوونە، ژ بەر هەرسێ ژی خوداوەندێ ئێشا کوخکێ نە.

**جهێ وی ل دەڤەرا قائیدیا:**

نیشانگەها خەند خەندۆك وەك شکەفتەکێ یە دکەڤیتە ژووریا گوندێ سینا ل قونتارا چیای، دیسان دکەڤیتە نێزیك بەرێ بەدوکا و دارەکا تاوکێ دکەڤیتە د دەریدا و بەرێ بەر دەرگەهێ شکەفتێ بێ نەقەب کرییە، د بیر و باوەرێن ئێزدییاندا دەمێ ئێشا کوخکێ زارۆکەکی دگرت قەستا ڤی جهێ پیرۆز دکەن و سێ جاران ئەوی زارۆکی دوێ نەقەبێ را دبەن و دئینن و بۆ خۆ دوعا ژێ دکەن ئەو زارۆك ژ وێ کوخکێ ساخ دبتەڤە.

**جهێ وی ل دەڤەرا دنا:**

وەکو تەحتەك یان بەرەکێ مەزنە یێ قولکرییە دکەڤیتە باکوورێ گوندێ خێراڤایێ نێزیکی رووبارێ ژ دهۆك دهێتە سەر سکرێ مووسل، نها ئاڤێ ئەڤ جهە گرتییە [٤٨].

## بەرێ بەدوکا:

نەهاتییە زانین کا ئەڤ نیشانا کێژ خاس و چاکی یە، تەنێ ئێزدی ب گشتی و خەلکێ دەڤەرێ ب تایبەت پیرۆزییەك و رێز و بەهایەکی د دەنێ، دهێتە ناسکرن ب بەرێ بە دوکا.

#### جهێ وی ل دەڤەرا قائیمیدیا:

بەرەکی پیرۆزە دکەڤیتە دەرێ گەلیێ کانیێ، ل جهەکی راست و پان ل ژووریا گوندێ سینا و ل دەمێ تواڤا کەرەجال دهێتە گێران و بشتی ژبەر ئاڤدا کەرەجال دزڤرن ل ڤی جهێ تواف دبن و رێورەسمێن ئێشیکێ ژبەر ڤێ بەری دەست پێدکەن.

## پیر بل:

هەلبەت ژ ناڤێ وی دیارە ژ چینا پیرانیێ بە و ئێکە ژ هەر چل ئۆجاخێن پیرانیێ. لێ نەهاتییە زانین کا پیر بل پیر (بوال)، یان پیر (بوك)ە یان پیر (بوب)ە یانژی ناڤێ وی (پیربل)ە، دناڤ ئێزدییاندا دهێتە زانین کو ئێکە ژ خاسێن شێخادی.

#### جهێ وی ل دەڤەرا قائیدیا:

وەك کۆمەکا بەرایە دکەڤیتە پەسارا چیایێ داکا راسەر گوندێ خەرشەنیا و راسەر گەلیێ کانیێ، دیسان دکەڤیتە بەرامبەر قوبا عەڤدێ رەش و پیرافات ل ئالییێ باشوورڤە، خەلك لێ تواف دبن و بۆ خوە دوعا ژێ دکن و مجێور نینە هەتا کو ب دروستاهی خزمەتا وی بێتەکرن.

## شێخ بوغە:

شێخ بوغە یان شێخ بوخە ب هەردو ناڤان دهێتەناڤکرن، ژ ناڤێ وی دیارە ئەڤ بابچاك ژ چینا شێخایە لێ د دوور ژین و ژیارا وی و رۆلێ وی دئێزدیياتیدا چ زانیاری دەست مەنەکەتن.

#### جهێ وی ل دەڤەرا دنا:

ب شێوەیێ هجری چوارگۆشە بوو ل سەر رووبەری (٣م × ٣م) ب بەران ئاڤاکری بوو، دکەتە سەرێ رزدی ل باشوورێ گوندێ کەبەرتو و ب دووراتییا (٢٠٠م)، حەفت کێلێن بەران دکەتنە ئالییێ رۆژئاڤایێ شێخ بوخە کو دگۆتنێ نیشانکەهێن حەفت کورێن پیری، ئەڤ حەفت کێلێن بەرا ئەو ژی دکەتنە سەر بلندییا رزدی، پشتی حکۆمەتا بەعس عەرەب ل دەور و بەرێن گوندێ کەبەرتوی نیشتەجێکرین ئەڤ جە ژی کەتن بەر نەمانێ [٤٩] .

## شەخسێن پیری:

چ بەلگە ل بەر دەستێن مە نینن یان ژی ئەم ب سەرهلنەبووینە، لێ ل گۆرەی ژێدەرێن دەڤۆکی دهێتەزانین کو ئافرەتەکا ئێزدی خودێ و شێخادی ل سەر دەمێ شێخادیێ دووێ کەرەم دگەل کربوو و مالاوێ ل (باب الحراق) ل مووسلێ بوو، حەفت کورێن عەگید و مێرخاس هەبوون، خودێ و شێخادی سعود و قەوەت دابوویێ و ل دەمێ پاشایێ مووسل بەدرەدین لوئلوئی فەرمانا کوشتنا شێخ حەسەن دەرانی، پیرێ دگۆتە کورێن خوە شیرێ من ل وە نەیێ حەلال بت ئەگەر هوون ژی دژی بەدرەدین رانەبن، دبێژن هەرحەفت کورێن پیری بەرسینگا بریارێن پاشای گرتن و شەر دگەل لەشکەرێ وی کر و گەلەك ژ لەشکەرێن وی کوشتن هەتا کو هەر حەفت هاتنە کوشتن پێخەمەت ئێزدیياتی، هەلبەت ل با شێخادی ئاشکەرا بوو کو حەفت کورێن پیرێ هاتنەکوشتن لەو شێخادی فەرواردا کو ل بەر دەرگەهێ میر ل لالشێ نیشانا حەفت کورێن پیرێ هەبت و چرایێن وان دگەل چرایێن پیرۆزێ لالشێ بێنە هلکرن. ئەڤچا بۆچوون سەر ڤی جهێن پیرۆز هەنە کو ئێك ژڤان جهان یێ پیرێ بت و یێ دن حەفت کورێن پیری بن [٥٠].

#### جهێ وی ل دەڤەرا دنا:

ئەڤ جهێن پیرۆز دکەڤنە راسەر گوندێن زەینیا ل دەڤەرا دوبانێ ئالییێ باکوورێ گوندی، ب شێوەیی بازنەیی هەر دو ب تەنشت ئێك هاتنەئاڤاکرن ب بەران و فەرشێن گێچێ و دەمێ خەلك دبەررا دەرباس دبن ولێ تواف دبن.

## پیر خەلیل:

هەلبەت چ بەلگە ل بەر دەستنین ئەم بزانن ئەڤ قەنجێ خودێ کییە، ژکیژ بنەمالا پێرانییە، پشتی

چەندین پرسیار مە ژ قەولبێژ و خەلکێ دەڤەرێ کرین دیار بوو کو پیر خەلیل پسێ بنەمالەکا پیرانی یە و دەروێشەکی خودێ ناس بوو، خودێ کەرەم دگەل کربوو. هەتا سالێن هەشتییان جهێ وی یێ پیرۆز وەکو هجرەکێ بوو ب فرەهیا (٣- ٤م) ب شێوەیێ بازنەیی، ب هشکەبەران هاتبوو لێکرن، پاشان قوبەك ل سەر جهێ وی هاتیە ئاڤاکرن، سالا (١٩٨٧)ێ ئەڤ قوب ژی بێ بەهر نەبوو ژ هەرفاندنی ب دەستێ رژێما بەعس، پشتی سەرهلدانێ جارەکا دن شوورهەکا بازنەیی دۆری پاشماوەیێ قوبا وی یا هەرفاندی ب بەران لێکرن [٥١].

**جهێ وی ل دەڤەرا دنا:**

ئەڤ جە دکەڤیتە گوندێ سۆرکا دناڤ زەڤیەکێ دا ل ئالییێ باکوورێ گوندی و گۆڕستانەك کەڤن ل دۆر و بەرێن ڤی جهێ پیرۆز هەیە، نها ژی خەلکێ گوند مرێن خوەیێن زارۆك بەر گۆڕ دکەن.

## پیر شێرێ:

هەلبەت ژ ناڤێ وی یێ دیارە ژ چینا پیرایە، ئانکو ئێکە ژ هەرچل ئۆجاخێن پیرانیێ، لێ زانیاری دۆر ژین و ژیارا وی و رۆلێ وی د ئێزدیاتیێ دا دەست مە نەکەتنە [٥٢].

**جهێ وی ل دەڤەرا قاییدیا:**

ئەڤ جە دکەڤیتە ئالییێ رۆژئاڤایێ گوندێ کەلەبەدرێ، دناڤبەرا گوندێ کەلەبەدرێ و گوندێ زاوا، وەك شوورهێ یە ب شێوەیێ بازنەیی ب هشکە بەران یێ ئاڤاکری، گۆڕستانەك گەلەك کەڤن دکەڤیتە دۆر ڤی جهی، لێ مخابن خەلکێ نە ئێزدی بەرێن جهێ وی راکرن و ئێدی پووتە پێ نە هاتەدان.

## پیرێ ب خەلات:

ئێکە ژ ئۆجاخێن پیرانیێ و ژ ناڤێ وی یا دیارە کو خودێ کەرم و خەلات دابوونێ و ئێك ژ قەنجێن خودێ یە، لێ چ بەلگە نینن کا ئەم بزانین یێ کێ یە و کیژ ماوەیی ژیایە.

**جهێ وی ل گوندێ وشتیانێ:**

جهێ وی دکەڤیتە ئاقارێ گوندێ وشتیانێ تەنشت جادا گشتی ئەوا کۆمەلگەها شاریا و باعەدرێ ب هەڤرەگرێدەت. ب خوە قوب بوویە لێ د فەرمانەکێدا هاتییە هەرفاندن، نها ژی دەرگەهێ قوبێ یێ خویایە و جارا دیوارێن وی دیارن لێ زنجێ قوبی هەمی هاتییەخوار ژ ئەنجامێن هەرفاندنێ و گۆڕستانەك مەزن و کەڤن ل دۆر و بەرێن قوبێ هەیە.

## پیر بوب:

ئێکە ژ هەرچل ئۆجاخێن پیرانیێ کو خودێ و شێخادی کەرەم دگەل کربوو، خاسەکی شێخادی یە و بوویە ئیختیاری بەحزانێ و ناڤێ وی دمشوورا خەتی پسی دا هاتییە پیر بوبێ بەحزانی و پیرێ ئێلا رەشکایە.

**جهێ وی ل دەڤەرا قائیدیا:**

وەکو هجرکەکێ یە دکەڤیتە قونتارا چیایێ سینا ل ئالییێ رۆژئاڤا و راسەری گوندێ سینا.

## مەهمەدێ جندار:

ژ بنەمالا شێشمسە، ل گۆرەیی بیروباوەرێن ئێزدییان ئیختیارێ سورا موخفیێ یێ هەر هەفت بابێ جنایە [٥٣].

**جهێ وی ل دەڤەرا دنا:**

ب شێوەیێ ئاقدێ هاتبوو ئاڤاکرن، ل سەر رووبەرێ (٣م × ٣م)، ل نێزیکی گرێ تاسی لەگەلەك ب دووراتییا (٥٠٠م) ل گوندێ خانکا کەڤن، سەر رێکا حەوینگا عەمەر دەلا، دیسا دکەتە بەرامبەرێ گوندێ چەم حزنێ. دیسان ب دووراتییا (٥کم) ژ گوندێ خانکێ. لێ پشتی ئاڤاکرنا سکرێ مووسل ئەڤ جهێ پیرۆز ژی کەفتە دبن ئاڤێ دا، لێ د رێورەسمەك ژ هەژی دا دەرچکا وی راکرن و ل ئاقارێ گوندێ زەینیا ئەڤ مەزار ب ئاوایێ قوب هاتە ئاڤاکرن [٥٤].

**توافا وی:**
سالانە ل وەرزێ بوهارێ رێورەسمێ، توافا وی دهێنە گێران و خەلکێ دەڤەرێ قەستا توافا وی دکەن.

## ئالوبەکر

ئێکە ژ ئۆجاخێن پیرانێ، ناڤێ وی ئالە پسێ بەکرە، ئێك ژ خاس و قەلەندەرێ شێخادی و خوەدێ و شێخادی کەرەم دگەل کریوو.

**جهێ وی ل دەڤەرا دنا:**
جهێ وی دکەڤیتە گوندێ ریبیێ ب شێوەیێ هەڤشییەکی بچووك یێ بازنەیی هاتییە ئاڤاکرن.

## شێخ بل:

ل پەیی بیروباوەرێن ئێزدییان شێخ بل ئامادینە، ژ چینا شێخێن شەمسایە و پسێ شێخ شەمسە، و ئێکە ژ خاس و چاکێن شێخادی، ناڤێ وی دگەلەك قەول و بەیت و قەسیدەیان دا هاتییە و دبێژنێ شێخ بل یان شێخە و بلا. دەما شێخادی ب پەیڤا خوە یا شرین گۆتی:

**شێخە و بلا**
**خوەزیا وی دەرمانێ دلا** [٥٥]

دیسان دهێتە زانین کو شێخ بل خوداوەندێ ئێشا زکی یە. هەتا نها ژی بابێ گاڤان کو پلەیەکا دینی یە د ئێزدییاتیێ دا دڤێت ژ بنەمالا شێخێن ئامادینا بت.

**جهێ وی ل دەڤەرا قایدییا**
ب شێوەیێ هەڤشییەکی بچووك و بازنەیی و ب بەران هاتییە ئاڤاکرن، دکەڤتە دناڤا گوندێ شاریادا ل ئالییێ باکوور[٥٦].

## ستیا ئێس:

ماکا شێخادی یە، خودێ کەرەمەك مەزن دابوویێ و دبێژنێ: ستیا ئێس یان ست ئێس، ژ بەر کو ژنەکا روومەت مەزن و بلند و قەدرگران بوو.

**جهێ وێ ل دەڤەرا قایدییا:**
خەلکێ دەڤەرێ دبێژنە ڤی جهی دارا ستیا ئێس وەکو شوورهەکێ یە و ب بەران ب شێوەیەکی بازنەیی هاتیبەئاڤاکرن، لێ ل ڤێ داویێ ژوورەك ل سەر وی جهی هاتە ئاڤاکرن و گۆڕستانەك مەزن و کەڤن دکەڤیتە دەوروبەرێن پیرۆز و نها ژی خەلکێ گوندێ شاریا مریێ خوە ل بەر ڤی جهی گۆر دکەن[٥٧].

## فەرهەنگۆک

١- مەرەبی: پلەیەکا دینییە و ژ هەرسێ چینا دبن مەرەبی وەکو چینا شێخا چینا پیرا چینا مریدا

چینا شێخا: شێخو بەکر، شێخ مەهمەدێ باتنی.

چینا پیرا: ئومر خالا، هسن مەمان، هاجیال، موهمدی بۆز.

چینا مریدا: تەنێ ئۆجاخەك دونە کو دبێژنێ فەقیرێ ب خەرقە.

٢- چرا: فتیلەکە ژ پەمبۆ دهێتە چێکرن و ب زەیتێ و ل هەمی ئێڤارێن چوارشەما و ئەینییا بەر قوب و ئاقد و نیشاگەهێن خاس و باب چاکا و ل مالێن خودان ئۆجاخ ل بەر ستێرکێن خودانان دهێتە هەلکرن ب دەستێ مجیورا ئەڤەژی رامانا وێ چەندێ دیار دکەت کو هەلکرنا ڤان چرایان زیندی و هەبوونا خاس و باب چاکایە و بیرئانینا وانە و هیڤی و داخوازا ژوان خاسان دکەن داکو ئەو خاس ل دیوانا خودێ دوعایێن وان قەبول بکەن.

٣- نیشانگەه: ئەو جهێ هاتی نیشانکرن بۆ خاسەکی ل دەمەکی سەرا وی جهی دایە

٤- هەجرك: گەلەك ژ وان ب شێوەیێ بازنەیی ب بەران هاتنەئاڤاکرن و گەلەك ب شێوەیێ چوارگوشێ هاتنەئاڤاکرن و بەلکو بلندیا وان نەگەلەکە و گەلەك ژ ڤان هەجرکان گۆر تێدانە و هەجرك ل دۆر ڤی گۆڕی یان ل دۆر ڤی جهی هاتینە دانان داکو کەس ب پێیان نێزیکی وی جهێ پیرۆز نەبت و ئەو هەجرك بۆ خاسەکی یان قەنجەکی خودێ

دزڤرت.

٥- هەڤشی: ب شێوەیەکێ بازنەیی هاتیەئاڤاکرن و بێ مەزنە وەکی هەڤشیێ مەمێ شڤان ل کۆمەلگەها خانکێ و جارنا ژی هەفشی بۆ پەزی دهێتە بکارئینان.

٦- تواف: بیرەوەریێن خاس و باب چاکانە و رێورەسمێن تایبەت ل رۆژێن توافا دهێنەگێران کو گوهۆرینا پەریێ هلێلی و سوارکرنا پەریا و چێکرنا سماتێ دیسان تواف بون و خوە تەوادن بۆ بەر دەرجکێن نیشانگەهێن وان خاسا و هیڤی و داخوازینە.

٧- ئوغلەمە: ئێزدی دبێژنێ هەلکەفت و جەژنێن خاسا ئوغلەمە وەکی تواف و جەژن و داوەنەبی و سووندێ پێ دخۆن و دبێژن ب ڤێ ئوغلەما خاسا ئانکو بڤێ رۆژا پیرۆز.

٨- سمات: زادەکێ تایبەتە مجێورێن خاسا ل رۆژێن جەژن و هەلکەفتان چێدکەن، پیکدهێت ژ دانێ قوتای و زەیت وگوشتێ نەدراوی خاسی یی سەمات ل رۆژا هەلکەفتا وی هاتی چێکرن و ئەو خەلکێن ئامادەبووی ل وی جهی دڤێت ژ وێ سەماتێ تام بکەت و بخۆت ژبەرکو پیرۆزیەك پێ دهیتە دان.

٩- خاس: کەسێن تایبەتن ل با خودێ، قەنجێن خودێنە.

١٠- مجێور: کەسەکە، مرۆڤەکە وەکی خلمەتکارەکی رادبت ب خزمەتا جهێ خاسەکی و هەلکرنا چرایێ وی خاسی ل رۆژا چوارشەمب و ئەینییا و گۆتنا دوعا و دروزا ل رۆژێن جەژن و هەلکەفتان ل بەر دەرجکا وی خاسی.

١١- بابچاك: کەسانێن ئۆلینە و چاکێن خودێنە، قەنجێن خودێنە.

١٢- قەلەندەر: کەسانێن ئۆلینە و خوە بۆ عیبادتێ و رێیا خودێ شکاندنە، یێن خوە دۆرکرین ژ خۆشی و لەڤزەتێن دنێ.

١٣- زێو: جهێن پیرۆزن دئێزدیاتیێ دا، ناڤێن وان د دروزا خاسادا هاتیە ل پێ لالش و مەهدەرێ دهێن و نیشانین خاس و هەمی بابچاکا لی هەنە وئێزدییان حەفت زیو هەنە.

١٤- قوب: ئێکە ژ جهێن پیرۆزێن ئێزدییان کو ژ هەشت پێکهاتەییا پێکدهێت، هەر پێکهاتییەکێ فەلسەفا خۆ یا تایبەت ب ئایینێ ئێزدییان وسروشتی ڤە هەیە، وەکو چوارگوشا بنیات، هەشت لایەن، شێوەیێ بازنەیی، زەنجێن قوبێ، تاری رۆژێ...هتد.

١٥- توبەرك، ئاخ، خوەلی، توربە: هندەکا ئاخێیە مجێور ل بەر دەرجکێن خاسا رادکن و ددەنە خەلکەکی ل دەمێ قەست دکەنە وان جهێن پیرۆز ب مەرەما هیڤی و داخوازیا و ساخبوون ژ ئێشان.

## ژێدەر:


١. داود مراد ختاري، معبد لالش و المراسيم الدينية الايزيدية، بغداد ٢٠١١.

٢. کوڤان رێسان حسن بەستامی (کوڤان خانکی) ژ سۆفیزما ئێزدییان بازیدێ بەستامی، ژوەشانین دەستەیا بلندا بنکەهێ لالش-٢٧چاپا ئێکێ ٢٠١٤.

٣. رێسان حسن جندی وەرگێران ژ عەرەبی کوڤان خانکی، بازیدێ بەستامی یی ئختیار ل جەم ئێزدییان چاپا ئێکێ٢٠١٣.

٤. سعید خەلیل عەسکەر، شکەستێن پەرستگەها لالش بابا چاویش وەك نموونە، ژ وەشانین ریڤەبەریا گشتی یا کاروبارین ئێزدییان، ٢٠١١..

٥. عزالدين سليم باقسري، مەرگەهـ من منشورات مركز لالش الثقافي و الاجتماعي-دهوك، ٢٠٠٣.

٦. حەسۆ هورمی، پەرستگەها لالش، دهۆك-کوردستان، ٢٠٠٠..

# هەبوونا مەسیحییان ل دەڤەرا دهوکێ

**یاساناس: ئەفرام فەزیل ئەلبەهرو**
**وەرگێران: خالد سالح**

دەڤەرا (نوهەدرا - دهوك) دیرۆکەکا کەڤن هەیە، پەرتووکێن دیرۆکی دیار دکەن کو ئەو دەڤەر دناڤ ئیمبراتۆریا ئاشووری دابوو، ب بەلگەیا هەبوونا پەیکەر و شوینوارێن ئاشووری و ڤەدیتنا گەلەك پارچێن شوینوارێن کەڤن ل دەڤەرێن جوداێن دهوکێ و دبیت دپاشەرۆژێ دا ئەگەر لایەنێن تایبەتمەند و نەمازە رێڤەبەریا شوینواران بخۆ ب کارێن ڤەکۆلین و لێگەریانان رابیت دێ گەلەك ژ شوینوارێن دی یێن پر بها کو د ناڤ ئاخا نوهەدرا د ڤەشارتی هێنە دیتن و ئەڤ چەندە ژی نە مولکێ کەسەکێنە، بەلکی مولکێ شارستانییەتا وێ مرۆڤایەتیێ یە کو ل وەلاتێ دۆلا ناڤبەرا دو رووباراندا پەیدابووی و دڤێت ژ لایێ رێکخراوێن تایبەتمەندڤە وەکی کەلەپۆرێ جیهانی بێنە دەستنیشانکرن.

مەسیحییەت هەر ژ سەدسالیا ئێکێ ل دەڤەرا دهوکێ یێ بەربەلاڤبووی. ئەگەر ئەم بچینە د ناڤ پەرتووکێن دیرۆکی دا دێ بۆ مە گەلەك پێزانینێن پر بها دیارین وێ چەندێ پشتراستدکەن کو مەسیحییەت هەر ژ سەدسالیا ئێکێ زایینی یێ گەهشتیە دەڤەرێ دا و بیث نوهەدرا ناڤەندەکا مەسیحیا یا گرنگ بوو، ل دووڤ گۆتنا نڤیسەرێ (مەسیحییەت ل کوردستانێ ل دووماهیا سەدسالیا ئێکێ و دەستپێکا سەدسالیا دووێ زایینی ل دووڤ هزروبیرێن کەنیسێ و نڤیسەرێن وێ یا بەلاڤبووی و ل دووڤ هزروبیرێن رۆژهەلاتناس و زانایێن ئەوروپی کو د تایبەتمەند ب زمانێن سریانی ڤە ئەو ل سەدسالیا سیێ یێ بەلاڤبووی)[1]. یا ئەم دبینین کو نڤیسەرێن ژیاننامێ شەهیدێن رۆژهەلاتی ئاماژێ ددەنە وێ چەندێ کو مەسیحی یێن تووشی تەپەسەریا چلینی بووین، کو فارسان ل سەرەتایا سالا (٣٣٩زایینی) دەستپێکری و ل سالا (٣٧٩ زایینی) ب دووماهی هاتی، و شەهیدێ (تەوبائی) مارایث ئالاهایێ نوهەدری دەمێ ل سالا (٣٧٦) گرتین ژێ وی شێست سال بوون و ئەو بخۆ شەماشە بوو، هەروەسان خویندکارەك ژی بوو ل خواندنگەهەکا ب ناڤ و دەنگ ل نوهەدرا و پشتی دادگەهکرنەکێ حوکمێ سێدارەدانێ کەتە سەر و ئینانە بازێرکێ وی نوهەدرا (دەڤەرا دستجرد - جهێ دهوکا نوی) و مەسیحی نەچارکرن بەرباران بکەن[2]. ئەڤە بەلگەیە کو مەسیحی ب کێماسی بەری سەدسالیا سیێ یێ زایینی ل دهوکێ هەبوون چونکی ئیث ئالاهایێ نوهەدری یێ ل سالا (٣١٥زایینی) ژخێزانەکا مەسیحی ژدایکبووی، سەرەرای ڤێ چەندێ ژێدەرێن دیرۆکی وێ چەندێ پشتراست دکەن کو دەڤەرا معلثای[3]

بارەگایێ کورسییا ئسقفی بوو و (گوندێ معلثا - معلاثایا ببوو ناڤەندا کەرتێ بانوهەدرا ...و ناڤێ ئوسقفێن وان ب کێماسی هەر ژ سالا ٤١٠زایینی و هەتا سالا ١٢٦٥زایینی د توومارکرینە[٤].

خەلکێ دهۆکێ یێن کەڤن ل سەر دەستێ قەشە گورگیس کورێ یوحانایێ ئەلقۆشی و ب هاریکاریا شاندێ (الاباء) دومنیکی کو (الاب ایبولدو صولدینی) ب رێڤەدبر و بوونە کاسولیك، پشتی کو هەمی ل سەر رێبازا نستۆریا بوون کو وی دەمی ل دەڤەرێ یا بەربەلاڤبوو.

ل سالا(١٧٥٣)ێ مەتران عەمانوئێل بابیە سەرەدانا دەڤەرێ کر و ژ وێ ژی دهۆکێ و ئاماژێ ددەتە وێ چەندێ کو (٣٠) خێزانێن کلدانیێن کاسولیك لێ هەنە و دێرەکا تایبەت ب وانڤە هەیە کو کاهنەك ب خزمەتا وێ رادبیت[٥].

دیسان (گەرۆکێ فەرەنسی ریتر دبێژیت هەژمارا خێزانێن مەسیحیێن کاسولیك ل دهۆکێ ل سالا (١٧٤٧)ێ نێزیکی ٣٠ خێزانانن)[٦].

ل ئامارەکا ئەبرەشییا کلدانی کو رەحمەتی ئەلخوری یوسف تفنکچی ل سالا (١٩١٣)ێ پێ رابووی، ئاماژێ ددەتە وێ چەندێ کو هەژمارا مەسیحیان ل دهۆکێ د گەهنە (٣٥٠) کەسان و هەمی ژی کلدانیێن کاسولیکن و زمانێ وان کلدانییە و دو کاهن و کەنیسەك و خواندنگەهەك لێ هەنە.

د ئامارەکا دی دا کو کەنیسا کلدانی ل سالا (١٩٥٠)ێ پێ رابووی، ئاماژێ ددەتە وێ چەندێ کو هەژمارا کلدانیان ل دهۆکێ دگەهنە (٥٢٠) کەسان و وان دو قەشە و کەنیسەك هەنە[٧].

ل دەستپێکا سەدسالیا بیستێ ب سەدان خێزانێن ئاسوریان گوندێن خۆ ل ترکیا بەردان و هاتنە دهۆکێ و ل سەر گەلەك گوند و دەڤەرێن دهۆکێ بەلاڤەبوون، ژ وانان بۆ نموونە تاخێ سۆرایێ (برایەتی) و تاخێ (گرێ باسێ) و تاخێ (شێلێ)، (و ئامارەك ئاماژێ ددەتە وێ چەندێ کو هەژمارا خێزانان ل سالێن سیهان ژ چەرخێ بووری د بازێرێ دهۆکێ دا نێزیکی (٤٢٠) خێزانانە و د بەلاڤەکرینە ل سەر شەش تاخان ب ڤی رەنگی:

٢٥٠ خێزانێن موسلمان ل تاخێن (شێخ محەمەد، بازاری *، شێلێ، سەرای)دئاکنجینە.

١٠٠ خێزانێن مەسیحی ل تاخێن(برایەتی- سۆرایێ، بازاری، گرێ باسێ) د ئاکنجینە.

٧٠ خێزانێن جوی ل تاخێن (برایەتی و گرێ باسێ) د ئاکنجینە.

هەژمارا خەلکێ بازێرێ دهۆکێ د وی دەمی دا نێزیکی (٢٤٠٠- ٣٠٠٠) کەسان بوون و ئامارا سالا (١٩٤٧)ێ ئاماژێ ددەتە وێ چەندێ کو هەژمارا مەسیحیێن ل تاخێ (نصاری- سۆرایێ) *(٧٤٢) کەسن و ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ هەژمارا وان (٨٦٣) کەس بوون و ل ئامارا سالا (١٩٧٧)ێ هەژمارا وان گەهشتە (١٥٤٣) کەسان، هەر وەسان ئامارا سالا (١٩٧٧)ێ دەستنیشان دکەت کو هەژمارا ئاڤاهیێن ئاکنجیبوونێ ل تاخی (١٤٧) ئاڤاهینە و هەژمارا خێزانان (٢٤٢) خێزانن [٨].

هەژی گۆتنێ یە کو ئەڤ ئامارێن ل سەری ئاماژە پێ هاتییەدان ب تنێ د تایبەت بوون ب وان مەسیحیێن ل تاخێ سۆرایێ (برایەتی) دژیان، چونکی هندە مەسیحی ل هندە تاخێن دی ژی، مینا تاخێ گرێ باسێ و تاخێ شێلێ هەبوون. دیرۆکنڤیسێ عیراقی (عەبدولرەزاق ئەلحوسەینی) دبێژیت: (هەژمارا خەلکێ دهۆکێ ل سالا (١٩٤٧)ێ نێزیکی ٣٥٠٠ کەسان بوون، دوسێکێن وان کورد بوون و سێکەك مەسیحی بوون)[٩].

هەژی گۆتنێ یە کو هاتنا مەسیحییەتێ بۆ دەڤەرا دهۆکێ هەر ژ سەدسالێن ئێکێ یێن زایینی ل سەر دەستێن پەیامبەران ژ وانان (مار توماێ پەیامبەر) و (مار ئەدی) و (مار ماری)، هۆیەك بوو بۆ بەلاڤبوونا دێرێن مەسیحییەتێ ل دەڤەرێ ب رەنگەکێ بەرفرەهـ، لێ پتریا وان تووشی کاڤلکرنێ بوون ل سەر دەستێن فارس و ئوسمانییان و مەسیحییەت یا شیای خۆ ل بەرامبەر ڤان هێرشان رابگریت و پشتی هینگێ ئەو حوکمەتێن ل دووڤ هاتین و هەتا ئەڤرۆ پویتە یێن پێ دایین، و نهو هەژمارا دێرێن مەسیحییان ل پارێزگەها دهۆکێ ب هەمی تا و رێبازێن خۆڤە دگەهنە نێزیکی (١٠٨) کەنیسەیێن مەزن و بچویك و ئەو د بەربەلاڤەنە ل دهۆکێ و گوندێن سەر ب پارێزگەهێ ڤە و نهو هاریکاری و پالپشتی ژلایێ حوکمەتا هەرێمێ ڤە درێکا رێڤەبەریا ئەوقاف و کاروبارێن مەسیحییان ل هەرێمێ بۆ دهێتەکرن، هەر

أ- کەنیسا (انتقال یا مریم العذراء) یا کلدانییان:



وەسان مەسیحی رێورەسمێن خۆ یێن ئایینی ئازادانە دگێرن، و ب ئاشتی و تەناهی د هەرێما کوردستانا خۆشتڤی دا دژین.

ل ڤێرە ئەم دگەهینە ئارمانجەکێ کو مەسیحییەت ل سەدسالییا ئێکێ یێ زابینی ل دەڤەرا دهۆکێ یێ بەلاڤبووی و گەلەك ژێدەرێن دیرۆکی وێ چەندێ پشتراست دکەن کو مەسیحی د کەڤندا ل دهۆکێ هەبووینە، و یێن شیاین خۆ دگەل وان مللەتێن هاتینە دهۆکێ ب گونجینن و ب تەناهی و هاریکاری و گیانێ لێبوورینێ ب هەڤرا بژین.

## تاخێ سۆرایێ (نصاری - برایەتی)
## کورتییەك ل سەر جهـ و دیرۆکا وێ:

تاخێ سۆرایێ - مەبەست ژێ مەسیحی نە - د کەڤیتە وێ دەڤەرا هەتا ئاستەکی نزم (هەڤبەر دگەل تاخ و رەندەکێن دی) ل لایێ رۆژهەلاتی ژ رووبارێ دهۆکێ، و پاشی بۆ لایێ رۆژهەلاتیڤە و دگەلدا بۆ لایێ باشووری رۆژهەلاتی ل وی جهێ ب (کەندال) دهێتە نیاسن دچیت، کو دکەڤیتە هنداڤی باغ و رووبارێ دهۆکێ و ل ویرێ پیچەکێ بلند دبیت و تا نهو ژی هندەك ژ وان خانییێن ل دەڤەرا کەندالی یێن ماین و گەلەك د کەڤنن و تاخێ سۆرایێ ژ تاخێن کەڤنێن ئاکنجیبوونێ یە ل دهۆکێ و د.هاشم خوزەبیر الجنابی وێ چەندێ پشتراستدکەت و دبێژیت: تاخێ برایەتی (ژ کەڤنترین تاخێن بازێری یە و هەژمارا خانیێن ئاکنجیبوونێ ل دووڤ ئامارێن موختارێ تاخی ل سالا (١٩٨٥)ێ نێزیکی ٣٠٠ خانییانە و ل دووڤ شێوازێن ئاڤاهیێن کەڤن ل لایێ یێ رۆژهەلاتی ل جهەکێ بلند - مەبەست ژێ کەندالایە- هەڤبەرکرن د گەل ئاستێ تاخی یێ نزم ل لایێن وێ یێن رۆژئاڤایی و باشوور و باکوور یێن هاتینە ئاڤاکرن و ئەو جهـ دکەڤیتە هنداڤی جهەکێ نزمێ چیایی ژ رووبار و باغچێن دهۆکێ.

ئەڤ تاخە هەتا دەستپێکا سالێن حەفتیان ژ سەدسالییا بووری ب ناڤێ تاخێ (نصاری - فەلا) د هاتە نیاسین و ئەڤ ناڤە ب فەرمی ل سەر هاتییە دانان، و پشتی دهۆك ل ١٩٦٩/٥/٢٧ێ بوویە پارێزگەهـ و د دووڤـرا پێکهاتنا ل ١١ئـادارا ١٩٧٠ێ هاتییە

راگەهاندن، ناڤێ تاخی بۆ برایەتی كو تا نهو ژی هەر ئەو ناڤ مایە، هەر چەند نهو كێم خانی لێ ماینە و خانیێن وێ هەتا دەستپێكا سالێن حەفتیان ل رەخ و روبێن كەنیسەیێ بوون، لێ ژ بەر ڤەكرنا جەهدان ددەستپێكا سالێن حەفتیان و گوهۆرینا دیزاینا باژێری، دەست ب سەرداگرتنا پتریا خانیێن تاخی و خێزانێن مەسیحی ل سەر تاخێن جوداێن باژێری بەلاڤەبوون و ب تنێ چەند خانیێن كێم ژێ ماینە.

## جهێن دیار و بەرنیاس ل تاخی:

ژ دیارترین ئەو جهێن بەرنیاس كو ل تاخی هەبوون ئەڤەنە:

**أ- كەنیسا (انتقال یا مریم العذراء) یا كلدانییان،** ئەڤ كەنیسە تا نهو یا بەرچاڤە.

چونكی مەسیحی ل پێش سەدسالیا چوارێ ل ڤی گوندی هەبوون ئەڤە وێ چەندێ دگەهینت كو وان كەنیسەك هەبوویە، لێ ئەم د پشتراست نینین كا كەنگی یەكەم كەنیسە ل دهۆكێ هاتییە ئاڤاكرن ژ بلی ئەوا ب ناڤێ مار گورگیس هاتی، كو د پەراوێزا دەستنڤیسا ئنجیلەكا نڤیسی دا ل جزیرا بۆتان دا هاتی، كو ب دەستێ قەشە ئەوراها هاتییە نڤیسین و جهێ وێ ل سالا (١٥٩٩)ێ دكەتە بەرامبەری مزگەفتا (جامعا) مەزن، دیسان ناڤێ كەنیسەكا دی ل دهۆكێ ب ناڤێ (مریم العذراء) یێ هاتی، كو ل سالا ١٦٣٥ێ د كەتە جهێ كەنیسا (انتقال) یا نهو، و ل سالا (١٨٥٠)ێ مەسیحییان كەنیسا دهۆك ئاڤاكرن[10].

باژێرێ دهۆكێ پشكەك بوو ژ كەرتێ بەرفرەهێ ئایینێ بەرنیاس ب ناڤێ (بنوهەدرا) و ل ژێر دەستەلاتا ئوسقفیا معلثایا بوو كو د كەڤیتە نێزیكی دهۆكێ، و دو كەنیسە لێ هەبوون، ئەو ژی ب ناڤێن كەنیسا (القدیس جورج)، كو مەبەست ژێ كەنیسا مار گورگیسە و كەنیسا (مریم العذراء)، كو گەلەكا ب ناڤ و دەنگ و كەڤنە و دەستنڤیسا (هكسامیرون) یا پربها هەبوو، كو دیرۆكا وێ ڤەدگەرێتەڤە سالا (١٧٠١)ێ و تا نهو یا ل باژێرێ كامبریدج ل بریتانیا پاراستییە... و كەنیسا مریەم العذراء ل سالێن شێستان پەرتووكخانەكا گرنگ هەبوو، پێكهاتی بوو ژ (٥٠) بەرگان، یا ژ هەمیان كەڤنتر دیرۆكا وێ ڤەدگەرێتەڤە سالا (١٧٤١)ێ، هەر وەسان ددەمەكێ دەستنیشان كری دا، دەستنڤیسێن كەنیسا مار زەیا ل معلثایا دناڤ خۆدا د گرت، ژ وانان دەستنڤیسا رێبازا ئنجیلێ (طقس الانجیل) یا ناڤدار كو ب خۆشنڤیسیا (اسطرنجیلی) هاتییە نڤیسین[11].

سەبارەت وێ كەنیسا ل سالا (١٨٥٠)ێ هاتییە ئاڤاكرن، كو هەتا نهو هندەك ژێ مای و دكەڤیتە مەیدانكا كەنیسا انتقال یا نهو، هێشتا كڤانێن (المذبح) سەرەكی و هەردوو (مذبح)ێن رەخا ل بەرچاڤ دیارن و ل سالا (١٩٤٨)ێ دچاخێ مەتران (مار یوحەنا نیسان) و ددەمێ خزمەتا (الاب الخوری یوسف بەهرو) خزمەتا وێ دكر، ئەو كەنیسە ژ لایێ خەلكێ دهۆكێ و ل سەر دراڤێن خۆ یێن تایبەت هاتییە نویژەنكرن و بەرفرەهكرن.

ل سالا (١٩٧٧)ێ ددەمێ رەحمەتی (اب ئوغسطین صادق دهۆكی) خزمەتا وێ دكر هندە دیوارێن وێ یێن ژ ناڤدا و ژ دەرڤە و دگەل بانێ وێ نویژەنكرنەڤە و ئەردێ وێ ب بەرێ مەرمەری هاتە رائێخستن و هێشتا ئەو كەنیسە یا دیارە و د كەڤیتە لایێ رۆژهەلاتی ژ پرا شۆرش و ل رۆژێن تایبەت و د هندە هەلكەفتاندا نڤێژ تێدا دهێنە كرن، و گەلەك قەشان خزمەتا وێ یا كری، ئەم شیاین ناڤێن ئەوێن هەر ژ ناڤەراستا سەدسالیا نۆزدێ خزمەت لێ كرین بنیاسین، كو ئەو ناڤ ژ تۆمارا (عماد الطنیسە) كو ل سالا (١٨٧٥)ێ دەست ب ڤەكرنا وێ كرین هاتینە وەرگرتن و ژ گرنگترین ناڤێن قەشێن دهۆكی ئەڤێن ل خوارێ دیاركرینە:

الاب حەنا ئیسحاق ئەلبرویی، الاب یوسف میخو دهۆكی، ئەلخوری یوسف بەهرو، قەشە شلیمون دهۆكی، قەشە ئوغستین سادق، قەشە یەعقوب ئەلنەجار، قەشە یوسف یاقو توما حەنا بەدێ. دیسان هندەك قەشێن دی خزمەتا وان یا كری، ژ وانان ئەلخوری حەنا پولس مەرقوس و قەشە فەرەنسیس

ئەلیشوران، و قەشە جەمیل نیسان ئەلسەناتی و قەشە گوریال ئەبونا و قەشە دکتور یوسف حەبی، و قەشە جونی داود حەنا و ییێن دی.

ب- مزگەفتا (جامعا) مەزن: کو ئەو ژی یا مەسیحییان بوو هێشتا یا مای و ل بەرێ ل بن ناڤێ (دێرا مار گورگیس) بوو (د دەمێ خۆ دا بۆ برایێن خۆ یێن موسلمان دەست ژێ بەردای بووین، و بیرا گەلەك سالخۆران د هێت کو دێرا مارگورگیس بیرەکا ئاڤێ تێدا هەبوو).

ج- کنیشتە (کۆمەلگەها جوییان): جوییان دو کۆمەلگەهـ (کنیشتە) هەبوون، یا ئێکێ د کەتە ل لایێ باکووری ژ نێزیکی کەنیسا (الانتقال) و یا دووێ د کەتە پشت خواندنگەها (الطاهرة الاهلية) دا، پشتی جوی ل دووماهیا سالێن چلان و دەستپێکا سالێن پێنجیان چووینە فەلەستینێ پشکێن مەزن ژ کۆمەلگەها ئێکێ هەرفتن و د سالێن حەفتییان دا کەتە سەر وێ جەهدا سەرەکییا هاتییە برین کو دکەتە بەرامبەر دەرمانخانا (الشفاء)ا نهو، لێ کۆمەلگەها دهۆکێ هەتا ناڤەراستا سالێن هەشتییان مابوو و بۆ کارێن ئاکنجیبوونێ د هاتە بکارهینان و پشتی هینگێ بۆ مولکێ خەلکی.

د- خواندنگەها الطاهرە یا ئەهلی یا کلدانییان: کو ئاڤاهیێ وێ ل سالا (١٩٥٧)ێ هاتییە ئاڤاکرن و پشتی هینگێ بۆ بارەگایێ یانا نوهەدرا یا کۆمەلایەتی و مولکێ وی ئاڤاهی یێ وەقفا کەنیسا کلدانییا دهۆکێ یە.

خواندنگەها الطاهرە یا ئەهلی یا کلدانییان دهێتە هەژمارتن یەکەم خواندنگەها ئەهلی کو ل باژێرێ دهۆکێ و ب تایبەت ل تاخێ سۆرایێ هاتییە ڤەکرن و هەتا ڤی دەمی چ خواندنگەهێن ئەهلی یێن فەرمی نەبوون، ل سالا (١٩٣١)ێ، ئەلخوری یوسف بەهرو داخوازەك پێشکێشی وەزارەتا زانیاری (المعارف - نهو وەزارەتا پەروەردێ یە) یا عیراقی کر، کو مۆلەتا ڤەکرنا خواندنگەهەکا ئەهلی ل ژێر ناڤێ (خواندنگەها الطاهرە یا ئەهلییا کلدانییان) ب دەنێ، و رازێ بوونا وەزارەتێ ل سەر وێ چەندێ دەرکەت کو مۆلەتێ ب دەنە ئەلخوری یوسف بەهرو ب ڤەکرنا وێ خواندنگەهێ.

## ژێدەر:


١. الدكتور فرست مرعي، گوتارەکە ل گوڤارا (قالا کلدایا)، ژ ١٥- سالا ٢٠٠٥، بپ ١٠.

٢. الاب الدكتور البير ابونا، شهداء المشرق، ج١.

٣. معلثای یان (مالطایێ) گوندەکێ کەڤنە د کەڤیتە دووراتییا (٧کم) ژ رۆژئاڤایێ باژێرێ دهۆکێ ل سەر وێ رێکا دچیتە مووسل و پەیڤا (معلثا – معلثایا) پەیڤەکا ئارامییە ب واتایا (دەرگەهـ یان جهێ دەربازبوونێ) و دبێژن کو ئەو گوندێ (مالیاتی) یێ ئاشووری بوو.

٤. الاب الدكتور البير ابونا، كتاب الرؤساء، توما المرجي، ص ٦٠.

٥. الاب يعقوب النجار، گۆتارەکە ل کۆڤارا (قالا کلدایا)، ژمارە/ ٤، سالا ١٩٩٩، بث ٢٤.

٦. جميل محمد مصطفى، دهوك في اواسط القرن العشرين، ٢٠١٣، ص ١٦٦.

٧. المطران اندراوس صنا، گوتارەکە ل گۆڤارا (نجم المشرق) ژمارە ٨، ١٩٩٦.

* ب ناڤێ سویکێ ناڤدارە.

* ل ناڤخۆ ب تاخێ فەلا ناڤدارە.

٨. الدكتور هاشم خضير الجنابي، مدينة دهوك، ١٩٨٥، ص ٤٦.

٩. عبدالرزاق الحسيني، العراق قديما وحديثا، ١٩٥٦، ص ٢٥٧.

١٠. جميل محمد مصطفى، هەمان ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٦٥.

١١. افرام عيسى يوسف، المدن الزاهية في بلاد الرافدين العليا، ٢٠١٣، ص ١٥٩.

# دێر ل پارێزگەها دهۆكێ (نوهەدرا)

هژمارەكا دێرێن كەڤن و دیرۆكی ل پارێزگەها دهۆكێ هەنە، ب درێژیا چەرخێن چوویی هەر ژ سەدسالییا چوارێ زایینی هەتا نها ڤان دێران پشكداری د پێشڤەبرنا ئەدەبیات و زانست و هونەراندا كریە، د ڤێ ڤەكۆلینێدا دێ بزاڤێ كەین گرنگترین ڤان دێران بدەینە نیاسین:

**بنیامێن حەداد**
**وەرگێران: موسەدەق تۆڤی**

## دێرا بەرانی (مار ایثالاها)[1]

د سەدسالییا حەفتێدا و د ژیاننامە ئیشو عەیاب دامەزرێنەرێ دێرا مار یاقوی ئاماژە ب ناڤێ ڤێ دێرێ هاتییەكرن، ئەلسەعرەدی دەربارەی ئیشو عەیابی دبێژیت:... پاشتر چوو دێرا (بابی النصیبی) و خوە كرە پەرستڤان، دەمەكی ما ل وێرێ، خودای پشتەڤانی



لێکر و بوو سەرۆکێ پەرستڤانان، ژ شکەفتا خوە دەرکەت و چوو چیایێ بانوهەزرا (بانهذرا) و ل جەم دێرا مار ئیسالاها (مار ایثالاها) ئاکنجی بوو...

ئیشو عەدناحێ بەصری د پەرتووکا (الدیورە) دا دەربارەی (مار ایثالاها) دبێژیت: مار ئیسالاها یێ چاکسازیخواز (الطوباوی) ژ زانینگەها نوهەدرا ل سەردەمێ شاهـ شاپوری ژبایە، دوزمانی لێ هاتەکرن، دەست و پێن وی زنجیرکرن و برنە ئەربیلێ، بۆ دەمەکێ درێژ خۆ ل بەر جۆرێن ئەشکەنجەیان گرت، ژ وێرێ برنە باژێرکێ (بیث نوهدرا) بۆ گوندەکی دگۆتنێ دەستکرد، ل وێرێ بەربارانکرن، دارا میتکێ ل جهێ بەربارانکرنا وی شینبوو، بتپەرستان ژ حەسوودیێ ئەو دار هەلکێشا، پشتی سەردەمەکی خودانباوەران دێرەك ب ناڤێ وی چاکسازی هاتییەناڤکرن ل وێرێ ئاڤاکر. و ئەڤ مارئیسالاهە د شەهیدبوونێدا ل سەردەمێ شاهپۆرێ دووێ یێ فارسی هەڤالێ عقبشما ئەسقوفێ (حانیثا المزعوم) و کاهن یوسفی بوو. دوا ئاماژەکرن ب ڤێ دێرێ ل سالا (١٦٠٧ز)ێ بوو، ئەو ژی د لیستا وان دێراندا یێن بۆ رۆما هاتینە پێشکەشکرن.

ئەلبێر ئەبونا د پەرتووکا خوە (دیارات)دا د پەسنا دێرا بەرانی دا دبێژیت: ئەم نزانین کانێ ل سەدساليیا هەڤدێ زایینی پەرستڤان ل ڤێ دێرێ هەبوون: وەك دیاردبیت ئەڤ دێرە یا بەرفرەهبوویە، جهەکێ گرنگ و بەرچاڤ ل باژێرێ دهۆکێ دگریت، بەری دەمەکێ نێزیك ل دەرڤەی باژێری بوو لێ نها کەتییە دناڤ مەلبەندێ باژێری دا.

هندیکە کەنیسەیە گەلەك جاران هاتییەنووژەنکرن، گرنگترینێ وان نووژەنکرنان ئەو بوو یا ل سالا (١٩٢٩)ێ هاتییەکرن، بەری ب داویهاتنا سەدساليیا بیستێ ل وی جهی کەنیسەکا مەزن و بەرکەتی هاتەئاڤاکرن، ئوسقوفێ ئەپرەشیێ جهێ ڤەمانا خوە ل نێزیکی کەنیسێ یا کو بوویە کاتدرائیەکا نوو دانا، ژ سەردەمێن دووروڤە ئەڤ جهە وەك مەزارەکێ پیرۆز هاتییەنیاسین، خەلکەکێ باوەردار ژ جهێن جوداڤە قەستا ڤی مەزاری دکرن، هەر سال ل رۆژا چوارشەمبیا پشتی جەژنا قیامەتێ ئاهەنگ لێ د گێران و دگۆتنێ شانەدێرا دێرا بەرانی (شیرا شهرا)یا مارئیسالاها.

هندی پەیوەندی ب نووژەنکرنێن ڤێ داویێ ڤە هەی ئەفرام فوزەیل ئەلبەهرۆ د پەرتووکا خۆ (مار ایث الاها النوهدري)دا دبێژیت: زانیاریێن دەربارەی قۆناغا داویێ ژ دێرا بەرانی هەین هندن هندی خەلکەکی ژ وان ئەوێن ل دەسپێکا سەدساليیا بیستێ ژیاین ڤەگێراین زێدەباری هندەك زانیاریێن تووماركری، ئەو ژی دیاردکەن کو هژمارەکا زۆر ژ ژوورێن کەڤن ل سەر عەردێ دێرێ هەبوون، پرانییا وان د هەرفتی بوون، هژمارا وان ژ چلان دبۆری، دێرەکا ئاڤا بوو ب پەرستڤانان، ژوور ل سەر وی گری بوون یێ نها ئاڤاهیێ کاتدرایێ ڤەگرتی و رەخێن وێ ژ ئالیێ ژێریڤە کو ئاڤاهیێ مەترانیا کەنیسا کلدانیە، هندەکێن دی دبێژن کو بەرمایێن دێرێ تنێ ژوورەکا مەزن بوو، ب هەررەنگەکی هەبیتن گرنگ ئەوە کو دێرا بەرانی (مار ایثالاها) هەبوو.

بەلێ ئەو مەزارێ سالا (١٩٢٩)ێ ئەلخوری یوسف بەهرۆ (١٨٨٠-١٩٥٣)ێ ل شوونا وی کاتدرائیە ئاڤاکری، ل سەردەمێ مەتران بۆترس عەزیز سەرپەرشتکارێ ئەبرەشیا زاخۆ و نوهەدرا بوو.

کۆڤارا (النجم) یا مووسلی ل سالا (١٩٢٩)ێ بەلاڤکرییە: «کو ئەلخوری یوسف بەهرۆ ناڤێ دێرا کەڤن ئەوا ل دهۆکێ ب مار ئیس ئالاها دهێتەناڤکرن و ل داویا نفشێ چوارێ ل (بیث نوهدرا) هاتییەئاڤاکرن ڤەژاندڤە، پشتی کو بەرماییکێن وێ راکرین تێرا ئاڤاکرنا هەیکەلێ دێرا کەڤن دراڤ ژ خەلکێ کۆمکر، و د ڤێ هەیڤێدا ب داویهات، وی ل بەرە د سالا بێتدا هندەك ژووران ل دوور ئاڤاهی ئاڤاکەت، رێزدار سەرپەرشتێ ئەپرەشیێ مەتران عەزیزی بۆ ڤی کاری هاندانا وی کرییە، ئەم ژی ب چاڤێ رێزگرتنێ ل ڤێ خەمخوریا ئەلخوری یوسف بەهرۆ دنێرین و سوپاسییا مەردینیا خەلکێ وی دکەین».

ل سالا (١٩٩٧)ێ خەلك هاتنەسەرپشککرن کانێ وانا دڤێت ل شوونا دێرا بەرانی کاتدرائیەك بێتەئاڤاکرن کو کەنیسا ئینتیڤالا دهۆکێ تێرا

نڤێژكەران نەدكر یان ژی پرۆژەكێ بازرگانی ل جهێ بیستانێ نێزیكی كەنیسا ئینتیقال بێتەدانان، خەلك پتر دگەل ئاڤاكرنا كاتدرائیێ بوو و دیزاین و نەخشەیێن پێویست بۆ ئاڤاكرنێ هاتنەبەرهەڤكرن و حكۆمەتا هەرێما كوردستانێ ژی پشكەك ژ مەزاختیێ ئاڤاكرنێ ب خۆڤەگرت، كەنیسا كو تێرا پتر ژ حەفتسەد كەسان دكەت هاتەئاڤاكرن و ل رۆژا ١٦ كانوونا ئێكێ ١٩٩٥ێ ب ئامادەبوونا نوونەرێ رێزدار مەسعوود بارزانی و پارێزگارێ دهۆكێ و مەزنە بەرپرسێن دیتر و كادرێ ئایینیێ كەنیسێ ب پلەیێن جودا جوداڤە و نوونەرێن موسلمان و ئێزدییان ل سەردەستێ بەتریك روفائیل بیداوید هاتەڤەكرن.

## دێرا قەشەفرێ
## {دێرا مار ئیشو عەیاب (ماریاقو)} [٢]

ئیشو عەدناحێ بەصری د پەرتووكا (الدیره)دا دبێژیت: قەدیس مار ئیشو عەیاب ئەوێ ژ باژێركێ خوە (.....) دەركەتی دێرەك ل چیایێ بانوهەدرا دامەزراندییە، ئەو ب خوە ژ باژێركێ بانوهەدرایە، ل وێرێ فێری پەرتووكان بوویە، ژ خواندنگەهێ بەرەف حەدیاب بۆ جەم مار ئیشو عەزخا چوو و ل دێرا یەشوع صلیوازخا بوو مامۆستا، پشتی دەمەكی مارزخای ئەو هنارتە جەم ماربابای نەصیبنایی، و ئەسكیما پیرۆز ل چیایێ ئیزیلا وەرگرت، پشتی مرنا مامۆستایێ وی دگەل سێ ژ برایێن خۆ یێن دیتر هاتە چیایێ بانوهەدرا و ل وێرێ دێرەك ئاڤاكر، برا ل دوور خرڤەبوون، كەسێ چاكسازیخواز (الطوباوی) مارولحەق ئەسقوفێ بانوهەدرا دەربارەی دێرێ دگەل ئاخفت و ژێ خواست وێ دێرێ نەهێلیت، گوهداریا ئەسقوفی كرو هێژ دژیێ پێنجی و شەش سالیێدا و ل مالا شەهیدان ل وێ دێری یا وی دامەزراندی هاتەڤەشارتن.

ئەڤ دێرە دكەڤیتە نێزیكی گوندەكی دبێژنی (مار یاقو) و خەلكێ دەڤەرێ دبێژنێ قەشەفرێ كو دكەڤیتە سەر چیایێ سپی ب دووراتییا (١٠كم) ژ باژێرێ دهۆكێ، كۆمتێن چیایێ سپی یێ كو بلنداهییا وی د ناڤبەرا هزار و هزار چوارسەد مەتران ل سەر ئاستێ دەریای دوورێن وێ دگرن، ئەڤ گوندە ژ ئالیێ كارگێریڤە سەر ب قەزا سێمێلێ و ژ ئالیێ كەنیسێ ڤە سەر ب ئەپرەشیا زاخۆ و نوهەدرایە. شوینوارێن ڤێ دێرێ ب گرنگترین و كەڤنترین شوینوارێن دیرۆكیێن دەڤەرێنە و ل سەدسالیا شازدێ زایینی هاتییەئاڤاكرن.

ل ژێر ناڤێ ئیشو عیاب (دامەزرێنەرەك ژ سەدسالیا حەفتێ( یێ جهێ خۆ هێلای، خودانێ پەرتووكا (القدیسون السریان) دبێژیت، ئیشو عیاب ل دەوروبەرێن سالا (٥٧٧ز)ێ ل بانوهەدرا (دهۆك)ێ هاتییەسەردنیایێ ل خواندنگەها گوندێ هەشتییان ل قردو خواندییە، ب مامۆستایێ فێركرنا خواندنێ ل دێرا (الجص) دەسپێكرییە، ئەوا پەرستڤان ئیشوع زەخا ل حەدیاب ئەربیلێ دامەزراندی. ژ وێرێ هنارتییە جەم بابۆیێ نصێبینی ل دێرا چیایێ ئەزەل ل دەڤەرا تۆرعابدین و پشتی مرنا بابۆی ل سالا (٦٢٩ز) ێ جهێ خۆ هێلا و زڤریڤە جهێ لێ هاتییەسەر دنیایێ داكو دێرەكێ دامەزرینیت، بۆ دەمەكی مایە ل نێزیكی دێرا بەرانی (مار ئیسالاها) ل نێزیكی دهۆكێ و پاشتر جهێ وێ دێرێ دەسنیشانكر یا وی دڤیا «ل وی جهی یێ كوردان لێ قوربانی بۆ شەیتانی ددان» ئاڤاكەت، ل وێرێ هندەك عەجێبی ب تایبەت چارەسەركرنا نەخۆشییان ل سەر دەستێ وی روودان، ژبەر بەلاڤبوونا ناڤودەنگێ وی ڤیا ژ وی جهی برەڤیت بەلێ ئەسقوفێ بانوهەدرا نەهێلا بچیت. ب پیراتی ل دەوروبەرێن (٦٨٥ز)ێ مر، پشتی كو ٥٦ سالان مایە ل وێ دێرێ یا وی ئاڤاكری، پشتەڤانیا خودێ خەلیفێ وی ژ دێرا دێرا بیت عابی ئینا وێرێ، ئەڤ خەلیفەیە مار یەعقوب بوو ئەو بوو یێ ژ هنگی وەرە دێر بناڤێ وی هاتییەنیاسین و نها بوویە كاڤل.

ل سەردەمێ یەعقوبی ئەو دێرا پێشیێ وی دامەزراندی نێزیكی ٣٠٠ پەرستڤان هەمبێزدكرن و دێر ب ناڤێ سەرۆكێ وێ یێ نووڤە ئەوێ كو پتر ژ جارەكێ نەڤیای ببیتە ئەسقوف دهاتەنیاسین، دژیێ نوت سالیدا ل دەوروبەرێن (٧١٧ز)ێ مرییە. ل شوونا جەژنا رەبان هورمزی ل رۆژا دوشەمبیا سێێ

ژ حەفتیێن (الفصح) شانەدێرا وێ ل وی گوندی یێ ل پشت دێرێ دهاتەگێران، پشتی روودانێن شۆرشا کوردستانێ ل ئەیلوولا (١٩٦١)ێ ئەڤ دێرە ژ ناڤچوویە.

دەمێ بابا (الاب) جان فییە د پەرتووکا خۆیا ناڤدار (اشور المسیحیە) ل سەر ڤێ دێرێ نڤیسی دیارکرییە کو بارا پتر ژ دیوارێن دێرێ هێژ د ئاڤابوون و نێزیکی شەشسەد سالانە دەستێ نووژەنکرن و ئاڤاکرنەڤێ نە گەهشتیێ.

ل وی جهی هژمارەکا زۆرا شکەفتان دهێنە دیتن کو رۆژەکێ ژ رۆژان جهێن خودێپەرستی و ناوسکێن پەرستڤانان بوون، بەلێ نها ژ ئەنجامێ سەروبەرێ سەقای ب سەرێکدا هاتینەخوار، هندەك سێربجێن ئاڤێ یێن د بەریدا کۆلای ل وان جهان هەنە بەلێ پرانییا وان هەرفتینە، کو ئەڤ شوینوارە هەموو نیشانا مەزناتییا دێرێنە د دەمێ خۆدا، زێدەباری چەند جهێن گڤاشتنا تری و رێکێن ب سەروبەر چێکری ب بەران بۆ چوونە ناڤ دێرێ کو نێزیکی سێ کیلومەترانە.

ب رەخ کەنیسێڤە هندەك شوینوار هەنە نیشانا بوونا دێرەکێ نە، کو ژ کۆمەکا ناوسکان (جهێن پەرستنێ) یێن پەرستڤانان پێکهاتینە و ژ بەری هاتینەئاڤاکرن، دهێتە زانین کو ل ڤان رەنگە دێران جهێن ژێری هەبوون، (قلایە) بۆ سەرۆکێ دێرێ و ناوسکەك د دەرگەهێ دێرێدا بۆ دەرگەڤانێ دێرێ، و جهەکێ تایبەت بۆ پەرستڤانێن نوو دەسپێکری و جهەکێ تایبەت بۆ مێهڤانان، و ژوورەك بۆ لێنانا خوارنێ جهەك بۆ تەنویرا نانی و عومبارەك بۆ هەلگرتنا کەرەستەیێن خوارنێ بۆ دەمێن سالێ و جهەکێ مەزن بۆ مێزا خوارنێ دەمێ خودێپەرستێن ئاکنجیێن ناوسك و شکەفتان ل رۆژێن جەژن و هەلکەفتان ب هەڤرا خوارن دخوارن. بەلێ هەروەك جان فییە ئاماژە پێ دکەت هەموو ئەڤ جهە تنێ کۆمێن ئاخ و بەران بوون ل ژێریا کەنیسێ، دیرۆکنڤیس ڤۆناغا بوونا دێرێ ب سەدسالیا شەشێ زایینی دەسنیشاندکەن.

ل داویا سەدسالیا دەهێ زایینی گەلەك کارەسات ب سەرێ دێرێن دەڤەرێ هاتن، ژ وانا ل سالا (٩٧٧ز)ێ دەمێ شاهنشاه ڤنا خسرو کو میر عەزدولدەولە کورێ حەسەنی یە یێ ناڤدار ب روکنولدەولەیێ بوەیهی و یەك ژحوکمدارێن ستەمکارێن سەردەمێ عەباسییان بوو و بەری هنگی حوکمداری ل هەرێما چیان (اقلیم الجبال- دەڤەرا عیلامێ) دکر، ڤی میری ب سەر باژێرێ مووسلێ و جزیرێدا گرت و دێر و کەنیسە ژ ئالیێ لەشکەرێن وی ڤە هاتنە وێرانکرن و هەرفاندن و د هەمان دەمدا ژێ خەلکێ دەڤەرا ئامێدیێ ژێ ئەو تالانکرن.

ل دەوروبەرێن (٩٧٩)ێ زایینی پەرستڤانان دێرێن خۆ ژ وانا ژێ پەرستڤانێن دێرا مار یەعقوبی بەردان و رەڤین و ژێك بەلاڤەبوون و د وێ ڤۆناغێدا گەلەك ژ مەسیحیێن داسن ل دەڤەرا ئامێدیێ هاتنەکوشتن و هژمارا کوشتییان ب نێزیکی پێنج هزاران د هێتەتەخمینکرن. پشتی دەمەکی فەرمانەك ب راوەستاندناکوشتن و چەوساندنەوە و دەربەدەرکرنێ دەرکەت، ئەڤ سەروبەرێ ئالۆز کێمەکێ تەنا بوو و گەلەك ژ پەرستڤانان زڤرینەڤە دێرێن خۆ و دەست ب نووژەنکرن و ئاڤاکرنەڤا وان کرن.

دیرۆکا خرابوونا ڤێ دێرێ ناهێتە زانین بەلێ دوور ناهێتەدیتن دوا وێرانکرنا وێ سەردەمێ شاهێ فارسی نادر شاهی بیت ل سالا (١٧٤٣)ێ یێ کو هەردێرەکا مایە ئاڤا ب سەرێکدایە ئیناخوار.

هەژییە بێتەگۆتن کو قەبرەك ل گۆرستانا گوندی ئەوا دکەڤیتە سەرێ گری هەیە دبێژنێ قەبرێ نەخشاندی (القبر المنقوش)، ئەڤ قەبرە یێ زارۆکەکییە ب ناڤێ دانیال کورێ قەشە مرخایی و ناڤێ دایکا وی (کەتو)یە، دیرۆکا قەبری دزڤریتەڤە سالا (١٧٠٩)زن ئەڤە نیشانا هندێیە کو کو قەشەکێ خودان ژن ل نێزیکی ڤێ دێرێ دژیا، یان ژێ ئەڤ دێرە ل سەر کاڤلێن دێرەکا هەرفتی هاتییەئاڤاکرن.

## دێرا زەعفەرانی[٣]

تومایێ مەرجی د پەرتووکا (الرؤساء)دا دبێژیت: پەرستڤان ئەپنیماران خەلکێ کرخ سلوقی (بیث کرمای) ل سەر دەستێ پەرستڤان ڤامیشوع فێربوویە، ژ زارۆکینیا خۆڤە ل سەر رێکا قەدیسێن

دێرا (بيث عابي) و ل ژێر سەرپەرشتییا پەرستڤان (قامیشوع)ێ مامۆستایێ خۆ چوویە، چەند نڤیسینەك هەنە رێنمایی و تەراتیلان ب خۆڤەدگرن كو نیشانا شارەزاییا وی یە د ڤی واریدا، دێرەك دامەزراندییە و هژمارەكا مەزنا پەرستڤانان ب خۆڤە دگرت، لێ ب ناڤێ بیدعەیا ئایینی (الهرطقه) د ناڤ نڤێژكەراندا ب سروودێن مریبان برە جهەكی دگۆتنێ (سباق الجحاش) لێ خودێ پشتەڤانی لێكر و ب رێكا وی ئەڤ دێرا پیرۆز هاتەئاڤاكرن ب مەرەما زیندووكرنەڤا بیرهاتنا وی.

د ژیاننامەیا (القديس الانبا شمعون)دا هاتییە ئەوێ دێرا باژێرێ شنا (السن)* (نێزیكی مووسلێ) دامەزراندی قەدیس پەرستڤان ئەڤنیمارانە ئەوێ دێرەك ل بانوهەدرا دامەزراندی و مار شەمعونی ب خۆ بەرێ وی دایە ڤێ چەندی.....

دیرۆكنڤیس ئەلحەمەوی د «معجم البلدان» و «الخزل و الدال»دا ئاماژە ب دێرا زەعفەران دكەت و دبێژیت: دێرا زەعفەران ب «عمر الزعفران» ژی دهێتەناڤكرن نێزیكی گزیرتا ئیبن عومەری یە ل ژێرییا كەلا ئەرمشتێ «اردمشت» ل سەر بەتەنا چیاییە و كەلا دكەڤیتە هنداڤ وێ دەمێ خەلیەیفێ عەباسی ئەلموعتەزد كەلا دووریێچكری ما ل وێرێهەتا چوویە دناڤدا.

ئەلبێر ئەبونا دەمێ ل سەر دێرا زەعفەرانی یان دێرا كوركوم «دير الكركم» دپەیڤیت دبێژیت: مار ئەڤنیمارانێ خودانێ ڤێ دێرێ نە ئەڤنیمارانێ مەزنە، بەلكێ شاگردێ پەرستڤان قامیشوعی و پەرستڤان ئەڤنیمارانێ بچووكە ل دێرا «بيث عابي»یا ناڤدار، د بنیاتدا ژ «كرخ سلوخ»یەل داوییا سەدساڵییا شەشێ زایینی هاتییەسەر دنیایێ، نێزیكی سەدساڵان ژیایە ل سەر دەمێ هەردو بەتریاركان (الجاثلقين) ئیشو عیاب ئەلجدالی (٦٢٨- ٦٤٦) و گیورگیسێ یەكەم (٦٦١- ٦٨٠) چالاكییا خۆ ل حەسەنێ ئەنجامدایە، كو ئەو ژی دكەڤیتە بنێ چیایی و كەلا دكەڤیتە هنداڤ، گەلەك پەرستڤان و ژوورێن پەرستڤانان لێ هەنە و پەرستڤانێن وی د دەولەمەندی و خوشگوزەرانییێدا دژین و خودان چەم و بیستانن، عەردێ وێ ب گولا زەعفەران خەملاندییە و ژوورێن وێ یەك ل هنداڤ یا دی یە وەك دێرا (دير الكلب) و ب جوانترین پەسن پەسنا وێ دهێتەكرن، شویرهەك دۆرماندورێن وێ دگریت، ڤەخوارنێن وێ خوشترین رەنگ و تامن و ڤەخوارنێن هەرە كەڤنن، ئاڤەكا سازگار هەیە ژ كانیێن چیای دزێت. د بەردەوامییا گۆتنێن خۆدا دەربارەی ڤان پەسنێن چوویی ئەلبێر ئەبونا دبێژیت:... گەلەك ژ شڤانان بۆ من ڤەگێرایە كو وان گوهـ ل دەنگێ ئاڤێ بوویە د كووراتییا چیاییدا دچیت، دبیت هەر ئەڤ ئاڤە ژی بیت بۆ خۆ دەرۆكەك ل داوییا چیایێ بێخێری نێزیك گوندێ دێرابوینێ دیتییە و ل جهەكێ دبێژنێ (سەروكانیێ) ژێ دەركەتییە.

هەر ل دۆر چاوانییا ئاڤاكرنا ڤێ دێرێ د پەرتووكا (ذخيره الاذهان)دا هاتییە: پشتی كو ئەڤنیماران ژ دێرا (الزرنوق) دەركەتی چوو جەم عمر يوحنا الحلحلي و ل نێزیك وی دێرەكا مەزن ئاڤاكر، بەلێ هندەك پەرستڤانان ئەو ناچار كر ژ ڤێ دێرێ دەركەڤیت و چوو شكەفتەكێ ل نێزیكی نوهەدرا و ل وێرێ ژی پەرستڤان لێ كۆمبوون و بۆ خۆ دێرەك ئاڤاكر ب دێرا زەعفەران هاتییەناڤكرن.

ژ ئەڤا چوویی دیاردبیتن كو بەری ئاڤاكرنا ڤێ دێرێ ئەڤا ب دێرا زەعفەران دهێتەنیاسین ل دەڤەرا نوهەدرا ژ ئالیێ ئەڤنیمارانی ڤە ئەوی دێرەكا دیتر ئاڤاكرییە، ل دوور ئەڤێ دێرا نوو ئەلبێر ئەبونا دبێژیت: دێرا زەعفەرانی ئەوا مار ئەڤنیمارانی ئاڤاكری دكەڤیتە بنێ چیایێ بێخێری هنداڤ گوندێ كولێ ل ژووریێ رۆژئاڤایێ گەلیێ زاخۆ، كەلایەك دكەڤیتە هنداڤ ڤێ دێرێ هێژ شوینوارێن وێ د دیارن ئەو ژی كەلا «زەعفەران»ە و وەسان دیارە باژێركەك ب ناڤێ زەعفەران نێزیكی ڤێ دێرێ بوو و هێژ شویرها وێ دیار و بەرچاڤە.

د بەردەوامییا بۆچوونا خۆ ل سەر بابەتی ئەلبێر ئەبونا دبێژیت/ ئەڤنیمارنی دەست پێكر ژ دێرەكێ چوو دێرەكا دیتر، سێ ساڵان ما ل دێرا «زێرنوڤا»،

دەمەکی ما ل دێرا «الغاب الجمیل» و دەمەکێ دیتر ل دێرا «ماریوحونان» ل «حەلحەل» ل دهەرا «بیث زیدی» ل داوینێ ژی جهێ خۆ ل بنێ چیایێ بێخێری دیت.

## دێرابون (دێرابون مارێوا)[٤]

ئەلبیر ئەبونا د پەرتووکا خۆ (دیارات العراق) دبێژیت: یەکەمین جار ناڤێ ڤێ دێرێ ل سەدسالیا شەشێ زایینی هاتیە ناسناما کەسێ ئەڤ دێرە ئاڤاکری نەهاتیەزانین، بەلێ هند دهێتە زانین دواجار ل سەدسالیا چواردێ ناڤێ وێ هاتیە، هەژیە بێتەگۆتن ئەڤ دێرە بۆ دیرۆکنڤیسان بوویە نهێنییەك و هەتا نها نەگەهشتینە راستیا وێ و بەردەوام پرسیاردکەن ئەرێ دێرا مار ئاوا هەمان دێرا ئابونە؟ هەروەك ئەلبیر ئەبونا دبێژیت:» یا ب ساناهی نینە ناسنامەیا کەسێ ئەڤ دێرە یان هەردو دێر ئاڤاکرین بزانین، تنێ د ژێدەراندا هندەك ئاماژە دەربارەی هندەك ئالیێن پەیوەندی ب دێرێ ڤە هەی هەنە. ئەلسەمعانی (م ش ۱، ۳: ۳٤۳- ۳٤٤ دبێژیت: دیرۆك ڤەدگێریت کو بەتریارك مار ئابایێ یەکەم بریاردا دێرئابوون ژ دەستەلاتێ بانوهەدرا ب دەربێخیت، ژ ڤێ چەندێ ئەم دکارین بێژین ئەڤ روودانە دناڤبەرا سالێن (٥٤٠- ٥٥٢ز)ێ ئانکو سەردەمێ بەتریارکێ مەزن بوویە، هەروەك ئەڤ چەندە ئاماژە پێ دکەت کو دبیت ئەڤ دێرە کەتبیتە دەڤەا بانوهەدرا، لەورا ئەلبیر ئەبونا پرسیاردکەت: ئەرێ ئەڤ دێرە د سەردەمەکیدا ب (دێر مار ئاوا) هاتیەناڤکرن؟ ئەڤە ئەوە یا ئەم نەزانین.

ل جەم ئەلحەمەوی ئەڤ دێرە ل بقردی ناڤبەرا گزیرتا ئیبن عومەری و گوندێ هەشتێیان (ثمانین) ە، و دێرەکا بقەدرە ل جەم وان، گەلەك پەرستڤان لێ هەنە، دبێژن کو قەبرێ نوحی ل وێرێ یە. هندیکە حەبیب ئەلزیاتە د پەرتووکا خۆ (دیارات)دا دیاردکەت: دێرئابون ل قردی ئەو ژی گوندەکە نێزیکی چیایێ جودی ل جزیرێ.

بەردەوام بۆ چەند نفشان (دێرابون) ب پەرستڤانان یا ئاڤابوو، و ل دووڤ دیدەڤانیا ئیبن فەزلوللا ئەلعومەری ل هەردو سەدسالیێن سێزدە و چواردە یێن زایینی هێژ هژمارەکا زۆرا پەرستڤانان لێ هەبوون. هەروەك د پەرتووکا (دیارات)دا هاتی: « هندەك وەسان دبینن کو پەسنێن ڤێ وەك یێن (دێرابون)ن ئەوا دکەڤیتە داویا باکوورێ چیایێ بێخێری نێزیکی سنوورێ ترکیا، لێ هندەك جوداهی هەنە کو ئەم دودلبین د لڤاندنا ڤی بابەتیدا، هەروەکی دیار ئەو دێرا دکەڤیتە ب رەخ گوندێ دێرەبوونێ ڤە نە (دیر أوون)ە ئەوا دکەڤیتە ئالیێ دی یێ رووبارێ خابووری ل ژێریا چیایێ جودی ل ناڤ سنوورێ نهایێ ترکیا. دبیت ئەو دێرا دکەڤیتە نێزیکی گوندێ دێرەبونێ (دێرا مار ئاوا)بیت، ئەوا دکەڤیتە بلنداهیەکێ باکوورێ گوندی کو ب (بانێ دێرێ): گرێ دێرێ یان کەنیسێ دهێتەناڤکرن و ئەڤە نە (دێرابون) یان (ئابیون)ە یا دکەڤیتە جزیرا ئیبن عومەری و گوندێ هەشتییان کو نڤیسەرێ (المراصد) دەربارەی وێ گۆتیە: دێرەکا مەزنە، گەلەك پەرستڤان لێ هەنە، دبێژن گۆرێ نوحی لێ هەیە...

ئیبن فەزلوللا ئەلعومەری د پەرتووکا (مسالك)دا دبێژت: دێرێ سێریجەکا ئاڤێ لێ هەیە، دهێتەگۆتن کو ب بووریێن سفری ئاڤ ژ چیایێ جودی دئینا ڤێ سێریجێ، ل جەم وێ چەم و بیستان هەنە.

## دیرا بیث صیاری (باصیاری)[٥]

دامەزرێنەرێ ڤێ دێرێ کەسەکە ب ناڤێ ئیبراهیم، ل داویا سەدسالیا شەشێ زایینی ژ دێرا مەزنا ئیزلا هاتیە و دێرا خۆ ل سەر چیایێ مەتینی ل بلنداهیەکێ دکەڤیتە سەر نهالا سپنەی ل ژوورێ گوندێ تنێ یێ سەر ب ناحیا بامەرنێ یا نهاڤە دامەزراندیە. ڤێ دێرێ ب درێژیا نهالا سپنەی گەلەك مولك هەبوون، هەتا نها ژی شوینوارێن ئاشێن ئاڤێ یێن ڤێ دێرێ ل دەڤەرێ و ب دووراتیا نیڤدەمژمێرەکێ ب پییان ل ژێریێ گوندێ سپنەی د دیارن.

وەسان دیارە ڤێ دێرێ گەلەك دۆم نەکرییە، وەك دهێتەدیتن ژ سەدسالییا حەفتێ زاینیڤە یا ڤالا بوویە ژ پەرستڤانان، دەمێ پەرستڤان یوسفی دێرا خۆ ل نێزیکی گوندێ ئینشکێ ئاڤاکری، پەرستڤان ژ دێرا مار سبریشوعی ل (بیث قوقا)ڤە هاتینە و ل ڤێ دێرێ ژیاینە و هەر د وی سەردەمیدا پەرستڤان بریلدا (ابن یلدا) ل سەر پێڤاژوویا پەرستڤانیێ فێربوویە، پشتی دەمەکی پشتی کو دێر کەتییە بەر ب سەرداگرتن و تالانکرنەکێ پەرستڤانێن ئاکنجی ل دێرا (بیث صیاری) بەلاڤەبووینە، پەرستڤان (ابن یلدا) بەرەف دێرەکێ ل دەڤەرا زۆزانان چوو، ل وێرێ دگەل پەرستڤان موسای گەهشتنە هەڤ، هێژ ل قۆناغا بەراهیێ یا فێربوونێ بوو ل دێرێ و دگەل هەڤ گونجان و ئەو کرە خویندکارێ خۆ.

دەمێ سەروبەرێ دەڤەرا سپنەی تەنا بووی (ابن یلدا) زڤریڤە ڤێ دێرێ و پەرستڤان موسا ژی دگەلدا بوو، پاشتر گەلەك برایێن دیتر ژ پەرستڤانان هاتنە ڤێ دێرێ هەتا هژمارا وان ل سەر دەمێ (ابن یلدا) ی گەهشتییە نێزیکی شێست پەرستڤانان و ل سەردەمێ پەرستڤان موسای گەهشتە سێ سەدان، هندی پەیوەندی ب پەیڤا (بیث صیاری)ڤە هەی د زمانێ سریانیدا ئەو ئانکویا مالا وێنەکێشان (بیت الرسامین) د دەت.

## دێرا (الانبا موسی)[٦]

یوحەنا برکلدون ل سەدسالییا دەهێ د پەرتووکا (یوسف بوسنایا) ل دۆر بنیاتێ (الانبا موسی) دبێژیت: هەروەك ژ چیرۆکا وی دهێتەزانین ژ گوندێ (جولمێرد) (جولمێرك- جولەمێرگ)ێ یە ئەوێ دکەڤیتە دەڤەرا زۆزانان، پوشاکێ پیرۆزێ پەرستڤانیێ ل دێرا ڤەدیس رەبان (بەختیازەد) کرییە بەرخۆ، دەمێ پەرستڤان (بن یلدا) هاتییە وێ دێرێ ئانکو دێرا (بەختیازەد) پەرستڤان موسا ل بەر دەستێن وی فێربوویە و ب هەڤالینییەکا کوور دگەل وی راهاتییە، دەمێ (بن یلدا) زڤریەڤە دێرا خۆ، پەرستڤان موسا ب هەڤالینیا وی هاتە دێرا (مار ئیبراهیم ئەلناسك) ئەوا ب (باصیاری)دهێتەناڤکرن، ل وێرێ پلە ل دووڤ پلەیێ بلندبوو هەتا گەهشتییە پلا پێگەهشتنێ د پولینکرنا ژیانا رۆحی (الحیاه الروحیه)دا.

موسا کەسەك جوامێر و دلۆڤان بوو، ئەو دێرە ب پەرستڤان موسای گەشبوو و ل سەردەمێ وی پڕ بوو ژ برایان، د دەمەکیدا کو ل سەردەمێ پەرستڤان (بن یلدا)ی ژ شێست برایان زێدەتر لێ نەبوون، بەلێ د دەمێ پەرستڤان موسای دا گەهشتنە سێ سەد برایان، شێخێن خودان رێز و پێگەهشتی، برایێن ژ خودێ ترس و مژوولی خودێ پەرستیێ د ناوسکانڤە. رەبان موسای ب شیاینێن خۆ و ژ کیستێ خۆ هەموو ناوسکێن دێرێ ژبلی ئەوێن ئاڤاکری ل سەر دەمێ پەرستڤان (بن یلدای)ئاڤاکرن، ناوسك بۆ وان کەسان ئاڤادکرن یێن ل دەسپێکا خودێ پەرستیێ و هێژ نەچووینە دناڤ ژیانا هەڤپشکدا.

هەروەك ژ یوحەنا بن کەلدەن هاتییەڤەگوهاستن کو ڤی پەرستڤان موسای عەجێبیێن پیرۆز ئەنجامددان، کارێن ئاڤاکرنێ ب تایبەت ئاڤاکرنا ناوسکان دکرن، دگەل برایێن خۆیێن پەرستڤان ئاشێن ئاڤێ ل سەر رووبارێ سپنەی ئاڤادکرن. هەروەك ئەلبێر ئەبونا ڤەدگێریت: وەسان دیارە پەرستڤان موسای دڤیا ل جهەکی ل بلنداهییا چیای خۆ ڤەدەرکەت، لەوما بۆ خۆ جهەکێ هەژی ل نێزیکی گوندێ «زیویثا» زێوە یا نها ب دووراتییا دەمژمێرەکێ ژ گوندێ تنێ هەلبژارت، ئەڤ جهە ب مەزارێ شێخ پیراموسی دهێتەناڤکرن کو رامانا شێخ موسا یان پەرستڤان موسای ددەت، ئەڤ مەزارە هەتا نها ژی مایە و گوندێ ب رەخڤە دگۆتنێ زێوا شێخ پیراموسی و کوردێن موسلمان لێ دژیان، گوند ل سەردەمێ ئەنفالان هاتییەخرابکرن و نها ل دەشتێ نێزیکی فرۆکەخانەیا بامەرنێ هاتییەئاڤاکرن.

## دێرا پەرستڤان قیومایێ بازی[٧]

دێرا پەرستڤان قیوما دکەڤیتە دەڤەرا بەرواری ژووری ب دووراتییا (٢کم) ژگوندێ دۆرێ. جان فییە د

پەرتووکا (القدیسون السریان)دا دبێژیت: من تشتەك ژ ژیانامەیا وی قەدیسی نەزانی، ژ زاردەڤ دهێتەگۆتن کو ڤی پەرستڤانی ل دەڤەرا بازێ (هەکاری) مزگینییا پەرستڤانیێ بیست سالان بەری مار زیعا (زیبای) وەرگرتییە ئانکو ل سەدسالییا چواری/پێنجێ، پەرستگەهەك ب ناڤێ وی ڤە ل گوندێ (شواعوثا) (دکەڤیتە دەڤەرا هەکاری) مینا ژوورەکا بەرییا مەزن بوو هەموو دیوارێن وێ ژ بەری بوون!.

هەروەسان دبێژیت: ژ سەدسالییا دەهێ ڤە دێرەك ب ناڤێ وی ڤە ل گوندێ دێرێ دەڤەرا بەرواری بالا باکوورێ ئامێدیێ هەیە، چ نەبیت ژ سالا (١٦٠٢)ێ ڤە هەتا نیڤا سەدسالییا بیستێ ئەڤ دێرە بنگەهێ ئوسقوفێ نەستوریێ خۆجهی بوو، ل رۆژا ئینیا سیێ ژ هاڤینێ شانەدێرا وی ژ ئالیێ سریانێن ملابارێن رۆژهەلاتیڤە دهێتەگێران.

د دیرۆکا (یوسف بوسنایا)دا عەجێبیەکا دی یا ڤی قەدیسی (ئانکو پەرستڤان موسای)دهێتە ڤەگێران کو: دەمێ سندریکا قەدیسی نێزیکی وی گۆرێ کری یێ تێدا ڤەشارتی، هژمارەکا زۆرا پەرستڤانان ل دوورێن وی دکرنە گری، پیرەکێ خودان باوەری ب ناڤێ پەرستڤان عەبد یەشوع ژ دێرا پەرستڤان قیومای عەجێبییەك دیت کو ناهێتەپەسنکرن، وی دیت دەستێ راستێ یێ قەدیسی ژ سندریکێ دەرکەت هێمایێ خاچێ بۆ وی خەلکی یێ ل دوورێن وی خرڤەبووین دکێشا.

د هەمان ژێدەردا هاتییە: برا هەموو کومبوون و ب گری و فیغانن و ژبەر دوورکەتنا بابێ خۆیێ روحی (ل ڤێرێ مەرەم پێ یوسف بوسنایا یە) یێ پرچا خۆ دکێشن و خەمباری ب روویێ وانڤە دیارە، هەروەسان گەلەك برا ژ دێرێن پەرستڤان هورمز، پەرستڤان ئیشە عەیاب، پەرستڤان یوسف ژ ئینشکێ، دێرا شەمرخێ و دێرا پەرستڤان قیومای د ڤان رێورەسماندا بەرهەڤبوون. ژ زاردەڤێ خەلکێ دەڤەرێ ئەفسانەیەك دهێتەڤەگێران گوایە رۆژەکێ ژ رۆژان پەرستڤان قیوما ژ گوندێ دیهێ دچوو گوندێ دورێ ب رێڤە بێهنەکێ راوەستیا دا بێهنا خۆڤەدەت، ل وێ جهی کانییەکا ئاڤێ دەرکەت پاشتر ب ناڤێ وی ڤە هاتییەناڤکرن.

دهێتەزانین کو کەنیسەیەك ب ناڤێ ڤی راهبیڤە ل دەڤەرێ هەیە دکەڤیتە گوندێ دورێ، ژ ئالیێ مەتران نرسای دی باز مەترانێ کەنیسا رۆژهەلاتیا ئاسووری ل لبنانێ یێ ل نیسانا ٢٠٠٠ێ سەرەدانا دەڤەرێ کری ئاهەنگا نووژەنکرنەڤا وێ هاتە گێران.

## دێرا (بیت عابی) قەزا ئاکرێ[٨]

یەعقوب لاشومی دامەزرێنەرێ ڤێ دێری یە، د پەرتووکا «الدیورة في مملکتي الفرس و العرب» ب بەرفرەهی دەربارەی ژیانا وی هاتییە، گوایە ئەو ژ دەڤەرا (بیث کرمای) گوندێ (لاشوم)ە، زانستێن خۆ ژ گەلەك ژێدەران وەرگرتینە، سەرەدانا (سبر یشوع) ل چیایێ (شعران)دکر، ئەوێ بوویە ئوسقوفێ لاشوم پاشتر بەتریك ل (٥٩٦- ٦٠٤ز)، هەروەسان بۆ دەمەکێ ل سەر دەستێ (یوحنا بیث ربان) خواندییە و پاشتر چوویە سەرەدانا جهێن پیرۆز ل قودسێ، پاشتر گەهشتییە دێرا (ئیزیلایا مەزن) و ل وێرێ (الاسکیم الرهباني) وەرگرتییە و ژیەکێ درێژ ژیایە.

ژ بەر مژوولبوونا مەزنێ ڤێ دێرێ پەرستڤان بابای ب کاروبارێن کەنیسێڤە د دەمێ ڤالابوونا کورسییا بەتریکی (شغور الکرسي البطریرکي) ئەڤ دێرە تووشی ئالۆزی و بێ سەروبەریێ بوو و کاودانێ وێ تێکچوو، ژ نەحەقی یەعقوبێ لاشومی هاتەگونەهبارکرن ب نەگەهاندنا نووچەیێن بێ سەروبەرییا دێرێ، لەوما ژ ڤێ دێرێ هاتەدەرێخستن، نەە پەرستڤانان پشتەڤانی لێکر و دگەل وی بەرەف دەڤەرا مەرجا مووسلێ (مێرگا مووسلێ) چوون، د ئەنجامدا ڤی یەعقوبی دێرەکا مەزن ل جهەکی دگۆتنێ (بیث عابي) ئانکو جهێ دارستان دەحل و پویشان ئاڤاکر، کو دکەڤیتە ب رەخ گوندێ (خرپێ) ل باکوورێ رۆژئاڤایێ ئاکرێ، دهێتەگۆتن کو ئەڤ جهە بەری وی دەمی جهێ پەرستگەهەکا بتان (سەنەمان) بوو. یەعقوب ل ڤێ دێرێ مر و ل مالا شەهیدان هاتەڤەشارتن.

هندیکە دێرا (بیث عابی)یە دکەڤیتە دووراتییا سێ چارێکێن دەمژمێرێ ب پێیان ل ژێرێ گوندێ (خرێ) ل باکوورێ رۆژئاڤایێ ئاکرێ، ئەڤ دێرە دکەڤیتە بێدەرێن گوندی، ڤێ دێرێ سێ کەنیسە هەبوون، یا ئێکێ ل چارێکا ئێکێ یا سەدساڵییا حەفتێ هاتییەئاڤاکرن، یا دووێ ژ ئالیێ بەتریك ئیشو عەیابێ سێی یێ حەدیابی ل نیڤا سەدساڵییا حەفتێ هاتییەئاڤاکرن و کەنیسا سێێ پشتی یا دووێ ب سەدساڵیەکێ هاتییەئاڤاکرن.

ئەو دێرا یەعقوبێ لاشومی ل چارێکا ئێکێ ژ سەدساڵییا حەفتێ ئاڤاکری، د دەمەکێ زوودا پێشکەت و پڕبوو ژ پەرستڤانان و بوو یەك ژ مەلبەندێن رووحی و رەوشەنبیرییێن کەنیسا رۆژهەلاتی، هژمارا پەرستڤانان د سەردەمێ دامەزرێنەریدا گەهشتە هەشتێ کەسان، و ل سەر دەمێ بەتریك ئیشو عەیابێ سێێ ئەڤ هژمارە گەهشتە سێ سەد پەرستڤانان و ل نیڤا سەدساڵییا حەفتێ و ئەڤ دێرە بوو رووگەها خەلکەکێ غەریب، هندەك ژ وان کەسان یێن ژ ڤێ دێرێ دەرچووین مەزناتییا بەتریکیێ وەرگرت و هندەکێن دی ل وەلاتێن دوور و نێزیك بوونە مەتران و قەشە.

نفش ل دووڤ نفشی ڤێ دێرێ بەردەوامی ب کاروانێ خۆدا، چەندین سەرۆکان رێڤەبەریا وێ کرییە، هندەك دەسنڤیس هەنە بۆ سەدساڵییا (١٢- ١٣ز) دزڤرنەڤە ل ڤێ دێرێ هاتینەنڤیسین یان بۆ وێ هاتینەنڤیسین، ژ نیڤا سەدساڵییا نەهێ ڤە رەنگە سستییەك کەتییە ڤێ دێرێ، بەلێ پاشتر چالاك بوویەڤە، وەسان دیارە ئەڤ دێرە هەتا سەدساڵییا شازدێ یا ئاڤابوو، د لیستا ساڵا (١٦١٠ز) ێ ڤەگێرانەك هاتییە کو بەتریارك ئیلیایێ هەشتێ بۆ پاپا پۆلسێ پێنجێ دەربارەی چیرۆکا رووداوێنەکا تراژیدی ڤەدگێریت وەسان دیارە ل چارێکا داویێ ژ سەدساڵییا شازدێ رووداوە کو تێدا هاتییە بەلەنگازان سەرۆکێ دێرێ برینە و د بلنداهییا چیای دا هاڤێتەخوار و هەستیکێن وی هەرشینە و ب رەنگەکێ تراژیدی مرییە، دوور ناهێتەدیتن ئەڤ رووداوە ل گوندێ (خەردوس- خردس) نێزیکی خرێ رووداییە و هەمان بەتریارك ئیلیایێ هەشتێ ددەت دیارکرن کو دێر یا ئاڤابوو و چالاکیێن خۆیێن پەرستڤانیێ و گەهاندنێ دگێران... بەلێ ددەت دیارکرن کو ل مالا شەهێدێن دێرێ ٣٨ قەدیس هەنە و د سەردەمێ چوویێدا ٧٠ ئوسقوف ل ڤێ دێرێ هاتینەڤەشارتن.

## دێرا مار عەبدا (عودا- دير الكلب)[٩]

ئەڤ دێرە د کەڤتە دووراتییا کیلومەترەکێ ژ گوندێ مالتایێ کو نها تاخەکێ رۆژئاڤایێ دهۆکێ یە، ئەلشابشتی د پەرتووکا (الديارات)دا دبێژیت (دێر ئەلکەلب) د ناڤبەرا مووسل و بەلەد دایە، ل وێرێ خەلکەکێ سەی لەق لێدای دهێتە چارەکرن، کەسێ سەی لەق لێدابیت دئینن وێرێ و چارەسەردکەن و بێ چل رۆژ ب سەر لەڤا سەی ڤە بۆریبن ناهێتەچارەسەرکرن.

ئەلحەمەوی ژی د هەردو پەرتووکێن خۆدا ڤێ چەندێ دوبارە دکەتەڤە و دبێژیت: ئەڤ دێرە ل دەوروبەرێن مووسلێ ل دەڤەرا باعەزرێ ناڤبەرا مووسل و جزیرێ یە، کەلوتك (قلالي)لێ هەنە ئێك ل هنداڤ یێ دینە و گەلەك پەرستڤان لێ هەنە. ئەلخالدی و ئەلعومەری ژی د ژێدەرێن خۆدا هەمان زانیاری دوبارەکرینەڤە، ئەلبەشار ئەلمەقدەسی دەمێ دەربارەی عەجێبێن وەلاتان دپەیڤیت دبێژیت: ژ عەجێبێن عەردێ مووسلێ دێرولکەلبە، کەسەکێ سەیێ بەرەلا لەق لێدابیت دبەنە وێرێ و پێنجی پەرستڤان لێ هەنە و ب پشتەڤانیا خودێ وی کەسی چارەسەر دکەن. ژ ژێدەرێن جوگرافیناسێن عیراقی دهێتە زانین کو ئەڤ دێرە ل نێزیکی مالتایێ ئانکو دهۆکێ یە و پەسنێن وی دگەل کاڤلێن دێرەکێ دگونجن کو نها دبێژنێ مار عەبدا (مارعودا).

فییە هەمان زانیاری دوبارەکرینە و زێدەتر دبێژیت: بادەکێن رێڤەبەریا شوینوارێن عیراقێ تشتەکێ وەسان دەربارەی ڤێ دێرێ نەگۆتییە، تنێ دیاردکەت کو ئەو شوینوارێن دێرێنە، کاڤل و هەرفتەیە، د وی کاڤلیدا جهێ (مذبح كنيسە) یێ بەرچاڤە. هندیکە

شوینوارێن دێرا مار عەبدا ل گوندێ



ئەلبیر ئەبونایە دبێژیت: دێرەكا گەلەك كەڤنە، شوینوارێن وێ ژێر ئاخ بووینە، تشتەكێ كێم ژێ بەرچاڤە، هزردهێتەكرن كو هەیكەلێ كەنیسەكێ یە، یەكەمین ئینانا ناڤێ وێ ژ سەدسالییا دەهێ و دوا ئینانا ناڤێ وێ ژ سەدسالییا چواردێ نابۆریت.

## دێرا ماردانیال (ئاسیا)یا زەلامان[10]

ئەلبیر ئەبونا د وێ باوەرێدایە كو ئەڤ دێرە دكەڤیتە ژێریێ گوندێ (دێر جندی) و ئەڤ گوندە چەند كیلومەترەكان دكەڤیتە رۆژئاڤایێ گوندێ فەیدیێ. ل ژێریا گوندێ دێر جندی یێ ئاماژەپێكری شوینوارێن دو دێران دهێنەدیتن، هەمان ژێدەر دبێژیت دبیت یەك یا پەرستڤانێن زەلام و یەك یا پەرستڤانێن ژن بیت.

خەلكێ گوندێ ناڤبری وەسان هزردكەن كو ئەڤ دو دێرە یێن (مار دانیال)ینە و د بنیاتدا ئەو ژ (صەعیدێ مصریێ)یە، هەروەك ئەبونا دبێژیت: دبیت دانیال یێ ب نوشدار (ئاسیا) دهێتەناڤكرن و چیرۆكا وی د پەرتووكا «سیر شهداء و القدیسین»دا هاتییە بەلاڤكرن و ئەدی شێر ژێ كورتییەك ژ ژیانا وی د پەرتووكا «اشهر شهداء المشرق) دا بەلاڤكرییە.

هەروەك چیرۆك بۆ مە ڤەدگێریت ئەڤ نوشدارە یەك ژ شاگردێن (مار ئوجین)ی بوو، هاتییەدەڤەرا (بیپ نوهدرا) ل شكەفتەكا نێزیكی وی روویاری یێ ژ مالتا (معلثایا) بەرەف رووبارێ دجلە نێزیك گوندێ «برقیطا»دهێت ئاكنجیبوویە، و سەرەرای ژیارەكا سەخت د ناڤ سەرما و گیانەوەرێن هۆڤدا ۴۲ سالان مایە ل وێرێ. ل رۆژهەلاتێ وی رووباری باژێركەك هەبوو دگۆتنێ « تل حش: تل خش» (تل خشاف) تل خشا نها دانیالی نۆشدار كچا حوكمدارێ باژێركی یا نەساخ چارەسەركر، ئەو بوو وی حوكمداری باوەری ب ئایینێ مەسیحی ئینا و كەنیسەك ل باژێركێ خۆ و دێرەك بۆ دانیالی ل نێزیك شكەفتا وی ئاڤاكرن و خەلكی تلخشێ ژ مەترانێ «بیث لافاط» كو مەترانەكی بۆ وان

دێر و کەنیسا مار عوبیشو ل گوندێ دێرێ



دیارکەت، و هوسان میلس بوو یەکەم مەترانێ «بیپ نوهەدرا».

د پەراوێزێ پەرتووکا «اشهر شهداء المشرق»دا هاتیە دبیت شوینوارێن ڤێ بازێرکی نها ل گوندێ تل خشێ مانە و ب ناڤێ قەدیس میلیس کو دکەڤیتە رۆژهەلاتێ ئەلقوشێ ب دووراتییا نێزیکی دەمژمێرەکێ ب پییان.

هەروەکی د چیرۆکێدا هاتی دانیال ل دێرا خۆ مرییە، و مەجوسان میلیس گرتییە و بەریارانکرییە. جان فییە بۆ وێ چەندێ دچیت کو دێرا راستەقینە یا دانیالی دکەڤیتە ژوورێ گوندێ باختمێ (برقیطا)یێ نها ب دووراتییا شەش کیلومەتران ژێرێ رۆژئاڤایێ پرا ئالوکا یا نێزیکی دهۆکێ. وەسان دیارە ئەڤ دێرە ل سەدسالییا پازدێ یان شازدێ هاتییەڤەگوهاستن بۆ دێر جندی یا سەر ب ئەلقوشێ ڤە، یەکەمین ئینانا ناڤێ ڤێ دێرێ دزڤریتەڤە بۆ سالا (١٦٣٧ز)ێ.

## دێرا دانیال یا ژنان[11]

ئەدی شێر د پەرتووکا (کلدو أشور)دا دبێژیت: دانیال د بنیاتدا خەلمێ مسرێ یە، دەمەکی دگەل مار میخائیلێ ژیایە، پاشتر چوویە (بیپ نوهدرا) و پشتەڤانی ل (حش) شاهێ بازێرکێ (تلحش)ێ کرییە، ڤی شاهی بۆ وی دێرەك ل سەر رووبارێ مالتایێ بەرامبەری گوندێ (طبیث قیطی) ئاڤا کرییە.

لێ ئەلبیر ئەبونا دبێژیت: مە گەلەك زانیاری ل سەر ماردانیالی نینن، وەسان دیارە د بنیاتدا ئەو ژ مسرێ یە و ژ وێرێ هاتییە وەلاتێ ناڤبەرا دو رووباران، دەمەکی دگەل مار میخائیلێ ژیایە، پاشتر چوویە دەڤەرا (بیث نوهدرا)، ل وێرێ شاهێ (مەلکێ) حشی» تلحشی» ئینایە سەر ئایینێ مەسیحی، ڤی شاهی دێرەك بۆ وی ل سەر رووبارێ مالتایێ ئاڤاکرییە بەرامبەری گوندێ (بیث قیطی). هەمان ژێدەر دبێژیت: دبیت دیرۆکا ڤێ دێرێ بگەهیتە سەدساللییا چوارێ یان دەمەکێ کێم

پشتی وێ، ئەم تشتەکی ل سەر چالاکیێن ڤێ دێرێ و دەمێ نەمانا وێ نزانین.

ئەڤا ئەلبێر ئەبونا هەمان گۆتنە یا دەربارەی دانیال ئاسیایێ نۆشدار د بەریەرێن ١٢٨- ١٢٩ یێن پەرتووکا «دیارات العراق»دا، تنێ هندە زێدەدکەت کو دشیاندایە شوینوارێن وان دو دێران ل زێرێ گوندێ «دێر جندی» ببینین و خەلکی وی جهی د وێ باوەرێدانە کو ئەو دو دێرە بۆ مار دانیالی دزڤرنەڤە کو د بنیاتدا ژ صەعیدێ مسرێ یە. و ئەلبێر ئەبونا د وێ باوەرێدایە کو یەک ژ وان دو دێران یا پەرستڤانێن زەلام و یا دی یا پەرستڤانێن ژن بوو و د وێ باوەرێدایە کو ئەڤ دانیالە دانیالێ نۆشدار (ئاسیا)یە یێ چیرۆکا وی د پەرتووکا (سیر الشهداو و القدیسین)دا هاتی دەڤێ ڤێ چیرۆکێ دبێژیت: ل رۆژهەلاتێ ڤی رووباری – مەرەم یێ رووبارێ مالتایێ (معلثایا)یە- باژێرکەک هەبوو دگۆتنێ «تل حش» دانیالی کچا حوکمدارێ باژێرکی چارەسەر کر، ئەڤ حوکمدارە هاتەسەر ئایینێ مەسیحی و کەنیسەک ل باژێرکێ خوە دێرەک بۆ دانیالێ نۆشدار ئاڤاکر.

ل ڤێرێ تەڤلیهەڤبوونەک دناڤبەرا ڤان دو دێراندا دروستدبیت کو هەردو ب ناڤی و جهی و دامەزرێنەری وەکهەڤن. گەلۆ ئەرێ ئەڤ دێرا دانیالی یا پەرستڤانێن زەلام بوو و دێرا دیتر ئەوا پێشتر ب ناڤێ دێر دانیال ئاماژە پێ هاتیەکرن یا پەرستڤانێن ژن بوویە، ئەڤە ل دووڤ مەزهەبێ مە دوور ناهێتەدیتن ژبەرکو زۆربەی ئەوێن سەرەدانا ڤێ دێرێ دکرن ژن بوون و ب مەرەما چارەسەریێ ژ نەخۆشیێن ب خۆ شیشتنێ ب ئاڤا ڤێ دێرێ دهاتنە ڤی جهی.

## دێرا نردوس[١٢]

ناڤێ ڤێ دێرێ د چیرۆکا ماروسایێ تکریتی ب تایبەت ئەوا دنحای نڤیسی هاتیە، د چیرۆکێدا زانیاریێن باش ل سەر دێران هەنە، چیرۆک ڤەدگێریت کو دێرا نردوسی دەست ژ ئایینزایێ (مەزهەبێ) نەستوری بەردا گەهشتنە ئایینزایێ منوفیزی (یێ باوەری ب یەک سرۆشتی هەی)، ژبەر ڤێ چەندێ ژ ئالیێ برصومایێ نسێبینی ڤە هاتنە چەوساندن و ئێشاندن و گەلەک ژ منوفیزیان بوونە قوربانی، سەرۆکێ دێرێ لعازر ژ وان قوربانییان بوو، ئەڤە ل دەوروبەرێن سالا (٤٨٤- ٤٨٥)ێ بوو.

وی سەردەمی هژمارا پەرستڤانێن دێرێ نێزیکی حەفتێ کەسان بوو، دێر ل گوندێ (مالودە) نێزیکی فەیدیێ هاتبوو ئاڤاکرن، بەری کو دنحا ژیاننامە ماروسایێ تکریتی بنڤیسیت ئانکو ل نیڤا ئێکێ ژ سەدسالیا حەفتێ دێرەکا دیتر ل جهەکێ بلندتر ژ ڤێ دێرێ هەبوو، وی دەمی کەسەک ب ناڤێ زەکی مەترانێ وی وەلاتی بوو، ل ڤێ دێرێ دژیا، دەمێ زەکی مری باوەرداران خواست ماروسا ببیتە ئوسقوفێ وان، وی دەمی ماروسا ل وەلاتێ رۆمێ بوو، ڤەمانا وی ل وێرێ دومکر، بانوهەدرا ل هیڤیا هاتنا وی بوو دابیتە مەترانێ وان، پشتی دو سالان ئانکو ل سالا (٦٢٩)ێ ماروسا گەهشتە کورسیا تکریت میتروپولوتی.

ئەلبیر ئەبونا پرسیارا جهێ دێرا نردوس دکەت و دبێژیت: ئەرێ دێرا نردوسا بنیاتی دکەڤیتە کیرێ و دێرا بلندتر دکەڤیتە کیرێ؟ ئەو ب خۆ د بەرسڤێدا دبێژیت: دبیت هەردو دێر (دێر جندی) بن ئەوێن دکەڤنە نێزیکی گوندێ فەیدیێ. دشیاندایە دیرۆکا ڤێ دێرێ ب رەنگێ ژێری بەرچاڤبکەین:

دێرا نردوس دەست ژ ئایینزایێ نەستوری بەردا و کەتە ژێر چەوساندن و ئێشاندنا برسومایێ نسێبینی و سەرۆکێ دێرێ لعازر ل سالا (٤٨٤- ٤٨٥)ێ هاتەکوشتن، دەمێ ل سەدسالیا پاشتر سەروبەر تەنا بووی ب تایبەت ل سالا (٥٤٠)ێ سەروبەرێ دێرێ گەشبووڤە هەتا ل داوییا سەدسالیا شەشێ بوویە مەلبەندێ ئوسقوفیا (بیث نوهدرا) ا یا منوفیزی، خواندنگەها ڤێ دێرێ ناڤودەنگێ خۆ پەیداکر و (ماروثا) یەک ژ وان کەسان بوو یێ ل وێرێ فێربووی و وی ب خۆ ل وێرێ کارێ فێرکرنێ کریە.. ل دەسپێکا سەدسالیا نەهێ دێرەکا دی یا بچووکتر ل جهێ وێ دێرێ هاتییەئاڤاکرن، ل وی جهی یێ هندەک مێهڤانان دەست ب سەرداگرتی و کریە رەز... تێبینی دکەین کو د وی سەردەمیدا

ئانکو ل سەدسالییا حەفتێ دێرا ماردانیال ئاسیا یێ نۆشدار نەمایە، و ل داوییا سەدسالییا سێزدێ دێرا نردوس (جندی) یێن ئەرسودوکسی دگەل ئوسقوفیا (بیث نوهدرا) یا ئەرسودوکسی نەماینە. و پشتی ڤێ چەندێ ل دەوروبەرێن سەدسالییا پازدێ خەلکەك ژ نەستورریان ل ڤی گوندی ئاکنجی بووینە، و هەردو دێرێن منوفیزی نووژەنکرینەڤە، کو ئەو ژی دێرا بچووکا سەرداترە و ب دێرا بەرزە (الدیر المختفی) ناڤکر.

## دێرا لالش[١٣]

دەمێ توماێ مەرجی د پەرتووکا (الرؤساء)دا ل سەروان ناوسکان (خودێپەرستێن دەست ژ دنیایێ بەردای) دپەیڤیت یێن ل دەڤەرا مەرج (مێرگ) ئەوێن ل شکەفت و کۆلکان ژیاین و دێر دامەزراندین دگەهیتە مژارا قەدیس مار ئیسالاها ئەوێ ل هنداڤ گوندێ لالشێ ژیای و ئەوێ هەموو ژیانا خۆ ب ڤەدەرێ ل قورنەتەکێ ژیای. ئەلبێر ئەبونا یێ پەرتووکا ئاماژەپێکری تویژاندی ل سەر ڤێ چەندێ دبێژیت هەتا نها لالش ب ڤی ناڤی دهێتەنیاسین و دکەڤیتە دەروکێ وی گەلیێ دچیتە پەرستگەها مەزنا ئێزدییان کو جهێ شێخ ئادی یە، قورنەتێ مارئیسلاهای پەرستن لێدکر ئانکو دێرا لالش نێزیکی دو کیلەمەتران ژ ڤێ پەرستگەهێ کو دکەڤیتە هنداڤ باژێرکێ شێخان (ئێسفنێ) یا دوورە.

هندەك ژ دیرۆکنڤیسێن هەڤچەرخ بۆ وێ چەندێ چوونە کو پەرستگەها لالش ب خۆ دێر بوو، بەلێ ئەلبێر ئەبونا ڤێ بۆچوونێ ب نەوەیی دەردئێخیت و دبێژیت: بەلگەیێن دیرۆکی و شوینواری بوونا دێرەکێ ل ڤی جهی ب نەوەیی دەردئێخن، بەلێ دەڤێ توماێ مەرجی داکۆکیێ ل سەر بوونا دێرێ ل جهێ مارئیسالاها دکەت، بۆچوونا توماێ مەرجی ژی ژ بۆچوونا جان فییە د پەرتووکا «ئێشور المسیحیه« هاتییەوەرگرتن.

## خەرابە دێر[١٤]

جان فییە د پەرتووکا خوەیا ناڤدار (أشور المسیحیة)دا ئاماژە ب ڤێ دێرێ کرییە و ئەلبێر ئەبونا ژی هەر ژ وی ڤەگوهاستییە و دبێژیت: ب دووراتییا دو کیلومەتران ژ ناحیا ئاسهێ یا سەر ب زاخۆڤە گوندەك هەیە دبێژنێ «بلقوز» ل ژێرییا چیایێ بێخێری، رێڤەبەرییا گشتییا شوینوارێن عیراقێ دبێژیت: کو خرابەیێن دێرەکێ ل وێرێ هەنە دبێژنێ خەرابەدێر (خربە الدیر) لێ ئەم تشتەکی ژێ نزانین، دوور ناهێتەدیتن تنێ کەنیسەکا کەڤنا وی گوندی بیت.

رێڤەبەرییا گشتییا شوینواران ل عیراقێ ئەڤ جهە ب ناڤێ (الدیر- خربە)ل گوندێ «بلقوز»ێ رۆژهەلاتێ گوندێ ئاسهێ یێ نها سەر ب ناحیا باتیلێ قەزا سێمێلێ توومار کرییە.

## دێرا مار حەنانیا[١٥]

جان فییە د پەرتووکا خوە (أشور المسیحیة) دا ئاماژە ب ڤێ دێرێ کرییە و ئەلبێر ئەبونا ژی ژ وی ڤەگوهاستییە و گۆتییە: ئەم تشتەکی بەرفرەهـ ل سەر ڤێ دێرێ نزانین و د ژێدرێن مەیێن کەڤندا چ پێزانین ل سەر ڤێ دێرێ نەهاتینە.

شوینوارێن ڤێ دێرێ ب دووراتییا شەش کیلومەتران دکەڤنە ژێریێ رۆژهەلاتێ دهۆکێ ل بەرۆشکێ، شوینوارێن وێ مەزنن و نیشانا گرنگییا ڤێ دێرێ یە کو هەتا سەدسالییا هەڤدێ زایینی یا ئاڤابوو.

هەروەك ئەلبێر ئەبونا دیاردکەت کو ئەم تشتەکی ل سەر ژیاناما ڤی مار حەنانیای نزانین، دبیت دێر ب ناڤێ شەهیدەکێ خودان باوەری لێ نە ژ زەلامێن ئایینی ل ئەربیلێ هاتییەشەهیدکرن هاتبیتە ناڤکرن، پاشتر هندەك ژ گیانێ وی هاتییەڤەگوهاستن بۆ ڤی جهی، هەروەسان ل ئەربیلێ کەنیسەك ب ناڤێ ڤی قەدیسی هەبوو، بەلێ ل دەسپێکا سەدسالییا چواردێ هاتییەخرابکرن، دبیت ئەڤە ژی ئاماژە پێکرنەك بیت کو بنیاتێ مار حەنانیای ژ ئەربیلێ بیت.

ئەدی شێر د پەرتووکا «کلدو أشـور»دا ئاماژە ب شەهیدەکێ ئەربیلێ ب ناڤێ حەنانیا دکەتکو ل ١٢ کانوونا دووێ ٣٤٦ێ هاتییەشەهیدکرن، ئەو خودان باوەرەك بوو ژ ئەربیلێ، ب فەرمانا ئازروشاغی

هاتیەگرتن و گەلەك هاتەئەشکەنجەدان دەمێ های ژ خۆ نەمای مەجوسان وەسان هزرکری کو یێ مری و ئەو هاڤێتە بازاری، پاشتر مەسیحییان ئەو ب دزیڤە راکر، ئەسقوف (مارل زخا)ی و گەلەك ژ مەسیحییان سەرەدانا وی کرن، هاتەڤە هشێن خۆ و ب ناڤێ مەزناتییا خودێ پەیڤەك بۆ وان خواند و پاشتر روحا وی دەرکەت، کلدان ل ١٢ کانوونا ئێکێ و لاتین ل ١٠ ای شانەدێرا وی دگێرن. هەژیە بێتەگۆتن کو جان فییە ئاماژە ب دێرەکێ ب ناڤێ (حنانیا) ل دەڤەرا چیایێ جودی دکەت.

## دێرا کوانێ (دێر کوم)[١٦]

یاقوتێ حەمەوی د هەردو پەرتووکێن خۆ «معجم البلدان و الخزل و الدال»دا ئاماژە ب ڤێ دێرێ کرییە، د « الخزل و الدال»دا دبێژیت دێرا کومە دێرەکا کەڤنە نێزیکی ئامێدیێ ل وەلاتێ هەکارێ ژ دەڤەرێن سەر ب مووسلێ ڤەیە، نێزیکی وێ گوندەك هەیە هەر ب ناڤێ دێرێ (کومە) هاتییەناڤکرن، هەتا نها ئاڤادانە. ئەڤە وێ چەندێ دسەلمینیت کو دێر و گوندێ ب رەخڤە هەتا سەردەمێ یاقوتێ حەمەوی (١١٧٩-١٢٢٩) د ئاڤابوون.

صەفی دینێ بەغدادی ژی دبێژیت: دێرا کومە نێزیکی ئامێدیێ وەلاتێ هەکارێ سەر ب مووسلێ ڤە، کومە گوندەکێ نێزیکی وێ یە. هندی پەیوەندی ب زڤراندنا ناڤێ دێرێ بۆ سەر ناڤێ گوندی هەی یاقوتێ حەمەوی دبێژیت: دبیت راستی بەروڤاژی بیت ئانکو کومە و کومانێ یان دێر و کومانێ بۆ دێرێ بزڤریتەڤە.

ژ زاردەڤێ خەلکێ دەڤەرێ ناڤێ (دێرێ) هەردەم دگەل (کومانێ) هەڤالناڤە، دبێژن دێرێ و کومانێ هەروەك تنێ یەکناڤ بیت و بیرا مە ل ناڤێ (دێر کوم) دئینیت: دێرا رەش: دێرەش هەروەکی ژ زاردەڤێ کوردێن دەڤەرێ دهێتەگۆتن.

دەمێ (یوحەنا بن کلدان) ل سەر مامۆستایێ خوە «یوسف بوسنایا» دنڤیسیت دبێژیت: شێخێ پیرۆز ژ ژیانا مرۆڤان بارکرە جەم خودایێ خۆ، دژیێ پیراتیەکا هەرەمەزندا کو نێزیکی سەد و پێنجی سالاندا بوو، دەمێ پەرستڤان یوسف بوسنایا دیتی، ئەو ژ مامۆستایێ خۆیێ بەرکەتی یێ باهربوو، نەڤیا ئەو ب خۆ خۆ ب رێڤەببەت، لەوما قەستا پەرستڤان ئیشوعی یێ ناڤدار ب کوماتی کر، (ئەلبێر ئەبونا ب کومانی دنڤیسیت)، ئەڤ کەسێ طوباوی یەك ژ شاگردێن پەرستڤان (یوحنا الخلفتی) بوو کو ژ گوندێ «خلفتا» بوو کو گوندێ «خلفت» یێ نهایە و دکەڤیتە رۆژهەلاتێ خازری ب دووراتییا ٢٥ کیلومەتران ژ رۆژئاڤایێ ئاکرێ، و ل دێرا پەرستڤان هرمزی ل سەر ژیانا پەرستڤانیێ فێربوو، دەمێ پەرستڤان یوحنایێ مامۆستایێ وی مری، پەرستڤان ئیشوع ژ دێرێ دەرکەت و چوو یەك ژ چیایێن ژووری یێ دگۆتنێ «کومتا». کومتا پەیڤەکا سریانیە ئانکو رەشرەشك.

وەرگێرێ پەرتووکا «یوسف بوسنایا» قەشە یوحەنا جولاغ دبێژیت: دوورنینە چیایێ کومتا پشکەك بیت ژ چیایێ گارە ئەوێ دکەڤیتە ژێریێ ئامێدیێ، دێرەك ل وێرێ هەبوو یاقوتێ حەمەوی ئاماژە پێکرییە. د بەردەوامییێدا جولاغ دبێژیت: نها ل دەڤەرێ دو گوند هەنە ناڤێن وان ژ (کوم) هاتینەوەرگرتن، ئێك ژ وان گوندێ کومانێ (کوانێ)یێ نهایە کو دکەڤیتە دووراتییا سێ کیلومەتران ژ رۆژهەلاتێ ئامێدیێ، ل ژێریا کوانێ ب دووراتییا حەفت کیلومەتران گوندەك دی هەیە دبێژنێ دێرەشێ، ئەڤە گۆتنەکا کوردی یە ئانکە دێرا رەش، کورد ل ڤی گوندی دژین، گەلەك ناووسکێن د کەڤری کۆلای لێ هەنە، خەلکێ گوندێن مەسیحینشین دبێژنێ «مار ساوا» و هەتا نها ل مەها تیرمەها هەموو سالەکێ سەرەدانا وی جهی دکەن.

ژ ئەڤا چوویی دیاردبیت کو دامەزرێنەرێ ڤێ دێرێ هەڤچەرخێ یوسف بوسنایا بوویە ل سەدسالییا دەهێ زایینی.

## دێرا مار میلس[٧]

ئەڤ دێرە دکەڤیتە گوندێ تلخشێ (تل خشف) ل دەڤەرا ئەلقۆش باکوورێ چیایێ بەنداوایا (بیهیندویا)

یان (گورا دداکان- چیایێ داکان)، وەسان دیارە ئەڤ دێرە ل سەدسالیا پێنجێ زایینی هاتییەدامەزراندن.

دهێتە گۆتن کو تلخشێ ببوو بازێرکەکێ گرنگ ل وێ دەڤەرێ، لەوما داخوازا ئوسقوفەکێ کر، ئەڤ داخوازە ژ مەتران (بیث لافاط)کر. دهێتەگۆتن کو مەترانی کەسەك ب ناڤێ (میلیس) ب بەرەکەتا ناڤێ (مار میلیس) ئەوێ ل دەوروبەرێ (٤٢٤ز)ێ ل ئەهوازێ شەهیدبووی بۆ وان دانا، ئەڤ (میلیس)ە وەك یەکەمین ئوسقوفێ (بیپ نوهدرا) هاتەدانان، دگەل وەرگرتنا کاروبارێن ئەبرەشیێ کەنیسەك ل وێرێ ئاڤاکر، بەلێ رۆژەکێ مەجۆسان ب سەرداگرت و بەریارانکر.

هەتا نها شوینوارێن دێرا (مار میلیس)ی ب دووراتییا ١٥٠٠ مەتران ژ رۆژهەلاتێ گوندێ تلخشێ ماینە، ل نیڤا سالێن چلان ژ سەدسالیا بیستێ من ب خۆ دیتینە، ژ دێرێ شوینوارێ هەیوانەکا مەزن دگەل خاچەکێ نکراندی ب ئەندازا ٨٠× ٦٠سم و هندەك شوینوارێن دی مابوون، ئەلبێر ئەبونا دبێژیت ئەو شوینوار دزڤرنەڤە سەدسالیا چواردێ، وەك شەفیعێ کەنیسا گوندی ناڤێ (مار میلیس)ی د گەلەك دەستنڤیساندا کو دزڤرنەڤە سەدسالیێن هەڤدێ و هەژدێ هاتییە.

خەلکێ دەڤەرێ ڤەدگێرن کو ئوسقوفێ تلخشێ د بنیاتدا هندی یان مەغولی بوو، بۆ خۆ جهەکێ هاڤینی و کەنیسەیەك ل سەر وی گری ئاڤاکربوو یێ کەنیسا (مار گورگیس)ی ل گوندێ بانداوایێ (بیهندوایا) دکەڤیتێ و ناڤێ ڤی گوندی ژ (بی) کورتکرنا پەیڤا (بیپ)یا سریانی و (هندوایا) ئانکو هندی دهێت و ب ڤی رەنگی دبیتە (مالا یێ هندی).

## دێرا (مار اثقن)[18]

ئیشو عەدناحێ بەسری د وێ باوەریدایە کو مار ئەسقن (مار اثقن) ژ دەڤەرا باجرمێ یە، خوەدیێ پەرتووکا (ذخیرة الاذهان) ژی پشتەڤانییا وی دکەت. مار ئەسقنی دێرا خۆ ل سەدسالیا حەفتێ زایینی دامەزراندییە، دواجار ناڤێ وێ هاتی ل سەدسالیا هەڤدێ بوویە، ئەڤ دێرە دکەڤیتە دەڤەرا سندی باکوورێ زاخۆ نێزیکی گوندێ (ئومەرا)، ئەڤ گوندە ب ناڤێ (دێرشیش)ژی دهێتەناڤکرن، ئەو ژی داکو ژ (ئومەرا) یەکا دیتر بێتەجوداکرن کو گوندێ (مار سبریشوع)ێ دامەزرێنەرێ دێرا رویلێ کەشخە (الغاب الجمیل)یە، گوندێ دێرشیشێ دکەڤیتە ژێریا چیای ناڤبەرا هەردو گوندێن یەردا و سەناتێ ل سەر سنوورێ ناڤبەرا ترکیا و عیراقێ. ئەڤ دێرە دکەڤیتە گەلییەکێ ژووردانی ژ گوندی ب دووراتییا نیڤدەمژمێرێ. ئەلبێر ئەبونا د پەرتووکا خۆدا دیاردکەت کو وی ل سالا (١٩٥١)ێ سەرەدانا شوینوارێن ڤێ دێرێ کرییە ژوورەك تێدا دیتییە هێژ یا ئاڤابوو و مینا ئاڤاهییەکێ دو نهۆمی (دو قاتی) بوو.

خەلکێ گوندێ دێرەشیشێ سەرەدانا ڤێ دێرێ دکر و ل ئێکشەمبیا ئێکێ ژ مەها کانوونا دووێ شانەدێرا وێ دکرن و گەلەك عەجێبی ددانە پال ڤێ دێرێ.

مار ئەسقن ل دێرا ئەزەل (الدیر الکبیر) فێری ژیانا ناسکێ (خودێ پەرستیا دەست ژ دنیا بەردانێ) ببوو، ژ وێرێ بەرەڤ دێرا صلیبیا ل نێزیکی ئێسفنێ چوو ل وی جهی یێ ب (بیپ ێسیا) دهێتەنیاسین، ئیشو عەدناحێ بەسری دبێژیت: مار قبریاقوس قوتابیێ صلیبایێ ئوسقوفێ بەلەد دەمێ ناڤودەنگێ وی بەلاڤەبووی خەلکێ وی جهی قەستا وی کر و دگەل خۆ قانوونا مار قبریانوسێ نصێبینی دگەل خۆ ئینابوو و ژێ خواستن ببیتە ئوسقوفێ وان، دێر دادەست قەدیس مار ئەسقنی و کرە سەرۆکێ دێرێ.

مار ئەسقن ژی هەڤالێ یوسف حەزایا بوو کو ئەو ژی خویندکارێ مار قبریانوسی بوو، بەلێ مار ئەسقن گەلەك د سەرۆکاتییا دێرا صلیبیادا نەما و دەست ژی بەردا و چوو دێرا ئەفنیماران، و ژ وێرێ بەرەڤ چیایێن ژووری چوو و ل وێرێ دێرا خۆ ئەوا مە ئاماژە پێکری دامەزراند و دەمێ مری هەر ل وێ دێرێ هاتەڤەشارتن.

ژیانا پەرستڤانیێ یا مارئەسقەنی ل دێرا مەزنا چیایێ ئەزلا دەسپێکرییە، پاشتر زڤریەڤە بانوهەدرا (دهۆکێ) و مایە ل دێرا پەرستڤان صلیبا (دێرا صلیب) ل بێرستەکێ نێزیکی (ئێسفنێ) و بوویە سەرۆکێ سێیێ یێ دێرێ، ژ ئەنجامێ دانانا پەرستڤان قریاقوسی

# ئەرمەنی ل بەهدینان

ئادگار هاكوب بێدرۆس ئەبراهامیان
وەرگێران: موسەدەق تۆفی

## دەسپێك:

**كورتییەك ل سەر مللەتێ ئەرمەن**

ئەرمەنی وەك ب زمانێ وان ب خۆ ب (هایر- Հայեր) دهێنەناڤكرن، مللەتەكێ سەر ب رەگەزێ ئاری (هند و ئەوروپی) یە وەك كورد و فارس و سلاڤ و یێن دی. مللەتێن هندو ئەوروپی ب دو پێلێن مەزن ژ وارێ خۆ دەركەتینە و ل وەلاتێن ئاسیا ناڤین هەتا دوورترین جهێن رۆژئاڤای بەلاڤبووینە، پێلا ئێكێ بووینە دو جوین: یەك ژ وان هاتینە وەلاتێن هندێ و ئیرانێ و مللەتێن هندی ئیرانی و ماری ژێ پەیدابووینە، هندیكە پێلا دووێ یە پشتی كو ژ دەریاكێ ئۆرال و دەریایێ خەزەر دەربازبووین چووینە د ناڤ ئەوروپادا. پشتی كو چەندین نفشێن وان ل باكوورێ كنارێ دەریایێ رەش ئاكنجیبووین ل سەر چەندین پێكهات و كۆمان بەلاڤەبوون، رەگەزێن هندو ئەوروپی ل ئەوروپا ژێ چێبوون، پێكهاتا ئەرمەنی ژڤان رەگەزان بوو و بەرەڤ ژێریێ ئەوروپا چوو، ژ رووبارێ (الطونه) دەربازبوو و ل تركیا ئاكنجیبوون، و ژ وێرێ ژ پەنگاڤا دەردەنیل بەرەڤ ئاسیا بچووك دەربازبوون و دگەل مللەتێ بروكی گەهشتنە ئێك[1].

هندیكە پەیوەندی ب بوونا وانڤە ل عەردێ ئەرمەنستانێ یێ دیرۆكی- بانیا ئەرمەنانڤە هەی كو دكەڤتە پشكێن ناڤین و رۆژهەلاتێ ئاسیا بچووك (نها دكەڤیتە تركیا)، ل دووڤ ڤەكۆلینێن زمانڤانی و شوینواری یێن نوو و رەوشت و تیتالێن ژیابوباپیرانڤە ماین دژڤریتەڤە هزارا سیێ بەری زایینی[2]. ل دووڤ بۆچوونا هندەك دیرۆكنڤیسان رووبەرێ ئەرمەنستانێ دگەهیتە(٣٥٨)هزار كم٢ كو دوازدە جاران تەمەت رووبەرێ نهایێ كۆمارێ ئەرمەنستانە.

دیرۆكنڤیسێ یونانی هیرۆدوتس (٤٨٤- ٤٢٥ پ.ز) دەربارەی پەیوەندیێن ناڤبەرا ئەرمەنستانێ و وەلاتێ ناڤبەرا دو رووباران دبێژیت: ئەرمەنان ب رێكا رووبارێ فراتێ كەرەستە دبرنە بابل و ل وێرێ دفرۆشتن، د توومارێن ئاشووریاندا ب (ادرو- ئادری)هاتینەنیاسین، ل هزار سالیا ئێكێ بەری زایینی هەڤپەیمانییەك د ناڤبەرا وەلاتێ نایری و ئۆرارتو دروستبوو، ژ ئەنجامێ هەڤسنووریا ناڤبەرا ئەرمەنستانێ و عیراقێ دیاردەكا ئاساییە كو ژ كەڤن وەرە ئەرمەن ل عیراقێ هەبن[3].

چەند شاهەكان ژ مالباتا (یروانتی- ئەرداشیسی) حوكمداری ل ئەرمەنستانێ كرییە[4]. ناڤدارترین شاهێ وێ قوناغێ شاهـ دیگرانێ دووێ (٩٥- ٥٥ پ.ز) بوو كو ب شاهێ شاهان هاتبوونیاسین ئەو ژی پشتی كو شاهێ فارسان بۆ وی دەست ژ ڤی نازناڤی بەردای،

ڤی شاهی هندەك ژ وەلاتێ فارس، عیراق، سوریا، فەلستین و لبنان ژی دانە دگەل شاهنشینییاخۆ[٥].

سالا ٣٠١ز ئەرمەن ب رەنگەكی فەرمی هاتنە سەر ئایینێ مەسیحی، ب ڤێ پێنگاڤا ئەرمەنستان یەكەمین دەولەتە ل جیهانێ هاتییە سەر ئایینێ مەسیحی. ل سالا ٤٠٦ز قەشە میسروب ماشتوسی ئەلیفبێتكا (پیتێن) ئەرمەنی داهینا و پەرتووكا پیرۆز هاتەوەرگێران بۆ سەر زمانێ ئەرمەنی، ب ڤێ چەندێ چەرخێ زێرینێ ئەدەبیاتا ئەرمەنی دەسپێكر، پرانییا پەرتووكێن زانستی، رەوشەنبیری، دیرۆكی و ئایینی یێن وی سەردەمی هاتنەوەرگێران بۆ سەر زمانێ ئەرمەنی[٦]. هەتاكو دەقێ رەسەنێ هندەك ژ ڤان نڤیسینان بەرزەبووینە لێ وەرگێرانا وان یا ئەرمەنی مایە، هەژییە بێتەگۆتن چەرخێ وەرگێرانێ بۆ سەر زمانێ ئەرمەنی ب چەند سەدسالییەكان كەتییە پێش چەرخێ وەرگێرانێ ل دەولەتا عەرەبیا ئیسلامی، هەروەسان مللەتێ ئەرمەن بەری مللەتێ ئەلمان ب نیزیكی ١١٠٠ سالان پەرتووكا پیرۆز وەرگێرایە سەر زمانێ خۆ[٧].

ناڤێ رەسەنێ وەلاتێ ئەرمەنان (هایك)ە، د چەرخێن ناڤیندا ئەڤ ناڤە هاتییەگۆهارتن و بوویە (هایاستان) پشتی كو پاشگرێ (ستان)داینە دگەلدا، ستان ئانكو عەرد هایاستان ئانكو عەردێ ئەرمەنان، (هایك) ب خۆ ئانكو بابێ ئەفسانەییێ ئەرمەنان، ئەو ژی هەروەك ژێدەرێن ئەرمەنییێن كەڤن دبێژن: نەڤییێ نوح پێغەمبەری یە، هەر وی ژی وەك دیرۆكنڤیس موفسیس خورینی دیاردكەت ل سالا ٢٤٩٢پ.ز سەركەتن ل سەر شاهێ بابلی (بیل) ی دەستڤەئینایە و ئومەتا خۆ ل دەڤەرا ئارارات دامەزراندییە و هەروەك هەمان دیرۆكنڤیس دیار دكەت پەیڤا (ئەرمەنیا) ژ پەیڤا (ئارام) هاتییە[٨]. هەروەسان د پەرتووكا پیرۆز (العهد القدیم)دا جهێ ئەرمەنان ب (بیت توركوما) هاتییەناڤكرن[٩].

## ئەرمەن ل بەهدینان

**بوونا وان، ژیانا ئابووری، جڤاكی و سیاسی**

### ١) ئەرمەن ل زاخۆ

سولتان عەبدولحەمیدێ دووێ (١٨٧٦- ١٩٠٩) ل پاییزا ١٨٩٥ێ فەرمانا كوشتنا هەموو ئەرمەنان دا یێن ب تركی یان كوردی یان عەرەبی دپەیڤن[١٠]، ئەو خۆنیشادانا حزبا هەنجاك دژی وی ئەنجامدای بۆ خۆ كرە مهانە داكو ب كوشتارا وان رابیت، ئەوبوو سولتانی هاندانا ترك و كورد و چەركەسان كر بۆ كوشتنا ئەرمەنان..

ل نیسانا ١٩٠٩ێ مشەختبوونا ب زۆریا ئەرمەنان ژ ئەدەنەن ستەنبۆلێ، موشێ، وانێ، قەرسێ، كارین (ئەرزرۆمێ) ب كاروانێن جودا جودا دەسپێكر، جەندرمێن تركان ب سەدان ژ ئەرمەنان ژ مالێن وان دئینانەدەر و بەرەف رێكێن چیایی و ئاسێ و پر ئاستەنگ یان رێكێن بیابانیێن هشكر بێ خوارن و بێ ئاڤ دبرن داكو ب رێڤە بمرن و تەرمێن وان بهێلنە ل چۆلی، درندەیی گەهشتبوو ئاستەكی زكێ دایكێن دو گیان د دراندن و دایك ب زارۆكڤە دكوشتن، گەلەك ژ ژن و كچێن ئەرمەنان خۆ ژ بلنداهییان دهاڤێتەخوار دا زێدەگاڤی ل سەر ناموسا وان نەهێتەكرن[١١]. پێدڤییە ئاماژە ب وێ چەندێ بكەین كو مشەختكرنا ئەرمەنان ژ وەلاتێ وان ب سێ رێكان دهاتەئەنجامدان

١- مشەختكرن وەك كاروانان.

٢- مشەختبوونا كەسێن نێزیكی ئێك دگەل هەڤدو، ئانكو داچەند خێزانەك خۆ دەنە دگەل ئێك ژ بازێرێن خۆ بەرەف زاخۆ دەنەرێ.

٣- مشەختبوونا مالباتەكێ یان خێزانەكێ ب تنێ ب هاریكاریا سەرۆكێ خێزانی بەرەف زاخۆ دهاتن ژبەركو بەرگوهێن وان كەتبوو كو زاخۆ گوندەكێ تەنایە و نێزیكی سنوورێ تركیایە[١٢].

یەك ژ وان مشەختێن ئەرمەن ئەوێن ژ سێرتێ هاتینە زاخۆ ڤەدگێریت: ٢٥ رۆژان ب پێیان ئەم ژ سێرتێ هاتین هەتا ل رۆژا ١٩١٥/٧/١٠ێ ئەم گەهشتینە زاخۆ، هند ئەم وەستیاین و ماندی بووین و نەخۆشی مە ب رێڤە دیتن ئەگەر پێڤاژوویا مە هەفتییەكا دی ڤەكێشابا كەس ژ مە ب ساخی نەدگەهشتە زاخۆ، ئەم د ترسیاین ژ بەركو ئەم چاڤترسیای بووین

و مە هزردکر کو کوردێن زاخۆ ژی وەك کوردێن ترکیا دێ هێرشێ ئینەسەر مە و وەك گوندێن دی یێن ترکیا یێن کەتینە د رێکا مەدا دێ زیانان گەهیننە مە، بەلێ یا مە دیتی بەرۆڤاژی بوو خەلکێ زاخۆ خەلکەکێ جوامێر و خێرخواز بوون و ب دلۆڤانی سەرەدەری دگەل مەکر. خەلکێ زاخۆ پێشوازی ل مە کر، ئەم ل خانەکا تاخێ گوندکی ئاکنجیکرین، مە باوەرنەدکر کو هێژ ئەم د زیندوونە، حەفت رۆژا ئەم ماینە ل وێ خانێ خەلکێ زاخۆ هەموو رۆژان خوارن بۆ مە دئینا، بێی بەرامبەر هاریکاریا مە دکر[13]. پشکەك ژ ئەرمەنێن مشەختێن ژ دهێ هاتین ل تاخێ جوویان (وی دەمی هێژ جوو ل زاخۆ هەبوون)، نیڤا دیتر ل تاخێ کێستە کو یێ مەسیحیێن شەرانشێ بوو ئاکنجیبوون[14]، رووبارێ خابووری د ناڤبەرا هەردو تاخاندا بوو، هاتنوچوون د ناڤبەرا هەردو تاخاندا ل هاڤینێ یا ب ساناهی بوو بەلێ ل زڤستانێ ژبەر لەهیان یا دژوار بوو پێدڤی د رێکا پرا بەری (پرا دەلالێ) را دەرباس ببان و ب دەمژمێرەکێ ژ ڤی تاخی چووبانە تاخێ دیتر[15].

ل سالا ١٩٢٣ێ دێرا ئەرمەنان ژ دارا و ئاخێ و ب بیشا ئەرمەنێن ئاکنجیێن زاخۆ ل نێزیکی جووا حازم بەگی هاتەئاڤاکرن، پشتی وێ ب دەمەکی ژ ئەنجامێ رەنجا قەشە (ابراهام ساهاکیان) و بێشێن ئەرمەنیان کۆمکرین ل سالا ١٩٣٢ێ دێرەکا مەزنتر ژ یا بەرێ بەلێ هەر ب ئاخێ هاتەئاڤاکرن[16]. ئەڤ دێرە رۆژا ٦ کانوونا دوویێ١٩٣٢ کو رۆژا بوونا عیسا پێغەمبەری (س) یە هاتەڤەکرن و (الاب ابراهام) دگەل شەماسەیان موسا عەزو و مەلکون بلیشی و ستراك فاغو یەکەمین رێورەسمێن پیرۆز (قداس) ل ڤێ دێرێ برێڤەبرن، ل سالێن ١٩٣٢- ١٩٣٤ێ هەموو ئەرمەنێن تاخێ جوهیان ڤەگوهاستنە تاخێ کێستە ژ بەرکو ئەرمەن کەسانێن تەنا و زیرەك و دلسۆزن د کارێن خۆدا حازمێ محەمەد شەمدین ئاغای پێشنیاز بۆ وان کر کو هندەك مولکێن خۆ بفرۆشیتە وان و ئەو ب قست حەقێ خۆ بدەن هەتا داوی دهێت، ئەو بوو ئەرمانان بۆ خۆ خانیێن ئاخێ ئاڤاکرن، و ل سالا ١٩٣٢ێ

(دوو زەلامێن ئەرمەنێ ١٩٠٤)



یەکەمین خواندنگەهـ بۆ فێرکرنا زمانێ ئەرمەنی ل وێرێ هاتەڤەکرن[17]، مامۆستایێ زمانێ ئەرمەنی ل ڤێ خواندنگەهێ نوبار بابازیان بوو، هندیکە ئاڤاهیێ نهایێ دێرێ یە دگەل خواندنگەهەکا شەش رێزی ل سالا ١٩٦٨ی ل سەر کیستێ دەولەمەندێ خێرخوازێ ناڤدار کولبنکیان هاتنەئاڤاکرن و خویندکارێن ڤێ خواندنگەهێ هاریکاریێن دراڤی و کەرەستەیی ژ سازیا کولبنکیانی وەردگرتن[18]. هەروەسان هندەك ژ ئەرمەنێن مشەخت ل تاخێ رکاڤا و کێستە ئاکنجیبوون و کارێ چێکرنا شەل و شەپکا و بازرگانیا پەرۆکان و چێکرنا پێلاڤان و پنیدۆزی دکرن، د کارێن خۆدا خودان شیان و دلسۆژ و جهێ باوەریێ بوون و پەیوەندیێن ناڤبەرا وان و خەلکێ باژێری ل سەر بنیاتێ رێزگرتنێ ل هەڤدو بوو[19].

هندی پەیوەندی ب بوونا ئەرمەنان ل زاخۆ هەی، دشیاندایە بێژین ئەو دو پشکن، پشکەك ژ وان

دشیاندایە ب ئاکنجیێن رەسەنێن باژێری بهژمێرین، راستیا ڤێ چەندێ ژی د چەند ژێدەرەکاندا دیاردبیت، گەرۆك جون ئاشری یێ ل سالا ١٨٦٤ێ سەرەدانا زاخـۆ کری ئاماژە پێ دکـەت کو: خەلکێ زاخۆ پێکهاتەکا تێکەلە ژ کورد و کلدان و ئەرمەنان، هەروەسان هندەکان ئاماژە پێکرییە کو پرانییا مەسیحیێن زاخۆ ل نیڤا دووێ ژ سەدسالیا نوزدێ کلدان و ئەرمەن بوون، د سالناما سالا ١٨٩٤ێ یا ویلایەتا مووسل دا هاتییە کو هژمارا ئەرمەنان ل زاخۆ (٢٥) کەس بوو، بەلێ ل دووڤ سالناما ویلایەتا مووسلێ یا سالا ١٩١٢ێ هژمارا وان (٦٨) ژن و مێر بـوون[٢٠]. پشکا دووێ ژ ئەرمەنێن زاخۆ ئەرمەنێن مشەختن، د ڤی واریدا دهێتەگۆتن دەمێ دەستەکا ئیتیحادیان (حزبا اتحاد و ترقی) ل سالا ١٩١٥ێ فەرمانا ب زۆری مشەختکرنا ئەرمەنان دەرێخستی گەلەکان ژ وان د دەمێ مشەختکرنێدا گیانێ خۆ ژ دەستدا[٢١] هندیکە پشکا دووێ ژ ئەرمەنێن زاخۆ، ئەو ئەرمەنن یێن سالا ١٩١٥ کەتینە بەر هەوا کوشتار و مشەختکرنا دەسەلاتدارێن ئوسمانی دژی وان راگەهاندین، پشکەك ژ ڤان یێن هاتینە مشەختکرن بەرەف ژێرێ کوردستانێ ب تایبەت بۆ دەڤەرا زاخۆ هاتن، خەلکێ زاخۆ پێشوازییەکا گەرم و هاریکاری و هەڤسووزییەکا باش بەرامبەری وان دیارکر، ئەڤە ژی بوو ئەگەرێ ڤەمانا وان ل باژێری[٢٢].

هاتنا ئەرمەنان ژ وارێ وان بۆ زاخۆ نە تنێ ب ئێکجار بوو، بەلکی ب چەند جارەکان بوو و د چەند سالەکاندا بوو، یەکەمین گەرا هاتنا وان د سالا ١٩١٥یدا بوو و یا بەردەوام بوو هەتا سالێن بیستان ژ سەدسالیا چوویی، ل دەسپێکێ هژمارا وان نێزیکی (٦٠) خێزانان بوون، لێ گەر ل دووڤ گەرێ هژمارا وان زێدەبوو هەتا گەهشتییە (٢٥٠) خێزانان[٢٣]. پتریيا ڤان مشەختان ژ گوند و باژێرکێن دهێ و شەرنەخ و سێرتێ هاتبوون، نیڤا وان ل تاخێ جوویان نیشتەجێبوون و نیڤا تر ل تاخێ کێستە دگەل کلدانێن شەرانشێ کو بەری ئەرمەنان ل وێرێ دژیان[٢٤]. جوینەکێ دی ژ ئەرمەنان ل قەزا دهێ موسلمان ببوون و ب موسلمینی هاتنەناڤکرن ئەو ژی ل سالا ١٩١٥ێ مشەختبوونە زاخۆ، ل سالا ٢٠١٢ێ هژمارا وان پتر ژ ٤٠٠ کەسان بوون[٢٥]. ئێك ژ وان ڤەدگێریت: دەمێ موسلمینی هاتینە زاخۆ تنێ دو خێزان بوون ئەو ژی:

١- مالا شاهین بیدروس ئادەم.

٢- مالا (هوهان) عەبدوللا حەجی ئیبراهیم ئەتلاس (اطلاس)[٢٦]

ل سالێن پێنجییان ژ سەدسالیا چوویی هاتنە زاخۆ و ب (مالێت موسلمینییا) ئانکو خێزانێن ئەوێن موسلمان بووین دهاتنە نیاسین، موسلمینییا پەیوەندیێن خێزانی یێن دگەل هەڤدو هەبوون، وەك مالا شەوقی موسلمینی، کوری موسلمینی، جەمیل موسلمینی، محەمەد سلێمان موسلمینی نایف موسلمینی، سەبری موسلمینی، حەسەن موسلمینی، فەرمانێ موسلمینی، شوکری و موسلمینی و خێزانا بەدرە صوری موسلمینی و نها پتریيا وان دەولەمەندێن زاخۆ نە[٢٧]. نها (٢٠٠) خێزانێن ئەرمەن ل زاخۆ دژین نێزیکی (٧٥٠) کەسانە.

ئەرمەنان پەیوەندیێن جڤاکیێن زۆر باش دگەل برایێن خۆیێن موسلمان ل زاخۆ هەنە، ل سەر بنیاتێ برایینی و خوشتڤیێتی و رێزگرتنێ ل هەڤدو و وەکهەڤیێ ب هەڤرا دژین، ب رەنگەکی یا ب زەحمەت بوو جوداهیێ بێخیە ناڤبەرا ئەرمەنییەکی یان موسلمانەکی یان کلدانەکی، ژبەرکو پەیوەندیا ناڤبەرا هەر هەموویان پێکڤەژیان و پێکڤەکارکرن بوو، تنێ ئایینی ئەو ژ هەڤجوداکرن و هەر ئالیەکی رێز ل بیرباوەرێن ئایینی یێن ئالیێ دیتر دگرت[٢٨].

پشکەك ژ زەلامێن ئەرمەنان ب تایبەت ئەوێن دانعەمر جلکێن کوردی (شەل و شەپکان) دکەنە بەرخۆ، ژنێن وان ژی هەمان جلکێن ژنێن کورد دکەنە بەرخۆ، چ جوداهی د ناڤبەرا جلکێن ژنێن کورد و ئەرمەندا نەبوو، هندیکە ژنێن مەزن و شووکرینە دەرسوکەکا سپی دکرنە سەرێ خۆ و کچان ژی هەمان جلکێن کوردی دکرنە بەر خۆ بەلێ بێی دەرسوك[٢٩]. داوەت ژی هەمان داوەتێن کوردان بوون ل دووڤ دەهول و زۆرنایێ بوون[٣٠].

دەربارەی رێورەسمێن ژنخواستن و ڤەگوهاستنێ پشتی کچ دهێتەخواستن و بەرهەڤی بۆ ڤەگوهاستنێ دهێنەکرن بەرەف دێرێ دچن و رێورەسمێن پێکئینانا ژیانا خێزانداریێ ل دێرێ دهێنەکرن، ئەڤە ژی ژبەرکو ژنمارکرن ئێك ژ نهێنیێن دێرێ یە، ئاهەنگا ژنئینانێ سێ رۆژان ڤەدکێشیت ب رەنگێ ژێری[٣١]:

رۆژا ئێکێ: بەرهەڤی دهێنەکرن هەڤال و کەسوکار دهێنەگازیکرن.

رۆژا دووێ: کو ب شەڤا خەنایێ دهێتەناڤکرن دەستێن بویك و زاڤا دهێنەخەناکرن، د ئاهنگێدا ب ستران و دەنگێ دەهۆل و زۆرناڤە ب مەرما خەناکرنا دەستێ بویکێ دچوونە مالا بابێ وێ.

رۆژا سێێ: داوەت دگەهێتە گەرماتییا خۆ و بویك و زاڤا دبرنە ناڤ هێلینا وان و ب ڤێ کریارێ داوەت ب داوی دهێت[٣٢].

بەلێ نها ژبەر گوهارتنا سەروبەرێ ئابووری و جڤاکی ل جەم پرانییا خەلکێ کەلتووری داوەت و ژنڤەگوهاستنێ و رەوشت و تیتال هاتینەگوهارتن ب تایبەت ژی گۆهارتن کەتییە د ئامیرێن موزیکێدا.

هندی پەیوەندی ب سەروبەرێ ئابووریێ ئەرمەنێن زاخۆڤە هەی ئەو خودان پێشە و دەستهەلبوون، پرانییا ئەرمەنان کارێ چێکرنا شەل وشەپکان (بەرگویزان) دکر و گرنگترین پیشە بوو کو ئەرمەنێن زاخۆ پێ رادبوون. هەروەسان ئەرمەن یەکەمین کەس بوو (پەنیرێ ب سیرك) ئینایە زاخۆ، ئەڤ کارە ژ ئالیێ ژنانڤە دهاتەکرن پەنیر و سیرێن هویرکری تێکەل دکرن و دکرنە دکلۆزکاندا و کلۆزك ل ژێر عەردی د ڤەشارتن و وەرزێ زڤستانێ دئینانەدەر و دخوارن[٣٣]. هەروەسان ئەرمەنان نانێ تەنك و دۆرکێن نانی و نانێ کلۆل دگەل خۆ ئینایینە زاخۆ[٣٤]. نڤیسکار سەعیدێ حەجی سەدیقی د پەرتووکا خۆ (زاخو بین الماضی و الحاضر)دا دبێژیت: پەنیرێ ب سیرك ژ باشترین خوارنان بوون یێن ئەرمەنان دگەل خۆ ئینایینە زاخۆ و بوویە ئێك ژ خوارنێن سەرەکیێن تێشتا سپێدەیان، هەتا نها ژی موسلمان و ئەرمەن و کلدان و ئێزدی ڤی کارێ چێکرنا ڤی پەنیری دکەن. دەربارەی کارێ چێکرنا شەل و شەپکانە د چەند قۆناغەکاندا دبۆریت و کەرەستێ وێ یێ سەرەکی موویێ مەرەزە (کەژە) رەنگەکێ بزنانە کو ب بزنا (چیر) دهێنەناڤکرن و رەنگێ وانێ (بێجی)یە[٣٥]. هەروەسان رەنگێ سپی ژی هەیە ب رەنگێ بنەفشی و شین و قەهوایی دهێتەرەنگکرن دبێژنێ پشتپەز، ژ رەنگێن دێ یێن شەل و شەپکان شەرنەخی و بەکر بەگی و شەمامۆکی و یێن دی، بەرهەمێ شەل و شەپکێن ئەرمەنان ل جەم خەلکی ژێ جوویان باشتر و ب بها تر بوو، رێستنا شەل و شەپکان رەنگە بزاڤەکا ئابووری ئێخستە د ناڤ جڤاکێ زاخۆدا و بوو هاندەر ژنێن بازێری ل مالێن خۆ مژوولی رێستنا مووی پرانییا وان ژی ژنێن موسلمان بوون، ژنێن هەردو تاخێن حسێنیکێ و رکاڤا ئەڤ کارە بەرامبەری پارەکی بۆ ئەرمەنان دکر و گەلەك بنەمالێن خۆپارێز ژی ژ ڤی کاری مفاداربوون[٣٦]. هەژییە بێژین بازارێ زاخۆ یێ کەڤن سێ پشك بوو:

١) بازارێ موسلمانان

٢) بازارێ ئەرمەن و فەلان

٣) بازارێ جوویان.

دهێتەڤەگێران کو سەروبەرێ ئابووریێ ئەرمەنان ب تەبایی یێ باش بوو، هەژار دناڤ واندا نەبوون، پرانییا وان کارێن پیشەسازی و رێستنا شەل و شەپکان دکر، پشکا دیتر ژ ئەرمەنان دوکانێن پەرۆکان و فرۆشتنا شەل و شەپکان هەبوون، ژ بازرگان و پیشەکارێن ئەرمەنان یێن ناڤدار و هاتینەنیاسین هەریەك ژ:

١) خاجیك بێدرۆس- بازرگانێ پەرۆکان.

٢) شاهین گریگور- بازرگانێ پەرۆکان.

٣) عەگیدێ مریەمێ- بازرگانێ پەرۆك و شەل وشەپکان.

٤) جەمیل یوسف قورمز- بازرگانێ پەرۆکان[٣٧].

زێدەباری ڤان کاران ل سالێن چلان ژ سەدسالییا چوویی ل بازارێ زاخۆ کەسەکێ دیێ ئەرمەن ب ناڤێ هوستا کاسبار هەبوو مژوولی چێکرنا پێلاڤان بوو

دگۆتنێ (پیلاڤێن مووسلێ)، ب دەستان ئەڤ پێلاڤە چێدكرن بێی كو بزمارەكێ بكاربینیت، بەلكی ب دەستی د دروین، پرانییا وان پێلاڤان سوور و گویزی و قەهوایی بوون، دوكانەكا مەزن و دو دەرگەهـ بوو، ئەو ب خۆ ژی د تەمەنێ حەفتێ سالییێدا بوو[٣٨]، كرینا پێلاڤان د شیانێن هەموو كەساندا نەبوو لەوما كەسەكێ دی ب ناڤێ شكری رەفعەت دوكانەكا پنیدۆزیێ ل بازارێ زاخۆ هەبوو و كارێ چێكرنەڤا پیلاڤێن كەڤن دكر. ل بازارێ زاخۆ یێ كەڤن هژمارەكا دوكانێن ئەرمەنان بۆ فرۆشتنا پەرۆك و شەل و شەپكان و هژمارەكا دوكانێن بەرگدروویێ هەبوون و هەر یەك ژ:

١) عەبدوویێ خەیات ژ تاخێ فەلا
٢) مەلكونێ خەیات
٣) كوستین سیرووب خەیاتێ شەل و شەپكان
٤) سلموا سوغومۆن، فرۆشتنا پەرۆكان
٥) سیرۆب عیشێ، فرۆشتنا پەرۆكان
٦) شاهین مهیریان بەقال

ژ كەڤنترین دوكاندار و خەیاتێن زاخۆ بوون و بازرگان ژ دهۆكێ و ئامێدیێ و مووسلێ دهاتنە زاخۆ و شەل و شەپك ژ ئەرمەنان دكرین و ل بازێرێن خۆ د فرۆشتن[٣٩].

عەدەتەكێ سالانە بوو هەر خیزانەكا ئەرمەنی ل وەرزێ پاییزێ (قویتێ سالێ) ژ گەنم و جەهـ و ساڤار و دانهێرك و تشتێن دی بەرهەڤدكر.

بوونا ئەرمەنێن مشەخت نە تنێ ل زاخۆ و دهۆكێ بوو، بەلكی هندەك ژ وانا ل گوندێن هەڤریسكێ، ئاڤزرویكێ، ئیسماعیل ئاڤا، كلیبنا، باستكا سەری و ژێری ئاكنجیبوون و ل سەردەمێ شاهـ فەیسەلێ ئێكێ ئەڤ گوندە دابوونە مەزنێ ئەرمەنان لیڤون پاشایێ ئەرمەنی، هەرئێك ژ وان گوندان ئێك ل دووڤ ئێك دێ ل سەر ئاخڤین[٤٠].

## ٢) ئەرمەن ل گوندێ هەوریسكێ:

گوندێ هەڤریسكێ ب دووراتییا ٣٠كم دكەڤیتە باشوورێ زاخۆ و ١٠ كم ژ سێمێلێ و ٣٠كم ژ دهۆكێ دوورە، ل دووڤ سەرژمێریا ١٩٥٧ێ هژمارا

كەنیسا ئەرمەنی ل گوندێ هەورێسكێ



خەلكێ گوندی (٢٣٨)كەس بوو و مەزنترین گوندێ وێ دەڤەرێ بوو[٤١]. ئەڤ گوندە ب گوندێ لیڤون پاشای[٤٢]هاتییەنیاسین ئەو سەركردێ ئەرمەنی یێ دگەل سەركردێ ئاشووری ئاغا بوترسی ل سالێن شەرێ جیهانیێ ئێكێ شەر دژی دەولەتا ئوسمانی راگەهاندی. ل دووڤ بەلگەنامێن رێڤەبەریا چاندنا دهۆكێ رووبەرێ گوندی ٥٧٠٠ دۆنەمە، ل سالا ١٩٥٢ئ ئەرمەنێن خەلكێ هەڤریسكێ ئەڤ عەردە ژ حكومەتێ كرییە و د ناڤ وی عەردێ چاندنێ یە یێ ب (المفوضة بالطابو) دهێتەنیاسین[٤٣].

ل سەر ڤی بنیاتی ل سالا ١٩٢٢- ١٩٢٣ئ ئەڤ گوندە هاتییەئاڤاكرن، پرانییا خەلكێ وی ئەرمەن بوون، تنێ چوار مالێن عەشیرەتا هاجانا كۆچەر دگەلدا بوون، لیڤون پاشای ل رەخێن گوندی پارچێن عەردی دابوونە وان داكو ل سەر بژین ژبەركو شڤانێن پەزێ گوندی بوون.

نڤیسكار جەرجیس جبرائیل دبێژیت: لیڤون پاشا ئەو كەسایەتی بوو یێ یەكەمین گوندێ نموونەیی ل عیراقێ ئاڤاكری، ل بەراهیێ ئەرمەنان ب سەرپەرشتیا لیڤون پاشای خانیێن ئاخێ ئاڤاكرن، هەروەسان كانییەك ل گوندی لێدا و دێرەك و خواندنگەهەك ژی ئاڤاكرن، ئاشەك ئینا گوندی و گوندێن هەڤسوو ژی دەخلێ خۆ ل وی ئاشی د هێران ب دروستی ئاڤاكرنا گوندی ل سالا ١٩٢٨ئ ب داویهات[٤٤].

كەیغام فارتانیان موختارێ گوندی بوو و هەریەك ژ ئوهانیس بەلهام مورادیان، زرزند ملكون و ماركروهی ئارمیناكیان د وارێ فێركرنێدا كار دكر، ژیان ل ڤی گوندی ب رەنگەكێ سرۆشتی برێڤە دچوو و پەیوەندیێن باش و موكم دگەل گوندێن دەوروبەران هەبوون[٤٥].

دناڤبەرا سالێن ١٩٤٥- ١٩٥٥ئ هشكەسالیێ ب سەر گوندیدا گرت و زیان گەهاندنە بەرهەمێن چاندنێ و سەروبەرێ خەلكێ گوندی دژوار بوو و ب زەحمەت بوو خۆ ل بەر وی سەروبەری بگرن[٤٦]، د ئەنجامدا هندەك ژ خەلكێ گوندی ناچاربوون مالێن خۆ ڤەگوهێزنە زاخۆ، دهۆك، مووسلێ، بەغدا، بەسرا، كەركووكێ، K٣، حەبانیێ و خانەقینێ.

تنێ لیڤون پاشای مافێ دابەشكرنا عەردی ل سەر ئەرمەنان هەبوو، ژبەركو وی دەمی فەرمانگەها تووماركرنا مولكان (دائـرة التسجيل العقاري) نەبوو، دەمێ ئەرمەنان ئەڤ عەردە كو دكەفتنە د چوارچووڤێ عەردێن چاندنێ ل سالا ١٩٥٢ئ كرین، دناڤبەرا سالێن ١٩٥٤- ١٩٥٥ئ حكۆمەتێ ئەو عەردە ل فەرمانگەها تووماركرنا مولكان تووماركرن و ب ڤێ چەندێ هەموو عەردێ گوندێن ئەرمەنان د تووماریێن حكۆمەتێدا یی تووماركریە[٤٧].

د ناڤبەرا سالێن ١٩٣٩- ١٩٤٠ئ خواندنگەهەك ل ڤی گوندی هاتەڤەكرن و خویندكارێن گوندێن دەوروبەران ژ وانا: باستكێ سەری و ژێری، مەرینا، موقبلێ، گردیزێ، ئاڤتەحلێ، گرشینێ، سمایل ئاڤا بامیرێ، ئاڤزریكێ، شكەفدەلێ و گەرماڤا و گوندێن دی ژی قەستا ڤێ خواندنگەهێ دكر، ژبەركو تاكە خواندنگەهـ بوو ل وێ دەڤەرێ[٤٨]. هەڤریسكێ ببوو مەلبەندەكێ فێركرنێ و هەموو خەلكێ دەڤەرێ مفا ژێ وەردگرت، هەروەسان تاكە گوند بوو بنگەهێ ساخلەمیێ لێ هەی و بۆ مەرەمێن ساخلەمیێ گوندێن دەوروبەر قەستا ڤی گوندی دكرن و نوشدارەكی ب ناڤێ د.مەتی لێ كاردكر، پشتی كەیغام ڤارتانیانی جوجان ئاغای موختاریا گوندی گرتەدەست و پشتی وی ژی ئانوشاڤان جوجان ئاغای موختاری گرتەدەست[٤٩].

ئەڤ گوندە ژی وەك گوندێن دی یێن دەڤەرێ ل سالێن حەفتییان هاتبوو ڤالاكرن ژ خەلكێ وی و گوندی دەربەدەر و مشەختی جهێن دی ببوون، پشتی سەرهلدانا ١٩٩١ئ ل سالا ١٩٩٦ئ تنێ پێنج كەس ژ خەلكێ گوندی زڤرینەڤە گوندی، دەمێ حكۆمەتا هەرێما كوردستانێ كو (سەركیس ئاغاجان)ی نوونەریا وێ دكر ئاگادار بووی ٢٠ خانی بۆ وان ل گوندی ئاڤاكرن، دووڤرا هژمارەكا خەلكێ گوندی ژ بەغدا و بەسرا و كەركووكێ زڤرینەڤە سەر گوندێ خۆ، ل سالا ٢٠٠٨ئ حكومەتا هەرێمێ خواندنگەهەك و ٦٠

خانیێن دیتر بۆ ئاڤاکرن، نها (١١٥) خانی ل گوندی هەنە* و (١٠٥) خێزان تێدا دژین[٥٠]. ل سالا ٢٠١٤ێ دێرەك ل گوندی هاتییەئاڤاکرن بەلێ هێژ ب رەنگەکێ فەرمی نەهاتییەڤەکرن، ئەڤ دێرە ژ ئالیێ رێکخراوا (کابنی) یا ئەلمانیڤە هاتییەئاڤاکرن و قەشە سەرگون کو رێڤەبەرێ رێکخراوێ یە دێرێ برێڤەدبەت، ڤێ رێکخراوێ ل سالا ٢٠٠٧ێ کەرەستێن خوارنێ ل سەر خەلکێ گوندی دابەشکرینە هەروەسان کارگەهەکا دروارێ ل گوندی ڤەکریە و چەند خانیێن شویشەی بێن چاندنێ ژی لێ دامەزراندینە[٥١].

### ٣) ئەرمەن ل گوندێ ئاڤزریکێ:

گوندێ ئاڤزریکێ: سەر ب ناحیا باتێلێ یا قەزا سێمێلی یە، نێزیکی (٢٥کم) ژ سەنتەرێ زاخۆ دوورە، دو پشکە: ئاڤزریکا میری (خەمۆی) ئەرمەنێن ئەرسەدوکس لێ دژین، خودان عەردن و کارێ چاندنێ و خودانکرنا تەرش و کەوالی دکەن، پشکا دووێ دبێژنێ: ئاڤزریکا شەنوی کلدان و ئاشووری لێ دژین ئەو ژی خودان عەردن و کارێ چاندنێ و خودانکرنا تەرش و کەوالی دکەن، ئەرمەنێن ئاکنجی ل گوندێ ئاڤزریکا خەموی وەك هەموو ئەرمەنێن دەڤەرا بەهدینان ب زمانێ کوردی دپەیڤن، تنێ ئەرمەنێن گوندێ هەڤریسکێ ب دیالیکتەکا ئەرمەنییا مللی یا تێکەلە ژ عەرەبی و ئەرمەنی د پەیڤن ئەڤە نقشێ نوونە، هندیکە نقشێ کەڤنە ب دیالیکتا ئەرمەنییا مللی دپەیڤین ژبەرکو کۆچەر بوون و ژ دەڤەرەکێ دچوونە یا دی و گەلەك ژ عەدەت و تیتالێن خۆ ژ دەستدابوون[٥٢]. ل دووڤ ڤەگێرانا دانعەمرەکی خەلکێ ئاڤزریکێ دبنیاتدا ژ گوندێ (کەغزی) یێ کنارێ دەریایێ وانێ نە، پاشتر هاتینە گوندێ (کزنخ) د ناڤبەرا ١٩٢٣- ١٩٢٤ێ ئەو مشەختبووینە دەڤەرا عەشیرەتا گولی و نێزیکی ١٠- ١٥ سالان ل وێ دەڤەرێ ئاکنجی بووینە، پاشتر ژ بەرکو کۆچەر بووینە ل دووڤ وەرزێن سالێ و سەروبەرێ سرۆشتی و سەقای ژ ڤی واری چووینە وارێ دیتر. هەروەك هەمان دانعەمر ڤەدگێریت: د ڤی سەروبەریدا کو حکۆمەتا ترکان و هندەك عەشیرەتێن سەر ب وێ ڤە ل هەر دەلیڤەکێ دگەریان بۆ کوشتنا ئەرمەنان محەمەد شەمدین ئاغای بەردەوام ئەو ژ حکومەتا ئاماژە پێکری و عەشیرەتان پاراستینە و رێ دایە وان ل دەڤەرێن سەر ب وی ڤە پەز و مالاتێ خۆ بچەرینن و ژیانا خۆ ب ئازادی ببۆرینن[٥٣]، هەتا هاتینە گوندێ (بێدار)ێ و چەند سالەکان ل وێرێ ئاکنجی بووینە و پاشتر ڤەگوهاستینە گوندێ (ئاڤزریك)ێ ئەوێ ل سالا ١٩٣٢ێ هاتییەئاڤاکرن. ئەڤ گوندە ب ئاڤزریکا میری یان دەشتا ئاڤزریکێ هاتییەناڤکرن، سەرکردێ ئەرمەنی لیڤون پاشای ئەو عەردە ژ حکومەتێ وەرگرتییە و ژ سالا ١٩٣٣ێڤە خەلکێ ل گوندی ئاکنجی بووین دەست ب دانا قستێن بهایێ عەردی کرییە و د هەمان دەمدا دەست ب چاندنێ و خودانکرنا پەز و مالاتی کرییە، ل قۆناغا بەراهیێ تنێ ١٨ خێزان بوون ل گوندی دژیان. زێدەباری ڤان دو گوندان ئەرمەن ل چەند گوندێن دی وەك باستکا سەری و ژێری، سمایل ئاڤا، کلیبنا دژیان بەلێ ئاکنجیێن ڤان گوندان ل سالا ١٩٤٨ێ چوونە کۆمارێ ئەرمەنستانا سۆڤیەتیا جاران. ل سالا ١٩٥٨ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییەڤەکرن و ل سالا ١٩٦٠ێ ئاڤاهیێ وێ هاتییەنووژەنکرن. ئەڤ گوندە ژی وەك تەڤایێ گوندێن کوردستانێ ب تایبەت گوندێن دەشتێ یێن ل بەر دەستەلاتێ حکومەتا عیراقێ و کرێگرتیێن وێ د ناڤبەرا سالێن ١٩٦١- ١٩٧٠ێ چەندین جاران کەتیە بەر زێدەگافی و دەستدرێژیێن لەشکەرێ عیراقێ و عەشیرەتێن عەرەبان و جاشێن دەولەتێ و هاتینەگونەهبارکرن ب هاریکاریا شۆرشا کوردستانێ و بزاڤا نەتەوەییا کوردی، ب کریار ژی خەلکێ گوندی ل دووڤ شیانێن خۆ هاریکاریا شۆرشا کوردستانێ و پێشمەرگەی کرییە. پشتی شکەستنا شۆرشا ئەیلوولێ ل رۆژا ٨ چریا دووێ ١٩٧٥ێ ب مهانا هندێ کو دەڤەرەکا لەشکەرییە خەلکێ گوندی ژ سەر گوندێ وان هاتینەدەرێخستن و دوورکرن بەلێ پاشتر عەرەب ل شوونا وان ئاکنجیکرینە. پشتی سەرهلدانا ١٩٩١ێ

ژ سالا ١٩٩٦ێڤە ژ ئالیێ رێكخراوێن خێرخوازی و مرۆڤایەتی و حكومەتا هەرێما كوردستانێ ڤە دەست ب ئاڤاكرنا گوندی و نووژەنكرنا خانیێن كەڤنێن گوندی هاتییەكرن و نها د ناڤبەرا ٩٥- ١٠٠خێزانان ل گوندی دژین و دبنە نێزیكی ٤٠٠ كەسان و ل سالا ٢٠٠٠ێ دێرەك ل گوندی ژ ئالیێ رێكخراوەكا ئەلمانی ڤە هاتییەئاڤاكرن ب دێرا قەدیس فارتان هاتییەناڤكرن.

## ٤) ئەرمەن ل دهۆكێ:

ئەڤە د بنیاتدا ژ وان ئەرمەنانە یێن ژ قەزا دهێ یا تركیا ژ ئەنجامێ هەوێن كوشتارا تەبابیا ئەرمەنان مشەختبووین، ئەڤ ئەرمەنە ناچار بوون ژ وارێ خۆ مشەخت بین، بەراهیێ ل بێرسڤێ بوون، بەلێ دەستەلاتدارێن تركا ل وێرێ ژی ب دووڤ وانڤە ڤەبوون و بەرێێن وان تەنگدكرن، ب ناچاری رەڤینە دەوروبەرێن چیایێ بێخێری پشكەك ژ وان بەرەف شنگالێ چوون و پشكا دی بەرەف گوندێ قەشەفرێ ل نێزیكی گوندێ شێجێ هاتن و پاشتر هاتنە دهۆكێ و هەتا نها لێ ئاكنجی بووینە.پێكهاتا خەلكێ دهێ تێكەلەك بوو ژ كورد و ئەرمەنان، ئەرمەن خودان ئاشێن هێرانا دەخل و دانی بوون، پرانییا ئەو پالەیێن د ڤان ئاشاندا كار دكر كورد بوون.

### سەروبەرێ ئابووریێ ئەرمەنێن دهۆكێ:

ئەو ئەرمەنە ژ قەشەفرێ هاتنە دهۆكێ و هەر هەموو ژی ل سالا ١٩٢٤ێ ل تاخێ شێلێ ئاكنجیبوون، ژبەركو وی سەردەمێ جهێ تاخێ شێلێ عەردێ چاندنێ بوو، ئەرمەنان ئەڤە ب دەلیڤە زانی و ژ بۆ پەیداكرنا رزقێ خۆ دەست ب كارێ چاندنێ كر، د هەمان دەمدا هندەكان دەست ب كارێ چێكرنا شەل و شەپكان كر، ماركوس ئامینیان، سومبات ئاڤیدیسیان، موسا قیرو سەركیسیان ژ وان ئەرمەنان بوون یێن كارێ چێكرنا شەل و شەپكان دكرن، هێدی هێدی سەروبەرێ وانێ ئابووری باش بوو و دەست ب كرینا خانیان بۆ خۆ كر[٥٤].

پاشتر ژن و ژنخوازی د ناڤبەرا هەڤدودا كر خێزانێن وان زۆر بوون و رێورەسمێن خۆ یێن ئایینی ل (دێرا بەرانی) ئەنجامددان، ژبەر كێمیا ئەرمەنێن دهۆكێ و نەبوونا دێرەكا تایبەت ب وانڤە قەداسێن خۆ ل دێرا ئەرمەنان یا زاخۆ ئەنجامددان زێدەباری رێورەسمێن (ژنماركرنی، و تەعمیدێ و مرنێ) هەتا ل سالا ٢٠٠٨ێ حكومەتا هەرێما كوردستانێ دێرەك ل دهۆكێ بۆ وان ئاڤاكری[٥٥].

پشتی كو ئەرمەن ل دهۆكێ ئاكنجیبووین و زانی كو هندەك ئەرمەن ل مووسلێ هەنە، هەر زوو تێكەلی دگەل وان كر ب تایبەت ئەرمەنیێن مووسلێ كارێ بازرگانی دكرن، پەیوەندی د ناڤبەرا هەردو ئالیاندا دروستبوون، یێن مووسلێ د كریارێن كرین و فرۆشتنێدا هاریكاریا یێن دهۆكێ دكر داكو تەنگاڤیا وان سڤكبكەن و خەما وان نەهێلن، د هەمان دەمدا ئەرمەنێن دهۆكێ بۆ دابینكرنا رزقێ خۆیێ رۆژانە كارێ چاندنێ دكر و یێ زێدە ژی دفرۆشت، لێ كارێ هەرەسەرەكیێ وان پیشەیێ شەل و شەپكان بوو، هندەكێن دی ژی كارێ بازرگانی و كرین و فرۆشتنا پەرۆكان دكر[٥٦]ئەو ژی:

١) موسا قیرۆ- پەرۆكفرۆش

٢) سیپان غەریب قوربان- پەرۆكفرۆش

٣) توما رەشۆ- پەرۆكفرۆش

٤) موراد بحد- پەرۆكفرۆش

ئەڤ هەرچوار كەسە ل سالێن پێنجییان ژ سەدسالییا چوویی بازرگانییا پەرۆكان دكر، بەلێ پرانییا ئەرمەنان ل وی سەردەمی مژوولی چێكرنا شەل و شەپكان بوون، هەشت خێزانێن ئەرمەن ئەوێن ژ قەشەفرێ هاتین ل تاخێ شێلێ یێ دهۆكێ دژیان و مژوولی چاندنێ و چێكرنا شەل و شەپكان بوون، بۆ چێكرنا شەل و شەپكان پێدڤی ب موویەكێ تایبەتێ بزنان بوون كو دگۆتنێ مەرەز) و د شیاندا بوو ب رەنگێ قەهوایی و گویزی و بنەفشی رەنگ بكەن[٥٧].

هندەك ژ كوردێن دەڤەرێ كەرەستێن دەسپێكی

بۆ چێکرنا شەل و شەپکان ددانە وان، وان ژی چەندین جۆرێن شەل و شەپکان چێدکرن وەك: (شەرنەخی، بەکر بەگی، شەماموکی، کاچیتی، تەختە بەفشی، خەزالی و سبی)، هەروەسان جۆرەکێ دگۆتنێ (گولك)یێ خەملاندی بوو ب گولان مە چێدکر، بەلێ چێکرنا ڤی جۆری پێدڤی دەمەکێ درێژ بوو[٥٨].

زێدەباری کارێ چاندێ ئەرمەنێن دهۆکێ بازرگانیێ هنگڤینی و کارێ خودانکرنا مێشا هنگڤینی و بەرهەمئینانا هنگڤینی دکر، ل مالێن خۆ مێش ب خودانکرن، سامی رزقۆ داکوکیێ دکەت کو بابێ وی (١٠٠) سەلکێن مێشان هەبوون، فرۆشتن و دەست ب بازرگانیێ کر.

## ژیانا سیاسیا ئەرمەنان ل دەڤەرا بەهدینان:

ژبەرکو ئەرمەن کەمینەیەکا نەتەوەیینە ل بەهدینان، ژ ئەنجامێ قرکرن و جینوسایدێ و چەوساندنێن ب سەرێ وان هاتین پەنا ئینابە بەر ڤێ دەڤەرێ، ئەندامێن ڤێ کەمینەیێ ب رەنگەکێ گشتی مایێ خۆ د سیاسەتێ ناکەن، کەمینەیێن ئەرمەنی ل وەلاتێن بیانی ژی هەر ب ڤی رەنگینە، ب دلسۆزی بۆ وان مللەت و دەولەتان کار دکەن یێن دەرگەهێن خۆ ل بەر وان ڤەکرین و پێشوازی ل وان کری، ئەڤە ژی وێ چەندێ ناگەهینیت کو نەچووینە د ناڤ وان حزبێن ئەرمەنی یێن بەرگریێ ژ مافێن وان دکەن، ئەو مافێن دەولەتا ترکی زێر پێ کرین و دەست ب سەرداگرتی، یان ژی ب یەکجاری نەهێنە دناڤ روودانێن سیاسیێن ل وارێن وان یێن نوو روودەن، گەلەك ژ ئەرمەنان چوونە د ناڤ رێزێن حزبا شیوعیا عیراقی و پارتی دیموکراتی کوردستان دا، د هەمان دەمدا خۆ ژ حزبا بەعس دووردگرت.

حزبا (طاشناق)یا نەتەوەییا ئەرمەن لقێ خۆ ل دەڤەرا بەهدینان هەبوو و مەلبەندێ وێ ژی گوندێ هەڤریسکێ یێ دەڤەرا سلێڤانەیی بوو و بەرپرسێ وێ ژی لیڤون پاشا بوو. ڤێ حزبێ لقەکێ خۆ ل زاخۆ ژی ڤەکربوو و بەرپرسێ وێ عەباس ماردیروس بوو، هژمارا

ئەوێن ل زاخۆ بووینە ئەندامێن ڤێ حزبێ (٤٠- ٥٠) کەسان بوو، ژ چالاکیێن ڤێ حزبێ بەلاڤکرنا هەستا نەتەوەیی بوو د ناڤ رێزێن ئەرمەناندا ئەو ژی ب رێکا گرنگیدان ب زمان و کەلتوورێ ئەرمەنی زێدەباری ئالیێ ئایینی، چالاکیێن حزبا(طاشناق) هەتا شۆرشا ١٤ تیرمەها ١٩٥٨ێ ل عیراقێ د بەردەوامبوون[٥٩].

دەمێ شۆرشا کوردستانێ ل ئەیلوولا ١٩٦١ێ دەسپێکری ژ ئەنجامێ هەڤسوزیا ئەرمەنان دگەل شۆرشێ کەتنە بەر ئێشاندن و مشەختکرنێ، لەشکەرێ عیراقێ چوونە د گوندێ هەڤریسکێ دا و ب گونەها هندێ کو خەلکێ گوندی هاریکاریا پێشمەرگەی دکەن و زانیاریان ددەنە شۆرشێ دەست ب ئازاردانا وان کرن، د راستیدا خەلکێ گوندی هاریکاریا پێشمەرگەی دکرن و د حەواندن و خوارن و پێویستیێن وان بۆ دابیندکرن و د دەمێ تەنگاڤیێدا د ڤەشارتن، ژ ئەنجامێ ڤێ چەندێ ژی کەتنە بەر ستەما دەستەلاتدارێن دەولەتا عیراقی[٦٠].

د ناڤبەرا ١٩٦١- ١٩٧٠ و سالا ١٩٧٤- ١٩٧٥ێ چەندین جاران گوندێن ئەرمەنان ژلایێ جاشانڤە هاتنە دزین و تالانکرن ژ ئالیێ، ئێك ژ وان هاتەکوشتن، پرانییا وان ناچار بوون گوندێن خۆ بەردەن و بەرەڤ مووسلێ بچن، هەروەسان ل سالا ١٩٦٤ێ بۆ جارا سیێ جاش چوونە د گوندێ هەڤریسکێ دا و خەلکێ گوندی ناچارکرن گۆژمەکێ پارەی بدەنە وان دەمێ پێشمەرگەی پێ زانی د هەوارا خەلکێ گوندی هاتن بەلێ هەر زوو جاش بەرەڤ وی جهێ رەڤین یێ ژێ هاتین[٦١].

پشتی شکەستنا شۆرشا کوردستانێ ل ئادارا ١٩٧٥ێ حکومەتا بەعسی بریاردا خەلکی ڤی گوندی ڤەگوهێزنە گوندەکێ دی یێ بەردای دبێژنێ (کونێ مارا)، ل دووڤ گۆتنا مەزنە بەرپرسەکێ بەعسی گونەها ڤی گوندی ئەو بوو کو د دەمێ خۆدا هاریکاریا پێشمەرگەی کرینە و ڤەحەواندینە، گەلەك ژ ئەرمەنان ناچار بوون بەرەڤ زاخۆ و دهۆکێ یان ژی بەرەڤ مووسل و باژێرێن دی یێن عیراقێ بچن و عەرەب ل شوونا وان نیشتەجێکرن هەتا سەرهلدانا

بهارا ١٩٩١ێ ب سەردا هاتی[٦٢].

هەر ب ڤی رەنگی ژی ل ٨ چریا دووێ ١٩٧٥ێ ئەرمەنێن گوندێ ئاڤزریکێ ژی ب مەرەما هندێ کو دەڤەرا لەشکەرییە ژ گوندێ وان دوورئێخستن، بەلێ بشتی دەرێخستنا وان عەرەب ل شوونا وان نێشتەجێکرن، ئەرمەنێن گوندی ژی بەرەف زاخۆ و هندەك ژی بەرەف بەغدا چوون و عەرەب مانە ل سەر گوندێ وان هەتا سەرهلدانا ١٩٩١ێ ب سەرداهاتی.

پشتی دەسپێکرنا شۆرشا گولانا١٩٧٦ێ هەلویستێ ئەرمەنان هەمان هەلویستێ سەردەمێ شۆرشا ئەیلوولێ بوو و هەڤسوز و پشتەڤانێن شۆرشێ بوون. پشتی سەرهلدانا ١٩٩١ێ و دامەزراندنا پەرلەمان و حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ گەلەك ژ ئەرمەنان زڤرینەڤە زاخۆ و هەردو گوندێن هەڤریسکێ و ئاڤزریکێ، و پشتی ئالۆزبوونا سەروبەرێ تەناهیێ ل بەغدا و باژێرێن دی یێن عیراقێ گەلەك ژ ئەرمەنێن وان جهان ژی پەنا ئینا بەر کوردستانێ و ل بەر سیبەرا حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ ب تەناهی و ئارامی دژین.

هەژیە بێژین پەرلەمانێ کوردستانێ د خولا خۆیا دوویدا بریار دا کورسیەکا پەرلەمانی ب سیستەمێ (کوتا) بۆ ئەرمەنان بێتەتەرخانکرن و د خولا سێ دا ئارام شاهین وەك یەکەمین پەرلەمانتارێ ئەرمەن هاتە هەلبژارتن، هەژیە بێژین (ئارام شاهین) ژ کەسان بوو یێن ل سالا ١٩٧٤- ١٩٧٥ێ چەکێ پێشمەرگایەتیێ هەلگرتی و ل بەرۆکا شەری ب سەختی بریندارببووی و هەتا نها ژی شوینوارێن وێ برینێ لێ دیارن. هەر بۆ زانین هژمارا ئەرمەنان ل سەرانسەری هەرێما کوردستانێ ژ سێ هزار کەسان نابۆریت و پرانیا وان ل دەڤەرا بەهدینان دژین هندەك ژی ل باژێرێن دی یێن ئاکنجینە، د ڤێت وێ ژی بێژین بەری تێکچوونا سەروبەرێ تەناهیێ ل عیراقێ و مشەختبوون و دەرکەتنا وان هژمارا وان نێزیکی ٢٥ هزار کەسان بوو. پشتی هەرفتنا رژێما بەعسی ل عیراقێ هەوێن رەڤاندن و ب بارمتەکرنا ئەرمەنان و و پێکهاتێن دی ل بەغدا و مووسلێ دەسپێکر، د ئەنجامدا هژمارەك زۆر ژ ئەرمەنان بەرەف دەرڤەی عیراقێ چوون و پشکەکێ ژی پەنا ئینا بەر هەرێما کوردستانێ و هەرێمێ ژی پێشوازیەکا باش ل وان کر و ب فەرمانا سەرۆکێ حکومەتا هەرێمێ بۆ هەر خیزانەکا وان مووچەك هاتەڤەبرین[٦٣].

## جەژن و هەلکەفتێن نیشتمانیێن ئەرمەنان:

ئەرمەنان سێ جەژنێن نیشتمانی هەنە سالانە ئاهەنگان تێدا دگێرن:

١- شەرێ ئاڤارایر (شەرێ ڤارتانانك- سالا ٤٥١ز).

٢- کوشتارا تەبابیا ئەرمەنان ١٩١٥/٤/٢٤ێ

٣- سەرخۆبوونا ئەرمەنستانێ ١٩١٨/٥/٢٨ێ

### شەرێ ئاڤارایر (شەرێ ڤارتانانك- سالا ٤٥١ ز):

بیرهاتنا وی شەرییە یێ ل رۆژا ٢٦ گولانا ٥٤١ ز ل دەشتا ئاڤارایر نێزیکی گوندێ ئاڤارایر (دەشتا دیلمان یا نها دکەڤیتە د ناڤ سنوورێ جوگرافیێ ئیرانێ دا) د ناڤبەرا ئەرمەنێن مەسیحی و فارسێن زەردەشتی رووداي، فارسان ژ ڤی شەری دڤیا ب زۆری ئەرمەنان بینن سەر ئایینێ خۆیێ زەردەشتی ژبەرکو پشکەك ژ ئەرمەنستانێ د وی چەرخیدا سەر ب ئیمبراتوریا فارسی بوو، بەلێ ئەرمەنان دژی پلانا حکۆمەتا فارسان بەرخوەدان کر و بەرگری ژ باوەری و ئایینێ خۆ و خاکێ وەلاتێ خۆ کر[٦٤].

ئەرمەنان ئەڤ شەرە ب سەرکردایەتیا سەرکردێ خۆ ڤارتان مامیکونیان وەك شەرەکێ چارەنڤیسساز ئەنجامدا و شیان لەشکەرێ نەیارێن خۆ بشکێنن و و نێزیکی ١٠٣٦ کەسان ژ ئەرمەنان ٣٥٤٤کەس ژ ئیرانیان د ڤی شەریدا هاتنە کوشتن، هەموو سالان دێرا ئەرمەنی پێنجشەمبیا بەری رۆژا پێنجیێ (صوم الخمسین) ب ڤێ هەلکەفتێ ئاهەنگان دگێرن[٦٥].

### کوشتارا مەزنا ئەرمەنان ل ٢٤ نیسانا ١٩١٥ێ:

دێرا ئەرمەنان، هەموو کۆمەلە و رێکخراوێن

ئەرمەنان سالانە ل رۆژا ٢٤ نیسانێ بیرهاتنا شەهیدکرنا ١٥٠٠٠٠٠ ئەرمەنان ژ ئالیێ دەستەلاتدارێن ئوسمانی ڤە ساخ دکەنڤە، بیرهاتنا ڤێ رۆژێ کو د کوشتنێدا جوداهی د ناڤبەرا گەنج و پیر و زارۆك و ژن و مێرێن ئەرمەناندا نەبوو، خویندەوار و نەخویندەوار و نڤیسکار و رۆژنامەڤان و رەوشەنبیر پێکڤە دهاتنەکوشتن کەسایەتیێن مینا دانییل ڤاروجان، پارێزەر گریگور زوهراب، هەلبەستڤان سیامانتو، موسکڤانێ ناڤدار کومیداس ڤارتابید، سیرۆب پاشا، کیڤۆرك جاوش و چەند کەسایەتیێن ناڤدارێن دی د ڤێ کوشتارێدا هاتنەکوشتن[٦٦]. هەژیە بێتەگۆتن کوشتارەکا دی بەری ڤێ کوشتارێ ل سالا ١٨٩٤ێ ل دەڤەرا چیایێ ساسۆنێ و مۆشێ ب سەرێ ئەرمەنان هاتبوو[٦٧].

## سەرخوەبوونا کۆمارێ ئەرمەنستانێ ٢٨/٥/١٩١٨ێ

هەرسال ل ٢٨ گولانا ١٩١٨ێ کۆمارێ ئەرمەنستانا سۆڤیەتی و دێرا ئەرمەنی و مللەتێ ئەرمەن ل هەر جهەکێ هەبیت ب هەلکەفتا سەرخوەبوونا ئەرمانستانا (سوڤیەتی) ئاهەنگان دگێرن، د ڤێ رۆژێدا پاشەرۆژا مللەتێ ئەرمەن د مەترسیەکا مەزندا بوو، هێرش ترکان بۆ ناڤ خاکێ ئەرمەنستانێ بەرەف یەریڤانێ دهات، ٨- ١٠ کم نێزیکی یەریڤانێ بوو، مەرەما وان داگیرکرنا سورمالو، سارداراباد و باشئەباران بوو[٦٨]. هێزێن ئەرمەنی ب سەرکردایەتیا چەند ژنەرالەکان بەرسنگێ لەشکەرێ ترکان گرت و شیان وێ لەشکەری بشکێنن و خاکێ ئەرمەنستانێ ژ دەستێن ترکان رزگار بکەن[٦٩].

## جەژن و هەلکەفتێن ئایینی:

ئەرمەن و دێرا ئەرمەنان چەند جەژن و هەلکەفتێن ئایینی هەنە ب رەنگێ ژێری:

**١- جەژنا بوونا عیسا پێغەمبەری (س):**

هەرسال ل رۆژا شەشێ کانوونا دووێ ئەرمەن و دێرا ئەرمەنان جەژنا بوونا عیسا پێغەمبەری دگێرن، ئەڤ یەك ژ پێنج جەژنێن سەرەکیێن دێرا ئەرمەنییە، ئەڤ جەژنە ب جەژنا رۆناهیيان (عید الانوار) دهێتەناڤکرن، ژبەرکو د ڤێ رۆژێدا مەسیحی ل دێران چرایێن رۆناهیێ هەلدگرن و دەمێ دبێتە ئێڤار رێورەسمێن رێزلینانێ ل ئاڤێ دهێنەگێران و هەمو ئەوێن دسالا چوویدا هاتینەپەروەردەکرن کریارا تەعمیدێ ل دووڤ بیروباوەرێن مەسیحی دکەن[٧٠]. وەك تیتالەکا مللی ئەرمەنێن زاخۆ و دهۆك و گوندێن ئەرمەنینشین سەروپێکا ب ڤێ هەلکەفتێ دلێنن کو د وان رۆژێن سەرما زڤستانێدا گەرماتیێ ددەنە مرۆڤان.

**٢- جەژنا قیامەتێ (عید الفصح):**

یەك ژ پێنج جەژنێن ئایینی یێن دێرا ئەرمەنانە، جەژنا مەزن و هەرەگرنگا جیهانا مەسیحی یە، مەسیحی ڤێ جەژنێ وەك رێزگرتن ل وێ رۆژێ دگێرن یا خودێ عیسا پێغەمبەر ژ ناڤ مریان راکریەڤە، ئەڤ جەژنە ب زمانێ ئەرمەنی ب (ZADIG) زادیگ دهێتەناڤکرن کو وەرگێرانا ئەرمەنییا پەیڤا (PASCHA)یا یونانی یە د پەرتووکا پیرۆزدا، ئەو ژی هێمایە بۆ جەژنا (عید الفصح) یا جوویان یان جەژنا رۆژی شکاندنێ ئەوا ل ١٤ نیسانی مەهی دەسپێدکەت و حەفت رۆژان ڤەدکێشیت[٧١]. پەیڤا (الفصح) کو ب ئەرمەنی دبیتە (ZADIG) ئانکو ژ هەڤجودابوون و قورتالبوونا مەسیحیان ژ گونەهێ[٧٢].

وەك تیتالەکا مللی د ڤێ جەژنێدا هێك د هێنەرەنگکرن و دگەل شرینی و تشتێن ژ هەڤیری چێکری ل سەر مەزن و بچووکان دهێنەدابەشکرن.

ل دووڤ رێورەسمێن دێرێن دێرا ئەرمەنی هەموو سالان ئاهەنگێن ڤێ جەژنێ د پێنجی رۆژاندا دگێریت، ژ جەژنا قیامەتێ (عید القیامة) هەتا (عید العنصرة) یان (عید حلول الروح المقدس) ڤەدکێشیت. دەمێ دژوارییا وەرزێ زڤستانێ ب

داویدهێت و بایێ دلڤەکەرێ بهارا دەسپێدکەت دا سەرژنوو سرۆشتی ڤەژینتەڤە ئەڤ جەژنە دهێتەگێران، ئەڤ جەژنە ل رۆژا یەکشەمبی پشتی تەواوبوونا هەیڤێ راستڤەبوونا بهارێ ل (٢١ ئادارێ) دهێتەگێران[٧٣].

٣- **جەژنا ڤارتاڤار (ب زمانێ ئەرمەنی) (التجلي) ب عەرەبی،** ڤارتافار (VARTAVAR) ل دووڤ گۆتنا هندەك زمانڤانان پەیڤەکا زمانێ زەندی یان زمانێ ئاڤێستا (زمانێ پەرتووکا پیرۆزا زەردەشتیان)یە، ژ دو برگەیان (VART) ئانکو ئاڤ, ڤارVAR) ئانکو رەشاندن ئانکو جەژنا رەشاندنا ئاڤێ، هندەکێن دی دبێژن: ئەڤ پەیڤە ژ عەدەتێ بەردەوامێ خەملاندنا خوداوەند (ئاستغیك)ی ب گولان د جەژناندا هاتییە، ئەو ب خۆ جەژنا (ڤارتافار) جەژنەکا تایبەتە ب خوداوەند (ئاستغیك) و پەیڤا (ڤارتافار) ئانکو خەملاندن ب گولان، و ڤارت (VART) ئانکو گول ب زمانێ ئەرمەنی.

ل رۆژا ئێکێ ژ مەها (NAVASART) کو دەسپێکا سالنامەیا ئەرمەنییە، بەرامبەری ١١ تەباخێ یە ب سالناما زایینی، باب و باپیرێن ئەرمەنان بەری پەیدابوونا ئایینێ مەسیحی ل چەند جهەکان کۆمدبوون و رێورەسمێن ڤێ رۆژێ دگێران کو پێکهاتبوون ژ فراندنا کوتران و ئاڤ ل هەڤدو د رەشاند و هندەك یارییێن شەران دکرن و قوربانی بۆ پەرستگەهێ و خوداوەندان ددان[٧٤]. دەمێ ل سالا ٥٥١ێ بەتریرك موفسیسێ دووێ یغیفارتیسی سالناما ئەرمەنییا نوو دانای (جەژنا ڤارتاڤار) کرە د رۆژا ١٤ێ پشتی (عید الفصح)[٧٥].

٤- **جەژنا زەیتونان(عيد السعانين):**

بەری جەژنا قیامەتێ ب حەفتییەکێ مللەتێ ئەرمەن و دێرا ئەرمەنان ڤێ جەژنێ دگێرن کو ئاماژەدکەت چوونا سەرکەتیانەیا عیسا پێغەمبەری بۆ ئورشەلیمێ، وەك رێزگرتن خەلکێ ئۆرشەلیمێ ب دلسۆزی پێشوازی لێکرن و جلکێن خۆ و تاکێن دارقەسپان ل بەر پێن وی دانان، ئەو بوو عیسا پێغەمبەری مالا خودێ ئانکو مزگەفتا (الأقصی) ژ باجوەرگران و فرۆشیارێن گیانەوەران پاقژ کر و گۆتە وان کو مالا بابێ من دێ جهێ نڤێژان بیت نە جهێ وەرگرتنا باجان، دبیت ئەڤ جەژنە ل سەدسالییا دووێ و سیێ بەری زایینی ل میسرێ وەك جەژنا چلێ (عید الاربعینی) هەبیت، ژ دیکیومێنتێن وی چاخی دیار دبیت کو کو یەك ژ سەعانان پەیوەندی ب حەفتیا ئێشان ڤە هەبوو وەك پێشکیەك یان دەروازەیەك بۆ ڤێ جەژنێ[٧٦].

٥- **عید الصعود:** پشتی جەژنا قیامەتێ ب چل رۆژان ئەڤ جەژنە دهێتەگێران، نهێنیا ڤێ هەلکەفتا ئایینی د چوونا عیسا پێغەمبەریە بۆ عەسمانی پشتی جەژنا قیامەتێ ل رۆژا چلێ ئانکو چل رۆژان پشتی جەژنا قیامەتێ.

٦- **جەژنا پێشکەشکرنا عیسا پێغەمبەرێ زارۆك بۆ مالا خودێ (الهیکل):** ل دووڤ تیتالێن جوویان پێدڤی بوو پشتی بوونا عیسا پێغەمبەری ب چل رۆژان وی پشکەشی قەرقودەی بکەن داکو بێتە سونەتکرن، ئەو بوو ل ١٣- ١٤ شباتێ هاتەسونەتکرن، بەری کو ئەرمەن بێنە سەر ئایینێ مەسیحی بتپەرست بوون، د ڤێ رۆژێدا وەك نیشانا پەرستنا رۆناهیێ دار دسۆتن و ئاگر هەلدکرن کو ل دووڤ بۆچوونا وان پەرستنا درێکا رۆناهیێ رایە[٧٧].

٧- **جەژنا بلنکرنا خاچێ (عید رفع الصلیب):**

ئەڤ جەژنە یەك ژ پێنج جەژنێن پیرۆزێن دێرا ئەرمەنانە، ب مەزنترین جەژنا خاچێ دهێتەنیاسین، دەسپێکا وێ دزڤریتەڤە وێ رووداني دەمێ باوەرداران خاچا (یعقوب الرسول) ل ئورشەلیمێ (قودسێ) پیرۆز کری، د ڤێ بۆیەرێدا خاچ ژ ئالیێ (یعقوب الرسول)ڤە هاتە بلندکرن و ئوسقوفێ ئێکێ یێ ئۆرشەلیمێ دوعا یەسوعێ مەسیح (کرنوشێ بۆ خاچا تە دبەین) خواندی، ئەڤ خاچە وەك خاچا راستەقینە بوو

و هندەك پێکهاتا وێ تێدا بوو. هەژی گۆتنێ یە ل سەدسالیا سێیێ زایینی هندەك ژ پێکهاتا خاچا مەسیحی ب رێکا هەردو قەدیسان کایانی و هریبسیمی گەهشتە ئەرمەنستانێ. ژبەرکو دێرا ئەرمەنان هەموو جەژنێن مەزن د رۆژێن ئێکشەمبی دا دکەت، بریار هاتییەدان جەژنا بلندکرنا خاچێ ژی د رۆژا ئێکشەمبیا نێزیکی ١٤ ئەیلوولێ ئانکو ناڤبەرا ١١- ١٧ ئەیلوولێ ب گێرن(٧٨).

**٨- جەژنا چوونا خانما مریەم بۆ ئەسمانی:**

ل دووڤ رێبازا دێرا ئەرمەنی (الكنيسة الارمنية الرسولية) پشتی ل خاچدانا مەسیحی و بلندبوونا وی بۆ ئەسمانان (قیامەتا وی) ب ١٥ سالان خانما مریەما عەزرا تەرمێ وێ ژ قەبری هاتییە ڤەگوهاستن بۆ ئەسمانی و ئەڤ بیرهاتنە هەرسال د ناڤبەرا ١٥- ١٨ تەباخێ دهێتە ڤەساخکرن، تری ل دێرێ دهێتە پیرۆزکرن و ل سەر وەلاتییان دهێتە لێکڤەکرن. کەڤنترین جەژنا مریەمێ جەژنا رێز لێنانا مریەما عەزرایە ژ سەدسالیا چوارێ زایینی ڤە، بەلێ پشتی کو ل سالا ٤٣١ێ گۆڕێ (قەبرێ) مریەمێ ل ئورشەلیمێ هاتییەدیتن ئەڤ جەژنە دگەل وێ دێرێ هاتییەگرێدان یا ل سەر گوری هاتییەئاڤاکرن، ئەو ژی دێرا گۆڕێ مریەما عەزرایە ل گەلیێ (جثسيماني)(٧٩).

هندی پەیوەندی ب سەروبەرێ رەوشنبیریێ ئەرمەنێن بەهدینانڤە هەی، هێژ زوو ئەرمەنان زارۆکێن خۆ دانیانە بەرخواندنی ل باژێران و ئەو گوندێن ئەرمەن لێ هەین، پاشتر ژی هنارتینە جهێن دوورتر بۆ خواندنا بلند و نها ل سنوورێ بەهدینان چەندین ماڤپەروەر، ئەندازیار، نوشدار، دەرمانساز و مامۆستا و فەرمانبەرێن ئەرمەن هەنە و باوەرنامێن بلندتر ژی هەنە، د ناڤبەرا سالێن ٢٠٠٠- ٢٠٠٤ێدا مامۆستایێ دەرچوویێ پشکا کوردی یا زانکۆیا بەغدا ڤارتکیس ئەمینیان رێڤەبەریا گشتیا پەروەردا پارێزگەها دهۆکێ گرتییەدەست، هەروەسان ئەرمەنان یانە و سەنتەرێن رەوشەنبیری و هونەری ل هەولێرێ و دهۆکێ هەنە.

# ژێدەر:


١. د.ك.ل. استارجيان ،تاريخ الامة الارمنية ،الموصل ،١٩٥١،ص٤٩.

٢. Հ.Հ.կրթութեան եւ գիտութեան նախարարութիւն.երեւան պետական համալսարան. հայոց պատմութիւն հնագոյն ժամանակներից մինչեւ մեր օրերը ,Պրոֆ.ՀՐ.Ռ.Սիմոնեան ,Հայոց Պատմութիւն ,Երեւան ,٢٠١٢.էջ ٢١-٢٣.

٣. دەقێ بابەتی د مالپەرێ www.khabararmane.com هەیە.

٤. Մովսէս խորենացի ,Հայոց պատմութիւն թարգմանութիւն եւ ներածութիւն ,դոկտոր US.Մալխասեան.Գահիրէ ,١٩٥٣ էջ ١٤٨-١٤٩.

٥. بنیاتێ ئەرمەنان، گۆتارەکا د مالپەرێ www.khabararmane.com دا هاتییەبەلاڤکرن.

٦. Մովսէս խորենացի.անդ. էջ٦٨.

٧. Հ.Հ.կրթութեան եւ գիտութեան նախարարութիւն ، անդ. էջ ٣٩.

٨. Մովսէս խորենացի.անդ. էջ٧٠.

٩. الكتاب المقدس ( العهد القديم ).التكوين ، اصحاح ١٠/ ٣ ،حزقيال اصحاح ١٤/٢٧ و ٦/٣٨ ، ملوك الرابع اصحاح

# جوهی ل دەڤەرا بەهدینان

د. فەرسەت مەرعی
وەرگێران: موسەدەق تۆڤی

تیرەیا جوهیان ل عیراقێ و كوردستانێ ئێكە ژ كەڤنترین تیرەیێن جوهی یێن جیهانێ و بنەكۆكا وان ڤەدگەرێتە سەردەمێ ئێخسیرێن ئاشووری و بابلی، كو پتریا وان د هەوێن ئێك ب دووڤ ئێكێن سەربازی ئەوێن ب سەركردایەتییا شاهێن ئاشووری و بابلی ل سەر وەلاتێ كەنعان(فلەستین) هاتینە ئەنجامدان هاتبوونە ئێخسیركرن و راپێچكرن، هەر بۆ نموونە، ل سالا ٧٣٢ب.ز شاهێ ئاشووری تگلات پلاسرێ سێ (٧٤٥-٧٢٧ب.ز) شاهنشینیا باكوور(ئیسرائیل) داگیركر و ب رێیا وێ كۆنترۆل ل سەر عەردێن جەلیل (باكوورێ فلەستین) و رۆژهەلاتێ ئۆردنێ كر و عەشیرەتێن نەفتالی Naphtali (كو ئێكە ژ ١٢ ئووجاخێن عەردێ كەنعان و خەلكێ باژێرێن رۆژهەلاتێ ئۆردن ب ئێخسیری ئینانە وەلاتێ ئاشوور (كوردستانا نۆكە)، ل ڤێرێ نەخشەبەرەكێ (المسلە) ئاشووری ژی هەیە نەخشەیێن هەوێن شاهـ تگلات پلاسەرێ سێ ل سەر وەلاتێ ئارام(سوریا) و ئیسرائیل(فلەستین) ل سەر هاتینە نەخشاندن و تێدا هاتییە:من هەمی باژێرێن (بێت عمری) د هەوێن خوێن بەرێ دا همبیز كرینە، من چ نەهێلان ژ بلی باژێرێ سامیرە (نابلسا نۆكە)... من نەفتالی ژی ستاند و كرە پشكەك ژ ئاشوور، من زەلامێن خۆ كرنە حوكمدارێن وێ و هەمی خەلكێ عەردێ (عمری) و ملك ومالێ وان باركرنە ئاشوور)[1].

ژبەر پێگیرینەكرنا شاهنشینیا باكوورێ ئیسرائیل ب سۆزێن داینە شاهێ ئاشووری سەرجۆنێ دووێ (٧٢٢-٧٠٥ب.ز) پێ پشتی شلمناسرێ پێنجێ ببوو شاهێ ئاشوور، (سەرجۆنێ دووێ) شاهنشینیا باكوور داگیركر و پایتەختێ وێ باژێرێ سامیرە (نابلسا نۆكە) ستاند و دەست ب گەفان ل ئۆرشلیمێ (قودسێ) یا پایتەختێ شاهنشینیا باشوور (یەهۆدا) ژی كر كو ٣٠ كیلۆمەتران دووری سنوورێ وێ یێ باكوور بوو، ئاشووریان ئاوایێ خوێن بەرێ ب كار ئینا و دەست ب ڤەگوهاستنا هژمارەكا زۆر یا پیشەكاران كر بۆ دەڤەرێن دوور ل ناڤ ئیمپراتۆریا خۆ بۆ حەلەج و خابوور(كوردستانا سوریا) و هەتا باژێرێن میدیا(كوردستانا باشوور و رۆژهەلات).

ل سالا ئێكێ یا حوكمێ شاهێ ئاشووری سەرجۆنێ دووێ ل سالا ٧٢٢ب.ز باژێرێ سامیرە كەڤتە د دەستێ وی دا و ئەڤ سەركەڤتنە بۆ وی هاتە ل قەلەمدان، لێ پەرتووكا پیرۆز(سەردەمێ كەڤن) سەركەڤتنا ب راستا بۆ شلمناسەرێ پێنجێ ل قەلەم ددەت - سالنامەیێن ئاشووری ژی ب دوور و درێژی بەحسێ ڤێ پرۆسەیا ڤەگوهاستنا

خەلكێ شاهنشینیا ئیسرائیل بۆ ناڤ عەردێن دەولەتا ئاشووری كرینە، هەر بۆ نموونە، د دەقەكێ شاە سەرجۆنێ دووێ دا ل سالا ئێكێ یا حوكمێ وی هاتییە:(ل دەستپێكا حوكمێ خۆ ئەز شاهـ ... من وەلاتێ سامریان دووریێچ كر و ستاند... سەخمەراتی وی خوداوەندێ وەل من كری سەربكەڤم ... و من ٢٧٢٩٠ كەس ژ خەلكێ وێ دوورئێخستن و من ژ وان سەرباز ئامادەكرن داكو سەركێشیا پێنجی پایتونێن زێرەڤانێن شاهنشینی بكەن... من باژێر نووژەن كر و ژ بەرێ چێتر لێ كر و من خەلكەك ژ شاهنشینین دی یێن (من) ستاندین لێ ئاكنجی كرن و من هندەك ئەفسەرێن خۆ كرنە حوكمدارێن وێ، من باج دانانە سەر وەكی ئەوێن هەرجار ل سەر هەڤوەلاتیێن ئاشووری دهاتنە دانان)[٢].

ل سالا ٦١٢ب.ز نەینەوا پایتەختێ ئاشووریان كەڤتە د دەستێ هەڤپەیمانییا میدی - كلدانی دا ب سەركردایەتییا شاە كەیخسرۆ(ئوڤاشترا) و شاهێ بابلێ كلدانی نەبوپلاسر و ملكداریا دەولەتا ئاشووری ل ناڤبەرا وان هاتە لێكڤەكرن، ئینا میدییان دەڤەرا دكەڤیت ناڤبەرا باكوورێ فورات و ژووریا رووبارێ ئاسیا بچووك بۆ خۆ هەلگرت، لێ پشكێن دی یێن ئیمپراتۆریێ كو ئەو ژی عیراق و سوریا و فلەستین بوون بوونە بەهرا نەبوپلاسر و بنەمالا وی یا كلدانی(بابلی یا نوو) ئەوێن باژێرێ بابل كرینە پایتەختێ خۆ[٣].

## پەیوەندیێن جوهی - فارسی و رەنگڤەدانا وان ل سەر جوهیێن كوردستانێ:

پشتی شاهێ ئەخمینی كۆرشێ دووێ (كیرۆس) (٥٥٩-٥٣٠ب.ز) شیای ل سالا ٥٥٠ ب.ز دەولەتا میدی ژ ناڤ ببەت، خەون ب هندێ ڤە ددیت كۆنترۆلێ ل سەر عیراقێ بكەت و دەولەتا كلدانییا بابلی بئێخیت، ئەو تشتێ وی ڤیای ب دلێ وی چێبوو ئەڤە ژی دەمێ ل سالا ٥٣٨ب.ز ب بەهانا بەرەڤانیێ ژ بیروباوەرێن ئایینی یێن بابلیان باژێرێ بابل یێ پایتەخت ستاندی، ب ڤێ چەندێ ژی وی ئەو جوهی یێن ئێخسیر ب هیڤی كرن یێن ئەو ب رزگاركەر و دلسۆزێ خۆ زانین چونكی وی دلسۆزی و دلپێڤەبوونەكا زێدەتر بەرامبەری وان دەربری و ئەو ئامانێن زێر و زیڤی یێن نەبوخوزنەسر ژ قودسێ ئینایین بۆ زڤراندن، هەروەسا وی رێدا وان ڤەگەرینە فلەستینێ و دەست ب ئاڤەدانكرنا پەرستگەهێن كەڤنێن ل قودسێ كر یێن ئاشووری و بابلیێن عیراقێ وێران كرین، ژ بەر هندێ، پێغەمبەرێن ژ نفشێ ئیسرائیلی رێزگرتنەكا زێدە بۆ كۆرش هەبوو و د پەرتووكا عەزرا دا هاتییە: (كۆرشێ شاهێ فارس هۆسا گۆت: خودێ خوداوەندێ ئاسمانی، هەمی مەملەكەتێن عەردی رادەستی من كرن و ئەز راسپاردم خانییەكی بۆ وی ل ئورشەلیم ل یەهۆدا ئاڤا بكەم، كی ژ هەوە ژ هەمی مللەتی بلا خوداوەندێ وی دگەل بیت و سەركەڤیتە ئورشەلیما ل یەهۆدا و خانیێ خودێ خوداوەندێ ئیسرائیل ل ئۆرشەلیم ئاڤا بكەت)[٤].

هەروەسا وی دو رێ دانانە بەر وان، یان ل بابل بمینن و خۆشیێ ب خێروبێرێن وێ ببەن، یان ژی ڤەگەرینە فلەستینێ، هۆسا، كاروانێ ئێكێ یێ جوهیان ب رێبەریا سەرۆكێ جوهی(زوربابل) كو ئەو كاروان ژ ٤٢٣٦٠ كەسان و ٧٣٣٧ بەنییان (كولەیان) پێكهاتبوو ڤەگەریا فلەستینێ، پشتی وان ژی ئێشیكێن دی یێن وان قەستا وێرێ كرن، لێ پشكەكا دی یا وان باشتر دیتن ل عیراقێ و كوردستانێ بمینن پشتی خۆشی و ژیار بۆ ب ساناهی كەڤتی[٥].

ئەڤ پەیوەندییا دیرۆكی ل ناڤبەرا هەردولا بوو ئەگەرێ وێ چەندێ شاهێ فارس یێ ئەخمینی (ئەحشویروشێ ئێكێ ٤٨٥-٤٦٥ ب.ز) هەڤژینیێ دگەل ژنەكا جوهی یا جوان بكەت ب ناڤێ ئێستێر(ستێر) كو وێ ب پشتەڤانییا مامێ خۆ (موردەخای) رۆلەكێ مەزن د هاندانا شاهی دا هەبوو تۆلێ ژ (هامان)ێ وەزیرێ خۆ و دارودەستەكێن وی یێن دژی جوهییان ڤەكەت، ژ بەر هندێ، جهێ حێبەتیبوونێ نینە كو حاخامێن جوهی قەنجییا وێ كچا خۆ (ئێستێر)

ێ ژ بیر نەكەن و ناڤێ وێ داننە سەر پەرتووكەكا تەوراتێ ب ناڤێ (پەرتووكا ئستێر) و رۆژا تۆلڤەكرنێ ژی ژ دوژمنێن جوهییان-ئانكو رۆژا ١٤ی هەیڤا ئاداری ب جەژن ل قەلەم بدەن و ناڤی وێ جەژنێ بكەنە (بوریم) ئانكو سەركەفتن... (ئستێر) ئەڤا جوهی و موردەخایێ مامێ وێ مەرقەدەكێ مەزن ل باژێرێ (هەمەدان) پایتەختێ دەولەتا میدیا هەیە، كو ئێكە ژ جهێن سەرەكی یێن باژێری و جوهی یێن ئیرانێ و جوهی یێن دی ژی بەردەوام سەرا ددەن[٦].

## میرگەها حەدیاب (ئەدیابین) یا جوهییان ل كوردستانێ:

پشتی فرتییان(ئەشكان- شاهێن تیرەیان(ملوك الطوائف) ل سالا ١٢٦ب.ز كۆنترۆل ل سەر كاروبارێن ئیرانێ و عیراقێ كرین و سلوقی یێن شوونگرێن ئەسكەندەرێ مەقدۆنی لادایین، هەر ل وێ دەڤەرێ یا جوهی ل سەردەمێ ئاشووری لێ هاتینە ئێخسیر كرن، میرگەهەكا بەرفرەها پێشكەفتی ب ناڤێ حەدیاب - ئەدیابین Adiabene (ب عەرەبی حزە) هاتە دامەزراندن، شاهێن وێ ژی ژ خێزانەكا عەشیرەتێن سكیس(ئەسكیس) بوون یا ب بۆرینا دەمی دگەل عەشیرەتێن میدی بوویە كورد و دەستەلاتا ڤێ میرگەهێ گەهشتبوو دەڤەرا ئازەربایجانێ و رۆژهەلاتێ دیجلە و دەڤەرا نسێبینێ[٧].

شاهێ ڤێ میرگەهێ مونوبازوس(موناباز) خووشكا خۆ شاهـ هیلانە (یا سالا ٥٠ ز مری) ل خۆ مار كربوو ئەڤە ژی ل دووڤ بیروباوەرێن بتپەرێسی یا ئایینێ فەرمیێ میرگەهێ و وان زارۆیەك بوو ناڤێ وی كرنە ئیزاتیس (عزەتێ دووێ) یێ كو سالا ٣٦ز دەستەلاتا میرگەهێ ب ستۆوێ خۆڤە گرتی، ئەو بوو جوهی و حوكمێ وی هەتا مرنا وی ل سالا ٦٠ ز ڤەكێشا، ئانكو وێ میرگەهێ ٧٩ سالان حوكم كرییە هەتا ل سالا ١١٦ز ژ لایێ تراجانێ ئیمپراتۆرێ رۆمانی ڤە هاتییە داگیركرن[٨].

ل سەر ڤێ چەندێ مەتران ئادی شێر دبێژیت: لێ حەدیاب یا عەرەبان ب (حزە) ناڤكری جهێ وێ دكەڤیتە ناڤبەرا هەردو زێیان (زێیێ مەزن و بچویك) و هەتا ئاشوور(مووسل) و هەتا نسێبینێ ژی درێژ دبوو و بنگەهێ وێ باژێرێ ئەربیل بوو، ل بەرەبابێ ئێكێ یی مەسیح (سەدسالیا ئێكێ زایینی) شاهەك ب ناڤێ (ئیزات) شاهێ وێ بوو... و دیرۆكنڤیسێ جوهی (یوسفوس) بەحسێ وی دكەت و دبێژیت كو ئەو ل سەر دەستێ حەنینا ببوو جوهی، هیلانەیا دەیكا وی ژی ب هندێ ناڤدار بوو كو ل سەردەمێ وێ كولبەك پەیدا ببوو و وێ گەنم ژ مسرێ ئینابوو و ل سەر خەلكێ ئۆرشەلیم بەلاڤ كربوو...)[٩].

گـۆرێ هیلانەیا شاها حەدیاب ل قودسێ ل گۆرستانا بەرنیاس ب گۆرستانا سولتانان (بەرامبەری خواندنگەها مەترانی) هاتەدیتن كو دیرۆكا وێ ڤەدگەرێتە سالێن٥٠-٦٠ز و نڤیسینەك ل سەر گۆرێ وێ یێ د كەڤری دا هاتییە نەخشاندن و دیرۆكا دامەزراندنا وی دیار دكەت، و زانیاری ئاماژێ دكەنە وێ چەندێ كو هیلانەیێ بەری مرنا خۆ فەرماندابوو گۆرێ وێ د كەڤری دا ل قودسێ بێتە هەلكۆلان، پشتی هنگی ژی هندەك گۆرێن دی بۆ كورێن وێ ب رەخ وێڤە و هەر ل وێ گۆرستانێ هاتنە هەلكۆلان[١٠].

گەلەك ڤەكۆلەر ژی ل وێ باوەرێنە كو ناڤكرنا عەشیرەتا كـوردی یا دربوەشێن (هەزبانی) یا رۆلەكێ مـەزن ل سەردەمێ ئیسلامی هەبوو و سـەركـردێ سەركەفتیێ مـەزن سەلاحەددینێ ئەیۆبی ژ وێ وێ عەشیرەتێ بوو، دبیت ڤەگەرێتە ناڤێ میرگەها (ئەدیابین) ئەڤە ژی ژ بەر وەكئێكیا دەڤەرێن ئاكنجیبوونا وان و دەڤەرێن هەزبانییان ژی ل سەردەمێ ئیسلامی دكەڤتنە هەر وان دەڤەرێن میرگەها ئەدیابین د ناڤبەرا هەردو رووبارێن زێ یێ مەزن و بچووك[١١].

## جوهی یێن كورد ل سەردەمێ ئیسلامی:

ژێدەرێن ئیسلامی ب تنێ تشتەكێ كێم ژ دەنگ وباسێن جوهییان ل سەردەمێن ئیسلامی یێن پشتی سەردەمێ پەیاما موحەمەدی و (خیلافەتا راشدین)

گۆتینە، زانیاریێن تێدا هاتین ژی تنێ بۆ نیشادان یان بۆ رێکخستنا پەیوەندی یا ل ناڤبەرا خودان ئایینێن ئاسمانی یێن ل سەر بەختێ موسلمانان(ئانکو جوهی و مەسیحییان) ب دەولەتێ و جڤاکێ ئیسلامی بووینە، لێ تشتێ پەیوەندی ب جوهیێن کوردستانێ ڤە هەی، زانیاری ل سەر دکێمن و ژ چەند ڤەگێرانەکان یان دروستتر بێژین ژ دو ڤەگێرانان نابۆرن، یا ئێکێ: جوهیێ بوویە موسلمان (السموأل کورێ یەحیا کورێ عەباسێ مەغربی) د پەرتووکا خۆ (افحام الیهود) یا سالا ١١٦٥ ێ ڤەگێرایە[١٢]، یا دووێ: گەریدە (بنیامین کورێ تطیلە) یێ ئەندەلوسی ل سالا ١١٧٠ ز ڤەگێرایە و کورتییا هەردو ڤەگێرانان ژی هەروەکی بنیامین بەحس کری ئەڤەیە: (ئامێدیێ: ل دۆرێن ٢٥ هزار جوهی لێ دئاکنجینە و ئەو ژی کۆم کۆم ل پتر ژ ١٠٠ جهێن چیایێن خەفتیان ل نك سنوورێ وەلاتێ مادی دبەلاڤەنە و جوهی یێن وێ بەرمایکێن رەڤەندا ئێکێ نە یێن شلمانسرێ شاهێ ئاشوور ئێخسیر کرین و ب زمانێ تەرجوم (دیالێکتا ئارامی) دهەڤدوو دگەهن و هژمارەکا مەزنە زانایان د ناڤ دا هەنە، ئامێدیێ ژی قووناغا رۆژەکێیە ژ سنوورێ وەلاتێ عەجەم (فارس)ان، جوهیێن وێ وەکی هەمی جوهیێن ل وارێن ئیسلامی زێرەسەرێ (جزیێ) ددەنە موسلمانان ... بەری دەهـ سالان ژی (١١٦٠ز) ئاژاوەگێرییا (داود ابن الروحی) ل ئامێدیێ هاتە روودان، کو ئەڤە ژی ل بەغدا ل سەر دەستێ (حەسدای رأس جالوت)(سەرۆکێ تیرەیا جوهیانی) و سەردەستێ (غاؤن یعقوب - رێڤەبەرێ خوداندنگەها جوهیانی) فێری زانستی ببوو و بسپۆری د تەوراتێ و فیقە و تەلمۆد و هەمی زانستێن دی دا وەرگرتبوو و باش فێری عەرەبیێ زمانێ موسلمانان و ئەدەبێ وان ببوو و ب هونەرێن سحربەندی وخێڤزانکیێ شارەزا ببوو، ئینا د دلێ خۆ دا بریاردا پشتەرێبوونێ ل سەر شاهێ عەجەمان (سەلجۆقییان) بکەت و جوهیێن ئاکنجیێن چیایێ حەبتون(چیایێن برادۆست و شیرین) ل خۆ کۆم بکەت و شەرێ وان مەسیحییان بکەت یێن ئورشەلیم ستاندین و کۆنترۆل ل سەر کرین(ئەو خاچهەلگرێن وی دەمی کۆنترۆل ل سەر فلەستینێ کرین) و وان ژێ دەربێخیت، ئینا ل ناڤ جوهییان دەست بەلاڤکرنا بانگخوازییا خۆ کر و ب گرۆڤەیێن ڤالا پشتەڤانییا وێ بانگخوازییا خۆ کر، هەروەکی دگۆت:(خودێ ئەز هنارتیمە و فەرماندایە من قودسێ بستینم و وە ژ بن نیرها بەندایەتیێ رزگار بکەم)، ئینا کۆمەلەکا سادە ژ جوهییان باوەری پێ ئینا و ب مەسیحێ چاڤەرێکری ل قەلەمدان[١٣].

هەرچەوان بیت ژی چارەنڤیسێ ڤێ بزاڤا جوهییان شکەستن بوو و دامەزرێنەرێ وێ ب دەستێ سەلجۆقییان هاتە کوشتن[١٤].

## رەهـ وریشالێن دیرۆکی یێن پەیوەندی یێن کوردی - جوهیانی:

جوهیێن کورد ب ئاشتی و دۆستانە دگەل وەلاتیێن خۆیێن موسلمان و مەسیحی و پێکهاتێن دی یێن جڤاکێ کوردستانێ دژیان و چ کێشە د پەیوەندییێن د ناڤبەرا وان دا نەبوون.

جوهی یێن کورد بەری جوهیێن دی ئێك ئێکە ژ بەر هۆکارێن ئایینی هەر ژ سالا ١٨١٢ز مشەختی فلەستینێ ببوون[١٥]، هەروەسا ل بن کاریگەرییا پرۆپاگەندە و نامەیێن دگەهشتنە جوهیێن کورد ژ وان مشەختێن بەری وان قەستا فلەستینێ کرین و رەوشا وێرێ ب رەوشەکا نموونەیی نیشا دان، جوهیێن کورد دەست ب مشەختبوونێ بۆ نك برایێن خۆ یێن ل فلەستینێ کرن، هەر بۆ نموونە، هەمی جوهیێن گوندێ (بەرئاشێ) یێ دکەڤیتە رۆژهەلاتێ هاڤینگەها سیارەتیکا ل باکوورێ باژێرێ دهۆك مشەختبوونە فلەستینێ و ل وێرێ کنیشتەیەك بۆ خۆ ئاڤا کرن و نۆکە وان ئاکنجیگەهەکا تایبەت ب خۆ ل باژێرێ قودسا رۆژئاڤا هەیە[١٦].

هەروەسا ئاژانسا جوهیانییا ل سالا ١٩٢٢ێ زایینی هاتییە دامەزراندن رۆلەکێ مەزن د هنارتنا گەلەك جوهییان دا بۆ کوردستانا عیراقێ هەبوویە داکو پەیوەندیێ ب جوهیێن کورد بکەن، ژ لایەکێ

دیڤە ل سالا ١٩٣٤ز رۆبین ب ئەرکەکێ نەپەنی گەهشتە عیراقێ و د ماوێ سێ سالێن دەراندەر دا خۆ وەسا نیشا ددا کو مامۆستایێ خواندنگەهێ یە و رۆژنامەڤانە و نیڤ دەوامەکێ دکەت، ل سەر ڤی بنواشەی ل هەمی دەڤەرێن کوردستانێ و عیراقێ گەڕیا و پەیوەندیێن بەرفرەهـ دگەل کورد و هەمی کێمینەیێن دی یێن نەعەرەب گریدان، ئەڤە ژی ب بەهانا وێ چەندێ کو یێ ماددێ پێتڤی بۆ نڤیسینا هندەك گۆتاران کۆم دکەت، کو ئەو گۆتار چ جاران نەهاتینە بەلاڤکرن[١٧].

ل سالا ١٩٤٥ێ ژی هنارتییەکێ بزاڤا نەپەنییا سەهیۆنی کو ناسناڤێ وی (ئەفنارب)ە هاتە سندۆرێ و راپۆرتەك بەلاڤکر و تێدا بەحسێ زێدەبوونا هژمارا خەلکێ سندۆرێ کرییە، ئەڤە ژی ژ بەر مشەختبووونا ناڤخۆیی یا جوهیێن کوردستانێ یێن ژ گوندێن دەردۆر دهاتنە وێرێ و هەر سال دەهـ هەتا پازدە خێزان ل وی گوندی زێدە دبوون.

ل سالا ١٩٤٦ ێ ژی ئاژانسا جوهیانی دوو ئەندامێن تۆڕا خۆیا سیاسی ب ناڤێن (مۆریس فیشەر) و (یەهۆدا هلمان) هنارتنە عیراقێ بۆ سەربازکرنا کورد و ئاشوورییان (مەسیحییێن نەستۆری) دژی عەرەبان، پشتی سەرەدانا وان هەردوان بۆ کوردستانا عیراقێ، ئاژانسا جوهیانی راپۆرتەك بۆ لیژنا ئەمریکی - بەریتانی یا کێشەیا (عەردێ ئیسرائیل) هنارت و تێدا هاتییە: (بەسە ئەم ئاماژێ بکەینە وی چارەنڤیسێ ل عیراقێ ب سەرێ کورد و ئاشوورییان هاتی - مەبەست ژێ شکەستنا بزاڤێن بارزان یێن سالێن ١٩٣٢ و ١٩٤٣ و ١٩٤٥ ێ و بزاڤا ئاشوورییان یا سالا ١٩٣٣ێ یە - داکو بزانین دەلیڤا دانانا رژێمەکا عەرەبی چەند یا لاوازە کو ئەو رژێم ب گیانێ خۆڕێڤەبەرییەکا فیدرالی و ل دووڤ پرەنسیپان سەرەدەریێ دگەل کێمینەیەکا خودان سیمایەکێ سیاسی و خودان شارستانییەکا جودا ژ شارستانییا خۆ بکەت)[١٨].

هەروەسا د راپۆرتەکا دەربارەی کوردان دا یا گەهشتییە ئاژانسا جوهیانی و ل ناڤ بادەك و ئەرشیفێ وێ ئاژانسێ دا هاتییە پاراستن هاتییە: (دو سالە کورد ب هەمی رێ یێن بەردەست قەستا مە دکەن داکو پەیوەندیێ دگەل بکەین و دەنگێ خۆ بگەهینینە دەنگێ وان دژی نەیارێ هەڤپشك عەرەبان)، راپۆرت پێڤە دچیت و دبێژیت: (کورد داخوازا رێکخەر و راهێنەران ژ مە دکەن و ل وێ باوەرێنە کو هنارتیێن ئیسرائیلی دشێن ئێککرتنێ ل ناڤبەرا هەمی عەشیرەتێن کوردێن نەیارێن ئێك پەیدا بکەن و یەکینەیەکا شەرکەر ژێ چێ بکەن و دشێن ل سەر هەمی جۆرێن چەك و تەقەمەنییان مەشق و راهێنانان پێ بکەن)، دەمێ من پرسیار ژێ کری؟ بۆچی قەستا جوهیان ب تنێ دکەن؟ گۆتنە من: مە دوژمنەکێ هەڤپشك هەیە[١٩].

هەر د وێ راپۆرتێ دا هاتییە کو (حازم بەگ شەمدین ئاغا) ئەندامێ پەرلەمانێ عیراقێ ژ قەزا (زاخۆ) ل سەر ڤێ چەندێ گۆتییە:ئەم ژ بریتانی و ئەمریکییان بێ هیڤی بووینە و دئامادەینە پەیوەندیێ ب هەر لایەنەکی بکەین، ئەم دئامادەینە ژی هەر هاریکارییەکێ ژ جوهییان وەرگرین، دەمێ من داخواز ژێ کری دەملدەست بزاڤا ئێککرتنا کوردان بکەت، ترس لێ دیار بوو و گۆتە من:ژ جوهیێن عەردێ ئیسرائیل (فلەستینێ) هیڤیخوازین هنارتیێن خۆ بۆ مە بهنێرن داکو مە ئامادە بکەن و داخواز ژ من کر ڤێ داخوازیا وی بگەهینمە سازیێن جوهیانی، وی سۆزدا پێشوازیا هەر هنارتییەکێ ئیسرائیلی بکەت و جهەکێ ڤەحەویانێ و پاراستنێ بۆ پەیدا بکەت، هەروەسا دیار کر کو یێ ئامادەیە هاریکاریێ بکەت هەر هنارتییەکێ جوهی ب قەچاغی ژ بەغدا ڤەگوهێزیتە کوردستانێ. ئەز پێشنیاز ژی دکەم کو هەکە کورد رازی بوون، هژمارەك ژێ بۆ ئیسرائیل (فلەستین) بهێنە هنارتن و مەشق و راهێنانان پێ بکەین و وان ئامادە بکەین، من دڤێت وێ چەندێ ژی بێژم کو کوردان چەندین جاران ئەڤ پێشنیازە کرینە[٢٠].

ل چریا ئێکێ یا سالا ١٩٤٢ێ ژی مائیر مریدۆر وەك هنارتیێ مۆسادا مشەختبوونا دووێ (هۆبا سیاسییا ئاژانسا جوهیانی) سەرەدانا کوردستانێ

كر داكو دگەل جوهیێ دی ئینزۆ سیرینی كاری بۆ دامەزراندنا یەكینەیێن بەرەڤانی ژ خۆكرنێ ل تاخێن جوهییان بكەت بۆ بەرسینگگرتنا هێرشێن عیراقی دكەنە سەر وان، وی د راپۆرتا خۆ دا ل سەر پەیوەندیێن ل ناڤبەرا جوهییان و هەڤسوویێن وان یێن ل كوردستانێ ئەو پەیوەندی ب گشتی ب باش ل قەلەمدابینە، لێ عیراقییان هەردەم پێكۆل كرینە ڤێكنەكرن و هەڤركییان ل ناڤبەرا وان بەرفرەهـ بكەن. هەروەسا مریدۆر دنڤیسیت:(ل سندۆرێ كو ئێكە ژ گوندێن باكوور{كوردستانێ} و دكەڤیتە باكوورێ باژێرێ دهۆك و هەروەسا ل زاخۆ دگەل وان جوهییان كومبوویمە یێن وەكی خەلكێ دەڤەرێ چەك هەلدگرتن، پێڤەدچیت و دبێژیت:... رەوشا ئێمناهیێ یا جوهییان ل وێ دەڤەرێ یا خرابە ژ بەركو عیراقی كوردان ڤێرا بەرددەن، ڤێ داوییێ ژی جوهی بۆ چاڤدان و زێرەڤانیكرنا ملكێ خۆ ناچنە ناڤ رەز و بیستانێن خۆ، ژ ترسا وێ چەندێ نەكۆ تووشی كێشەیەكا مەزن ببن)[21]، گوندێ سندۆرێ ژی (كو گوندێ ئێكانەیێ جوهیان بوو ل كوردستانا عیراقێ) ل سالا ١٩٤٢ێ تووشی روودانەكێ ببوو، ئەڤە ژی دەمێ خەلكێ هەردو گوندێن (سندۆرێ) و (قارقاراڤا) (دوو گوندن دكەڤنە باكوورێ باژێرێ دهۆك) د شرین خەوا خۆ دا بوون، گازییا هەوارهاتنێ یا شڤانەكێ ل سەر چیایێ سپیرێز (یێ ل هنداڤی هەر سێ گوندان ژ لایێ باشوورڤە) ئەو هشیاركرین، ژ بەركو نەریتێ دەڤەرێ ژی وەسا بوو خەلكێ دەڤەرێ د هەوارا گازییا هەر ئێكی بچن، خەلكێ وان گوندان چەكێن خۆ هەلگرتن و قەستا ژێدەرێ گازیێ ل وی چیای كرن، كو ل وێرێ چەند گوللەیەك هاتبوونە هاڤێتن و ببوو ئەگەرێ بریندارببوونا (مستەفا گەردی) یێ خەلكێ گوندێ ئێكماله، جوهی یێن سندۆرێ ژی بزاڤكرن وی چارەسەر بكەن لێ بێ مفا بوو و ژ بەر برینەكا سڤك یا ل باسكێ پیێ وی چێ بووی گیانێ خۆ ژ دەستدا، ژ بەر هندێ، (تێلی گەردی) یێ برایێ وی و رەشید گێندەل پسمامێ وی بریاردان تۆلا وی ژ جوهییێن گوندێ سندۆرێ ڤەكەن، ئینا شەڤەكێ قەستا گوندێ سندۆرێ كرن و بێی هندێ جوهی پێ ب حەسیێن چوونە ناڤ كنیشتێ، دەمێ جوهییێن روونشتی ل ناڤ كنیشتێ هەردو زەلام ل دەرازینكا دەرگەهێ كنیشتێ دیتین، بزدیان و ژ ترسان رۆناهی ڤەمراندن، ئینا تێلی و رەشیدێ پسمامێ وی ب ئاوایەكێ هەرەمەكی تەقە لێ كرن و حەفت ژێ كوشتن و پتر ژ بیستێن دی بریندار كرن، پشتی ڤێ روودانێ (تێلی گەردی) و (رەشید گێندەلێ) پسمامێ وی بوونە كەسانێن داخوازكری ژ لایێ دەستەلاتا شاهنشینیا عیراقێ ڤە، پاشی ناڤێ (سەلیم مستەفا بێسفكی) ژی ل سەر ناڤێن وان هاتە زێدەكرن كو ل رۆژا ١٢خزیرانا سالا ١٩٣٨ێ مزگینیدەرێ ئەمریكی كەمبرلاند ل باژێرێ دهۆك كوشتبوو[22]، رۆژنامەڤانییا جوهیانی ژی ل فلەستینێ ئاماژە ب ڤێ روودانا گوندێ سندۆرێ كر یا ب سەرێ جوهییان هاتی.

فەرە بێژین تێلی گەردی كو ئێك بوو ژ كەسایەتیێن عەشیرەتا ناڤدارا دۆسكی، د بەرێ دا ئێك بوو ژ وان كەسان یێن جوهییێن سندۆرێ ژ دەستدرێژیێن یێن دی دپاراست[23].

## هەلویستێ جوهییان ژ شێخ و ئاغایێن دەڤەرا بەهدینان:

د رۆپیڤەكا خۆ دا بۆ چوار دەڤەرێن كوردی یێن دەڤەرا بەهدینان كو ئەو ژی زاخۆ، دهۆك، ئامێدیێ و ئاكرێ نە، دیرۆكنڤیسێ ئەمریكیێ ب رەگەز جوهی یوسف موردەخای زاكن Mordechai Zaken د پەرتووكا خۆ دا (جوهییێن كوردستانێ و سەرۆك عەشیرەتێن وان) ڤەگێرانێن خۆ ژ زاردەڤێ جوهییێن كوردستانێ ڤەدگوهێزیت:(هندەك ئاغا و شێخێن رێبازێن سۆفیگەری و هندەك زانایێن ئایینی، جوهی تەپەسەر دكرن و دەستدرێژی دكرنە سەر)، زاكن هندەك نموونەیان ل سەر وان دەستدرێژییان دئینیت و ناڤان ژی ئەشكەرا دكەت، لێ هەڤدەم پەسنێ هندەكێن دی هەر ژ وان تەخ وچینان دكەت و ئاماژەیێ دكەتە ناڤێن وان دەمێ ئەو روودان چێ بووین.

## ئێك : قەزا زاخۆ

ل (قەزا زاخۆ) کو ئێکەمین ویستکەهێ گەریانا وی بوو ژ بەرکو ئەو ب خۆ خەلکێ وێرێ بوو، زاکن دبێژیت: جوهی ل نیڤا سەدسالییا ١٩ێ ل ناڤبەرا نیڤ هەتا دوو ژ سێی (٣/٢) خەلکێ زاخۆ بوون، هەر بۆ نموونە، ل سالا ١٨٤٨ ێ راپۆرت وەسا دیار دکەن کو ١٣٠٠ خێزانێن جوهی ل زاخۆ دژین، ل سالا ١٨٥١ێ جوهی ل ١٠٠ خانییان ژ کۆما ١٥٠ خانییان دئاکنجی بوون، ل سالا ١٨٥٩ ێ ٢٠٠ خانییێن جوهییان و هژمارەکا هەڤشێوەیا وێ ژ نەجوهییان(موسلمان و مەسیحییان) لێ هەبوون، هەروەسا ل ناڤبەرا سالێن ١٨٨٠ و ١٩٠٦ێ راپۆرت دبێژن کو ٢٥٠ هەتا ٣٠٠ خێزانێن جوهی ل زاخۆ دژین کو هژمارا وان ژ ١٥٠٠ هەتا ٢٤٠٠ کەسان بوویە[٢٤].

دگەل داویهاتنا شەرێ جیهانیێ ئێکێ ژی ل سالا ١٩١٨ێ، هژمارا جوهیێن ئاکنجییێن زاخۆ گەهشتبوو ٢٤٠٠ کەسان، ئەڤە ل وی دەمێ هژماران وان ل وێرێ ل سالا ١٩٢٩ێ ٤٠٠٠ هزار کەس بوو، لێ ل سالا ١٩٣٠ێ ژ بەر مشەختبوونا وان بۆ فلەستینێ تنێ ١١٧١ جوهی ل زاخۆ مابوون.

هەروەسا ل سالێن ١٩٤٠-١٩٤٥ێ ١٥٠٠ جوهی ل زاخۆ دئاکنجی بوون، ئەڤە ل وی دەمێ ئامارێن فەرمی دگۆتن کو هژمارا وان ١٣٩٤ کەس بوویە، ل دووڤ راپۆرتێن داویێ یێن بەری مشەختبوونا ب کۆم بۆ ئیسرائیل ل ناڤبەرا هەردو سالێن ١٩٥٠ و ١٩٥١ێ ١٨٠٠ جوهی ل زاخۆ دئاکنجی بوون[٢٥].

زاکن ژ ڤەگێرەکێ خۆ ڤەدگوهێزیت کو ئەو ژی مامۆستا (لیفی)یە و ل دووڤ ڤەگێرانەکا زاردەڤ، زەلامێن عەشیرەتا سلێڤانەیی بازێرێ زاخۆ ئاڤا کرینە و عەردێ وان دکەڤیتە باشوورێ بازێری و بنەمالا شەمدین ئاغا ل زاخۆ ئاکنجی بوویە و بنەکۆکا وێ ڤەدگێرییتە سەر عەشیرەتا سلێڤانەیی[٢٦].

دەمێ ئاماژەیێ دکەتە کەسایەتی و ئاغایێن زاخۆ ژی، دبینین یێ پەسنێ بنەمالا (شەمدین ئاغا) و پەسنێ پتریا ئەندامێن وێ بنەمالێ دکەت کو وی دەمی ئانکو هەر ژ دەستپێکا سەدسالییا ١٩ هەتا نیڤا سەدسالییا بیستێ یا ب هێز و زەنگین بوو، هەروەسا دەمەکێ کێم پشتی مشەختبوونا جوهییان بۆ فلەستینێ و مرنا کەسایەتیێ بەرنیاس (حازم بەگێ) ل سالا ١٩٥٤ ێ و دگەل داوییێن سەدسالییا ١٩ و پێهەل، بنەمالا شەمدین کۆنترۆل ل سەر هەمی موسلمان و جوهی و مەسیحیێن زاخۆ و دەردۆرێن وێ کریوو، (عاسف بەگ) ژی ئێکەمین کەسایەتی بوو ل ناڤ وێ بنەمالێ ناڤدار بووی و کورێ وی حازم بەگ (١٨٩٥-١٩٥٤) ب هێزترین زەلامێ زاخۆ بوو، ئەو ژ هەر ئێکێ دی یێ ل دەڤەرێ زەنگینتر بوو، هەروەسا خودانکار ژی بوو و ١٠٠ دکان ل زاخۆ هەبوون، ئەڤە سەرباری عەردێن بەرفرەهێن ل دەرڤەی بازێری هەبن، هەروەسا سیاسەتمەدارەکێ دیار و بەرکەڤتی بوو و چەندین جاران بوویە نوونەر، بوویە ئەندامێ پەرلەمانی و ئەندامێ جڤاتا ئەعیانان(جڤاتا پیرێن عیراقێ)، ماوەیەکێ کورت ژی ببوو وەزیرێ بێ وەزارەت د حکومەتا عیراقێ دا و مام و پسمامێن وی ژی خودان دەستەلات بوون، مامێ وی (محەمەد ئاغا) سەرۆکێ بازێرڤانییا زاخۆ و ئەندامێ پەرلەمانی بوو هەتا ل سالا ١٩٢٣ یان ١٩٢٤ێ د روودانا کەڤتنا فرۆکێ دا گیانێ خۆ ژ دەستدای، هەروەسا پشتی وی کورێ وی حەجی ئاغا شوونا وی گرت و بوو سەرۆکێ بازێرڤانییا بازێری، حازم بەگ و حاجی ئاغا پسمامەکێ دی ژی هەبوو کو ئەو ژی (عەبدلکەریم ئاغایێ کورێ حەجی رەشید بەگێ) یە، لێ (عەبدلکەریم ئاغا) وەکی ئەندامێن دی یێن بنەمالێ چ دەستەلاتا فەرمی نەبوو، لێ (باشترین ئاغا) بوو جڤاکێ جوهی یێن زاخۆ رێزێ لێ دگرت...[٢٧].

بۆ ئاماژەکرنا رێزگرتنا ئاغایێن زاخۆ بۆ کەسایەتیێن جوهییان، دانەر دبێژیت:(حازم بەگ ب رێزگرتن ڤە ل بەرامبەری مۆشێ کابای موختارێ زەنگینێ زاخۆ رادبوو، هەروەسا عەبدلکەریم ئاغا ب (خالۆ) گازی مرداخ میرۆ زاکن (ئێکە ژ ئەندامێن بنەمالا دانەری) دکر، چونکی ب راستی خالێ وی جەمیل ئاغا سەرۆکێ ئاغایێن سندییان ئەو دپاراست و چاڤێ خۆ دایێ)[٢٨].

ل سەر ئاغایێن عەشیرەتا سندی ژی ئەوێن ل دەڤەرا (گەلیێ پسئاغا ل باكوورێ ناحیا شەرانش- دەركار عەجەم) دئاكنجی دبێژیت:ئەو سەروەرێن عەشیرەتی یێن پتریا جوهیێن زاخۆ بوون كو پتریا وان جوهیان بازرگان یان فرۆشیارێن گەڕۆك بوون و هاتن وچوونا وان ل دەڤەرێن ل بن دەستەلاتا وان بوو، وان ئاغایان د ماوێ چوار بەرەبابێن داویێ دا:(ئاقووب (یەعقوب ئاغا)، كورێ وی عەبدی ئاغا، جەمیل ئاغا و سالح ئاغا كورێن عەبدی ئاغا (كو ل سالا ١٩٤٥ێ وەغەرا داویێ كرییە)، كورێن عەبدی ئاغا، بشار ئاغا كورێن جەمیل ئاغا ڤان ئاغایێن وێ عەشیرەتێ گەلەك جوهی پاراستینە[٢٩].

ل سەر پەیوەندیێن جڤاكی و پەیوەندیێن ل ناڤبەرا سەرۆكێ عەشیرەتا سندی و جوهیێن زاخۆ، دبێژیت:( ل سالا ١٩٤٥ێ دەمێ بوویە دەواتا عەبدی ئاغایێ كورێ جەمیل ئاغای، ڤەگێڕێن جوهی ئەو شەهیان ب روودانەكا گرنگ د ژیانا خۆیا جڤاكی دا ل قەلەمدان و ڤەخواندنا خۆ بۆ وێ شەهیانێ ب شەرەفەكا مەزن بۆ جوهیان ل قەلەمدان ژ بەركو ئەو یێ دبنە مێڤان ل ئاهەنگا دەواتا كورێ ئاغای .. هەتا ل ئیسرائیل ژی و پشتی پتر ژ ٤٠ سالان ژ مشەختبوونا جوهیان بۆ وێرێ، ڤەگێڕێن جوهی ئەو ڤەخواندن وەسا ل قەلەمددان كو ئەڤە نیشانێ وێ رێزگرتنێ یە یا وان ئاغایان بۆ جوهیان هەی، هەروەسا دەمێ بشار ئاغایێ كورێ سەلاح ئاغای ژنا دووێ ژ عەشیرەتا هاجان ژ كۆچەران ئینای شەهیانێن مەزن بەری دەواتێ (ئانكو دەمێ ژنخواستن و شەڤا خەنایێ) ل مالا خێزانا (مرداخ - مردەخای میرۆ زاكن) یا جوهی ل زاخۆ هاتینە گێڕان و جوهیان هەست ب شانازیێ كرینە ژ بەر ڤێ شەهیانا ژنئینانێ)[٣٠].

سەرباری ڤێ پەسندانێ بۆ سەرۆك عەشیرەتێن سلێڤانەیی و سندی، زاكن د جهەكێ دی دا بەحسێ وان كوشتاران دكەت یێن كوردان ل زاخۆ دژی جوهیان ئەنجامداین و دبێژیت: «... د نامەیەكا سالا ١٨٩٢ێ یا سەركردێن جوهی یێن زاخۆ دا گازندە هاتییە كرن كو كورد ب ئاوایەكێ رێكخستی كوشتاران دژی جوهیێن ل بازێران ئەنجام ددەن و خانی و پەرستگەهێن وان دسۆژن و حەفت جوهی هاتینە كوشتن و هەمی ئەوێن رزگاربووی ژی هاتینە دەستەسەركرن و ب دژواری هاتینە ئەشكەنجەدان، هەروەسا باج ل سەر وان گەلەك هاتینە زێدە كرن و هاتینە دوو قات كرن، ڤێجا بازێر ل ناڤ ڤێ فەرتەنێ خەندقییە و ١٥٠ خانیێن جوهییان هەرفینە)[٣١].

هەر د ڤی چارچۆڤەی دا، زاكن پشتی ٥٠ سالان دروستتر ژی ل سالا ١٩٤١ێ، ئاماژەیێ دكەتە كوشتنا حەفت جوهیێن خەلكێ گوندێ سندۆرێ یا دكەڤیتە باكوورێ بازێرێ دهۆك[٣٢].

نڤیسەری ژێبر نەكرییە بێژیت كو سەرۆكێن هەشیرەتا سندی پارێزڤانێن جوهیێن زاخۆ و دەردۆرێن وێ بووینە، هەروەسا ئاقووب ئاغا (یەعقوب ئاغا) و عەبدی ئاغایێ كورێ وی و جەمیل ئاغا و سەلاح ئاغا كورێن عەبدی ئاغا كو ل نیڤا دووێ یا سەدسالییا ١٩ و نیڤا ئێكێ یا سەدسالییا بیستێ ئاغایێن سەرەكی یێن وێ دەڤەرێ بوون، پتر ژ حكومەتێ شیاینە جوهیان بپارێزن[٣٣].

زاكن ژ (ویگرام)ێ مزگینیدەرێ ئەمریكی- بەریتانی ڤەدگوهێزیت و دبێژیت:(سەرۆكێ بارزان (=شێخ عەبدلسەلام) و عەبدی ئاغا ژ هەردو عەشیرەتێن سندی و گولی، ل دەستپێكا سەدسالییا ٢٠ێ گرنگترین سەرۆك عەشیرەتێن وێ دەڤەرێ بوون، ئەڤە ژی دەمێ ئەو دهێنە هەڤبەركرن دگەل (حەجی رەشید بەگێ میرێ بەرواری) و ئاغا چالا(چەلێ ل كوردستانا تركیا) كو ئەڤە وەكی وان یێ ب هێز و خودان دەستەلات نەبوو). زاكن ژ ویگرام ڤەدگوهێزیت و دبێژیت: «دبیت ژی (عەبدی ئاغا)یێ سندی-گولی ژ وان هەمیان چێتر بیت، وی كەلهەكا جوان چێ كری هەیە و چ هێزێن حكومی نەشیاینە بچنە ناڤ وێ كەلهێ و ئەو ئاغا ژی تەمەت هەڤسوویێ خۆ شێخێ بارزان(شێخ عەبدلسەلامێ بارزانیێ دووێ) كەسەكێ گراڤی و ب قیمەتە، ئەو كەلە یا ب هێز و بلندە و ل بانیا تانینا(تەنینا سندیا)یە كو ئەو ژی بانیەكا راست ویان و قاهیمە دكەڤیتە د ناڤبەرا

چیایێن(باكوورێ باژێرێ زاخۆ ل سەر سنوورێ تركیا) كو دارستان و ئاڤا وێ تێرا هەمی تاكێن عەشیرەتا (سندی) هەنە.

## دوو: ئاكرێ

ڤەكۆلەری د پشكا دووێ دا بەحسێ قەزا ئاكرێ كریە و زانیاریەكا گرنگ گۆتیە، ئەو ژی ئەوە كو جوهیێن ئاكرێ ژێ دەركەڤتینە، چونكی حوكمدارێ وێ كێشە بۆ پەیدا كرینە، هەروەكی زاكن دبێژیت. هەروەسا ژ گەڕیدەیێ جوهی بنیامینێ دووێ ڤەدگوهێزیت و بەحسێ هژمارەكا هێرشێن موسلمانێن كورد بۆ سەر ژنێن جوهی دكەت دەمێ بۆ تافیركرنێ دچوونە گەرماڤا نێزیكی كنیشتێ ل دەرڤەی باژێری[٣٤].

ڤەكۆلەر ب ئامار بەحسێ هژمارا جوهییان دكەت هەر ژ نیڤا سەدسالییا ١٩ هەتا دەستپێكا سەدسالییا ٢٠ ێ و دبێژیت كو هژمارا جوهیێن ئاكرێ ژ ٣٠٠ كەسان نەبۆریە و د شەڕێ جیهانیێ ئێكێ دا ب تنێ دەه خێزانێن جوهی ل وێرێ مابووینە، لێ دیار دكەت كو ل سالا ١٩٢٩ ێ ٢٠ خێزانێن كلدانی و ٤٠ خێزانێن جوهی ل ئاكرێ هەبووینە ژ كۆما ٨٠٠ خێزانان كو ل وی دەمی ل ئاكرێ دژیان و هژمارا وان ٤٠٠٠ كەس بوون[٣٥].

د شەڕێ جیهانیێ دووێ دا ١٥٠ جوهی ل ئاكرێ دئاكنجی بوون و پتریا وان خودان جهێن بازرگانی بوون و ب چێكرنا شیرێن زیڤی و خەنجەرێن كوردی دناڤدار بوون[٣٦].

پاشی بێی هندێ ئەگەر بێنە گۆتن، هژمارا جوهییان ل ئاكرێ ب زێدەهییەكا كێم زێدە بوویە، وەسا دیارە ژی هەلبوونا شۆڕشێن بارزان دژی حكومەتا شاهنشینیا عیراقێ ل سالێن ١٩٣١-١٩٣٢ێ و ل سالێن ١٩٤٣-١٩٤٥ێ ب سەركردایەتیا شێخ ئەحمەد بارزانی و مەلا مستەفا بارزانی، ئۆپەراسیۆنێن سەربازیێن لەشكەرێ عیراقێ و بومبەبارانكرنا گوندێن بارزانییان و زێبارییان ببنە ئەگەرێ وێ چەندێ گەلەك جوهیێن بارزان و گوندێن زێبارییان قەستا باژێرێ ئاكرێ بكەن[٣٧].

پاشی بەحسێ خێزانەكا جوهی دكەت كو د ماوێ سێ بەرەبابێن بۆری دا ناڤدار بوویە كو ئەو ژی خێزانا (خواجە خینۆ)یە یا سەرۆكاتیا جڤاكێ جوهیانی ل ئاكرێ دكر، ڤێ خێزانێ پەیوەندیێن بەرفرەهـ دگەل ئاغا و فەرمانبەرێن فەرمی هەبوون یێن هەرجار سەرەدانا وێ خێزانێ دكرن و دەمێن خۆش دگەل دبۆراندن و پێكڤە خوارن و ڤەخوارن دخوارن و گوهداریا مۆزیكێ دكرن و ل تەنگاڤییان هاریكاریێن ماددی و دارایی بۆ سەرۆك عەشیرەتێن پێتڤی وان هاریكاریان كۆم دكرن، هەروەسا ژ ژێدەرەكێ مەیدانی ڤەدگوهێزیت كو ئەو ژی (دەرێش ناحۆم) ە یێ وەك نڤیسەر ل نك خواجە خینۆ كار دكر، دبێژیت كو:(ئەفسەرێن پۆلیس و لەشكەری هەرجار سەرەدانا وی دكرن و پێكڤە دروینشتن و پێكڤە خوارن وڤەخوارن دخوارن و گوهداریا هندەك سترانان دكرن یێن خۆشی بۆ چێ دكرن و پاشی دچوون)[٣٨].

ل سەر پەیوەندیێن د ناڤبەرا جوهییان و شێخێن نەقشبەندیێن بارزانی، زاكن ئاماژێ دكەتە وێ چەندێ كو شێخێن بارزان رێزگرتنەكا مەزن ل نك خەلكێ كوردستانێ هەیە، هەروەسا ژ پەرتووكا (الحیاة في شرق كردستان) یا (ویگرام)ێ مزگینیدەرێ بریتانی ـــ ئۆسكۆتلەندی ڤەدگوهێزیت:(شێخێ بارزان ئێكە ژ ب هێزترین كەسایەتیێن عەشیرەتی ل كوردستانێ)، هەروەسا بەحسێ سەرەدانەكا خۆ بۆ بارزان دكەت كو زێرەڤانێن وی دگەل وی و زەلامێن وی هاتبوونە گوندێ (بیرا كەپرا) یێ زێبارییان هەتا گەهشتینە كنارێ رووبارێ (زێ یێ مەزن)، دەمێ ل كەلەكێ سوار بووین، ئەركێ زێرەڤانێن وی ل وێرێ ب داویهات، ئەو دگەل مە دەرباز نەبوون، چونكی ئەڤە سەر ب عەردێ شێخێ بارزان بوو، حكومەتێ ژی (یا ئۆسمانی) هەست ب هندەك شانازیێ كر، بۆ وێ رێزگرتنا شێخێ بارزان بۆ دەربری دەمێ دگەل وان د عەردێ وان را دەرباز بووین...)[٣٩].

ژ لایەكێ دیڤە، ویگرام خۆ مەزن نەكرنا شێخێ بارزان (عەبدولسەلامێ دووێ) پشتراستدكەت ئەڤە

ژی دەمێ ئەو دگەل سەرۆك عەشیرەتێن ژ وی کێم هێزتر هەڤبەرکری و دبێژیت:(ئەو سەرۆك عەشیرەت، هەتا یێن خودان دەستەلاتەکا کێمتر ژی، ل کۆچکا دژیان)، لێ خانیێن وی ل ناڤ زەلامێن وی بوون و جهێ ئاکنجیبوونا وی ژ چەند خانیەکێن ب رەخ ئێکڤە نەدبۆرین، گوندێن بارزان دپێشکەڤتی بوون، شێخ ب خۆ ژی یێ ئاقلمەند و دلۆڤان بوو، ب هندێ یێ ناڤدار بوو کو ب دادپەروەری سەرەدەریێ دگەل دووڤکەڤتیێن خۆ دکەت، هەروەسا دەمێ ڤێکنەکرن ل ناڤبەرا وی و حکومەتێ پەیدابووی و رەڤییە چیای، وی بەرهەمێ سەرەدەریا خۆیا باش دگەل جۆتیاران چنی، چونکی مرۆڤەکێ ب تنێ ژی، نەیێ موسلمان و نەیێ مەسیحی نەبوو خیانەتێ لێ بکەت و وی رادەستی دوژمنێن وی بکەت[٤٠].

ویگرام ل سەر دەربڕینا هەڤسۆزیا خۆ دگەل شێخێ بارزان بەردەوام دبیت و بەحسێ مەردینی و حەژێکرنا وی بۆ خێرێ دکەت، نەتنێ بەرامبەری دووڤکەڤتیێن وی یێن موسلمان، بەلکی بەرامبەری یێن نە موسلمان ژی[٤١].

پاشی ڤەکۆلەر ڕێچکا ئاخڤتنێ دگوهوریت و ژ راپۆرتەکا تایبەت ب دەنگ وباسێن دەڤەرا ئامێدیێ یا ل کانوونا ئێکێ سالا ١٩١٣ێ دەرکەڤتی ڤەدگوهێزیت و پشتا خۆ ب گۆتنێن مزگینیدەرەکێ خۆجهی گەرم دکەت و دبێژیت:(شێخێ بارزان (عەبدلسەلامێ دووێ) هێرش کرە سەر هندەك گوندێن عەشیرەتا نێروە کو سێ ژ وان یێن ئاشووری(نەستۆری)یان و شەش ژی یێن کوردی نە، ئەو گوند تالان کرینە و شەلاندینە و شەش جوهی ژی کوشتینە، کو ئەڤ هێرشە بەرسڤدانا زەلامێن نێروە - ڕێکان بوو یێن رەت کرین هاریکاریا وی بکەن بۆ ئەنجامدانا هێرشەکێ یا نەخشە بۆ هاتییە دانان دژی هەردو عەشیرەتێن چال و تخۆما یێن ئاشووری)[٤٢].

ڤەکۆلەر پرسیارەکێ دکەت و دبێژیت:(لێ بۆچی ئەو جوهیێن بەلنگاز هاتنە کوشتن؟)، ڤەکۆلەر ژ مزگینیدەرێ ئەو دەنگ و باس ڤەگوهاستی ڤەدگوهێزیت:(مرۆڤ دڤی تشتی ناگەهیت)، پاشی ڤەکۆلەر شرۆڤەیا ڤی دەنگ و باسێ نشکاڤەیی دکەت، چونکی ئەو راپۆرت گومانان ل سەر شێخێن بارزان و هەلویستێ وان یێن راست ودروست بەرامبەری کوردێن جوهی پەیدا دکەت و بزاڤێ دکەت بەرسڤێ بدەت و دبێژیت:(چونکی هەمی راپۆرتێن ژ ژێدەرێن جودا جودا دەرکەڤتین بەحسێ سەرەدەریا جوامێرانەیا بارزانییان بەرامبەری جوهییان کرییە)[٤٣].

کو ئەڤە ژی هەتا رادەیەکێ بلند هەڤدژییە دگەل بنواشەیێ وان پەیوەندیێن باش یێن د ناڤبەرا جوهی و شێخێن بارزان هەین، نڤیسەر ب رۆهن و ئەشکەرایی ئاماژەیێ دکەتە ڤێ چەندێ دەمێ دبێژیت:(وەسا دیارە شێخێن نەقشبەندی، نەخاسمە ژی (شێخ ئەحمەد) و (مەلا مستەفا بارزانی)، پەیوەندیێن باش و تایبەتی دگەل جوهیێن کوردێن ل بن چاڤدێریا وان هەنە... سەرباری ڤێ ژی ڤەگێڕێن جوهی ژ دەڤەرێن: شنۆ، مێرگەسوور، سەرکانی و دیانا بەحسێ هەلویستێن ئەرێنی یێن بارزانییان بەرامبەری جوهییان دکەن[٤٤].

شێخێن بارزان پەیوەندیێن موکم دگەل خێزانا خواجە خینۆ هەبوون کو د ماوێ سێ بەرەبابێن بۆری دا گرنگترین و ناڤدارترین خێزانا جوهی بوو ل ئاکرێ، گرۆڤە ژی بۆ ڤێ چەندێ، ئەو داخوازییە یا دەستەلاتا ئۆسمانی(حکومەتا ئیتحاد و تەرەقی) ل عیراقێ داخواز ژ خواجە خینۆر کری بەرگەریانێ ل ناڤبەرا وێ حکومەتێ و شێخ عەبدلسەلامێ دووێ یێ بارزانی بکەت دەمێ بزاڤا وی ل دەستپێکا سەدسالیا بیستێ دەستپێکری، ڤەکۆلەر پشتراست دکەت کو چ ژێدەرێن دی نینن ڤێ ڤەگێڕانێ پشتراست بکەن، ژ بلی شوینوارێ خێزانا خواجە خینۆ، ڤەکۆلەر ڤەگێڕانەکێ ژ (ئاریێل کابای) کو ئێکە ژ ئەندامێن خێزانا خینۆی ڤەدگوهێزیت، کو دبێژیت: «دەمێ باپیرێ من گەهشتییە بارزان... هەمی ئەڤە ئامادە بوون داکو ب خێرهاتنا وی بکەن: شێخ عەبدلسەلام (ل سالا ١٨٨٢ێ ژ دایك بوویە)، محەمەد سادق، شێخ ئەحمەد (ل سالا ١٨٨٤ێ ژ دایك بوویە)، مەلا مستەفا بارزانی (ل سالا ١٩٠٣ ێ ژ دایك بوویە) و هەمی کوڕێن وان، وی گۆتە وان کو ئەو بۆ بەرگەریانێ

د وێ کێشەیێ دا هاتییە، وان ژی گۆتی:(چ خرابی دگەل تە ناهێتەکرن و هەر تشتەکێ تو بڕیار ددەی، ئەم پێ درازینە، لێ هەکە کەسەکێ دی هاتبا، نەدشیا بهێتە ڤێرە، چونکی ئەم تە ب مرۆڤەکێ ڕێزدار دبینین.... ئەڤ سەرەدانە ل دەمێ ئاهەنگگێڕانا جوهییان ب جەژنا (هەیکەل) هاتییە کرن... و مەحال بوو ژ بارزان دەرکەڤیت و گۆتنێ: دێ بۆ تە هەیکەلەکی(پەرستگەهەکێ) ل ڤێرە دانین... ب ڕاستی ژی خیڤەتەکا مەزن بۆ ڤەدا و بەرزەحفییەك(سفرەك) بۆ دانا و هەمی جوهیێن گوندێ بارزان هاتنە گوندی داکو خوارنێ دگەل بخۆن، کو ل دووڤ ڕێ ورەسمێن جوهیانی ل ناڤ هەیکەلی دهاتە ئامادەکرن)[٤٥].

ڤەکۆلەر ل سەر پەیوەندییا موکم یا د ناڤبەرا خێزانا شێخێن بارزان و جوهییان بەردەوام دبیت و بەحسێ ئاخڤتنا ڕێبەرێ کورد مەلا مستەفا بارزانی دکەت دەمێ ل سالا ١٩٤٤ێ ل بەهییەکا وەکیلێ (خواجە خینۆ)ی ئامادە بووی و بارزانی ب ئامادەبوونا گەلەك سەرۆك عەشیرەتێن کوردی یێن بازێڕێ ئاکرێ دیارییەك ژ ڕێبەرێ جوهیێن ئاکرێ (خواجە خینۆ) وەرگرتی ئەڤە ژی ب هەلکەڤتا ئامادەبوونا وی ل وێ بەهیێ، کو ئەو دیاری ژی خەنجەرەکا زێڕین بوو یا ب سێ پیلەکێن زێڕی هاتییە نەخشاندن، دەڤێ ئاخڤتنا وی ژی ل بەرامبەری گەلەك سەرۆك عەشیرەتێن کورد ل ئاکرێ ئەڤا خوارێ بوو:(هوون باش دزانن کو ئەو خێزان (خواجە خینۆ) یا خۆشتڤییە ل بەر دلێ من ... و هەمی ژی وەك ئێك خێزان بەرێ خۆ ددەنە مە، هەرچەندە ئایینێ مە ژێکجودایە، لێ من نەڤێت ئەو تووشی چ ئێش و ئازاران ببن). زاکن ژ نڤیسەرەکێ دی یێ جوهی ب ناڤێ ئەمیل مراد ل سەر گۆتارا ئارمانجبەرا مەلا مستەفا بارزانی ل وێ هەلکەڤتێ پێشکێشکری ڤەدگوهێزیت کو ئەو گۆتار ب ڤێ گۆتنێ ب داوی ئینا بوو:(من جوهی گەلەك دڤێن و هەرکەسێ هزرا ئێشاندنا وان بکەت، دێ چاما ب سەری ئینم)[٤٦].

## سێ: قەزا دهۆك

ڤەکۆلەر ل دەستپێکا پشکا سێ بەحسێ هەبوونا ڕەڤەندەکا جوهی و مەسیحییان دگەل موسلمانان دکەت کو د ناڤ ١٠٠ خانیێن دهۆك دا دئاکنجینە، پاشی دبێژیت کو کورد پتریا خەلکێ بازێڕینە و ل ناڤ ٥٥٠ خانییان دئاکنجینە، مەسیحی خودان ٦٥ خانی و جوهی ژی خودان ٣٠ خانی نە، هەروەسا هژمارەکا مەزن یا نەستۆریان(ئاشووریان) ژی لێ هەنە دگەل هژمارەکا کێم یا مەسیحیێن کلدانی یێن ژ دەڤەرێن جزیرا بۆتان و هەکاری مشەخت بووینە بازێڕی و ئەڤە ژی بوویە ئەگەرێ زێدەبوونا ئاکنجییێن دهۆك و ل سالا ١٩٢٩ێ هژمارا وان گەهشتییە ٢٩٨٥٨ کەسان، کو پتریا وان کوردێن موسلمانن و هژمارا وان ١٨٣٠٧ کەسن، مەسیحی ٥٧٨٤ کەس، عەرەبێن موسلمان ٢٠٦٨ کەس، ئێزدی ٢٨٧٠ کەس و جوهی ٨٢٩ کەسن، ئانکو ب ڕێژا ٪٧,٢ ێ[٤٧].

ب هەڤبەرکرنا ڤی بازێڕی ژی دگەل بازێڕێن دی یێن کوردی، پتریا ئێزدییان ل دهۆکێ نە، وەسا دیارە ژی مەبەستا ڤەکۆلەری ئێزدی یێن ل گوندێن نێزیك و سەر ب قەزا دهۆکێ نە، هەکە نە، چ ئێزدی ل ناڤ سەنتەرێ بازێڕی ب خۆ نینن، ڤەکۆلەر ژی ل وێ باوەرێیە ئەڤ چەندە ژ بەر ڤێ ئەگەرێ بیت دەمێ دبێژیت:(... ناڤێ وێ یێ کەڤن دهۆکا داسنیایە، ئانکو دهۆکا ئێزدییان، لێ چ لێ نەمان پشتی وان کوشتارێن ل دژی ئێزدییان هاتینەکرن... پشتی هینگێ مەسیحی و جوهی هاتینە دهۆك و لێ ئاکنجی بووینە)[٤٨].

ل سەر ئاغا و شێخێن دەڤەرا دهۆك ژی، ڤەکۆلەری هندەك بەرپەڕێن وێ پشکێ تەرخان کرینە بۆ بەحسکرنا (سەعید ئاغایێ دۆسکی) و کوڕێن وی، پاشی بزاڤێ دکەت یێ بەری وی (حەسەن ئاغای) بدەتە نیاسین ئەڤە ژی ب ڕێیا بیرهاتنێن ساسۆن ناحوم کو ئێك بوو ژ جوهیێن دهۆك و دبێژیت:(حەسەن ئاغا مەزنێ ئاغایێن دهۆك ل دەستپێکا سەدسالییا بیستێ د شەرێ جیهانیێ ئێکێ دا خۆ دابوو دگەل لایەنێ ڕۆسی دژی ترکیا (دەولەتا ئۆسمانی)، حەسەن ئاغا دگەل هێزێن عەشیرەتا خۆ ڕەڤی ڕوسیا و پشتی هینگێ ب ئێکجاری نەڤەگەڕیا و سەعید ئاغایێ

برایێ وی بوو شوینگرێ وی، سەعید ئاغا ژی مەنترین حوکمدارێ عەشیرەتێ بوو ل دەڤەرا دۆسکی(ب ئارامییا نوو: دۆستینکایە) و سنوورێ دەستەلاتا وی ژ دهۆك بەرەڤ ژێهەل هەتا کناری رووبارێ خابوور درێژ دبوو، ئەو ب خۆ ژی ب رەسەن خەلکێ گوندێ (گەرماڤا)یە، راپۆرتێن شەری یێن بریتانی سەعید بەگ (١٨٩٠-١٩٤٧) یێ ژ (گەرماوا-گەرماڤا) نێزیکی دهۆك هاتی، ب زەلامێ هێزدارێ ئێکانە ل ناڤ عەشیرەتا وی ل قەلەم ددەت و خودان دەستەلاتەکا مەزنە، لێ یێن دی هێزا وی نینە و پێکەهێ وان نزمترە و گەلەك ژ ئاستێ موختارێن گوندان ژی کێمترن، بەریتانی نەتنێ وی ب کەسایەتییەکا ب هێز، بەلکی ب زەلامەکێ هەستیار دبینن و پشتەڤانییا وی بۆ حکومەتێ د ئۆپەراسیۆنا سالا ١٩٢٢ێ دا ل گەلیێ زێبار (ئامازەیە بۆ بزاڤا عەبدللەتیف ئاغایێ ئامێدی دگەل مەحمود ئاغایێ زێباری) و خۆراگرتنا وی یا بەردەوام دەمێ ل سالا ١٩٢٥ ێ ئالۆزی ل دهۆك چێ بووین ل بەرچاڤگرتینە دەمێ لیژنا سنووری سەرەدانا دەڤەرێ کری، ئەڤە ل وی دەمێ پتریا ئاغایێن دۆسکیان هەلویستەکێ دژی حکومەتا هەبوو، پشتی خۆسەرییا عیراقێ ژی، ل سار ١٩٣٨ێ وەك نوونەر یان وەك ئەندامێ پەرلەمانی هاتە هەلبژارتن، هەروەسا دو جارێن دی ژی ل سالێن ١٩٤٤ و ١٩٤٧ێ وەك ئەندامێ پەرلەمانێ عیراقێ هاتییە هەلبژارتن)(٤٩).

بیرهاتنێن جوهیێ دهۆکی ساسۆن ناحوم دمژەوینە، چونکی (حەسەن ئاغایێ کورێ ئیسماعیل ئاغا)یێ دۆسکی دگەل هێزێن عەشیرەتا خۆ یا دۆسکی کو شەرکەرێن عەشیرەتا مزووری ژی ب سەرکردایەتییا (شێخ نوری عەبدلجەبار) بریفکی دگەل بوون چووینە ئیرانێ داکو شەری بۆ دەولەتا ئۆسمانی بکەن دەمێ هێزێن رۆسیا باکوورێ ئیرانێ داگیرکری، پاشی ل بازێرێ ساوجبلاغ(مهاباد)ێ ژ ئەگەرێ نەخۆشییەکێ وەغەرا داویێ کر و تەرمێ وی هەر ل وێرێ هاتە ڤەشارتن(٥٠).

ل سەر راپۆرتا سەربازیا بەریتانی ژی، هەتا راددەیەکێ بلند یێ هووربین بوو، سەعید ئاغا خۆ دابوو دگەل لایەنێ حکومەتا بەریتانی، لێ سەفەر ئاغایێ کورێ عومەر ئاغای کو ئێك بوو ژ رێبەرێن عەشیرەتا دۆسکی خۆ دابوو دگەل لایەنێ حکومەتا ئۆسمانی دژی داگیرکەرێ بەریتانی، وەسا دیار ژی کو ئەڤ هەلویستێ وی ئێك بوو ژ ئەگەرێن تیرۆرکرنا وی ل سالا ١٩٢٤ێ ل گوندێ پیرەفاتێ کو ئێکە ژ گوندێن دۆسکییان و دکەڤیتە رۆژئاڤایێ بنیا چیایێ کەمەکا ل باکوورێ بازێرێ دهۆك(٥١).

راپۆرتا سەربازیا بەریتانی ل سەر بەحسکرنا هەر سێ کورێن سەعید ئاغای پێڤە دچیت و دبێژیت:(ئیسماعیلێ کورێ وی خۆکوشت و دبێژن کو ئەڤە ژی ژ بەر پشتەڤانییا وی بوویە بۆ دۆزا نەتەوەیی یا کوردی (ئەندامەتییا وی د پارتا هیوا دا) ب سەرکردایەتییا بارزانی و ل دژی هەلویستێ بابێ خۆ بوو یێ لایەنگرییا ئنگلیزی دکر و پشتەڤانییا سیاسەتا حکومەتێ دکر.. ل سەر کورێ دی (ئانکو دێوالی) یێ بوویە شوونگرێ سەعید ئاغایێ بابێ خۆ د رێبەریکرنا عەشیرەتێ دا، پێڤە دچیت و دبێژیت: هەمی ڤەگێرێن جوهی ل وێ باوەرێنە کو دێوالی و بابێ وی سیاسەتا زێستاندنێ ب کاردئینن و ملك ومالێ جوهییان بۆ خۆ ب رەوا دبینە، ڤەگێرێن جوهی وی ب ئاغایەکێ عەشیرەتیێ زمانخۆش و جوامێر ل قەلەم ددەن، لێ نە ب پلا سەعید ئاغایێ بابێ وی...)(٥٢)، لێ ب راستی ئەڤە زێدەگاڤییە ل سەر دێوالی ئاغا، چونکی هەمی ل وێ باوەرێنە کو ئەو خودان کەسایەتییەکا بالکێش و هەڤسەنگ بوویە و خزمەتا جوهی و مەسیحی و ئێزدییان کرییە، بەری خزمەتا کورێن نەتەوێ خۆیێ موسلمان بکەت، هەروەسا ڤەگێرانێن باوەردارێن ئایینێن ناڤبری و ژیاننامە وی ل ناڤ خەلکێ دەڤەرا بەهدینان ب گشتی و ل ناڤ خەلکێ دهۆك ب تایبەتی، شەهدەیی یێ ل سەر جوامێرییا وی ددەن، هەتا وی دەمێ سەرا هەلویستێن خۆیێن نیشتمانی و مرۆڤایەتی ب غەدر هاتییە تیرۆرکرن(٥٣).

ژ یا بۆری دیاردبیت کو هندەك رووداوێن تایبەت

ب هندەك جوهییان ڤە، كاریگەرییا خۆ ل سەر رێیا سەرەدەریكرنا ڤەگێڕێن جوهی دگەل دێوالی ئاغایێ دۆسكی هەبووینە، پتریا گونەهبارییان ژی ژ لایێ كەسەكێ ب ناڤێ سەعید جەملیلی یێ كورێ حاخام باشیێ وی دەمی یێ دهۆك ڤە ئاراستەی وی هاتینەكرن، چونكی وی هندەك كێشەیێن دارایی و جڤاكی دگەل هندەك جوهییێن دهۆك هەبوون و دەمێ دێوالی ئاغا ب رێیا ئەتەكێتێن عەشیرەتی بزاڤا چارەكرنا وان كێشەیان دكر، ئەڤ چارەكرنە دگەل حەزوڤیانێن سەعید جەملیلی نەدگونجان[٥٤].

ژ لایەكێ دیڤە، ئەو كێشەیا كاریگەرییا خۆ ل سەر كارڤەدانا دێوالی ئاغا ل دۆر جوهییان هەبووی و وەلێ كری ژ وان بتنگژیت، ئاخڤتنا (حزكۆ ئیللۆ) بوو دەمێ گۆتییە دێوالی كو ل رۆژا گەردەن ئازاكرنێ (یوم الغفران) (جوهییان ل كنیشتنێ نفرین لێ كرینە)، ئەو حاخامێ دەست ب نفرینان ل دێوالی كری ژی، بنیامین جەملیلی یێ بابێ یوسف جەملیلی بوو[٥٥].

پاشی ڤەكۆلەر بەحسێ بابەتەكێ دی دكەت كو ئەو ژی پەیوەندییا شێخ عوبەیدوللایێ كورێ شێخ نور محەمەد بریفكی یە ب جوهییێن دهۆك ڤە و هۆسا پێناسا وی دكەت:(شێخ عوبەیدوللا بریفكی (كورێ شێخ نور محەمەد) ئێكە ژ سەرۆكێن ئایینی ل دەڤەرا دهۆك و پەیوەندییێن تایبەت و نەمازە دگەل جوهییان هەنە و ژێ دهێتە ڤەگێران كو وی گرنگی ب زانینا تەوراتێ دایە و ل نیڤا سالا ١٩٢٠ێ و دەستپێكا ١٩٣٠ێ حاخامەكێ خۆجهی پشكەك ژێ وەرگێرایە[٥٦].

ل وێ باوەرێ مە ژی كو شێخ عوبەیدوللا بریفكی بزاڤ دكر ژ نێزیك پێداچوونێ ب تەوراتێ (پەرتووكا پیرۆز یا جوهییان) بكەت، كو چاپا عەرەبییا وێ پەرتووكا پیرۆز ب دەست نەكەڤتبوو یا وی دەمی ل چاپخانەیێن بەیرۆت هەبوو، یان هەر چ نەبیت بێژین كو نەدزانی چاپا عەرەبی یا تایبەت یا تەوراتێ هەیە، ژ بەر هندێ گرنگە و جهێ رێزگرتنێ یە رێز ل حاخامێ جوهی شالۆم شیمۆن مەزنە حاخامێ دهۆك بێتە گرتن یێ وەرگێرانا هندەك پشكێن تەوراتێ ب ستۆوێ خۆڤە گرتی و هەر ژ سالا ١٩٢٠ێ هەتا ١٩٣٦ێ مشەخت بوویە فلەستینێ وەك وانە دگۆتنە شێخی، ئەڤە ژی ژ ئاخڤتنا ڤەكۆلەری دیارە دەمێ دبێژیت:(شێخی حەز ژ جوهییان دكر و گەلەك خەمگین بوو دەمێ حاخام ل سالا ١٩٣٦ێ مشەختبوویە ئیسرائیل(فلەستینی) و ژ بەركو نەشیابوو ژی ل سەر خواندنا خۆ بەردەوام بیت)[٥٧].

پاشی ڤەكۆلەر بەحسێ دو روودانان دكەت كو كاریگەرییەكا مەزن د هەستێن شێخی دا بەرامبەری جوهییان هەبوون، د ڤەگێرانا ئێكێ دا بەحسێ نەساخبوونێ دكەت و تێدا هاتییە:(دهاتە گۆتن كو كورێ نەساخ یێ شێخ عوبەیدوللای(نور محەمەد) ڤیا دگەل مامێن خۆ ئاشت ببیت كو ژ بەر هندەك ڤێكنەكرنان ژێ دووركەڤتبوو، هەڤدەم شێخ عوبەیدوللا ب رێیا (شابۆ شیمۆن)ێ خزمەتكارێ خۆ داخواز ژ رەڤەندا جوهی كر نڤێژان بكەن بەلكی خودێ سلامەتیێ بدەتە كورێ وی و ساخلەم بكەت، پشتی ڤێ چەندێ ب دوو هەیڤان، ئاشتبوون ل ناڤبەرا وان هاتەكرن ئەڤە ژی ب پشكدارییا گەلەك مامێن وی، ژ وانا: شێخ نوری (كورێ شێخ عەبدلجەبار)، شێخ عەبدلرەحمان ئەترووشی، شێخ محەمەد مەمانی، مەتەكا وی یا ب ناڤێ (مریەم خاتوون) هەروەسا قەشە یوسف بەهرۆ (خوری یێ دێرا ڤەگوهاستنێ یا كلدانی ل دهۆك) و پێشنڤێژێ مزگەفتا مەزن یا دهۆك (مەلا سەعید یاسین دهۆكی-بریفكی) پشكداری د پرۆسا ئاشتبوونێ دا كرن[٥٨].

هەروەكی ژ دەڤی دیارە، ڤەگێرێ جوهی پێشنڤێژێ مزگەفتا دهۆك ل پلا داویێ دانایە، ئەڤە ژی د تەمامكرنا ڤەگێرانێ دا دهێت و ڤیایە ئاماژێ بكەتە وێ چەندێ كو پەیوەندی ل ناڤبەرا شێخ عوبەیدوللا و مەزنە زانایێن ئیسلامێ ل دهۆك د ئاسایی نەبووینە، دەمێ دبێژیت:(شێخ عوبەیدوللای بەری وێ روودانێ ب دوهەیڤان بكروڤەكێش دگەل پێشنڤێژێ دهۆك كربوو، ژ بەركو پێشنڤێژی خەلك دژی جوهییان ئازراندبوون، هەڤپەیڤینا بهێت ژی دیار دكەت كا چەوان شێخ عوبەیدوللا كەڤتییە د

بگروڤەکێشەکا دژوار دا دگەل پێشنڤێژێ مزگەفتا دهۆك ل سەر (ستوونێن ئیسلامێ) و شێخی سۆزدایە ۱۰۰ دیناران بدەتە پێشنڤێژی هەکە د ماوێ هەیڤەکێ دا بەرسڤا وی بدەت، لێ نەشیا ژ بەر هندێ، پێتڤی بوو دەست ژ ئازراندنا خەلکی ل دژی جوهیيان بەردەت و من گونەهبار نەکەت هەکە من فەرمانا سێدارەدانا وی دا[59].

هەروەسا ڤەکۆلەر بزاڤێ دکەت بۆ خواندەڤای وەسا دیار بکەت کو شێخی چەند باوەری ب تەوراتێ هەبە و ناڤەرۆکا وێ نیشانێ سۆپەریيا گەلێ جوهی یە! ئەڤە ژی دەمێ گۆتی کو هەردو حاخامێن جوهی (شالۆم) و (مۆشێ مانواح) شیاینە ب رێیا نڤێژ و دوعاکرنێ بۆ خودێ و تافیرکرنێ، دگەل ب کارئینانا پاران و پێڤەخواندنان (قبالا-سۆفیگەریيا جوهیانی) باران د ماوێ هشکەسالیێ دا بباریت و نەهێلیت دوو حەفتیار تەرمێن گۆڕستانا موسلمانان نێچیر بکەن[60]، کو ئەڤە ژی مەزنترین گرۆڤەیە بۆ پرۆپاگەندەکرنێ بۆ جوهی و جوهیاتیێ، ب رێیا هندەك ڤەگێرانێن دشیاندا نینە راستییا وان بهێتە زانین، چونکی ژ ژێدەرەکی ب تنێ هاتینە[61].

ژ لایەکێ دیڤە، زاکن دبێژیت کو (داود بیری) یێ ل گوندێ (بیرێ) یا دکەڤیتە دەڤەرا شەمکان یا سەر ب عەشیرەتا مزووری ژ دایك بووی و ئێکە ژ دیارترین سەرۆکێن رەڤەندا جوهیيان ل دهۆك ل نیڤا ئێکێ یا سەدسالییا بیستێ، بابێ وی هەڤژینی دگەل کچا (داود سەلمان) بازرگانێ زەنگین یێ جوهی کرییە، داود بیری پلە ب پلە خۆ ڤێرا گەهاندییە و بازرگانی ب داوباری کرییە و بوویە بازرگانەکێ زەنگین، ئەڤە سەرباری هندێ کو بەرپرسێ گەنجینا کنیشتا دهۆك بوو، هەروەسا پەیوەندی دگەل دەستەلاتا خۆجهی و دگەل ئاغایێن عەشیرەتان هەبوو، نەخاسمە ژی دگەل (عەلی حەجی مەلۆیێ) مزووری و خۆ دابوو دگەل (عەلی حەجی مەلۆ) د وێ هەڤرکییا عەشیرەتی دا یا ل ناڤبەرا وی و شێخێن بریفکا هەبوو، نەخاسمە ژی پشتی کوشتنا حەجی مەلۆی ب دەستێ شێخ سەعیدێ کورێ (شێخ نوری) ل

سالا ١٩٤٤ێ، کێم مابوو بیری ژی ب دەستێ زەلامێن شێخ نوری بهێتە کوشتن، چونکی وی دەنگ وباسێن وان بۆ خێزانا حەجی مەلۆ ڤەدگوهاستن، لێ خودێ ئەو رزگار کر، یان ژی ژ بەرکو وی زێرەڤانەکێ تایبەتی هەبوو، ل دووڤ دەربڕینا زاکن[62].

## چوار: ڤەزا ئامێدیێ:

سەردەمەکی باژێرێ ئامێدیێ ئێك بوو ژ ناڤدارترین باژێرێن کوردی یێن جوهیيان ل ناڤەراستا کوردستانێ، ب پشتبەستن ب گۆتنا (جێمس ریچ) کۆنسولێ بەریتانی ل عیراقێ یێ سالا ١٨٢٠ێ ل کوردستانێ گەریای و دێڤد هیلل گەریدەیێ جوهیێ ل سالا ١٨٢٦ ێ سەرەدانا کوردستانێ کری، وی دەمی ٢٠٠ خێزانێن جوهی و ١٠٠٠ یێن موسلمان ل ئامێدیێ هەبوون و هژمارا ئاکنجیێن وێ ژی ٨٠٠٠ هزار موسلمان بوو، لێ بەری نیڤا سەدسالییا ١٩ێ، گوهوڕینەك ل باژێری هاتە روودان و ڤێ گوهوڕینێ کاریگەرییا خۆ ل سەر ڤی باژێری و رەڤەندا وێ یا جوهی هەبوو، وی دەمی میر محەمەد (یێ ناڤدار ب میرێ کۆرە) ژ رەواندزێ هات و باژێر دوورپێچکر و سەرکەڤتن ب دەستڤەئینا، باژێرێ ئامێدیێ پویرە و تالان کر و سەرەدەرییەکا خراب دگەل خەلکێ وێ کر، نەخاسمە ژی دگەل جوهیيان کو گرنگترین پێکهاتا وی باژێری بوون و بێ دلۆڤانی و ب دارێ زۆرێ خرابترین و دژوارترین سەرەدەری دگەل وان کر و گەلەك جوهی نەچارکرن مشەخت ببن، یێن چەنسێ مشەختبوونێ ژی نەبووین ل بن دیکتاتۆرییا وی مان، ل دووڤ دەربڕینا زاکن ئەکادیمیکێ جوهی[63].

پشتی ژ ناڤچوونا حوکمێ میرێ کۆرە، پاشایێ مووسل (ئینجە بەیرەقدار)ب دەستەکێ ئاسنین حوکم ل ئامێدیێ کر و پیچەك رەوشا جوهیيان باشتر لێ هات، لێ دنەچاربوون ئاڤێ و بەران ژ دەشتێ بکێشنە کەلهێ و هەمی کارێن پیس و چەپەل بکەن یێن دبوونە ئاستەنگ د رێیا پیشەسازییا واندا، د ماوەیەکێ کورت دا، هژمارا وان رەڤەندێن جوهیيان رۆژەکێ ژ رۆژان د دحالخۆشیێ دا بوون، بوونە ١٠٠ مال ب تنێ و ژ بەر رەوشا سیاسییا نە بنەجهـ

رەوشا ئابووریا جوهییان خرابتر لێ هات، ماوەیەکێ کورت ژی پشتی کەڤتنا میرێ کۆرە، ل سالا ١٨٣٩ێ مزگینیدەرێ فرەنسی دکتۆر (ئساهیل گرانت) سەرەدانا ئامێدیێ کر و دیت باژێر یێ چۆل وهۆلە ئەڤە ژی ژ بەر وان شەرێن تێدا هاتینە رۆودان پشتی کوردێن رواندز ب سەر باژێریدا گرتین، وی دیت تنێ ٢٥٠ خانی ژ کۆما هزار خانییان لێ ماینە و هەمی خانیێن دی و بازار هاتینە کاڤلکرن[١٤].

ل سالا ١٨٥٠ یێ ژی مزگینیدەرێ ئنگلیزی (جۆرج پێرسی بادکەر) دگەل شاندەکێ جوهیێن ئامێدیێ کۆمبوو دەمێ ب رێیا خۆ دچوونە نك پاشایێ مووسل داکو سکالایەکێ ل سەر (تێبرنا پارەی) پێشکێش بکەن یا (وەرگری) ئانکو حوکمدارێ باژێری ب کار دئینا، جوهی و مەسیحیێن ئامێدیێ ژ دەستێ زولم وزۆریا وەرگری دنالین و حەز دکرن مشەخت ببن، لێ هاتبوونە نەچارکرن ل باژێری بمینن[١٥].

ل هەیڤا چریا ئێکێ یا سالا ١٨٥١ێ، مزگینیدەرێ خۆجهی هنری ئارۆن شترن سەرەدانا ئامێدیێ کر و ل کنیشتێ کۆمبوونەك دگەل حاخامێن خۆجهی گرێدا و رێیا وی هاتە دان بۆ جوهییان بئاخڤیت و ئەڤ راپۆرتا خوارێ هاتە تۆمارکرن:(رۆژا پاشتر حوکمدارێ ئەز گازی کرم، بێی هندێ سلاڤێ بکەت یان ژی بەرسڤا سلاڤا من بدەت، ب زڤری و ب ناڤچاڤێن گرێ پرسیار ژ من کر کا بۆچی شڤێدی دگەل جوهییان کۆمبوویمە، من ژی ب کورتی ئارمانجا سەرەدانا خۆ بۆ گۆت، ئینا دەملدەست چ گومان د هزرا وی یا مژەوی دا نەمان و ب چاڤێن چریسك ژێ دیەشین گۆتە من: کارێ تە جهێ دەستخۆشیێ یە و هیڤیخوازم هەمی جوهی باوەریێ ب مەسیح بینن، چونکی بۆ وان چێترە ل شوونا هندێ کو حاشاتیێ ل دو پێغەمبەران بکەن، دانپێدانێ ب پێغەمبەرەکێ مەزن بکەن[١٦].

بەردەوام رەوش ل ئامێدیێ کمباختر لێ دهات، هەر بۆ نموونە، ل سالا ١٨٧١ێ و د شەرەکێ دی دا ل باژێری، موسلمانان هێرش کرە سەر رەڤەندا جوهییان و کنیشتە پویرە و تالانکرن و تەورات پەرپەر کرن، ڤێجا جهێ حێبەتیبوونێ نینە هژمارا خێزانێن جوهیێن ل ئامێدیێ ل سالا ١٨٨١ کێم ببیت و تنێ ٥٠ خێزان لێ بمینن، دبێژن ژی ل سالا ١٨٨٨ ێ هژمارا جوهییان ل باژێری ببوو ٦٠٠ کەس، ل دووڤ راپۆرتێن فەرمی یێن سالا ١٩٣٠ێ ژی تنێ ٨١٢ جوهی ژ کۆما ١٧٤٦ جوهییان ل ئامێدیێ مابوون، هەروەسا راپۆرتەکا شەری یا بەریتانی یا سالا ١٩٢٩ێ پشتراست دکەت کو هژمارا خەلکێ باژێری ٣٠٠٠ هزار کەسە، راپۆرت بەحسێ بۆریێ باژێری یێ پێشکەڤتی دکەت و پێشبینی دکەت ل پاشەرۆژێ رەوشا وێ باژێری پتر تێکبچیت[١٧].

ل سالا ١٩٤٥ ێ هژمارا جوهیێن ئامێدیێ کێمتر لێ هات و ژ ٤٠٠ کەسان نەدبۆری، ئانکو پشتی نێزیکی پازدە سالان هژمارا وا ب نیڤی بوویە، هەرچەندە سەرژمێریا فەرمی هەبوونا ٣٠٣ جوهییان ب تنێ ل ئامێدیێ تۆمارکرییە.

(شاباتی بەرئاشی) بازرگانەکێ زەنگین بوو و سەرۆکێ رەڤەندا جوهیێن ئامێدیێ بوو و پەیوەندیێن موکم دگەل دەستەلاتا خۆجهی هەبوون، کەسەکێ مەرد بوو و هەرجار بەرپرسێن حکومی و ئاغا ژ وانا (هاریکار)ێ سەرۆکێ پۆلیسان و قائیمقام و دادوەرێ خۆجهی مێڤان دکرن داکو پێکڤە ل سەر کیسێ وی بخۆن و ڤەخۆن، جوهیێن ئامێدیێ ئەو بازرگان ب کەسەکێ زیرەکێ خودان پێگەهـ ل ناڤ خەلکی ل قەلەم ددا و وی ژی کاریگەریا خۆ (یان ب رێیا پارەی یان ژی ب رێیا ڤەخوارنێ) دکر و گۆتنەکا مەزنان د جهێ خۆدایە دەرهەڤێ وی بهێتە گۆتن (یا ئاوایێ سەرەدەریا وی) سالۆخ ددەت، هەر تشتێ ئەو فەرمانبەر داخواز دکەن، ئەو هەمیان ب جهـ دئینیت، لێ بەرامبەری وێ چەندێ، ئەو ژی پێتڤی هەر هاریکارییەکێ ببیت، ئەڤ هەڤال و هۆگرێن وی دەستێ هاریکاریێ بۆ درێژ دکەن، هەرچەندە چ زانیارێن بەردەست ل دۆر ڤێ چەندێ نینن[١٨].

خەلکێ ئامێدیێ ژی دبێژن کو شاباتی بەرئاشی ڤێکنەکرن دگەل حاخامەکێ خۆجهی هەبوو (کو ئەو ژی حاخام عەلوان ئەفیدانی)بوو یێ حکومەتێ

وەك سەرۆکێ تیرەیا جوهییان ل ناڤ جڤاکێ رەڤەندا جوهیێن دامەزراندی و خودانێ ڤی پۆستەی مووچەیێ خۆ ژ حکومەتێ وەردگرت، لێ پەیوەندیێن شاباتای بەرئاشی دگەل فەرمانبەرێن فەرمی یێن خۆجهی هاریکاریا وی دڤێ ڤێکنەکرنێدا کر، شاباتای بەرئاشی مایێ خۆ د ڤێ مەسەلێ دا کر و ل سالا ١٩٣٦ ێ ڤێکنەکرنەك ل ناڤ رەڤەندا جوهییان پەیدا بوو و بوونە دو تیرە و شاباتای بەرئاشی بەرپرسیا کنیشتا بلند و حاخام عەلوان ئەفیدانی بەرپرسیا کنیشتا نزمتر ب ستۆوێ خۆڤە گرت[٦٩].

ئاغایێن عەشیرەتێن کورد حوکمدارێن سەرەکیێن ئامێدیێ بوون و موسلمان و جوهییان داخوازیا هاریکاریێ ژ ئاغای دکرن (چونکی ل وێ باوەرێ بوون ئاغا ژ حکومەتێ چێترە) و هەر تشتەکێ ئەو بێژیت حکومەت دێ رێیەکێ بینیت دگەل رێکبکەڤیت.

دەمێ شەرێ جیهانیێ ئێکێ ب داوی هاتی، بەریتانییان دانپێدان ب عەشیرەت و کەسایەتیێن سەرەکی یێن دەڤەرا ئامێدیێ کرن، ژ وانا: رەشید ئاغا، مووسا بەگێ بەرواری، عەبدلوەهاب ئاغایێ نێروە رێکان و سیتۆ ئاغایێ قشووری و ئۆرەماری[٧٠].

ل نیڤا ئێکێ یا سەدساڵیا بیستێ ژی، ئامێدیێ دوو ئاغایێن سەرەکی هەبوون کو ئەو ژی حاجی عەبدوللەتیف کورێ حەجی عەبدولعەزیز و حەجی شەعبان ئاغا بوون و د ژێدەرێن جوهیانی دا گەلەك زانیاری ل سەر ڤان هەردو ئاغایان و کورێن وان هەنە.

زاکن ژ ڤەگێرەکێ خۆیێ جوهی کو ئەو ژی دانییێل بەرئاشی یە ڤەدگوهێزیت: «جوهیێن ئامێدیێ حاجی عەبدوللەتیف ب پشتەڤان و چاڤدێرێ هەمی جوهییان ل قەلەم ددەن... و ئەو جوهیێن ئەو دپارێزیت کەس نەوێریت دەستدرێژیێ بکەتە سەر، هەروەسا تەنگاڤکرنا حکومەتێ ل خەلکێ خۆجهـ و فەرمانبەرێن حکومەتێ قەدەغە کربوو»[٧١].

زاگن ڤەگێرانەکا دی ژی ژ (دانییێل بەرئاشی) ڤەدگوهێزیت و دبێژیت:(پشتی ب داویهاتنا شەرێ جیهانیێ ئێکێ (دروستتر ژی شەڤا ١٥/١٤ ی تیرمەها ١٩١٩ ێ) حەجی شەعبان ئاغا ئامێدی نامەیەك بۆ تاهر هەمزانی و عەبدوللا ئاغا هنارت بۆ دانانا پلانەکێ بۆ کوشتنا ئەفسەرێن بەریتانی و سەربازێن ئاشووری یێن ل قشلەیا ئامێدیێ ئاکنجی بووین، وێ شەڤێ پێشەنگ(کاپتن) ویلی، ئەفسەر جێدار ماکدۆنالد، پۆلەوان(سێرجنت) ترۆپ ل قشلەیێ هاتنە کوشتن و دەستێ خۆ دانانە سەر پارەیێن وێ و رەڤین، رۆژا پاشتر ژی یەکینەیێن هندی گەهشتنە ئامێدیێ)، ڤەگێرێ مە پێڤە دچیت و دبێژیت:(جوهی رحەت بوون و زەلامان ژن و زارۆك هنارتنە گوندان داکو خۆ لێ ڤەشێرن)، ئەڤە ژی ئاماژەیە بۆ شەرێ (گەلیێ مزیرکا) ئەوێ ل ناڤبەرا هێزێن بەریتانی ب پشتەڤانییا یەکینەیێن (کۆرکا) یێن هندی و شۆرشگێرێن کورد هاتییە روودان[٧٢].

ڤەگێرێ جوهی دانییێل بەرئاشی و ئەندامێن خێزانا وی ل دۆرێن هەیڤەکێ مانە ل گوندێ (سپیندارا مزێ) یا دکەڤیتە دەڤەرا چیایێ گارەی ل باشووری رۆژهەلاتێ ئامێدیێ[٧٣].

ل هەیڤا ئیلۆنا ١٩٢٢ێ ژی کو ئەڤە هەڤدەمە دگەل شەڤا سەرێ سالا جوهییان، وی دەمی حاجی عەبدوللەتیف ئاغا حوکمدارێ ئامێدیێ بوو، وی هاریکاری دگەل مەحموود ئاغایێ زێباری یێ هەڤژینێ خووشکا خۆ کر داکو سەرهلدانەکێ دژی حکومەتا عیراقێ بکەن، ئینا یێ داویێ داخواز ژ زەلامێن عەشیرەتا خۆ (یا زێباری) کر بگەهنە سەرهلدانا ل ئامێدیێ ئەڤە ژی ب رێیا کونکرنا دیوارێ ل دۆرماندۆری مالا حاجی عەبدوللەتیف ئاغای، ب ڤێ چەندێ ژی شەرەك ل ناڤبەرا هێزێن پۆلیسێن عیراقێ و شۆرشگێرێن کورد (یێن زاکن ب ڤارێ ل قەلەم ددەت) هاتە روودان، جوهییان ژی ژ ترسا هندێ ببنە قوربانی یێن ڤی شەڕی، رێ ورەسمێن ئاهەنگا جەژنێ ل کنیشتێ نەگێڕان و کۆم کۆم ل ناڤ خانییان خڕڤەبوون و هەر ئێك ژ وان بڤرەك وەك چەك د دەستی دا بوو و دگۆتن:(هەر کەسێ بۆ کوشتنا مە بهێت، ئەم ژی هندی ژ مە بهێت دێ گەلەکان ژێ کوژین)، نیڤ شەڤ ژی هندەك هێزێن دی یێن سەربازێن ئاشووری ژ عەشیرەتا تخۆما {بەتالیۆنا

لیفی(شبانە) - دەرەك} ب سەر ئامێدیێ دا گرت بۆ هاریكاریا هێزێن عیراقێ و ڤارێ یێن كورد (زێباری) نەچاركرن پاشڤە ڤەگەرِێن و عەبدللەتیف ئاغایێ ئامێدی ژی قەستا بارزان كر و ل نك خزمێ خۆ شێخ ئەحمەدێ بارزانی بنەجە بوو، چونكی هەردو خێزانان ب رێیا خزمانیێ مرۆڤانی دگەل ئێك هەبوو[٧٤].

## پێنج: سندۆر:

پتریا خەلكێ سندۆرێ (یا دەهـ كیلۆمەتران ل باكوورێ بازێرێ دهۆكێ) جوهی بوون، ل دووڤ وی تشتێ ژ زاردەڤێ جوهییان دهاتە گۆتن، د بەرێ دا جوهی و مەسیحی ل وێرێ ئاكنجی بووینە، ژ بەر هندێ ئەو گوند ب (سان-دیر San-Dir) هاتییە ناڤكرن و دەمێ مەسیحی ژێ دەركەڤتین، موسلمان و جوهی هاتینە هاتینە وێرێ و لێ ئاكنجی بووینە، مەسیحییان ئاڤاهییەكێ مەزن لێ ئاڤاكربوو، لێ پاشی جوهییان ئەو ئاڤاهی كربوو كنیشتا گوندی، دەمێ موسلمان ژی ژێ دەركەڤتین، جوهییان مزگەفت هەرفاند و گوند هەمی بۆ جوهییان ما[٧٥].

ل دەستپێكا سەدسالیا هەژدێ، ڤەكۆلەرەكێ جوهی دبێژیت: گرۆڤەكێ باوەریێ هەیە كو (شلحیم) ئانكو هنارتی ژ فلەستینێ ب ئاوایەكێ سیستەماتیكی سەرەدانا كوردستانێ نەخاسمە ژی گوندێ سندۆرێ كرینە بۆ ڤالاكرنا سندوقێن تایبەتێن كۆمكرنا پارەی هەروەسا بۆ پێشكێشكرنا شیرەتێن پێگیریكرنێ ب شەریعەتێ جوهیانی، ئەڤە سەرباری دەرئێخستنا برِیارێن تایبەت یێن ب زەحمەتێن دادوەری، هەر بۆ نموونە وەكی ژنبەردانێ[٧٦].

ل سالا ١٨٢٧ێ، گەریدەیێ جوهی (رابی دێڤد دبیت هلیل) سەرەدانا سندۆرێ كر و د راپۆرتەكا خۆ دا گۆتییە كو هەمی ئاكنجییێن سندۆرێ جوهی نە، لێ ل سالا ١٨٤٨ێ دەمێ گەریدەیێ جوهی بنیامینێ دووێ سەرەدانا گوندی كری گۆت كو ٢٠٠ كورد و پێنجی خێزانێن جوهی لێ هەنە[٧٧].

د دەمێ چارێكا ئێكێ یا سەدسالیا بیستێ دا سێ خێزانێن كوردێن موسلمان ل سندۆرێ دئاكنجی بوون، ژ بەركو ئەو (ئانكو موسلمان) رۆژێن شەمبی كار دكەن، ئەڤە دبوو زێدەگاڤی ل سەر رحەتی و بێنڤەدانا رۆژا شەمبیێ یا جوهییان، ژ بەر هندێ، موختارێ جوهیێ سندۆرێ كو خودان كەسایەتی بوو و پەیوەندیێن بەرفرەهـ دگەل قازیێ دهۆكێ هەبوون، داخواز ژێ كر موسلمانان ژ گوندی دەربێخیت و ل جهەكێ دی بهێنە ئاكنجیكرن، ب ڤێ چەندێ، جوهیێن سندۆرێ نەچاربوون خانیێن وان كوردان بكرِن یێن چووینە دەردۆر یان دروستتر لایێ باكوورێ گوندی كو دبیتە پشكەكا ڤەدەر ژ گوندێ سندۆرێ، ژ بەر هندێ، دەمێ (بەنزیۆن ئیسرائیلی) نوونەرێ بزاڤا سەهیۆنیزمێ ل سالا ١٩٣٤ێ هاتییە سندۆرێ، دیت كو چوار یان پێنج خێزانێن موسلمان ل پشكەكا ڤەدەر دژین، ئەڤە سەرباری هندەك خێزانێن دی یێن كورد یێن چاندن وتۆڤچینی و زێرەڤانیا گوندی دكرن[٧٨].

ل هەیڤا نیسانا سالا ١٩٤٢ێ ژی هنارتییەكێ دی یێ سەهیۆنی ب ناڤێ ئینزۆ سیرینی سەرەدانا گوندێ سندۆرێ كر، لێ وی ژ بلی جوهییان كەسێ دی لێ نەدیت، دگەل هەبوونا بنكەهەكێ پۆلیسان كو پۆلیسەكێ ب تنێ لێ هەبوو بۆ زێرەڤانیكرنا جوهییان و ئەو بنكەهـ هاتبوو دانان پشتی حەفت جوهی ل هەیڤا كانوونا دووێ یا سالا ١٩٤١ێ ب دەستێ دو كەسایەتیێن عەشیرەتان هاتینە كوشتن كو ئەو ژی تێلی گەردی و رەشید گێندەل بوون[٧٩].

## هژمارا جوهیێن بەهدینان د سالنامەیێن ئۆسمانی دا:

ل سەر هژمارا جوهیێن بەهدینان، سالنامەیێن ئۆسمانی زانیاریێن جودا جودا ل سەر رەوشا جڤاكی ل قەزایێن كوردی: زاخۆ، ئامێدیێ، دهۆك و زێبار پێشكێش كرینە كو یا داویێ قەزایەكا خۆسەر بوو و ل داویێن سالا ١٨٧٨ێ ببوو قەزا و ناحیا شێروانە هەروەسا ناحیا مزووری بالا پێڤە هاتبوونە گرێدان، لێ پشتی پلەیا وێ قەزایێ هاتییە نزمكرن و بوویە ناحیە، هەردو ناحییێن شێروانە و مزووری بالا ب قەزا

رەواندز ڤە هاتنە گرێدان[80].

تشتێ پەیوەندی ب زاخۆ ڤە هەی، د سالنامەیا ئۆسمانییا ١٣١٠ مشەختی/١٨٩٢-١٨٩٣ زاینی دا هاتییە کو ٥٠٠ جوهی و پەرستگەهەکا وان (حۆرا) ل سەنتەرێ قەزایێ و پەرستگەهەکا دی ل گوندێن شەرانش و بێدارێ و سیفیێ ؟؟؟ هەنە.

د سالنامەیا ١٣١٢مشەختی/١٨٩٤ زایینی دا ژی هاتییە کو ٥٤٢ جوهی ل زاخۆ هەنە، لێ بەحسێ کنیشتەیان نەکرییە.

ل دۆر قەزا ئامێدیێ ژی، سالنامەیا ١٣١٢ مشەختی/١٨٩٤ێ زایینی هژمارەیا جوهییان ل وێرێ تەخمین دکەت و دیار دکەت کو ٢٢١ جوهی لێ هەنە، لێ دسالنامەیا ١٣٢٥ مشەختی/١٩٠٧ زایینی دا هاتییە کو ٨٧ جوهی ب تنێ ل ئامێدیێ هەنە، بێی هندێ ئاماژەیێ بکەتە هژمارا خانی و پەرستگەهان[81].

ل سەر قەزا دهۆک ژی، سالنامەیا ١٣١٠ مشەختی/١٨٩٢-١٨٩٣ زایینی دیار دکەت کو ٤٢٥ جوهی لێ هەنە، لێ د سالنامەیا ١٣١٢ مشەختی/١٨٩٤ زایینی دا ئەو هژمارا وان ل دهۆک زێدەبوویە و بوویە ٤٩٤ جوهی، بێی هندێ بەحسێ هژمارا خانی و پەرستگەهان بهێتە کرن.

ل دۆر قەزا ئاکرێ ژی، سالنامەیا ١٣١٢ مشەختی/١٨٩٤ زایینی بەحسێ هەبوونا جوهییان و پەرستگەهەکێ لێ دکەت، لێ د سالنامەیا ١٣٢٥ مشەختی/١٩٠٧ زایینی دا چ بەحسێ جوهیێن ئاکنجیێن ئاکرێ نەکرییە، ژ بلی ئاماژەکرنەکێ بۆ ناحیا زێبار کو ٣١٤ جوهی لێ هەنە، لێ سالنامەیا ١٣٢٠ مشەختی/١٩٠٢ زایینی ب تنێ خشتەیێن ئامارێن هەتا رادەیەکێ رێك وپێك بەحسکرنە بەرۆڤاژی سالنامەیێن دی یێن ئۆسمانی[82].

هەر بۆ نموونە، د وێ سالنامەیێ دا هژمارا جوهییان ل دەڤەرێن خوارێ ب ڤی ئاوایی هاتییە:

قەزا زاخۆ: ٩٨٧ جوهی (نێر) و ٥٧٥ جوهی (مێ)، ل قەزا ئامێدیێ: ١٢٠ جوهی، قەزا دهۆك: ٢٣٨ جوهی. هەروەسا سالنامەیان ئاماژە کرینە هەبوونا ١١ مەکتەب (خواندنگەهـ)ێن تایبەت ل دهۆك بۆ فێربوونا زارۆیان، ژوانا: ٧ بۆ موسلمانان، ٢ بۆ جوهییان و ٢ بۆ مەسیحیان[83]، ئەڤە سەربارێ ٢ خواندنگەهێن دی ل قەزا ئامێدیێ و هەر خواندنگەهەکێ پەیوەندی ب کنیشتەکێ ڤە هەبوو و خویندکارێن وان ل ناڤبەرا ٤٠-٥٠ خویندکاران بوون، ل زاخۆ ژی خواندنگەهەك هەبوو و ل سالا ١٩٢٠ ێ هژمارا خویندکارێن وێ گەهشتبوو ٢٥٠ خویندکاران[84].

وەسا دیارە ژی ئەڤ ئامارە دهوور نەبوون، چونکی هەمی ئاکنجی ب خۆڤە نەگرتبوون، ژ وانا عەشیرەتێن کۆچەر.

لێ بریتانیا پشتی عیراق و ویلایەتا مووسل(کوردستان) داگیر کرین، ل سالا ١٩٢٠ ێ سەرژمێرییەك بۆ جوهیێن دەڤەرا بەهدینان کر و ل دووڤ وێ سەرژمێریێ هژمارا جوهییان ب ڤی ئاوایێ خوارێ بوو:

١- قەزا زاخۆ: ٥٦٨٨ کەس.

٢- قەزا دهۆك: ١٢٤٤ کەس.

٣- قەزا ئاکرێ: ١٠١٤ کەس.

٤- قەزا ئامێدیێ: ٣٠٣ کەس.

٥- قەزا شێخان: ١٦٣ کەس[85].

جهێن پیرۆز و پەرستگەهێن جوهییان ل کوردستانێ:

جوهییان هژمارەکا جهێن پیرۆز و پەرستگەهـ(کنیشتە)یێن تایبەت ب خۆ ل کوردستانێ هەنە، لێ ل دەڤەرا بەهدینان جوهییان هژمارەکا جهێن پیرۆز و کنیشتە و خواندنگەهێن ئایینی هەنە، ژ وانا:

١- گورێ پێغەمبەر ناحوم ئەلقوشی ل لایێ رۆژئاڤایێ ناحیا ئەلقوش (ئەلکویش)[86].

٢- هەردو گۆرێن حازان دێڤد و حازان یوسف ل ناڤ سەنتەرێ بازێرێ ئامێدیێ[87].

٣- شکەفتا ئیلیا ل گوندێ بێتەنوورێ ل دەڤەرا بەرواری بالا ل باکوورێ ئامێدیێ[88].

٤- گۆرێ ر.ناتانێل هالیڤی بارزانی ل گوندێ

بارزان[٨٩].

ل سەر كنیشتەیێن جوهییان ژی ل دەڤەرا بەهدینان، ل هندەك باژێرێن سەرەكی و ل گوندێن سندۆرێ (عەشیرەتا دۆسكی)، بێتەنوورێ ل ناڤ عەشیرەتا بەرواری بالا، سۆخۆ (ل رۆژئاڤایێ ئاكرێ) كو هەمی خەلكێ وان جوهی بوون، كنیشتەیێن جوهییان هەبوون، هەروەسا كنیشتێن وان ل هندەك گوندێن دی یێن كوردی ژی هەبوون، ژ وانا:

ئەڤا خوارێ ژی خشتەیەكە ب ناڤ و هژمارێن كنیشتەیێن جوهییان ل باژێرێن سەرەكی یێن دەڤەرا بەهدینان.

| ز | جهـ | هژمارە |
|---|---|---|
| ١ | ئامێدیێ | ٢ |
| ٢ | زاخـۆ | ٢ |
| ٣ | دهۆك | ١ |
| ٤ | ئاكرێ | ١ |

هەروەسا ل هندەك باژێر و گوندێن بەهدینان خواندنگەهێن جوهییان یێن سەر ب كنیشتەیان یان ژێ جودا هەبوون، ژ وانا:

| ز | جه | تێبینی |
|---|---|---|
| ١ | ئامێدیێ | دوو خواندنگەهـ سەر ب دوو كنیشتان ڤە. |
| ٢ | زاخۆ | خواندنگەهەك سەر ب كنیشتێ ڤە |

| ز | ناڤێ گوندی | تێبینی |
|---|---|---|
| ١ | نێروە | گوندەكە ل كوردستانا عیراقێ ل نێزیك سنوورێ تركیا. |
| ٢ | بارزان | ناحیەكا سەر ب قەزا مێرگەسوورێ و جهێ ژ دایكبوونا رێبەرێ كورد مستەفا بارزانی یە. |
| ٣ | بەرئاشێ | گوندەكە دكەڤیتە رۆژهەلاتێ هاڤینگەهـا سیارەتیكا ل بنیا چیایێ گارەی. |
| ٤ | گوهەرزێ | گوندەكە دكەڤیتە رۆژهەلاتێ ئامێدیێ. |
| ٥ | شندۆخا | گوندەكە دكەڤیتە رەخ ورووبێن دهۆك. |
| ٦ | شەرانش | گوندەكە دكەڤیتە باكوورێ زاخۆ. |
| ٧ | مێزێ | گوندەكە دكەڤیتە بنیا چیایێ گارەی. |
| ٨ | شووشێ | گوندەكە دكەڤیتە رۆژئاڤایێ ئاكرێ. |
| ٩ | هەركی | دەڤەرەكە دكەڤیتە باكوورێ رۆژهەلاتێ بارزان. |
| ١٠ | رولكە | گوندەكە نێزیكی ئامێدیێ یە. |
| ١١ | رووبار | گوندەكە نێزیكی ئامێدیێ یە |
| ١٢ | رەفلا | گوندەكە نێزیكی ئامێدیێ یە |
| ١٣ | گەرەگو | گوندەكە دكەڤیتە رۆژهەلاتێ هاڤینگەهـا سەرسنكێ. |
| ١٤ | قەدشێ | گوندەكێ مەزنە (كۆمەلگەهەكە) دكەڤیتە رۆئاڤایێ ئامێدیێ. |
| ١٥ | كانی بەلاڤێ | گوندەكە دكەڤیتە بنیا چیایێ مەتینا. |